# چەردە باسێك لە بارەی كوردانەوە

## میهردادی ئیزەدی



ئەمین شوان

لە ئینگلیزییەوە كردوویە بە كوردی

میهردادی ئیزەدی

# چەردەباسێك لە بارەی كوردانەوە

بەشی زمان و شارستانییەتەكانی ڕۆژهەڵاتی نزیك/ زانكۆی هارڤارد

ئەمین شوان

لە ئینگلیزییەوە كردوویە بە كوردی

سلێمانی ٢٠٠٧

# ناوەڕۆك

# لیستی نەخشەکان

# لیستی خشتبەندییەكان



# لیستی هێڵبەندی و وێنەكان

# نرخاندن

دوای سڵاو نیشانە بە نامەی ڕۆژی شازدەی نیسانی ئیمساڵتان دەربارەی كتێبەكەی میهردادی ئیزەدی كە مامۆستا ئەمین شوان كردوویە بە كوردی دەڵێم ئەو كتێبە بەپێی بۆچوونی من بەرهەمێكی زانستیی بە هادارو دانسقەو بێ ئەندازە بایەخدارە، بە نەخشەو نەخشەسازی و تابلۆ و لێدوانی قووڵ و بۆچوونی وردو هەڵسەنگاندنی بابەتەكی ڕازێنراوەتەوە، سەرچاوەكانی هەمە جۆر و پێویستن، بەشێكیان لەو سەرچاوانەن كە بە ئاسانی وەدەست ناكەون، پێم وایە دانەری نەك شانی لە شانی كوردناسە ناسراوەكان داوە، بەڵكو گەلێك جاران و لە زۆر خاڵی دەگمەندا بۆریشی داون.

وێڕای هەموو ئەوانەی وتمانن و گەلێكی تری وەك ئەوانیش نووسەر وەك زانایەكی ڕاستگۆ لە هەموو ڕوویەكەوە بە شێوازێكی بابەتەكی لەگەڵ خەرمانی فرە دەوڵەمەندی ڕووداوەكان و ئاڵوگۆڕە جیاوازەكانیاندا ڕەفتاری كردووە، وەستایانە بەدووی ڕاستیەكاندا چووە، ئاوڕی لە هەست و ئارەزووی هیچ لایەن و دام و دەزگایەك نەداوەتەوە، هەرچەندە وەك مرۆڤێكی دادپەروەر لە سەنگەری زۆر لێكراولندایە كە كوردان لە ڕیزی هەرە پێشەوەیاندان، بەڵام سۆزی نارەوای وەلا ناوەو چاوی لە زێدڕۆیی جار جارەی ئەوانیش نەپۆشیوە.

هەرچەندە بە كوردی كردنی بەرهەمێكی وا چڕو پڕی هەمەلایەنیی بە زوبانێكی ئینگلیزیی بەرز داڕێژراو كارێكی هەر وا ئاسان نییە كەچی پتر لە چاوەڕوانی هەموومان وەرگێڕی هاتۆتە دەست و بە كوردییەكی پەتی و ڕەوان و بێ گرێ سەرجەمی بابەتەكانی داڕشتوونەتەوە و گیانی كردوون بە بەرداو بۆ هەمووانی سەلماندووە وەرگێڕان هونەرێكی بەرزی ئەوتۆیە كە لە وێژەی كەم كەسدایە، بریا دوكتۆر ئیزەدی بۆخۆی كوردیی دەزانی تا دڵنیا بووایە لەوەی

بەرهەمە ناوازەکەی لە بەرگێکی قەشەنگدا دەگاتە دەست کوردەکەو بەڵگەیەکی سەلمێنەری نوێی بۆچوونەکانی خۆی دەبینی کە سوورە لەسەر ئەوەی کورد هیچی لە کەس کەمتر نییە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا کە مشتێکن لە خەروارێك، ژمارەیەك تێبینی و خۆزگەم هەیە کە والێرەدا چەند نموونەیەکیان دەخەمە بەرچاو. نووسەر قۆناغی مێژووی هاوچەرخی کورد بە سالانی ١٤٩٧ تا ١٩١٨ دادەنێت کە ئەوە پێودانێکی ئەورووپاییەو بۆ کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان دەست نادات. هەمان کات نووسەر بەهۆی سەرچاوەکانییەوە کەوتۆتە ژمارەیەك هەڵەوە کە بەپێی بۆچوونی خۆم بەشێکیانم هەر لەسەر لاپەڕەکانی تەرجەمەکە تۆمار کردووە.

چەند ستایشی کارەکەی شوان بکەم هێشتا بەلامەوە کەمە، کاتی خۆی لە ڕێگەی وەرگێڕانییەکانییەوە، تایبەت لە ڕێگەی کتێبەکەی ئارشاك سافرستیانەوە باش لەم ڕووناکبیرەمان گەیشتبووم، بەم کارە نوێیەی هێندەی تر لام گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەیەك پێشنیاریم بۆی هەیە، ناوەڕۆکی کتێبەکەی میهردادی ئیزەدی گەورەترین پێناسەی دانەرێتی، لەگەڵ ئەوەیشدا بریا وەرگێر پوختەیەکی چڕوپڕی دەربارەی نووسەر دەکردە چەپکە گوڵیی ڕازاوەی پێشەکییەکی گەلێك فراوان و قووڵتر لەوەی کردوویەتی. نکۆڵی لەوەیش ناکرێت کە وەرگێڕ زۆر باش بە چاپە کوردییەکەدا چۆتەوە و ورد هەڵەچنی کردووە، ئەوەی بەداخەوە هەمووان وەك پێویستە وا پەیڕەوی ناکەن، لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەیەکی زۆر هەڵەی تر خزاونەتە ناو چاپەکەوە و وەك بەڵگە چەند نموونەیەکم لەسەر کتێبەکە بۆ دەستنیشان کردووە، وێڕای ئەوەی لەسەرانسەری وەرگێڕدراوەکەدا سەردێڕێکی نوێ و ئاسایی وەبەرچاو ناکەوێت هەرچەندە هیچ نەبێت دەیتوانی سەرەتای هەموو پەرگرافە نوێکانی کارەکەی وەك دەقی ئینگلیزییەکەی ئیزەدی لێ بکات. چەند تێبینییەکی تری لەو جۆر و بابەتانەم لە شوێنی خۆیاندا لەسەر لاپەڕەکانی کتێبەکە دەستنیشان کردووە کە نە ئەوان و نە ئەمانەی وتمن بۆیان نییە نە زۆر و نە کەم لە نرخ و بایەخی بێ ئەندازە زۆر و بەرزی کارەکەی ئیزەدی و شوان کەم بکەنەوە. پێم وایە کتێبە نایابەکەی میهردادی ئیزەدی شایانی ئەوەیە بێ دواکەوتن بکرێتە تورکی و فارسی و فەرەنسی و ڕووسی و چەند دەتوانرێت هێند فراوان بلاوبکرێتەوە.

لەگەڵ ڕێزمدا.

کەمال مەزهەر
٢٠٠٦/٦/١

# پێشەكی

هەر لە سەرەتای تۆماركردنی مێژووەوە، سەرزەمینە شاخاوییەكانی باكووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرزەمینی گەلێك بووە كە خاوەنی كەلتوورێكی جیاواز و ڕەسەنی ئەم جیهانەیە. هەندێ لایەنی ژیان و كەلتووری كوردان، لە ڕاستیدا، ڕێچكە دەبەنەوە ناو قوولایی زیاتر لە پەنجا هەزار ساڵ لەمەوبەر و دەچنەوە ناو ئەشكەوتەكانی شانەدەرەوە لە دەوروبەری هەولێری كوردستانی ناوەڕاست. كەچی، سەرەڕای ئەو هەموو كەلەپوورە كۆنە و ئەو زیندوویییە فەرهەنگییەكە لە كوردانـدا دیـارە لەسەرچـاوە مێژوویییەكانـدا كـەمتر بـاس و خواسیان هاتووە. ئۆباڵی ئەمەش دەكەوێتە مل ئەو ڕاستییەوە كە كورد تا ئێستا نەبووە بە خاوەن دەوڵەت و دەسەڵاتی تایبەت بەخۆی، كەچی هەر لە سایەی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە وڵاتانی وەكو توركیاو ئێرانو عێراق و سوریا خۆیان بادەدەن كە گوایە بەرزەكی بانان و خاوەن پێناسەی جیاوازی خۆیانن و هەر ئەمەش بۆیان بووە بە بەرەكەت و پێی بوونە بە نەتەوەی جیاواز و یەكڕەنگ لە كاتێكدا لە چەندین پێكهاتەی جیاواز و بەڵەك بەولاوە هیچی تر نەبوون.

لە هەمان كاتیشدا ئەم نەتەوە– دەوڵەتانە هەرگیز لە تەقەلای ئەوە نەسرەوتوون نەهێڵن كورد ببێ بە قەوارەیەكی ماڵ جیای نەتەوەیی و تا بۆیان كراوە خۆیان گوشیوە دەستبەرداری یەككرتنی بن.

هەر لەبەر ئەمە چیان بۆ كرابێ لە بواری چەواشەكاری و دیزە بە دەرخۆنەكردنی ڕەسەنایەتی و كەلتووری نەتەوەیی كوردیدا درێغیان نەكردووە نەك هەر ئەمە، تا بۆیان كرابێ كۆسپ و تەگەرەیان خستۆتە بەردەم هەموو هەوڵێك بۆ دەرخستنی ڕابردووی تیشكداری و گرنگی بوونی وەكو ڕەگەزێكی جیاواز. بۆ ئەم مەبەستەش ناو و ناتۆرەی بێ بنەما و بەلگەیان بە سەریدا سەپاندووە وەكو "توركی چیایی" لە توركیا و "عەرەبی نومەوی ڕەگەز" لە سوریا و عێراق بۆ یەزیدییە كوردەكان. لە پەنای ئەم كردەوەیەدا، لە وڵاتی وەكو ئێران و

ئازەربایجانی سۆڤیەتی و تورکمانستان، جیاوازیی ڕەگەزی کورد دەخرێتە ژێر لێوەوە. بەم کارەیان ئەم نەتەوە— دەوڵەتە تازە داکەوتوانە سەریان تەنانەت لە کوردەکانی خۆشیان شێواندووە و چەواشەیان کردوون.

بە ڕاستی، جێی سەرسووڕمانە کەوا تەنانەت تەڵەزمە سواڵەتێکی کۆنینە یان نووکە ڕمێکی ژەنگن، یان کەرتە گۆزەیەکی شکاو یان شتێکی تری لەم بابەتە کە بوترێ بەڵێ ئەمە هی کوردە و بە ئاسەواری کورد دادەنرێ لە هیچ مۆزەخانەیەکی ئەم سەرزەمینەدا خۆی نەگرتۆتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە مۆزەخانەکانی ئەمسەر و ئەوسەری جیهان پڕن لە ئاسەوارو پاشماوەی گەلانی تر.هەر لە سەردەمی بەردەوە بیگرە تا دەگەیتە مێژووی نوێی ئوستراليا و باکووری ئەمەریکا و دوورگەکانی پاسەفیك و وڵاتانی ئەفەریقا.

بەرەو مافوور و (لەم دواداوییەدا) هەندێ کاری وێنەکێشی و نەخشونیگاری لێدەرچێ، کەلەپووری مودێرنی دەستڕەنگینانەی کاری هونەریی کوردیش هەر ئەم دەریای نەناسین و پشت لێکردنە هەڵیلوشیون. بۆ نموونە، لە چوار بەش سێ بەشی ئەو مافوور و بەڕانەی ئێستا لە تورکیا دەسکرد دەکرێن، بەرهەمی دەستی ڕەنگینی ژن و پیاوی بەهرەداری کوردن، کەچی لە چوارچێوەی سنووری ئەو وڵاتە خۆیدا، کەس ناتوانێ ئەو ڕاستییە هەر باسیش کا.

لەم کارەمدا، من هەوڵم داوە کەلەپوور و میراتی لە کوردەوە بەجێماو، پاش تۆزتەکاندن، بخەمە سەربالی های کردن. لە کاتێکدا بازاڕی شارستانیی دابەشکراوی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دوکان بە دوکان و گوزەر بە گوزەر ناوی پێکهاتە نەتەوەییەکانی تریان پێوەیە، کڕین و فرۆشیان گەرمە و دەنگی های کردن تێیاندا دەگاتە ئاسمان، کەچی کوردانی بێ دەوڵەت لەو دووەرەوە سیسکەی چاویان دێ و نە دوکانێکیان هەیە نە گوزەر.

سەبارەت بەوەی کێ کوردە و کێ کورد نییە، ئەم کارە تەواوی ڕێز لە بیروڕای هەر کەسێك دەگرێ کە بڵێ من کوردم، بێ پەنگانەوە لەسەر شێوەی زمانی، جۆری ئایینی یان ئەو دەوڵەتەی لەناو سنووریدا دەژی.

لەم بارەیەوە هەر کۆمەڵێك کە لەسەرزەمینی کوردستان نیشتەجێ بێ، خۆی تا ئەمڕۆ جگە لە کوردبوون پێناسەیەکی تری هەڵنەبژاربێ، یان خۆی نەبەستبێت بە پێکهاتەیەکی ئەتنی یان نەتەوەیی ترەوە کە ئێستا یان جاران لە دەرەوەی کوردستان ژیابن، ئەوا بە کورد

دادەنرێ. هەر ئەم پێودانگە بۆ چەسپاندنی پێناسەی میسرییە كۆنەكان یان گریكەكان و پێوەندی ئێستایان بە میسری و گریكەكانی ئەم سەردەمەوە بە گشتی بە دروست دانراوە و كاری پێ دەكرێ.

بۆیە بەهەمان دڵنیاییەوە كە دانیشتووانی میسری سەردەمی فیرعەونەكان، بە باوباپیرانی راستەقینەی میسرییەكانی ئێستا دادەنێین، هەرچەند بە زمانێكی تریش دوابن، یان بەشێوەیەكی تر ژیابن و تەنانەت شێوە و ڕوخساری ڕەگەزیی تریشیان بووبێ، دەبێ دانیشتووانی كۆنی كوردستانیش بە باوباپیرانی دانیشتووانی ئێستاكەی بزانین. ئەم دیدە لەو فەسڵەدا بە دێژی دەردەخەین كە باسی پێناسەی ئەتنیكی دەكا.

ئەم كتێبە بۆ ئەوە دانراوە ببێ بە سەرچاوەیەكی كورت بەڵام بەڵگەچینكراو بۆ هەر بابەشێك كە سەرەداوێكی بچێتەوە سەر كورد، كەسەرباسی پشتەڵەكی مێژوویی و بنباسی دابەشكردنی جوگرافیانەبێ. لێرەدا تەنها سەرەداوە درشتەكان و هۆكار و جێ دەستەكان باس كراون، هەمووشمان لەو ڕاستییە باش ئاگادارین كە هەست و نەست و سەروبنی گەلێك هەرگیز لەناو سینگی یەك كتێبدا كۆ ناكرێتەوە، جا ئەو گەلەش گەلێكی وەكو كوردبێ كە هێشتا بەشێكی زۆری سەربووردی ژیانی لەناو دووكەڵ و تەپوتۆزی ونبوون و شارراوەییدا تا تەپڵی سەر خنكاوە. بۆ نموونە، هەر ئەم دەمە كەواین لە كۆتایی هەزارەی دووەمی مێژوودا و لە چاخی سەفەر و گەشتی تاریكایی ئاسماندایین، كەس نیە بوێرێ بەپشت ئەستووری بە بەڵگە و ژمارەبەندی دروست، ژمارەی هەموو كوردانی سەر ڕوی ئەم زەمینەمان بداتێ. هیوامان وایە ئەم كتێبە هەستی لێكۆڵینەوە زیاتر بورووژێنێ، تا ژەنگ لەسەر ئەم ڕاستیانە لادرێ و هەر خاوەن ئامانجێك بە ئاسانی و دروستی بتوانێ بگاتە مەبەستی.

ڕووی ئەم كتێبە لە زۆرترین ژمارەی خوێنەر و دەزگاكانی باس و هەواڵ و مامۆستایان و خوێندكاران و ئەدەب نۆست و شارەزایانی دیكەی مەیدانەكانی زانست و تەنانەت گەڕیدەكانیشە ئەمە سەرچاوەیەكی سووكەدەستە بۆ بە ئاسانی گەیشتن بە زانیاری، یان بۆ هەر كەسێك بیەوێ زانیاریەكی سەرپێی لەسەر كوردان و كوردستانی وڵاتیان دەزگیركا.

نووسەری ئەم كتێبە ئێستا خەریكی ئامادەكردنی كتێبێكی فراوانترە بە ناوی "لێكۆڵینەوەیەكی بنچینەیی سەرزەمین و گەلی كوردستان"ەوە. هیوا وایە لەوێدا زانیاری فرەتر

بخرێتە بەردەستی خوێنەر، لە بارەی کوردان و سەرزەمین و مێژوو کەلتوورییانەوە. لەپاڵ ئەو کتێبەشدا ئەتڵەسێکی تایبەت بە کوردان بە دەستەوەیە.

لە کاتێکدا دوا بژارکاری و تەتەڵە و گێژەی ئەم کارە لەدوا قۆناغییدا بوو، یەکیەتی سۆڤیەت کە دوا ئیمپراتۆرەیەتی مەزنی ئەوروپا بوو، باروبارگەی پێچایەوەوە و بوو بەمیوانی مێژوو.

تا ئەو کاتە کە دەوڵەتێکی تر ڕستی سەرزەمینەکانی ئەو وڵاتە دەگرێتەوە دەست، زاراوەی "یەکیەتی سۆڤیەت" یان هەر "سۆڤیەت" لەهەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا هاتن هەر هەمان مانای گۆرینی کۆن دەگرنەوە.

کامبریج/ کانوونی یەکەمی ١٩٩١

## هەندیّ تێبینی لە بارەی سەرچاوەكانی ئەم كتێبە و شتی گشتیی ترەوە

ئەو بیبلۆگرافیا و سەرچاوانەی تر كە لە دوای هەر یەكە لە بابەتەكانی ناو ئەم كتێبەوە پێشنیار كراون، ئەو سەرچاوە و بنج و بنەوانانە دەگرنەوە كە ئەم كتێبەیان لیّ هەڵێنجراوە. زۆر گرنگە ڕاستییەك بزانین كە ئەمانە بە هیچ كلۆجێك لە هەموو شتێكدا لەگەڵ ناوەڕۆكی ئەم كتێبەدا سەد ڕێكو كۆك نین. بە پێچەوانەوە، سەبارەت بە ساوایی مەیدانی دیراساتی كوردی، گەلیّ لەم سەرچاوانە، تەنانەت لە بابەتە ئەساسییەكانیشدا، لەگەڵ زۆر بابەتی ناو ئەم كتێبەدا ناگونجێن، تەنانەت لەگەڵ یەكەمیشدا هەر نەكوڵەكن. هەندیّ لەو سەرچاوانەی كە ناویان هێنراوە، لە كاری تریاندا لە هەڵوێست و بۆچوونی ڕابردوویان پاشگەز بوونەتەوە. بۆ نموونە لە بارەی مەسەلەیەكی گرنگی وەكو ڕەگوریشەكانی زمانی هاوجەرخی كوردییەوە زماناسێكی بەناوبانگی وەكو دێڤید ب. مەككێنزی ساڵی ١٩٦١ بۆچوونێكی لە بارەی ئەو پەیوەندییانەوە خستە ڕوو كە لەگەڵ زمانی میدییەكاندا، كەچی لە ١٩٨٩دا لەو بۆچوونەی خۆی پاشگەز بووەوە[1]. كەواتە، هەموو سەرچاوە گرنگەكان، لەم كتێبەدا دراون بیّ ئەوەی هەڵوەستە لەسەر هەڵوێست و بۆچوونەكانیان بكریّ، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی ماوەیەكی تەواو بە خوێنەر بدریّ تا لە بیر و ڕا جۆراوجۆرەكان ئاگادار بیّ. هیچ سەرچاوەیەك لەم كتێبەدا هاتبیّ، لەم بە باڵابڕینە بەدەر نییە.

هەندیّ سەرچاوەی گشتی لە كۆتایی هەر یەكێك لە بابەتە سەرەكییەكاندا ناونووس كراون. بۆ هەر یەكەشیان كورتە سەنگاندنێك كراوە. بە گشتی هەوڵ دراوە تەنها بە ئینگلیزی سەرچاوەكان بدرێن بەڵام ئەمە لە هەندیّ شوێن بازی بەسەردا دراوە، بۆیە هەندیّ سەرچاوەی گرنگ كە بە زمانی فەرەنسی، ئەڵمانی و ڕووسیش نووسراون، خراونەتە پاڵ ئینگلیزییەكان، تا زۆریەی خوێندەواران نەكەونە گێژاوی بێهوودەكارییەوە، لە بیبلۆگرافییەكاندا، خۆم نەداوە لە ئاقاری ئەو سەرچاوانەی كە بە زمانە ڕۆژهەڵاتە ناوەڕاستییەكان نووسراون. هەرچی كاری

---

[1] بڕوانە (Ethnic groups in the Republic of Turkey) Peter A. Anderewses لە (1989 – P.531) Wesbaden: Ludung Rachestدا.

دانـەرە گریـك — ڕۆمـە کلاسـیکییەکان و ئیـسلامییەکانی سـەدە ناوەندییەکانـە، ئـەوا لەبـەر شۆرەتی بەربڵاویان، بە پێویستم نەزانی لە بیبلۆگرافیابەندیی ئـەم کتێبـەدا خانەیـەکی جیایـان بۆ تەرخان کەم.

لـە هـەڵواردانی زمانـە ڕۆژەڵاتناوەڕاسـتییەکاندا و ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە سەرچـاوە پێشنیارکراوەکانەوە هـەبێ، نەخشەکان، زانیارییـەکانی سـەرژمێری و ئەتڵەسـەکان بـەدەرن، واتە تەنها ئاماژە بۆ ئەوان کراون.

تەنها ناوی ئەو کتێب و دەزگای بڵاوکردنەوانـە لـەم کتێبـەدا هـاتوون کـە لـەم (٣٠) ساڵەی دواییدا هاتوونەتە ناوانەوە. ئەو سەرچـاوانەی کـە لەلایـەن دەزگـای بڵاوکردنـەوەی زانکـۆ یـان مۆزەخانەکانەوە باسیان کراوە، بێ ناوی دەزگای خاوەن پەیوەندی تێ نەپەڕیون، چونکە ئەم دەزگایانە گەلێ زیاتر لـە دەزگاکـانی بڵاوکردنـەوە کتـێبی فرۆشتنیان هەیـە. شـار یـان وڵاتـی بڵاوکردنەوەش هەمیشە ناویان براوە.

ئــەو نەخــشە و وێنــە و خــشتەبەندییانەی لــەم کتێبــەدا دراون، هــەموو ئەســڵێن و سەرچاوەکانیـشیان بـە ڕوونـی لـە داوێـنی هـەر یەکەیانـدا وتـراون، ئەوانـەی لـێ دەچـێ کـە زانیارییـەکانیان لەلایـەن نووسـەرەوە لـە چـەند سەرچـاوەی جیاجیـادا هـەڵێنجرابێ، لێرەشـدا سەرچاوەی زانیارییەکان لـە دامێنـدا و لـە چوارچێوەی بیبلۆگرافیاکانـدا دەستنیـشان کـراون. سنوورەکانی کوردستان بە پشت بەستن بـە سەرچـاوەی بـاوەڕپێکراوی متمانـەدار لـە فەسـڵی "جوگرافیا"دا سنووریەندی کراون.

دەستەواژەیەکی زۆر، بێ دەست ترسان، لەنێوان سەرباسەکاندا کراوە و لە شوێنی پێویست ئاماژەیان بۆ کراوە تا خوێنەر بە ئاسانی بتوانێ بگەڕێتەوە سەریان و ڕاوێژیان پێ بکا، چـونکە ئەو سەرباسانە نەك یاریدەدەری دەسووبردن بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، بەڵکو لـە هەنـدێ جێگەدا زۆر پێویستن بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی تەواوی بابەتەکانیش.

دەزانم بۆ کەسێك کە شارەزایی پڕی لـە زمانـەکانی کـوردی و فـارس و عـەرەبی و تورکیـدا نەبێ، هەرگیز ناکرێ بە ڕاستی و دروستی ناوەکان بە هیچ سیـستەمێکی دەربـڕینی دەنگـەکان وەکو خۆیان دەربڕێ و چونکە کاری ئەم کتێبە فرێ بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی زمانەوانییەوە نییە، بۆیە لەم بوارەدا لە دروستکردنی گرانباری بۆ خوێنەر خۆم بە دوور دەگرم.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش، بۆ دەربڕینی ناوەکان زمانی ستانداردی ئینگلیزیی ئەمەریکیم کردووە بە بەردەباز و ناوەکانم لە ڕووی دەنگی پیتەکانەوە پێیدا پەڕاندۆتەوە. لەم بوارەدا تەنها نیشانەیەکی دەنگی نەختێ ئاڵۆزیی ناوەتەوە، ئەویش دەنگی (ئا — â)یە کە لە وشەی وەکو (far، bar،car ) دەردەکەوێ چونکە (a) بێ سەرەکەی سەری، بەو جۆرە دەردێ کە لە وشەکانی (add، bad،sad )ی ئینگلیزیدا دەردەچن.

ناوی شوێنەکان، هەر بەو شێوەیە دەربڕاون کە کوردەکان بەسەر زاریاندا دێ، ئەوانەیان لێدەرچێ کە خۆیان لە بنەڕەتدا کوردی نین، یان کوردین بەڵام بەشێوەی تایبەتی دەردەبڕێن وەکو (ئەربیل، مەهاباد) کە هەردووکیان شاری کوردنشینن لەلایەن کوردان خۆیانەوە بە (هەولێر، سابڵاخ) دەردەبڕێن. بۆ ئەوەی کارەکە بۆ خوێنەران زیاتر سانا بکەین، جۆری گۆڕان لە دەربڕینی ناوی شار و شارۆچکەکاندا لەژێر بابەتی "شارنشین و مەڵبەندە شارییەکان"دا باس کراوە.

ناوی هۆزەکان، تا کرابێ بەو شێوە کلاسیکیە کوردییەیان دەربڕاون کە مێژوونووسی کوردی بەناوبانگی سەدەی شانزەیەم (شەرەفخانی بدلیسی) نووسیونی. لەوە بەولاوە نووسراوەکانی مێژوونووسە ئیسلامییەکانی سەدەکانی ناوەند بەکارهاتوون. ئەمەم بەبێ هۆکارە نەکردووە، چونکە زۆر جار ناوی هەمان هۆز، یان لقەکانی، بە چەند شێوە دەردەبڕێ، بە تایبەتی ئەگەر لقەکان زۆر لە ڕووی شوێن و نیشتگەوە لێك دوور کەوتبنەوە. باشترین نموونە بۆ ئەم ناوگۆڕانە هۆزی ڕەشەوەندە، کە ئێستا هەر لە ڕۆخەکانی دەریای سپیی ناوەڕاستەوە پەڵە پەڵە نیشتەجێن تا دەگەیتە قەفقاسیا — ئاسیای ناوەندی سۆفیەتستان. هەر لەم سەردەمەی ئێستاماندا هۆزەکە بە چەند ناوی جۆراوجۆر ناوی دەرکردووە کە هەر لە ڕاشەوەن ڕاشەوەند و ڕەشوانەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە ڕەشڤان و ڕەشخان و ڕەشکان. ئەم گۆڕانانە لەوانەیە ببێتە هۆی گومان خشتنە سەر یەکڕەسەنیی ئەم هۆزە کە بە سەر دوو هەزار میلی سەرزەمیندا پەرش بۆتەوە و خاوەنی مێژوویەکی پڕ لە کارەسات و ڕووداوە.

بۆ خاتری تێکنەدانی بیری خوێنەر، ئەو ناوانەی لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا هاتوون، وەکو خۆیان نووسراون کە لای مێژووناسە کلاسیکە ئیسلامییەکان، یان جوگرافیاناس و ڕووناکبیرانی دیکەی ئەو سەردەمە باو بوون. ئەم ناوانە لە ژمارەدا زۆر نین و شێوەی دەربڕینیشیان بۆ ئەوانەی لەو بوارەدا شارەزاییان هەیە شاراوە نییە.

## سوپاس و پێزانین

کتێبخانە و مۆزەی کوردی لە برۆکلینی نیویۆرک مەردانە سەرچاوە بەنرخەکانی خۆی خستە بەردەستم، بۆیە بە پێویستی دەزانم بەشێوەیەکی تایبەتی سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ ئەم دەزگایە دەربڕم هەردوو دکتۆر ڤێرا بۆدین و سەعید پوری ئاوەڵی دێرینم و خاتوو ئەناهید عەکاشەی هاوسەری خۆشەویستم، بەرێنومایی و سەرنجە بە نرخەکانیان، بۆ ئەم کارە بوون بە هاندەر و یارمەتیدەر بۆیە سوپاسی بێ پایانی هەردوو لایان دەکەم.

دەبێ سوپاسی تایبەتیش پێشکەش بە پرۆفیسۆر ویلەر تاکستی بکەم، بۆ سەرنجە بە نرخەکانی لە رێکخستنی ئەم کتێبەدا، هەروەها هاورێی دڵسۆزم دکتۆر لۆرەنس پۆتەر، کە پەیتا پەیتا لە نوا رووداو و گۆرانکارییەکانی کارووباری کوردان ئاگاداری دەکردم. هەروەها قەرزداری بەرێز تۆد بۆڵدوینم کە لە دارشتنی ئەم کتێبەدا لە چاوەدێری و رێنومایی و وردەکاری بەنرخ دریغی نەکردوە.

# فەسڵی یەكەم

## جوگرافیا

### سنوورەكان و جوگرافیای سیاسی

سەرزەمینی پان و بەرینی كوردان لە (٢٠٠) هەزار میلی چوارگۆشە زەوی پێكهاتووە- پانایی بەتەواوی هاوتای پانایی فەرەنسا یان ویلایەتەكانی كالیفۆرنیا و نیویۆرك پێكەوەیە. (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١). كوردستان بەسەر سنووورە شاخاویەكانی باكووری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەلاژاوە و بەوە ئەو سەرزەمینە لە یەكێتی سۆڤیەتی بەرێ جیادەكاتەوە. بەشكل لەپیتی (٧)ێكی ئاوەژووكراو دەچێ كە نووكەكەی ڕووی لە قەفقاس و لینگەكانی ڕویان لە دەریای سپیی ناوەڕاست و نۆكەندی فارس بێ (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢).

لە كاتێكدا ئەمڕۆكە كورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی نییە، كە خاكەكەشی بگرێتەبەر، دەتوانین بەو سەرزەمینانە بڵێین كوردستان كە زۆربەی دانیشتووانیان كوردن. ولاتی كوردان هاو سنووری ستراتیژیە لەگەڵ هەر سێ پێكهاتە ئەتنیەكەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا: عەرەبەكان لە باشوورەوە، فارسەكان لە ڕۆژهەلاتەوە و توركەكان لە ڕۆژئاواوە.

لە پاڵ ئەمانەدا، هەندێ كۆمەڵی بچووكی تریش هەن كە لەگەڵ كوردانلدا هاو سنوورن، وەكو گورجیەكان (كە لازەكانیش دەگرنەوە) و ئەرمەنیەكان لە باكورەوە، ئازەریەكان لە باكووری ڕۆژهەلاتەوە، لوڕەكان لە باشووری ڕۆژهەلاتەوە، توركمانەكان لە باشووری ڕۆژئاواوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣).

ڕوبەری ئەو سەرزەمینانەی دانیشتووانی كوردیان لەسەر جێگیر بووە، لەبارەی مێژووییەوە، هەمیشە لە گۆڕانلدا بووە. ئەم سەرزەمینانە زیاتر شان بەشانی

نەخشەی ژمارە(1) بەراورد لەنێوان ڕووپێوی کوردستان و ئەورووپای ناوەڕاست و ئەمەریکای ڕۆژهەلاتدا

تەنینەوەی کوردان بە دەوروبەردا تەسک بۆتەوە. ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە باری دیموگرافی و مێژوویی و ئابووری هەبووە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤).

لە فەسڵی جوگرافیای بەشەرییدا شیکاریەکی دووری درێژی دەریەدەری و جێگۆڕکێ و تێکەڵاو بوون و توانەوەکان کراوە.

لە کوردستانی باکووردا، کوردەکان ئێستا لە نزیکەی نیوەی ئەو سەرزەمینەدا کە بە وڵاتی ئەرمەنییەکان ناسراوە، واتە ئەو سەرزەمینەی کە دەوروبەر و باکووری گۆلی وان لە تورکیای ئەم سەردەمەدا دەگرێتەوە نیشتەجێن. لەلایەکی ترەوە هەر لە سەدەی نویەمەوە تا سەدەی شانزەیەم، سەرزەمینە کوردنشینەکانی لای ڕۆژئاوا واتا پۆنتوس، کاپا دۆچیا، کۆماجین و سیلیسیا (قیلیقیا)ی ڕۆژهەڵات بەرەبەرە، لە دەست کوردان دەرکران و خرانە سەر قەڵەمڕەوی ڕۆمە بیزەنتی و ئارامییە سووری و دوایی تورکمانەکان و دواتریش تورکەکان. ئەگەر چی ئەم بارودۆخەی دوایین وا خەریکە لەم سەردەمەدا بەرەبەرە ئاوەژوو دەبێتەوە.

سەرزەمینێکی زۆری کوردستان لە باشووری زاگرۆس کە لەناوچەی کرمانشاوە دەست پێدەکا و دەگاتە شیراز (لە وڵاتی فارس/پارس/پارسی) و بەولاوەتریش هەتاهەتایە لەدەست چووە بەهۆی دەربەدەر بوونی کوردەکان و کۆچ کردنیان بەرەو باکووری ڕۆژئاوا و تێکەڵ بوون و توانەوەی بەربڵاوییان لەناو لۆڕەکان و ڕەگەزی تردا.

ئەم پرۆسەیە لە سەدەی نۆیەمەوە بەردەوام بووە و ئێستاش نەبڕاوەتەوە و ئاسەوارەکانی بەزەقی لە لەکەکاندا خۆی دەردەخا کە هەرچەندێکو هێشتا بەزاراوەیەکی کوردی دەئاخاون (بڕوانە زاراوەی لەکی) و پەیڕەوی ئایینێکی تایبەتی کوردی دەکەن (بڕوانە یارسانی)، کەچی لەگەڵ لۆڕەکاندا یەکگیربوونە و لەوان نزیکترن لە چاو کوردەکانی ترەوە (نەخشەی ژمارە ٤). جیاکردنەوەی کوردەکان لەپێکهاتە ئەتنییەکانی دراوسێیان لە باشووری کوردستان ئاسان نییە، واتا لەو شوێنانەدا کە هاوسنوورن لەگەڵ لۆڕەکان لەمیحوەری هەمەدان– کرماشان– ئیلامدا لە سەدەی شانزەیەمەوە کوردستانی یەك پارچە دوو پارچەی گەورەی هاتۆتە سەر هەرچەندە لە ڕوی جوگرافیەوە بە دەمیەوەنین. زۆربەی دانیشتووانی ئەم دووپارچەیە کوردی ڕەهەندەی سەردەمانی کۆنن. پارچەکەی ئەنەدۆڵی ناوەند بریتیە لەسەرزەمینی دەوروبەری شارەکانی یۆناك و هایمانا و جیهانبەیلی خوارووی ئەنقەرەی

پایتەخت هتد (واتا كاپا دۆچیای دێرین)—

نەخشەی ژمارە(4): گۆڕانە سەرەكییەكان لە پێكهاتەی ئەتنی ناوچە كوردنشینەكان لە (3000) ساڵی رابردوودا

ئـەم پارچـەیە دەكـشێتە نـاو ناوچـە شـاخاویەكانی ناوەنـدی بـاكووری ئەنەدۆڵـەوە (واتـا پۆنتۆسی دێرین) و تا سنووری شارەكانی تۆقات، یوزغات، چوروم و ئەماسـیا لـە دەوروبـەری رووبـاری سـەوز (یەشـیل ئیرمـاق) ناوەسـتێتەوە. لەمـە، ناوچـەی ناوەنـدی ژووڕووی ئەنـەدۆڵ ئێستا كوردی زۆرترە لە پارچە كۆنەكەی ئەنەدۆڵی ناوەند. ئەو بەشە زۆر بـچووكەی لێدەرچـێ

کە بە زاراوەی (دیمیلی—Dimila) دەئاخاون، جێی گومانە کەم مەرز و بومە هیچ لە کوردە پۆنتیە دێرینەکانی لێ مابێ کە تا سەردەمی بە زۆر دەربەدەرکردنەکانی سەدەی (٩)ی رۆمە بیزەنتیەکان لەوێ دەژیان.

پارچەکەی تر ئەوی باکووری خۆراسانە و دەکەوێتە رۆژاوای ئێرانەوە و شارەکانی قۆچان و بووجنوردی ناوەند دەگرێتەوە و لەو دەربەدەرکردن و بەزۆر نیشتەجێکردنەوە هاتە کایەوە کە لە سەدەی (١٦)ەوە تا سەدەی (١٨) لە ئێراندا بەردەوام بوو.

لە شەڕی یەکەمی جیهانییەوە کوردستان بەسەر پێنج دەوڵەتی سەر بەخۆدا دابەشکراوە (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ).

لەمانە بەشی گەورە بەر تورکیا کەوتووە (٤٣٪)، ئینجا ئێران (٣١٪) ئینجا عێراق (١٨٪) و سوریا (٦٪). (٢٪)شی بەر یەکێتی سۆڤیەتی جاران کەوتووە.

ئەم وڵاتانە کوردستانیان لە قۆناغی جیاجیادا بەسەر چەند یەکە و کەرتی ئیداریدا دابەشکردوە. لەم یەکانە، تەنها لە رۆژئاوای ئێران، یەکێکیان ناوە مێژوو— ییەکەی هەلگرتووە ئەگەر چی بەناتەواوییش بێ، ئەویش پارێزگای کوردستانە کە شاری سنە پایتەختییەتی.

یەکێك لە ئاکامە هەرە نارەوا و قێزەوەنەکانی دابەشکردنی کوردستان لەنێوان ئەم دەوڵەتە ناتەبا و بلۆکە جیۆپۆلەتیك و بەرژەوەند جیاوازانەدا (بڕوانە فەسڵی جیۆپۆلەتیك) ئەوەیە کە مەرزوبوومی چوار کاتەیان هەیە (ئەگەر خۆراسانی تورکمانستانی بخەینە سەر ئەوە دەبێتە پێنج کاتە). وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش کە چوارجار بەقەی کوردستان پانە مەرزوبوومی چوار کاتەی هەیە. ئەگەر لەباری جوگرافیایەوە وەریگرین، کوردستان وڵاتێکی یەك کاتەیە، واتە بە سێ کاتژمێر پێش گرینویچ دەکەوێت. ئەو سێ کاتژمێرە، ماوەی نێوان پلەی ٣٥ و ٥٠ی رۆژهەڵاتی گرینویچ دەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی کە بەشەکانی رۆژئاوا و رۆژهەڵات دەکەونە سەر هێڵی ٣٦ و ٤٩ لە رۆژهەڵاتەوە، ئەوە بەشێوەیەکی سروشتی دەبێتە وڵاتێکی یەك کاتە.

# چۆن دابەشكاری جوگرافیایی كوردستان نەخشەكێش كەین؟

وەكو هەموو لایەنێكی بوونی نەتەوەیی و پێناسەی تایبەتی كوردان، مەسەلەی لە چ سەرزەمینێك زۆرینەشن دیسانەوە هێشا هەر ناكۆكی و مشتومڕی لەسەرە. لە كاتێكدا نوێنەرانی پێكهاتە ئەتنییەكانی دراوسێیان، بە تایبەتی ئەوانەی لەسەر سەكۆی دەسەلاتن تا بۆیان بكرێ سەرزەمینی بە چڕی كوردنشین تەسكتر دەكەنەوە.

هەرچی كوردەكان خۆیانن زیاتر بەلای زیادەڕۆییدا دەچن لەم بوارەدا.

ئەم بگرەوبەردەیە، كاری شارەزا دەركیەكیانیشی تا ڕادەیەك دژواركردوە بەلام ئەوەی مایەی دلنیاییە ئەوەیە، كەوا پشكنەر توشی سەریەشەیەكی زۆر گەورەنابێ لەم بارەیەوە، چونكە چ كۆن چ نوێ، زانیاریەكی زۆر باش لەبەر دەست دایە كە بێ پەكوپووك كردن كارەكە ئاسان دەكەن.

چ لە سەدەی ڕابردوودا، چ لەوەی ئێستادا گەلێ شارەزاو و زانستگای باوەڕپێكراو لیستەی پڕ لە زانیارییان لە بارەی تیرە كوردەكان و مەلبەند و دابەشكاری و ژمارەیان لەگشت كون و قوژبنەكانی كوردستان داوە (بڕوانە فەسلی تیرەكان)، لە پەنای ئەمەدا لەچەند جێ هەولدراوە ئەم زانیاری و ژمارەگیریانە نەخشەرێژ بكرێن، كە یەكێك لە هەرە چاكەكانیان ئەو نەخشە گەورە ڕەنگا و ڕەنگەیە كە كۆمەلەی جوگرافیایی شاهانەی بریتانیا دایناوە و ناوی ناوە "نەخشەی ڕۆژهەلاتی توركیا لە ئاسیا، سوریا و ڕۆژاوای ئێران لە ڕووی ئیتنۆگرافیەوە-١٩٦٠" كە بەڕێكەوت ڕاستە و ڕاستبە كوردستان دەگرێتەوە. ئەم نەخشە كەم هاوتا و بە نرخە، ئەمڕۆكە پێویستی بە هەندێ دەسكاری هەیە، لەبەر ئەو گۆڕانەی كە بەسەر نەتەوەی ئەرمەن لە دەورووبەری گۆلی وان و هەندێ ئەم شوێن و ئەو شوێنی ئەنەدۆلی ڕۆژهەلات لە جەنگی جیهانی یەكەمدا هاتووە.

لە شەستەكانی سەدەی ڕابردوودا، حكومەتی توركیا دەستی كرد بە پرۆژەیەك كە ناوی "كوی ئینڤانتەر ئیتودلەری Koy Envanter Etudleri واتە پرۆژەی لێكۆلینەوە لەسەر ژمارەبەندیی گوندەكان، ئەم لێكۆلینەوەیە، دوایی لەپاش سالی ١٩٦٧ لە باریرا و دواتریش

هەر تەپس کرا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ژمارەبەندیە زانیاریەکی پڕ بەهای لە بارەی پێکهاتەی ئەتنی وڵاتی تورکیاوە تا دەگاتە ئاستی لادیکان دایە دەست و بوو بەسەر

چاوەیەكی داتاكاری باش (لە كارێكی باش داتارێژكراودا (Nestman) نەخشەكێشییەكی، باوەڕپێكراوی دابەشكاریی ئەتنی ئەو وڵاتەی پێشكەش كردووە (هەرچەندە پارچە دابڕاوەكەی كوردانی ئەنەدۆڵی ناوەندی نەگرتۆتەوە). لەو كارەدا سوودێكی باش لەو پڕۆژەی ژمارەبەندییەی گوندەكان كە حكوومەتی توركیا ئامادەی كردووە و لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ كردووە وەرگیراوە (بڕوانە Ethnic Groups in the Republic of Turkey. P. Andrews. 1968)

ئەو زانیارییەی لە لێكۆڵینەوەكەدا هاتووە دەقاودەقە لەگەڵ نەخشەكەی كۆمەڵەی جوگرافیایی شاهانەی بریتانیا كە لەسەرەوە باسمان كرد، تەنها یەك جیاوازی لێدەرچێ، كە جێی سورسوڕمانە، ئەوەیش ئەوەیە كە لێكۆڵینەوەكەی توركیا سەرزەمینی كوردان لەوەی نەخشەكەی بریتانیا گەورەتر نیشان دەدا. لەوانەیە ئەمە ڕەنگدانەوەی ئەو هەموو تاراندن و ڕەتاندن و سەر لەنوێ نیشتەجێكردنەوانە بێ كە لەساڵانی ١٩٢٩–١٩٣٨دا ڕوویان دا (بڕوانە فەسڵی نیشتەجێكردنە زۆرەملێكان و باری دیموگرافی).

نووسینگەی جوگرافیی هێزە چەكدارەكانی ئێرانیش لە چلەكاندا پڕۆژەیەكی وەكو ئەو پڕۆژەیەی ئامادە كردووە و لە فەرهەنگی جوگرافیایی ئێران لە دە بەرگدا بڵاوی كردۆتەوە (بڕوانە أ. ڕەزمارا ١٩٤٦–١٩٥١). دوابەدوای ئەمە (The Village Gazatteer of Iran)ی دەركرد. (سەنتەری ستاتیستیكی ئێران ١٩٦٨– تا ئێستا بەردەوامە).

حكوومەتی كوكۆنیاڵی بریتانیا لە سەردەمی خاوەنداریكردنی عێراقدا و حكوومەتی فەرەنساش كە ئەویش خاوەندارێتی بەسەر سووریادا هەبوو (بە ناوچەی ئەنتاكیەشەوە بەرلەوەی ساڵی ١٩٢٨ بخرێتە سەر سووریا)، زانیارییەكی پڕیان داوە لە بارەی پێكهاتەی ئەتنیكی ئەو ناوچانەوە و كەرەستەیەكی باشە بۆ دەرخستنی سنوور و بازڕەتی كوردستان.

لەپاڵ ئەمانەدا هەندێ نەخشەی ڕووسكردیش هەن كە لە شەستەكاندا كێشراون و تەنیا زانیارییەكی سەرەتاییان تێدایە. ئەمانە ناوچە كورد نشینەكانیان دەستنیشان كردووە و لەوكاتەوە بوونەتە سەرمەشق و نموونە بۆ لاولایەنی تر، لەوانە نەخشەیەكی ئەتنیكی كە ئاژانسی هەواڵگیری ناوەندی (CIA) ئەمەریكی دەری كردووە. چاكترینی بەرهەمە سۆفیەتكردەكان هینەكانی (Bruk – بڕووك)ن كە بە "Narody Peredny Azil 1960" ناسراون لەگەڵ نەخشەیەكی (١:٥٠٠٠٠٠٠٠)ی هەروەها ( Bruk and Apenchenko- Atlas Narodov Mira

1964) کە هەردووکیان ژمارەی دانیشتووانی چەند بەشی کوردستانیان داوە.

ئەو نەخشانەی لەم کتێبەدا هاتوون پشتیان بەم سەرچاوە باوەڕ پێکراوانە بەستووە.

بۆ زیاتر چوون بەتانی ئەم بابەتانەدا، ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بگەڕێ:

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** *Map of Eastern Turkey in Asia, Syria, and Western Persia (Ethnographical)* (London: Royal Geographic Society, 1906, updated in 1914), with full-color sheet map at 1:2,000,000 scale; *Ethnographische Karte der Türkei: Vilayet Darstellung der amtlichen Türkischen Statistik 1935* (Berlin: Presse E. Zagner, n.d.), with sheet map at 1:2,500,000 scale; S. I. Bruk and V. S. Apenchenko, *Atlas Narodov Mira* (Moscow: Academy of Science, 1964); S.I. Bruk, *Narody Peredney Azii* (Moscow: Ethnographical Institute, 1960), with sheet map at 1:5,000,000 scale; J. F. Bestor, "The Kurds of Iranian Baluchistan: A Regional Elite," unpublished masters thesis, based on the author's field work (Montreal: McGill University, 1979); W. Barthold, *An Historical Geography of Iran* (Princeton: Princeton University Press, 1984); G. Le Strange, *The Lands of the Eastern Caliphate* (London: Cass, 1966, reprint of the 1905 original); H.W. Hazard, *Atlas of Islamic History* (Princeton: Princeton University Press, 1951); L. Nestmann, "Die ethnische Differenzierung der Bevölkerung der Osttürkei in ihren sozialen Bezügen," in Peter Andrews et al., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); *Annual Abstract of Statistics, 1970* (Baghdad: Government of Iraq, 1971); *Statistical Abstract 1973* (Damascus: Government of Syria, 1973); *Population Census 1970* (Damascus: Government of Syria, 1972); Captain Bertram Dickinson, "Journeys in Kurdistan," *Geographical Journal* 35 (1910), with map of Kurdistan at 1:2,000,000 scale; Captain F.R. Maunsell "Kurdistan," *Geographical Journal* 3-2 (1894), with map at 1:3,000,000 scale; Captain F.R. Maunsell "Central Kurdistan," *Geographical Journal* 18-2 (1894), with map at 1:1,000,000 scale; Lieut. Col. J. Shiel, "Notes on a Journey from Tabriz, through Kurdistan via Vân, Bitlis, Se'ert and Erbil, to Suleïmaniyeh, in July and August 1836," *Journal of the Royal Geographical Society* 8 (1838), with map at 1:4,060,000 scale; T.F. Aristova and G.P. Vasil'yeva, "Kurds of the Turkmen SSR," *Central Asian Review* 13-4 (1965).

# دابەشکارییە ناوخۆییەکان

لە ڕووی مێژوو و بنەمای کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەوە، دەکرێ کوردستان بە سەر پێنج وردەبەشدا دابەش بکرێ: کوردستانی باشوور کە کرماشان مەڵبەندی مێژووییەی، کوردستانی ناوەند کە هەولێر، کوردستانی ڕۆژهەڵات کە مەهاباد، کوردستانی باکوور کە بایەزید و کوردستانی ڕۆژاوا کە دیاریەکر مەڵبەندی مێژووییەتی. دوو پارچە دابڕاوە کورنشینەکەی تر کە بریتین لە خۆراسان و ئەنەدۆڵی ناوەند باسێکی تایبەتی و سەربەخۆیان گەرەکە (نەخشەی ژمارە ٦).

بەپێی هەندێ بەڵگەی مێژوویی هەرەهەرە کۆن، کوردستان بەر دوو دابەشبوونی مێژوویی کەوتوە، هەر یەکەیان جۆرەتێکەڵبوون و یەکرەنگبوونێکی ئەتنی بەخۆیەوە بینیوە، ئەم دوو دابەشبوونە مورك و شوێن دەست و کاریگەریی خۆیان بەسەر زاراوەی زمانی و کەلتوورو ئایین و جیهانبینی کورداندا چەسپاندووە. ئەم باسانە بە دوورودرێژی لەو بابەتانەدا تاوتوێ کراون کە لە بارەی زمان و ئایین و ژیانی شارستانی و مەڵبەندە شارستانی و کۆچکردنە مێژوویی و گواستنەوە و جێنشینکردنە زۆرەملیکانەوە دەدوێن.

گەڕی کۆچکردنی چەند سەدەیی و بەردەوامی کوردەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باکووری ڕۆژاوا، لە سەدەی سێیەمی پاش عیسادا یەکێتیی فەرهەنگیی کۆمەڵگای کوردەواریی لێکەوتەوە. بەڵام ئەم یەکیەتییە زۆری نەکێشا، چونکە لەم سەردەمەدا کوردستانی باکوور و ڕۆژاوا چوار سەدەی ڕەبەق کەوتنە ژێر ڕکێفی بیزەنتییەکانەوە و لەو بەشانەی کوردستان دابڕان کە کەوتبوونە ناو دەسەڵاتی ئیسلامەکانەوە. بەمەش ئەو یەکیەتییە فەرهەنگییەی کە خۆی گرتبوو بەرەبەرە هەڵوەشایەوە و کاڵ بووەوە (بڕوانە مێژووی سەدە ناوەندەکان).

هەر لەم هەڵکەوتە خۆیەوە، ئەو سنوور ڕێژیەی باکوور و باشوورەش کەوتەوە کە ئێستا لەنێوان کۆمەڵەی زاراوەکانی کرمانجی لەلایەك و زاراوەکانی دەوروویەری زێی گەورە لە عێراق لەلایەکی ترەوە، بەدی دەکرێ و ئاسەواریشی بەزەقی دیارە.

ئەو سنووررێژییانەی کە لە سەدەی شانزەیەمدا لەنێوان وڵاتی فارس و وڵاتی عوسمانییدا کراون،

Black Sea
CENTRAL ANATOLIAN ENCLAVE
ANKARA
Haymana
Cihanbeyli
Yozgat
Corum
Amasya
Tokat
Sivas
Erzinjan
Erzurum
Ardahan
Kars
Agri
Bayazid
Kelbajar
Lachin
Dersim
Bingol
Elazig
Malatya
Adiyaman
Diyarbakir
Batman
Mus
Bitlis
Siirt
Van
NORTHERN
KURDISTAN
Hakkari
Urmia
Tabriz
Ardabil
Maras
Adana
Antep
Urfa
Mardin
Cizire
WESTERN KURDISTAN
Pinar
Qamishli
Dohuk
Rwandiz
Mosul
Arbil
Aleppo
Latakia
Hama
CENTRAL
KURDISTAN
Kirkuk
Sulaymania
Kifri
Mahabad
EASTERN
KURDISTAN
Bijar
Sanandaj
Hamadan
SOUTHERN
KURDISTAN
Khanqin
Kirmanshah
Malayir
Borujird
Ilam
Pahla
BAGHDAD
Caspian Sea
Rasht
Klardasht
Sari
ALBURZ POCKETS
TEHERAN
Varamin
Qum
Kuhak
TURKMENISTAN
Ashkhabad
Shirvan
Bujnurd
Dargaz
Quchan
Khurasan Prov.
Radkan
Meshhad
KHURASANI ENCLAVE
IRAN
نەخشەی ژمارە (6): حەوت بەشە ناوخۆییە سەرەکییەکەی کوردستان
دابەشکردنی هەرە زوو: رۆژهەلات – رۆژاوا
سنووری ئەو هەرێمانەی لە رووی کۆمەلایەتی – کەلتوورەوە لێکجیان
ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتووانیان کوردن
سنوورە نێودەولەتییەکانی ئەم سەردەمە

بە ئەندازەی سنووررێژییەکانی نێوان بیزەنتییەکان و ئیسلامەکان درێژخایەن و کاریگەر و دابڕکەریوون. هەر خودی ئەم سنوور ڕێژیەشە کەوا بۆتە مایەی ئەو داتلێشانە دیارەی کە لەنێوان ڕۆژەلات و ڕۆژاوای کوردستاندا هەیە، کە لە گۆلی وانەوە دەست پێ دەکا و بە سنووری نێوان عێراق و ئێراندا دەکشێ.

## کوردستانی باشوور

کوردستانی باشوور ئێستا دوا مەڵبەندی زاراوەی گۆرانی – لەکی و ئایینی یارسانییە. لێرەدا تەنها کۆمەڵێکی یەکجاریچووکی دانیشتووان بە کرمانجیی باشوور دەدوێن. تەنانەت لەوانەیە لە فارسیش کەمتر باوبێ هەرچەندە فارس لەو مەرزوبومەدا بە زمانێکی خۆیی دانانرێ. سەرزەمینەکە پڕ شارنشینە و خەڵکێکی هەمە جۆرەی لێ دەژین، دانیشتووانی زۆر بە کۆنینەیی خۆیان دەنازن.

## کوردستانی ڕۆژەلات

بەشێکی زۆری کوردستانی ڕۆژەلات بەتایبەتی ئەوەی دەکەوێتە ئاقاری بیجار– مەریوانەوە تا ئەم دواییە لە رووی فەرهەنگەوە بەشێك بوون لە کوردستانی باشوور. ئێستا کرمانجیی باشوور تاقە زاراوەی باوە و ئیسلامی سونیش ئایینی زۆرینەی خەڵکەکەیە، کە بەپشتەڵەك کۆچەرزادەن و بەشێوەیەکی ئاشکرا لە شارنشینان جیان. ئەمە جووتکەسایەتیی لە ناخیاندا چەسپاندووە. لە کاتێکدا شارگەلێکی وەکو سنە و بیجار و مەریوان بۆنی هەست و کەلتووری کراوەی باشووری کوردستان دەدەن، خەڵکی لادێکان هێشتا پارێزگر و سرکن. هۆی سەرنەکەوتنی گەلێ پارتی سیاسی کورد کە دەسکردی خۆماڵین ئەوەیە کە نەیانتوانیوە سووك و ئاسان هەست و سۆزی هەردوولای کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتەکە بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. بێ هیچ گومانێك وڵاتەکە لەژێر کاریگەرییەکی بەتینی فەرهەنگی ئێراندایە، بەڵام پەیوەندییەکان ئەوەندەی کوردستانی باشوور تێکەڵاو و سفت و سۆڵ نین، بەتایبەتی لەناو گوندنشینیاندا.

**کوردستانی ناوەند:**

ئەم وڵاتە هەمیشە ڕووی لە مێزۆپۆتامیا بووە و مێژووشی بەو سەرزەمینەوە گرێ دراوە. وەکو کوردستانی باشوور، ئەویش ڕابردوویەکی شارستانیانەی هەیە، بەڵام کەشوهەوا و شێوەی خاکی بە هی کوردستان ناچن. کوردستانی ناوەند کەمتر چیاییە و بە مام ناوەندیترین

بەش دادەنرێ لە باری گەرما و سەرماوە. ڕاستییەکەی زۆر جار وڵاتەکە بە "گەرمیان" ناودەبرێ. لە ڕووی فەرهەنگەوە، کوردستانی ناوەند و باشوور بەیەك سەرزەمین دادەنرێن ئەگەر چی باشوور (٥) سەدەی لەژێر دەسەڵاتی فارسدا بردۆتەسەر. (پێش سەردەمی دابەشکاری نێوان عوسمانی و فارس و هەر لەو کاتەوە مێژوو نووسراوەتەوە، کوردستانی باشوور لەباری فەرهەنگەوە ڕووی لە مێزۆپۆتامیا بووە).

ئەگەرچی ئیسلامی سونی ئایینی زۆربەی دانیشوانی کوردستانی ناوەندە، بەڵام لە پەنایدا ئیسلامی شیعەو یارسانی و عەلەوی و یەزیدی و دیان و ئایینی جولەکەش لە وڵاتەکەدا هەن و بوونە. جگە لەمە، هەموو زاراوە سەرەکیەکان لەم سەرزەمینەدا باون و هەموو بەشەکانی کوردستانی لەڕووی فەرهەنگ و جوگرافیاوە پێکەوە لکاندووە.

## کوردستانی ڕۆژاوا

کوردستانی ڕۆژاوا بە دیمەن بەشێکە لە دەریای سپیی ناوەڕاست، ئەگەر چی لە ڕووی جوگرافیاوە سەرزەمینەکە لە ڕۆخەکانی ئەم دەریایەوە لەنزیك ئەسکەندەریەوە دەست پێ دەکا و بەرەو زنجیرە چیای (١١٠٠٠) پێ بڵندی باکووری دەرسیم هەڵدەکشێ. کەشوهەوای گشت ناوچەکە خۆش و پڕ بەرەکەت و سەرتاسەری دارستان و لێرەوارە، لە ڕووی مێژووەوە، هەمیشە ئاوەدان بووە لە مێژەوە، مەڵبەندی شارستانیەت و پڕ لە شاری ئاوەدان و بەناو بانگ بووە لەسەرتاسەری جیهاندا و چاوی بەردەوام لە ڕۆژئاوا و وڵاتەکانی سەر دەریای سپیی ناوەڕاست بووە بۆ وەرگرتنی بابەتی مەدەنیەت و پێشکەوتن. وڵاتەکانی، ئەنتاکیە، ڕۆما، بیزەنتە یان ئەستەموول، هەمیشە سەرمەشق بوونە بۆ ئەم مەڵبەندە.

لەم مەڵبەندە بە ئەندازەی پەیڕەوانی ڕێبازی عەلەوی، ئیسلامی سوننی مەزەبیش هەن. لە ڕووی زمانەوە خەڵکەکە چ بە دیمیلی چ بە کرمانجیی ژووروو دەئاخاون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا پەیوەندیەکی یەکجار لاواز لەنێوان ئایین و زماندا هەیە، ناکۆکی ناوخۆیی ئەوەندە خۆیان لە کاری کۆمەڵایەتی یان فەرهەنگییدا نانوێنن.

کوردستانی ڕۆژئاوا، لە ڕووی یەکیەتیی زەوییەوە لەسەرزەمینی کوردستان دابڕاوە ئەگەرچی سنوورێکی دووردرێژی لەگەڵ کوردستانی باکووردا هەیە، ئەمە لەبەر چۆڵەوانیەتی خودی کوردستانی باکوور لە لایەك و لەبەر کێوستانییەتیی چڕی ناوچەکە کە لێك جیایان دەکاتەوە، لەلایەکی ترەوە.

## كوردستانی باكوور

كوردستانی باكوور نموونەی زەقی و سەختیی سەرزەمین و درِی و دژواری ئاووهەوای كوردستانە.

بەشێكی زۆری ئەم وڵاتە، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی دەكەونە سەر رۆخ و باكووری گۆلی وانەوە سەرزەمینی دێرینی ئەرمەنستانە و روخسارە كوردییە زاڵەكەیان لە كۆتایی جەنگی جیهانیی یەكەمەوە وەرگرتوە. ئەم وڵاتە لەسەردەمانێكدا مەڵبەندێكی كشتوكاڵیی یەكجار گەورەو خاوەن ئابوورییەكی بازرگانی سروشت و شاریازێرپییەكی تەواو روختەبوو. هەموو ئەمانە لەو هەموو شەروشۆرِ و تارلندن و رەتاندن و لێقەومان و قەتلوعام كردن و گۆران و شێوانی سروشتیەدا كە لە پێنج سەدەی رابردوودا بەسەر هەرێمەكەدا هاتن، وێران و خاپوور بوون (بروانە بابەتی سەرەتاكانی مێژووی هاوچەرج و زەوی و زار و سروشت). دانیشتووانی هەرێمەكە دووركەوتووترین، یەكجاری خێڵەكی و لە باری ئابووری و تەكنۆلۆجیاوە پاخستەترینی دانیشتووانی كوردستانن.

ئەگەرچی بازێری وان گەورەترین شاری هەرێمەكەیە، مرۆڤ بە ئاسانی ناتوانێ ناوی بنێ ناوەندەشاری كوردستانی باكوور. لە هەموو هەرێمەكەدا، جگە لە ئاسەواری كۆنە شاری گەورە، شارێكی ئەوتۆنیە كە هی ئاماژە بۆ كردن بێ. كوردستانی باكوور خاوەنی چەندین سەنتەری فەرهەنگی بووە لە رابردوودا. تەنانەت كوچەك بازێرێكی وەكو بایەزید (نۆغو بایەزیدی ئێستاكانە) سەردەمانێك گەورە شارو مەڵبەندێكی فەرهەنگی بووە. ئەم شارە زادەگای ئەحمەدی خانییە، كە ئەتوانرێ بە گەورەترین شاعیری كورد دابنرێ. ئەو دانەری داستانی مەم و زینە (بروانە بابەتی ئەدەب).

## خۆراسان:

لەو دوو پارچە سەرزەمینە كوردنشینەی كە لە خاكی كورد دابراون، خۆراسان كە دەكەوێتە باكووری رۆژهەڵاتی ئێران، خاوەنی گرنگییەكی تایبەتە. ئەم سەرزەمینە پێكهاتەی ئەو بەزۆر گواستنەوانەی سەدەی شازدەیەم تا سەدەی هەژدەیەمە كە لە سەردەمی شاهە سەفەویەكاندا بەسەر كوردەكانی باكوور و رۆژاوای كوردستاندا هاتن. ئەم پارچەیەیان تا سنووری ئێران و كۆماری توركمانستان دەكشێ و لووتی دەگاتە ئەو هەڵەتانەی بەسەر

عەشقابادی پایتەختی تورکمانستاندا دەڕوانن.

بە پانایی هەندی کوردستانی ڕۆژهەلات و بە ژمارەی دانیشتووانی دەگاتە نیوەی ژمارەی دانیشتووانی، لە ئاو هەواشدا، نەرمتر و ژینگەشی کەمتر لە هی کوردستانی باکوور لەوتێنراوە. لە باری شارستانیەوە، چەند شاری گەورەی وەکو قۆچان و شیروان و بوجنوردی تێدایە و خاوەنی کشتوکالێکی پەرەسەندووە.

لە سەدەکانی ڕابردوودا، ئەوەندە دووچاری فرتەنە و لێقەومان نەبووە وەکو ئەوەی زۆرینەی دانیشتووانی کوردستانی باکوور گرفتاری بوون.

داب و نەریتی کوردەکانی خوراسان لە هی سەرزەمینە ئەسڵییەکانیان ناچن، چونکە ڕەتاندنەکانیان بەتەواوەتی هاوکاتن لەگەڵ سەرەتای شێواندنێکی تەواوی کوردستانی باکوور و وێرانکردنی لەژێر پێی لەشکری هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانیدا. ڕەفتاری نەرم و جلوبەرگی سەیری ئەم کوردانە، بۆ نەوەکانی دواڕۆژیان سایشتێك جێ دەهێڵن، کە ئەگەر ئەو وێرانکاریە گەورانە بەرەنگاری وڵاتەکەیان نەبوایە، ئێستا لەچ باوردۆخێکی دەڕوونی سانادا دەبوون.

زۆریەی هەرە زۆری کوردەکانی خۆراسان بە زاراوەی کرمانجی ژووروو دەئاخاون، بەڵام چەندین سەدەی پێکەوەژیان لەگەڵ دانیشتووانی شیعەی دەوروبەرو نزیکیی هەرێمەکە لە شاری پیرۆزی مەشهەد لای شیعیان، خەڵکەکەی بەسەر سوننی مەزەب و شیعەدا دابەش کردووە، ئەگەرچی هەندێ لە دانیشتووان عەلەوی مەزەبن.

سەرزەمینی خۆراسان، هەروەها، مەڵبەندی هەندێ لەکی یارسانی ئایینیشە. ئەمانە لە کوردستانی باشوورەوە لە سەردەمی ئەفشاریەکان و لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا پەڕاگەندەی ئەوێ کراون، ڕاستییەکەی، کەریم خانی دامەزرێنەری پادشاییەتی زەندی لە ئێران، کە دوای ئەفشارەکان هاتەسەر کار، خۆی بە بنەچە ڕۆڵەی یەکێك لەم خانەوادە لەکە ڕەتێنراوانەی هۆزی زەند بوو. پاش ئەوەی چوە سەر تەختی تاوس، کەریم زۆریەی تیرەکەی بردەوە مەرزوبوومی خۆیان. ئەوانەی لەوێ مانەوە ڕۆڵەی لەکەکانی خۆراسان و بیرجەندی قوهستانن.

**ئەنادۆڵی ناوەند:**

بەشە دابڕاوەکەی تر لە ئەنەدۆڵی ناوەند و باکووری ناوەندە لە تورکیا. ئەم هەرێمە بریتیە لەسەرزەمینێکی دووپەلکە و خاوەنی دووکەسایەتییە. پەلکی باشوور بریتیە لەو سەرزەمینە

وشك و برینگ و بێ خێرو بێرەی كە دەكەوێتە ڕۆژئاوای گۆلی (گۆلەخوێ – توز گولو)ی باشووری ئەنقەرەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیە شارەكانیشی هەژار و ڕووت و پەرپووتن.

لەم شارانە جیهان بەیلی، یوناك و هەیمانە جێی ئاماژەن. پەلكی باكووری دەكەوێتە سەرزەویەكی بەپیت وبەرەكەتی دەولەمەند كە زۆریەی هەلـەتی دەوروبەری شارەكانی تۆقات، یوزغات، چوروم و ئەماسیا دەگرێتەوە. هەرچەندە شارەكانی یوزغات و تۆقات، هێشتا زۆریەی دانیشتووانیان كورد نین، بەلام هاكا ناكا گێژەلۆكەی گۆڕان ملیان لێ دەنێ و ڕووكاریان دەگۆڕێ.

پەلكە خوارینە دروستبووی هەمان ئەو ڕەتاندن و كۆچ پێكردنانەیە كەلە سەدەكانی (١٦–١٨)دا هەرێمە كوردنشینەكەی خۆراسانیان پێك هێنا.

پەلكە ژوورینە، بەرهەمی كۆچكاریی بەرەبەرەی كوردانە لەسەرزەمینی ئالۆزو فرتەنەزەدەی كوردستانەوە... ئەم پەلكەیان، تا بلێی ولاتێكی زیندوو پەرەسێنە و خەلكەكەشی باشترین ئاستی ژیانیان هەیە لەچاو كورداندا. ئەمڕۆش پەیتا پەیتا ڕووی لە تەنینەوە و گەشەكردندایە.

زۆریەی دانیشتووانی كوردانی ئەنەدۆلی ناوەند بە زاراوەی كرمانجیی كوردی دەدوێن، لە پال (١٠٪)دا كە بە زاراوەی دیملی دەئاخاون. لە بارەی مەزهەبەوە زۆریەیان سونین، لە پال كەمایەتیەكی گرانی عەلەوی مەزەبدا. دانیشتووانی هەرێمەكە، خۆیان دەبەنەوە سەر لق و پۆپی تیرەی جۆرا و جۆر كە هەر یەكەیان خاوەنی مێژوویەكی قوولن.

لەكاتێكدا خەلكەكە خاوەنی حكومەتی سەربەخۆی خۆیان نین، ئەم لق و پۆپە خێلەكیانە، دەكرێ بە دەزگایەك بشوبهێنرێن كە دەتوانێ جێگەی حكومەت بگرێتەوە و كاروباری خەلكەكە بەشێوەیەك ڕابپەڕێنێ.

ڕاستییەكەی ئەم پێكهاتانە، لەسەر بنەمای هەندێ ڕاستی مێژوویو فەرهەنگی ئەوتۆدانراون كە لە هەزاران سالەوە حوكم فەرماییان لەناوخەلكەكەدا كردووە (بروانە بابەتی تیرەكان) (نەخشەی ژمارە ٧ ).

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:

**General Bibliography**

H.V. Handel-Mazzetti. "Zur Georgraphie von Kurdistan," *Petermann's Geographische Mitteilungen* 58 (1912); Walter Harris, "A Journey in Persian Kurdistan," *Geographical Journal* 6-5 (1895); Major Kenneth Mason, "Central Kurdistan," *Geographical Journal* 154-6 (1919); E. Smith, "Contribution to the Geography of Central Koordistan," *Journal of the American Oriental Society* II (1851); J.G. Taylor, "Travels in Kurdistan, with Notices of the Sources of the Eastern and Western Tigris, and Ancient Ruins in their Neighbourhood," *Journal of the Royal Geographical Society* 35 (1865); Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895).

نەخشەی ژمارە (7): دابەشکاری کوردستان لەسەر بنەردتی ناوچە هەرە گەورەکان

# فەسڵی دووەم

## سەرزەمین و ژینگە

کوردستان، لە ڕووی پێکهاتەی جیۆفیزیاییەوە، بەشاخاویەتیەکەی جیا دەکرێتەوە. کوردستانی ئێستا پێك دێ لەناوچەکانی ناوەند و باکووری زاگرۆس، لە (٣/٢)ی ڕۆژهەلاتی چیاکانی تۆرۆس و پۆنتۆس و نیوەی بەشی باکووری چیاکانی ئەمانۆس. دوویەشە گەورە و دابڕاوەکەی سەرزەمینی کوردان بریتین لە هەڵەتەکانی ریوەند (ریڤەند)ی کلکەی ڕۆژهەلاتی زنجیرە چیای ئەلبورز کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی باکووری ئێرانەوە لە هەرێمی خۆراسان، هەروەها ناوەڕاستی زنجیرە چیای پۆنتۆسی ناوەند و باکووری ناوەندی ئەنەدۆڵ، کە نزیکە لە ئەنقەرەی پایتەختی تورکیا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٨).

هەروا بێتەوە، لە چەند سەدەی ڕابردووەوە چەند پارچەی بچووکی دیکەی خاکی کورنشین لە هەڵەتە بورکان پژێنەکانی بلووچستانی ڕۆژاواوە تا دەگاتە ناوەڕاستی زنجیرە چیاکانی ئەلبورز لە باکووری ئێران هەبوونە، ئەم پارچە پارچانە هەر بەو ئاراستەیەدا تا چیاکانی (ئولۆ)ی کەناری دەریای ئیجە لە ڕۆژاوای تورکیا دەکشێن.

لە کوردستانی یەکپارچەدا، هەروەها لە بەشە دابڕاوە کورنشینەکاندا، چیاکان تاقە نیشانەی سروشتی گرنگی وڵاتەکەن و بوونەتە دروستکەری مێژوو و پێکهاتەی نەتەوەیی و داب و نەریت و فەرهەنگی کوردان.

ڕاستییەکەی، لەگەڵ تەواویوونی چیا و هەڵەت و دەسپێکردنی دەشتایی و نەرماندا، بوونی کوردیش یەکسەر دێتە دومایی.

زۆربەی چیا بەرز و لووتکە سەرکەشەکان دەکەونە باکووری کوردستانەوە. هەر وەکو ویلیام ئیگلتن پەسنی دەدا ئێرە وڵاتی "لافاوی بەخوڕ و چۆمی قووڵ و ئاودار و پردی

هەڵواسراوە".. کوردستانی ناوەندیش، لە بڵنداییدا مام ناوەندە، ئاو و هەواشی، لە هەموو کوردستان خۆشتر و نەرمترە، بەشەکانی تری سەرزەمینەکە لەنێوان ئەم

نەخشەی ژمارە (8): سیستەمی چیاکانی باشووری ڕۆژاوای ئاسیا

دووشێوە كەش و هەوایەدان. چیاكانی كوردستان دەڵێی شوورەی سروشتن لەبەردەم هەردوو بانی[2] كاكی بەكاكی ئێران و ئەنەدۆڵ لە ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵاتەوە كە هەردووكیان لە بیابانی عەرەبستان لە باشوور و باشووری ڕۆژاواوە و لە دەریای ڕەش لە باكوورەوە جیا دەكاتەوە.

بەشی هەرە تۆكمەی زنجیرە چیایەكە بە درێژایی سەرزەمینی كوردستان وەكو بڕبڕەی پشت لەم سەری وڵاتەكەوە بۆ ئەوسەری دەكشێ.

لووتكە هەرە بەرزەكانی چیاكانی كوردستان بریتین لە ئەڵوەند لە باشووردا (ئێران) كە ١١٧٤٥پێ بەرزە و هەڵگورد (یان ئەلگورد) لە باكووری ناوەندی كوردستان (عێراق) كە ١٢٢٤٩پێ بەرزە و چیای مونزور لە ڕۆژاوا (توركیا) كە ١١٧٤٤پێ بەرزە و چیای ئەرارات لە باكوور (توركیا) كە ١٦٩٤٦ پێ بەرزە (نەخشەی ژمارە ٩).

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:

**Further Readings and Bibliography:** Y. Abul Haggag, "North-east Iraq: A Physiographical Study," *Bulletin de la Societe de Geographie d'Egypte* 33 (1960); H. Bobek, "Forshungen im Zentralkurdischen Hochgebirge zwischen Van- und Urmia-See (Sudest-Anatolien und West-Azerbaidjan)," *Petermann's Geographische Mitteilungen* 84 (1938); R. Clayton, "The Mountains of Kurdistan," *Alpine Journal* (1887); Francis Halley, "The Gorge of the Qal'a Cholan and its Confluence with the Lesser Zab. Notes of a Tour in South Kurdistan in 1921," *Geographical Journal* 86-2 (1935); Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895).

---

[2] بان، هضبة plateau بڕوانە بانی مەقان، بانی زالیاو، بانی نەرمە- وەرگێڕ.

Mt. Jam (10,010 ft.)
Mt. Chāldir (10,485 ft.)
Great Ararat (16,946 ft.)
Little Ararat (12,870 ft.)
Mt. Rashkoh (12,336 ft.)
Mt. Halgurd (12,249 ft.)
Mt. Alvand (11,745 ft.)
Mt. Bisitun (11,014 ft.)
Mt. Shāwa (11,122 ft.)
Mt. Subhān (13,314 ft.)
Mt. Nimrod (9,567 ft.)
L. Van
Mt. Judi (6,436 ft.)
Mt. Sanjār (4,985 ft.)
Mt. Munzur (11,644 ft.)
Tur Abdin (4,774 ft.)
Nemrut Dāgh (8,556 ft.)
Mt. Elbistān (10,108 ft.)
Kurd Dāgh (3,606 ft.)
نەخشەی ژمارە (9): بەرزی و نزمی زەوی
لە 10000 پێ بەرزتر
10000 - 7000
7000 - 5000
5000 - 3000
3000 - 2000
2000 - 1000
لە 1000 پێ کەمتر

# جیۆلۆجیای زەوی

لە ڕووی جیۆلۆجیاوە، زەوی كوردستان یەكجار بزۆكە. ئەم زەوییە خۆی بەسەر ئەو ناوچە دابەشكەرەدا داسەپاندوە كە دەكەوێتە نێوان لێكدانی سەرزەمینی یۆرۆئاسیا و ئەفەریقا و ئەو پێكهاتە زەمینییانەی كە لێیەوە كەوتوتەوە. لەناوچەكەدا سەرزەمینی عەرەبستان، لەسەرزەمینی ئێران و ئەنەدۆڵ سالانە چەند گرێ لێك دووردەكەونەوە. سەرەنجام چیاكانی زاگرۆس و كوردستان كە نووكی لێكدانە لەنێوان هەردوو سەرزەمینەكەدا، دەكەونە ژێر فشارەوە و ساڵی چەند گرێ دەكشێنرێنەوە، ئەم پاڵە پەستۆ كیشوەرگیرە كە نزیكەی (١٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەستی پێ كردووە، سەرزەمینی كوردستان لە قووڵایی دەریای (تەثیث)ەوە كە باشووری ڕۆژاوای ئاسیای داپووشیبوو، بەرەو بانتر تەس دەدا و هێشتا هەر بەردەوامە و لە بڵندیی چیا تازە دروستبووەكانی كوردستان زیاتر دەكا.

ناوچەی جیۆلۆجیی پێدەشتەكانی كوردستان كە لەگەڵ بیابانی عەرەبدا لێك دەدەن لەبنەڕەتدا تەواوكەری ئەو زەوی سازیەیە كە خۆی دەباتە دەورووبەری نۆكەندی فارس— كە خۆی لە خۆیدا پاشماوەی دەریای (تەثیث)ە كە پڕە لە هایدرۆكاربۆنات. ئەم زەوی سازیانە، بێ گۆڕانێكی ئەوتۆ لە كەناری ڕۆژهەلاتی دەریای سپیی ناوەڕاست و لە نزیكی ئەنتاكیەوە مل دەنێن تا خۆیان لە تەنگەی هورمز دەدەن، لە ڕاستیدا ئاوەكانی نۆ كەندی فارس، لە ڕووی جیۆلۆجییەوە، سەردەمانێك تا ئەم دواییەش تا دەگەیشتنە هەڵەتەكانی وڵاتی كوردستان شەپۆلیان دەدا تا خۆیان دەگەیاندە زەریای هیندی بەرەو دەریای سپیی ناوەڕاست و دەریای ئەتلانتیك و بەم جۆرە یۆراسیایان لە ئەفەریقا و عەرەبستان جیاكردەوە. كەواتە دەتوانین بڵێین ئەو تەنگە جیۆلۆجییە بە پیترۆڵەی نۆكەندی فارس دەكرێ بكرێ بە دەرەنجامی ئەو سامانی نەوت و گازی سروشتییەی كە وان لەژێر ژێری چینە زەمینییەكانی خاكی كوردستاندا.

هەڵچوونە مەزنە بوركانییەكان بەشێكی زۆری سەرزەمینی كوردستانیان لە باكوور و باكووری ڕۆژهەلات سفتوسۆداوە. لە چیای ئەرارات، چ لووتكە بەرزەكان، چ ئەوانەی نزمترن، هەروەها لە چیای نەمرووود (یان نیمروت داغ)ی سەر گۆلی وان سێ دەرەنجامی زەقی ئەم

بزاڤە نەسرەوە جیۆلۆجیەن، هەروەها هەردوو گۆمی وان و ورمێش پێکهاتووی ئەو کۆسپ و بەنداوە سروشتیانەن کە لە ئاکامی ئەو گۆڕانە جیۆلۆجیانەوە هاتوونەتە دی کە لە رابردوویەکی نزیکدا ڕوویان داوە. ئەوانەی لێدەرچێ، سەرزەمینەکەی تر هەموو بەو زەوی قلێشانەوانە هاتوونەتەدی کە بە کوردستاندا لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر ڕوویان داوە بەتایبەتی بە ئاراستەی باکووری ڕۆژئاوا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتدا، ڕۆژاوای کوردستانی لێدەرچێ کە ئاراستەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا دەکشێ. کەف و خڵتەدەردانە بورکانییەکان زەوی کوردستانیان بە کانزای بەپیت و سامان بەرەکەتدار کردوە (بڕوانە سەرچاوە سروشتییەکان). هەروەها سەرزەمینەکەیان بە ڕەنگی جۆرا و جۆری خاك و بەرد و تاوێرە شاخی جوان نەخشاندووە کە هەمیشە مایەی سەرنج و سەرسووڕمانی ئەو کەسانەن کە لە وڵاتانی بێگانەوە یەکەمجار پێ دەنێنە خاکی کوردستانەوە. ئەم جیۆلۆجیا نەسرەوە لە هەمان کاتدا کوردستانی کردووە بە سەرزەمینێکی بوومەلەرزە ئۆست. یەکێك لە دەرنجامەکانی ئەمە ئەوەیەکە کەمتر ئاسەوارە ئەرکیۆلۆجییەکان بەپێوە ماون. لە کەنگاوەری کوردستانی باشوور، پەرستگە مەزنەکانی ئەناهیتای خواوەندەژن شایەتێکی گەورەی هێز و خۆڕاگریی ئەم ئاسەوارانەن. هەرچەندە ئنگەکانی بە هەرچوار لادا هەڵدراون و پێپلیکانەکانی بەو ناوەدا پەرشوبڵاو بوونەتەوە و سەکۆ مەزنەکانی و لادیوارە زلەکانی بەم لاو بەولادا هەڵاژاون، بەڵام هەموو پێکەوە شایەدی (٢٢٠٠)ساڵی ڕەبەقی بوومەلەرزەی یەك بینن.

پەیکەرە زلە کون کون بووەکانی چیای نەمرود داغ (ئەمە ئەو چیای نەمرودە نییە کە لەسەرەوە باسی کراوە) کە دەکەوێتە باکووری ئادیەمانی ئەوپەڕی ڕۆژاوای کوردستان، نموونەی تری ئەم ڕاستییەن. چیرۆك و داستانەکانی سەر زاری دانیشتووانی شار و لادێکان کە دەڵێن گوایە زەوی قلێشاوەتەوە و شار و گوندەکانی هەڵلووشیوە هەموو باسی ئەم بزاڤە جیۆلۆجیە دەکەن کە بە درێژەی چەندین سەردەم هاتوونەتە سەر بەرەی بوون.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Celâl Sengör, *The Cimmeride Orogenic System and the Tectonics of Eurasia* (Boulder: Geological Society of America, 1984); *The International Petroleum Encyclopedia*; Christopher Ryan, *A Guide to the Known Minerals of Turkey* (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960); I. Altin et al., "Ölçekli Türkiye Jeoloji Haritasi" ("Explanatory Text of the Geological Map of Turkey"), sheets published loose at 1:500,000 scale for each Turkish province, accompanied by explanatory texts (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960-70); *Seismotectonic Atlas of Iran* (Teheran: Geological Survey of Iran, 1976); Herbert Wright, "Geologic Aspects of the Archaeology of Iraq," *Sumer* XI (1955).

# ئاو و هەوا و ڕێژەی باران بارین

پلەی گەرما لە كوردستان زۆر بەگوێرەی بڵندایی شوێنەكان دەگۆڕێ و تا مرۆڤ بە ناوچە شاخاوییەكانی ناوەندد‌ا زیاتر هەڵگژێ، ئەوەندە پلەی گەرما نزمتر دەبێ. هاوینی شوێنە نزمەكان لەوانەیە لەڕادەبەدەر گەرم و نیمچەشێداریی، بەڵام لەو ناوچانەدا كە دەكەونە دووتوێی چیاكانەوە تا بڵێی فێنك و خۆش هەوا دەگوزەرێ. زستانان، ئەو شوێنانەی لێدەرچێ كە بەسەر دەشتەكاندا دەڕوانن، تا بڵێی ساردو بەفراوی دەبێ (نەخشەی ژمارە ١٠).

ئەم جیاوازیە لە ئاو هەوادا، بەهۆی وێران كردنی یەك لە دوای یەكی دارستان و لێڕەوارەكان و زۆر بەكارهێنانیان وەكو لە وەرگەی ئاژەڵەوە هاتۆتە دی- زۆر جێگاهەن كە تا ئەم چەندانەی دواییش بە ئاو هەوای خۆش ناسرابوون، ئێستا وشك و برینگ بونەو بونەتە دەشت و دەری ڕووتووقووتی لە تاوساندا ئاگریارێن و لە زستاندا شەختە و بەستەڵەكاوی زۆریەی سەرزەمینەكانی كوردستانی باكوور لە ئەنەدۆڵ پلەی گەرمییان لەزستاندا خۆی دەدا لەژێر سفر، و ئەمەش بڵندایییەكان دەكا بە یەك پارچە بەستەڵەك. ئەم جۆرە شوێنانە نزیكەی (٥٪)ی وڵاتە پێكدێنن. ئەو شوێنانەی پلەی گەرمای ساڵانە تێیاندا نزمە و دەكەوێتە نێوان پلەی بەستان و "٥" پلەی ژێر سفرەوە (٤٠ فەهرەنهایت) ١٥٪ی سەرزەمینی كوردستان پێكدێنن. ئەم ناوچانە سەرەتا لە كوردستانی باكوورەوە لە توركیا دەس پێ دەكەن و بەرەو ئێران دەكشێن بەڵام پەل بەرەو باكووری ڕۆژئاوای كوردستانیش دەهاون، واتا بەرەو دەرسیم، لەوێشەوە بەرەو عێراقیش ڕەت دەهاون. دەتوانین بڵێین لە دوانزە مانگی ساڵ، حەوت مانگی بەفراوی دەبن. هەردوو شاری قارس و ئەردەهان دەكەونە ناو ئەم ناوچەیەوە. لە كوردستانی باكوور مانگەكانی زستان بەگشتی ساردترن لە ئەنكۆراج و جانۆ و ئەلاسكا.

ئەو باس و خواسە خۆشانەی كە زینۆفۆنی مێژوونووسی یۆنانی، كە خۆی و (١٠) هەزار سەربازە یۆنانێكانی ئاوەڵی نائومێدانە بە كوردستاندا و بەناو بەفر و بەستەڵەكەدا بەرەو وڵاتی خۆیان ساڵی (٤٠١ ی پێش زایین) گێڕاونیەتەوە (ئەناباسیس بەشی چوارەم، ١-٣)، و هەڵمەتەكەی دوو سەد ساڵی دوای ئەوەی ڕۆمەكان كە بەسەركردایەتی (لوكوللو)

كراوە و پلوتارك گێڕاویەتەوە، هەموو باسی ئەو هەموو ڕەنج و كوێرەوەرییە دەگێڕنەوە كە هەردوو لا بە دەست سروشتی سەخت و سارد و نالەباری وڵاتەكەوە كێشاویانە.

پلوتارك دەڵێ: ئەو ساڵە زستان لە كۆتایی مانگی ئەیلوولەوە داهات و سەرەتای بە زریان و فرتەنە و بەفر بارانی بەردەوامەوە دەستی پێكرد. تەنانەت ئەو ڕۆژانەش كە ئاسمان ساف و بێ هەور بوو، كەش و هەوا ئەوەندە ساردی دەكرد كە هەرچی كانیاو و جۆگە هەبوون دەیانبەست و مستێ ئاو بۆ خواردنەوەی ئەسپەكانیش بە ئاسانی دەست نەدەكەوت. ڕێگاویان هەمووی دەگیرا و كەڵكی تێپەڕبوونی پێدا نەدەماو قڕان دەكەوتە ناو ئەسپەكان. لەشكری ڕۆمەكان هەڵگەڕایەوە و مەسەلەكە لە بەرەودوا كشانەوە بەولاوە كەڵكی پێوە نەما.

دوای ئەوە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا، ماركۆپۆلۆی گەڕیدەی ڤینیسیانشین باسی ساردیی ئەو سەرزەمینەی بەوە كردووە كە لە هەموو ڕادەیەك بەدەرە (Travels I.vi).

لە بەشەكانی تری باكووری كوردستان پلەی نزم خۆی دەدا لە ٥–١٠ پلەی سەنتگیراد (٤٠– ٤٨ فەهرنهایت)، هەروەها گەلێ بەشی تری ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵاتی كوردستان لە هەمان ئاستدان. ئەمە لە باشوورەوە تا هەمەدان بەهەمان شێوەیە.

ئەم هەرێمە كەش و هەواییە نزیكەی ٢٠٪ی خاكی كوردستان دەگرێتەوە، شارەكانی دەرسیم و بتلیس و مووش و بینگۆل و ئاگری و وان و حەكاری و قەلادزێ و بیجار و سەردەشت و مەریوان و بانە و هەمەدان، دەكەونە بازنەی ئەم هەرێمەوە. لە هەموو ئەم ناوچەدا زۆربەی ساڵان، ساڵی پێنج مانگ بەگشتی بەفر دەكەوێ.

لەوانەیە خۆشهەواترین بەشی كوردستان، ئەوەبێ كە خاوەنی نزمترین پلەی گەرمای (١٠– ١٥ پلەی سەدی واتە ٤٨–٥٧ی فەهرنهایت) بێ.

ئەمە پانترین هەرێمی یەكپارچەی كوردستان واتا ٤٠٪ی كوردستان پێك دێنێ بە نزیكەی (٣/٢)ی كوردستانی باشوور و نیوەی كوردستانی ڕۆژاواوە. هەردوو بەشە دابڕاوەكەی ئەنەدۆڵی ناوەند و خۆراسان، بەشێوەیەكی گشتی بەر ئەم هەرێمە دەكەون. ئەم هەرێمە بازێڕەكانی مەلاتیە، ئادیەمان، عێنتاب، ئەلازیگ، زاخۆ، دهۆك، ئامێدی، هەڵەبجە، مەهاباد، سەقز، سەنەندەج، كرمانشاه، شاهئاباد و كەنگاوەر و قۆچان و بوجنورد و شیروانیش (لە بەشە دابڕاوەكەی خۆراسان) و جیهانیەیلی و هەیمانا، پۆلاتلی، یوزغات و تۆقاتیش لە (بەشە

دابڕاوەکـەی ئەنـەدۆڵ) دەگرێتـەوە، (بڕوانـە شارنـشینی و ناوەنـدە شارنـشینەکان). لـەم هەرێمانەدا لەوانەیە بەفر ساڵی چوار مانگ بە هەندێ شوێنەوە هەبێ.

کام هەرێمی سەرەکیی کوردستان دەگری لـە رووی گەرمییـەوە دەبـینی لـە پلـەی نزمـی وەکو ١٥–٢٠ پلەی سەدی (٥٧–٦٥ پلەی فەهرنهایت)دایە. هەموو کوردستانی سوریا، نیـوەی کوردستانی ناوەند لـە عێراقدا، نزیکـەی ١٥٪ی کوردسـتانی ڕۆژاوا دەکەونـە ئـەم هەرێمـەوە. هەرێمەکـەش شـارەکانی دیاربـەکر، سـێرت، مـاردین، ئورفـە قامیـشلی، عـەفرین، سـنجار، سولەیمانی، هەولێر، قەسری شیرین، ئـیلام، گیلان و پەهلـە دەگرێتـەخۆی. لێرەدا، لەوانەیـە ساڵی هەر (٢) مانگ بەفر بکەوێ.

هەرێمێکی یـەکجار بـچووك کـە کـەمتر لـە (١٠٪)ی وڵاتـی کـوردان پێکـدێنێ و بریتییـە لـەو تیلماسکەی خاکی کوردستان لە پێدەشتە نزمەکانی دراوسێی لێك دەکاتەوە تێیدا پلەی گـەرما خۆی دەدا لە (٢٠–٢٥٪ واتە ٦٥–٧٤ف). زۆربەی زۆری ئـەم ناوچـەیە دەکەوێتـە کوردسـتانی عێراقەوە، شارە گرنگەکانی کـەرکووك، کفری، دووزخورمـاتوو، خانـەقین، مەنـدەلی، بـەدرە و میهـران، کـە بـە ڕەز و بـاخی زەیتـوون و هـەنجیر و هـەنار و میـوە پرتەقاڵییـەکان بـەناوبانگن دەکەونە ئەم هەرێمەوە.

زۆر بە پێچەوانەی بەشەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بەفر و باران لە کوردسـتاندا هـەم ڕێکوپێك و هەم زۆریشە و لەسەر سیستەمی دەریـای سـپیی ناوەڕاسـت دەڕوا و زۆرتـریش لـە زستان و بەهاردا دەبارێ. زۆربی بارینەکە لە شـێوەی بـەفردا دەبێـت، کـە جـاری وا هەیـە (٦) مانگ دەکێشێ لە هەندێ جێگا، ئەم بەفربارانە دەبێتە مایەی بەستانی زۆربەی جۆگە و گـۆل و شەتاوەکانی ناو زۆزانە هەرە بڵندەکان.

لـە هاوینـدا کـەمتر بـاران دەبـارێ، بـەڵام لەبـەر توانـەوەی بـەفری کوێـستانەکان، ئـاوی ڕووبارەکـان دەگاتـە ئەوپـەڕی پلـەی بـەرزی لـە هاوینـدا و بەمـە ئـاوێکی زۆر و زەوەنـد بـۆ کاروباری ئاودێری فەراهەم دەبێ، (بڕوانە سەرچاوە سروشتییەکان: ئاو).

ڕێژەی باران لە زۆزانـە ناوەنـدەکان دەگاتـە (٥٠– ٨٠) گـرێ لـە سـاڵێکدا و تـا بـەرەو ژێـر شۆڕبێتەوە ڕووەو سـنوورەکان بەرەبـەرە نـزمتر دەبێتـەوە تـا دەگاتـە ٢٠–٤٠ گـرێ. نـزمترین ڕێژە لەو ناوچانە دەبارێ کە دەچنە سەردەشتەکانی میزۆپۆتامیا (بڕوانە نەخشەی ١١).

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography**: British Naval Intelligence Division's *Geographical Handbook* series on Iran, Iraq, Turkey (2 vols.), and Syria (1940-43); X. de Planhol, "Limites antique et actuelle des cultures arbustives mèditerranèennes en Asie Mineure," *Bulletin de l'Association de Gèographes français* 239-40 (Paris, 1954). Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895).

# ژینگە و ژیاناسی

لە (١٠٠) هەزار ساڵی ڕابردوودا، کوردستان چەند دەورەی وشکی و تەڕی بە خۆیەوە بینیوە، ئەمەش دەرەنجامی زیاد و کەمیی شینایی و گۆڕانی قووڵ لە سروشتدا و زیادبوونی زیندەوەر و گیا بووە لە هەرێمەکەدا.

لە پۆپەی دوایینترین چاخی بەستەڵەکدا، سەرزەمینێکی فراوان لەناو هەڵتە بەرزەکاندا وشک هەڵاتن، ئەمەش چ لەبەر سەرمای لە ڕادە بەدەر، چ لەبەر داپۆشرانی بەرزاییە لووتکەشەکان بە بەستەڵەک. هەرچی ناوچە نزمەکان بوون،، لەبەر گۆڕانی سنوورەکانی کەش و هەوا و زیاتر بەرەو ژێر داکشانی جۆگەلە و شەتاوەکان، کەمتر بەر ڕێژنەی بەفر و باران کەوتن.

لەو سەردەمەدا کە ئاژەڵ و بەر و بووم لە کوردستاندا لەسەردەستی مرۆڤ کەوی بوون، واتە سەردەمێك کە دەگەڕێتەوە بۆ (١٢) هەزار ساڵ لەمەوبەر، هێشتا سەرزەمینێکی فراوان بە بەستەڵەك داپۆشرابوو و کەوتنی بەفری زۆر و بارینی بارانی بەخوڕ باو بوون. ئەمە لەگەڵ هی ئەم سەردەمەدا زۆر جیاواز نەبوو، هەرچەند لە ڕووی وەرزەوە زۆر لە ئێستا جیاواز بوو. لە سروشتی ئەو سەردەمەدا، گیا سەر ڕوی زەمینی داپووشیبوو، ئەمە ڕوخساری باوی ئەو چەرخەبوو، بە تایبەتی گیا و گوڵی دانەوێڵەبەخش و گژوگیای پەلك پان، هەروەها گیای پۆلکەدار و گوڵی جۆراوجۆر (بڕوانە ٣٢٩– ٣٣٤ / Wright ١٩٦٨).

مێگەلی گەورەی مەڕ و بزن و بەرازی کێوی و شێرداره گۆشتخۆرەکان و باڵندە کۆچکەرەکان لەسەر بەروبوومی سەرزەمینەکە دەژیان. هەرێمەکە، مەڵبەندی دوو داهێنانی تازەسازی یەکجار شۆڕشگێڕ بوو لە تەکنۆلۆجیای ژیاندا، واتە کشتوکاڵ و کەویکردنی ئاژەڵ..... هەر لەبەر ئەم هۆیە سەرزەمینی کوردستان و دراوسێکانی لەسەرزەمینە نزمترەکان وەکو مێزوپۆتامیا و سوریا و فەلەستین ناوبانگی مێژوویی "کەوانەی بەپیت" یان وەرگرت (بڕوانە سەرەتای پێشکەوتنی تەکنولۆژی).

دوا ڕووداوی لابەلای گرنگ لە گۆڕانی کەش و هەوا و ژینگەدا ئەوە بوو کە (٨٠٠٠) ساڵ

لەمەوبەر روویدا، ئەوە بوو شەختەبەندان و بەستەڵەك وەكو دیاردەیەك بە تەواوەتی كۆتاییی‌یان هات و كەش و هەوا بە تاو بەلای تەشقشكاندا هات و هەوری باراناوی بەری ئاسمانیان گرت و شەتاوان روویان كردە باكوور.

ئەم دیاردە ئاسیاتەبارە، نزیكەی ٦٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر چوەتە ئەو بانە كاكی بەكاكییانەی ئێرانەوە كە دەكەونە رۆژهەلاتی كوردستانەوە، و لەوێ گۆمی گەورەی ئاوی بنزەمینیان دروست كردووە، دەرنجامی ئەمە ئەوە بوو بارانی بە خوڕ و گوڕی زستان و بەهار هاوینەبارانیشی هاتە سەر و سەری چیاكانیان شۆردەوە و هەرچی شەختە بەندان و بەستەڵەك هەبوو بە پەلە توانەوە و شینایی و گیاوگوڵ. هەموو یاڵەكانی كوردستانیان داپۆشی.

دەشتی رووت و سارد و سڕ لە هەندێ جێ و كەم گیا لە جێی تر، بە دارستانی چڕی گەز وسنە بەر و عەرعەر و سەروو چنار و بی و سوورە چنار و لە هەموویان گرنگتر داری كەستانە و بەروو داپۆشران. لە شیوو دۆڵەكاندا، كە كەمتر كەوتبوونە بەرپێی مرۆڤ و ئاژەڵ، داری میوەی ناوكدار و بێ ناوك بە زۆری بڵاوبوونەوە، زیندەوەری تازە هاتووی وەكو ورچی بۆر و رەش، لەناو دارستانە چرەكاندا لانەی چاكیان بۆ خۆیان دیتەوە، ئیتر شوێنە سەخت و یەكجار بڵندەكان بوون بە پاوانی گەورە گەورە.

وەرزەبای ئاسیایی ٤٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر دەستی كرد بە كزبوون و ئینجا نەمان و كشانەوە بەرەو باشوور، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی هاوینەباران ئیتر ببڕای ببڕای جارێكی تر لەسەرزەمینەكە دانەكاتەوە، لەكاتێكدا شینایی لە بەرزاییی‌یە هەرە بڵندەكانی كوردستان ئەوەندە بەم باران بڕانە پشت شكێنە شێلوو نەبوون (لەبەر فێنكیی ولاتەكە خۆی و لە ئەنجامدا كەمتر شێ لە دەستدانی زەوییەكان). زەوی و زاری شیوو دۆڵەكان لە بارێكی ناسكدا مانەوە، هەر ئەم بارە دژوارە، هەڵەتەكانی دەستی ئەوبەری لە ئێراندا بە وێران كردن وێران كرد. شایانی باسە ئەم وشكە ساڵیە درێژ و لەسەرخۆیە تا ئەمرۆكەش هەر بەردەوامە، هەندێ ئەدەبیاتی مێزۆپۆتامیا كە لە ئاسەوارە بەردینەكان وەرگیراون و باسی داستانی ٤٠٠٠ ساڵەی لەمەوبەری گیلگامش دەكەن، كە دێنە سەر باسی زاگرۆس بە "ولاتی جەنگەڵستانی چڕی گەزەلان" ناوی دەبەن كە "بەهەر چوارلادا دەهەزار فەرسەخ دەڕوا" (بڕوانە فەرهەنگی میللی و ناسنامەی نەتەوەیی).

داستانەکە دیسانەوە دەکەوێتە باس و دەڵێ: "ئەوان پێکەوە بەرەو دارستانەکە شۆڕبوونەوە لەوێشەوە بۆ چیا سەوزەکە ڕۆیشتن، لەوێ بێدەنگ دانیشتن هەردووکیان بە مەدهۆشی و کەڕولاڵ ئاسا چاویان بڕیبوە دارستان و چیاکەی بەرامبەر کە سەرتاپا باڵا بەرگی سەوزی سنەوبەری پووشیبوو ئەو لووتکە بەرزانەی کە دەتگوت نەزەرگای خوداوەندەکانن. سنەوبەرە بە ئاسمانداچووەکان بەرسنگی چیاکانیان داپووشیبوو و بەرپێی خۆیان کردبوو بە ساباتێکی یەکجار دلڕفێن، کە مرۆڤ پڕ بەدڵ ئارەزوی حەسانەوەی تێدا دەکرد، چ چیاکە چ وردە تەختاییەکانی بەرسنگی بەرگێکی سەوزی گیا و گوڵیان کردبوە بەر.

دەبێ بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمانە، ئەم دارستانە چڕ و ڕەشانەی ناو چیاکان سەرچاوەیەکی بێ بنی دار بوو بن بۆ خانوو و بەرە دروستکردن و بۆ خەڵووزی کورە خشتەکان و بۆ بەکارهێنانی تری ناوماڵ. بەڵام مەسەلەکە زۆری نەخایاند چونکە سەرچاوەکە دویماکار هاتە بن ڕاستییەکەی لەگەڵ سەرەتای یەکەم هەزارەی پێش زاییندا، دارستانە سەروەکانی زاگرۆس (کونار لە کوردییدا)، ئەوەندە کەوتنە بەر فەوتاندن (هەندێ جار بوون بە قوربانیی گۆڕانی کەش و هەواش)، کە گێڕانەوەکانی دواتری داستانەکە، "دارستانی سەروەکە" دەباتە لوبنان– هەرچەند لە ڕووی جوگرافیاوە هەردوو شوێنەکە گەلێك لێك دوورن، چونکە لەوکاتەدا سەروێکی زۆر بە چیاکانی لوبنانەوە مابوون. ئەوی ڕاست بێ، هەندێ شارەزای هاوچەرخ، هەرچەندە پەیان بەم هەڵە جوگرافیە بردووە، بەڵام لەژێر باری سەرسووڕماندا کە بۆچی هیچ ئاسەوارێکی دارستانی چڕی سەوز بە زاگرۆسەوە نەماون، هەستاون وشە دێرینەکانی داستانەکەیان لە "دارستانی سەروەوە" کردوە بە "دارستانی سنەوبەر".

کاتێك کە ئەخەمینیەکان هاتنە سەرکار (٥٥٠ پێش میلاد) (بڕوانە مێژووی کۆن)، و ئەوانیش وەکو پێشینەکانیان هەر لەسەر بەکارهێنانی ڕاژە و دیرەکی سەرو بۆ دارەڕاکردنی خانوەکانیان ڕۆیشتن، ئیدی لەو دارە لە کوردستاندا نەمابوو، بۆیە دارای یەکەمی پادشایی ئەخەمینیان ناچارما بۆ کۆشکەکانی سووسە و پرسپۆلیسی دارسەر و لە وڵاتێکی دوورە دەستی وەکو لوبنانەوە بێنێ. بۆیە ئەوەندەی پێ نەچوو دارستانە سەروەکانی لوبنانیش بە دەردی ئەوانەی کوردستان چوون. گەلێ دارستانی سەرزەمینی کوردان پاشماوەی سەردەمانێکی تەڕترن لەمەی ئێستا و پاش ئەوەی لەبنەوە ئەمسەر و ئەوسەر دار بڕکراون

جارێكی تر ناتوانن سەر دەربكەنەوە و ببنەوە بە دارستان. دارستانیش كە دار بڕكرا، ئەو كەش و هەوای ناوچەو نەرمی ژینگەیەی دەیپارێزن یەكەندەردوو لە بەین دەچن. بەم جۆرە زۆربەی دارستانەكان جارێكی تر لە نویێ كردنەوەنایەن، بە مانای نویێ كردنەوەی ڕاستەقینە، بۆیە دەبێ بە ئاگاداری و وریاییەوە ئەم دارستانە كۆنانە بپارێزن. لەو وێرانكارییەدا، یەكەم سەرووەكان بوون بە قوربانی، ئینجا سنەوبەرەكان دوابەدوای ئەوان. دەتوانین بڵێین، سەدەكانی (٣) یان (٤)ی پێش زایین ئەو سەردەمە دەگرنەوە كە دارستانە سنەو بەرەكان قەلاچۆ كراون، بەوەی كە سنەوبەر بە داری هەڵبژاردە و بەرەكەشی بە نیشان و نەخشی سەر كۆشكەكان دادەنران لە سەردەمی ئاشووری و میدیایی و ئەخەمینیەكاندا تا ٣٣٠ی پێش زایین بەڵام لەوە دواتر ئەو دەستوورە ئاسەواری نەما.

ئەم شێوانە لە بەرگی سەوزی سەرزەمیندا، لەباری سروشتییەوە، كاریگەرییەكی قووڵ و زیانبەخشی بەسەر باری كەش و هەوای گشتیدا هەبوو بە جۆرێك كەش و هەوای ناو خۆ و ناوچەیی جارێكی تر نەیتوانی بێتەوە سەر دۆخی جاران، (بڕوانە كەش و هەوا و باران بارین)، ئەو زیانانەی كە لە سەدەكانی ١٩ و ٢٠ دا لە دارستانەكان كەوتوون ئەوەندە گەورەن كە لە چاو ئەوانی ڕابردوودا، بەسەردەمەكانی هەرە كۆنیشەوە، هی بەراورد كردنیش نین. بەراوردێكی خێرای ژینگەی ئەم سەردەمە، لەگەڵ ئەو قسە و باسانەدا كە گەڕیدە بیانیەكان لە سەدەی ڕابردوودا كردوویانە، زەندەقی خوێنەر دەبەن كە چ گۆڕانێكی خراپ لە سامانی سروشتیی هەرێمەكەدا ڕوویداوە. یەكەم توێژی پڕ بەرەكەتی زەوی بەرگە گیایینە سەوزەكەی سەری دادەماڵرێ و بە بارانی بە خوڕی بەهار دەشۆرێتەوە، ڕنووی بەفری بەهار، لەگەڵ لێشاوی دارمانی قوڕ و لیتە لە هەمان وەرزدا، لەگەڵ یەكدا نۆرەبڕی دەكەن بۆ داخستنی ڕێگاوبانەكان و وێرانی دەكەن، بەڵكو دەبنە هۆی گیران و لە كارخستنی ئەو بەنداوانەی كە بۆ پاراستنی سامانی ئاوی ناوچەكان دروست كراون (بڕوانە سامانە نەتەوەییەكان: ئاو).

دیارە كوردستان لەم وێرانكارییە گەورەیەدا لە وڵاتانی دیكە بە دەرنیە، بەڵكو هەموو ناوچەكانی دراوسێ، بگرە هەموو جیهان، لە دەستی هەمان دەردی گران دەناڵێنێ.

ڕاستییەكەی، بۆ پاراستنی تۆخی سەرەوەی زەمین كە ڕزكێنەری شینابییە كارێكی ئەوتۆ نەكراوە. هەروەها گەڕی بەردەوامی شەڕ و شۆڕ و ئاڵۆوقەكاری، تەنانەت جەنگی

ڕاستەقینەش لە هەرێمەکەدا، ئەوەندیکە بارەکەی خراترو و دژوارتر کردووە. بزووتنەوە و هاتوچۆی کەرەستە و تفاقی گرانی جەنگ، بومباباران کردن، ئاگرنانەوەی بەئەنقەست لە ئۆپراسیۆنە جەنگییەکاندا، هەموو دەست لەناو دەست، بۆ وێرانکردنی ژینگەی لاژگی هەرێمەکە بە چالاکی تێکۆشاون.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر، بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Herbert Wright, "Pleistocene Glaciation in Kurdistan," *Eiszeitalter und Gegenwart* XII (Wiesbaden, 1961); K. Wasylikowa, "Late Quaternary Plant Macro-Fossils from Lake Zeribar, Western Iran," *Review of Palaeobotany and Palynology* 2 (1967); Herbert Wright, "Late Quaternary Climates and Early Man in the Mountains of Kurdistan," *Report of the VI International Congress on Quaternary Epoch, Warsaw, 1961* (Lödz, 1964); H. Wright, "Modern Pollen Rain in Western Iran and its Relation to Plant Geography and Quaternary Vegetational History," *Journal of Ecology* 55 (1969); Charles Reed and R. Braidwood, "Toward the Reconstruction of the Environmental Sequence of Northeastern Iraq," in Braidwood and Howe, eds., *Prehistoric Investigations in Iraqi Kurdistan* (Chicago: University of Chicago Press, 1960); C. Brooks, *Climate Through the Ages* (London: Ernest Benn, 1949); Arlette Leroi-Gourhan and Ralph Solecki, "Palaeoclimatology and Archaeology in the Near East," *Annals of the New York Academy of Sciences* XCV (1961); Clark Howell, "Pleistocene Glacial Ecology and the Evolution of Classic Neanderthal Man," *Southwestern Journal of Anthropology* VIII-4 (1952); Werner Nützel, "The Climatic Changes of Mesopotamia and Bordering Areas: 14,000 to 2,000 BC," *Sumer* xxx:1-2 (Baghdad, 1976); X. de Planhol, "Limites antique et actuelle des cultures arbustives mèditerranèennes en Asie Mineure," *Bulletin de l'Association de Gèographes français* 239-40 (1954); *Climatic Atlas of Iran* (Teheran: Teheran University Press, 1970); Ali Tanoglu, Sirri Erinç, and Erol Tümertekin, *Türkiye Atlasi* (Istanbul: Milli Egilim Basimevi, 1961); *The Epic of Gilgamesh*, translated and edited by N.K. Sandars (Baltimore: Penguin, 1972); H. Wright, "Natural Environment of Early Food Production North of Mesopotamia," *Science* 161:334-339 (1968); W. van Zeist, "Late Quaternary Vegetation History of Western Iran," *Review of Palaeobotany and Palynology* 2 (1967); H. Bobek, "Die gegenwärtige und eiszeitliche Vergletscherung im Zentralkurdischen Hochgebirge (Osttaurus, Ostanatolien)," *Zeitschrift für Gletscherkunde* 27 (1940); Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895).

# شینایی و زیندەوەر

ئەو هەموو داربەڕووە — چ دار چ دەوەن — و كەستانە و عەرعەر و سنەوبەر و سەڕوو داری میوەی كێویلە كە لە كوردستاندا لە دێرزەمانەوە خۆڕاگرانە ماونەتەوە، وێنەیەكی باشی دارستانە چڕەكانی سەردەمانی دێرینمان دەدەنێ (بڕوانە ژینگە و ژینگەناسی). داربەڕوو — چ دار چ دەوەن ئێستاكە باوترین دارە لە پاشماوەی دارستانە چڕەكانی زاگرۆسدا، ئەم دارستانانە جێگەیەكی پێكەوە ژیانی یەكجار چاكن بۆ هەندێ جۆری كارگ و دۆمەڵان كەلە گەل كەستانەی كێویدا (بەڕوو) خۆراكێكی خوداداەن بۆ هەژاران. هەر ئەم دارستانانە خۆیان خولنی والای میوەی كێویلەن وەكو توترك، توێكڵداری جۆراوجۆر، تری، توو، هەرمێ، شاتوو، توەڕەشە، گوێز، فستق، بادام و هی تر...

سەرزەمینەكە هەر لەسەردەمە دێرینەكانەوە ناوبانگی بە زەوەندیی گوڵ و گوڵزارەكانی دەركردووە (بڕوانە فەرهەنگی میللی)، لەوانەیە كوردستان مەڵبەندی بەخێوكردن و ڕەنێوهێنانی گەلێ گوڵی فیسكەرسك بوویێ وەكو زەمەق و نیلوفەڕ و نێرگز، هەروەها ئەو جۆرە گوڵانەی كە بۆ داودەرمان بەكار دێنرێن وەكو گوڵەباخ و ناردین. ئەو هەموو گیا و گوڵ و گوڵخونچە بۆنخۆشانەی كە لەسەرزەمینەكەدا هەن، لەوانەیە وەڵامدەرەوەی ڕاست و ڕەوانی ئەو پرسیارە هەمیشەییەبن: دەبێ بەرەوبوومی سپییایەتیی كوردستان بۆچی ئەوەندە بە بۆن و بەرامە بێ (بڕوانە كشتوكاڵ).

هێشتا كوردستان پڕە لە درەختی كێوی، وەكوو ورچی ڕەش و بۆر، گورگ، كەمتیار، بەراز، ڕێوی، دەڵەك، چەقەڵ، بەور، پڵنگ، باڵندەی جێنشین و ڕەوكەر وەكو داڵاش و كۆلارە، مریشكەرەشە، چرگ، كڵاوكوڕە، كۆترەشینكە، پۆڕ و قەتێ و قاز و مراویی كێوی و خشۆكی وەكو كیسەڵی گەورە و بچووك، قۆڕی و قومقومۆك مارمێلكە و مار. سەرەڕای ئەمانە، چەندین جۆری ماسی شیرناوی ناو گۆم و ڕووبارەكان هەن، جگە لە نزیكەی چل جۆری ماسی ناوكانی و بن ڕەوەز.

گۆزە و كیتەڵەكۆنی كوردی و ئاشووری پڕن لەوێنەی هەندێ زیندەوەر و دەعبای وا كە

ئێستا لە کوردستاندا بڕانەتەوە. هەندێ بەڵگەی ئەرکیۆلوجی، وای دەردەخەن کەفیلی (جۆری Loxodonta) هەروەها وشتریش لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زایینـدا لـە دەورووبـەری پێدەشتەکانی دەم کوردستان هەبووین، شێری (جۆری Files Leo Persica) دەبـێ تەنانـەت تـا سەرەتای سەدەی ڕابردوو هەبووبێ. شێردەرە زلەکان، هەمیشە نێچیری چاکی ڕاوچییەکان بوون و زۆر جار بە کۆمەڵ بە ڕاوکردن لەناو براون.

بۆ وێنە تیگلاتپیلاسەری یەکەمی پادشایی ئاشوورییان (١١١٤–١٠٦٧ پێش زایین)، لە یـەك لە بەردە نووسەکانییدا دەڵێ: چوار گاکێوی و فیل و ٩٢٠ شێری لـە یـەك وەرزی ڕاو و شـکاردا کوشتووە.

وا دەردەکەوێ پڵنگی Felis Tigris Tigris کە لە بازنەی دەورەبەری ڕووبـاری دیجلـەدا ژیـاوە (و هەر لەوەشەوە نـاوی لـەناو زمانـە ئەورووپاییەکانـدا بـە Tiger بـاوە)، تـا ئـەم دوا دواییـەش لەناوچەکەدا تەراتێن کردبێ... هەربۆیە، دەبێ ئەو پڵنگانەی لە مەیدانەکانی شـارەکانی ڕۆمـادا بۆ نومایشی ڕاوشکار نیشان دەدران لەم توخمـە بـووبن. لەوانەیـە، ئـەم پڵێنگـە کوردیانـە، بـە تەواوی مانا پڵێنگ نەبووبن، بەڵکو لەو بەورە زلانە بووبن کە تـا ئێـستاش لـە کوردسـتاندا هـەر هەن، ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەیان لە کەم کردندایە.

ئەو ناوی Tigerەی کە نرایە سەریان، دوایی لەلایەن ڕۆمانەکانـەوە نرایـە سـەر ئـەو پڵێنگـە ڕاستەقینانەی لە دارستانەکانی دەورووبەرو باشووری دەریای خـەزەرەوە هێنـران پـاش ئـەوەی هاوجۆرەکانیان و دڕندەی تری شکاری لە کوردستاندا دوایان بڕا.

ئێسقانەباڵی هەندێ باڵنـدەی کەتـە، کـە لەوانەیـە لـە سرووت و ئاهـەنگی ئایینییـدا بـەکار هێنرابن (بڕوانە یەزیدییەت)، لەناو ئەشکەوتەکانی تەنگی ژووڕووی شانیدەر – زاوی چەمی لـە کوردستانی ناوەندا دۆزراونەتەوە و مێژوویان بڕاوەتەوە بۆ ١٠٨٠٠ ساڵ لەمەوبەر.

لەناویانـدا، سـەرگەڕی ڕیـشدار و ئەفـسانەوار، هـەڵۆی سـپیی دەریـایی و هـی بـچووك و مێشەسی هەیە – دوای زۆربەی ئەم باڵندانە ئێستا لـە کوردسـتاندا بـڕاوە، بـەڵام دوانـی مـەزنی ئەم باڵندە گەورانە، واتا هەڵۆی هوما، کە نیشانەی بەیداخی پادشا سـەلاحەدین و پادشـاییەتی کـوردی ئـەیوبی بـوو (بڕوانـە مێـژووی سـەدەکانی ناوەنـد)، هـەروەها شـاوات (Otis Trada)– مێشەسی – هێشتا لە شوێنە تەریك و دوورەدەستەکانی وڵاتەکەدا تاك و تەراماوون.

بالی ئەم نووبالندە کەتانە لە (٨) پێ درێژترن ئەمەش لێکدەرەوەی ئەوەیە کە بۆچی بۆ
کردار و پەرستشە ئایینیەکان لە کوردستان بە کار دەهێنران.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** M.B. Rowton, "The Woodlands of Ancient Western Asia," *Journal of Near Eastern Studies* 26 (1967); P.F. Turnbull and C.A. Reed, "The Fauna for the Terminal Pleistocene of Palegawa Cave," *Fieldiana Anthropology* 63 (1974); T.C. Young, "Survey in Western Iran, 1961," *Journal of Near Eastern Studies* 25 (1966); Dexter Perkins, "Prehistoric Fauna from Shanidar, Iraq," *Science* CXLIV-3626 (1964); H. Wright, H. McAndrews, and W. van Zeist, "Modern Pollen Rain in Western Iran, and Its Relation to Plant Geography and Quaternary Vegetational History," *Journal of Ecology* LV (1967); H. Walter, "Vegetationgliederung Anatoliens" ("Plant Distribution in Anatolia"), *Flora* 143 (1956); Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895).

**General Bibliography**

Some very good sources on the land and nature of Kurdistan in general are the British Naval Intelligence Division's *Geographical Handbook* series on Iran, Iraq, Turkey (2 vols.), and Syria (1940-43). The sheet maps and the accompanying text books of the *Tübinger Atlas des Voerderen Orients* (TAVO) (Wiesbaden, Ludwig Reichert Verlag, ongoing) are valuable resources for this and many other topics discussed in this work. Also see Ali Tanoglu, Sirri Erinç and Erol Tümertekin, *Türkiye Atlasi* (Istanbul: Milli Egilim Basimevi, 1961); Sirri Erinç, *Dogu Anadolu Cografyasi* ("Geography of Eastern Anatolia") (Istanbul: Istanbul University Press, 1953).

# فەسڵی سێیەم

## مێژوو

سەر لەنوێ دارشتنەوە و دارەڕا کردنەوەی مێژووی کورد کارێکی یەکجار دژوارە. ئەم مێژووە زۆر جار تووشی شێوان و بیروڕای سەرپێی بووە لەناو سەرچاوەیەکی زۆر و جۆرا و جۆر کەنە بۆ کورد نووسراون نەبۆ دەرخستنی ڕوخساری ڕاستی مێژووەکەی. بەشێکی زۆری مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن دەستەی دەسەڵاتدار و باڵادەست بوە، و لەم دوا دواییانەشدا، لەلایەن دەوڵەتە نەتەوەییەکانەوە نووسراوە. لەم ناوەدا، کورد لە (٨٠٠)ساڵی ڕابردووەوە نە دەسەڵاتدار و نە باڵادەست بووە. لە ئاکامی ئەمەشدا، بەشدارییەکانی کورد لە مێژوودا پشت گوێخراون، یان لەمەش خراپتر، کراون بە ماڵی گەلانی تر (بۆ دەست خستنە سەر ئەم ڕاستییە، بڕوانە پێشەکی و ناسنامەی نەتەوەیی).

هەر هەوڵێکی نوێ و پێشەنگ بۆ دارەڕا کردنەوەی ئەم مێژوە، بابەشێکە کە دەکەوێتە بەرپرس و پرسیارێکی زۆر و زەوەند و گیر و کێشەیەکی سەخت. ئەمە شتێکی چاوەڕوان کراوە، چونکە لەگەڵ بار و دۆخی سەر خواندا ڕێکناکەوێ. ئەگەر کارێکی ئەوها ببێتە مایەی لێکۆڵینەوەی زانایانەی پتر، ئەوا نیشانی پێکاوەو کارێکی سەرکەوتووە.

# پێشكەوتنی تەكنۆلۆژی پێش مێژوو و دواتر ۱۰۰۰۰- ۳۰۰۰ پ.ز.

ئەم قۆناغە، قۆناغێكە هەتا بڵێی سەرنجكێش لە مێژووی كوردستاندا. ئەو پێشكەوتن و دۆزكاریە زانستیانەی كە لە هەڵەت و بڵندییەكانی كوردستان لە (۷۰۰۰)ساڵەی پێش سەرهەڵدان و قوت بوونەوەی مێزوپۆتامیادا (۳۰۰۰ پێش عیسا) هاتبوونەدی هەتاهەتایە نەك هەر ڕێبازی مێژووی مرۆڤایەتیان گۆڕی بەڵكو ڕوخساری سەرزەمینیشیان خستە بەر پرۆسەی گۆڕان. زۆربەی ئەوەی دویماكار لەلایەن مەدەنیەتی (۵۰۰۰) ساڵەی نەویایی میزوپۆتامیاوە خرایە مەیدانەوە و بوو بە بابەتی شارستانیەت، ۷۰۰۰ ساڵ لەوەبەر لە چیا و دۆڵەكانی كوردستانی هاوسنووردا هاتبووەكایەوە. بەڵگەیەكی زۆر و دۆكۆمێنتیزە كرا و لە بارەی گرنگیەتی ڕۆڵی كوردستان لە پێشكەوتنی مەدەنیەتدا بە دەستەوەن و ئەم بەڵگانە چ لە ڕووی ئەركیۆلۆجی و چ لە ڕووی زیندەوەرناسییەوە گرنگییەكی زۆریان هەیە.

خەڵكە ئەشكەوت نشینەكانی چەرخەكانی بەردینی كۆن و ناوەڕاست (واتە ئەوانەی بە مێژوو دەگەڕێنەوە بۆ ۱۰۰۰۰ ساڵی پ.ز) لە كوردستانی خوارو و ناوەنددا بە زۆری نیشان كراون. ئەوانی بە هیستوون (چیای بێستوون) لە باشوور هی نزیكەی ۱۰۰۰۰۰ ساڵ لەمەوبەر و ئەوانی شانیدەر خۆیان دەدەن لە ۵۵۰۰۰ ساڵ، پێشكەوتنی تەكنۆلۆجی و دەربڕینی هونەری ئەم فەرهەنگی چەرخی بەردینی كۆن و ناوەندانە، چ كەم چ زۆر، هاوشانن لەگەڵ هۆبە و نیشتگەكانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و باشووری ئەوروپادا.

چەرخی بەردینی نوێی كوردستان، لە بەرامبەردا، سروشتێكی زۆر جیاوازتری هەبووە. دۆزەكاریەكان وای دەردەخەن كە كوردستان ئەگەر لانكەی سەرەتای گۆڕانكاریە شۆڕشگێڕانەكانی ئەم چەرخە نەبوبێ، ئەوا یەكێك بوە لەو لانكانە. دانیشتووانی ئەم سەرزەمینە بە دەورلێنێكی نەزانراوی گوڕانی خێرای تەكنولۆجیادا تێپەڕیوونە كە هێشتا نازانرێ هێزی پاڵنەریان چی بوە و لە كوێوەهاتن، ئەوان زۆر خێراتر لە خەڵكانی دەوروبەریان لەم ڕێبازەدا هەنگاویان ناوە، هەرچەندە ئەو خەڵكانەش لە ڕووی تەكنولۆجیای ئەو سەردەمەوە لە شوێنی تری جیهان پێشكەوتووتر بوون، ئەم پێشكەوتنە تەكنۆلۆجیە بریتی بوە لە

گواستنەوەی خێرا لە ئابووری ڕاووشکاری پەراگەندەوە بۆ قۆناغی ئابووری بە کۆمەڵی خواردن بەرهەمهێنان.

کوردستان، کە بەشی شاخاویی ژوورووی کەوانەی بە پیتی مێژوویی پێك دێنیٚ، مەکۆی پێشکەوتنکاری و بەکارهێنانی گەلێك تەکنۆلۆجیای خۆماڵی و پیشەسازیی نوێکار و هەروەها شێوازی نوێی بەرهەمهێنانی خۆراك بووە، بەڵگە و نیشانێکی زۆری تەکنۆلۆجی بە دەستەوەن لەسەر ئەوەی چیاکانی کوردستان لە ۱۲۰۰۰ ساڵ لەمەوبەرەوە مەڵبەندی داهێنانی کشتوکاڵ بوە (بڕوانە Braidwood 1960). هەر لە چیاکانی کوردستانیشەوە دویماکار ئەم تەکنۆلۆجیا شۆرشگێرە بەرەو سەرزەمینە نەوییەکانی مێزۆپۆتامیای دراوسیٚ و هەڵەتەکانی ئەنەدۆڵی ڕۆژاوا و بەرزاییەکانی ئێران پەریوەتەوە. نزیکەی ۸۰۰۰ ساڵ لەمەوبەریش بەرەو باکووری ئەفەریقا و ئەوروپا و وڵاتی هیندستان بازی داوە. بەم جۆرە کورستان، سەرچاوەی پەیدابوونی گەلیٚ دانەوێڵە و زیندەوەری کەوی کراوە (بڕوانە Ucko and Dimbleby 1969; Berg and Protsch 1973; Wright 1969) گوێزانەوە لە خۆراك کۆکردنەوەوە بۆ خۆراك بەرهەمهێنان لەناو هەمان سەرزەمیندا دەستی پیٚ کرد کە باپیرانە کێویەکانی دانیشتووانی ئەو سەرزەمینانەی تێدا دەژیان، واتە دەوروبەری چیاکانی زاگرۆس (بڕوانە Braidwood and Howe 1960، 1962; Braidwood 1972). جگە لەمە، ئەو بەڵگانەی ئێستا لەبەر دەستدان، کوت و مت پەنجە بۆ هەڵەت و شیو و دۆڵەکانی ناوچیاکانی کوردستان درێژ دەکەن و بە مەڵبەندی سەرەکی ئەم گوێزانەوەیەی دادەنێن.

بێگومان، پەیدابوونی کشتوکاڵ، بە دوای خۆیدا کەوی کردنی ئاژەڵ و زیندەوەر و ڕاهێنانی شینایی پێویستیشی هێنا. پشتە هەرە سەرەتاییەکانی گەنم و جۆ و چەودەر و کزن و نۆك و نیسك و وێنجە و ترێی ئەم سەردەمە، یەکەم جار لەلایەن پێشینەکانی کوردەکانی ئەمڕۆوە ڕاهێنراون. یەکسەر دوابەدوای هەزارەی نۆیەمی پێش زایینەوە، جۆری کێویلەی زۆربەی زۆری دانەوێڵە و پۆلکەدارەکان تا ئێستاش لە چیاکانی زاگرۆس و ڕۆژهەڵاتی تۆرۆس و تەنانەت لە چیاکانی ئەمانۆسیشدا هەر ماون (بڕوانە زەوی و ژینگە). پاشماوەی هەندیٚ لەو بزن و مەڕ و سەگ و بەرازانەی کە یەکەم جار کەوی کران لەسیٚ مەڵبەندی ئاسەواری کوردستاندا دۆزراونەتەوە. ئەم سیٚ مەڵبەندە بریتین لە چای ئۆێنو (لە نزیك دیاربەکری ئێستا

لە كوردستانی ڕۆژاوا )، گەنجی دارا (لە باكووری ڕۆژاوای كرماشان لە كوردستانی باشوور كە تەمەنی خۆی دەدا لە ۱۰ هەزار ساڵی لەمەوبەر) و چەرمو (باكووری سولەیمانی ئێستا لە كوردستانی ناوەند كە تەمەنی خۆی دەدا لە ۸۰۰۰ ساڵی لەمەوبەر). لە سەرەتای هەشت هەزارەی پێش زایینداً، گەلێ كۆمەڵگەی كشتوكاڵی كودستان ئاژەڵیان ماڵیی كردبوو، سامانی پاشماوەی كەرەستەی بە كارهێنانی دانەوێڵە وەكو دەستاڕ و نۆڵ و دەسكەدۆڵ بەشێكن لەو بەڵگانەی كە شایەدی بۆ داهێنانی كشتوكاڵ لە كوردستاندا دەدەن لەوكاتەدا.

پەرەسەندنی لە ڕادەبەدەری ژمارەی دانیشتووان و بەرهەم كە ئەم پێشكەوتنانە بە دیيان هێنا، بوو بە هۆكاری لێ كۆڵینەوەی زیاتر بە دوایی تەكنۆلۆجیا و داهێنانی جۆری نوێدا. مەدەنیەتی كوردستان لەسەر ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی خۆی هەر ڕۆیشت، بەم جۆرە یان ڕاستە وخۆ یان بە بەشداری كردن، بابەشێكی زۆری تری ڕاهێنان هاتە كایەوە وەكو كانزاكاری، ڕێسین و چنین و گۆزە و كیتەڵە و دەوری كوورەكار، جگە لە پێشكەوتن لە ڕاستایی خانووسازی و شارستانیەت و نووسیندا، بە بەڵگە كۆمەڵگای چای ئۆێنو بە یەكێك لەدوو داهێنەری كانزا گەری لە جیهاندا دادەنرێ (بڕوانە Braidwood 1969; Caldwell 1967)، ئەو سواڵەتە مسانەی كە لەوێ دۆزراونەتەوە هی نیوەی یەكەمی هەزارەی پێنجەمی پێش زایین، تووج كەتێكەڵەی مس و مەفرەقە، لەمس ڕەقتر و بەسوودتریشە و بەگەرمیەكی كەم دەتوێتەوە و بەم خەسیەتە بەكارهێنانی بۆ كەرەستەی جۆراوجۆر ئاسانترە كەرەستە توجەكانی كە لە چای ئۆێنو لە سەرەتای چوار هەزار ساڵەی پێش زاییندا دۆزراونەتەوە وا دەگەیەنن كە دوو هەزار ساڵ پێش ئەوروپا بەكار هێنراون.

پێشكەوتن لە بواری كانزاگەرییدا بە بوونی خاوەكان لە وڵاتەكەدا گەلێ ئاسانتر هاتە دەست، لە كاتێكدا كە دەشتە لیتەكارەكانی مێزوپۆتامیا چ سامانێكی ئەوتۆی كانزاییان تێدا نییە، چیاكانی تۆرۆس و زاگرۆس و ئەمانۆس، هەروەها پێكهاتە بوركانییەكانی جوودی، لەو گەنجینە بن زەمینیە بڵق دەدەن. لە ڕاستیدا هەرێمی دەوروویەری چای ئۆێنو دەتوانرێ بەكۆنترین پیشەسازگەی زیندووی جیهان دابنرێ، چونكە تواندنەوەی مس و دروستكردنی كەرەستە لەمس كە حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر لەوێ دەستی پێكردوە تا ئێستاش لەوێ هەر بەردەوامە (بڕوانە سەرچاوە سروشتییەكان: كانزاكان).

لەچای ئوێنو هەروەها لە گەنج داراش (لەبەشی ئەویەری کوردستان نزیکی کرماشان)، لەهەمان سەردەمدا، کەرەستەی کوورەکار (لەگەڵ هەندێ پەیکەری بچووکدا) لە سەرەتای هەشت هەزارەی پێش زایین بۆ یەکەم جار سەریان دەرکردووە (بڕوانە Majidzadeh 1975) لە کاتێکدا لە چەرخی بەردینی نوێدا، کەرەستەی خواردن و خواردنەوە، بە ئاسایی لە بەرد یان دار یان قوڕ یان پووش و لاسك دروست دەکران، هاتنە مەیدانی چەندین جۆری گڵێنە شۆڕشێکی لە ژیانی سەرگیراونشینیدا بەرپا کرد و کۆمەڵگاکانی تر شێتگیرانە کەوتنە پەیجووری ئەم بابەتە نوێیانە کە وەکو ئاگرێك لەناو پووشدا بکەوێتەوە، لە هەموو وڵاتەکانی پێش زاییندا بوو بە باو (Roaf 1990-42)، لە تەنیشتی گەنج دارا و لە پاشماوە دێرینەکانی سێ گابیدا، یەکەم نموونەی کەرەستەی خواردن و خواردنەوەی شووشە دۆزراوەتەوە، کە هی (٢٥٠٠)ی پێش زایینە[3]. بەمە ئەم شوێنە ٢٠٠٠ ساڵ پێش میزۆپۆتامیا و چین کەوتن لە تەکنۆلۆجیای شووشە سازییدا (Vandiver 1990; Levine 1979)، هەرچی جێ دەستی کوردستانە لە پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای ڕێسین و چنیندا لە بابەتی (بەرەو مافوور و کۆتاڵ)دا، باس کراوە.

لە دویمایی هەزارەی هەشتەمی پێش زاییندا، کۆمەڵگای کوردستان ئیتر بە تەواوی شێوەی بازرگانیشی بە خۆوە گرتبوو، بە جۆرێك پێویستی بە دەفتەرگیری هەبوو بۆ سەوداکاری بازرگانی، ئەم دەفتەرگیریە، هەوەڵ جار لە کوردستاندا لە شێوەی نیشانی فرەجۆری گڵێنەدا دەرکەوتوە، کە هەر یەکێکیان بۆ بابەشێکی بازرگانی یان ژمارەیەك بە کار هاتوون، نیشانەکان لە ٧٥٠٠ ساڵ لەمەویەرەوە گۆڕانیان تێدا کراوەو بەوە مەودا و ماوەی بەکارهێنانیان فراوانتر کراوە. کە بابەتی نیشانەکان چڕ و پڕتر بوون بەگوێرەی ژمارەی سەوداکارییەکان، ئیتر هەر یەکەیان کیفێکی گڵینەی بۆ دروستکراوە و هەندێ جاریش لە لەیان لە کنارەوە بۆ کردوون و بەشێوەیەك ڕستیان کردوون کە بۆ وەرگر مانایەکی تێدابێ (Schmidt-Besserat 1986; Nissen 1986)، لە (٣٠٠٠)ەی دوای زاییندا کیفەگڵێنەکە خۆی بوە بە تۆمار و ئیتر نیشانەکان هەڵگیراون، خشتە بزمارنووسە هەرە کۆنەکان، ئێستاش وێنەی هەڵزەپاوی

---

[3] لە نووسینی کوردیدا پێش پاش زایین، پێش و پاش عیسا و پێش پاش میلاد بەکارهێنراوە، ئەم وشانە لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا هاتبن هەر یەك شت دەگرنەوە- وەرگێڕ.

كیفە كۆنەكانیان هەر لەسەرە، بێ ئەوەی هیچ نیشانێكیان تێدابێ، بەم جۆرە نووسین لەسەر شێوازی نوێ دەستی پێ كرد و هاتە كایەوە.

ڕاستییەكەی، كۆنترین شێوە نووسینی بزماریی وێنە نووسی، لە نیشانەكانەوە وەرگیراون، هێندەی پێ نەچوو ئەمانیش بوونە بەشێوەی زیاتر سیمبۆلیك و بەمە دژوارتر بوون (Green-1981) هەر وەكوو بوارەكانی تر، لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا، میزۆپۆتامیا لە كوردستان پێشكەوتووتر بوو لە مەیدانی نووسیندا، لە كوردستان و لە چیاكانی زاگرۆس، شێوەی سەرەتاییتری نیشانكاری بۆ كاروباری تۆماركاری تا ماوەیەكی دوور و درێژ هەر مایەوە، لە میزۆپۆتامیا، نووسین بە ماوەیەكی گۆڕان و پێشكەوتنی خێرادا تێپەڕیوو، بەڵام لە كوردستاندا نیشانەكان شان بەشانی نووسین هەر بەكارهاتن، خشتی قوڕین كە بەخەتی هیرۆغلیفی نووسراون و لەبەر نەبوونی ناوی ڕێكتر و گونجاو تر بە (Proto - Ilamite) ناسراون، هەوەڵ جار (٤٥٠٠) ساڵ لەمەوپەر لە گودیتی نزكی كەنگاوەری ئێستا دەركەوت، ئەم مێژووە، ئەگەر سیستەمی نیشانگەری خۆی لەخۆیدا بە نووسین دابنێین، كوردستان دەكا بە یەكێك لە مەڵبەندە هەرە كۆنەكانی كۆمەڵگا خوێندەوارەكان لە جیهاندا و لەم بوارەدا تەنها میزۆپۆتامیای دراوسێی لە پێشەوە دەبێ، لە كاتێكدا هێشتا نازانین كارتێكردنی مەسەلەكە لەسەر وڵاتی ئێرانی تەنیشتمان چۆن و چەند بوە؟

سەرچاوەی زۆر و زەوەندی خۆراك و ئاستی بەرزی ژیان، بەرەبەرە دانیشتووانی كوردستانی زیاتر خستە خۆشی و زەلینەوە، لە ماوەیەكی كورتدا، ژمارەی دانیشتووانی كوردستان نزیكەی دەجار زیادی كرد، واتە لە ١٥٠٠٠ كەسەوە لە دە هەزارەی پێش زایینەوە بوو بە ١٥٠٠٠٠ لە نۆ هەزارەی پێش زاییندا، ئەوەبوو یەكەم دەوڵەت یان شاری شێوە دەوڵەت لە دەوروبەری هەزارەی هەشتەی پێش زاییندا هاتنە كایەوە (Wright-1977).

شوێنی وەكو چای ئۆێنو، ئۆیلم حویوق، تیتریش (لە كوردستانی ڕۆژاوا)، جەرموو، تەپە گەورە (لە كوردستانی ناوەند)، گەنجی دارا و گیان (لە كوردستانی باشوور) لەگەڵ جەریشۆ (ئەریحا) لە جودیا (ئیسرائیل)[4] بوون بە یەكەم كۆمەڵگای مەدەنی لەسەر ڕووی زەمین.

---

[4] (هەندێ كەس لەو باوەڕەدان كە (جودی) پیرەمەگروونی وڵاتی سلێمانیە – وەرگێڕ لە زمانی دكتۆر كەمال مەزهەرەوە).

هەرچەند ئەم "شارانە" لە قەوارەدا هەندە گەورە نەبوون (١٠٠٠—١٥٠٠ دانیشتوو)، لەو کاتەدا، زۆربەی خەڵکی شوێنانی تری جیهان، بێگومان، ئەشکەوت نشین بوون، ئەم خەڵکە شارستانییانە لە کۆختەی سادەدا دەژیان و بەشێوەیەکی دیار نەخشەی کۆختەکانیان وا دانابوو، کە چ لەنێوانیاندا، و چ لەگەڵ دەوروبەریشدا بۆشاییەك هەبێ، هەروەها بۆ شوێنی کۆمەڵە کۆختەکانیان، جۆرە ستراتیژیەتێکیان بەکار دەهێنا بەوەی رووەو دەشتایی بێ، بۆ ئەوەی کاری بازرگانی و کشتوکاڵ، هەروەها پاراستنی هۆبەکەش ڕەوانتر بکەن.

بەخشندەیی سروشتیی زەوی و ئاسانیی پارێزگاری کردن لە دەوروبەر کە زۆرتر شاخاوی بوو، ئەوەندەی پێویست نەدەکرد خەڵکەکە خۆی بە حکوومەتکاری و سوپاسازیەوە خەریك بکا، بەم جۆرە حکوومەتە ناوخۆییەکان هەر بە بچووکی و زەبوونی و کەم دەسەڵاتی مانەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا، لە دەشتە نەرمانەکانی میزۆپۆتامیای دراوسێدا، چونکە سەرچاوەکان کزبوون، ژیان پێویستی بە دەست پێوەگرتنیان دەکرد (وەکو پرۆژەکانی ئاودێری و گلدانەوەی ئاوی سێلاو) هەروەها پاراستنی دەشتاییە بەر بەتاڵەکان، پێویستی بەرێکخراوەی حکوومەتی دەکرد جگە لە سازدانی هێزی سوپایی، بۆیە شان بەشانی دروستبوون و پەرەسەندنی قەوارەی حکوومەتەکان، شارەکانیش زیاتر گەورە و پانەوەبوون. شارە هەرە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا و سۆمەری و ئەکەدیەکان وەکو ئەریدۆ، نیپور، ئوور و ئورووك، کەم و زۆر، دەجار لە شارەکانی کوردستان ئاوەدانتربوون و دانیشتووانی هەر یەکەیان خۆی دەدا لە ١٠—١٥ هەزار کەس و خاوەنی سیستەمێکی قایمی خۆپارێزییش بوون.

مەدەنیەتی کوردستان تەنها لەو سەردەمەدا پەرەی سەند و گەشەی کرد کە بە سەردەمی حەلەف ناسراوە و خۆی دەباتەوە (٦٠٠٠—٥٠٠٠)ی پێش زایین، ئەم سەردەمە بەناوی کۆنە شوێنەواری حەلەفیی ڕۆژاوای ماردینەوە لە کوردستانی ڕۆژاوا ناونراوە (نەخشەی ژمارە ١٢)، فەرهەنگی حەلەف بە تەنینەوە و باو بوونی یەکەی نیشتەجێی باش بیناکراو و خڕ و دروستکردنی وەستاکارانە و دەست ڕەنگینانەی سواڵەتی جۆراوجۆر نەخشێنراو و ڕێك و پێکدا خۆی دەردەخا، یەکەم بەڵگەی تۆکمەی تەبایی فەرهەنگی دانیشتووانی کوردستان دەچێتەوە سەر سەردەمی حەلەف، ئەم بەڵگانە ڕێکوپێکی دەربڕینی هونەرمەندانە و سەلیقەی کارزانانەی ئەم سەر و ئەوسەری کوردستان دەردەخەن (Roaf-1991-51). ئەم یەکیەتییە لە تەلارکاری و نەخشسازییدا ئەوەندە بەهێزە، کەزۆر ئاسەوارناسی برئۆتە سەر ئەو باوەڕەی کە گەلە خاوەنەکەی، لەڕووی ئەتنییشەوە هەر یەکپارچەبوە(Van Oppenheim 1931). ئەوەی جێی سرنجە، زۆر لە کارە نەخشسازیەکانی سەردەمی حەلەف ئێستاش لە زۆر کاری هونەریی کوردیدا هەر شوێنەواریان دیارە (Mellaart-1975) (بڕوانە کاری نەخشسازی و وێنەی هەڵکۆڵراو). لەگەڵ کۆتایی هاتنی چاخی حەلەفدا، ئاستی مەدەنیەت و دەبدەبەی

تـــەكنۆلۆجیازادی پێدەشـــتەكانی میزۆپۆتامیـــا وای لێهـــاتبوو شـــان بـــدا لەشـــانی هەڵـــەت و بڵندایەكانی كوردستان، لە سەرەتای ئەم چاخەدا كە بە "چاخیٚ مێـژوویی" ناسـراوە (٤٠٠٠ پ ز) میزۆپۆتامیا ئاشكرا كەوتبووە پێش كوردستانەوە، هەر لەم ساتەدا كوردستان خۆشـی پێـی نابوە ناو چاخی فەرهەنگیی حۆریەوە.

جگـە لـە هـەموو ئـەم گۆڕانكاریانـە، نووسـین بـە بـەربڵاوی هاتـە ڕاسـتای ژیانـەوە، حكوومەتكاری تەنیەوە و تەرزی فرێدا، ئایین بوو بە دام و دەزگا، شارنشینی یـەكجار پـەرەی سەند و ئەوەی پێی دەوترێ "مەدەنیەتی خوێنـدەواری" لـە چاخـی "پـێش مێـژوو"ەوە پێـی نایە "چاخی مێژوویی"یەوە.

نەخشەی ژمارە (12)- ڕەتبردی فەرهەنگی حەلەف لە کوردستان لە دەوروبەری 6000 - 4500 پێش زایینیدا: بڵاوبوونەوەی سواڵەت

تێبینی: سنوورەکانی باکووری کەلتووری حەلەف ئەمڕۆکە بە ئەندازەی سنوورەکانی باشووری زانراونین.

سەرچاوە

Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990), p. 49.

# تەکنۆلۆجیای کشتوکاڵی و بڵاوبوونەوەی زمانی هیندۆ–ئەورووپی

لەم دواییانەدا چەندین تیۆری نوێ لەمەڕ بڵاوبوونەوە و تەنینەوەی زمانە هیندۆ–ئەورووپییەکانەوە کەوتوونەتە ناوانەوە. کۆلین ڕینفرۆ یەکێکە لەو پسپۆڕانەی بە توندی داکۆکی لەم تیۆریانە دەکا (٩٨٨)، ئەم تیۆریانە پشتگیری لەوە دەکەن کە بڵاوبوونەوەی ئەم زمانانە لەبنەکاندا بەهۆی داهاتنی تەکنۆلۆجیایەکی نوێ باوەوە، واتە کشتوکاڵەوە، هاتۆتەدی، بەم جۆرە ئەم زمانە لە ئەنەدۆڵی، لە دانیشتوواندا چڕوپڕ و لە کشتوکاڵدا پێشکەوتووەوە، بەرەو هەڵەتەکانی یۆراسیای لە دانیشتوواندا تەنك و لە کشتوکاڵ بێ ئاگا، پەڕیەوە، پاش ئەوەی دانیشتووانی ئەنەدۆڵ بەخۆیان و بە زمانەکەیانەوە بەرەو ئەورووپا پەڕینەوە. دانیشتووانی ئەنەدۆڵ خۆیان بە زمانی هیندۆئەورووپی هەرە کۆنی "Ursprache" دەدوان، هەر لەسەر ئەم بنەڕەتە خۆی خاوەنی ئەو تیۆریانە، هێلانەی ڕاستەقینەی خێزانە زمانی هیندۆئەورووپی بەو ناوچەیە سنووریەند دەکەن کە ناوەندەکەی چاتاڵ حویوقی ناوەڕاستی ئەنەدۆڵە، بە گوێرەی تیۆرییەك کە جێمس میلارت (١٩٧٥) دایناوە و ڕێنفرۆ پشتگیری لێ دەکا، تەمەنی وەرزێڕیی لە چاتاڵ حویوق دەچێتەوە (٧) هەزارەی پێش زایین، واتە زیاتر لە (٢٠٠٠) ساڵ پاش بوونی چەندین کۆمەڵگای وەرزێڕیی لە پاڵ تەکنۆلۆجیای نوێی کشتوکاڵی لە کوردستاندا (بۆ نموونە چای ئوێنو لە نزیك دیاریەکرەوە) کە کۆمەڵگای کشتوکاڵگەریی، زۆر پێشکەوتووی لێ هەبوە و ئامێر و تفاقی یەکجار چاکیشیان تێدا بە کار هێنراوە، تەکنۆلۆجیای کشتوکاڵگەری لە کوردستانەوە نزیکەی (٢٠٠٠) ساڵ پاش داهێنانی لەوێ ئینجا بەرەو ڕۆژاوای ئەنەدۆڵ پەرتەی کردووە، دوو مێژووناسی سۆڤیەتی، واتە: تی. گامکرەلیدزە و ڤی. ئیڤانۆف (١٩٩٠)، چوونەتە ڕیزی ئەو مێژووناسانەوە کە سەرچاوە و کانگای بڵاوبوونەوەی زمانە هیندۆ ئەورپاییەکان بە داهێنانی کشتوکاڵەوە دەبەستنەوە، ئەم دوانە، بەر هەرحاڵ، سەرزەمینی ئەسڵیی داهێنانی کشتوکاڵ بەلای ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باشووری قەفقاسیا دادەنێن، ئەوەی جێی سەرسووڕمانە، ئەم دوانە، هەردووکیان، ڕاستییەکیان نادیدە گرتوە کەپشتی بە بەڵگەی زۆر ئەستوورە و دەڵێ کشتوکاڵ بە چەسپاوی لەناوەوەی کوردستان گەلێ زووتر لە هەرێمە

دوورەکانی قەفقاس و چەتاڵ حویوق هەبووە.

ئەم تیوریانە، هەرچەندە بە توندی ڕەت دەکرێنەوە، بێ ئاگایانە و بە هەڵە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، واتە کوردستانی مەڵبەندی هەرە کۆنی کشتوکاڵ، دەکەن بە مەڵبەندی ئەسڵیی ئەم خێزانە یەکجار گرنگەی زمانان، من بە تەواوی لەگەڵ مالۆریدا (١٩٨٩) یەکڕام لە ڕەتکردنەوەی ئەم شێوە بۆچوونە، کە لە هەندێ لایەنی تریەوە سرنجکێشە چونکە ئەگەر چی هەندێ دەرەنجامی گرنگ دەداتە دەست، بەڵام پرسیار و پەیجوورییەکی زۆریش بە دوای خۆیدا بکێش دەکا. جگە لەمە، میتۆدولۆجی نادروست لەگەڵ ژمارەیەك هەڵەی جوغرافیایی و مێژوویی گرنگدا، ئەم تیۆریانە دەخەنە ناو کەوانەی گومانەوە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings & Bibliography**: Richard Lee and Irven DeVore, eds., *Man the Hunter* (Chicago: Aldine, 1968); Robert Braidwood, "The Iranian Prehistoric Project," *Iranica Antiqua* I (1961); Robert Braidwood and Bruce Howe, *Prehistoric Investigations in Iraqi Kurdistan* (Chicago: The University of Chicago Press, 1960); Henry Field, *Ancient and Modern Man in Southwest Asia* (Coral Gables, Florida, 1956); Dorothy Garrod, "The Palaeolithic of Southern Kurdistan: Excavations in the Caves of Zarzi and Hazer Merd," *Bulletin of American Schools of Prehistoric Research* 6 (1930); Patty Jo Watson, *Archaeological Ethnography in Western Iran* (Tucson: University of Arizona Press, 1979); Clark Howell, "Pleistocene Glacial Ecology and the Evolution of Classic Neanderthal Man," *Southwestern Journal of Anthropology* VIII-4 (1952); Carleton Coon, ed., *Cave Explorations in Iran in 1949* (Philadelphia: University of Pennsylvania Museum, 1951); Carleton Coon, *The Seven Caves* (New York: Knopf, 1957); T.C. Young and P. Smith, "Research in the Prehistory in Central Western Iran," *Science* CLIII (1966); T. Cuyler Young, *Excavations at Godin Tepe, Progress Report* I-II, Art and Archaeology Occasional Papers 17 and 26 (Toronto: Royal Ontario Museum, 1969, 1974); L.D. Levine, "The Excavations at Seh Gabi," in *Proceedings of the III Annual Symposium on Archaeological Research in Iran* (Chicago: University of Chicago Press, 1974); T. Cuyler Young, Jr., "An Archaeological Survey of the Kangavar Valley," in *Proceedings of the III Annual Symposium on Archaeological Research in Iran* (Chicago: University of Chicago Press, 1974); L.D. Levine and M. McDonald, "The Neolithic and Chalcolithic Periods in the Mahidasht," *Iran* XII (1974); Colin Renfrew, *Archaeology and Language: The Puzzle of Indo-European Origins* (New York: Cambridge University Press, 1988); J.P. Mallory, *In Search of the Indo-Europeans: Language, Archaeology and Myth* (London: Thames and Hudson, 1989); Thomas Gamkrelidze and V. Ivanov, *The Indo European Language and the Indo-Europeans* (London: Mouton, 1990); Thomas Gamkrelidze and V. Ivanov, "The Migrations of Tribes Speaking Indo-European Dialects from Their Original Homeland in the Middle East to Their Historical Habitations in Eurasia," *Journal of Indo-European Studies* 13 (1985); I.M. Diakonov, "On the Original Home of the Speakers of Indo-Europeans," *Journal of Indo-European Studies* 13 (1985); Jared Diamond, "The Earliest Horsemen," *Nature* 350 (London, 28 March 1991); Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990); P. Ucko and G. Dimbleby, eds., *The Domestication and Exploitation of Plants and Animals* (London: Duckworth, 1969); R. Berger and R. Protsch, "The Domestication of Plants and Animals in Europe and the Near East," *Orientalia* 42 (1973); J. Harlan and D. Zohary, "Distribution of Wild Wheats and Barley," *Science* 153 (1966); D. Perkins, "The Beginnings of Animal Domestication in the Near East," *American Journal of Archaeology* 77 (1973); W.A. Wigram and T.A. Edgar, *The Cradle of Mankind: Life in Eastern Kurdistan* (London, 1914); Y. Majidzadeh, "The Development of Pottery Kiln in Iran from Prehistoric to Historic Period," *Paleorient* 3 (1975-1977); R. J. Braidwood et al., *Prehistoric Archeology Along the Zagros Flanks* (Chicago: Oriental Institute, 1980); R. J. Braidwood, "Seeking the World's First Farmers in Persian Kurdistan: A Full-Scale Investigation of Pre-Historic Sites near Kirmanshah," *Illustrated London News* (October 22, 1960); R.J. Braidwood, "The Early Village in Southwestern Asia," *Journal of Near Eastern Studies* 32 (1973); Braidwood, "The Joint Istanbul and Chicago Prehistoric Project," *The Oriental Institute Report for 1968-69* (Chicago: University of Chicago Press, 1969); G.A. Wright, "Origins of Food Production in Southwestern Asia: A Survey of Ideas," *Current Anthropology* 12 (1971); P. Mortensen, "Excavations at Tepe Gurân, Luristan: Early Village Farming Occupation," *Acta Archaeologica* 34 (1964); Robert Whallon, *An Archaeological Survey of the Keban Reservoir Area of East-Central Turkey*, Memoirs of the Museum of Anthropology, No. 11 (Ann Arbor: University of Michigan Press, 1979); Robert Braidwood and Gorden Willey, ed., *Courses Toward Urban Life* (Chicago: Aldine, 1962); Willem van Zeist, "Palaeobotanical Results of the 1970 Season at Çayönü, Turkey," *Helleniuum* 12:3-19 (1972); Fuad Safar, "Pottery from Caves of Baradost," *Sumer* VI-2 (1950); Herbert Wright, "Recent Research on the Origin of the State," *Annual Review of Anthropology* 6 (1977); Charles Reed, "Animal Domestication in the Prehistoric Near East," *Science* CXXX-3389 (1959); H. Wright, "Natural Environment of Early Food Production North of Mesopotamia," *Science* 161: 334-339 (1968); Max von Oppenheim, *Der Tell Halaf* (Leipzig, 1931); James Mellaart, *The Neolithic of the Near East* (New York: Scribner, 1975); Pamela Vandiver, "Ancient Glazes," *Scientific American* 262:4 (April 1990); J. Oates, "The Background and the Development of Early Farming Communities in Mesopotamia and the Zagros," *Proceedings of the Prehistoric Society* XXXIX (1973); Denise Schmandt-Besserat, "Numbers and Measures in the Earliest Written Records," *Scientific American* (February 1984); Denise Schmandt-Besserat, "An Ancient Token System: The Precursor to Numerals and Writing," *Archaeology* (November/December 1986); M.W. Green, "The Construction and Implementation of the Cuneiform Writing System," *Visible Language* xv.4 (1981); Hans Nissen, "The Development of Writing and of Glyptic Art," in U. Finkbeiner and W. Rölling, eds., *Gamdat Nasr: Period or Regional Style?* (Wiesbaden: Reichert, 1986); Hans Nissen, "The Archaic Texts from Uruk," *World Archaeology* 17 (1985-86).

# مێژووی هەرە کۆن: ٣٠٠٠-٤٠٠ پێش زایین

لەم سەردەمەدا فەرهەنگی میزۆپۆتامیای دراوسێ، سێبەرێکی گەورەی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و بازرگانی بەسەر کوردستاندا لار کردەوە، هەر لەم ماوەیە خۆیدا جۆرە ململانێیەك لەسەر دەسەلات لەنێوان هێزە سوپاییەکانی چیانشینەکان (کوردستان) و هی پێدەشتەکانی کەوانەی بە پیت (میزۆپۆتامیا و سوریا)دا هاتە کایەوە، ئەم ململانێیە لەسەر گرتنی جڵەوی کاروباری سیاسی و ئابووری ئەم ناوچە هەرە پێشکەوتوو و هەرە دەوڵەمەندەی سەر رووی زەمین بووە، تا ئێستاش ئەم ڕکەبەرێیە جارێ بە کشانەوە بۆ دەستبالایی لە ولاتەکەدا هەر بەردەوامە، هەر لەم سەردەمە کۆنەدا، هاتنی ئارياییەکان ڕوویدا و کۆمەڵگەی کوردستان بوو بە کۆمەڵگایەکی بە زمانی هیندۆئەورووپی و ئەم گۆڕانە لە سەردەمی کلاسیکدا گەیشتە ئەوپەڕی.

ناوەڕۆکی ئەو خشتە نووسراوانەی کە تا ئێستا لە کوردستان دۆزراونەتەوە و هێشتا هەر ناوی "ئیلامی سەرەتایی Proto-Ilamite " یان بۆ دانراوە، هێشتا نەکراونەتەوە و نە وەریش گێڕراون، بۆیە ئەم سەرچاوە سەرەتاییانەی مێژووی هەرە کۆنی کورد لەم کاتەدا بابەتی پشت پێ بەستان و کردنە بەڵگەنین، هەر لەبەر ئەمەش، مێژووی ئەم چاخە دەبێ سەرلەنوێ دارێژرێتەوە، و تۆماریەندی گەلانی دراوسێ، لەو شوێنانەدا کە باسی چیانشینە کوردەکان دەکا، بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنرێتەوە. ئەگەر ڕاستت دەوێ دەکرێ لە زۆرینەی ئەو تۆمار بەندیانەدا ناوی تیرە کوردەکانی ئەمڕۆ، هەروەها شوێن و ولاتەکان و شتی وا دەستنیشان بکرێن، هەر بۆ ڕێنمایی، لەهەر شوێنێکیان کە وشەی "قوتیل"مان بەرچاو کەوت، ئەوا یەکەندەردوو دەتوانین بڵێین مەبەست کوردە و ئەمەش هەرە کۆنە ناوی کوردە (بڕوانە کەسایەتی نەتەوەیی).

ئەگەر بمانەوێ دەست بخەینە سەر ئەو هەموو پادشاییەتی و شار و دەوڵەتە سەربەخۆیانەی کەپێش هاتنە کایەوەی میدیەکان (١١٠٠ پ ز کە بەیەکخەری ولاتەکە دادەنرێن) لە کوردستاندا حوکمران بوون، ئەوا بێ یەك و دوو دەبێ باسی پادشانشینەکانی

کوموهو، مەلیدی، گورگوم، ئونگی (ئونکی)، کامانو، کاسکو، نایری، شوپریا، ئورکیش، موشکو، ئورارتو، نامار، ساوبارو، کورتی، ماردو، لولوبی، کاردۆ، زاموا، ئەللیپی، جگە لە هەردوو پادشانشینیماننا و قوتیل، بکەین. ئەم ناوانە. ئەوانەن کە تا ئێستا لە تۆماریەندیەکانی مێژۆپۆتامیادا باسیان کراوە. بەلام ناوە خۆولاتیەکانیان هێشتا هەر لە دوو تۆیی خشتە نووسراوەکاندا چاوەڕوانی کردنەوەن. هەندێکیان لەم سەردەمەدا، شوێنکاری خۆیان لەسەر ناوی شوێنەوار و تیرەی کورد دەردەخەن. بۆ نموونە، ناوی موشکو ئێستا وا بەسەر شار و ناوچەی مووشەوە (موس) لە باکووری ڕۆژاوای کوردستان، ئەم پادشانشینە، بەرلەوەی لەلایەن تیگلات پیلەسەری پادشایی ئاشوورەوە (١١١٤-١٠٧٦ پ ز) داگیر بکرێ، دەیتوانی ٢٠٠٠٠ سەرباز لە یەك ئاندا بڕژێنێتە مەیدانی جەنگەوە و لێکدانەوەکانی ئێستا بۆ ئەوە دەچن کە کۆتایی هێنان بە دەسەلاتی (حیثیەکان) لە ئەنەدۆڵ (ڕۆن ١٩٩٠) لەسەر دەستی ئەمان بوویێ. هەروەها ناوی ماردۆ هێشتا لە ئەفسانە سەرزاریەکانی کورداندا، لەشێوەی مارد (مەرد)دا باس دەکرێ، کە کەسایەتیەکی خەیاڵییە و بە یەکێك لە باپیرە هەرە هەرە گەورەکانی ئەم گەلە دادەنرێ، هەر ئەم ناوە خۆی لەناوی شاری ماردینی کوردستانی ڕۆژاوا دا خۆی دەنوێنێ، مەلیدیەکان ناوی خۆیان بە شاری مەلاتیە بەخشیوە، کە ئەویش هەر لە ڕۆژاوای کوردستانە، هەر بەم نەزمە، لۆلۆبیەکان بوونە بە ناوێکی ئەتنی و لە (لوڕ)ەکاندا خۆیان دەرخستوە (نەخشەی ژمارە ١٣).

لە دوادوای هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا، قوتیلەکان توانیان شارە دەوڵەتەکانیان لە چوارچێوەی یەکیەتیەکی سیاسییدا یەکخەن و بکەونە تەنینەوەیەکی یەکجار بەربلاو بۆ دەرەوەی کوردستان (نەخشەی ژمارە ١٤). لە ئەنجامدا بنەماڵەیەکی نوێی حوکمڕانیان پێکەوە نا لە سۆمەرستان و ئەکەرستان کە لە (٢٢٥٠)ەوە تا (٢١٢٠)ی پ ز ڕاندی. ئەم تەنینەوەیەی قوتیلەکان بە ملی ئەم دوو وڵاتەدا تاکە تەنینەوەیە کە لە تۆماریەندییەکاندا باس کرابێ، بەلام لەوانەیە لە دواڕۆژدا چەندی تری بێتە سەر. شتەکە لەسەر بەرهەمی لێکۆڵینەوەی نوێ بەندە.

لەبارەی ئەم قوتیلانەوە نارامسینی پادشای ئەکەدستان (٢٢٩١-٢٢٥٥ پ ز) نووسیویەتی: "هەر کە گەیشتینە ناوەندی چیاکان، لەناکاودا لێمان دەرپەڕین، پەلاماریان

داین و بوونی خۆیـان سـەلماند.. ". پێـنج سـاڵ دوای مردنـی نـارام سـین، هـەر ئـەم چیاییانە خۆیان پادشانشینەکەشیان لەناو برد، بـە گـوێرەی قـسەی سـۆمەریەکان هەرنـەبێ هۆزێـك لـە نەوەکانی قوتیلەکان تائێستا لەناوماندا ماون. ئەوانیش زێباریەکانن کە سۆمەریەکان

نەخشەی ژمارە (13): پلاشانشین و شارە دەوڵەتەکانی کوردستان تا پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیا.

Melidi
Mushku
Hasanlu
Arbela
Jarmo
IRANIAN
PLATEAU
Ganj Dara
Aratta
Gawdin
AKKADIA
Nippor
S Y R I A
M E S O P O T A M I A
Scale
Km. 0 100 200
Miles 0 50 100 150
ANSHAN
Susa
Uruk
ELAM
Lagash
SUMERIA
Ur
Persian Gulf
نەخشەی ژمارە (14): ئیمپراتۆرییەتی قوتیلەکان
دەوروبەری 2100 پێش عیسا.
بڕکردنی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەتەکە
ناوجەرگەی ئیمپراتۆرییەت
Aratta : ئەراتا: پایتەخت؟
ئەو شوێنانەی ئەمڕۆ زۆربەی دانیشتووانیان کوردن
بڕکردنی تۆکەندی فارس لە 2100ی پێش زایینیدا
تێبینی:
مێزۆپۆتامیای لێدەرچێ، سنوورەکانی تر سایەقتین.

بەسوبیرۆ یان ساوبارۆ باسیان دەکەن. زێباریەکان تائێستاش لەهەمان زێدووار دەژین، کە نووسراوەکانی پێش چوار هەزار ساڵی سۆمەریەکان باسیان کردوە– واتە باکووری شاری هەولێری کوردستانی ناوەند. خشتە نووسراوێکی سۆمەریەکان، تەنانەت ناوی تیریجان ناوێکیش دەبا کە پادشایی قوتیلەکان بووە. ئەمە هەمان ناوی یەکێکە لە خێڵە کوردەکانی سەردەمانی کۆن واتە تیریجان کە تائێستاش دراوسێی زێباریەکانن و لە باکووری ئەوانەوە دەژین. لەوانەیە، هەرناوی ئەم خێڵە خۆی بێ کە بەتیگرانی پادشایی ئەرمەنەوەبێ(سەدەی دووەمی پ ز) کە بەبنەچە کوردە(بروانە تیرەکان ومیژووی کلاسیك).

داهێنانە پڕبایەخەکانی قوتیلەکان لە کاتێکدا هاتنەکایەوە کە کۆمەڵگای کوردەواری لە گەرمەی پرۆسەی یەکبووندا بوو لە ئەنجامی کۆچکردنی حۆریەکاندا. حۆریەکان بەزمانێك، یان کۆمەڵەزمانێك دەدوان، کە سەرچاوەی لە باکووری ئەفقاسەوە هەڵقوڵابوو و زیاتر لە زمانەکانی گورجی و چەچانی و ئاڤاری نوێ نزیك بوو (بروانە دەیاکۆنوف و ستاروشین ١٩٨٦). لەم کۆچکردنەیاندا، حۆرییەکان بە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەوە و لەگەڵ خۆیاندا گۆڕانێکی فەرهەنگی، بگرە زمانیشیان هێنایە ناوەوە و لە هەموو سەرزەمینی کۆنی زاگرۆسدا تۆویان کرد و بەمە لە یەك ناسنامەدا یەکیان خستن (بروانە کۆچکردنە مێژووییەکان) (ڤیلهیلم ١٩٨٩). تەنها واژەی نەتەوەیی کە هی ئەو سەردەمەبێ و تا ئێستاش مابێتەوە واژەی (ئیەنزی) یان (یانزی)یە کە واژەیەکی دەوڵەتیارییە و هی قوتیلەکانە و بە مانای (حوکمدار) یان (حوکمفەرما)دێ. شوێنی حوکمداریەکەش لەم شار و دەوڵەتانەی سەرزەمین زاگرۆسدابن. ئاسەوارێکی گەلێ گرنگتری ئەم فەرهەنگە سیاسیە ژیرانەیەی ئەم شارەدەوڵەتانەی ئەو سەردەمە کۆنانەی کوردستان هێشتا هەر ماوە، لە خشتە نووسراوەکانی ئاشووریەکانەوە بەشێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ دەگەینە دەرەنجامێك کەوا بە پێچەوانەی ئەو شێوە حوکمڕانیە سیاسییە بێدادیانەوە کە ئەوسا لە مێزۆپۆتامیا زۆر باو بوونە، حوکمڕانانی دەوڵەتی (مانی) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات (کەوێ دەچێ پایتەختی لە حەسەنلوی کۆنە شوێنەوار و دێرینە بوویێ)، لە کاروباری دەوڵەتیارییدا زۆرتر دیموکراتانە ڕەفتاریان کردوە و هاونیشتمانان ڕۆڵێکی کارا و چالاکیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا گێڕاوە.

لەم بارەیەوە ئای. ئێم. دەیاکەنۆڤ. کە شارەزا و سەرچاوەیە لە کاروباری دەوڵەتەکانی

سەرزەمینی میدیا و زاگرۆسدا دەڵێ:" وا دیارە پادشـایی مـانی وەكـو فەرمانڕەوایـەكی بێـدادۆ ستەمكار حـوكمی نـەكردوە، بـەڵكو هەمیـشە ئەنجومـەنێكی پیرانـی لـە تەنیـشتەوەبوە بـۆ ڕاوێژكاری". لە نامەیەكی دیبلوماسیانەیدا بۆ پادشـایی ئاشـوور ئـەو خـۆی بـە تـەنها بڕیـاردەر دانانێ، بەڵكو دەڵێ" خۆم و پیاوماقوڵان و پـیران و ڕاوێـژكارانی وڵاتەكـەم" دەیاكـەنۆڤ ١٩٨٥، ٧٢". ئـەم ڕەفتـارە دێرینەیـەی مانیـەكان، كـە بریتییـە لـە جۆرێـك فرەڕایـی لـە بڕیاردانـدا و تارادەیەك بۆیە بە ئاوێنـەی فەرهـەنگێكی سیاسـی خۆشـڕەفتارانە، زۆرجـار لـە ڕەفتـاری ئـەو خانەوادە حوكمڕانە سەرەكییانەدا، دەردەكەوێ كە بەڕەگ دەچنەوە سـەر وڵاتـی كوردسـتان، هەر لە مانیەكانەوە بگرە تا دەگەیتە ئەدیابینیەكان و ئەییوبیەكان و زەندیەكان.. هتد.

لە ٦٥٢ی (پ ز)دا بابلییەكان، وەكـو لـە خـشتنووسەكانی پـاش خۆیـان دەردەكـەوێ، بـە هەموو چیاكانی كوردستان و دانیشتووانیان وتوە "قوتیل"، ئەم ناوە میدیەكانیشی گرتۆتـەوە كە لەو سەردەمەدا چنگی دەسەڵاتیان تـا كـەنارەكانی دەریاچـەی وان لـە كوردسـتانی بـاكوور توندكردبوو. لە پاڵ ئەمەشدا، ئـەوان بـەرە بـەرە نـاوێكی تریـشیان بـۆ كـوردان بـەكارهێنا كـە ئـەویش كـاردۆ یـان كـاردۆك بـوە، كـەوێ دەچـێ لـە هـەمان وشـەی قوتیلـەوە وەرگیرابـێ. ڕەگوڕیشەی "كارد" لەوانەیە بچێتەوە سەر "كارد"ی سامی – ئەكەدی، هەروەها "كورد" كـە وشەیەكی هێندۆئەوروپییە. هەردوو وشەكە بە مانای پاڵەوان یان جەنگاوەر دێن.

لە تەلمودیشدا، هەردوو وشەی (Qardu) یان (Kardo)، هەرچەند بە جۆری تریشبێ، ناویان هاتووە. ڕاستییەكەی، چ تەلموود چ تەورات، دوو سەرچاوەی باشی كۆنینـەن لەسـەر كـوردان. بـۆ نموونـە تـەلمود لـە شـوێنێكدا دەڵـێ: "سـەنناخریب، لـە گەڕانەوەیـدا بـۆ ئاشورسـتان، قـەدەدارێكی دۆزییـەوە.. شێوەی قەدەدارەكـە جۆرێـك بـوو كـە ئـەو بـە بـتی زانـی و كەوتـە پەرستنی. بە لێكدانەوەی ئەو، پارچە دارەكە بەشێك بوو لەو كەشتییەی كـە نـووحی لـە لافـاو ڕزگاركردبوو. ئەو نەزری كرد، كە كوڕەكانی بكا بە قوربانی بۆ ئـەو بتـە ئەگـەر لـەو جەنگانـەدا سەركەوێ كە بەدەستیەوە بوون، كوڕەكـانی بەمـەیان زانیـو بـە هـەموویان باوكیـان كوشـت و بەرەو كاردۆ هـەڵاتن. یـان دەڵـێ: پارشـانداكای كـوڕی هامـان كـە حـوكمڕانی كاردۆنیـابوو كـە قەدەدارەكەی لێ بوو. یان دەڵێ:– "ئیبراهیمی باوكمان دە ساڵ زیندانی كرا، سیانی لـە كوثـا و حەوتی لە كاردۆ". دیسانەوە هەر تەلمود دەڵێ:– "ئەوانەی تـازە دێنـە سـەر ئایینەكـەمان،

وەردەگیرێن ئەگەرچی کاردۆییش بن" ئەو کۆمەڵگا جوولەکەیەی کوردستان کە تا ئەم دواییەش کۆمەڵگایەکی گەورەبوو لەوانەیە ڕەگ و ڕیشەی بچێتەوە سەر ئەم نۆجوولەکانە.

پادشانشینە کوردەکان، لەبەر ئەوەی پێشکەوتوو و خاوەن موڵك و وارێکیی تا بڵێی بە پیت و بەرەکەت و خۆش هەوا بوون، بووبوون بە مایەی چاوتێبڕینی دەوڵەتەکانی هەرێمی مێزۆپۆتامیا و تەدارەکدانی هێرش و پەلامار بۆ سەریان و تاڵانکردنی سەرزەمینەکانیان، خشتە نووسراوەکانی سەردەمە دواییەکانی ئەکەدیەکان کە هی ١٤٠٠ ساڵ پێش زایین و (ئەرشیفەکانی ئەمارنا لەمیسر)، باسی پادشانشینێکی چیانشین دەکەن کە ناوی کورتی(Quritie or Kortie) )بوە و هەر لە باکووری مێزۆپۆتامیاوە تا ڕۆخەکانی دەریاچەی وان حوکم فەرما بووە، خشتەکان دەڵێن: ئەم پادشانشینە لەلایەن پادشاکانی کاشییەوە لەناوبراوە، سێ سەدە دوای ئەوە و لە سەردەمی پادشا تیگلاث پیلەسەردا (١١١٤–١٠٧٦ پێش زایین)، سەرچاوەکانی ئاشوورییەکان. باس لەوە دەکەن کەوا ئەم (کورتی)یانە کە دانیشتووی چیا دراوسێکانی باکووریان بوون، لەلایەن ئەم پادشاییەوە شکێنراون و تێکوپێك دراون، هەروەها هەندێ خشتە نووسراوی سەردەمی دواییی بابلیەکانیش باس ئەوە دەکەن کە (کارداکا)کان بەشێك بوون لە گاردی پادشایی.

ئەو شەڕ و شۆڕانەی کە لەم ماوەیەدا لەنێوان دەوڵەتە کوردەکانی بڵندایییەکان و دەوڵەتەکانی پێدەشتە نەوییەکانی مێزۆپۆتامیادا دەقەومان، چەندین داگیرکاری سەربازی، تاڵان و بڕۆ، وێرانکاری و بەکۆیلەگرتنیان بە دواوەبوو و لە هەموویاندا مێزۆپۆتامیا دەستی باڵای هەبوو دەستی کوشندەی لە ئابووری و مەدەنیەتی کوردستان دەوەشاند. شارەکان خاپوور دەکران و ژمارەیەکی زۆری کۆیلە و گیراوی تر دەریەدەر دەبوون. بەمجۆرە دارەڕای ئابووری وڵات تێکوپێك درا، وڵاتی کوردستان تووشی شڵەژان و بێ سەرەوبەرەیی بوو، دەرەنجام ئاری نەژادەکان خۆیان تێهەڵکردو، ئەوەبوو میدیایی و سیثیەکان داگیریان کرد. بەم جۆرە کوردستان، تا ٢٠٠٠ ساڵ دوای ئەوە (تەنها لە سەدەی سێیەمی پاش زایینەدا کۆتایی هات) لەلایەن چەند شەپۆلی بەردەوامی خەڵکانی هیندوئەورووپایی زمانەوە – وەکو میدیەکان – ژێر خرا هرۆژمەکە هێندە بەتین و نەفەسبڕ بوو کە خەڵکەکە زمانە ناوخۆییەکانی خۆیان واز لێ هێناو لەجیاتی ئەوە کەوتنە بەکارهێنانی شێوەیەکی کۆنی کوردیی هێندۆئەورووپی.

پرۆسەی ئەم گۆڕانە زمانییە تا ماوەیەکی کورتی پێش داهاتنی سەردەمی مەسیحیەت نەوەستایەوە. دەرکەوتنی شێوە ناوی شوێنەکان بە زمانی هیند ۆئەورووپی و ئێرانی، لە سەدەی سێیەمی پیش زاییندا لە شوێنە دوور دەستەکانی کوردستاندا بوو بە باو. بۆ نموونە، رووباری فورات لە باکووری رۆژاوای کوردستان لە تۆماریەندیە کۆنەکانی ئەرمەنییدا لە شێوەی (ئاراسان)دا هاتووە، هەروەها پتۆلمی (هاران) بۆ (ئاراکیس)ی ئەوپەڕی باکوور بەکار دێنێ و (ئاران) بۆ رووباری (خابوور) لە رۆژاوای ناوەند و ئوروتس (هاراڤانت) بۆ رووباری (ئاسی ) لەوپەڕی باشووری رۆژاوای کوردستان. ئەمە بەڕوونی دەرەنجام و کۆتایی هاتنی ئەم پرۆسەیە دەردەخا.

تێینی تەواوی ئەم بەسەردادانەی ئاریەکان لە زاگرۆس و هەرێمەکانی دراوسێی لە دەورووبەری ١٢٠٠–٩٠٠ پێش زاییندا شوێن دەستی باش دیاربوو لەوەدا کە وێرانکاری جەستەی ولاتەکەو و شێواندنی لە رووداهات و کۆمەلایەتی و بازرگانییەوە، کوردستان و سەرەنجام هەموو باشووری رۆژاوای ئاسیای خستە بێوڵەتی کۆمەلایەتی و ئابوورییەوە (بڕوانە رۆن ١٩٩٠). دەرەنجامی ئەم هەرەسە گەورەیە ئەوەبوو گەلێ سەنتەری فەرهەنگ و مەکۆی پڕ کارو پڕتاوی بازرگانی بوون بە کۆنەوار. هێزی هەمەلایەنە و نەفەسبڕی ئەم داگیرکەرە ئاریانە، بە تەواوەتی روخسارە فەرهەنگی و ئەتنییە کۆنەکانی کوردستانی شێواند و داپۆشی. نەك هەر کوردستان. بەڵکو ئەم لافاوە بێ ئامانە هەردوو سەرزەمینی ئێران و ئەنەدۆڵیشی بەو دەردە برد (بڕوانە کۆچکاریە مێژووییەکان). بە کۆتایی هاتنی ئەم چاخە، واتە لە ٩٠٠ی پ ز دا، کوردەکان بوو بوون بەئاری. ئارییە تازە هاتەکان و کوردە بە ئاری بوەکان، لە سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا، لەژێر ئالای میدیەکاندا بالی دەسەلات و هەژەلی خۆیان بەسەر زۆریەی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەندا کێشابوو، لەژێر ئالای میدیەکاندا، بەر لەم تەنینەوە هەمە لایەنەی دەولەتی ماد (کە سالی ٧٢٧ پ ز دامەزرا)، چەندین وردە خانەوادەی پادشاییی هیندۆئەورووپی زمانی تر چ لە کوردستان و چ لە دەورووبەری دامەزرابوو. مێتانیەکانی (کوردستانی رۆژاوا ) و حیثیەکانی (باکووری رۆژاوای کوردستان و ناوەندی ئەنەدۆل)، بەناوبانگترینی ئەم خانەوادانە بوون.

یەکەم پادشایی هەلبژاردەی ماد کە ناسرابێ (ئەوە دەبێ بزانین کە میدیەکان سەرۆك

دەوڵەتەکانی خۆیان هەڵدەبژارد، هیرۆدۆتس ئەم شایەدییەی داوە ٨٥-٩٧-١) دەیوسیس یان دیاوکۆ بوە (٧٢٧-٦٧٥ پ ن)، ئەم پادشاییە هەر کە هاتە سەرمەکۆی کار، کەوتە بەجێهێنانی بەرنامەیەکی یەکخستنی هەموو دانیشتووانی کوردستان بۆ بەرگرتن لە پەلامار درندانەکانی هێزە ئیمپریالیستیە ئاشووریە نوێ سەرهەڵداوەکان (٧٤٥-٦٠٦ پ ن)، هەر ئەمە خۆی وای لە ئاشووریەکان کرد لێی بکەونە پارێز و لە ئەنجامدا تەفروتونای بکەن. فرائورتیس یان خشا ثریتا کە دوابەدوای ئەو هاتە سەر تەخت (٦٧٤-٦٥٣ پ ن)، بەهەمان ڕێبازی دەیوسیسدا ملی ناو و ئەویش هەر بە دەستی ئاشووریەکان بەهەمان دەرد چوو.

دوای ئەوان سیاخاریسی مەزن[5] (یان هۆڤاخشاثریتا ٦٢٤-٥٨٥ پ ن) هات کە سەرنجام توانی ئاشووریەکان دەرپەڕێنێ و ئینجا، پاش داگیرکردنی نەینەوای پایتەختیان، لەناویشیان بەرێ (٦١٢ پ ن). تەورات بەخوشناوازیەوە ئەم ڕووداوە باس دەکا و بە ئەنجامی پێشبینیە وردەکانی ناحوم پێغەمبەری دادەنێ لە بارەی وێران بوونی دەنگدەرەوەی "نەینەوای ستەمکار"ەوە.

ئەو ماوەی ١٥٠٠ ساڵەی مێزۆپۆتامیا تیایدا باڵادەست بوو بەسەر بڵندایییەکانی کوردستاندا (لەژێرکەوتن و دارمانی قوتیلەکانەوە) سەرەنجام ئاوەژوو بوەوە. ئەم ئاوەژوو بوونەوەیە هەر درێژەی کێشا تا داگیرکردنی سەرزەمینەکە لەلایەن ئیسلامەوە لە سەدەی حەوتەمی پاش زایینیدا ئەویشی ئاوەژوو کردەوە، هۆکارێکی زۆر سەرەکیی لەسەرکەوتنی ئەم ڕووداوە سەردەمسازەدا بەکارهێنانی زیرەکانەی میلیشیا یان گەریلا بوو. ناوی ئەو کاتەی ئەم گەریلایانە "کارا"بوە وەکو لە بەردەنووسەکانی کێوی بەهیستوون لە کوردستانی باشوور دەردەکەوێ (دەیاکەنۆف ١٩٨٥-١١٥). ئەم تۆمارە کۆنترین نووسراوە لەسەر ئەم جۆرە تاکتیکە جەنگییە، کە لەو کاتەوە بۆتە باشترین شێوەی بەرگری لە کوردستاندا و ئێستاش هەر باوە و خۆی لە "پێشمەرگە" یان "جەنگاوەری گەریلا"دا دەنوێنێ.

سیاخاریس سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی بەجۆرێك پان کردەوە کە هەموو کوردستانی تا ڕۆخەکانی ڕووباری هالیس (قیزیل ئیرمەقی ئێستا) نزیك ئەنقەرە گرتەوە کە لەڕۆژاواوە لە سنووری کوردستان زۆر دوورە (نەخشەی ژمارە ١٥).

---

[5] (کەیاخسار یان کەیخوسرەویش بەکاردێت: ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەیخوسرەوین... ) د. کەمال مەزهەر.

رشتی ڤێگا ئازهی دەهاك (كە هیرۆدۆتس بە ئەستیاگس ناوی دەبا ٥٨٤–٥٩٤ پ ن) ئیمپراتۆریەتەكەی خۆی بۆ كوڕەزایەكی دایك فارسی، واتە سیرۆسی مەزن كە بە دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی فارس دادەنرێ، بەجێهێشت.

لە سەردەمی حوكمڕانی ئەژیدەهاكدا، ئایینی نەتەوەیی كورد، واتە ئایینی تیرەی فریشتەكان، كارێكی زۆری لەسەر ئایینی تازە داهاتووی زەردەشتی هەبوو بەوەی كە داب و نەریتە كەهەنووتیەكانی مەجووسیەكانی تێخست. پادشا زەردەشتیەكانی ئەخەمینیەكان، كە دوابەدوای میدیەكان هاتنە سەركار، هەوڵیاندا ئەم كارتێكردنە ئاوەژوو بكەنەوە، بەڵام لەمەدا سەركەوتنێكی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنا و نەیانتوانی ئایینە ئەسڵیەكە بهێننەوە ناوان، واتە زەردەشتیەتی ڕەسەن بەو شێوەیەی كە لە گاتاكاندا هاتووە و بریتییە لە كۆنترین و پاكیزەترین بەشی ئاڤێستای كتێبی پیرۆزی ئایینی زەردەشتی. لەوانەشە هەر لەم سەروەختەدا زەردەشتیەكان ناوناتۆرەی ئەهریمەنییان خستبێتە سەر ناوی ئەژی دەهاك كە نازناوێكی پادشاییانەی شەرەفبەخشە و بەم جۆرە چ لە ئایینی زەردەشتی و چ لە میثۆلۆجیای نیشتمانیی و ئەدەبی داستانی ئێراندا ڕەنگی دابێتەوە. ئەژی دەهاك هێشتا لای پەیڕەوانی ئایینی كوردی یارسانی مایەی ڕێزوستایشە و ناوی سوڵتان سەهاكی بۆ خۆی وەرگرتوە (بڕوانە تیرەی فریشتەكان).

شان بە شانی تاخمە ئاری نەژادەكانی تر، میدیەكان و ئەو خەڵكە كوردەی كە بەر لەوە هەبوون، بەتەواوەتی تێكداتوانەوە، بەمەش كۆمەڵگای كوردەواری لە تاخمێكی كۆنە قەفقاسیایی نزیكتر لە گورجی هاوچەرخەوە گۆڕا بۆ كۆمەڵگایەكی هیندۆئەورووپی ئێرانی كە تا ئێستا وەكو خۆی ماوەتەوە.

كەلتووری میدی لە كوردستاندا هێشتا هەرپایەدارە. ئەم پایەداریە لە شێوەی زمانی هاوچەرخی كوردییدا خۆی دەردەخا، هەروەها لەناوی جێگا و شوێنەكاندا، لەم ڕووەوە واژەی ماە یان مایی واتە میدیایی جێی سرنجن. پاشماوەی سیثۆئالانەكانیش وەكو هی میدیەكان وایە لە كارتێكردندا. ئەم ناوە شوێنانەی ئێستاكە وان بە هەندێ شارەوە وەكو سەقز یان ناوی خێڵەكان وەكو ئالانەكانی پیرانشەهر لە كوردستانی ناوەندا كاریگەریی ئەم پاشماوەیە باش دەردەخەن، نموونەی تریان وا لەناوی بنەماڵەی میرزادەی ئەردەلان (ئالانە مەزنەكان)دا. نەك

هەر ئەمە، بەڵکو لەناوی مەمی ئالانی پاڵەوانی گەورەترین داستانی میثۆلۆجی کورد واتە (مەم و زین)یشدا دەردەکەوێ.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** L.D. Levine and T.C. Young, ed., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia*, Vol. 7 (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, 1977); I.M. Diakonov (Diakonoff), "Media," in Ilya Gershevitch ed., *The Cambridge History of Iran*, Volume 2, *The Median and Achaemenian Periods* (New York: Cambridge University Press, 1985); Ephraim Speiser, "Southern Kurdistan in the Annals of Ashurnasirpal and Today" *The Annual of the American Schools of Oriental Research* VIII (1926-27); Arthur Tobler, *Excavations at Tepe Gawara*, 2 vols (Philadelphia: University of Pennsylvania Press, 1950); W.A. Wigram, *The Assyrians and Their Neighbors* (London: G. Bell, 1929); H. Weiss and T. Cuyler Young, "The Merchants of Susa: Godin V and Plateau-Lowland Relations in the late Fourth Millennium BC," *Iran* XIII (1975); W. Hinz, "Persia, ca. 2400-1800 B.C.," *The Cambridge Ancient History*, 3rd edition (New York: Cambridge University Press, 1984); T. Cuyler Young, "A Comparative Ceramic Chronology for Western Iran, 1500-500 B.C.," *Iran* III (1967); T. Cuyler Young and L.D. Levine, *Excavations at Godin Tepe, Progress Report* I-II, Art and Archaeology Occasional Papers 17 and 26 (Toronto: Royal Ontario Museum, 1969, 1974); M. Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990); M.A. Dandamaev and V.G. Lukonin, *The Cultural and Social Institutions of Ancient Iran*, trans. P. Kohl (Cambridge: Cambridge University Press, 1989); I.M. Diakonov, "Evidence of the Ethnic Division of the Hurrians," in M.A. Morrison and D. Owen eds., *Studies in the Civilisation and Culture of Nuzi and the Hurrians...* (Winona Lake: Eisenbrauns, 1981); M.I. Diakonov and S.A. Starostin, *Hurro-Urartian as an Eastern Caucasian Language. Münchner Studien zur Sprachwissenschaft* 12 (Munich: R. Kitzinger, 1986); K. Kamp and N. Yoffee, "Ethnicity in Ancient Western Asia During the Early Second Millennium BC: Archaeological Assessments and Ethnoarchaeological Prospectives," *Bulletin of the American Schools of Oriental Research* 237 (1980).

EUROPE
Black Sea
CAUCASUS
Caspian Sea
Aral Sea
Chorasmia
SOGDIANA
BACTRIA
Empire
ARIA
IONIA
Lydian
Empire
Mediterranean Sea
PHOENICIA
SYRIA
Babylonian
Empire
Ecbatana
SAMARIA
Babylon
Memphis
JUDEA
ELAM
ANSHAN
EGYPT
Scale
Km. 0 200 400
Miles 0 100 200 300
CARMANIA
PERSIS
INDIA
MAKRAN
Persian Gulf
Indian Ocean
نەخشەی ژمارە ( 15 ): ئیمپراتۆرییەتی میدیا لە هەرەتی بڕكردنی دەسەڵاتیدا
خاكی میدیا
ئەو شانشینانەی سەربە ئیمپراتۆرییەتەكە بوون و لە لایەن كەینەخسارەوە خرابوونە سەری.
ئەو سەرزەمینانەی ئەژیدەهاك دەستی بەسەردا گرتبوون
ئەو سەرزەمینانەی ئەمرۆ زۆربەی دانیشتووانیان كوردن
سەرچاوە:
دیاكۆنۆف 1985 نەخشەی ژمارە(5)

# مێژووی کلاسیك: ٥٠٠ پێش زایین– ٦٠٠ پاش زایین

ئـەم ماوەیـەی مێـژووی کـورد بەرجەسـتەکەری یـەکڕەنگبوون و یەکـدگیری ناسـنامەی نەتەوەیی هاوچەرخی ئەم گەلەیە. وشەی کورد وەکو ناسنامەیەکی ئەتنی درەنگانێکی درەنـگ چەسـپا و بـوو بـە پێناسـەی پارچـە جیاکـانی نەتـەوە. دامـەزران و جێگیربـوونی ئارییـە کۆچەرەکان نزیکەی هەزار ساڵی برد و تەنها پاش ئەوەی کە تێکەڵبوونی ئارییەکان[6] لەگەڵیاندا بۆیان بوو بە مایەی ژیانەوە، ئینجا پادشاییەتی یە سەربەخۆ و بزێوە کوردەکان توانیان، دوای سـێ سـەدەی ژێـر دەسـتەیی و نقومبـوون لـەناو ئیمپراتۆریـەتی ئەخـەمینی و سـلوقییدا، سەردەرکەنەوەو دیسانەوە بێنەوە ڕاستایی ژیانەوە و وەکو دەوڵـەت خۆیـان بشەنگێنن. ئـەم ژیانەوەیە لە سەدەی یەکەمی پێش زایینـدا گەیشتە ئەوپـەڕی گەشـە، کـاتێ کـە قەڵـەمڕەوی سیاسی کورد هـەر لـە یۆنـان و ئۆکرانیـاوە گرتیـەوە تـا دەگاتـە تەنگـەی هـورمز. لـە دوادوای کۆتایی هاتنی ئەم سەردەمە، کارفەرمایی کورد لـە بـاکووری ڕۆژاوای ئاسـیادا لـە سیاسـەتەوە گواستیەوە بۆ بـاری ئـایین و دیموگرافیـا و ئەمـە تـا چـەرخەکانی ناوەنـدیش هـەر بـەو نەزمـە ڕۆیشت.

لەگەڵ داهاتنی چەرخی کلاسیکدا، زینۆفۆن، کە مێـژووناس و فەرماندەیـەکی یۆنـانی بـوو، بەخۆی سەرکردایەتی بەرەنگار بوونەوەیەکی لەگەڵ کوردەکـان کـرد، کـاتێ پـێش لەشـکرێکی دە هەزارکەسـیی بـەهێزی یۆنـانی کـەوت و لـە سـاڵی (٤٠)ی پـێش زایینـدا و بـە مەبەسـتی قەدبڕکردنی ڕێگا، بەناو کوردستاندا، ملی نا. دانیـشتووانی وڵاتەکـە کـە بـە کاردۆچـۆی ناویـان دەبا و کە هەرچەندە لەناو جەرگەو ناوەندی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی فارسدا دەژین "بـەڵام بە تـەواوەتی سەربەخۆن و بـەهیچ جۆرێك سـەردەمدارانی ئـەو ئیمپراتۆریەتـە بـە ژووردەسـتی خۆیان ناکرن"، (بڕوانە ئەناباسیس: ڕێگایەك بە کوردستاندا) لە بەرامبەردا، مێژووناسێکی تـری یۆنانی، دیۆدۆراس، هەر بە ماوەیـەکی کـورت دوای ئـەوە دەڵـێ کـەوا کوردەکـان " لـە کـون و

[6] واتە ئەوانەی لە ڕووی ئەتنیکییەوە بە ئاری ئەژاد دەناسران – وەرگێڕ).

کەلێنی چیاکانیانەوە، بۆ ئێمە گەلێ زیاتر مایەی سەریەشەبوون، لەوەی لەگەڵ لەشکر و ئیمپراتۆریەتەکانی تردا ناویان دەرکردبوو" و کەوا " تەنها بە بەکارهێنانی هێز یان رێککەوتن توانیمان کارێك بکەین کە لە تێکدانی باروئۆخی پێدەشتەکان دووریان بخەینەوە".

هەر دوابەدوای سرنجرێژیەکانی زینۆفۆندا سترابۆی جوگرافیاناس و زانای مێژوو لە سەدەی سێیەی پێش زاییندا دەنووسێ "کورتیۆیەکانی فارسستان - باکووری رۆژاوای ئێران - و ماردەکانی ئەرمینیا- باکووری ناوەندی کوردستان لە تورکیای ئێستادا- کە بەهەمان ناو خۆیان دەناسێنن، خاوەنی یەك خەسڵەت و کەسایەتین" (بروانە کۆچکاریە مێژووییەکان) لە هەندێ قسەی تری سترابۆوە ئەوە هەڵدەهێنجین کەوا کوردەکان، کە بەناوی دێرینەی "کورت"ەوە ناسراون، لەو کاتەدا لە هەرێمەکانی ئەنەدۆڵ و ئەرمەنستان و باکووری سوریا و عێراق و لە هێڵێکی پان و بەرینی رۆژاوا و باشووری رۆژاوای ئێراندا هەبوونە. هەرچی پۆلیبیۆسی مێژوونووسە، لە ٢٢٠ی پێش زاییندا، کوردەکان( یان کۆرتی بە گوێرەی باسەکەی ئەو) بەدانیشتووی میدیا و ئەنەدۆڵی رۆژهەلات (کە تا ئێستاش هەر لەوێن) دادەنێ. بە تێکڕای دەنگ، وشەی کورت (کە لە تێکستە لاتینیەکاندا بە کێرتی ناو دەبرێ) بەڕچەڵەك باوك و باپیری ڕاست و ڕاستەوخۆی وشەی (کورد)ی ئەم سەردەمەیە. ڕاستییەکەی لە تورکی هاوچەرخدا، ئەو وشەیەی بۆ کورد بەکاردێنرێ هەمان وشەیە کە لەسەرچاوە فارسیەکانی ناوەندا بەکارهێنراوە تەنها بەیەك جیاوازیەوە، ئەویش (u)ە کەی فارسی کراوە بە ئوی (ü)ی تورکی بروانە (Kurd)ی فارسی و (K rtü)ی تورکی.

سەرەڕای ئەوەی کە وشەی (کورت) سەرچاوەی ڕاستەقینە و باوە بۆ ناوی کوردان بەلام شێوەی تریش تا سەردەمە هاوچەرخەکانیش هەر مانەوە بۆ نموونە، پلینی، کە مێژووناسێکی رۆمە، لە سەرەتای سەدەی یەکەمی پێش زاییندا لەبارەی ئەم پرۆسەی گواستنەوەیەوە دەنووسێ:

"لەناو ئەدیابیندا، (کوردستانی ناوەند لە باکووری عێراق) ئەوگەلە نیشتەجێیە کە لەمەوبەر بەکاردۆشی دەناسرا و ئێستا بە کوردۆی دەناسرێ و ڕووباری دیجلە بەناو وڵاتەکەیاندا تێدەپەڕێ، (Natural history، V1، Xviii، 44).

داهاتنی سەدەی چوارەمی پێش زایینی و هەرەسهێنانی هەخامەنشیان لەسەر دەستی

ئەسکەندەری مەزن، لەهەمان کاتدا مێژوورێژی کۆتایی هاتنی مێژووی دێرینی کورد و دەستپێکی مێژووی کلاسیکیەتی.

ئیمپڕاتۆریەتی سلووقیان، کە دوای مردنی ئەسکەندەری مەزن (٣٢٣ پێش زایین) یەکێك لە فەرماندەکانی ئەو (سلۆقس—وەرگێڕ) لەسەر سەرزەمینە داگیرکراوەکانی ئاسیا دایمەزراندبوو، لە کۆتایی سەدەی سێیەمی پێش زاییندا و لە پرۆسەی دارمانیدا، بەرە بەرەو پارچەپارچە خاکەکانی بۆ ئیمپراتۆریەتی تازە هەڵکەوتووی پارثیا لە دەست دەدا. پارثیەکان لەگەڵیّ ڕووەوە دەشوبهانە کوردەکان بەڵام لەگەڵ ئێرانیەکانی تر بۆنموونە فارسەکان جیاوازبوون، بە تایبەتی لە پادشا گەردانی ناو کارفەرمایی سیاسییدا. زۆربەی کوردەکان یان بە خوایشتی خۆیان هاوپەیمانییان لەگەڵ ئەو فیدراسیۆنە پارتیەدا بەستا کە لە تەنینەوەدابوو، یان کەوتنە ژێر دەسەڵاتیەوە ئەم فیدراسیۆنە کە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زایینەوە بە هەرچوارلادا کەوتبوە پەل هاویشتن لە دووکوت سیّ کوتی ڕۆژەڵاتی کوردستان کەوتە ناو سنووری فیدارسیۆنەکەوە، لەو چوار سەدەی تەمەنی پارثیاندا (لە ٢٤٧ی پێش زایینەوە تا ٢٢٦ی پاش زایین)، هەموو پادشانشین و دەسەڵاتگە کوردەکانی گۆردیەن/ گوردوێن (بتلیس و سێرتی ئێستا)، ئەدیابین (هەولێری ئێستا)، مادا (میدیا)، ئیلیمایس (لوڕستانی ئێستا)، کێرم (کرماشانی ئێستا)، موکریان (مەهابادی ئێستا)، شارەزوور (سولەیمانی ئێستا)، بارشان (بارزانی ئێستا)، ساناك (سەهنەو[7] کەنگاوەری ئێستا) هەموو ئەندامی کارا و پڕکار و نیمچە یان تەواو سەریەخۆی ناو ئەو فیدراسۆنە بوون (نەخشەی ژمارە ١٦).

پادشاییەتی کوردیی ئەدیابین، کە پایتەختەکەی لە ئەربیلا/ ئەربیل (هەولێر)ی ئێستا) بوو، لێرەدا ، لەهەموو ئەوانی تر شایستەی سرنجە، بەتایبەتی لەبەر ئەو مێژووە ئایینیەی کە هەیەتی. پاش ئەوەی کە چینی باڵای شارەکە لە سەدەی یەکەمی پێش زاییندا هەموو چوونە سەر ئایینی جوولەکە، زۆربەی دانیشتووانی وڵاتەکەش چوونە سەر ئەو ئایینە. کە ڕۆمەکان هێرشیان بردە سەر یەهودا و سامیرە (٦٧—١٧ی پێش زایین) تەنها ئەدیابین هێز و کەرستە و تفاقی بۆ ڕزگارکردنی خەڵکەکەیان نارد و نەك هەر ئەمە بەڵکو لە هەولّی بیّ ئەنجامی پاراستنی گەلیلیشدا ئەدیابین بەشداری کرد (گرەیزل ١٩٦٨—١٦٣).

[7] لە هەر شوێنێك سەهنە/سەحنە هات، ناوی یەك شار دەبەخشیّ).

نەخشەی ژمارە ( 16 ): پادشانشینەكانی كوردان لە سەردەمی پارثی و ڕۆمانەكاندا

نەدیابین: پادشانشینی كورد - ئەندام لە فیدراسیۆنی پارثیاندا

پۆنتۆس: پادشانشینی سەربەخۆی كورد. دوایی چوونە نلو كۆمار/ ئیمپراتۆریەتی ڕۆماوە.

ئەرمینیا: پادشانشینی دراوسێ و ئەندام لە فیدراسیۆنی پارثیاندا.

ئەو سەرزەمینانەی ئەمڕۆ زۆربەی دانیشتووانیان كوردن.

با لەوە لاچین، لە سەدەی چوارەمدا ئەدیابین بەگشتی وەرگەڕابوە سەرئایینی مەسیحی، بۆیە تۆماریەندی كەنیسەكان باشترین بەرجەستەكەری مێژوویی ئەو سەردەمەن و ئاوێنەی بێ خەوشی مێژووی ئەو ماوەیەی كوردن (بڕوانە جوولەكەیی و مەسیحیەت). وشەی لاتینراوی ئەدیابین چەوتكراوەی ناوە كوردیەكەی خێڵی هەضەبان یان هەزەوان/ هەزلوەندە.. ئەم خێڵە

کوردە گەورەیە لە سەدەی سێیەمی پێش زاییندا لە باشووری زاگرۆسەوە هاتبوو و لە کوردستانی ناوەنددا نیشتبووە و، لە دوا دوای سەدەکانی ناوەڕاستدا هەندێ پاشماوەیان هێشتا لە باشووری زاگرۆس هەر مابوون (بڕوانە خێڵەکان). هەضەبانەکان خێرا بالادەستی سوپایی و سیاسی خۆیان لە هەرێمەکەدا داچەسپاندوو ئەربیلای دێرینیان کردە پایتەخت بۆ خۆیان و بۆ ماوەیەکی زۆر ناوی ئەتنی خۆشیان لێی نا بەم جۆرە ناوی ئەربیلا کرا بە "هازا"تا دوای ئەوەی کە ساسانیەکان وڵاتەکەیان داگیرکرد ئەوەبوو ئەردەشیری یەکەم ناوی خۆی بە سەریدا دەسەپاند و بوو بە نۆتار ئەرتەخشیر. (ئیسلامەکان دوای ئەوەی وڵاتەکەیان گرت ناوە ئاشووریە کۆنەکەیان خستەوە سەری و بوو بە ئەربیلا، تا لە کۆتاییدا لەسەر ئەربیل نیشتەوە) ئەگەرچی هەضەبانیەکان سەرەنجام لە سەدەی سێیەمی پاش زاییندا دەسەلاتیان لە دەست داو و بوونە ژێردەستەی ساسانیەکان بەڵام لە سەدەی پانزەیەمدا دیسانەوە هەڵسانەوە و میرنشینی ئەیوبییان، دامەزراند کە سوڵتان سەلاحەدینی لێ کەوتەوە (بڕوانە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست).

هەر لەو کاتەدا کە لە سێ بەش دووبەشی کوردستانی ڕۆژهەلات خەریك بوو بەرەبەرە لەگەڵ پارثیادا یەکدگیر دەبوو. سێ پادشاییەتی ڕۆژاوای کورد (کاپادۆچیا، کۆماجین و بەتایبەتی پۆنتۆس) پەلی سەربەخۆیی تەواوی خۆیان بەرەو دەریایی ئیجە و ئەولاتریش دەهاویشت. ئەگەرچی لە مەدادویماکار لەگەڵ کۆماری ڕۆمدا پێکدا هەڵبڑان و دوا بەداوی ئەوە، کەوتنە ژێر دەستیەوە. بەڵام ئەم سێ دەوڵەتە ڕۆژاوا نشینەی کوردان هەروا بە ئاسایی نەچوونە ژێر ڕکێفی ڕۆمەکانەوە. تا سەردەمی سێ فەرماندە و قونسوولی ڕۆمەکان، واتە ماریۆس، نوکولاس و پۆمپەی تێنەپەڕی ئەم کاری داگیرکردنە نەگەیشتە ئەنجام. پادشانشینی پۆنتی لە ڕۆژگاری هەرە پرشنگداری حوکمیدا، بە فەرماندەیی میثریداتسی مەزن (میثریداتسی شەشەم، یۆپاتۆر، ۱۲۱–۶۳ پێش زایین)، تا یۆنان و قەفقاسیا و داوێنی ئۆکرانیا قەڵەمڕەوی حوکمی بوو (نەخشەی ژمارە ۱۷).

نەخشەی ژمارە (17): ئیمپراتۆرییەتی كورد لە سەردەمی پادشا میثریداتیسی شەشەمدا (دەوروبەری ساڵی 86ی پ.ز

ئەوەی جێی سرنج و ڕامانە، سەرچاوە کۆنە یۆنانیرۆمیەکان کە باسی میثریداتس و گەلیٚ پادشایی تری بەرچەڵەك کوردی ئەم سەردەمە دەکەن، بە "فارس" یان لە قەڵەم دەدەن. ئەوان لەبەر دووهۆ وا دەکەن: یەکەم، ئەوان هەر کەسێك کە بچێتەوە سەر ڕچەڵەکێکی ئێرانی لە ڕووی فەرهەنگ و ئەتنییەوە، بە "فارس"ی دادەنێن. بەڵیٚ کوردەکان ئێرانی بوونە و هەر ئێرانیش. ئەو کاتە زمانی کوردی زیاتر لە ئێستا لە زمانی فارس نزیك بوە، ڕاستییەکەی سترا بۆ لە دەورووبەری ئەو سەردەمەدا هەمان قسەی کۆنی هیرۆدۆتسی دووپات کردۆتەوە کە دەڵی "میدیەکان و فارسەکان دەتوانن بە ئاخاوتن لێك بگەن" هەرچەند نەختێك بە گرانی، ئەو لە هەمان کاتدا کوردەکان بە (کیرتی) و دانیشتووانی میدیاو پێرسیس (واتە پێرسیا) ناودەبا. هۆکاری دووەم ئەوەیە کە ڕەوکردنە مەزنەکانی کوردەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی زاگرۆسەوە، کوردانیان لە شوێنی خوارووی وەکو پیرسێسەوە بەرەو پۆنتوس و شوێنی تری ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ ڕادەماڵی.

سنووری پانەوە کراوی کۆماری ڕۆم و فیدراسیۆنی پارتیا، هەندەی پیٚ نەچوو ساڵی (٥٧)ی (پ، ز) لەسەر ڕووباری فورات لێکیان دا. دوای ئەوە یەك سەدەی تەواوی جەنگی خوێنین دەمی کردەوە. ئەم جەنگە ڕۆژاوای کوردستانی تێگلاند و سەرەنجام فوراتی کردە سنووری نێوان هەردوو هێز. بەم جۆرە سێیەکی ڕۆژاوای کوردستان کەوتە ژێر حوکمی ڕۆمەوە، ئەوانەی لەم ژێر کەوتنەدا بەرکەوتن بریتی بوون لە پۆنتییەکان، کەپەدوچیەکان و کۆماجینەکان، لەگەڵ ئەمانیشدا کوردەکانی ئەمانۆس لە چیاکانی سەر ڕۆخی دەریای سپیی ناوەڕاست، (کە کەمتر ناسراون و هەمیشە پشتگویٚ خراون) بەرکەوتن. وەکو دەردەکەویٚ، هەر لەسەردەمانی کۆن کۆنەوە ناوچەکانی سەر بڵندایییەکانی ئەمانۆس و دەورووبەری ئەنتاکیە و بە درێژایی لێواری دەریای سپیی ناوەڕاست، نشینگەی کوردەکانی ڕۆژئاوا بوە. کۆنەوشەی کوردیی ئۆرنتس (ئاسیی ئەم سەردەمە) کەبەو ڕووبارە گەورەیە دەوترا کە لە ئەنتاکیەوە دەچێتە سۆریاوە بەلگەیە بۆ ئەوەی کوردان لە سەردەمی ئەسکەندەردا لەو مەرزوبوومە بوونە. کەلەپووری هونەری ئەم هەرێمە، تا دەگاتەوە سەردەمی حەلەف (٨٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر) یەکیەتیەکی سرنجکێش لە دارشتن و شێوەدا لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستاندا دەسەلمێنیٚ (بڕوانە دارشتنی نەخشکاری وێنەی هەڵکۆڵراو). لە سەردەمی

ئیقلیمگیریەكانی ئەسكەندەری گەورەدا، كوردەكان كە ئەوسا بە تەواوی بوویوون بە ئاری نەژاد و هەموو چیاكانی ئەمانووسیان بەدەستەوە بوو.

پادشا سلووقیە یۆنانیەكانیش بە تایبەتی ئەنتیۆچەسی دووەم، هەولّیاندا ئەم كوردانە لە شاری تازە دروستكراوی ئەنتاكیە و بەندەری ئەسكەندەروونە (٣٠٠ پ. ن) جێنشین بكەن. گەلێ خانەوادەی دەسەلاّتداری كورد، بەتایبەتی ئەوانەی بە ڕچەلّەك میرزادە بوون، وەكو ڤێراس (كۆمەلّە خێلّی بەرازیی ئێستا) و بەلّكانا (كۆمەلّە خێلّیی بەلیكانی ئێستا) بە بەردەوامیی لەم مەلّبەندە بازرگانیە پێشكەوتوانەدا نیشتەجێ بوون و پێوەندی قایمیان لەگەلّ فەرمانڕەوا ڕۆمەنوێیەكانی هەرێمەكەدا هەبوو. ئەم پەیوەندیەی نێوان كورد و ڕۆمەكان تا سەرەتای سەدەی هەشتەمی پاش زایین و دومایی هاتنی دەسەلاّتداریی ڕۆمەبێزەنتیەكان لەناوچەكەدا درێژەی كێشا. لە هەردوو ئابلۆقەدانەكەی سالّی (٢٦٠)ی پاش زایین بە سەركردایەتی شاپووری یەكەم و سالّی (٥٣٨)ی پاش زایین بەسەركردایەتی خوسرەوی یەكەم، كوردەكانی دەورووبەری چیاكانی ئەمانۆس لە داكۆكی كردن لە ئەپامیا و ئەنتاكیەدا بەشداریيان كرد. ئەنتاكیە لەو سەردەمەدا سێیەم گەورە شاری ئیمپراتۆری ڕۆمی بیزەنتی بوو.

بە چوونی ڕۆژئاوا و باكووری كوردستان بۆ ناو قەلّەمڕەوی ڕۆمەكان تیرەی فریشتەكان كە تیرەیەكی خۆیی كوردبوون، دەرفەتێكی زۆر نایابیان دەست كەوت (بڕوانە ئایین) تا ئایینی كۆنی ڕۆمانەكان وەربگرن و لە بەرگی میثرائیەتدا بیكەن بە ئایینی تایبەت بۆ خۆیان. ڕاستیەكەی ئەم تیرەیە لە چەندین سەدەوە لە ئالّوگۆڕ كردندا بوو لەگەلّ هەموو ئایینەكاندا لە سنوورەكانی ڕۆژئاوای سەرزەمینەكەدا. كە میثرائیەت لە كوردستاندا چەسپا ئینجا دەستی كرد بە تەشەنەكردن بەرەو دوور تا گەیشتە بەریتانیا. نەك هەر ئەوە بەلّكو تا ڕادەیەكی زۆریوو بە جێگری ئایینی ڕۆمەكانیش و پێش ئەوەی مەسیحیەت ببێ بە ئایینی ڕەسمی دەولّەت، میثرائیەت گرنگترین ئایینی ئیمپراتۆریەكە بوو.

یەكێك لە ڕووداوە درشتەكانی ئەو سەردەمە كەجێی سرنج بێ، ئەو هەڕكردنە بە كۆمەلّە گەورەیەی كوردە لە باشووری زاگرۆسەوە بۆ باكووری ڕۆژاوای و بەرەو زنجیرە چیاكانی تۆرۆس و پۆنتۆس. كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا لە ئەنەدۆلّ، جێی نیشتنەوە بوون بۆ ئەم

ڕادانە ناوخۆییەکە بەلافاو کوردی لە شوێنی دووری وەکو چیاکانی پیرسیس (فـارس ئیـستا)وە ڕماڵی. ئەم بارکردنە بە کۆمەڵە، توانی تەباییەکی کۆکی نەتەوەیی و فەرهەنگی بـۆ کـورد لـەم سەری وڵاتەکەیانەوە بۆ ئەوسەری دەستەبەر بکا. بۆ نموونە پەهلەوانیی کرد بە زمـانی بـاو لـە کوردستاندا (بڕوانە زمان)، هەروەها تایەفەی فریشتەکانی کرد بە سـەردەمداری ئـایینی هـەموو وڵاتەکـە (بڕوانـە ئـایین). لـە پـەنای ئەمەشـدا، تـا ڕادەیـەکی دوور ئـەدەب و هونـەر و گیـان و سـەلیقەی نەتـەوەیی کـوردی یەکخـست و تۆپـەڵیکرد. لـە کۆتـایی سـەدەی هەشـتەمی پـاش زاییندا، ئەم تەباییە خۆی لە شـێوەی نـوێ کردنـەوەی باڵادەسـتیی سیاسـیی کـوردان بەسـەر ناوچەکەدا دەرخست، کە لە سەردەمی میدیەکانەوە لە دەست چوو بوو. تـانی ئـەم مەسـەلەیە و زۆرتر دوان لە بارەی ڕادانی دانیشتووانی کورد لە بابـەتی (کۆچـکاریە مێژووییـەکان)دا بـاس کراوە.

لـە دەورووبـەری سـەدەی سـێیەمی پـێش زاییـندا، کۆماجینـەکان، کـە پەدوچـییەکان و پۆنتوسـەکانی ئەوپـەڕی بـاکووری ڕۆژاوا، ژمارەیـەکی زۆری خێڵـی ڕاداوی کوردیـان گرتبـوە خۆیان. لە یـەك گەلەکۆمەکێدا بـۆ میترایداتیـسی پادشـایی کـوردی پـۆنتی یـەکان،(١٤) خێـڵ لەمانـە دژ بەڕۆمـەکان خۆیـان دابـوە پـاڵی، ئـەم هێـزە خێڵەکیانـە بوویـوون بـە پێـشڕەوی لەشـکرەکەی و بـەردەوام هێرشـیان دەبـردە سـەر پێـشەنگی لەشـکری ڕۆمـەکان. بەرلـەوەی لەشکری پۆنتیەکان بە ناو خـاکی ڕۆمـدا پێشڕەوی بکـەن و دڕ بـە لەشـکری ڕۆم بـدەن، شـان بەشانی چەند کەرتە سوپای دەریاوان، ئەم چەکدارە خێڵەکیانە لە سیلیسیاوە بە بەلـەم دایـان بەسەر شارە کنار دەریاییەکانی ئەیۆنییەکاندا بەر لەوەی بەرەو ئەورووپا بپەڕنەوە. پلوتارك لە کاتێکدا بە دزوجەردەی دەریا ناویان دەبا، لە بارەیانەوە دەنووسێ کەوا "ئـەوان کـە گەیـشتنە چیای ئـۆلیمپس بەشـێوەیەکی سەرسـووڕێنەر کەوتنـە قوربـان کـردن و بـە جێهێنـانی هەنـدێ دەستووراتی ئایینی یان کردەوەی نائاسا کە هەندێکیان بابەتی ئایینی میثـرایـی بـوون (بڕوانـە تیرەی فریشتەکان).

جگـە لەناوچـەکانی بـاکووری ڕۆژئاوایـی کوردسـتان، ئـەرمینیا و باشـووری گورجـستان و ئارانیش بوون بە مەڵبەندی نیشتنەوەی لەسـەرخۆی ژمارەیـەکی زۆری خێڵـە کوردەکـان. ئـەم تازە هاتانە، ڕۆڵێکی یەکجار گرنگیان بینی لە مێژووی گەلانی ئەو وڵاتانەدا لەسـەردەمە کۆن و

ناوەندەكاندا. مێژووناسی ئەرمەنی مۆسێسی چورێن كە پسپۆڕی مێژووی سەرەتای سەدەی ناوەندی ئەرمەنستانە (كە لەنێوان ٤٩٠-٧٦٠ پاش زایینـدا ژیاوە) باسێكی سەیری مێژووی سەرەتای ئەرمەنیەكان دەكا، كە بەشێكی ئەفسانەوارە، و تێیدا پەیوەندیەكی بەهێز لەنێوان خانەوادەی ئەژی دەهاكی پادشایی میدیا و پادشا و ئەرسیتۆكراتەكانی ئەرمەنییدا دووپات دەكاتەوە. ئەو دەنووسێ كەوا باوباپیرانی دیكرانی پادشایی ئەرمەنستان لە بنەماڵەی ئەژی دەهاك بوونە، بەڵام لە دەست زۆرداریی ئەو ناچارماون لە دەستی هەڵبێن، (مێژوو ١١٤-١٣٩).

لە داستانی (شاهنامە)دا، فیردەوسیی شاعیری فارس دەڵێ ئەژی دەهاك خەڵكی ولاتی باشوور و باشووری ناوەندی كوردستان و نزیكی هەمەدان بووە. هەر ئێرەش ئەو مەرزو و بوومەیە كە ئەژی دەهاك حوكمڕانیی دەكرد، بەم جۆرە دەكرێ قسەكانی مۆسێس بەوە لێك بدرێتەوە، كە مەڵبەندی باوباپیرانی تیگران لە هەمان هەرێمی ناوچەكانی باشووری كوردستان بوویێ.

مۆسێس لە باسەكەیدا بە ئاشكرا دەڵێ لەسەرویەندی ڕێكخستنەوەی پادشاییەتی ئەرمەنیان لەسەر دەستی مەلیك ڤالارشاگدا، چینی دووەمی دەسەلاتی دەوڵەت پەنایان بردۆتەبەر "توخمی ئەژدەهاك" ئەو چینە خۆیان وەكو بنەماڵەی خانەدانی موراتسیان ناساندووە. هەروەها لە قسەكانی مۆسسیدا، باسی پادشاییەكی تری ئەرمەنی دەكرێ، كە ناوی ئێرواندە (كە لە سەدەی دووەمی پاش زایینـدا ژیاوە) و لەگەڵ ئەرتاشیسی پادشایی پارتییدا جەنگاوە. بەم جۆرە ئێرواند لەلایەن موراتسیانی ئەرسیتۆكراتی ئەرمەنی میدیەوە پشتگیری دەكرێ، بەڵام سەرەنجام لە هەوڵەكەیدا سەرناكەوێ و ناچار دەگەڕێتەوە بۆ ولاتەكەی خۆی "ئێرواندافان" ئێرواند جۆرێكە لە شێواندنی هاراڤاندیان /هالڤاند/ ئەلڤاند كە ناوی بڵندترین و پیرۆزترین چیای میدیایە، واتە ئەو چیایەی كەوا بەسەر شاری كۆنە پایتەخت و دێرینی هەمەدانـدا دەڕوانێ. ناوی ئێرواندەڤان (وشە ڕاستەكە ئەرڤاندا ڤەندە)، ناوێكی ڕەسەنی خێڵەكییە و بە خێڵێكی كوردی دانیشتووی باشووری كوردستان دەوترێ[8].

---

[8] ئێستا ناوی ئەم خێڵە بوە بە وەندو لەمەشەوە پاشناوی "وەندوی" وەرگیراوە. سەیر ئەوەیە هەندێ كەس بەم پاشناوەوە خۆیان كردووە بە توخمی نەتەوەی تر- وەرگێڕ

هەوڵەکە بۆ ئەوە دراوە کە رەچەڵەکی تیگران لەباری ئەتنییەوە بەرنەوە سەر فارسەکان، هەر وەکو لەسەرەوە باسکراو لە بابەتی (خێڵەکان) و (کۆچکاریە مێژووییەکان) دا هاتووە. رەگە کوردیەکەی تیگران تا بڵێی دیار و ئاشکرایە، دەبێ ئەوەش لە بیر نەکرێ کەوا لە سەردەمی کارفەرمالی پارثیەکاندا کە چوار سەدەی بردو و لە ساڵی (٢٢٤)ی پاش زاییندا کۆتایی هات، فارسەکان وەکو بوونێکی ئەتنی تەنها کەمایەتیەکی بچووك بوون لە هەرێمە دوور دەستەکانی باشووری فیدراسیۆنی پارثیدا کە پتر لە هەزار میل لە ئەرمینیاوە دوورن، لە کاتێکدا زەویەکانی ناو بەینیان مەنزڵگای کوردانە و ئەوانی لێ دەژین. هەر وەکو ئەوەی لەسەرەوە لەمەڕ مەڵبەندی ڕاستەقینەی میثریداتیسی شەشەمی پادشایی پۆنتیانەوە باسمان کرد، ئەو وشەی (فارس)یە کە بۆ وەسفکردنی ڕەچەڵەکی ئەتنیی تیگران وتراوە، بە مانای (ئێرانی) دێ کە قەدێکی ئەتنیکی گەورەیەوە و کورد یەکێکە لە لقەکانی.

مێژووی گەلی ئەرمەن و ئەرمەنستان، لە هەموو بارێکدا، سەرچاوەی هەرە بە نرخە بۆ دارشتنەوەی مێژووی کوردو گواستنەوە و کۆچکردنیان لە سەدەکانی کۆن و ناوەڕاستدا.

ئەو رۆڵەی ئەریستۆکراتە کوردە کۆچکردوەکانی باشوور بینیان، ئەتوانرێ بەو رۆڵە بشوبهێنرێ کە خانەوادە ئەرستوکراتە ئەڵمانەکان لە ئەوروپادا تا داهاتنی ئەم سەدەی ئێستامان بینیان. ئەم خانەوادانە بە ژن و ژنخوازی چەندین پادشا و دۆق و شازادەیان بەخشییە بنەماڵە پادشاییەکانی نەتەوەی دیکەی وەکو جیورجیەکان، یان خۆیان بوون بە پادشا لە وڵاتە تازە پێکهاتووەکاندا کە پێویستیان بە حوکمڕانێك بوو خوێنی پادشاییەتی لە دەماریدا هەبێ. ئەوان خوێنی شازادەییان لە دەماردا بوو کە بۆ ئەو مەبەستە پێویست بوو، بەڵام شتێکیان کەم بوو کە ئەویش ملکەچکردن بوو بۆ ئەو ئیمپراتۆری و پادشانشینە سەر بە گێچەڵانەی کە ئەوکاتە لەسەر مەکۆی فەرمان بوون. ئەم بەزمە هەر بەم نەزمە تا کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستی دەوامی کرد.

بە گراتیەکانیش، وەکو ئەو ئەدیابینیانەی بەر لەمە باسمان کردن، جێی سرنجی تایبەتین. ئەوان هەر لە بناوانەوە سەرۆکایەتی خێڵی ناودارو گەورەی بەگرەوەند بوونەو لە ماوەیەکی کورتدا سەرۆکایەتیەکیان بۆ خۆیان پێکهێناوە و بەو جۆرە بنەماڵەیەکی حوکمڕانیان بۆ خۆیان سازداوە. ئەم بنەماڵەیە بە ناوی باگراتیان ناوی دەرکرد. هەر ئەمان خۆیان، ناوی

خێڵەكەی خۆیان بەخشی بە ناوچەی باكووری ڕووباری دیجلە كە پتولمی (باگراواندین ڕیجیۆBagrawandine Rejio)ی پێ دەڵێ. ئەوانیش وەكو هەضەبانیەكان، ناوی( ئامێد)ی پایتەختی دێرینیان گۆڕی و خستیانە سەر ناوی خێڵەكەی خۆیان. دیارە بەكر كە لە (دیاری بەكر- سەرزەمینی بەكران)ەوە وەرگیراوە گەورەترین شارە لە كوردستانی ئەنەدۆڵ. بەگراتیەكان، هەرچەندە ماوەی حوكمڕانیەكەیان پڕبوو لە كەموكورتی گەورە گەورە، تا ساڵی( ١٨٠١ ) حوكمڕانیی گورجیەكانیان كرد، واتە تا ئەوكاتەی ڕووسیا گورجستانی داگیركرد.

ئەم بنەماڵە كوردە دێرین و خاوەن جێ و ڕێ و زیرەكانە بە ئاسانی و خێرا لەناو كۆمەڵە ئەتنییەكانی دەوری خۆیاندا جێیان دەكردەوە و دەچەسپان. مێژووی بنەماڵەی ئەیوبیی سەدەكانی ناوەڕاست (كە لە هی بەگراتیەكان باشتر تۆماریەند كراوە) وێنەیەكی بێ خەوشە كە چۆن بنەماڵەیەكی خانەدانی كورد كاتێك دەكەوێتە وڵاتێكی بێگانە چ زوو زۆریەی هەرە زۆری خەسڵەتە ئەتنیكیەكانی خۆی ون دەكا. تیگرانی مەزن، كە بە كەڵە پادشایی هەرە گەورەی ئەرمەنیان دادەنرێ، هەرچەندە بە ڕەسەن كوردیش بوو، بەلام لە هەموو بارێكەوە، بەوپەڕی دڵسۆزی و ئەرمەنیایەتیەوە حوكم فەرمایی گەل و وڵاتی ئەرمەنستانی دەكرد. تاقە بەڵگە بۆ ڕەتكردنەوەی ئەم بۆچوونە ڕەنگە ئەو بڕیارەی بێ كە بۆ جێی پایتەختی نوێی وڵاتەكەی دای، ئەوەبوو چووتێگرانۆ كێرتای پایتەختی نوێی لە قووڵایی سەرزەمینێكی كوردنشین (لەو شوێنەی پتۆلمی بە گۆردینا گوردەی و پلێنی ناوی دەبا) و لە دەرەوەی خاكی ئەرمەنستان دامەزراند. ئەمە دەتوانرێ بەوە لێك بدرێتەوە كە ئەو گەلێك لە ڕادەبەدەر بە ڕابردووی كوردانەی خۆیەوە بەندبووە. ئەو كوردانەی لەناو كۆمەڵی ئەتنیكی دیكەدا دەئامێتان، لە قەوارە نوێیەكانیاندا پلە و پایەی زۆر گرنگیان وەردەگرت لە سەدەكانی ناوەڕاستدا. ڕاستییەكەی ئەم ڕاستیە تا ئێستاش هەر وەكو خۆیەتی، (بڕوانە كۆچكردن و توانەوە).

ئەردەشیری یەكەمی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریی ساسانی، كە لە ساڵی (٢٢٤)ی پاش زاییندا بوو بە میراتگیری كۆنە فیدراسیۆنی پارثیان، هەر كە هاتە سەرتەخت یەكسەر پەلاماری بردە سەر ئەو پادشاییەی كە بە "پادشایی كوردە میدیەكان" ناوی دەبرد. ئەم پادشاییەش كاتێ

هەستی بە مەترسی هێرشەکە کرد بە پەلە و هەڵەداوان ژمارەیەك بنەماڵەی حوکمڕان و پادشاییەتی بەسام و هەیبەتی کوردی هەر لە بارشان (بەرزان) و هەکار (هەکاری)یەوە بگرە تا دەگەیتە موکران (موکریان)، سەنەك (سەهنە) و شارەزوور لەژێر ئالای پادشاییەتی کەرم (کرماشانی ئەم سەردەمە)دا کۆکردەوە و لێکیدان، ئەردەشێر ناچاربوو بچێتە جەنگێکی دوو ساڵەوە (لە ٢٢٤ پاش زایینەوە تا ٢٢٦) لەگەڵ کوردەکاندا تا لە ئەنجامدا تولنی سەربەخۆیی لە چنگی ئەو چەند پادشاییەتیە کوردانە بپچڕێ. ئەمەی تەنها کاتێ بۆکرا، کە بە پێچەوانەی سیاسەتی سەنترالیزەکاری سەختەوە کە پەیڕەوی دەکرد، ناچار ما شازادە کابوس کە حوکمڕانێکی ناوخۆیی کورد بوو بخاتەوە سەر کار تاوەکو پادشاییەکی خودموختار حوکمی کوردە میدیەکان بکا. خانەوادەی کایۆس، وەکو بنەماڵەیەکی حوکمڕانی نیمچە سەربەخۆ تا ٣٨٠ی پاش زایین حوکمڕانیی کوردستانی ناوەند و باشووری کرد، تا ئەردەشێری دووەم (٢٧٩–٢٨٣ پ ز) دوا شازادەی ئەم بنەماڵە کوردەی لەسەر تەخت لادا. دوا شازادەی بنەماڵەکە (کە پلەی ویسامەکانی دومباوەند لە بنەماڵەی کاڤۆسەکان)[9] ی هەبوو لەلایەن سەرچاوە کۆنینەکانی ئەرمەنیەکانەوە بەهاوچاخی ئارشاکی پادشایی ئەرمەنیان (٣٥٢–٣٦٧ پ ز) دادەنرێ. بنەماڵەی کایۆس تاقە بنەماڵەی حوکمڕانی نیمچە سەربەخۆی کورد بوو لەو پێنج سەد ساڵەی دواییدا.

ئەم ڕووداوە یەکجار گرنگە لە مێژووی کورددا، بەوەستایانە لەسەر تاوێرە بەردێکی تاقی بێستوون، کۆنە ئاسەواری پایتەختی مێژوویی کرم و میرنشینی کایۆس (بڕوانە سەر بەرگی ئەم کتێبە) هەڵکەنراوە. ئەم ڕووداوە (هەرچەندە کەلێنێکی هۆنەزانراوی حەوت ساڵیی تێدایە)، بووە بە سەرەتای ڕۆژ ژمێری نەتەوەیی کورد، کە بە گوێرەی ئەو ئێمە ئێستا (ساڵی ١٩٩٢) دەکەوینە ساڵی (١٦٠٤)ەوە (بڕوانە ئاهەنگ و میهرەجانەکان).

ئێستاش لە دەورووبەری کۆنەشاری دینەوەر، لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کرماشان، ڕیزە گۆڕێك لە دڵی تاشە بەردەکانی چیاکەدا هەڵکەنراون، ئەم گۆڕانە هی بنەماڵەی کاوس یان کایۆسن. جێی سرنج لێرەدا ئەو ناوەیەکە بۆ جەنگاوەرە کوردەکان لە دەقی ئەسڵیی داستاننامەی

---

[9] لە ئەسلە ئینگلیزیەکەدا: wisamakan of dumbawand from the family kavusakan

جەنگەكەی ئەردەشیر (واتە كارنامەك)دا بەكار هاتووە. ئەمان بۆ ئەو جەنگاوەرانە ناوی (جانسپار)یان بەكار هێناوە كە وشەیەكی فارسیە.

ئەم وشەی (جان سپار )ە لە فارسیدا، بەرامبەر بە وشەی "پێشمەرگە " دێت كە لە سەردەمی ئێستاماندا كوردان بۆ جەنگاورەكانیان بەكاری دێنن و هەردووك بەمانای (گیانبەخش ) دێن.

بابەشێك كەمایەی سەسوڕمانە ئەوەیە كە پاشماوەی پارتیەكان، خودی ئەردەشیریان بەوە تاوانبار كردووە كە گوایە "كورد" و "ڕۆڵەی كورد بووە و لە باوەشی كورداندا گەورە بووە" (بڕوانە كارنامە و مێژووی ئەلتەبەری). هەر وەكو لێرەدا بینیمان، كوردەكان لەو سەردەمەدا دانیشتووی خاكی ئەردەشیر، واتە پێرسیس بوون و كارنامە دەڵێ كەوا باوكی ماوەیەكی زۆری لاویەتی خۆی لەگەڵ كوردان (كورتان)دا بردۆتەسەر. بەهەرحاڵ، هیچ بەلگەیەكی ڕاستەوخۆی ئەوتۆ بە دەستەوە نیە كەوا ئەو لەگەڵ كورداندا پەیوەندییەكی ئەتنیكی هەبووبێ.

پاش لابردنی بنەماڵەی كایۆس لە ساڵی ٣٨٠ی پاش زاییندا و تا داڕمانی دەوڵەتی ساسانیەكان لە ٦٥١ی پاش زاییندا، باس لە هیچ قەوارەیەكی كورد نەكراوە چ بە سەربەخۆیی یان بەشێوەی خود موختاری لە كوردستان، یان هەر جێیەكی تردا حوكمی كردبێ لەژێر دەسەلاتی بیزەنتییەكاندا، ئەرمەنیەكان كە مەسیحی بوون، لە حوكمڕانی خاكی خۆیان بێ بەش كرابوون، چ جای كوردەكان كە مەسیحیش نەبوون. لە چارەی كوردان وا نووسرابوو كە تا هاتنی ئیسلامەكان و لەبەین بردنی دەوڵەتی ساسانیان و ڕامالینی بیزەنتیەكان بەرەو دوا، نەتوانن بێنەوە سەر ڕاستای كار و جڵەوی حوكمڕانیی لەسەر خاكی خۆیان بگرنەوە دەست.

لە دوا دوای سەدەی چوارەمدا، ئاپۆرایەكی گەورەی خێڵی كۆچەر كە لە باكوور و ڕۆژهەلاتی هەردوو ئیمپراتۆریی بیزەنتی و ساسانییەوە داماڵابوون ملیان نابوو بە سنوورەكانی ئەم دوو دەوڵەتەوە. لەهەمان كاتدا یەك سەدەی تەواوی ئالۆزیی سیاسی و ئابووری ناوخۆیی و ناردنی هێزە سوپاییەكان بۆ ناوچە سنووریە دوور دەستەكان بۆ بەرەنگاریوونی فشاری خێڵە كۆچەرەكانی دەشتە كاكی بە كاكییەكانی باكوور، دەرفەتێكی بۆ كوردان ڕەخساند كە لەژێر سێبەری توانای ئابووری و بە شەریی خۆیاندا، هەندێ دەسكەوت بۆخۆیان بهێننە

دەست، ئەوەبوو دەستیان کرد بە دان بەسەر ناوچەکانی دەورووبەری خۆیاندا. لەهەمان کاتدا، چ لە ڕاستای فەرهەنگدا، چ لە هی ئایینداا، هەندێ پێشکەوتنیان دەسکەوت.

ئەو کارەساتە گەورانەی کە لەم سەردەمەدا بە گوڕ، چ لەڕاستای زەوی و ژینگە، چ لەڕاستای باری ئابوورییدا ڕوویاندا، بێگومان بوون بە مایەی گەلێ سەرهەڵدانی کۆمەڵایەتیش، بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا کە لەژێر دەستی ساسانیەکاندا بوون، ئەوەبوو لە چیاکانی زاگرۆسەوە شۆڕشگێڕێك هاتە خوارەوە. ئەم شۆڕشگێڕە مەزدەك بوو کە بزووتنەوەیەکی نوێی لەسەر بنچینەی بیروڕای تیرەی کوردی فریشتەکان دامەزراند. ئەم هەرایە زۆری پێ نەچووبوو بە پەلامارێکی تر بۆ سەر زەردەشتییەت بە ئامانجێکی هەڵووشینی (دوای ئەوەی لە کۆتایی سەردەمی میدیەکاندا، بزووتنەوەکە بەشێوەیەکی بەهێزی خۆی نواندبوو). بۆ ماوەیەك وا دەرکەوت کە لەوانەیە تیرەکە بتوانن بەسەر زەردەشتیەتدا سوارین، بە تایبەتی کاتێ کە (کاڤات)ی پادشایی ساسانی (٤٨٨ – ٥٣١ پا ز) وەرگەڕایە سەر ئەو ئایینە (بڕوانە تیرەی فریشتەکان)، خوسرەوی یەکەمی ئەنوشیروان کە کوڕی (کاڤات) و جێگریشی بوو و لە هەمان کاتدا پاڵەوانی زەردەشتیە توند مەزەبەکان بوو، بەرنامەیەکی دڕندانەی بۆ قەلاچۆکردنی مەزدەکیەکان گرتەبەر. ئەم سیاسەتە لە کۆتایی حوکمڕانی (کاڤات) خوێدا، لە دەورووبەری (٥٢٨)دا دەستی پێ کردبوو هاوشان بەم سیاسەتە دژ بە مەزدەکیەتەی، ئەنوشیروان سیاسەتێکی چاکسازی کۆمەڵایەتی و سیاسیشی گرتبووە بەر، تا ڕێگە لەو نەفەسە سوشیالیستیە بگرێ کە بزووتنەوەکە بۆ خەڵکە ڕەشوو ڕووتە کوڵۆل و دەسکورتەکلیماکان بانگی دەدا. هەندێ لە شارەزاکانی ئەم سەردەمە، وەکو کریستنسن (١٩٢٥) و کلیما (١٩٥٧) لە ڕاستیدا بزووتنەوەی مەزدەکیەتیان بە سەرەتای کۆمۆنیزم داناوە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە :–

**Further Readings and Bibliography:** E. Sachau, "Die Chronik von Arbela," *Abhandlungen der Preussische. Akademie der Wissenschaften* 6 (Berlin, 1915); A.H.M. Jones, *The Cities of the Eastern Roman Provinces* (Oxford, 1937); A. Christensen, *Le règne du roi Kawadh I et le communisme mazdakite* (Copenhagen, 1925); O. Klima, *Mazdak* (Prague, 1957); F. Altheim, *Ein asiatischer Staat* (Wiesbaden, 1954); N.C. Debevoise, *A Political History of Parthia* (Chicago, 1938); L.D. Levine and T.C. Young, eds., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia*, Vol. 7 (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, 1977); H. Luschey, "Iran und der Western von Kyros bis Khosrow," *Archäologische Mitteilungen aus Iran, Neue Folge* 1 (1968); Arshak Safarastian, *Kurds and Kurdistan* (London, 1948); Moses Khorenats'i, *History of the Armenians*, edited and translated by Robert Thomson (Cambridge: Harvard University Press, 1979); Solomon Grayzel, *A History of the Jews* (New York: Mentor, 1968); Movses Dasxuranci, *The History of the Caucasian Albanians*, edited and translated by C.J. Dowsett (London: Oxford University Press, 1961); N. Pigulevskaya, *Goroda Irana v Pannem Crednevekovie* (Leningrad, 1955), French translation by Claude Cahen (Paris: Édition scientifique, 1962).

# مێژووی ناوەڕاست: سەدەكانی ٦ تا ١٦ ← ١ ز

ئەم ماوە پڕ گۆڕانەی مێژووی كورد، مۆرزەدەی زیندبوونەوەی هێزی سیاسی كوردە لە سەدەكانی (٧) ەوە تا (٩)، پاش ئەوەی سێ سەدەی ڕەبەق ئەم هێزە لەژێر دەستی حوكومەتە سەنترالیزەكانی ساسانیە فارسەكان و ڕۆمە بێزەنتیەكاندا خامۆش و بێ چركە و پركەبوو. لە ماوەی نێوان سەدەی (١٠) و كۆتایی سەدەی (١٢)دا هێزی كوردان چووە ئەوپەڕی گەشەكردن، بە جۆرێك بەڕاستی دەتوانین ناویان بنێن سەدە كوردەكانی سەردەمی ئیسلام، ئەوە بوو چ بە كۆچكردنی لەسەر خۆو چ بە تەنینەوەی سوپایی، ڕۆڵی سیاسیان هەر لە ناوەندی ئاسیاوە گرتیەوە تا دەگاتە لیبیا و یەمەن.

لەم ماوەیەدا كوردەكان توانییان میرنشینی بەهێزی ئەوتۆ دابمەزرێنن، كەوا لە ڕۆژی خۆیدا توانییان ناوچەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە هێرشی داگیركەرە بیانیەكان، وەكو نا خاچدارەكان و هیتر، بپارێزن، و قۆناغێكی یەكجار ڕەونەقدارە لە فەرهەنگی كوردییدا وەدی بێنن. ئەوان لەم قۆناغەدا، لە ڕاستاكانی مێژوو، فەلسەفە، مۆسیقا و هی تردا سەریان دەركرد ئەگەر باسی كوردە بەناوبانگەكانی ئەو بوارانەی ئەم سەردەمە بكەین دەبێ ناوی مێژووناسان ئەبولفیدا، ئینولئەثیر، ئیبن شەرداد و ئەبوحەنیفەی دینەوەری، و فەیلەسووفان ئەلسوهرەوەردی و بەدیعولزەمانی هەمەدانی و توێژە ئیبن فەزلان و موسیقاناس صەفیولدینی ئورمەوی و محەمەد خەتیبی ئەربیللی و موسیقاژەنان ئیبراهیم و ئیسحاقی موسڵی و زەریاب، میعمار و ئەندازیاری بیناكاری مونیس، ماتەماتیكزان و ئەستێرەناس موحیەددینی ئەخلاتی سەرگوزەشتەناس ئیبنی خەلەكان، ئینسایكلۆپیدیازان ئیبنی نەدیم و شۆرشگێڕانی كۆمەلایەتی (وئاییینیش) بابەك و نەرسە بهێنین و بۆ نموونە ئیبنی موتەبیە كە كوردێكی دینەوەرییە، لە سەدەی نۆیەم و لە كتێبێكیدا بەناوی "عیون الاخبار" باس لە زانستەكانی سروشتی و میكانیك دەكا. لەم باسانەدا باس لە "فڕینی ئاگر پڕژێن" و تەكنیكی تواندنەوە و پاڵاوتنی ئاسن و ئاسنی ئاودراوو تووج ئەكات واتە لە هەندێ پیشە دەدوێ كە لە كوردستاندا ئەو سەردەمە مێژوویەكی كۆنیان هەبوو (بڕوانە پێش مێژوو و سەرەتای پێشكەوتنی

تەکنۆلۆژی).

هەر لەم سەردەمە خۆیدا بزووتنەوەی ئایینی چون مەزدەکیەت کە لە دوادوای سەردەمی ساسانیەکانەوە بە پێشەوایەتی مەزدەك سەریان هەڵدابوو سەرلەنوێ گەشانەوە و گەیشتنەوە پۆپەی چالاکی و کارایی. ئەوەبوو هەردوو قارەمانی تازە سەرهەڵدا و بابەك و نەرسە بزووتنەوەکەیان لەژێر ئالای "خورەمیە"دا پێشەوایەتی کرد بابەك بەناوی ئەوەوە کە بەرجەستەکەری پەروەردگارە سەرەتا بزووتنەوەکەی لە ئازەربایجانەوە سالّی (٨١٧)ی (پ،ز)، بەسەرهەڵدان دژ بە خەلیفەی سەروەختی عەباسیەکان دەستی پێکرد و دەوری سەدەیەك بەردەوام بوو، ڕاستیەکەی بابەك تەنها نازناوێك بوو کە درابوو بەم شۆڕشگێڕە، ئەو خۆی ناوی حەسەن بوو. زۆر لەوانەیە بابەك هەر شێوەیەکی بچوککردنەوەی و وشەی "بابا"بێ کە بەرجەستەکەرێکی پەروەردگارە.. بۆیە بابەك، زۆر و پێ دەچێ، بە مانای "وردە بەرجەستەکەر"بێ لەمەوە زۆر لە گوێندایەکە حەسەن خۆی بە بەرجەستەکەرێکی پلە دوو زانیبێ، (بڕوانە تیرەی فریشتەکان).

لە کاتێکدا، لەسەر بە تیرەی فریشتەکان بوونی بابەك لە بواری ئایینیدا هیچ گومانێکمان نییە، لە بارەی ڕچەڵەکی ئەتنی ئەوەوە هیچ زانیاریەکمان بەدەستەوە نیە و ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ: گوایە کوردبوە، لەسەر ئەم دوو بنەمایە دانراوە: یەکەم، ئازەربایجان لەو سەردەمە داو تا سێ سەدەی دواییش مەیدانی چەندین جێگە گورکێی گەورەی کوردان بووە، ئەوەبوو، چیای سافالان لە ئازەربایجان بوو بە مەنزڵگەی هەردوو تیرەی بەلیکان و باز (باض) کە ئێستاش لەوێن و بە ناوی خێڵەکانی بەلیکان و باز و بازیانییەوە ناسراون، (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣) و ناوی خۆیان سەپاندۆتە سەر شارەکانی بایلەقان باضدا، باضی خۆی بوو بە پایتەختی بابەك.

دووەم: سەرکردەکانی بزووتنەوەکەی بابەك، کە ناسنامەی ئەتنیکیان لەسەر چاوە ئیسلامیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا باس کراوە، بە کورد دانراون بۆ نموونە، الیعقوبی، حوکمداری شاری مەرەند لە ئازربایجان و سەرفەرماندەی سوپای بابەك، بە "ئیسماە ئەلکوردی" ناوە دەبا.

دوایی، بابەك نەرسە چوە پاڵ (کە مێژووناسی بەناوبانگی ئیسلامی ئەلمەسعوودی بە

نەسیر ئەلكوردی ناوی دەبا). ئەم نەرسەیە لە باشووری کوردستانەوە ئالای یاخیبوونی هەلگرت، واتە لەناوچەرگەی سەرزەمینی تیرەی فریشتەکانەوە کە بە نەتەوە کوردبوون. لە سالّی (٨٣٣) دا، لە شكرەکانی خەلیفەی عەباسی توانیان سەرهەلدانەکانی نەرسە دامرکێننەوە بەلام پاش ئەوەی (٦٠٠٠)، یان لە موریدەکانی کوشت. بەو قسەیەی کە مێژوونووسی ئیسلامی ئەلتەبەری دەیگێڕێتەوە، نەرسە ناچار خۆی و ژمارەیەکی زۆری هەوادارانی بەرەو سنوورەکانی بیزەنتییەکان هەلاتن و لەوێ لەشکرێکی کوردیان پێکەوەنا لەناو سوپاکەی ئیمپراتۆر تیۆفیلۆسدا. هەر ئەم لەشکرە خۆی گەیی بە دەنگ بزووتنەوەکەی بابەکدا کە خەریك بوو تێك بشکێ(Rosser 1974،Rekaya 1974))، و سەرەنجام توانی لە سالّی ٨٣٣دا هەندێ لەسەرزەمینی خەلیفەی عەباسی داگیربکا. ئەم خۆتێگلانەی شیۆفیلۆس ئەوەندە کاریگەر نەبوو، چونکە ئەوەندەی پێ نەچوو خەلیفەی عەباسی لەشکری ناردەوە سەر بابەك و شکستێکی گەورەی پێ هێنا.

بیزەنتییەکان نەرسە و هەوادارانیان لە پۆنتۆسی باکووری ناوەندی ئەنەدۆلّ دانیشاند. وەکو سەرچاوە بێزنتییەکان باسی دەکەن، هەلّبژاردنی ئەم مەلّبەندە بەو مەبەستە بوە کە هەلکەندراوەکان لە شوێنێك نیشتەجێ بکرێن کە لە "ناو گەلی خۆیاندابن"، (بڕوانە burg1912)، لەمەوە ئەو هەلّدەهێنجین کە کوردەکانی دێرینی ولاتی پینتۆس تا ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم هەر لەسەر سروشت و ناسنامەی کوردانەی خۆیان ماونەتەوە، هەرچەندە وەریش گەڕابنە سەر مەسیحیەت، هەر بۆیەشە بیزەنتیەکان هەوادارانی نەرسەیان لەو شوێنە دامەزراندوە تا چواردەورەکەیان وەکو خۆیان خەلّکی کوردستانی باشوورین. سەرباری ئەمەش، گەلێ بەلگەی ڕاستەقینەتریش لەسەر باری ئەتنی ئەو سەردەمەی پۆنتیەکان بە دەستەوەن، بەلام نەرسە خۆی، بەهەرحالّ، دەوترێ کە دوا دوایی وەرگەڕاوەتە سەر مەسیحیەت و ناوی شیۆفۆبۆسی بۆخۆی هەلّبژاردوە.

بزووتنەوەکەوی بابەك و بوونی چڕوپڕی کوردان لە ئازەربایجاندا، دەرەنجامی ڕەوکارییەکی یەکبین و نەپساوەی بە ئاپۆرای کوردان بوو کە لەسەردەمانێکی زووترەوە دەستی پێکردبوو. لە دەورووبەری سەرەتای سەدەی چوارەمی پاش زایینەوە و لە ئەنجامی چەندین سەدەی جێگۆڕکێ کردنی کوردانی باشوور، (بڕوانە مێژووی کلاسیك) و دەست

کەوتنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئابووری باشتردا، کوردستانی باشوور و ڕۆژاوا لە ئەنەدۆڵ بۆ ماوەیەك چوە قۆناغی هەڵقولانێکی بلقدەری دانیشتووانەوە. دارژانی خێڵە کوردەکان بەرەو باکووری ڕۆژاوا، ئاستی ئاپۆرای دانیشتووانی لەوێ یەکجار تەنگنا کردبوو، بەجۆرێك کەمترین سستی نواندن لە هێزی سوپایی بەرەزمدا لەلایەن ساسانیەکان و بیزەنتییەکانەوە (کە هەردوولا تەنگیان بە دانیشتووان چ لە ڕۆژەلات چ لە ڕۆژاوا دا هەڵچنیبوو) بەرەوێکی لافاو ئاسای خەڵکەکە دەشکایەوە.

ئەو وەرچەرخانەی لە ولاتی فارسدا ڕوویدا، بوو بە ئاگردەری ڕاپەڕینە سیاسی و ئایینی و ئابوورییەکانی کۆتایی سەدەیی پێنجەم و بەرایی سەدەی شەشەم. ساڵەهای سالی دووروودرێژی شڵەژان لە تەرازوبەندیی ژینگەدا هەڵسانی لافاو و گرانیی و برسیەتی و دارشانی کوللە ئاسای خێڵە ڕەوەندەکان لە ئاسیای ناوەند و قەفقاسەکانەوە، هێدی هێدی ساسانیەکانی لاواز و زەبوون کردبوو، لە کاتێکدا بیزەنتییەکان کە نەکەوتبوونە بەر گۆڕانی ژینگە و کەشوهەوا، گرفتارێکی دەردێکی تر بووبوون ئەویش شالاوی ئەو حەشاماتە خەڵکەبوو کە بە ئامۆزای کوردان دادەنران، وەکو سارماتی و ئالان و سورب و هەندێ خێڵی جێرمانی نەژاد کە گشت پێکەوە لە ژوورتر خۆیانەوە و لە دەشتاییەکانی ئەورووپاوە ڕشابوونە ناو خاکی بیزەنتەوە و چ لە باری ئابوورییەوە، چ لە باری سوپاییەوە ئیمپراتۆریەتەکەیان لاواز و هەرکاو کردبووەیە دارمانی ئیمپراتۆریەتی ساسانیان لەسەر دەستی عەرەبە ئیسلامەکان لە (٦٥١) (پا، ز)دا، ئیتر دەرگای خڕ داخراو لەبەردەم ڕەوی بە ئاپۆرای کوردان کەوتە سەرپشت و هەتا چاو بڕکا نە کۆسپیان لە بەردەمدا ما نە تەگەرە.

پاش هاتنی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمدا، کۆچکردە بە هێزەکانی کۆنە کوردستانی داری دەسەڵاتیان لە چەندین پادشاییەتی و میرنشینی لە دەرەوەی خاکی کوردستاندا کەوتە دەست، ئەوی ڕاستبێ، ئەم ڕەوکردنە پاساری ئاسایە هەر لە سەدەی دەیەمەوە بۆ ماوەی چەندین سەدەی دوابەدوای یەك بوو بە دیاردەیەکی باوی ناو مێژووی ئیسلام هەر لە خۆراسانەوە بگرە تا دەگەیتە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، لە کاتێکدا سەرزەمینە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئێران لە ئاسیای ناوەند و ئەفغانستان/ سیستان، لەلایەن میرنشینە سوغدی (سامانی) و ساکایی (تاهیری و صەفەری)یە فارس زمانەکانەوە دەگیرا، سەرزەمینەکانی

ڕۆژاوا، هەروەها كەوانەی بە پیت لەلایەن میرنشینە كوردە سەربەخۆ و ژووردوست نەناسەكانەوە خاوەنداری دەكرا، بۆیە بەبێ پەنگانەوە دەتوانین ماوەی نێوان سەدەی دەیەم تا دوانزەیەم لە مێژووی سیاسی و ژیانی ناوخۆیی خاكی ئیسلامدا بە سەدە كوردیەكانی مێژووی ئیسلام ناوبنێین چونكە كوردەكانی ناوجەرگەی خاكی ئیسلامیان هەم كارگوزاری دەكرد هەمیش لە مەترسی بێزەنتی و ڕووسەكان و دوایی لە هی خاچدارەكانیش دەپاراست.

هەرە گرنگترین میرنشینە كوردیەكان میرنشینی دەیلەمیەكان بوو كە لە سەرەتای سەدەكانی ناوەڕاستەوە هاتبوە سەرمەكۆی كار، ئەم دەیلەمییانە چەندین میرنشینی بەناو و دەبدەبەیان دامەزراندبوو، كە لە گشتیان بەناوبانگتر بنەماڵەی بوەیهیەكان بوو (٩٣٢-١٠٦٢ پا، ز) كە هەر بەو ناوە مێژوویەند كراون (هەرچەندە ئەم ناوە زۆر باش لەگەڵ ناوكیاندا ناگونجێ)، ئەم بوەیهیانە توانییان سەر بە خەلیفەی عەباسی لە بەغدا تەوی كەن.

قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی بوەیهی كورنەژاد بە پادشایەتی پەنا خوسرەو (عضود الدولة ٩٤٩-٩٨٣)، هەر لە ئەنەدۆڵ و مێزۆپۆتامیاوە حكومەتڕانیی دەكرد تا دەگاتە كنارەكانی دەریای هیندی (نەخشەی ژمارە ١٨)، تەم و مژێكی زۆر بە دەوری ئەسڵ و شوێن و ماوای ئەم دەیلەمیانەدا پەنگاوەتەوە، هێرشە سیاسی و سوپاییەكانیان لە سەردەمی ئیسلامەكاندا لە چیاكانی ئەڵبورزی گیلانەوە كە شۆڕدەبنەوە سەر دەریای خەزەر، گوژمی دەهێنا. بەڵام ئەگەر بەرچەڵەكیاندا بەرەو سەردەمەكانی پێش ئیسلام شۆڕبینەوە، بە ڕوونی بۆمان دەردەكەوێ كە ئەوان لە دەورووبەری بەشی هەرە ژووڕووی ڕووباری دیجلە لە ئەنەدۆڵەوە، واتە لەو شوێنەوە كە مەڵبەندی نەوەكانی ئێستایان، كوردە دیمیلیەكان (زازاكان)ە سەریان هەڵداوە. بونداهیشنای كتێبی پیرۆزی زەردەشتیەكان جێ و ماوای دیلەمان (كە پاشان بوون بە دەیلەمان) لە سەرچاوەكانی دیجلەدا دادەنێ نەك لە هەرێمە چیاییەكانی كناری دەریای خەزەر، ئەرشیفەكانی كەنیشتی مەسیحیش كە هی سەردەمی مەسیحیەتیی ئەربێلا (ئەربیلی ئێستا)ن ئەم سەرزەمینە بە باكووری سەنجار (سەرچاوەكانی دیجلە) دەخوێننەوە و پێی دەڵێن (بێت دەیلومایە- واتە خاكی دیلەمان). جگە لەمە، ئەو گۆشە تەسكەی چیاكانی ڕۆژاوای ئەڵبورز (واتە پارچە زەوییەك كە بە پانایی بە ئەندازەی پانایی یۆنك ئایلاندی نیویۆرك دەبێ و نابێ) كە تا ئێستا هەر بە ماوای دەیلەمییەكان دادەنرێ، لە ڕووی توانای داكردن و

بژێوداببینکردنەوە یارای خۆراکدانی کۆمەڵە دانیشتووانێکی ئەوتۆ گەورەی نیە کە بۆ نموونە سەرزەمینێکی وەکو ئەوەی لەنێوان ڕووباری نیل و ئاسیای ناوەندایە پڕ بکاتەوە، بەو جۆرەی کە دەیلەمییەکان لە ماوەیەکی کورتدا کردیان. گەلێ بوەیهی وەکو شەرە فولدەولەی شێرزیل یان شێرزیلی (٩٨٣-٩٩٠ پاش میلاد)،

نەخشەی ژمارە(18): فەرمانڕەوایی بوەیهییە دەیلەمییەکان 932 - 1062 پ. ز

ناوێکی کوردیی ڕێکوپڕەوانیـان هەیـە، کـە زیـل، بەشـی دووەمـی ناوەکـەیان پێکـدێنێ کـە وشـەیەکی دیمیلییـە و بـە مانـای (دڵ) دێ (لـە هەورامانیـدا زیلـی، لـە گورانیـدا ضـیل و لـە کورمانجیدا زیرد) (بڕوانە زمان) و بەو جۆرە ناوەکەی مانای (شێردڵ) دەبەخشێ. ئەبولفیـدای مێژوونووسی سەدە ناوەندیەکان) لە تەتەڵە و گێژەڵکردنی هەموو ئەو گریمانانەی کە لە بـارەی ڕچەڵەك و ڕەگ و ڕیشەیانەوە دەدوێن، کوردەکان و دیلەمیـەکان دەکاتـە ڕۆڵـەی یـەك نەتـەوە (بڕوانە التواریخ القادمة) ئەبولفیدا خۆی بە نەتەوە کوردبوو و بۆ بڕیـاردان لەسـەر مەسـەلەیەك کە کرۆکەکەی کوردبێت، لێهاتوو و شارەزابوو.

وەکو دەردەکەوێ زۆریـەی دەیلەمیـەکان، ئەگـەر گشتیان نـەبێ، پـەیڕەوی تـیرەی کـورد بەچەی فریشتەکان بوون، بە تام و بۆنێکی داب و نەریتی شیعەگەرییەوە (بڕوانە ئـایین) ئەمـە لەوانەیە هۆی سەرسووڕمانی هەندێ لە شارەزا و پسپۆڕانی نوێ بێ کە کاتێك پادشـا بوەیهیـە دەیلەمیـەکان خیلافـەتی سـوننی مـەزەبیی عەباسـیان لـە بەغدایـدا بۆچـی نـەیانگۆڕی بـە خیلافەتێکی شیعە مـەزەب. هـەروەها لەوانەیـە وەڵامـی ئـەو پرسیارەش بداتـەوە کـە بۆچـی هەنـــدە سـتایش و ســـەناخوانی نووســـەر و سیاســـەتمەداری تونـــد مـــەزەبی ســـوننی سەدەناوەندییەکانی وەکو ساحیبی ئیبنی عـەباد و نیزاموولمولکیـان پـێ بەخشرا کـە نـەیاریی شیعەکانیان دەکرد؟ چونکە دەیلەمیەکان خۆیان بە ئایین موسوڵمان نەبوون، نەیانتوانی زیـاتر بـاری پـێ داگـرتن لەسـەر زۆرینـەی سـونیەکان گـران کـەن، بـە هێنـانی خەلیفەیـەك کـە لـە کەمینەیەکی مەزەبیی تر واتا شیعە بێت. باشیش زانراوە کەوا هـەر لـەم سـەردەمەدا، هەنـدێ حوکمڧـەرمای دیلـەمی وەکـو مـەرداویجی پادشـایی زیـاری و ماکـانی پادشـایی کاکـەوەیهی، تەنانەت لە کەنوکۆی ئەوەدابوون ئیسلام خۆشی لەڕە گەوە ڕیشەکێش کەن (و لە پێناوی ئـەم ئاواتەدا سەریشیان دانا).

ئایینی دەیلەمیەکان هەر بەجیایی مایەوە لەهی دراوسـێ پێدەشـتیەکانیان، واتـە گیلانـی و تالشیەکان، کـە لەسـەردەمانێکی دێـرەوە سـوننی مـەزەب بـوون (مینۆرسـکی ١٩٥٣–١١٢) ڕاستییەکەی، لە کاتێك دا گیلانیەکان دویماکار وەرگەڕانە سەر مەزەبی زەیدی (پەنجگانـە) کـە لقێکە لە ئیسلامی شیعە، تا لشیەکان بە سوننیەتیی شافیعی مانەوە و تا ئەمڕۆش هەروان هەر لـە سـەدەی پانزەیەمـەوە، حەمـدوللای مستەوفی، جوگرافیانـاس و مێـژوونووس و کـارگێڕی

ئیسلام کە شاری قەزوینی نیشتەگای تەنها چەند دەمیلێکی کەم لە سنووری دەیلەمییەکانەوە دوور بوو، ئەوان بە موشریك و نا موسوڵمان دادەنیێ. حوکمفەرمای زەیدی مەزەبی گیلان شازادەکیا، ئەم نامسوڵمانیەیاتی کردە بەهانەو لە سەدەی چواردەیەمدا قەتلوعامێکردنی مەزەبییانەوی لە دەیلەمییەکانی ئەلبورز خستەکار.

ئەمڕۆ، دانیشتووانی ئەم بەشەی ئەلبورز هێشتا هەر بە کوردی ماونەتەوە و زۆریەیان پەیڕەوی ئایینی یارسانی و عەلەوی دەکەن کە هیچیان مسوڵمان نین، هەرچەندە هەندێ تام و خوێی شیعەی دوانزە ئیمامی ئیسماعیلیەتی پێوە کراوە ئەم کوردانە، تازە هاتەن، واتە تەنها لە سەدەی شانزەیەمدا گەیشتوونەتە ئەو مەرزوبوومە بەڵام، هەر چۆنێك بێ پاڵپشتن بۆ ئەو بۆچوونەی کە ئەم وڵاتە لە دێر زەمانەوە جێی نیشتنەوەی ئەو کۆچکەرانەیە کە لەناوەڕاست و باکووری زاگرۆسەوە ڕەویان کردووە. ئەوەی زۆر سرنجکێشە ئەوەیە، لەناو کوردەتازە هاتانەدا کە لە چیاکانی ئەلبورز نیشتوونەتەوە، هەندێك هەن کە تا ئێستا بە زاراوەی دیملی کە نزیکترین زاراوەی نزیکی دەیلەمییە، گفتوگۆ دەکەن. دەیلەمستانی ناوچیاکانی ئەلبۆرز، لەسەرێکی ترەوە، ئەو مەڵبەندەیە کە گرنگترین قەڵایچەی ئیسماعیلیەکان، واتە قەڵای ئەڵەمووتی لێیە کە ماوای ئەفسانەیی "پیرەمێردی چیانشین"ە (ئەڵەموت لە زمانی دیملییدا بە واتای، لانەی شاباز دێت).

با بێینەوە سەر هەندێ خانەوادەی حوکمڕانی تری کوردانی دەیلەم کە ئەوانیش کەسایەتی بە دیمەن و دەوڵەتیاری کارامەو چاکیان لێ هەڵکەوتوە و لە مێژوودا ڕۆڵی کاریگەریان بینیوە. لەمانە باوەندیەکانی خوارووی دەریای خەزەر (٦٦٥ – ١٣٤٩ پا. ن)، زیاریەکانی تەبرستان و گورگان (٩٢٧–١٠٩٠پا. ن) گەر گەرییبەکاتی ئازەربایجان و باکووری ئێران (٩١٦–١٠٩٠) کە بەموسافیری یان سالارییش ناسراون و جەستانی یەکانی گیلان و ڕویان و تاڵیشان (سەدەکانی ٦–١٢) شوانکارە (شەبانکارە)ەکانی فارس و موکریان و کاکەوەیهیەکانی ناوەند و باشووری ئێران (١٠٠٨–١١١٩پا.ن).

دوای بوەیهییەکان، ئەیوبییەکان لە گرنگییدا دێن، ئەمان ناودارترین میرنشینە کوردەکانی سەدەکانی ناوەڕاستن، بەڕەسەن دەچنەوە سەر خێڵ و میرزادەی هەجنانی (هەضبانی) کە حەوت سەدە لەوەپێش حوکمڕانی میرنشینی ناوداری ئەدیابین (کوردستانی ناوەند) بوون،

كاتێك كە لە فیدراسیۆنی پارثییدا ئەندام بوون (٢٢٧ی پ ز–٢٢٤ی پاش ز) بڕوانە مێژووی كلاسیك. سوڵتان سەلاحەدینی بنیاتنەری ئیمپراتۆریەتەكە (١١٦٩–١١٩٣) لە كوردستانەوە بۆ وەرگرتنەوەی (سەرزەمینە پیرۆزەكان) لە چنگی خاچدارەكان ڕاپەڕی و دوای ئەوەی ڕیچارد لیۆنهارتی پادشایی ئینگلتەرەی بەزاند، دەستی كرد بە فراوانكردنی سەرزەمینەكەی و میسر و عێراق و سوریا و سەرزەمینە پیرۆزەكان و عەرەبستان و یەمەنیشی خستە سەر كوردستان. ئەیوبییەكان هەر لە ساڵی (١١٦٩)وە تا كۆتایی سەدەی پانزەیەم بێ ژوور دەست حوكمڕانیی ئەم سەرزەمینانەیان كرد. (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٩).

ئەم میرنشینە كوردیانەی سەدەكانی ناوەند، دڵفراوانی و لێبوردەییەكی ئایینی لە ڕادەبەدەر فراوانیان دەنواند، بەو ڕەفتارە نموونەییەیان كە لەگەڵ جوو و مەسیحیەكانی ناوخۆیاندا پەیڕەویان دەكرد.

هەروەها ڕەفتاری یەكسانانەی شەددادیەكان لەگەڵ گورجی و ئەرمەنیە مەسیحیەكانی ناوخۆیاندا، لەناو هەموو سەرچاوەكانی ئەم سەردەمەی مەسیحیەكاندا دەستی بۆ دراوە بە سنگدا.

شێوەی ڕەفتاری ئەیوبییەكان لەگەڵ خاچدارەكاندا، بۆ سوڵتان سەلاحەدین نازناوی "شازادەی سوارچاكان"ی پچڕی. وەكو داننانێك بەم ڕاستیەدا، (٧١١) ساڵ دوای داگیركردنی ئۆرشەلیم لەسەر دەستی ئەو، كاتێك ویلهێلمی دووەمی قەیسەری ئەڵمان ساڵی ١٨٩٨ سەردانی سووریای كرد، فەرمانیدا گۆڕە داڕوخاوەكەی سەلاحەدین تامیر بكرێتەوە و چرایەكی زیوین بەسەر گۆڕەكەیەوە لەناو مەزارگەكەدا هەڵواسرا كە مۆری خودی قەیسەر و سوڵتانی عوسمانی لێدرابوو و لەسەری نووسرابوو كەوا "ئەمە ڕێزلێنانە بۆ ئەوەی كە سەلاحەدین نموونەی هەرگیز بێ وێنەی دوژمنێكی جوامێر بوە"، (بڕوانە Newby 1948، 13).

شان بەشانی دەیلەمی و ئەیوبیە مەزنەكان، كوردی تریش لە شوێنی تری ناوەوە و دەرەوەی كوردستان توانیویانە میرنشینیی یەكجار گرنگ و پڕ هەیبەت دامەزرێنن، هەرە بە دیمەنترینی ئەمانە شەددادیەكانی ئەرمەنستان و شەروان و ئاران بوون (لە قەفقاسیا) (٩٥١–١١٧٤)، ماملانیەكانی (یان ڕەوادیەكانی) ئازربایجان و باشووری ئەفقاسیا (٩٢٠–١٠٧١) و حەسەنە و حەسەنەوەیهییەكان (كە لە هەندێ جێ بە حەسەنەوی و بەردخانی ناسراون)، كوردستانی ناوەند و باشوور (٩٥٩–١٠١٥) (نەخشەی ژمارە ٢٠).

نەخشەی ژمارە (19): ئیمپراتۆریی کوردی ئەییوبی 1169 – سەدەی یازدەیەم
ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی ئەییوبییەکاندا بوون
جەزیرە: ناوچەکە بەگشتی
دوین: شاری سەرەکی
Black Sea
Dvin
ARMENIA
Bitlis
Diyarbakir
KURDISTAN
Aleppo
JAZIRA
Arbil
Mosul
LEBANON
SYRIA
Takrit
Damascus
Mediterranean
Sea
Baghdad
Jerusalem
LYBIA
Alexandria
PALESTINE
Cairo
EGYPT
NAJD
South to Include
The Yemen
Red
Sea
HIJAZ
Aswan
Medina
NUBIA
Mecca

نەخشەی ژمارە (20): قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایییە كوردییەكانی چاخەكانی ناوەند (بوەیهییەكانیان لێ دەرچێ).

ئەوانـەی لـێ دەرچـن چـەندین بنەماڵـەی مـیرزادەی تـری کـورد هـەن، کـە هـەر یەکـەیان شایـستەی بـاس و لێکۆڵینەوەیـەکی تایبـەتین، بچووکی سـەرزەمینەکانی بـەر قەڵـەمڕەویان هەرگیز لە گرنگی ڕۆڵی مێژووییان کەم ناکاتـەوە. کـوردێکی بـاضیان بـاز کـە یـەکێك بـوو لـە ڕۆڵـەکانی هـۆزی مێـژوویی بـاض (کـە لەوانەیـە بابـەکیش لـەوان بـوویێ) لـە سـاڵی ٩٨٣ دا میرنشینێکی دامەزراند کە هەموو شاری ئەخلات (خـەلات)ی سـەر ڕۆخـی ژوورووی دەریاچـەی وان و دەوروبەری دەگیرا، ئەم میرنـشینە دوا دوایـی تەنیـەوە و بـە میرنـشینی مـەروانی نـاوی دایەوە و دەستی دەسەڵاتی بەسـەر هـەموو سـەرزەمینی نێـوان ڕووبـاری فـورات و دەریاچـەی ئورمیـەدا دەڕۆیـشت (٩٨٣–١٠٨٥)، مەروانیـەکان لـە پاشـان نـاو گۆڕیـان بـۆ ڕۆژەکـی کـە پایتەختیان لە بتلیس بوو و دواتریش بۆ بەدرخانی کرد.

ئەم میرنشینەی ڕۆژەکی– بەدرخانییە تا ساڵی ١٨٤٦ هـەر بـە پـاوە بـوو (بڕوانـە مێـژووی هاوچەرخ). کۆتەرەی بنەماڵەی باز، بەهەرحاڵ، بە میرایەتی شارە دەوڵەتی ئـەخلات مایـەوە و تا سـاڵی ١٨٤٧ کاتێك کـە عوسمانیـەکان دەسـەڵاتی ڕاسـتە و خۆیـان داسـەپاند و دوا مـیری بنەماڵەکەیان ٨٦٤ ساڵ پاش دامەزراندنی لە میرایەتی و براگەورەیی خـست هـەر بـە میرایـەتی ڕاندیان. ئەم دەسەڵاتداریە بچووکە. بێ لاف و دەبدەبەیە بە تۆکمەیی و درێژی تەمەن گەلێ لە میرنـشینیە بـێ سـەرەوبەرە ناوخۆییـە عەباسـی و عوسمانلیـە دەسـکردەکان پایـەدارتر و بەردەوامتر بووە. ئەم هۆزە کە ڕۆڵەیەکی وەکو باضی تێدا هەڵکـەوت، تـا ئـەمڕۆ هـەر مـاوە و ئێستا بە (بان) یان (بازیانی) دەناسرێن و نیشتەجێی هەرێمەکانی باکوور و ڕۆژاوای کوردسـتانن (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣)[10].

واژەی کوردستان بۆ یەکەم جار لە دەوروبەری سەدەی دوانزەیەمدا، کەوتە ناو ناولـەوە. ئەوسا تەنها بـۆ ناسـاندنی باشـووری کوردسـتان واتـە کرماشـان و دینـەوەر و هەمـەدان بـەکار دەهات. ئەگەرچی ئەم مەسەلەیە لەلایەن هەندێ نووسەرەوە کە لەسەر کوردیان نووسیوە زۆر گەورە کراوەتەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە خۆی بایەخێکی مێژوویی بۆ کـوردان پێوەنیـە، واژەی (ستان) یان (ئیستان)ی ئێرانی کە بە مانـای "سـەرزەمین" یـان "وڵات" دێـت، ئـەو کاتـە بـێ جیاوازی بەکاردەهێنرا و کە بخرایە سەر نـاوی برەخـەڵکێکی یـەك ئـەتنی، زۆر نەزانانـە دەبـوە

[10] لە ناوچەی (بازیان)ی سەر بە پارێزگای سلێمانییش لە کوردستانی باشوور هەن – وەرگێڕ.

مایەی سەر گەورەكردنی یەكە یەكەی بەڕێوەبەرایەتی و خەڵكەكەشی، لەبەر ئەوە واژەی كوردستان هاتە بەكارهێنان بۆ ئەوەی ببێ بەهاو كووفی چەندین سەرزەمینی ئەتنی تر لە باشووری ڕۆژاوای ئاسیادا (وەكو ئەرمەنستان، توركستان، عەرەبستان، ساكیستان (سیستان)، بلوچستان هتد...). كە سەلجووقیەكان لە دوادوای حوكمڕانیاندا بە وردی بۆ دابەشكاریی ئیداری خۆیان بەكاریان هێنابوو.

لە سەرەتایی سەدەی (١٢)دا، "ماوەی كوردیی" لە مێژووی ئیسلامدا بەسەرچوو و لە جێی ئەو "ماوەی توركی" بوو بە باو كە چوار سەدەی ڕەبەقی خایاند. كوردستان بەڵكو هەموو كەرتە ئاسیاییەكەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- كەوتە ناو گەرداوێكی چوار سەدەییەوە كە تێیدا ناوچەكە چوە ژێر پای گەلەخێڵێكی تاراوی توركەوە كە چەندین فەرهەنگ و كۆمەڵی ئەتنی یان پامال كرد. كوردستان بوو بە ڕێبوارەڕێی هەزارەها بە هەزارەهای توركی پەرگەندەی خێڵەكی كە وڵاتەكەیان كرد بە پرد بۆ گەیشتن بە سەرزەمینی ئیمپراتۆرەیەتی بیزەنتی و دویماكار خاپووركردنی و ئینجا توركاندنی خاكەكەی.

هەرچەندە میرنشینە كوردە گەورەكان لەم پرۆسەیەدا لەبەین چوون، بەڵام هەندێ وردە میرنشین هەر مانەوە و لەسەر بەڕێوەبردنی كاروباری سیاسی خۆیان، هەر ڕۆیشتن. ئەوان توانیان بە سووكە سەرنەوی كردنێك بۆ بنەماڵە هەرە دەسڕۆكانی تورك و مەغۆل وەكو سەلجووقیەكان، خوارەزمشاهیەكان، ئیلخانیەكان و تەیمووریەكان، لەسەر ئەو دارەڕایە بڕۆن كە لە دێرزەمانەوە دایان بەستبوو. لە بەرامبەر ئەو ئۆتۆنۆمییە ناوخۆییەی كە هەیان بوو باجێكی ساڵانە، یان لە كاتی پێویستدا هەندێ شەركەریان دەدا بە دەوڵەتی سەروەخت و هیچی تر. لە هەمان كاتیشدا، گەلێكیان بچووكترین دەرفەتی لاوازی و زەبوونیی توركە داگیركەرەكانیان لە دەست نەدەدا، بێ ئەوەی پشتیان لێ بكەن و بە هیچ جۆرێك كاغەزیان نەخوێننەوە و بە كورتی وەكو دەوڵەتی سەربەخۆ كاروبار ڕاپەڕێنن. لەناو ئەمانەدا چەند ناوێك لە هەمووان درەوشاوەترن، وەكو ئەحمەدیەلەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان و ئازربایجان (كە تا دەوروبەری ١٢٠١ وەكو لقێك لە ڕەوادیەكان مانەوە)، زەنگەنە یان زەنگییەكانی مووسڵ (١١٢٧-١٢٥٠) گوكیۆریەكانی هەولێر و كەركووك (١١٤٤-١٢٣٢)، بەكرییەكانی دیاریەكر و ئورفە (١١٠١-١٢١٢) و ئەردەڵانیەكان كە حوكمڕانییان ماوەیەكی دوور و درێژی

کێشا (۱۱٦۸-۱۸٦۷).

تەنانەت داگیرکردن و چنگوچڕنوکی توند گیرکردنی مەغۆلەکانیش لەسەرزەمینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەیتوانی حوکمڕانیی خۆ بەخۆیی لە کوردستاندا تەفروتوونا کات. جلیتان کرنەکانی مەغوولەکان بە کوردستاندا لە جرت و فرتی کورت مەودا و پەرێزپیس بەولاوە چی ترنەبوون. ئەوان دوای خۆیان هیچ جێ پێیەکی ئەوتۆ قووڵیان نەدەهێشتەوە کە مانای کارتێکردن بدا. ڕاستیی حاڵ ئەوەبوو کوردستان ئەوەندە لە ئامانجەکانی مەغۆلەکان دوور بوو کە جەلالەدینی مانگوبەرتی سوڵتانی خوارەزمشاهییەکان لە تەنگانەدا کوردستانی کرد بە پەناگە بۆ خۆی، بەڵام میر موزەفەرەددین لە شەڕدا شکا و بە دیلی گیرا، لێرەدا مەغۆلەکان کەوتنە مەرایی کردن بۆ کوردەکان و بۆ ئەم مەبەستە جەلالەدین میر و داروەستەکەی گەڕاندەوە هەولێر و بۆ سارێژکردنەوەی ئەو خرابکاریانەی بەرامبەر خەڵکی وڵاتەکەی کردبووی، زیانەکانی قەرەبوو کردەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، جەلالەدین پیلانی گەورەتری دژ بە کوردستان لە مێشکدا بوو، ئەوە بوو ئەوەندەی پێ نەچوو ملی نا بە ئەخلاتی کۆنە پایتەختی حوکمڕانیە مێژووییەکەی باضەکان کە لەو کاتەدا سەر بە ئەیوبییەکان بوو، پاش دەورگرتنی وێرانی کرد، سەرێکیش بەتانی بتلیسیشدا چوو تا لە دەست میرە ڕۆژەکییەکان دەریکا، بەڵام کە نەهات بە دەستیەوە، بە دەم هەڕەشەی گەڕانەوە و لەگەڵ خاك یەکسان کردنیدا، جڵەوی بادایەوە و بەجێی هێشت. ئەم دوا کەڵەپیاو و ڕۆڵەی بنەماڵە میری بە دەبدەبە و ناو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە لە ڕووی مەغۆلەکاندا وەستابوو ساڵێك دوای ئەوە، واتە لە (۱۲۳۱)دا لەبەر زۆرداری و بێ بەزەیی لەرادە بەدەری، لەسەر دەستی کوردەکان کوژرا.

هەرچەندە ئەستێرەی بەختی سیاسی کورد لە دوادوای سەدەکانی ناوەڕاستدا کەوتە ژێر پەڵە هەوری دەسەڵاتی میروسوڵتان نشینە تورکەکانەوە، بەڵام ئایینی نەتەوەیی کوردەکان بەشێوەیەکی بەر چاوی تەرز و تووڵی هەڵدا و بڵاوتربووەوە. ئەوە بوو تیرەی فریشتەکان کە بابەشێکی ئایینی خۆماڵی کورد بوو، لقی عەولەوی مەزهەبی ئیسلامی شیعەی بە خۆو بە هەواداراننەوە تا ڕادەیەك قووت دا (لە ڕاستیدا، ئەگەر سەفەوییەکان لە سەدەی حەڤدەدا ئەو هەڵمەتە. بەهێزە ئیدیۆلۆجی و پاکیزەگەری خوازییەکان نەکردبایە کە کردیان، ئەوا مەزهەبی

شیعە هەر خۆشی لەگەڵ بای ڕۆژگاردا تۆزی دەچوو بە ئاسماندا تیرەی فریشتەكان توانایەكی خۆیی بی هاوتای هەبوو لە بكێشكردن و لەخۆگرتنی ئایینەكانی تردا، ڕەگ و ڕیشەی ئەم توانایەشی لە بیرۆكەی "دوناو دۆنكردنی گیانەكان" و هەڵێنیشتنیان لە گیانی تردا بوو (بڕوانە تیرەی فریشتەكان). بەم نەزمەوە ئەوان محەممەدی پەیامبەر و فاتیمەی كچی كە تاقە فریشتەی زیندووی پاش خۆی بوو، هەروەها عەلی زاوای و ئیمامی یەكەمی شیعەكان لەگەڵ چەند ناودار و چاكی هەردوو ئایینی مەسیحی و جوولەكەیان بە بەرجەستەكەری "گیانی گەردوونی"ی ئایینەكە دادەنا. هیچ جۆرە گرفتێكی ئەوتۆ گرنگ نەدەهاتە پێش هەواداران بەتایبەتی بۆ عەولەویەكان و تا ڕادەیەكی كەمتر بۆ یارسانیەكانیش كە هەوڵدەن سەرەتا شیعەكان لەو گومراییانەیان پاك كەنەوە كە بە پێچەوانەی فەرمانی قورئانەوە كردوویانە و پاش سفتوسۆدانیان، خۆیان و ئایینەكەشیان هەڵلووشن.

ئەم هەڵمەتە لە ماوەی شلبوونی بەرە بەرەی چنگی بنەماڵە حوكمڕانەكانی ئیلخانیە مەغۆلەكانی فارس لەسەر سەرزەمینەكانی ژێر دەستیاندا دەستی پێكردبوو (١٢٥٦– ١٥٣٥) ئەم سەرزەمینانە بریتیبوون لە كوردستان و مێزوپۆتامیاو وڵاتی فارس و هەندێ هەرێمی دەورویەر. تاخمێك (ساختە–شیعە)ی عەلەوی، لە مینبەری مزگەوتەكانیانەوە كەوتنە سووكی كردنێكی ڕۆژانەی تۆڵەسێنانە بە یارانی پڕ ڕێزی پەیامبەر محەممەد. مەبەستی ئەوانە ئەتككردن بە شیعە مسوڵمانە دێرینەكان بوو تا بەزۆری زۆردارەكی وا داری هاتنە ناو ئایینەكەی خۆیانیان بكەن (هەروەها تەنانەت سوننییەكانیش) و ئایینەكەیان بەزۆر بە ئیسلامی ڕاستەقینە بیقەبڵێنن. سەیر ئەوەیە لەو كارەیاندا هەندێ سەریش كەوتن.

عەولەیەكان، شەیدایی توركمانەكانی ئەنەدۆڵیان بە بەرەكەتێكی خودادا و زانی. ئەوەبوو لەژێر ئالای سوڵتان جیهانشاهدا (١٤٣٨–١٤٦٧) كە كوڕی بنەماڵەیەكی میرنشینی قەرەقۆیونلوی توركمان بوو، قەڵەمڕەوی سیاسیی خۆیان تا دەرگاكانی هیرات (لە ئەفغانستانی ئێستادا) كە پایتەختی گەورەترین هێزی سوننی مەزەبی ئەو سەردەمە، واتە تەیموورییەكان بوو، كشاند. سوننییەكان كە ڕەفتاری ئەم "بە ڕواڵەت شیعانە" زەندەقیی بربوون و دوور لە ئیسلامەتی ئایینەكە هەراسانی كردبوون، كەوتنە دەماندنی ئاگری هێرشی بەرلمبەر. زانایانی سوننی مەزەبی ئەنەدۆڵ، مێزوپۆتامیا، فارس و ئاسیای ناوەندیش

دەستیان کردە هێرش بردنە سەر شیعە عەولەویەکان و ناویانیان نا "رافزی" نەك شیعە. ساڵی ١٤٦٨، لەسەرینی دژایەتیکردنی ئەم "ناپاکانەوە" دەوڵەتی قەرەقۆیونلو لەسەر دەستی بنەماڵەیەکی حوکمڕانی تری تورکمان، واتە ئاق قۆیونلو، هەرەسی هێنا و کەلاوەی بوو بە مەڵبەندی کوندەبوو. ئەم هەڵگەڕانەوەیە زۆری نەبرد، چونکە پرۆپاگەندەی عەولەویەکان هێندەی پێ نەچوو پشتگیری تورکمان و کوردە سوننییەکانیانی لە ئاق قۆیونلو بڕی، بەوەی هەردوو لایان هاتنە سەر مەزهەبی عەلەوی و ڕوویان لەمان و پشتیان لە ئاق قۆیونلو کرد.

بەم جۆرە دیاریەکری پایتەختی ئاق قۆیونلوان لە کوردستانی ڕۆژاوا ساڵی ١٥٠٨ لەلایەن پادشاییەکی تازە هەڵکەوتووی عەلەوی، واتە ئیسماعیلی یەکەمەوە کە ئیمپراتۆریەتی سەفەوی لە فارس دامەزراندبوو (١٥٠١ — ١٥٢٤) داگیرکرا. ئیسماعیل کە خۆی بە بەرجەستەکەرێکی نوێی خوداوەندی و "خوداوەندی سەروەخت" دانا— تا ئێستاش هەموو عەلەوییەکانی ئەنەدۆڵ بەم سیفەتەیەوە باوەڕیان پێیەتی و دەیپەرستن —لەشکرێکی گرانی لەم سەربازە شەیدایانە (کە بە قزڵباش ناویان دابوەوە) پێکهێنا. (قزڵباش وشەیەکی تورکییە و بە مانای "سەرسوور" دێ لەبەر ئەوەی لەو کڵاومێزەرە سوورەیان لەسەر دەکرد، کە ئێستاش کوردە عەلەوییەکانی ئەنەدۆڵ هەر لەسەری دەکەن).

نۆ قزڵباشەکانی کوردو تورکمان لە کوردستان و ئەنەدۆڵەوە وەکو کوللە کەوتنە دوای ئیسماعیل. کوردستان لەوکاتەدا باش دەیتوانی سەربازێکی زۆریدا چونکە ژمارەی دانیشتووانی بەڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە زیادکردندا بوو و لە ساڵی (١٤٢٥) دا خۆی دەدا لە (١،٣ ) ملیۆن (بڕوانە دیمۆگرافیا) بەمەش لە هەموو کاتێك پڕ دانیشتووانتربوو. هەر لە چەند ساڵێکدا ئەم قزڵباشە سەرگەرم و هەڵپاچ و داپاچانە وڵاتەکەی ئیسماعیلیان وا بەرین کردەوە کە سەرێکی لە ئەنەدۆڵ و دەریای ڕەش و سەرەکەی تری لە ئاسیای ناوەند و دەریای هیندی بوو. دیار بوو، هێز نەبوو لە مەیداندا بتوانێ بەر لەم لەشکرەی ئیسماعیل و شمشێری تیژی و بڵاوبوونەوەی عەلەویەت بگرێ کە لەسەر حیسابی ئیسلامی تەقلیدی دەیکرد، تا لە ئاسۆکانی ڕۆژئاوە لوولەی تۆپی عوسمانلیە سوننییە سەختگیرەکان دەرنەکەوت.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: For the dynastic lists of medieval Kurdish royal houses and a very succinct account of their histories, C.E. Bosworth, *The Islamic Dynasties* (Edinburgh: Edinburgh University Press, 1967) is the best source. More detail of the same nature can be found in Stanley Lane Poole's *The Mohammadan Dynasties: Chronological and Genealogical Tables with Historical Introductions* (London 1893), Eduard von Zambaur, *Manuel de généalogie et de chronologie pour l'histoire de l'Islam* (Hanover, 1927), and Eduard Sachau, "Ein Verzeichnis Muhammedanische Dynastien," *Abhandlungen der Preussischen Akademie der Wissenschaften* I (Berlin, 1923). V. Minorsky, *A History of Sharvân and Darband in the 10th and 11th Centuries* (Cambridge, UK: Heffer, 1958); V. Minorsky, *Studies in Caucasian History: New Light on the Shaddâdids of Ganja, The Shaddâdids of Ani, Prehistory of Saladin* (London: Taylor & Francis, 1953); V. Minorsky, *Persia in A.D. 1478-1490: An Abridged Translation of Fadlullâh b. Ruzbihân Khunji's Târikh-i Âlam-Ârây-yi Amini* (London: Luzac, 1957); C.E. Bosworth, *The Medieval History of Iran, Afghanistan and Central Asia* (London: Variorum, 1977), including material on the Daylamites and the Baluchis; Aram Ter-Ghewondian, *The Arab Emirates in Bagratid Armenia*, translated by N. Garsoïan (Lisbon: Livraria Bertrand, 1976); P.H. Newby, *Saladin and His Time* (Boston: Faber and Faber, 1983); W. Madelung, "The Minor Dynasties of Northern Iran," in *The Cambridge History of Iran*, Vol. 4, ed. R. Frye, (New York: Cambridge University Press, 1975); C.E. Bosworth, "Dailamis in Central Iran: The Kâkuyids of Jibâl and Yazd," *Iran* VIII (1970); C.E. Bosworth, "Military Organisation under the Buyids of Persia and Iraq," *Oriens* XVIII-XIX (1965-6); C.E. Bosworth, "The Kufichis or Qufs in Persian History," *Iran* XIV (London, 1976); M. Rekaya, "Mise au point sur Thèophobe et l'alliance de Bâbek avec Thèophile (839/840)," *Byzantion* 44 (1974); J.B. Bury, *A History of the Eastern Roman Empire from the Fall of Irene to the Accession of Basil I: AD 802-867* (Brussels, 1935); H. Grègoire, "Manuel et Thèophobe et l'ambassade de Jean le Grammairien chez les Arabes," in A. Vasiliev, *Byzance et les Arabes*, vol. I (Brussels, 1935); J. Rosser, "Theophilus' Khurramite Policy and Its Finale: The Revolt of Theophobus' Persian Troops in 838," *Byzantia* 6 (1974); W.A. Wright, "Bâbak of Badhdh and al-Afshin during the Years 816-41 AD: Symbols of Iranian Persistence against Islamic Penetration in North Iran," *Muslim World* 38 (1948).

# سەرەتای مێژووی هاوچەرخ ١٤٩٧- ١٩١٨

ئەم ماوەیەی مێژووی کورد، ماوەیەکی لاربوونەوە و داهێزرانی لەسەر خۆی هەمەلایەنەیە لە ژیانی نەتەوەیی و نیشتیمانی کورددا تەنها یەك لایەنی لێدەرچێ ئەویش لایەنی وێژەو ئەدەبیاتە کە ئەتوانین بڵێین تا ڕادەیەك ئەو باری لاربوونەوەیە بەدەرە. لە پاڵ ئەمەدا، لە ماوەی ئەو (٢٥٠) ساڵەدا کە دەکەوێتە نێوان (١٥٠٠- ١٧٥٠)وە بەشێکی گرنگی گەلەکە کەوتە بەر شالاوی گواستنەوەی بە زۆر بۆ خاك و سەرزەمینی دوورە دەست (بڕوانە گواستنەوە و جێگیرکردنە زۆرەملێکان) بەم جۆرە، کۆمەڵگای چالاکی، کارامەی بە ئاستی جیهان گەیشتووی کورد لە سەرەتای ئەو ماوەیەدا، گۆڕا بە کۆمەڵگایەکی هەرە دواکەوتوو وێرانکراوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کۆتاییدا. دوو هۆی سەرەتایی بوون بە مایەی ئەم نالەبارییە: ١) داشکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەسەر دوو ئیمپراتۆریەتی دوژمن بەیەکی فارس و عوسمانییدا، کە شەڕگەی سەرەکییان ناو جەرگەی کوردستان بوو و لەوەش گرنگتر: ٢) ئافەرۆزبوونی تەواوی کوردستان لە ڕووی ئابوورییەوە بە گۆڕینی شەقامەڕێ جیهانییەکانی تیجارەت، کارێك کە نەك کوردستان، بەڵکو ڕوخساری جیهانیش گۆڕی.

گەیشتن بە زمانەزەوی ئاواتی چاك (Cape of good hope) ساڵی ١٤٩٧ لەلایەن ڤاسکۆدی گاماوە ڕۆژە ڕەشێکی گەورەی بۆ ژیانی نیشتمانیی کورد لێکەوتەوە، جیا لە هەموو پێکهاتە ئەتنییەکانی تری ناوچەکە. ئەم مێژووە، نیشاندەری سەرەتای گۆڕانی خێرای تیجارەتی جیهانیە لە ڕێگاوبانی سەرزەمینەوە بوو هی دەریایی، واتە ڕێگا مێژوویییە دێرینەکانی وەکو ڕێگای کەژ لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژاوادا ئیتر باویان نەما و ڕێبواریان برا.

هەموو ئەو کاروانە بار پڕ لە تەکنۆلۆجیا و کالایانە کە لەنێوان ئەورووپا و ڕۆژهەلاتدا ئەو ڕێیەیان دەکوتا، لە ناکاوێکدا لە تێپەڕبوون بەخاکی کوردستاندا کەوتن و بەوە بازاڕەکانی کوردستانیان بە تەواوی سڕکرد و لە کاریان خستن. کوردستان خێرا بوو بە سەرزەمینێکی چیایی دووردەستی ئەفەرۆزکراو. ئەو سوود و سەودا بازرگانییەی کە سەردەمێك لە سایەی تیجارەتی ڕێگاوبانەوە دەڕژایە ناو باخەڵی هەرێمەکەوە، و هەر کەسەی بەم دیوو ئەودیوی

ڕێگاکانەوە بوو لێی سوودمەند دەبوو، ئێستا وا یەکسەر هەڵدەڕژێتە گیرفانی ئەو وڵاتانەی ئاسیا و ئەورووپاوە کە کاڵا و کەرەستەکانیان بۆ دەچێ و خەڵکی تر لە بەرلمبەردا سیسکەی چاویان دێ. لە کاتێکدا ئەورووپا لە دەوڵەمەندییدا دڕاو زەلایەوە، کوردستان و هەموو ئەو وڵاتانەی تر کە دەکەوتنە سەر ڕێگا کۆنەکە کەوتنە سەر ساجی عەلی و هەژاری و دەسکورتی سواری کۆڵیان بوو.

نەك تەنها هەر داهاتەکانی ترانزێت لە دەستچوون، هەموو ئەو ژێرخانەش کە دارەڕاو پاشکۆی ئەو تیجارەتە بەهێز و بازرگانیە گەرمەبوون: ڕێگاوبانەکان، ئەو بیرۆکراتە کارلمانەی کە سامانەکەیان هەڵدەسووڕاند و پێویستی بوونی دەوڵەتی نیشتمانیی سەقامگیر و جێ پێ قایم کە چاوەدێریی بەردەوامی لووس و ئاسانی کاری تیجارەت بن هەموو لێك هەڵوەشان و داریان بەسەر پەردووویانەوە نەما.

ئەم گۆڕانە، هەڵقوڵانی تەکنۆلۆجیا و زانست و بیری بۆ ناو وڵاتەکە پەککخست، هەروەها بڵاوبوونەوەی هەواڵی داهێنانی نوێی لە هەموو کون و قوژبنی دوور و نزیکی جیهانەوە و هێنانی نموونەی دوا جۆری بەرهەمی چ بۆ بەکارهێنانی ناوخۆ چ بۆ لەسەر گرتنەوە، وەستاند.

هەر ئەم گۆڕانە خۆی، بوو بە بایسی داشکانی چەندەکی و جۆرەکی ئەو کەلوپەلانەی کە لە وڵاتەکەدا باو بوون لەبەر نەمانی بازاڕیان. چەندین کاڵای بازارگەرم و بەناوبانگ، یان تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو یان چالاکیی سەرمایە پژێن هەموو لەبرەو کەوتن، چونکە لە بازاڕی ناوخۆ بەولاوە کڕیاریان نەما، تەنانەت ئەو بەرهەمی جۆلاییانەی کە کوردستان دەنگی پێ دابوەوە لە سرووشت و شێوەدا داشێوان (بڕوانە مافوورجات و کوتاڵ). چەندین وەستای کارلمە و دەست ڕەنگینی پیشەی جۆراوجۆر لە کارکەوتن و ناویان نەما. بەمە چینی ناوەندی کوردی بە تەواوەتی لە گەشەکردن و پێشکەوتن کەوت، ئەم حاڵە تا چەند سەدەی دوای ئەوە درێژەی کێشا، تەنها لەم دوا دواییەدا کوردستان توانی بە هەندێ کەرەستەی کانزای ژێر خاکەوە بچێتەوە ناو بازاڕی تیجارەتی جیهانیەوە، لە پاڵ هەندێ بابەتی بەرهەمهێنراوی ناوخۆدا. (بڕوانە سەرچاوە سرووشتییەکان).

ئەوە با لەوێ بوەستێ، خۆ هەر گۆڕانی ڕێگاکانی بازرگانی بە تەنها هۆی ماڵوێرانیی کوردستان نەبوو. زیندووبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی فارس لەژێر ئاڵای سەفەویەکاندا ساڵی

(١٥٠١) پاش ئەوەی چوار سەدەی یەکبین تیرە و تایەفە و هۆزی جۆراوجۆری تورکی کۆچەری بە ولاتەکە هەلپژان و تەراتێنیان کرد و سووتاندیان و وێرانیان کرد، هۆیەکی تری مەینەتی و لێقەومانی بۆ کوردان لەگەل خۆیدا هێنا.

لێرەدا، بە پێویستی دەزانم چەند قسەیەکی کورت و کەم لە بارەی مەسەلەی پشتەلەکی بنەمالەی سەفەوی و پەیوەندی ڕەچەلەکییانەوە لەگەل کوردەکاندا بکەم. تاقە سەرچاوەی پێش سەردەمی سەفەوییەکان نووسراوی و هەر لەبەر ئەوەش باوەرپێکراوی کە لەبارەی ڕەچەلەکی بنیاتنەری بنەمالەکە واتە پیاوی پیرۆز و سۆفی مەشرەب شێخ سەفیەلدین (کە سالی ١٣٣٤ مردووە) بدوی، سەفوەتولسەفای ئیبنی بەزازی ئەردەبیلییە[11]. ئیبنی بەزاز سالی ١٣٢٥ بە مندالی شێخی بینیبوو، ئەو سەفوەتولسەفای دوای سالی ١٣٥٧ بە ماوەیەکی کورت و گەلی پێش بزاڤە جیهانگیریەکانی سەفەوییەکان تەواو کردبوو، هەرچەندە سەفەویەکان پاش لەسەرگرتنەوە، دەقە ئەسلیەکەیان گۆڕیووە، ئەسلیەکە بە ڕاشکاوی پشتی سەفیەدین دەباتەوە سەر کورد (بڕوانە کیسرەوی ١٩٢٧[12] باری ناسکی بنەمالەی سەفەوی وایکردووە هەندی دەسکاری بە ناوی "ڕاستکردنەوەی مێژوویی" یەوە لە کتێبەکەدا بکری، ئەم دەسکاریانە، هەندی سەرچەلەو نەسەبنامەی ساختی کۆشکی پادشاییی و دەست لێوەشاوی سیاسەتیان هێناوەتە پێشی کە گوایە شێخ لە پشتی ئیمامی حەوتەمی شیعیانە و بە نەتەوەش دەچێتەوە سەر ئەو هۆزە تورکمانانەی کە بەدەوری بنەمالەکەدا ئاپۆرایان بەستبوو بۆی بوویوون بە کۆلەکەی ڕاوەستاویی (بێگومان لەسەر حیسابی کوردان).

(ئەم کردەولنەی سەفەویەکان، لەولنەیە ڕوونکەرەوەی ئەوەبن چۆن بەکرانیەکان و تیگران بە گورجی و ئەرمەنی لە قەلەمدران لە مێژووی کلاسیکدا (بڕوانە مێژووی کلاسیک)ە بە گوێرەی وتەکەی ئیبنی بەزاز، پیرۆزشای زەرین کولاهی باپیرە گەورەی کوڕنەزادی شێخ سەفیەدین لەگەل هۆزێکی گەورەی کورد دا، لە سەدەی دەیەمدا لە سنجارەوە (لە سوریای ئێستادا)[13] هاتوون. هۆزەکە، کە زۆر وێدەچی دیمیلی بن، لەو ناوچە شاخاویە نیشتوونەوە کە

---

[11] صفوة الصفاء - لإبن بزاز الأردبيلي. وەرگێر

[12] مەبەست ئەحمەدی کیسرەوییە. وەرگێر

[13] سنجار لە کوردستانی عێراقە — وەرگێر.

دەكەوێتە گۆشەی باكووری ڕۆژاوای دەریای خەزەرو نزیك شاری ئەردەبیلەوە. ئەمە زۆر لە گوێندایە بەشێ بووبێ لەو جێگۆڕكێ گەورانەی هۆزە مەزنە كوردە سەدەی ناوەڕاستیەكان و هەندێ بنەماڵەی حوكمڕان بەرەو ئەو ناوچانە كردبیان. سەفیەدینیش ژیانی مسوڵمانێكی دەست و دەم پاك و پیرۆزی لە ئەردەبیل دەبردەسەر و بە مەزەب و ڕێبازسوننی شافیعی بوو، ئەو مەزەب و ڕێبازەی كە زۆربەی كوردان ئێستا لەسەرین، هەرچەندە ئەو سەردەمە وانەبوون. هەندێ دێڕە شیعر كە لێیەوە ماونەتەوە، بەزمانێك نووسراون كە زیاتر لە شێوەی دیمیلی نزیكترەو لەو كرمانجییە دەچێ كە ئێستا لە سنجار باوە (بڕوانە زمان) تا ئەم ڕۆژگارەش هۆزێكی بچووكی دومیولی (دیمیلی) لە چیاكانی سنجار لە سوریا دەژین.

عەلەویەتی بنەماڵەی سەفەوی، تەنانەت بەر لەوەش كە ببن بە بنەماڵەیەكی پادشایی، زیاتر نزیكترە بۆ پشتەڵەكی دیمیلی – عەلەوی، وەكو بۆ كرمانجی– سوننی. دامەزرێنەری بنەماڵەی پادشایی سەفەوی، واتە شائیسماعیلی یەكەم، خۆی بە "بەرجەستەكەرێكی خودایی" دەشەنگاند و تائێستاش عەلەویەكانی ئەم سەردەمە بەوەی دادەنێن.

تائێستاش بوونی كوردەكان لە هەرێمی ئەردەبیل نەسڕاوەتەوە، هەرچەندە لە سەردەمی سەفیەدینەوە توركاندنی دەشتەكانی ئازەربایجان كە دەكەونە لای ڕۆژاواوە هێمان هەر بەردەوامە تەنانەت ئێستاكەش دوو هۆزی كوردی هەر لێماوە كە بریتین لە هۆزەكانی شاتڕانلو و كوربێگاو، كە لە چیاكانی باشووری ئەردەبیلدا دەژین.

هەر دوابەدوای ئەوەی شائیسماعیلی یەكەم پێی لە ئازەربایجان و شەروان گیركرد، لەوێوە قەڵەمڕەوی سیاسی خۆی بەرەو ڕۆژهەڵات كشاند، ئەوەبوو ساڵی ١٥٠٨ بنەماڵەی میرنشینی ئاق قۆینلوی تەفروتوونا كرد، ئینجا بۆ دەستگرتن بەسەر كوردستانیشدا باری بۆ هەموار بوو.. (بڕوانە مێژووی سەدە ناوەڕاستییەكان) كاركردی كاریگەرو بەردەوامی شیعەگەریی تەقلیدی لەسەر شازادە سەفەویەكان، لە پرۆسەی پەروەردە بوون و پێگەیشتنیان لەسەر دەست وەزیرو دەرسبێژو شازادە فارس نەژادەكان لەناو كۆشكە پادشاییەكاندا بەزەقی خۆی لە ڕەفتاری شا عەباسی گەورەدا(١٥٨٨–١٦٢٩ ) نواندو گەیشتە ئەوپەڕی توندیی كاتێ شا قزڵباشە عەلەویەكانی تارومار كرد و لەجیاتی ئەوان بایدایەوە لای زانا موسڵمانە شیعە مەزەبە تەقلیدیەكان لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

ئەم بیرکارە ئایینییانە بەرەبەرە ڕیشەی عەلەویزمیان لە ئایینی ئیسلام دەرکێشا، بەڵام، هەرچەندە ئەم پێشهاتانە ئیسلامی شیعەی لە توانەوەی تەواو لەناو عەلەویزمدا ڕزگارکرد، کارکردنی عەلەویزم لە شیعە تا ئێستا جێ پەنجەی هەر دیارە.

پەلهاوێژی و تەنینەوەی ئیمپراتۆریەتی سەفەوی تازە هەڵکەوتوو بەرەو ڕۆژئاوا، ساڵی(١٥١٤) لەگەڵ پەلهاوێژی و تەنینەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا بەرەو ڕۆژهەڵات لە دەشتی چاڵدیرانی باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لووتیان تەقی بەلووتی یەکا ئەو ململانێ ڕۆژهەڵات – ڕۆژئاواییەی کە لە سەدەکانی کلاسیکیدا لەنێوان فارسەکان و ڕۆمەبیزەنتیەکاندا باوبوو، ئێستا وا دیسانەوە سەری هەڵداوەتەوە و سەر لەنوێ کوردان وەکو گشت جارێك کەوتوونەتە نێوان دوو ئاگرەوە.

تەنها جیاوازییەك کە لە ئارادابوو ئەوەبوو لە چاڵدیران عوسمانیەکان، کە پاشهاتی بیزەنتیەکان بوون، بە جۆرێکی یەکلاکەرانە شای ئیسماعیلی یەکەم و فارسەکانیان تەفروتونا کرد و بەرەو ڕۆژهەڵات لەودیوی ڕووباری دیجلەش دوورتریان ڕەتاندن سەرەنجام پاش ڕیزە تێکدادان و شەڕوشۆڕێکی یەك سەدەیی، هەردوو ئیمپراتۆریەت پێکەوە ساڵی ١٦٣٩ لە زەهاو دانیشتن و لە پەیمانێکدا ئەم سنوورەی ئێستای ئێران لە ڕۆژاواوە کەم و زۆر، ڕێکەوتنی لەسەر کراو بەمە بە سێ بەشی کوردستان چوە ژێر دەستی عوسمانیەوە و تا داڕوخانی ئەو ئیمپراتۆریەتە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا هەر بەو جۆرە مایەوە.

لە جەنگەسەرزەمینخوازیەکانی زووی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانییدا کوردە عەلەویەکان لایەنی سەفەوییەکانیان گرت، لە کاتێکدا موسڵمانە سوننیە کوردەکان زۆرتر تای عوسمانیی بوون، کە شێوازی دەسەڵاتداریان زیاتر شل و چاوپۆشکەرانەتر بوو لە هی بنەماڵە حوکمڕانە شیعە و عەلەوییە سەختگیرەکانی وڵاتی فارس.

جگە لەمە، زۆربەی کوردەکان، چ سوننی چ عەلەوی، زەرەرو زیانێکی یەکجار کوشندەیان لە دەستی سەفەویەکان تێسرەوێنرا ئەویش لەبەر هەڵکەوتەی ستراتیژی سەرزەمینەکەیان و ڕاستییە جوغرافیەکانی ئەو سەردەمە.

بەو لەشکرەیانەوە کە زۆرتر لە تیپی سووك سووکی سوارەی پێکهاتبوو، هێزی سەفەویەکان تاڕادەیەکی زۆر لە هی عوسمانیەکان بچووکتر بوو، کە لە بنەڕەتەوە لە سوارەی تۆپخانەداری گران دامەزرابوو لەبەر ئەمە لەشکرە گرانترو گەورەترەکەی عوسمانیەکان، دەبوو

بەڕێوە دەم دەم ئازووقەی پێویست پەیداكا، وەرنە گەورەیی كاروانەكانی ئازووقە و خەرجی بە ڕێخستنیان، دەبوو بە فاكتەری بڕیاردەری ژمارەی ئەو زەلامانەی دەتوانرا بخرێنە بەرەكانی جەنگ و دابینكردنیان بۆ ئەوەی بتوانن بەر لە تۆپبارانی عوسمانییەكان بگرن فارسەكان تەكتیكی "زەمینی سووتاو" یان بەكاردەهێنا تا نەهێڵن عوسمانیەكان ئازووقەی پێویستیان دەستكەوێ ئەم سیاسەتی "زەوی سوتاو" ە بەشێوەیەكی كاریگەرانە تای تەرازووی شەڕەكەی بەرامبەر ڕاگرت، هەرچەندە هەندێ جار بەلای هێزە بچووكەكەدا دایگرت، كە هی فارسەكان بوو و هێزی سوارە سووك و تیژڕەوەكان بە ئاسانی دەیانتوانی بە "زەمینە سووتاو" ە چۆڵەكەدا دزەبكەن و خۆ بگەیەننە سوپای عوسمانی و جەزرەبەی چاكی لێبدەن لەم ناوەدا دۆڕاوو ماڵوێرانبووی هەر گەورە كوردستانی زەمین سوتاو بوو، كە هەرلایە بۆ سەركەوتنی لە شەڕەكەدا دەبوو لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر، بێ پەرواو و پەنگانەوە ئاگری تێبەرداو خاپووری كا.

هەزارەها هەزار كورد لەلایەن سەفەویەكانەوە بە زۆر لە زێدی باوباپیرانیان هەڵكەندران و بەرەو شوێنی دوورە دەست بە تۆپزی گوێزرانەو وێرانكاریەكە لە باكوورو ڕۆژاوای كوردستان ئەوەندە ترسناك بوو كە ئەو خەڵكەی تێیدا مابوونەوە لە ترسا ناچار بوون پشتی عوسمانیەكان بگرن پێشڕەوی ئەولەی كە كوردەكانیان بۆ پشتگیری كردنی عوسمانلییەكان هاندەدا، میر ئیدریسی ڕۆژەكی میری بدلیس و باپیرە گەورەی شەرەفخانی نووسەری یەكەم مێژووی گشت كوردگیر، واتە شەرەفنامە بوو (بڕوانە وێژە).

ڕووداوێكی ڕاستەقینە كە بگێڕەرەوەی شێوەی ڕەفتاری خراپی سەفەویەكانە لەگەڵ كوردانداا، ئێستا بوە بە داستانێكی میللی و لەبەینی قەڵای دمدمدا لەسەر زیانی گۆرانیبێژان دەگەڕێ قەڵای دمدم كە دەكەوێتە (١١٠) میلی باشووری ورمێوەوە ساڵی (١٦٠٨) دەكەوێتە بەر هێرشی شا عەباسی پادشایی سەروەختی سەفەویان لە ئابڵووقەدانێكی یەكساڵیدا قەڵانشینە كوردەكان تا دواكەسیان، بە سەركردایەتی عومەر خانی برادۆست، ئەو پاڵەوانە داستانیەی كە بە خانی "لەپ زێڕین" دەنگی داوەتەوە، قەڵاكەیان نادەنە دەستی دوژمنەوە. داستانەكە بابەتە قارەمانیەكانی ناو ئەلیادەو، بەرگرییە بێهوودە دەست و یەخەییەكانی ماسادا بەرجەستە دەكا.

بەهۆی ئەو پەیوەندییە بەهێزە فەرهەنگی و بگرە ئایینیەشەوە کە لەگەڵ سەرزەمینی فارسدا هەیان بوو، دانیشتووانی ناوەند و باشووری کوردستان وەك هەمیشە لایەنی دەوڵەتی فارسیان گرت بەڵام تەنانەت ئەم پەیوەندیانەش هەندێ جار بەکردەوەی دلمودەزگا سەختگیرەکانی سەرەتای حوکمی سەفەویەکان دەپسان ساڵی (١٥٢٤) هەر تازە، شا ئیسماعیلی یەکەم مردبوو، کە زولفەقارخانی میری هۆزی کەڵهوڕ، لە سەفەویەکان یاخی بوو و توانی بەغدا داگیرکا و خۆی و وولاتەکەی بردە ژێر حوکمڕانی عوسمانیەکانەوە ئەمە ڕێگای بۆ سوڵتان سولەیمانی گەورە خۆش کرد کە ساڵی ١٥٣٣ بروسکە ئاسا عیراق داگیرکاو ولاتەکە تا ساڵی (١٩١٧)بەو شێوەیە لەژێر دەستی عوسمانیاندا بمێنێتەوە.

ڕاستییەکەی سوڵتان سەلیمی ترسناك (١٥١٢—١٥٢٠) دەسەلاتێکی خۆبەخۆی فراوانی بە کوردان دابوو، هەر لە پاداشتی ئەمەشدابوو کە کوردان پشتیان گرت و بوون بەتای بە هەر حاڵ تەنانەت ئەم دەست بەسنگدادانەی عوسمانیەکان بۆ کوردان کە بەڵێ ئێمە برای یەکین زۆر دەوامی نەکردو لەلایەن سوڵتان سەلیم خۆیەوە شکێنرا، ئەوەبوو لە کۆتایی حوکمڕانییدا، ژمارەیەکی زۆر لە کوردان بە زۆر بۆ ناوەڕاست و باکووری ئەنەدۆڵ هەڵکەندران و ئەمانە لەو شوێنانەبوون بە ناوکی پارچە دابڕاوەکانی سەرزەمینی کوردنشین هەندێکی تریان دوور دوور تا بۆلغارستان ڕەهەندەکران لەناوجەرگەی ئەم ڕەهەندانەی دەستی عوسمانیەکانەوە، ساڵی ١٥١٩ لە تۆقاتی باکووری ئەنەدۆڵەوە جەلال ناوێك ڕاست بوەوە، کە خۆی بە بەرجەستەکەری ڕووح ناساند.

ئەوەی جێی سەرنجە لەمەدا ئەوەیە ئەم جەلالە لە هەمان سەرزەمینی پۆنتۆسی دێرینەوە هەڵسا، کە لە سەدەی نۆیەمدا بوویوو بە مەکۆی نەرسەی خوڕەمی (شێوفۆبۆس) و هەوادارە کوردە ڕەهەندەکراوەکانی و هەروەها ئەوەی ئەوان دەیانووتەوە، دووپاتکەرەوەی هەمان ئیدیۆلۆجی ئایینی و کۆمەلایەتی بوو کە تیرەی فریشتەکان بانگیان بۆ هەڵدەدا (بڕوانە مێژووی سەدەناوەندەکان و تیرەی فریشتەکان). جەلال، ناوی شا ئیسماعیلی، لەسەر ناوی پادشایی ڕاونراوی سەفەوی بۆ خۆی هەڵبژارد. ئەو لافی ئەوەی لێدەدا کە گیانی بەرزی پادشاییەتی، کە گوایە دەمێك بەر لەوە لە جەستەی شا ئیسماعیل تارابوو، هەر لەو سۆنگەیەشەوە ساڵی ١٥١٤ لە چاڵدیران تووشی ئەو شکستە کارەساتبارە بوویوو، ئێستا لە گیانی ئەودا نیشتۆتەوە.

وەکو عەلەویەکی دیمیلی، هەواداران و پشتگیرانی جەلال بەشێوەیەکی سەرەکی لە وەرزێڕ و دێهاتیەکان پێکهاتبوون. هەرچەندە جەلال لەسەرەتادا زنجیرەیەك سەرکەوتنی بەرچاویی وەدەستهێنا، بەڵام سەرەنجام شکستی هێنا و خۆی و هەزارەها لە هەواداران قەتڵوعام کران.

ئەم سەرهەڵدانە، کە بەسەرهەڵدانی جەلالی و لەسەر ناوی ڕابەرەکەی ناوبانگی دەرکرد، تا دوو سەدەی دوای کوژانەوەشی لە خاکی عوسمانیدا شوێنەواری هەر دیار بوو وەجار ناجار لێرەو لەوێ بلێسە دەدایەوە. چەندین سەرهەڵدانی تر بەهەمان ناوەوە و بە ڕابەرایەتی کەسانێك کە خۆیان بە مەزهەری ڕووح (بابا) دادەنا وەکو بابا زوننونی بوزوق و قەلەندەر چەلەبی (١٥٢٦–١٥٢٧) لە ئەلبیستانی قیلیقیاش ڕوویاندا هەوادارانی جەلالی. بە هەر حاڵ زیاتر لەناو تورکمان و بەرەگەز تورکەکانەوە هاتبوون و بەوە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ مێژووی کورد لە دەست دەدا.

بە هەر حاڵ زنجیرەی ئەو ڕووداوە وێرانکەرانەی لەو ماوەیەدا لەسەر خاکی کوردان گەو بەگەو ڕوویاندا، بیروڕایەکی نوێشیان زایاندە ناو دڵ و دەروونی هۆشمەندانی کوردەوە کە بریتیبوو لە دامەزراندنی حوکومەتێکی خۆبەخۆیی و سەرلنسەری بۆ کوردان، بەڵام بیرۆکەی یەکخستنی نەتەوەیەك کە خۆی کاروباری خۆی لەڕێی حوکومەتێکی خۆ بەخۆوە بگێڕێ و تواناو تینی بۆ گەشەکردن و ئاسایش و زیندویی فەرهەنگیی قەوارەی ئەتنی ئەم گەلە تەرخان کا، بەڕاستی بۆ ئەو ڕۆژگارە کردەوەیەکی ئاسان نەبوو، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئیسلام نشین کە تێیدا " ئوممەتی ئیسلام" کۆکەرەوەی هەموو مسوڵمانان و تاکە تەوەرە بوو کە هەموو دڵسۆزانی ئیسلامی لە دەوردا کۆبێتەوە. نەك هەر لەناو کورداندا بەڵکو دوای جیهانگیریەکانی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمدا، لەناو گەلی ئێرانیشدا بزاڤێك بەرپابوو تا مەسەلەی نەتەوەیی ئێرانێکی مەزن بخاتەڕوو و پشتیوانیی لێبکا، وەکو وڵاتێکی جیاواز و مەڵبەندی فەرهەنگێکی دیکە لەچاو سەرزەمین و فەرهەنگ و کەلتووری عەرەبدا. ئەمە، بە زەقی لە شانامەی فیردەوسییدا بەرجەستەکراوە. بە هەرحاڵ، ئەمە دەبێ لە پرۆسەی وریابوونەوەی نەتەوەیی کوردان جیا بکرێتەوە، چونکە شانامە خۆی لە باسی کۆمەڵێکی ئەتنی دیاریکراو نەداوە، بەڵکو لە کۆمەڵێك پێکهاتەی ئەتنی دواوە کە هەموو پێکەوە لە شارستانیەتی ئێران و لە چوارچێوەیەکی گەورەتردا هاوبەشن. شانامە، هەر چۆنێك بێ،

هەرگیز پێش بیرۆکەی یەك حکوومەت یان یەك قەوارەی سیاسی نەگرتووە کە یەکخەرو پارێزەری ئەم گەلانە و شارستانیەتیان بێ، لە کاتێکدا لەڕوو بەڕوبوونەوەی شەپۆلێکی وێرانکەرانەتردا، ڕۆشنبیرانی کوردی سەدەی حەڤدەیەم، لە بەرهەمەکانیاندا بێ یەك و دووکردن ئەم ڕێبازەیان گرتۆتەبەر.

یەکەم مێژووی گشتیی کوردان، شەرەفنامە، ساڵی ١٥٩٦-١٥٩٧ لەلایەن میر شەرەفەدین (شەرەفخان)ی بدلیسەوە نووسراوە (بەدلیس شارێکە دەکەوێتە ناوجەرگەی ئەو هەرێمەوە کەوا یەك سەدەی ڕەبەقە لەناو وێرانکاری وماڵوێرانی و تەپوتۆزی ڕاپەڕین و گواستنەوەی بە زۆر و دەربەدەری و تیرۆردا دەژی) لە کتێبەکەیدا شەرەفخان بە گەرمی بۆ بەختی ڕەشی کوردان و سەرزەمینە نازدارەکەیان دەلاوێنێتەوە، لێرەو لەوێی کتێبەکەدا باسی مرازی ناحاسڵ و ئاواتی بەدی نەهاتووی کوردان دەکا لە بوونی پادشاییەکدا کە وڵاتەکەیان یەکخا لە پەنای ئەفسوسخۆری بۆ نەبوونی پادشاییەکی وادا. دوایی، وەکو دەرککردن بەوەی ئیسلام و بیرۆکەی "ئوممەی ئیسلام" لەوانەیە هۆکاری مەسەلەکە بن، بەخشکەیی و بەکینایەت ئۆباڵەکە دەخاتەسەر ئەو لەعنەتنامەیەی پەیامبەر محەمەد لە کوردانی کردووە.. بەدلیسی دەڵێ: محەمەد کە کابرایەکی کوردی ڕەزاگرانی چارە شەڕانیی دی، سەخڵەت بوو، داوای لە خوا کرد تا کورد هەیە نەبن بەیەك، چونکە محەمەد لەوە دەترسا گەر ببن بەیەك دنیا دەخۆن.

یەك سەدە دوای ئەوە، لە ساڵی (١٦٩٤ ) دا، شاعیری خۆش ئاوازی کورد ئەحمەدی خانی لە داستانی مەم و زیندا دەڵێ: "بڕوانە هەر لە عەرەبستانەوە بگرە تا دەگەیە گورجستان هەموو خاکی کوردە، بەڵام کاتێك کە زەریای فارس و دەریاکانی تورك هەڵدەچن، تەنیا خاکی کوردان خڵتانی خوێن دەکرێ "خانی بە ئاشکرا لۆمەی بەختی ڕەشی ئەو هاوڵاتیە کوردانەی دەکا کە لە شەڕی سوپای تۆڵەخوازی عوسمانی و سەفەوییدا دەبنە باڕاشی ناو ئاشی خەڵکانی لاییدە، لە کاتێکدا دەوڵەت (حکوومەت)ێکی کورد نییە باوکایەتیان بکا. بەدەم دادکردنەوە لە دەستی ناتەبایی و ڕێك نەکەوتن لەنێوان بنەماڵە میرە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا، هاوار ئەکا بۆ یەکگرتن لەژێر ئالای یەك پادشادا کە ببێتە سێبەری سەری وڵاتەکە و سامانی نیشتمانی و فەرهەنگی بپارێزێ. بەکارهێنانی هزری نیشتمانی پاك، کە لەوانەیە یەکەم جاریێ لەلایەن ڕۆشنبیرێکی کوردەوە خرابێتە سەر کاغەز، ئەویش لەو سەردەمەدا کە

دەورانی لێقەومانی نیشتمانی بوو بۆ كوردان. لەپاڵ شەرەفنامەكەی بەدلیسییدا، هەردووك یەكەم دەربڕینی هەستی ڕاستەقینەی وریابوونەوەی نەتەوەیین لەناو كوردانـدا، ئەگەر هـی نەتەوە پەرستی (ناسیۆنالیزم) نەبن بەو مانایەی ئەمڕۆكە ئەم وشەیە هەیەتی، (بڕوانە ئەدەب و وێژە).

لەگەڵ دامركانەوەی شەڕ و شۆڕەكانی نێوان ئێران و عوسمانی لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٧)دا ئەم سەرەتا ڕەسەنەی ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ لەنێوان ڕووناكبیرە كوردەكاندا، گوێگرێكی ئەوتۆ گوێ ڕایەڵی لێ نەهاتە پێشەوە. ئاستی نزمی ڕۆشنبیری و بەرزی نەخوێندەواری و لەتین كەوتنی ئەو چینە ناوەندە شارنشینە كوردەی كە سەردەمانێك وەك ژیلەمۆ دەدرەوشایەوە، قەڵەشێكی دەم كراوەی ڕووناكبیریی لەنێوان ئەم ڕووناكبیرانە و هاووڵاتیەكاندا دروست كرد كە زۆربەیان هەژار و نەدار و بەچكە ڕەوەند بوون و هەر ڕۆژە لەبن بنچكێكدا دەژیان. ئەمە پشت بەپشت بەو نەزمە گەڕا و ڕۆیشت.

لەنێوان بنەماڵە میرنشینە نیمچە سەربەخۆكانی ئەو دەمە، ئەردەڵانیەكانی شارەزوور لە كوردستانی ناوەند و باشوور، ناوبانگیان لەسەراسوێ كردنی هونەرە جوانەكاندا دەركرد هەروەها شەمدینانیەكانی هەكاری لە ڕۆژاوا و باكوری ناوەندی كوردستان داشداری و كەڵكبەخشییان بۆ گەلێ شاعیر و نووسەر كرد دەنگی داوەتەوە شەرەفەدینی بەدلیسی، وەكو لەسەرەوە باسمان كرد، خۆی میرێك بوو ڕۆڵەی بنەماڵەی میرنشینی ڕۆژەكی لە بەدلیسی كوردستانی ڕۆژاوا (نەخشەی ژمارە ٢١).

لە بارەی پلەی سەربەخۆیی ئەم بنەماڵە فەرمانڕەوا كوردانەوە قسەیەكی گەڕیدەی بەناوبانگی فەرەنسی تا ڤەرنێ (Tavernier) دێنینەوە كە ساڵی ١٦٧٦ لەسەر میری بەدلیسی نووسیویەتی: (میرنەشای واتە شای ئێران)ی بەهیچ دەزانی نەسوڵتان (واتە سوڵتانی عوسمانیی) و لەهەر ئان و ساتێكدا دەیتوانی (٢٠-٢٥) هەزار سواری كەمەر بەستووی پڕچەكو تفاق فڕێداتە مەیدانی كارزارەوە، هەروەها فلۆریان، لە نووسینێكی ساڵی (١٦٩٤)یدا لە زمانی ئەو میسیونەریانەوە كە ساڵی ١٦٨٣ سەردانی بتلیسیان كردوە دەڵێ: (تەنها بەناو میر سەرانەیەكی بۆ عوسمانیەكان دەنارد، ئەوەبو ناوبەناو هەندێ دیاری بۆیان ڕەوانە دەكرد ئەویش بەگوێرەی توانا و بوون).

پاش ڕێککەوتننامەی زەهاو، جۆرە هێمنییەك باڵی بەسەر کوردستان و میرنشینە نیمچە سەربەخۆیەکانییدا کێشا، بەڵام ئەمە زۆرێکی وای نەبرد، ئەوەبوو کوردستان هەر لە ساڵی ١٧٢٢ەوە کە سەفەویەکانی تێدا سەرەنگریژ بوون تا ١٧٥٠ و سەرهەڵدانی زەندیەکان لە فارس چووەوە ناو قۆنگرەی ئاژاوەو شەڕوشۆڕەوە. ئەو بۆشاییەی ڕووخانی سەفەویەکان جێیهێشت، ڕێی بە عوسمانیەکان دا بڕژێنە هەرێمەکانی ڕۆژاولوە و بیخەنە سەر قەڵەمڕەوی

خۆیان. ئەوەبوو تا چەند ساڵێك هەموو كوردستانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

هەر كە هاتە سەرتەخت، نادر شای (١٧٣٦–١٧٤٧) دامەزرێنەری ئەفشاریان و حوكمڕانی بەتین و توانای وڵاتی فارس، دەسوبرد كەوتە سەغڵەتكردنی عوسمانیەكان لە كوردستان و لە عێراقدا. هەمان ماڵوێرانی و كوڵۆڵیی پاش چالدیران دیسانەوە ملی نایەوە لە كوردستان و ئەمجارەیان باشوور و ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی وڵاتەكەشیانی گرتەوە. چەندین شار و شارۆچكە و شارەدێ خاپوور كران و چەندین هۆز بە خاوخێزانەوە دەربەدەركران، تەنانەت ئەو تۆزقاڵە فەرهەنگ و كەلتوور و ژیانی مەدەنیەی كورد كە بە ڕێكایەكی لە ئەقڵ بەدەر لە جەنگی وێرانكاریەكانی سەدەكانی ١٦ و ١٧ ڕزگاریان بوویوو (چونكە لە دەرەوەی مەیدانە سەرەكیەكانی جەنگ پارێزرابوون) سەراسەر پان و پلیش كرانەوە، ئیتر كوردستان بوو بە تاریكستان و ئەمە تا داهاتنی سەدەی بیستەم هەر وا مایەوە.

بڕێكی زۆری كەلتووری نەتەوەیی لەم ماوەیەدا یان لەبیر چوەوە یان لەبنی فەوتا، ئەوەش كە مایەوە ئەوەندە پچڕپچڕ بوو، كە لەناوییدا تەنیا زاراوەكانی سەدە ناوەڕاستیەكانی ئایینە نەتەوەییەكەی كورد (تیرەی فریشتەكان) و كۆنە زمانی كوردان (پەهلەوانی) لێ بە ساغی دەرچوون. ئەم شتانە دوای ئەوە هەرگیز نەگۆڕان یان جێگریان بۆ پەیدا نەكرا. ناوی ئایینەكان (یارسانی، عەلەوی، یەزیدی) و زاراوەكانیش (دیمیلی، گۆرانی و لەكیی) كە هی كۆنە زمانەكە بوون، وەكو خۆیان مانەوە (بڕوانە ئایین و زمان).

لەناو یەكێك لەو هۆزانەوە كە سەفەویەكان سورگوونی خۆراسانیان كردبوون، واتە زەندەكانی هەرێمی ئێهپەری باشووری كوردستان، لەناكاوێكدا دوا میرنشینی كوردان سەریهەڵدا، كە لە قەوارە و شێوەدا لە هی ئەیوبییەكان و بوەیهیەكانی سەدەكانی ناوەڕاست دەچوو. ئەوەبوو محەمەد كەریم خانی زەند (١٧٥٠–١٧٧٩) میرنشینی زەندی لە فارس دامەزراند كە قەڵەمڕەوی تا ساڵی ١٧٩٤ هەموو ئێرانی ئێستا و باشووری عێراقی دەگرتەوە و لە شیرازەی پایتەختیانەوە هەموو ئەم سەرزەمینەی دەڕاند (نەخشەی ژمارە ٢٢).

پەڵەپەڵەی زەندەیە لەك زمانەكان ئێستاش لە گەڵێ ناوچەی كوردستانی باشوور هەر ماون، هەر لە كفرییەوە بگرە تا دەگاتە مەلایر (بڕوانە هۆزەكان). لە دڵچاكی و لێبوردەییدا بەرامبەر دوژمنە بەزیوەكانی، لە ئازایەتی و ساكارایەتی سیاسییدا، كەریم بێ هاوتایانە،

میرێکی تری کورد، سوڵتان سەلاحەدینمان وەبیر دەخاتەوە. لە کاتێکدا، جێگرەکانی سەلاحەدین، زانیاری و وەستاییەکی میکیاڤیلیانەی سیاسییان بۆ مانەوەی میرنشینەکەیان بەکارهێنا، جێگرەکانی کەریم نەبەردییەکەی ئەویان نەبوو بەڵام میراتگری پڕ بەپێستی ساکارییە سیاسیەکەی بوون. ئەو هەرگیز ناوی شای بۆ خۆی بەکار نەهێنا، بەڵکو تاما هەر بە "وەکیلی ڕەعییەت" ناسرابوو، هەندێ جاریش هەر "وەکیل" ئەم کارەی کەریم لە هی یەکێك لە باپیرە هەرە گەورەکانی واتا پادشایی کوردەمانیەکان دەچوو کە هەرگیز لە کاتی خۆناساندن بەسەرداره ستەمکارە ئاشووریەکان، نەیدەوت من، بەڵکو دەیوت "من و پیران و پیاو ماقووڵان و شیرەتوانانی وڵاتەکەم" (مێژووی کۆن).

دولمیری زەندیان، لوتفعەلیی نەوجوان و کارامەو دانا، لەلایەن ئاغا محەمەد خانی ترسناکی، (١٧٧٩-١٧٩٧) دامەزرێنەری بنەماڵەی قاجاری حوکمڕانی ئێرانەوە بەشەڕ شکێنرا و ئینجا پاش ئەشکەنجەیەکی دڕندانە کوژرا. ئاغا محەمەد سەردەمی لاویەتی و پەروەردەشی لە کۆشکی کەریم خاندا بردبوە سەر، کەریم خان بەچاوی ڕێز و بەرزییەوە سەیری ئاغا محەمەدی دەکرد. بینا بەوەی کە ڕۆڵەی بنەماڵەیەکی لە شەڕدا دۆڕاویوو. یەکێك لەو شتە جوانانەی کە زەندیەکان خۆیان پێی لە حوکمڕانانی تری وڵاتەکە جیادەکردەوە، بەشداریکردنی ژنان بوو لە هەڵمەتە سەربازیەکاندا. ئەمە داب و نەریتێکی دێرینی کوردان بوو (بڕوانە بارودۆخی ژنان و ژیانی خێزانی) و تەنانەت کەریم خان خۆشی لەناو ماڵ و منداڵی خۆیدا لەسەری دەڕۆیشت، ئەوەبوو لە شەڕێکیدا لەگەڵ ئەفغانەکاندا، بووکی گەورەی شان بەشانی خۆی لە مەیدانی کارزاردا دەجەنگا زەندیەکان سیفەتێکی تریشیان هەبوو کە تەنها تایبەتە بە کوردان، ئەویش لێبوردەیی و دڵفراوانیە بەرامبەر بە ئایینەکانی تر، زەندیەکان کە سەرداری حکومەتێکی ئیسلامی شیعەمەزەب (یان لەوانەیە یارسانیی)بوون ساڵی ١٧٦٦ لەلایەن نەیبووری ئاسەوارناس و گەڕیدەی دانیمارکیەوە وا باس کراون: "بەلایانەوە گرنگ نەبوو سەربازەکان لەسەر چ ئایینێك بن مەسیحی، ئیسلام یان جوولەکە". هەروەها دەڵێ کەوا: "پاش ئەوەی زەندیەکان بەسەرەیان دوای ئابلۆوقەدانێکی دوور و درێژ گرت، هیچ پەرستنگەیەك، حاورا بێ، یان کە نیشت یان مزگەوتی هەر تیرەیەکی مسوڵمان، تووشی بێڕێزی و سووکایەتی و تاڵانکردن نەبوو".

Black Sea
KINGDOM OF
GEORGIA
SHARVAN
Caspian
Sea
UZBEK
KHANATE S
Tabriz
Dar Gaz
Meshhad
OTTOMAN
EMPIRE
Teheran
Hamadan
AFSHÂRID
KINGDOM
Baghdad
Deh Pari
Malayir
IRAQ
Isfahan
Basra
Shirâz
Kirman
Persian Gulf
Indian
Ocean
OMAN
نەخشەی ژمارە(22): پادشانشینی زەندییەکان
رێچکەی دەربەدەرکردنی هۆزی زەند بۆ خۆراسان و پاشان گەڕانەوەیان بۆ دەهپەری
سەرزەمینی ژێر دەسەڵاتی زەندیان
ئەو سەرزەمینانەی ئەمڕۆکە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن
شیراز : پایتەخت

هەر لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە، لەکەکان، کە زەندەکان بەشێکن لێیان، پەیتا پەیتا خۆیان لە کوردەکان دوورخستۆتەوە و خۆیان کوتاوەتە ناو لوڕەکانی دراوسێیانەوە و تێیاندا تواونەتەوە. لوڕەکان خۆیان، سەردەمانێکی گەلێ دێرتر ناسنامەی کوردیی خۆیان لە دەست دابوو و نەتەوە گۆڕییان کردبوو (بڕوانە ئامێتەبوون تێکداتوانەوە). هەر لەبەر ئەمەش مێژووناسان تووشی گرفتێکی زۆر بوونە لە نەتەوەناسی میرنشینی زەنددا.

هەر لە هاتنە سەرکاری زەندیەکانەوە، جۆرە هێمنییەکی گومان لێکراو باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا، هێمنییەك کە زۆرتر لە هێمنی دەشتێکی کاکی بەکاکی دەچوو. ئەمە بەشێوەیەکی سەرەکیی، سەرەنجامی سێ سەدەی ڕابردووی پڕ لە کرداری سەربازی ئێسك و پروسك هاڕو وێرانکاری ئابووری کەمەر شکێن بوو، دانیشتووانەکە ئەوەندە هەرکێنرابوون و وڵاتەکە ئەوەندە چروسابووەوە، بەجۆرێك کوردستان بوو بوە سەرزەمینیکی لاچەپی دوور دەستی، گیاو دەغەڵزەدەی داماڵراویی ئەوتۆ کەهیچ بایەخێکی ژینگەی وای نەبێ، نە بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، نە بۆ ئیمپراتۆریەتی عەجەم. خۆی ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە هەردووکیان بەپەلە خەریك بوون، ئەستێرەی دەبدەبەیان لەبەرلمبەر ئەستێرەی درەوشاوەی ئیمپراتۆریەتە کۆلۆنیاڵیە ئەورووپیەکان و پێشکەوتنی سەرسام ئاوەری تەکنۆلۆجیایاندا کەوتبووە پرتە پرت و دەیدا لە کزی. ئەو داخزانەی کوردستان، کەم و زۆر، بەشێك بوو لە داخزانی گشتی ڕۆژهەڵات، هەرچەند کوردستان، ئاسەوارەکەی لەبەر شەڕ و شۆڕ و چۆڵکردن پتر پێوە دیار بوو.

**سەدەی نۆزدەیەم:** لەگەڵ داهاتنی سەدەی نۆزدەیەمدا، کوردان سەر لەنوێ کەوتنەوە بیرکردنەوە لە ڕەوش و ڕۆڵی خۆیان لە وڵاتەکەدا. ئیمپراتۆریەتی رووسی دەستی کردبوو بە پاڵنانی سنوورەکانی بۆ قووڵایی باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە قەفقاس و ئاسیای ناوەندا. ساڵی ۱۸۱۳، پاش شەڕێکی شەش[14] ساڵەی نێوان ڕووس و عەجەمەکان، ڕێککەوتننامەی گوڵستان هەموو گورجستان و باکووری ئازەربایجان (شەروانی کۆن) و داغستانی لە دەستی دەوڵەتی فارسەوە کردە دەستی ئیمپراتۆریەتی ڕووسەوە، بەم جۆرە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا

[14] ئەو جەنگە ساڵی ۱۸۰٤ دەستی پێکرد – دوکتۆر کەمال مەزهەر.

هەندێ لە كوردان بوون بە بەشێك لە ڕووسیا. ئەمانە كۆمەڵە كوردەكانی دێرینی هەرێمەكانی گەنجە و شەڕوان بوون (كە ئێستا كۆماری ئازەربایجانی پێ دەڵێن) كە هەزار ساڵ لەمەوبەر بنەماڵەی میرنشینی شەدادیەكانی لێ هەڵكەوتبوو (بڕوانە مێژووی سەدە ناوەندەكان).

شەڕی دووەمی ڕووس- عەجەم (١٨٢٦-١٨٢٨) بەرێككەوتنامەی توركمانچای كۆتایی هات. ئەم ڕێككەوت نامەیەش ئەرمەنستانی عەجەمی (كە ئێستا كۆماری ئەرمەنستانی پێ دەڵێن) كردە خەلاتی هەمان ئیمپراتۆریەت. ئەوەی جێ هاوڕدانەوەیە ئەوەیە، تەنانەت لەو كاتەشدا و لەو بەشەی ئەرمەنستانی دێریندا، بە گوێرەی قسەی بڕنووتیان، ژمارەی كوردەكان لە هی ئەرمەنیەكان پتر بوو (٢٥٠٠٠ كورد لە بەرامبەر ٢٠٠٠٠ ئەرمەنی)- (بڕوانە بڕنووتیان- bournoutian 1982 ٧٦)، ئەوەندەی پێ نەچوو، ڕووسەكان لمۆزیان ژەنیە سەرزەمینەكانی دەوروبەرەوە و بە داماڵینی هەرێمەكانی قارس و ئەردەهان، بێ پەروا كەوتنە ناو خاكی كوردستانەوە و بەو جۆرە كوردێكی زۆریان خستە ژێر هەنگڵی خۆیان.

ئەم گۆڕانانە لە سنووری دەوڵەتێكی ئەورووپاییدا بەرەو هەرێمەكانی كوردستان، هەرچەندە ئەو ولاتە دەوڵەتی هەرە دواكەوتووی ئەورووپاش بوو، كۆتایی بەدوو سەدەی ڕەبەقی ئەفەرووزی كوردان هێنا، ڕووسەكان لەگەڵ خۆیاندا، گەلێ بابەتیان هێنا، لەوانە بیروڕای نوێی ڕۆژئاوا، ئەوكاری وریا كردنەوەیەی ئەمە لەناو كورداندا بەدی هێنا لە هەموو كون و قوژبنی كوردستاندا هاواری دەكرد و تەكنۆلۆژیای نوێ دەرفەتێكی باشی بۆ حكوومەتە ناوەندیەكانی عوسمانی و عەجەم دەدا تا دەسەلاتێكی مەركەزی توندوگرانتر و ستەمكارانەتر بخەنە سەر كوردەكان و ئەو دەسەلاتداریە نیمچە سەربەخۆیانەیان كە لە درێژ زەمانەوە هەیانبوو.

ناسیۆنالیزمی نەتەوەیی، لە شێوەی ئەوەی لە ئەورووپادا هەبوو، لەم سەردەمەدا، خۆی لە شیعرەكانی حاجی قادری كۆییدا دەرخست (١٨١٧-١٨٩٧) ئەو بە توندی داكۆكی لەم ناسیۆنالیزمە كرد بەهاندان بەرەو یەكیەتی گەل و ڕەتكردنەوەی چینە دەسەلاتدارە كۆنە پەرست و پێشەوا ئاینیەكان. حاجی قادر بە ئاشكرا ئەوانەی بە تەگەرە لەبەردەم مەسەلەكە و بێ پەروا لە ئاستیدا دانا، ئەو هەروەها بانگەوازی بۆ دەوڵەتێكی گشت كوردان هەڵدا كە ڕۆڵەكانی كورد بە ڕێبازی دنیایی و لە زمانی كوردی پەروەردە بكا، تا زمانی كوردییش یەكسان بێ لەگەڵ زمانی هەموو گەلانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، زمانی ڕەسمی ئەم

دەوڵەتە گشت – کوردیەش دەبێ کوردی بێ (حەسەنپوور ١٩٨٩/٥٥).

ئەم بیروڕایانە ئەو ڕۆژە، تەنانەت لای گەلی کوردی خوێندەواریش بە خەیاڵ پلاو ورەتی بڵاو دادەنرا، بەڵام حاجی بەمە تاجی سەرقەتاریی کاروانێك ڕۆشنبیر و خوێندەواری هەلگری ئەندێشە و بیروڕایەکی نوێی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەسەر دانا.

پیاوانی حاجی قادر ئاسا، هەرچەند ژمارەیان لە پەرەسەندندا بوو، بەلام هەر بە دابڕاوی مانەوە لە بەشەکانی تری کۆمەڵگای کورد. ئەوان زۆربەیان لە پایتەختەکانی ئەورووپا دەژیان یان لەنێوان ئەو پایتەختانەدا هاتوچۆیان دەکرد، بۆیە شارەزایی هەندێکیان لە فەرهەنگ و مێژووی ئەو کۆمەلگابیانییانەدا چەند قات لەهی خۆیان زیاتر بوو. ئەو خەلکە کوردەش کە ئەو دەمە لە کۆتایی چەندین سەدەی دوابەدوای یەکی داهێزران و داچۆڕانی نیشتمانی و فەرهەنگییدا لاکەی سەریان دەهات، بە تەواوەتی نەناس بوون لەگەڵ بیروڕا سیاسیە تازە بابەتەکانی ئەواندا، ئەولەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، ڕابەرایەتی بزووتنەوەی سیاسی کوردیان دەکرد واتە سەرۆك هۆزەکان یان شێخانی تەریقەت، هۆشیاری فیکرییان لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتی خۆیان دەرنەدەچوو و دوور بوون لەهی ئەم ڕووناکبیرە نوێخوازانە بۆیە ڕوونکبیرەکان بە خەوبینی بێ ئاگا و دوور لە ڕاستییەکان و دابڕاو لە گیروگرفتی ئاپۆرای کوردان دادەنران و بەو چاوە سەیر دەکران کەوا ئەوان گەلێ لە حاڵوباڵی پاریس و فیەننا شارەزا ترن وەکو لەهی شارەکانی خۆیان لە کوردستان.

لە کاتێکدا خەوبینێکی وەکو حاجی قادر لە دەریای ناسۆنالیزمی تازە بابەتدا مەلەی دەکرد، کوڕانی دوا بنەماڵەی میرنشینە کوردەکان، لە پایتەختەکانی وڵاتەکانیان، ئاوارە و دەربەدەر، پەنا بەرییشیان پێ ڕانەدەبینرا. میرەکانی میرنشینی ئەردەڵان (کە ساڵی ١١٦٨ دامەزرابوو) ساڵی ١٨٦٧ لە سنە (سەنەندەچی ئێستا) وەدەنرابوون و لەجیاتی ئەوان فارسەکان فەرماندارێکی ئالقە لەگوێی خۆیان دلنابوو کە پەیوەندی یەکسەر بە تارانەوە بوو. هەر بەماوەیەکی کورت بەر لەوە، ساڵی ١٨٤٧–١٨٤٨، دوا بنەماڵە میرنشینە کوردە سەرەکیەکانی ناو خاکی عوسمانی، واتە بنەماڵەکانی بابانی سلێمانی و ڕۆژەکی (بەدرخانی) یە مێژووییەکانی بتلیس (کە ساڵی ١٠٤٣ دامەزرابوو) و بازەکانی ئەخلات (کە ساڵی ٩٨٣ دامەزرابوو) هەموو لە پایتەختەکانیان وەدەرنرابوون و سەرزەمینەکانیان خرابوە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەو خۆی ئەستەموڵەوە.

ئەم گۆڕانە بنەڕەتیە لە سروشتی سەرکردایەتی کورددا، واتە کوژانەوەو لەناوچوونی داب و نەریتی نیشتیمانی لە حکومەت گێڕیدا، شایستەی بایەخ و هەڵوێستەیەکی گەورەیە، چونکە رۆڵێکی بەتینی لە دواخستنی پرۆسەی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورددا گێڕاوە. ئەم دامودەزگا نیشتیمانی و نەتەوەییانە کەهی هەزاران ساڵی لەوەبەر بوون، سەرچاوەی هەرە مەزنی پێشکەوتن و گۆڕان و بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و کەلتوور و تەکنۆلۆجیا و بیر و باوەڕی نوێ بوون لە کوردستاندا. ئەم بنەماڵە میرەکوانگ کوێرەوەکراولنە بوون کە سەرکردە خێڵەکیەکانیان کەوی و شارستانی کردو هەڵچوونی ڕابەرە ئایینییە سەختگیرەکانیان دامرکانەوە و پەیوەندی ئابووریيان لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەدا بە بەردەوامی پاراست. رۆڵەکانی ئەم بنەماڵانە خۆشیان خاوەنی پلەی بەرزی خوێندن و هۆشیاری دنیایی بوون. و بێ یەك و دوو دەکرێ بوترێ، هەموو دەسکەوتە کەلتوورییەکانی ڕابردووی کورد لەسەر دەستی ئەمان هاتوونەتە دی، شەرەفخانی بتلیسی نموونەیەکی گەشی ئەم جۆرە میرزادانەیە.

هەروەها داهێنان و بەکارهێنانی شێوەی نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی تەبار، شاکاری دەستی میرە بەدرخانیەکانیانە، هەر ئەوان خۆیان یەکەم دانەری یەکەم بەردی بناغەی رۆژنامەگەری کوردیین و بنیاتنەری یەکەم پارتی سیاسی کورد (خۆیی بوون)ن لەسەر دارەڕا و سیستەمی مۆدێرن. (بڕوانە پەروەردە، چاپەمەنی و کەرەستەی میدیای ئەلەکترۆنی، هەروەها پارتە سیاسیەکان) ئەم بنەماڵە میرانە، هەروەها لە باوەشی خۆیاندا کەلتوورێکی سیاسی وشیارانە و جیهان بینیان پەروەردە کرد، کە توانای ئەوەی هەبوو بە زووترین کات هەر بۆشاییەکی دەسەلات پڕکاتەوە کە لە هەرێمەکەدا بکەوتایەتەوە، لەناو کورد یان گەلی تردا.

نەریتی لێبوردەیی ئایینی باوی سەردەمی میرە کوردەکان تەنها تا ناوەڕاستی سەدەی (١٩) بڕی کرد، چونکە لەوەودوا ئیتر سیستەمی دێرینەی حکوومەتی ناوخۆیی لادرا بۆ نموونە بتلیس کە مەکۆی گەشی بەدرخانی-ڕۆژەکیە ڕووناکبیرە دڵزینەوەکان بوو کرا بە مەڵبەندێکی جموجۆڵی ئایینی سەختگیری سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی لەژێر سەرپەرشتی هەندێ شێخی سەر بەو ڕێبازەدا (بڕوانە سۆفیگەری). موریزیۆ گازرۆنی قەشەی ئیتالیایی لەماڵی میر شەرەفخانی بدلیسییدا لە بدلیس[15]، وەکو ماڵی خۆی (١٨) ساڵی ڕەبەقی بەژیان و

[15] بتلیس و بدلیس لە هەرکوێ هاتن ناوی یەك شارن - وەرگێڕ

کارکردن لەناو کوردانـدا ڕابواردبوو.

ئەو هەمان ڕەفتاری جوان و میوان پەزێرانەی لەگەڵدا دەکرا لە ماڵی میردا کە لەگەڵ ئەو خرستیانانەدا کرابوو کە ساڵی ١٦٨٣ میسیۆنەرییەکیان لەوێ دامەزراندبوو. ساڵی ١٨٥٨ میسیۆنێرێکی پرۆتستانتی ئەمەریکاییش هەر لەوێ دامەزرا، زۆربەی ئەو کاری زمانەوانی و فەرهەنگسازی و وەرگێڕانانەی ئینجیل کەبۆ زمانی کوردی کراون لەو دەمەدا و لەسەر دەستی ئەو میسیۆنەریانە کراون (بڕوانە مەك کارەس ١٩٦٠).

کەچی لە ١٨٨٠دا بتلیس بوو بوو بە بنکەی ڕاپەڕینە سەختگیرانەکەی شێخ عوبەیدولا.

سولەیمانیی مەڵبەندی بنەماڵەی سەرنگوون کراوی بابان و سەنەندەجی پایتەختی ئەردەڵانیە دوورخراوەکانیش، هەر تووشی گۆڕانکاری لەو شێوەیە بوون.

ئەو کەسایەتیە ئایینیانەی کە لە کوردستانی سەدەی نۆزدەیەمدا چوونەسەر مەکۆی سەرکردایەتی ئەوەندە پێویستیان بە لێبوردەیی ئایینی نەبوو، چونکە سەختگیری کوێرکوێرانە بووبوو بە ئامرازێکی کاریگەر بەدەستی سەرکردە ئایینییە ئاپۆرا و ڕوژێنەکانەوە کە ئێستا چەکەرەیان لە سامی میرە حوکمڕانەکان نەدەکرد چونکە ئەوان نەمابوون، ئەوەبوو لە کوردستان بەر لەهەموو شتێك گڕی تۆڵەیان ئاراستەی یەزیدیەکان کرد و چەندین هێرشی خوێناویان کردە سەر و قەتڵوعامیان کردن. ئەم کارەیان بە دەست بە پشتدادانی دەسەڵاتدارە عوسمانی و سەرکردە ئایینییەکان و دەسخۆشکەری هەربوولایان ئەنجام دا، سەرەنجام زۆربەی ئەوانەی لە زاری گورگی مەرگ ڕزگاریان بووبوو، ڕەهەندەی ڕووسیا بوون (بڕوانە گواستنەوە و جێگیرکردنی زۆرەملی). ئاسوورییەکانیش لەم هەڵچوونە بەدەرنەبوون، بەو قەتڵوعامە بێ بەزەییانەیەی کە (٥٠٠٠)، کە سی ساڵی ١٨٤٢ لەسەر دەستی شێخ نوروڵڵا گرتەوە، بەرایی هەڵمەتێکی گەورە دژ بەهەموو مەسیحیەکان دەرکەوت. دوای ئەوان نۆرە هاتە سەر شیعە و عەلەویەکان و دواتریش جوولەکەو بابیەکان ساڵی ١٨٨٠ شێخ عوبەیدولا کە بەمەبەستی دژایەتی کردن لەگەڵ سەنترالیزە کاریی پەیتا پەیتای عوسمانییەکان لە دەسەڵاتی ناوچەکاندا ئاڵای ڕابەرایەتی هەڵکردبوو، تەنانەت لەناو کوردە سەرکوتکراوەکانی فارسیشدا پشتگری هەبوو کە دراوسێی هەرێمەکەی خۆی واتە ئەنەدۆڵ بوون. ڕاستییەکەی سەرکردە ئایینیە کوردەکانی ئەو ناوچانەی وڵاتی فارس خۆیان لەسەر بەهانە بوون بۆ لایەنگیری کردنی سەختگیری ئایینی، چونکە ئەوان کەمایەتیەکی سوننی مەزەبیان پێك دێنا لە وڵاتێکدا

کە زۆربەی هەرە زۆری شیعە مەزەب بوو بەتایبەتی کە دراوسێ ئازەریەکانیان بە گەرمی کوورەی ئەم ئاگرەیان دەدەماند.

لە هەرێمی ئەنەدۆڵ خۆیدا، عوبەیدوڵا چەندین کردەوەی ستەمکارانەی دژ بەکوردە ناسوننیەکان و هی تریش کرد. کوردە عەلەوییەکان دووچاری چەند قەتڵوعام و بەزۆر وەرگەڕان و ماڵ و موڵك داگیرکردن بوون لە ١٨٨٠کاندا بەجۆرێك ناچار بوون پشتگیری کۆمارە عەلمانیەکەی ئەتاتوورك بکەن (ساڵی ١٩٢٥)، تا خۆیان ئینجا لە ڕابەرێکی ئایینی کوردی تر، واتە شێخ سەعید بپارێزن، ترسەکەیان ئەوەندە توند بوو ناچار بوون شان بەشانی سوپاکانی کۆماری تورك دژ بە شێخ سەعید بچنە جەنگەوە. بەفیتی مەلا و شێخەکان سمایلاغای سمکۆی سەرۆك هۆزی شکاك، بەر لەوەی لەسەر دەستی ڕەزاشای شای ئێران ساڵی ١٩٣٠ لەناو ببرێ، لەو (١٥) ساڵەی دەورانی سیاسی خۆیدا، هێندەی دڕندایەتی نواند کە دەشێ بخرێتە ڕیزی خوێنرێژی مێژوویی چون ئەتیللای هوونی یەوە. تەنها بۆ نموونە، سمکۆ هەندێ لە نوێنەرانی ئاسووریی کوردستانی باکووری بۆ گفتوگۆ و ڕاوێژکاری بانگ کردبوە لای خۆی، کەچی لەناکاوێکدا خاینانە هەڵیکوتایە سەریان و دوا یەکیانی کوشت بە پەتریارکی هەرە بەرێزی ئاشووریەکان، بنییامین شەمعوونەوە کە لەو کاتەدا تەمەنی لە نەوەد ساڵ تێپەڕیبوو، دوایی خوێنەکەشی بە نیشانەی ڕق و کینەی ڕەشی لە پەتریارك، خواردەوە. سمکۆ بەشێکی زۆر لە ئۆباڵی ئەو لەکەیە هەڵدەگرێ کە بە مێژووی لێبوردەیی و دڵفراوانی کۆمەڵگای کوردەواریی کەوتوە.

ئەم بەسەرهاتانە لەپاش خۆیان لە کوردستان تەنها سەر هۆزە سەرەکیەکان و ڕابەرە ئایینییەکان، شێخ و مەلا و قانیەکانیان لە گۆڕێ هێشتەوە بۆ داکۆکی کردن و سەراسوێ کردنی کوردان و ئاواتەکانیان. هیچ یەکێك لەمانە هی ئەوە نەبوون، لە دووریشەوە پا بەپای گەیشتن بە کاروانی تیژڕەوی گۆڕانکاریەکانی جیهان بڕۆن لەجیاتی پیاوی وەکو شەرەفەددینی بتلیسی، دەمڕاست و داواکەری کوردستانی سەربەخۆ لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا، هەندێ سەرۆك هۆزی، پاشەڵپیسی وشك و نەزان بوون وەکو سمکۆ کە بە "پیاوخۆر" ناویانگی دەکرابوو، یان مەلای وەکو شێخ سەعید، کە بە سەختگیری و سایشت تەسکی کوردە عەلەوییەکانی لە خۆی و لە بزووتنەوەکەی کردبوو بە دوژمن. ئا لەم دەرفەتە مێژووییەدا، کە نەتەوەکانی تر بەژیری و کارلەیی و ئاسۆی فراوانی دیدی سیاسیی سەرکردەکانییان،

بەمرازی خۆیان دەگەیشتن و دەوڵەتی سەربەخۆیان بۆ خۆیان دادەمەزراند، سەرکردەکانی کورد توانا و یارای ئەوەیان نەبوو بە ڕەوایی مەسەلەکەیان کاربەدەستە ئەورووپاییەکان باوەڕمەند بکەن. ئەگەر بنەماڵە میرە کوردە دێرینەکان تا ۱۹۱۸ بمانایە، ئەم دەرفەتە زێڕینە بۆ گەیشتن بە ئاواتی مێژوویی، واتە دامەزراندنی دەوڵەتی میللی هەرگیز لەدەست نەدەچوو...

لە کاتێکدا کوردە سیاچارەکان ئەو دەرفەتە زێڕینەیان لە دەست چوو کە بە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم و بە داڕووخانی ئیمپراتۆریە گەندەڵەکان هاتبوە پێشەوە، کەچی لە ئاکامە شوومەماڵوێرانکەرەکانیدا بەشێکی زۆر گرانیان کەوتە سەر، بەرەی پێشەوەی جەنگی گەرم بەسەر کوردستانی باکوور و ڕۆژاوادا پاش و پێشی دەکرد و هەر لە فارسەوە دای کوتا تا دیاربەکری گرتەوە بەداهاتنی ساڵانی ۱۹۱۷ و ۱۹۱۸ هێزەکانی فەرەنسا و بریتانیا لەسەر خاکی کوردستان، دەستیان لە ناقرگەی یەکتر گیرکردبوو تەنها لە کوردەکانی ئەنەدۆڵ (٤٠٠) هەزار کوژراو کەوتەوە و سەرزەمینێکی زۆر فراوان وێران بوو (بڕوانە دیموگرافیا). هەرچی ئەرمەنی دانیشتووی هەرێمەکە هەبوو لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرکران و بەقەتڵوعام و بەزۆر دەرپەڕاندن دوایان بڕایەوە کوردستانی ناوەند و باشوور و ڕۆژهەڵات هەرچەندە کەمتر بەرکەوتن، بەڵام بەرتاڵان و بڕۆو وێرانکاریەکی زۆری دەغڵودان بە دەستی لە شکرەکانی ڕووس و عوسمانی و ئینگلیز کەوتن.

ساڵی ۱۹۱۸، کوردستان بوو بەسەرزەمینێکی وێرانی ژێرخان خاپوری کۆمەڵگا تەفر و تووناى، ئینتەلیجنسیا سەری لێشێواو لەم بەینەدا تەنیا سەرۆك هۆز و شێخە ئایینیەکان، وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون و بوون بە خاوەن و خاوەنداری ئەوەی مایەوە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Fleurian, *Estat présent de l'Arménie* (Paris, 1694); Tavernier, *Les six voyages* (Paris, 1676); V. Cuinet, *La Turquie d'Asie* (Paris, 1892); Martin van Bruinessen, "Kurdish Tribes and the State of Iran: the Case of Simko's Revolt," in Richard Tapper, ed., *The Conflict of Tribe and State in Iran and Afghanistan* (New York: St. Martin's Press, 1983); Martin van Bruinessen, *Agha Shaikh and State: On the Social and Political Organization of Kurdistan* (Rijswijk: Europrint, 1978); Ernest McCarus, "Kurdish Language Studies," *The Middle East Journal* (Washington, Summer, 1960); Ibn Bazzâz Ardabili, *Safwat al-Safâ*, ed., Ahmad Kasravi (Teheran, 1927); Sharaf al-Din Bitlisi, *Chèref-nameh [Sharafnâma] ou Fastes de la nation kourde*, translated by Charmoy, 2 vols. (St. Petersburg, 1868-75); Amir Hassanpour, "The Language Factor in National Development: The Standardization of the Kurdish Language, 1918-1985," unpublished doctoral dissertation (Urbana, Illinois, 1989); Carsten Niebuhr, *Reisebeschreibung nach Arabien und anderen umliegenden länder*, vol. 2, "Kurdes" (Copenhagen, 1766); John Perry, *Karim Khan Zand* (Chicago: Chicago University Press, 1979).

# مێژووی هاوچەرخ ١٩١٩-١٩٥٩

بیرۆكەی دەوڵەتی نەتەوەیی بە مانای مۆدێرن و لەسەر شێواز و سیستەمی ئەوروپا، كەم و زۆر، تا كۆتایی سەدەی (١٩) شتێكی باو نەبوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەم شێوازە سیاسی ئەوروپازادە سەرنجی كوردانیشی وەكو هەموو نەتەوەكانی تری هەرێمەكە، لە دەمی كەرت بوون و لێكهەڵوەشانی ئیمپراتۆری عوسمانیدا، ڕاكێشابوو.

ئیتنۆناسیۆلیزم لەسەر شێوازی ئەوروپی، كە لە كوردستان حاجی قادری كۆیی ئاڵا هەڵگری هەرە دێرینی بوو، كۆمەڵێكی زۆری ڕووناكبیر و مودێرنستی كوردی بەدەوری خۆیەوە كۆكردبووەوە. ساڵی ١٨٩٨ ڕۆژنامەیەكی كوردی ئاڵا هەڵگری نەتەوەخوازی بە ناوی "كوردستان"ەوە لە ئەستەمبووڵ دەردەكرا. یانەی سیاسی و ئەدەبی كوردی هەروەها كۆمەڵەی كۆمەڵایەتی لەناو خاكی عوسمانییدا چالاكانە هەستی نەتەوایەتی كوردیان دەبزواند و بەگەرمی بۆ پاراستنی كەلتوور و كەسایەتی كورد تێكۆشان. ساڵی ١٩٢٠ كە ڕۆژنامەی كوردستان بەزۆر داخرا، گواستیەوە قاهیرە و لەوێ لە چاپخانەیەكی كوردییەوە "المطبعة الكردية- چاپخانەی كوردی"، كە كوردێكی بەهائی، محەمەد زەكی ئەلكوردی ناو كارگێڕی دەكرد، كەوتەوە دەرچوون (بڕوانە بابیەت و بەهائیەت). هەندەی پێ نەچوو، كوردستان دوو دەستە خوشكی تری بۆ هەمان ئامانج لە سولەیمانی هاتە پاڵ (بڕوانە چاپخانە و میدیای ئەلەكترۆنی).

دوو هۆ بوونە تەگەرەی پێش دروستكردنی دەوڵەتێكی نەتەوەیی كوردی پاش جەنگی جیهانی. یەكەم یەكێك لە دوو هۆیەكە ناوخۆیی بوو و بریتی بوو لە نەبوونی سیاسەتمەدار و دەوڵەتیاری باوەڕپێكرا و كە ئەو ڕێبازە بگرن كە جاران بنەماڵە میرەكان سێ سەدە لەوەپێش گرتبوویانە بەر ئەوی تریان، دەرەكیی بوو.

ودروو ویلسنی سەرۆك كۆماری ئەمەریكا بەتوندی پشتگیریی لە سیاسەتی برەودان بە (مافی دیاریكردنی چارەنووس) بۆ هەموو ئەو نەتەوانە دەكرد كە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریە هەڵوەشاوەكانی ئەڵمان، ئەوستریا و عوسمانیدا دەژیان. لەسەر ئەم بنەمایە ئەو بەئاشكرا و پەیتا پەیتا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت كە دەبێ دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ "عەرەبەكان و

ئەرمەنیەکان و کوردەکان" دابمەزرێ. پەیمانی سێڤرە (١٠ی ئابی ١٩٢٠) کە ئیمپراتۆری لە جەنگدا دۆڕاوی عوسمانیی هەڵوەشاند، بەڕاشکاوی دانی بەم مەسەلەیە دناوە و لە بەشی سێیەم، بڕگەکانی ٦٢-٦٤یدا داوای دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی لەسەر سەرزەمینە کوردەکان کردووە.(بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢٣). بڕگەی (٦٤) دەڵێ: ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا لەکارابوونی ئەم ڕێککەوتننامەیەوە ئەو کوردانەی لەو ناوچانەدا دەژین کە لە بڕگەی ٦٢دا، باسکراون (واتە ڕۆژاوای کوردستان) خۆیان بە کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان (عـصبة الأمـم) ڕاگەیاند کەوا زۆربەی دانیشتووانی ئەم سەرزەمینانە ئارەزووی سەربەخۆییان لە تورکیا هەیە و دوای ئەوە کۆمیسیۆن هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەم گەلانە توانای ئەو بەڕێوەبردنەیان هەیە، و ڕایسپارد کە بدرێ پێیان، تورکیا بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتننامەیە دەبێ ئەو ڕاسپاردەیە جێبەجێ بکات و دەست لە هەموو ماف و داواکاریەك لەسەر ئەم ناوچانە هەڵبگرێ.

دانانی ڕێ و شوێنی ئەو دەست هەڵگرتنانە دوایی لەنێوان هێزە هاوپەیمانەکان و تورکیا لە ڕێککەوتنێکی جیادا دەستنیشان دەکرێ. هەر کاتێ ئەو دەست هەڵگرتنە هاتە دی، هێزە هاوپەیمانەکان هیچ نارەزاییەکیان دەربارەی ئەوە نابێ کە هەر بەشێکی تر بەخواستیی خۆی خۆی بخاتە پاڵ ئەو دەوڵەتە کوردە سەربەخۆیەی ئەو بەشەی کوردستان کە تا ئێستا لە چوارچێوەی ویلایەتی مووسڵدا بووە، (کە کوردستانی ناوەندی پێك دەهێنا).

ئەم پەیماننامەیە لەلایەن دەوڵەتی سوڵتانی عوسمانلیەوە لە ئەستەمبوڵ کە لە گیانەڵادابوو ئیمزا کرا. بەڵام ئەو دەوڵەتەی پاش ئەو دامەزرا، واتە کۆماری تورکیای تازە دامەزراو بە ڕابەرایەتی مستەفا کەمال پاشا (کە دوایی ناوی نرا ئەتاتورك واتە باوکی تورکان) خۆی بە پابەندی نەزانی، بۆیە بڕگەکانی پەیماننامەی سێڤرە هەرگیز چاویان بە دیداری جێبەجێ کردن ڕوون نەبوەوە.

ئینگلیز و فەرەنسییەکان کە دەوڵەمەندترین و ئاسانترین بەشە ناتورکەکانی سەرزەمینی عوسمانلییان هەڵلوشیبوو، هەوڵیان دا وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ سەرخوانە چەورەکە ڕاکێشن بەوەی مافی خاوەندارێتی ئەرمەنستان و کوردستانی بدەنێ، بەڵام وڵاتەیەکگرتەوەکان نەیتوانی ئەمە بکا.

بە هەرحاڵ، ساڵی ١٩٢١، مەگەر تاك و تەرا، ئەگینا ئەرمەنی پێ بوترێ لە ئەرمەنستانی ئەنەدۆڵ نەمابوو، چونکە قەتڵوعام و بەزۆر دەرپەڕاندنی بەکۆمەڵ، کەس بوێرێ نەکرد، ئەرمەنستانی سۆڤیەتی لێدەرچێ، ئەرمەنستانی دێرینی مێژوویی پانەوپان بە تەنیا بۆ کوردەکان مایەوە، و ئەگەر دەوڵەتێکی ئەرمەنیش وەکو ئەوەی لەسەرەوە باسکراوە دروستیش بکرایە ئەوا زۆرینەی زۆری دانیشتووانەکەی کورد دەبوون (نەخشەی ژمارە ٢٤).

نەخشەی ژمارە (23): ئەو نەخشەیەی ساڵی 1921 پەیمانی سێڤرە بۆ كوردستانی سەربەخۆ دایناپوو

نەخشەی ژمارە (24): کوردستان و ئەرمەنستان دوابەدوای جەنگی جیهانی یەکەم

كونگريسی ئەمەريكا خاوەنداريەتەكەی ڕەتكردەوە، ئەو هۆيانەی كە كۆنگرێس دانی ئەمانە بوون: ١) دەبوە مايەی تێوەگلانی ئەمەريكا لە شەڕی كۆلۆنيالی جيهاندا و چەقين لە زەلكاوەكانيدا، لە كاتێكدا ئەمەريكا خۆی ولاتێكی دوورەپەرێز بوو، ئەو تێوەگلانەش هيچ سوودێكی پێ نەدەبەخشی ٢) چ كوردستان چ ئەمەريكا، زۆر لێك دووريوون و هيچ پەيوەندييەكی دەرياييان پێكەوە نەبوو ٣) تێوەگلانەكە بێ سوودبوو، چونكە بريتانيا بڕياری دابوو كوردستان ببەستێتەوە بە خۆيەوە و بەو جۆرەش بهێلێتەوە، تا سامانە نەوتيەكەی هەموو بكاتە گيرفانی خۆيەوە (بڕوانە stvers 1982) كە ولاتە يەككگرتووەكان نەيتوانی خاوەنداريەتی كوردستان بكا، ئيتر بريتانيا، كە بەتاكە سواری مەيدان مايەوە، ئەوەندەی تری لە خاكی كوردستان كە بە چەوری دەزانی خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی، ئەوەبوو هەموو ويلايەت (هەرێمی) مووسڵ (ناوەندی كوردستان)ی كە كۆنە خاكی عوسمانيی بوو، بە ناوچەی كوردنشينی كەركووكەوە كە هەر گۆشەيەكی لە نەوتدا بلقی دەدا كردە ماڵی خۆی، سەرزەمينەكە هەموو خرايە سەر ولاتی عێراق كە بە ناوە عەرەبی و لە ڕاستيدا لەژێر خاوەنداريەتی بريتانيادا بوو لە پاڵ بڕيارێكی كۆمەڵەی گەلان (عصبة الأمم) دا كە دەبێ ڕێز لە ئارەزووە نەتەوەيی و ئەتنييەكانی گەلی كورد لەلايەن بەغدادەوە بگيرێ.

لە (٢٤) ی حوزەيرانی (١٩٢٣) دا ڕێككەوتننامەيەكی تر لە لۆزان (سويسرا) ئيمزاكرا كە هەموو سەرزەمينی ئەنەدۆڵی، بە كوردستانی باكوور و ڕۆژهەڵاتەوە، كردە موڵكی توركيا. ڕوون و ئاشكرابوو كە كوردستانێكی سەربەخۆ لە ئەنەدۆڵ بێ هيچ گومانێك دەبووە مايەی شلكردنی چنگی بەريتانيا لە كوردستان و گەنجينە نەوتيە بێ بنەماكانی (Nash-1976)، لەبەر ئەمە بريتانيا بە خۆشييەوە ڕێ خۆشكەريی بۆ كۆماری تازە پێگرتووی توركيا كرد دەست بەسەر بەشەكەی تری كوردستانی عوسمانييدا بگرێ. لە پەيماننامەكەدا، بۆ ئەوەی دەوڵەتە ئەوروپاييەكان بە يەكجاری ئابڕوويان نەچێ و بۆ ئەوەی نەوترێ كە بە يەكجاری بڕيارنامەكانی و ويلسنيان لەمەڕ مافی چارەنووسەوە بۆ كەمينە نەتەوەييەكان خستۆتە ژێر پێوە، هاتن لە بڕگەكانی ٣٧-٤٤ ی پەيماننامەكەدا هەندێ گوايە دەسەبەركارييان بۆ مافی كەمينەكان دانا، كەچی ئەوەی جێی سەرسووڕمانە لەو بەلگەنامەيەدا، ناوی هيچ يەكێك لەو كەمينە ئەتنيانە نەهێنراوە كە فڕێ درانە ژێر دەستی توركانەوە.

لەپەنای ئەوەدا کە برگەی ٣٨، مافی ئایین و بەجێهێنانی داب و نەریتی بۆ هەموان دەستەبەر کردووە، هەروەها ئازادی گواستنەوە و کۆچکردن بۆ نامسوڵمانان، برگەی ٣٩ ئازادی زمانی بۆ هەموو پێکهاتە ئەتنییەکان دەستەبەر کردوە و دەڵێ:

هیچ سنوور بەندییەك نابێ لەسەر بەکارهێنانی هیچ زمانێك لەلایەن هاوولاتیەکی تورکەوە دابنرێ لە گفتوگۆ کردنی تایبەتیدا لە بازرگانی و ئایینی و چاپەمەنی یان بلاوکراوەی هەمە جۆرەدا یان لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا، لەگەڵ بوونی زمانی ڕەسمیدا، دەبێ ئاسانکاری تەواو بۆ ئەو هاوولاتیە تورکانە بکرێ کە بە زمانی تورکی نادوێن، زمانەکەیان بۆ قسەکردن لەبەردەم دادگاکاندا بەکاربێنن.

بۆ بەرگرتن لە دەرکردنی یاسای تر لە تورکیا کە بێتە مایەی پووچەڵکردنی ئەم دەستە بەرییانە.

برگەی ٣٧ دەڵێ: تورکیا ملکەچ دەبێ بۆ ئەوەی هەر ئەندامێکی کۆمەڵەی نەتەوەکان مافی ئەوەی هەبێ کە سەرنجی ئەنجوومەن بۆ هەر شکاندن یان مەترسی شکاندنێك ڕابکێشێ کە بکەوێتە سەر هەر یەکێك لەم پابەندیانەو کەوا لەو کاتەدا ئەنجوومەن بۆی هەیە کردەوەی وابکات یان فەرمانی ئەوتۆ بدات کە بەباش و پێویستی بزانێ لەو بارودۆخەدا.

بە هەرحاڵ، تورکەکان کە دەیانزانی هێزە هاوپەیمانەکان ئەوەندە لەسەر ڕەچاو کردنی برگەکانی ٣٨-٣٩ پێداگرنین، فەرمانێکیان لە (٣)ی مارتی ١٩٢٣دا، واتا لە ساڵێ کەمتر دوای ئیمزاکردنی پیماننامەکە دەرکردوو بەگوێرەی ئەو فەرمانە هەموو قوتابخانە و ڕێکخراوە و چاپەمەنی، هەروەها قوتابخانە و کۆمەڵە ئایینیەکانیان قەدەغە کرد. ساڵێك دوای ئەوە، واتا لە شوباتی ١٩٢٥دا، کوردەکانی ئەنەدۆڵ یەکەم زنجیرەی ڕاپەرینی خوێناوی فەلاکەتباریان دژ بەکوتەڵە کۆمارەکەی تورکیا بەرپاکرد.

ئەم یاخی بوونە گشتیە بە سەرکردەیی شێخ سەعیدی ڕابەری[16] ڕێبازی سۆفیگەریی

[16] دوکتۆر جەبار قادر لە بارەی ڕابەرایەتی شۆڕشەکەوە دەڵێ: ".... هەروەها سەرکردەی ڕاپەڕینەکە شێخ سەعیدی پیرانیان، کە تەنها بە هەڵکەوتوو بەهۆی بەرپابوونی پێش وەختی ڕاپەڕینەکەو دەسگیرکردنی سەرکردە ڕاستەقینەکانییەوە بەرلەوەی بگەنە ناوچەکانی سەرهەڵدانەکە، خۆی لە جێگەی کەسی یەکەمدا بینییەوە، دوای ئیلکردنی فایلکرد بۆ ڕزگارکردنی سەری خۆی، کە بەدی نەهات، سرووشتی نەتەوەیی و کوردایەتی بزافەکە بشێوێنێ و بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو و هەڤاڵەکانی بۆ ئیسلام و گەڕانەوەی خیلافەت و سەڵتەنەت لەسەریان هەڵداوە – وەرگێڕ (بڕوانە: دۆزی کورد لە تورکیا، دوکتۆر جەبار قادر، ڕۆژنامەی ڕێبازی ئازادی ژمارە(٣٥٧)ی ٢٠٠٤/١٢/٢٨).

سوننی نەقشبەندی كرا كە خۆی بە بنەچە كوردێكی دیمیلی بوو (بڕوانە ڕێبازە سۆفیەكان). هەرچەندە یاخیەكان زۆریەی ناوچەكانی دیاربەركر و دەرسیم و ئەلازیگیان گرتبوو لە مارتی ١٩٢٥دا، ڕكەبەركێی ناو هۆزەكی ڕاپەڕینەكەی پەكخست ئەوەندەی پێنەچوو سوپای كۆماری توركیا شۆڕشەكەی دامركاندەوە و شێخ سەعید و چەند كەسی لە فەرماندە سەرەكیەكانی لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا لە سێدارەدران.

ئەم ڕاپەڕینە زیاتر لەوەی ڕاپەڕینێكی نیشتمانی كورد بێ، تا ڕادەیەك بگرە ئەولاتریش كاردانەوەیەكی ئایینی بوو بەرامبەر بە پرۆگرامە دنیاداریەكانی ئەتاتورك لە كارەساتەكەدا كوردە عەلەوییەكان بەگشتی پشتی كۆمارە دنیادارەكەی ئەتاتوركیان گرت. چونكە دیسانەوە لە ڕوودانەوەی قەتڵوعام و ڕەزالەتەكانی ١٨٨٠ كانی شێخ عوبەیدوڵا دەترسان ئەمجا لەسەر دەستی شێخ سەعید (ئەمە هەرگیز مانای ئەوەنیە كە كوردە عەلەوییەكان لە كوردەكانی تر كەمتر نیشتمان پەروەر بوون. ڕاستییەكەی ئەوان خۆیان بوون كە یەكەم ڕاپەڕینی نیشتمان پەروەرانەی پاش جەنگی جیهانیی یەكەمیان بەرپا كرد هەرچەندە مەیدانی شۆڕشەكەیان تەسكتربوو، ئەوەبوو ساڵی(١٩٢٠) هۆزی گەورەی قۆچگیری عەلەوی ڕاپەڕی و ئالای شۆڕشی هەڵكرد، جگە لەمە، هەر ئەم عەولەویانە خۆیان دوایی بوون بە قوربانیی دڕندانەترین هێرشی دژ بە كورد كە كۆماری تازەی توركیا ساڵی ١٩٣٧– ٣٨ لە قەسابخانە بەناوبانگەكەی دەرسیمدا كردی، وەكو لە خوارەوە باسی دەكەین بە هەرحاڵ ڕاپەڕینە سەرلاپاگیرەكەی ساڵی (١٩٢٥)ی شێخ سەعید تەنها پێشەكییەك بوو بۆ ئەم ڕاپەڕینە.

ساڵی ١٩٢٧[17] دەستەیەك كورد لە ڕووناكبیرانی ئەریستۆكرات و نوێخواز (كە تێیاندا چەند سەرۆك هۆز و كوڕ و كوڕەزای بنەماڵە میرنشینە كۆنەكانیش هەبوون) كە لە پاریس یان بە ڕەهەندەیی یان بەشێوەی تر دەژیان، حیزبێكی سیاسییان دروستكرد بەناوی خۆیبوونەوە (بەهۆییبوون یان هویبونیش– واتە سەربەخۆیی– ناسرابوو) پاش هەرەسهێنانی ڕاپەڕینەكەی شێخ سەعید، ئەوان لە لوبنانەوە ساڵی ١٩٢٧ بانگی دروستكردنی حكومەتێكی دوور وڵاتیی كوردییان دەركرد و كەوتنەخۆ بۆ پەیداكردنی پشتگیریی جەماوەر بۆ ڕاپەڕینێكی چەكدار لەگەڵ داهاتنی ساڵی ئایندەدا.

---

[17] خۆیبوون ساڵی ١٩٢٧ دامەزرا – د. كەمال مەزهەر

راپەڕینەکەی خۆیبوون لەوەی شێخ سەعید جیابوو، بەوەی کە سایشتێکی نوێخوازانەی بەرامبەر مەسەلەی نەتەوایەتی کورد هەبوو و هەولیان دەدا کۆتایی بە ڕکەبەرکێی نێوان هۆزەکان بهێنن و دەوڵەتێکی یەکپارچەی سەربەخۆی کورد پێك بێنن کە ڕێبازی دنیادارانەی هەبێ. دلنەر و دارەڕاکەی ئەم ڕێبازە نوێ و سەردەمیانەیە، دوو ڕۆڵەی سەرتۆپی بنەماڵەی میرزادەی ڕۆژەکی بەدرخانی بتلیس سورەییا و کامەران بوون کە ڕۆڵی سەرەکییان هەبوو، لە دەرکردنی ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی، کوردیدا تا هاولاتیەکانی خۆیان بەگیانی نوێخوازی و پێداویستیەکانی تری خەباتی سەردەم پاراو بکەن (بڕوانە چاپەمەنی و میدیای ئەلکترۆنی).

هێزەکانی خوێبوون بەسەرکردایەتی ژەنەراڵ ئیحسان نووری پاشا کە کۆنە ئەندامی بزووتنەوەی تورکە لاوەکان بوو زوو بەزوو بتلیس و وان و زۆریەی ناوچە شاخاوییەکانی گرت، هەر لە دەورووبەری دۆلی وانەوە تا دەگاتە چیای ئەرارات، بەلام سەرکەوتنەکانیان زۆرخایەن نەبوو.

کوردەکانی دەرەوەی ئەرارات وەکو شێخ ئەحمەدی بەرزانی لە کوردستانی عێراقی ئێستا، جۆرە یارمەتیەکی سەربازی خۆیبوونیان دا، بەلام هێندەی پێ نەچوو لەژێر فشاری تورکیادا، ئینگلیز و فەرەنسییەکان کەوتنە تەگەرەسازی لێیان و یارمەتیەکەیان پێیان وەستاند دوای ئەوە حکوومەتی ڕەزاشای ئێرانیش ئەو دەستی یارمەتیەی کێشایەوە کە بۆی درێژ کربوون. دەستکێشانەوەکەی ئێران بەرامبەر بە هەندێ دەستگرتنەوەی سیاسی و زەمینی تورکیا بوو بۆی، ئەوەبوو تورکیا وازی لە دەشتی پان و بەپیتی دوستان و بلندایيە ستراتیژیەکانی قوتووری باکووری ڕۆژاوای ورمێ بۆ ئێران هێنا (گوایە تورکیا لە بەرامبەردا لووتکەی ئەراراتی دەسکەوت کە گشت کەسێ دەزانێ هیچ بایەخێکی نیە) کە یارمەتی دەرەکیی لێ برا، شۆڕشەکە لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩دا لەلایەن سوپای تورکەوە تێکشکێنرا. تورکەکان ڕێگایان درابوو سنوورەکان ببەزێنن تا بتوانن دواشوێنە قایمەکانی شۆڕشگێڕەکان لە چیای ئەراراتدا داگیرکەن. ژەنەراڵ ئیحسان نووری پاشا خۆشی ناچار بە پەناهەندەیی هەتاهەتایی کەوتە تاران (بڕوانە نووری پاشا ١٩٨٦).

پاش تێکشکانی هەلگەڕانەوەکە، بەرنامەیەکی دامرکاندنەوەی خێرا لەسەرزەمینە کوردنشینەکانی تورکیادا خرایەکار. بێڕەزایی کرداره سوپاییەکانی تورکەکان ئەوەندە لە

ڕادەبەدەر بوو، کە هەموو ناوچەکەی کرد بە دۆزەخێکی لەوزە بەدەر، قەتلوعام و وێرانکردنی دڕندانە شوێنبیری نەکرد. شوێنێکی دوور دەستی شاخاوی وەکو دەرسیم، واتە ناوچەرگەی هەرێمی کوردە دیمیلییەکان و مەڵبەندی جەنگاوەرو میرنشینە دیمیلییەکانی سەدەی ناوەڕاست خاپورکراو بوو بە وێرانە.

بەهاری ساڵی ١٩٣٧ سوپای تورك هێرشێکی "بنەبڕ"کەرانەی بردە سەر هەرێمەکە، لەم هێرشەدا چەك نەما نەخرێتەکار، بە گازی ژەهراوی و تۆپخانەو تەنانەت بۆمبارانی ئاسمانییشەوە لە تشرینی یەکەمی (١٩٣٨)دا گشت ناوچەکە، کە تەنها گومانی ئەوەی لێدەکرا هاوسۆزیێ لەگەڵ شۆڕشەکەدا، "دلمرکێنرایەوە".

بە هەزارەها کەس کە خۆیان کوتابووە ناودارستان و بڕوونیەکانەوە لەناوچوون، دەیەها ئاوایی نشین خۆیان لە بڵندایییەوە هەڵدێراو مردن. ژن و کچێکی زۆر خۆیان فڕێدایە ناو ئاوەوە خنکان تا خۆیان لە نامووس شکێنی لەسەر دەستی سەربازە تورکەکان بپارێزن، دەرسیم ئەوەندە بێ بەزەییانە سەراپا خاپوور کرا، کە تەنانەت ڕۆژنامە تورکەکان هاواری "دەرسیم نەما"[١٨] یان لێوە بڵندەوە بوو، ئەمان هەمان قسەکانی سیپیۆی ژەنەراڵی ڕۆمیان بەکارهێنا کە دوو هەزار ساڵ لەوەبەر پاش خاپوورکردنی شاری کارتاگ وتبوونی (بڕوانە سافراستیان ٨٧/١٩٤٨) ئیتر لەوە بەدوا ململانێی چەكدار تا ساڵی ١٩٨١ لە کوردستانی تورکیا ڕووی نەدا (نەخشەی ژمارە ٢٥).

ئەو لە کزیدانەی، لە ژمارەی دانیشتووانی کوردی تورکیادا ڕوویدا، کە سەرەتا لەبەر کوشت و کوشتار و لە (٩٤٠)یش بەدواوە لەبەر کەمی زاوزێی سرووشتیی بوو، لە (١٩٥٠)کاندا نیشانەی دەرکەوت بەوەی کە کۆمەڵگای کوردەواری بەرەو توانەوە و لەناو چوون دەبا. کە هەستیان بەمەکرد، هەردوو سەرۆك وەزیر، مەندەریس و بایار گوریسی هەندێ سیاسەتی سەختگیرانەی کۆنیان شلکرد، تەنانەت هەندێ چاپەمەنیش بە زمانی کوردی ڕێی پێدرا بە هەرحاڵ، ئەو کەم برشتیە دیمۆکرافیە دەرکەوت تەنها شتێکی کاتی بووە، چونکە هەر هەندەی نەبرد مەکینەی کارای زاوزێکاری کورد کەوتەوە خۆ، بەڵام چ کەوتنەخۆیەك، (بڕوانە دیموگرافیا).

یەکەم بەڵگەی هەستپێکراوی دەوڵەت لە بارەی ئەم برشت چاکییەی وەچی کوردانەوە

---

[18] (١) De Lenda Est Dersimo- بڕوانە "کورد و کوردستان" نووسینی ئارشاك سافراستیان وەرگێڕانی ئەمین شوان لە ئینگلیزیەوە — ل ١٣٢.

لەوەدا دەرکەوت، کە ئیتر لە ئامارگیرییە گشتییەکان دانیشتوواندا، باسی ڕەگەز و نەتەوە وەلانرا.

ڕژێمە عەسکەرییەکەی جەمال گورسەل کە لە کودەتاکەی ١٩٦٠ هێنرایە سەر مەکۆی دەسەلات، سیاسەتە کۆنە سەختگیرانەکانی خستەوە کار تا گوایە سنوور بۆ ئەو بەرزبوونەوەیە دابنێ کە لە ژمارەی دانیشتووانی کورددا هاتبوە دی. ئەوەبوو چەند کۆمەڵە

هۆزی كورد لە ولآتی خۆیان جێلەق كران و گوێزرانـەوە و لـەنێوان سـالآنی ١٩٦١ تـا ١٩٦٣ دا، ٢٦ ڕووناكبیری كورد لە سێدارەدران. ئەو چەند حكوومەتە یـەك لـەدوای یەكـەی كەلـە دوادوای (١٩٦٠)ە كانـدا هاتنـە سـەر كـار، بەشـێوەی جیـا جیـا سـەودایان لەگـەڵ مەسـەلەكەدا كرد، هەندێكیان بەرنامەی یەكجار توندیان گرتەبەر و هەندێكیان، ئەو توندكاریـەیان خـاوتر كردەوە كە لە سەردەمی گۆرسەلدا خرابوە كار.

لە عێراقدا، هەر لەو دەمـەوە كـە حـوكمی خاوەنداریـەتی بریتانیـا داسـەپێنرا، بریتانیـەكان كەوتنـە شـێوە ڕەفتارێـك لـە بەرامبـەر نەحەوانـەوەی كوردەكانـدا لـە بـاكوور. بەهـەرحاڵ، كوردەكان هەرگیز لەگـەڵ هێـزە ئیمپریالیـەكانی بریتانیـادا كـە چ لـەڕووی بابـەتی كەرەسـتەی جەنگی مۆدێرن چ لە ڕووی ژمارەوە چـەند جـار بەسـەر ئەوانـدا دەشـكایەوە، نەدەخرانـە تـای تەرازووی بەراوردەوە. ڕاستییەكەی، دەساڵ بەر لەوەی توركەكان هێزی ئاسمانی لـە دەرسـیم دژ بە كوردەكان بەكاربهێنن، كوردەكانی عێراق بوون بـە یەكـەم ئامـانج لـە مێـژوودا كـە هێـزی بوردومانكەری ئاسمانی بۆ بەكاربهێنرێ، كاتێ كە هێزی شاهانەی ئاسمانیی بریتانیـا لـە عێـراق گوندنشینە كوردەكانی كوردستانی ناوەندی بۆمباباران كرد (Olson 1980،163).

لـە بـاكووری عێـراق، سـاڵی ١٩٢٢ حكوومـەتێكی كـوردی، لەلایـەن شـێخ مـەحموودەوە ڕاگەیـەنرا شـێخ مـەحموود، هەرچـەندە بەبنەچـە نەدەچـوەوە سـەر كۆنـە بنەماڵـە مـیرە كوردەكان، بـەڵام ئـەو ڕۆڵـەی بنەماڵـەی بەرزنجـەیی بـوو، كـە بنەماڵەیـەكی ناسـراوی ڕابـەڕی ڕێبازی سۆفیگەری قـادریین بۆیـە لـەو كاتـەدا كـە خـۆی لـە سیاسـەتیش ئەسـوو، پـشتی بـە پشتگیرێكی بەتوانای ئایینییش ئەستوور بوو. پێگـای شـێخ لـە بەشـی باشـووری كوردسـتانی عێراق و شوێنێك بـوو كـە بـە كرمـانجی باشـوور دەدوێـن و كـەمتر خێڵـەكی و زیـاتر شارسـتان نشینن ئێستا ئەوێ بە پێگەی جەلال تاڵەبانی و یەكێتی نیشتمانی كوردستان دەخوێندرێتەوە، (بڕوانـە پارتـە سیاسـیەكان). لەسـەرەتاوە، شـێخ مـەحموود لەلایـەن بریتانیەكانـەوە كـرا بـە دەسكەلا بۆ ڕاگیركردن و سەراسوێی كردنی كوردەكان بۆیـان، لـەو خاوەنداریـەیان لـە عێراقـدا كە تازە گرتبوویانە ئەستۆ بەڵێ ئەو، كارەی كرد، بەڵام نـەك بـۆ بریتانیـەكان، بۆیـە دەسـوبرد گرتیان و یەكسەر سوورگوونی هیندستانیان كرد و تـا سـاڵێك لـەوێ هێشتیانەوە. سـاڵە و دوا خۆیـان بـە هیـوای ئـەوەی ماڵییـان كربـێ هێنایانـەوە، ئـەو لـەجیاتی ئـەوە، سـاڵی ١٩٢٢

سەربەخۆیی کوردستانی لەژێر ئاڵای "بزووتنەوەی کوردستانی ئازاد"دا ڕاگەیاند و خۆشی بە "مەلیکی کوردستان" جاڕدا.

لە ماوەی دوانزە ساڵ شەڕ و شۆڕدا، شێخ مەحموود ئەوەندەی لەگەڵ سەرۆک هۆزە کوردەکاندا یەخەگیربوو، ئەوەندە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا نەبوو. لە وڵاتی سلێمانی بەولاوە کە مەڵبەندی خۆی بوو، سێبەری دەسەڵاتی بڕی نەدەکرد، ئەو نوێنەری کۆمەڵگای کۆن بوو و نا کۆکیەکی زۆریشی لەنێوان ڕووناکبیر. کوردەکاندا نایەوە، کە تۆباڵی گرفتاریەکانیان دەخستە ئەستۆی ئەو بیر و باوەڕانەی شێخ مەحموود و کۆنینەکانی چون ئەوهاییان بۆ دەکرد و پشتگیرییان لێدەکرد. بۆ سەرەك هۆزە کوردەکان ئەوەندە گرنگ نەبوو ئەو نیمچە سەربەخۆییەی کە هەیانبوو لەژێر سایە و سێبەری شێخ مەحموود دابێ یان هی لەندەن یان بەغدا یان ئەنقەرە پشتەڵەکی ئایین بەهێزی شێخ مەحموود لای ئەوانەی لەسەر ڕێبازی سۆفیگەریی قادری سوننی نەبوون، ئەوەندە جێی بایەخ نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، سێر ئارنۆڵد ویلسنی ئەفسەری سیاسی بریتانیا لە بەغدا لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێ: "سەرەڕای هەموو ئەم تەگەرانەش چوار کەس لە پێنجی لە خەڵکی کوردستان پشتیوانی لە پلانەکانی شێخ مەحموود دەکەن بۆ سەربەخۆیی کوردستان (Wilson 1931، 137).

لەو چەندانەدا، هێزەکانی ئەتاتورك ڕژابوونە ویلایەتی مووسڵەوە (هەرێمی کوردستان) بۆ پشتیوانیکردنی داواکاری تورکەکان لەسەرخاوەنیی هەرێمەکە، ئەمەش دژ بە پلانەکانی بریتانیا بوو زۆربەی کوردەکان ئەوەندە بیرەوەری تاڵیان لەسەر دەستی ناسیۆنالیستە تورکەکان و هەوڵی دنیاداری ئەتاتورك تێکەڵاو بەدڕندەیی ناو بانگدەرەوەی سوپای تورك لە ناوچەکانیاندا هەبوو، کە هەموو پشتیان لێکرد و شان بەشانی ئینگلیزەکان ڕووبەڕووی سیاسەتی دەست تێوەردانی ئەنقەرە بوونەوە، هەر لەم ڕەوشەوە لە شێخ مەحمووديش تاکانەوە، چونکە ئەو هێشتا هەر دووژمنی ئینگلیزەکان بوو. ئەوەبوو ساڵی ١٩٢٤ سولەیمانی پایتەختی شێخ مەحموود خۆی بە دەستەوەدا.

ساڵی ١٩٢٦ کۆمیسیۆنێکی "کۆمەڵەی گەلان"، پاش باسکردنی ڕەفتاری دڕندەئاسای تورکان بەرامبەر ئاشووریە مەسیحیەکان و کوردەکان لەو ناوچانەدا کە ناکۆکیان لەسەر بوو، ویلایەتی مووسڵی دا بە عێراق و ئەو حکوومەتەی کە ئینگلیزەکان دەیانگێڕا. کۆمەڵە داوای لە

عێراق کرد، ئۆتۆنۆمی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی بۆ هەرێمە کورنشینەکان دەسەبەریکا.

شێخ مەحموود ناشیانە لە هیوای ئەوەدابوو کە کوردستانی ناوەندی وەکو شانشینێکی سەربەخۆ لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە بدرێتێ و بۆ ئەم مەبەستە بارەگای گواستەوە ئێران تا سەرلەنوێ دەستکاتەوە بەچالاکی. لەوێ لەشاری مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بانگی شۆڕشی هەڵدا، کە لەوێ لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە هەڵکەندرا، ناچار گەڕایەوە سولەیمانی، کەچی دیسانەوە تووشی بەرهەڵستی هات لەلایەن ئینگلیزەکان و لە بەهاری (١٩٢٠)دا ڕاپەڕینەکەی دامرکێنرایەوە.

لە ساڵی (١٩٢٧)یشدا بەشی باکووری، بەکرمانجی باکوور دووی کوردستانی عێراق بوو بە گۆڕەپانی ڕاپەڕینێکی تر، کە زۆر سرنجکێش بوو. ڕابەرایەتی ئەم ڕاپەڕینە لەلایەن سەرکردەی ئایینی پایەبەرز و خۆشەویستی هۆزی بەرزان شێخ ئەحمەدەوە دەکرا، ئەو براگەورەی سەرکردەی سیاسی بەناوبانگی کورد ژەنەڕاڵ موستەفا بارزانی بوو لەهەمان کاتیشدا ڕابەری ڕێبازی سۆفیگەری دەسەڵاتبڵاوی نەقشبەندی بوو. شێخ ئەحمەد بەریەرەکانێی ئینگلیزەکان و تورکەکان و عەرەبەکان و بگرە هەندێ کوردی خۆولاتیشی کرد (هۆزی نەیاری برادۆست).

وەکو ئەو هەموو نەیارە کەم بن، شێخ بەرەنگاری ئیسلامەتی ئادەتییش بوەوە بەوەی بانگی ئایینێکی نوێی هەڵدا کە بریتی بوو لە تێکەڵکێشی کردنی ئایینەکانی مەسیحیەت و جوولەکە و ئیسلام لەیەك ئاییندا. لەوانەشە ئاواتی شێخ یەککگیرکردنی کوردەکان بووبێ لەڕووی ئایینەوە، بۆیە هەندێ بابەتی لە ئایینی کۆنی تیرەی فریشتەکانیشی دەخستە ناو ئەو تێکەڵە ئایینیەوە و خۆشی وەکو بەرجەستەکەری گیانی گەردوونیی نیشان دەدا، (بڕوانە تیرەی فریشتەکان) (لەم داوایەدا ئەو تاکە کەس نەبوو، ساڵی (١٩٣٩) سولەیمان مورشیدی ڕابەری عەلەوی نوسەیری داواکاری بەرجەستەکەری ئاسمانیی بۆ خۆی هەڵدا) (بڕوانە حۆرانی ١٩٤٧– ٨٨).

پاش چەند ساڵێ یەك لەدوای یەکی شەڕ و شۆڕ، هێزەکانی بریتانیا توانیان هێزەکانی شێخ ئەحمەد بشکێنن. هێزەکانی عێراق و بریتانیا، لەلایەن هێزی ئاسمانی شاهانەی بریتانیاوە بە توندی پشتگیری دەکرا، تەنها دەرکەوتنی تارمایی ڕەشی بۆمبا هاوێژەکان زەندەقی گوندنشینە کوردەکانی دەبرد گەلێ زیاتر لەو وێرانکاریەی بۆمباکانیان لەگیان و ماڵی

ئەو خەڵکەدا دەیکرد.

بەشکاوی، شێخ ئەحمەد ڕووی کردە تورکیا، بەڵام دوای ئەوە دەسگیرکرا و بە دوورخراوەیی ڕەهەندەی باشووری عێراق کرا... براگەورەیی هۆزەکەش چووە دەستی مەلا مستەفای برای، مەلا مستەفا لەساڵی (٩٤٠)ەوە دوای خولیای ئۆتۆنۆمی بۆ وڵاتی کوردان کەوتووە، بەڵام لە (١٩٦٠)ەکانەوە کردوویە بە پرۆگرام و ئەمە تا ئێستاش هەر بەردەوامە (بڕوانە مێژووی ئەم دواییە).

یەکێك لە ئاکامە نا هەموارەکانی خەباتی خوێناوی و دوور و درێژی شێخ مەحموود و شێخ ئەحمەد دژ بە ئینگلیزەکان لە کوردستانی ناوەند، چاك و خراپ، بەوە شکایەوە کە ئیتر بریتانیا ئەو ئارەزووەی نەما حوکمڕانی ناوخۆیی بدا بە کوردان، بەو جۆرەی کە لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلاندا دەربارەی گونجاندنی کوردستانی ناوەند لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا هاتبوو. ئەو پەیماننامەیەی ساڵی (١٩٣٠) لەنێوان ئینگلتەرە و عێراقدا گرێدرا، کە سەربەخۆییدا بە عێراق ساڵی (١٩٣٢) نەك هەر باسی ئۆتۆنۆمی تێدانەبوو، بگرە هەر بەلای شتی ئەوهاشدا نەچوو بوو بۆ کوردان.

ساڵی (١٩٣١) شێخ مەحموود دیسانەوە بە نیشانەی نارەزایی دەربڕینەوە لەبەرامبەر پەیماننامەکەدا، بۆ دواجار ئاڵای ڕاپەڕینی هەڵکردەوە. دیاریوو پاش ساڵەهای ساڵی تێکۆشانی بێهودە بۆ سەربەخۆیی، هاتبووە سەر داواخوازی بۆ کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی بەڵام ئینگلیزەکان بەمەش ڕازی نەبوون. ئەوەبوو لە کانوونی دووەمی (١٩٣١)و پاش ساڵێکی تەواوی شەڕ و شۆڕ هێزەکانی شێخیان پەکخست واتە تەنها (١٦) مانگ دوای تێکشکانی ڕاپەڕینەکەی خۆیبوون لە تورکیا.

تاکو ئێستاش ئاشکرا نەکراوە بۆچی لە دوادوا و پاش پامالکردنی یەکجارەکی شێخ مەحموود و بزووتنەوەکەی لە کۆتایی ساڵی (١٩٣١)دا سیاسەتمەدارە ئینگلیزەکان، لە دواچرکەدا هەندێ برگەی نوێیان خستەسەر پەیماننامەی سەربەخۆیی یەکەمی ساڵی (١٩٣١)ی ئینگلیز و عێراق و بە گوێرەی ئەو بڕگانە خوێندن بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکان و هەڵبژاردنی فەرمانبەری خۆماڵی لەناوچەی کوردستانی عێراقدا کران بە مافێکی تایبەتی بۆ کوردان تۆ بڵێی خۆڕاگریی مەردانەی شێخ مەحموود لە بەرامبەر هەموو لێقەومانەکاندا، سەرەنجام بوو بێ بەمایەی بەزەیی و ئازائافەرینی نەیارە ئەوروپاییەکانی؟ (بڕوانە کەسایەتی نیشتمانی). لە (١٩٣٢) بەدواوە، بۆ جاری یەکەم پاش(١٩١٤)، جۆرە خامۆشییەك باڵی بەسەر دەشتودەری فەلاکەتزەدەی کوردستانی ناوەندا کێشا.

# كۆماری مەهاباد:

لە پایزی(١٩٤٠)دا، لە ئەنجامی داگیركردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە كوردەكانی ئێران دەستیان بە بزووتنەوەیەكی سەربەخۆیی خوازانە كرد. كوردەكانی ئێران، لە ئەنجامی نائارامی و بێ ئاسایشی دوور و درێژ و دەسشێوەردانی سوپای سۆڤیەت لە ئابووری وڵاتەكەیان و ئەو برسیەتی و گرانییەی لێی دەكەوتەوە،ساڵی (١٩٤٥) كۆمارێكی كوردی سەربەخۆیان لە مەهاباد دامەزراند. هێزەكانی كۆمار، ئەوەندەی پێنەچوو كە سەرزەمینەكەیان بەرەو باشوور تا سنەو كرمانشاه پانكردەوە، بەڵام، كە لە شەڕی دیواندەرەدا شكان ناچاربوون بكشێنەوە ناو سەرزەمینێكی تەسكی پشت هێڵەكانی سوپای سۆڤیەتەوە لەو بەشەی خاكی ئێراندا كە داگیریان كردبوو (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢٦) كۆمارەكە تەنها ساڵێكی تەمەن بەسەربرد (كانوونی یەكەمی ١٩٤٥– كانوونی یەكەمی ١٩٤٦).

(نەخشەی ژمارە ٢٦)

لەو ماوەیەدا هەموو دامودەزگاو وەزارەتەكانی دەوڵەتەكە دروستكران و كەوتنە كار، تا لە ئەنجامدا لەسەر دەستی سوپای ئێران تەفرو تونا كرا.

بە هەرحاڵ، ڕاستی مەسەلەكە وابوو كە كۆماری مەهاباد، وەكو هەموو خەڵك ناوی دەبا، دەسكردێكی ئەو هێزانەی سۆڤیەت بوو كە ئێرانیان داگیر كردبوو (سۆڤیەتیەكان لە تەوریزیش كۆماری دیموكراتی ئازەربایجانیان پێكهێنابوو). ئەم دوو قەوارەیە بێ یەك و دوو كردن دوای تەواوبوونی جەنگ دەلكێنران بە یەكیەتی سۆڤیەتەوە.

هەر كەسێ تۆزقاڵێك مێشك لە كەللەیدا هەبێ، چاك ئەوە دەزانێ كە ئەم دەوڵەتە كوردە بچووكترین دەرفەتی مانەوەی لەبەر دەمدا نەبوو، ئەگەر بە تەواوەتی لە دەستی ئێران دەرچووبایە، یان یەكێتی سۆڤیەت چەتری پشتگیری سوپایی لەسەری لابردایە، وەكو ڕوویدا. ئەوەبوو سوپای ئێران بە ئاسانی مەهابادی گرتەوە و قازی محەممەد و یارانی لە مەیدانی هەرە گەورەی شارەكە بەدارردا كران، بەم جۆرە كۆماری مەهاباد لاپەڕەی ژیانی هەڵدرایەوە.

ئەو ماوەیەی كە دەكەوێتە نێوان ڕووخانی كۆمارەكەو پێش ئەو هەڵگەڕانەوەیەی

موستەفا بەرزانی ساڵی (١٩٦٠)لە عێراق سەرکردەیی کرد، بەکەم رووداوترین ماوەی مێژووی نوێی کورد دەژمێررێ، چەند وردە پێکداپرژانێك، یان هەندێ نارەزایی دەربڕینی چەکداریان بێ چەکی دژ بە سیاسەتی ئەم حکوومەتە لێدەرچێ، کوردستان بە ماوەیەکی پێویستی پیاچوونەوە و حەسانەوەدا تێپەڕی، ئەمە کوردەکانی بۆ ماوەیەکی نوێ و دراماتیکی لە ژیانی نەتەوەییاندا ئامادەکرد کە لەدەیەی شەستەکانەوە دەستی پێکرد.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: William Eagleton, *The Kurdish Republic of 1946* (London: Oxford University Press, 1963); Arshak Safarastian, *Kurds and Kurdistan* (London, 1948); Robert Olson, *The Emergence of Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion, 1880-1925* (Austin: University of Texas Press, 1989); Gerard Challiand, *People Without a Country* (London: Zed Press, 1980); David Adamson, *The Kurdish War* (London: George Allen and Unwin, 1964); Lord Kinross, *Ataturk: The Rebirth of A Nation* (London: Weidenfeld and Nicolson, 1964); Martin van Bruinessen, *Agha Shaikh and State: On the Social and Political Organization of Kurdistan* (Rijswijk: Europrint, 1978); Albert Hourani, *Minorities in the Arab World* (New York: Oxford University Press, 1947); Theodore Nash, "The Effect of International Oil Interests upon the Fate of Autonomous Kurdish Territory: A Perspective on the Conference at Sèvres, August 10, 1920," *International Problems* 15, 1-2 (1976); William Stivers, *Supremacy and Oil: Iraq, Turkey, and the Anglo-American World Order, 1918-1930* (Ithaca: Cornell University Press, 1982); Elmer Bermon Sovill, "The Royal Air Force, the Middle East and Disarmament, 1919-1934," unpublished doctoral dissertation (Kalamazoo: Michigan State University, 1972); Stephen Longrigg, *Iraq, 1900-1950: A Political, Social, and Economic History* (London: Oxford University Press, 1953); Stephen Longrigg, Oil in the Middle East: Its Discovery and Development (London: Oxford University Press, 1968); Ernest Main, *Iraq: From Mandate to Independence* (London, 1935); Sir Arnold Wilson, *Mesopotamia, 1917-1920: A Clash of Loyalties* (London, 1931); William Westermann, "Kurdish Independence and Russian Expansion," *Foreign Affairs* 70-3 (Summer 1991); Ihsân Nouri Pâshâ, *La Revolt d'Agri Dagh* (Geneva: Editions Kurdes, Genev PV, 1986).

# مێژووی ئەم دواییانە: لە (١٩٦٠)ە و تا ئێستا

ئەم سەردەمە، سەردەمی سەرلەنوێ جوان بوونەوەی ژیانی نیشتمانیی کوردە. لە (١٩٦٠) کاندا ڕێگا بازرگانیەکان گەڕانەوە کوردستان و قەوارەی چالاکییە بازرگانیەکان لە (١٩٧٠) کاندا گەیشتنە ئاستێکی سەرسوڕێنەرە. ئەمە، هەندێکی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بووژانەوەیەی کە ئابووری چ ئێران چ عێراق، لە (١٩٨٠) کانەوە وە دەستیانهێنا و کورت بوونەوەی ئەو ڕێگایانەی کە وڵاتەکانیان بە بازاڕەکانی ئەوروپاوە لە ڕێگای تورکیاوە دەبەستا. ئەم ڕێگا بازرگانیانە لە چەندین دەرگاوە بە کوردستاندا تێدەپەڕین. بازرگانیی کوردستان لە چەندین سەدەی نووستنەوە، بە هەنگاوی سەرسووڕێنەر بەرەو دوا دواکانی سەدەی بیستەم دەگوازێتەوە (بڕوانە بازرگانی).

پیاو نابێ زۆر زیادەڕۆیی بکا لە باسی ڕۆڵی کاروانچیەتی بازرگانیی جیهانی لە بوژاندنەوەی ئابووری کورد و ژێر خانەکانیدا، هەروەها لە کاردانەوەی کۆمەڵایەتی و کەلتووریدا. ئەو وێرانکاریەی کە وەستانی ئەوجۆرە بازرگانیە کردوویەتی لە ئابووری کوردستاندا، ئێستاش شوێنی هەر دیارە (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ).

ئەو پێشکەوتنە ئابووریە گەورانەی کە لەم گۆڕانە، لەسەرخۆ بەڵام بنەڕەتیە، وەدەست هاتن، لە دروستکردنی ڕێگاوبان و سیستەمی پەیوەستکاری نوێ و بەگەڕخستنی پرۆژەی کشتوکاڵی جۆراوجۆر و بەرنامەی چاککاری لە بوواری کاروباری شارستانییدا خۆ دەنوێنن. لەهەمان کاتیشدا کاروباری شارسازی و خوێندەواریی بە پلەی بەرز بەرز هەڵکشاون، چینێکی ناوەندیی هەراشی کورد پاش نزیکەی چوارسەد ساڵ لە بەین چوون، واخەریکە دێتەوە کایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە کوردەکانی تورکیا لە هەمووان زیاتر لەم پرۆسەیە سوودمەندبوون، بەڵام کوردەکانی عێراق لە گشت لا پتر سەروەشێنتر بوون، هەر لەبەر ئەوەش سەرنج کێشتربوون، هەرچەندە ئەوان بە ژمارەی دانیشتووان تەنها (١٧٪)ی ژمارەی هەبوو کوردانیان دەگرتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردستانی عێراق هەمیشە لەناو بشێوێنی و شەڕ و شۆڕدا بووە،

زیاتر سەرنجی هەموو خەڵکانی دەور و بەر و گشت جیهانی بۆلای خۆی کێشاوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە خەڵکێکی زۆر بەو هەڵەیەدا چوونە کە ئەم پارچەیەی کوردستان ڕۆڵی هەرە سەرەکیی بینیوە لەم قۆناغەی مێژووی کورددا. کوردەکانی تورکیا، کە ئێستا بە گۆڕانێکی زیاتر بنەڕەتیدا تێپەڕ دەبن و لە پاشەڕۆژی گەلی کورددا ڕۆڵێکی هەرەسەرەکیی دەبینن، لەلایەن جیهانی دەرەوە زۆر پشتگوێ خراون.

کوردەکانی عێراق بە هیوایەکی زۆرەوە پێ دەهاوێنە ئەم قۆناغەوە. لە ڕاستییدا لەژێرسایەی عەبدولکەریم قاسمدا، ئەو سەرکردەیەی کە بە کودەتای ساڵی (١٩٥٨)، ڕژێمی پادشاییەتی لە عێراقدا وەرگەڕاند، ئاڵای دەوڵەتی عێراق بە وێنەی ڕۆژ کە دروشمێکی دێرینی کوردە (ڕۆژێکی زەرد کە حەوت لیسپی سووری لێبو بووەوە) ڕازابووەوە. ئەم ئاڵایە لە (١٩٥٩)وە تا (١٩٦٣) لە عێراقدا شەکایەوە. بەقسەی هەندێ کەس، قاسم خۆی کوردێکی لەناو عەرەبدا تلیساوەبووە (بڕوانە ئامێتە بوون و توانەوە)، هەرچەندە بە گشتی سیاسەتە نادۆستانەکانی بەرامبەر بە سەرکردایەتی کورد، ئەوەندە نە خۆی نە حکوومەتەکەی لای ئەوان شیرین نەکرد.

پاش ئەوەی ئەوانیش بە کودەتایەك حکوومەتە سەربازیەکەی عەبدولکەریم قاسمیان لابرد، سەرکردەکانی حیزبی بەعس بڕیاریاندا بگەنە ڕێککەوتنێکی سەرلەنسەریی لەگەڵ کوردەکاندا. بە هەرحاڵ، دوای لادانی قاسم لە ١٩٦٣، یەکسەر ڕۆژە کوردیەکەش لە ئاڵای دەوڵەتی عێراق لادرا.

لە (١١)ی ئازار (مارس)ی ١٩٧٠، سەدام حوسێنی نوێنەری بەعس (کە وەکو بەهێزترین کەسایەتی لەناو ڕژێمەکەدا دەرکەوت، هەرچەندە هێشتا نەبوویوو بە سەرکۆمار). چووە ناو گفتوگۆوە لەگەڵ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ژەنەراڵ مەلا مستەفا بەرزانیدا و هەردولا گەیشتنە ڕێککەوتنێك.

لە ڕێککەوتنەکەدا بە ئاشکرا وترابوو کەوا "گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکیی پێکهاتووە کە بریتین لە عەرەب و کورد". زمانی کوردی پایەی زمانی دووەمی دەوڵەتی لەپاڵ عەرەبیدا پێدرابوو، هەروەها دەبوو هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی کوردی لە ماوەی چوارساڵدا پاش ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە پێك بهێنرێ و بۆ کاروباری خزمەتگوزاری هەرێمەکەش تەنها

فەرمانبەری كورد دابنرێن. كوردێكیش كرا بە جێگری سەركۆمار.

پێكهاتنەكە هەرگیز نەخرایەكار، چونكە هەرلایەنێك لەوی تر ساردتر بوو لێی و وای دەردەخست لایەنەكەی تر هەڵیخەڵەتاندووە. هێشتا مەرەكەبی پێكهاتنەكە وشك نەبووبووە، ژەنەڕاڵ بارزانی وتی كەوا هەمووی لە "فێڵ" بەولاوە هیچی تر نەبوە و "بەر لەوەی ئیمزا بكرێ، بن دەركم بەمە كردبوو" بە كورتی بڵێین باشە، هەردوولا بە تەواوەتی لەیەك بە گومان بوون، وەكو ڕووداوەكانی داهاتوو دەریان خست. هەر دولا تەنها دەیانویست كات بەرنە سەر تا فرسەت دێتەپێش.

لە (٢٩)ی ئەیلوولی ١٩٧١، واتە كەمتر لە ساڵێك پاش ئیمزاكردنی پێكهاتنەكە، ژەنەڕاڵ بارزانی لە هەوڵێكی كوشتن ڕزگاری بوو ئەم ڕووداوە دڵی ئەوی زیاتر كرمێ كرد لە بارەی نیازەكانی بەغداوە، بەتایبەتی لە بارەی سەدام حوسێن خۆیەوە، كە بە بیروڕای ئەو ئەم دارەڕاكەری هەوڵەكە بوو. ئەوەی سەیرە، لە پێشدا پەنجەی گومان ئاراستەی جەلال تاڵەبانی، سەركردەی حیزبە سیاسیە كوردە عێراقیەكەی تر كرا. (Gharid 1981، 156-170).

ساڵی ١٩٧٣ بارزانی لە ئیمزاكردنی پێكهاتنەكە پەشیمانی دەربڕی، لە ئاكامدا بە پەلە كەوتە توندتركردنی پەیوەندیەكانی، بە نهێنی و بە ئاشكرا، لەگەڵ سێ دوژمنی عێراق – ئێران، ئیسرائیل و ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكادا.

لە كۆتایی ئەو چوار ساڵەدا كە بۆ جێبەجێكردنی پێكهاتنەكە دانرابوو، ساڵی ١٩٧٤ بەغدا سەروبەری یاسایەكی بڵاوكردەوە كە بۆ گێڕانەوەی ناوچە كوردە ئۆتۆنۆمەكە ئامادەیان كردبوو. لە كاتێكدا یاساكە چوو بوو بەتانی دەسەڵاتی ئەنجوومەنەكانی یاسایی و جێبەجێكردندا، دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ڕاپەڕاندنی كارە ناوخۆییەكانی ناوچە ئۆتۆنۆمەكە، هەر لە دەستی بەغدادا مایەوە، (سەرچاوەی پێشوو). ئەو یاسا سنمبەندكراوە نە لەگەڵ ڕووح نە لەگەڵ جەستەی پێكهاتنەكەدا یەكیان دەگرتەوە.

هەر لایەنە، بۆ نواندنی توانای سوپایی خۆی سەری دەخورا، بارودۆخەكەش بۆ هەردوولا لەبار بوو بۆ بەهانەگرتن بەوی تر. هێزەكانی كورد، بەڕابەری پارتی دیموكراتی كوردستان، لەچەند هەفتەیەكدا خۆی تەیارو كەمەر بەستكردو دەستی كرد بە هێرشی پارتیزانانەی فراوان بۆ سەر هێزو دامەزراوەكانی حكوومەت. هاوپەیمانییان لەگەڵ ئێراندا، پەیتا پەیتا لە زیادبوونی

ئاشكرا تردابوو، پارەو چەك لەشاوە، شان بەشانی زانیاری و پارەی تر لە ئەمەریكاو ئیسرائیلەوە كەوتنە دەڵێن بۆ وڵاتەكە. شای ئێران كە دەمی لەباش كوێخایی هەرێمەكە دەكوتا و لە باڵادەستیی دەگەڕا لە ناكۆكیەكان لەگەڵ عێراقدا، كوردەكانی بە خەنجەرێكی باشی لاقەبرغەی عێراق زانی، ئەمەی لێدەرچێ، ئەو هەرگیز خوازیاری سەركەتنێكی ئەوتۆی كوردان نەبوو كە لابەلا كەرەوەبێ، چونكە ئەوكاتە ناچار دەبوو كە بكەوێتە گێژاوی بەرگرتن لە هەستی نەتەوەیی توندی كوردەكانی خۆی، كە بە ژمارە لەهی عێراق زیاتربوون. شا وەستایانە توانی ڕاپەڕینی كوردەكانی عێراق بۆ بەرژەوەندی وڵاتەكەی بەرامبەر بە عێراق بەكار بێنێ، بۆیە پەیتا پەیتا یارمەتی كرد بە قورگیاندا لە كاتێكدا ئەوان لە بارێكی یەكجار دژواردابوون، بەڵام هەر كەبیزانیایە تای تەرازوو بەلای ئەماندا دەشكێ، دەركی جەواڵەكەی دەگرتەوە. وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا، بگرە ئیسرائیلیش، هەمان سیاسەتیان پەیڕەو دەكرد و هەمان تاكتیكی ئێرانیان بەكار دەهێنا، لە كاتێكدا تینی بینایی بارزانی بۆ ئاقاری ئەم یاریە بڕی نەدەكرد.

بەم "دۆستە" پڕ دەسەڵات و هێزانەوە، بارزانی وایزانی عێراقی خستۆتە ناو دوو كەوانەی گیرەوە، دوایی هەڵەیەكی ستراتیژی لەدەست دەرچووو بەوەی كە فەرمانیدا هێزەكانی لە شەڕی پارتیزانیەوە بگوازنەوە بۆ شەڕی ڕوویەڕوویی لەگەڵ هێزەكانی عێراقدا پێشمەرگەی كورد كە دەستی كەم لە سەردەمی میدیەكان و شكاندنی ئاشووریستانەوە لەشەڕی پارتیزانیی نهێنییدا كارامەو زەبەر دەستبوون (بڕوانە مێژووی هەرەكۆن) لە شەڕی ڕوویەڕوودا هەرگیز هاوكووف و هاوتا نەبوون لەگەڵ سوپای پرچەكی عێراقدا كە بە ئاشكرا دیاربوو لەو باڵا دەست تربوو تێیدا، بۆیە هێندەی نەبرد دریان پێدرا. كە (١٩٧٥) داهات، هێزەكانی كوردستان پەسترابوونە چەند میلێكی كەمی دەورووبەری سنووری ئێرانەوە.

شای ئێران، كە دڵنیایی پەیداكرد لەوەی كە هێزەكانی بارزانی هاكا ناكا دەبەزن و شەڕەكە دەرفەتێكی باشی بۆ دێنێتە دەست كە فشار بخاتەسەر بەغدا بۆ پچڕینی دەسكەوتی زۆرتر، ئاوابوونی زوو بەزووی ڕۆژی سەركەوتنی كوردانی لەبەرچاو بەرجەستەبوو، ئەوەبوو لە (٦)ی مارتی (١٩٧٥)دا، لە جەزائیر ڕێككەوتننامەی دۆستایەتی لەگەڵ عێراقدا ئیمزاكرد و یەكسەر پشتی وەرگەڕاند لە كوردان و هەموو ئەو داخوازیانەی لە بەغدا هەیبوو، لەخاك یان

ئاودا، هەمووی وە دەست هێنا. سەدام حوسێنیش كە ئەو كاتە جێگری سەر كۆماری عێراق بوو بێ یەكو دوو پەنجەی بە ڕێككەوتننامەكەدا نا.

ئەگەر بهاتایەو بارزانی بە باشی مێژوونامەی گەلەكەی و خوێ بخوێنایەتەوە، كوردە بێچارەكان لەوانەبوو تووشی ئەو نەهامەتیە نەهاتنایە. ڕێك (٤٥) ساڵ لەوەبەر ژنەراڵ ئیحسان نووری پاشا لە بزووتنەوەی خوێبووندا متمانەی دابوو بە شایەكی تری ئێران، واتە ڕەزاشا ئەوەی لەوە كەوتەوە، شای ئێران بە دەسكەوتی زەمینی و سیاسییەوە دەرچووو و كوردان بە مایەپووچی و ماڵوێرانییەوە، (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ). بەم جۆرە، هەر بە دەردەكەی ئیحسان نووری پاشا، بارزانییش ڕەهەندەی مەنفابوو لە تاران بە مووچەیەكی كەمی دەوڵەتی ئێران. ئەوەندەی پێنەچوو ساڵی (١٩٧٨) بە نەخۆشی شێرپەنجە لە نەخۆشخانەیەكی ڤێرجینیا سەری نایەوە.

مەست بە هەستی سەركەوتن، بەغدا دەستی كرد بە پرۆگرامێكی باش دارێژراوی كزكردنی نفووزی پارتە كوردیەكان لە هەرێمەكەدا، لەهەمان كاتیشدا، دەمی تەلیسی پارەو پوولی سەر بەرەو ژێركرد بۆ سەر لەنوێ بنیاتنانەوەی ولاتە فەلاكەتزەدەكە بەو هیوایەی دڵی هاوولاتی بێ دەسەلاتی كورد بەلای خۆیەوە بكێشێ بەوەی گوایە "ها تۆش بەشی خۆت لە چنگاڵە چەورەكە وەرگرە".

"هەرێمۆكەیەكی ئۆتۆنۆمی"یش لە كوردستانی عێراق لەژێر چەپۆك و چاودێری توندی بەغدادا دابڕا، كە تەنها دەوروبەری نیوەی سەرزەمینە كورد نشینەكەی كوردستانی عێراقی گرتەوە (نەخشەی ژمارە ٢٦) شان بەشانی ئەمە بەرنامەیەكی باش نراوەی توند لەژێر چاوەدێری حكوومەتدا بۆ عەرەباندنی هەندێ ناوچەی تایبەتی كوردنشین خرایەكار بەرهەر حاڵ، وەكو دوایی دەركەوت، ئەم بەرنامەیە مرازی بەعسیانی نەهێنایە دی، ئەگەرچی هەزارەها لەجێی خۆیان هەڵكەندران و ڕاگوێزی ئەملاو ئەولا كران و لەشوێنی یەكجار دووری وەكو سوودان و مۆریتانیاوە خەڵكی تر هێنران تا لە هەڵەت و تەلان و چۆڵەوانیەكانی كوردستاندا جێگیر بكرێن.

لە ئێرانیش هەر لە داڕوخانی پادشاییەتیەوە لە شوباتی (١٩٧٩)دا تا كۆماری ئیسلامی توانی چنگ لەهەر چوار لای ولاتەكە لەكۆتایی ساڵی (١٩٨٢)داگیربكا، گەلێ شێوەی فرتەنەی

کۆمەڵایەتی و چەکدار، ڕقی پەنگاوەی چەندین پێکهاتەی ئەتنی ئەو وڵاتەی لە شێوەی ڕاپەڕینی چەکدارانەدا تەقاندەوە. لە کوردستان، ڕێکخراوە سیاسیە کوردەکان وەکو حیزبی دیموکراتی کوردستان (KDP-I) و کۆمەڵە کە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو لەژێر باری زەبرو زەنگدا دەیانناڵاند، بە پەلە کەوتنە کار بۆ سازدانی جۆرە دارەڕایەکی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان، لە کاتێکدا تاران هێشتا هەر لاوازو بێ تین و ئامادەی سازش بوو. گفتوگۆ بۆ ئۆتۆنۆمی درێژەی کێشا هەر کە تاران هەناسەی هاتەوە بەرو کەوتەوە سەرپێ، داواکاریەکانی ئەم حیزبانەی بۆ مەبەستێکی تر بەکارهێنا (ئەمەش لە قسە بەزۆرلندان بەولاوە هیچی تر نەبوو) ئەوەبوو دیسانەوە تۆمەتەکەی گۆڕینێ، واتە لەتلەتکردنی ئێران درایەوە پاڵ کوردان و دەوڵەت بەو بیانووەوە شەڕی گشت لایەنەی دژ بە گەلی کورد جاڕدا.

لێرەدا ئاشی چەند بەرەکێ و ڕکەبەرێی خۆبەخۆی گۆڕینی ناو کوردان کەوتەوە کار، بە سوود وەرگرتن لەو زانیاریانەی گرووپەکوردە دژ بە یەکەکان خستبوویانە بەردەستی، تاران هێرشێکی توندی بردەسەر ناوچەکان و لەئەنجامدا مەڵبەندە سەرەکییەکانی بەرگری داگیر کردەوە و دەسەڵاتی تێدا چەسپاندەوە ئەو پارچە خاك و خەڵکەی کە بە دەست کۆمەڵە و (KDP-I)) و (هەروەها بزووتنەوەیەکی کوردیی ئاشتیخواز بە ڕابەرایەتی شێخ عیزەدینی حوسەینی کە پشتگیری لە ڕاپەڕینی خەڵکەکە کرد ئەوەندە تەنگ و نالەبار بوو کە لە هیچ ماڵێکدا لە چواریەکی کوردستانی ئێران تێپەڕی نەدەکرد، پشتگیری گشتی خەڵکەکەش، لەپاڵ ئەوانەدا، لەو ڕادەیە دەرنەدەچوو (بڕوانە کەلتووری سیایس و ڕابەرایەتی) هەر لەبەر ئەمە خۆشی ژمارەی گشتی قوربانیەکانی کوردەکان ئەوەندە زۆر نەبوو (کەم و زۆر لە ۱۰۰۰–۲۰۰۰ کەس تێ نەپەڕی).

کەساڵی (۱۹۸۳)دا هات، ڕاپەڕینەکە هێندە کزبوو، کە ئیتر لە سووکە سەریەشەیەك بەولاوە نەبوو بۆ تاران. هەندێ حەشارگەی سەختی دوور دەستی لێدەرچێ، هەموو ناوچە کورنشینەکان کەوتنەوە ژێر دەسەلاتی ڕاستەوخۆی توندی دەوڵەتەوە.

GEORGIA
S.S.R.
Tbilisi
Samsun
TURKEY
Trabzon
Kars
AZERBAIJAN S.S.R.
ARMENIA S.S.R.
Ganja
Lâchin
Zardawa
Kelbâjâr
Erzinjan
Erzurum
Sivas
Malatya
Darsim
Van
Maras
Adana
Bitlis
Diyarbakir
Urmiyâ
Tabriz
Antep
Urfa
Dohuk
Mahabad
IRAN
Aleppo
Mosul
Arbil
Bijar
SYRIA
Sulaymania
Kirkuk
Sanandaj
Hamadan
Kirmanshah
BAGHDAD
Pahla
IRAQ
نەخشەی ژمارە (26): بەشە كوردنشینە دابڕاوەكان 1920 - 1975
سنوورەكانی كۆماری ئۆتۆنۆمی سۆسیالیستی سۆڤییەتی كوردكە بەشێك بوو لە كۆماری ئازەربایجانی سۆشیالیستی سۆڤییەتی 1923 - 1929
ئەو سنوورانەی لەو داوایەدا هاتبوون كە كوردەكان پێشكەشی دانیشتنی یەكەمی نەتەوە یەكگرتووەكانیان كردبوو، كە ساڵی 1945 لە سان فرانسیسكۆ گیرابوو. سێ یەكەكەی تری داوكە كە بەرەو كەنداوی فارس دەچی لێرەدا دەرنەكەوتووە.
سنوورەكانی كۆماری دیموكراتی مەهاباد/ 1946
سنوورەكانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی كوردستانی عێراق/1975
ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتووانیان كوردن
سنووری ئێستای دەوڵەتەكان

هەڵایسانی شەڕ لەنێوان عێراق و ئێراندا لەلایەك و تاگیری تەواو و ئاشکرای پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە ئێران لەلایەکی ترەوە، بەلای خەڵکی عێراق یان حکوومەتی عێراقەوە خزمەتی مەسەلەی کوردی نەدەکرد. بەهەر حاڵ ئەم تاگیریە جێی سەرسوورمان نەبوو، چونکە (KDP) بنکەو بارەگاکانی لەدیوی ئێران بوون و هەر لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە کە بارزانی عێراقی بەجێهێشت، زۆریەی بودجەو مەسرەفیان لەوێوە دابین دەکرا. لەو کاتەشدا کە تای عێراق لە جەنگەکەدا گران بوو، عێراق ئەوەندە دەربەستی ئەوە نەبوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان (عێراق- وەرگێڕ) لەودیو چی دەکرد و چی نەدەکرد، کە بەختی شەڕ ڕووی لە عێراق وەرگێڕا و ئێران خاکێکی زۆری لەسەر سنوورەکان داگیرکرد، ئینجا ناچارمان حیسابێکی زیاتریان بۆ بکەن، ئەوەبوو چەند پێشنیاریان خستە بەردەم (پ د ك)، کە هیچی لێ هەڵنەکرلند. بەهەرحاڵ، بەغدا ئەمجا ساڵی ١٩٨٤ ڕوویکردە گرووپە سیاسیەکەی تری ناو کورد، واتە یەکیەتی نیشتمانی کوردستان (ی ن ك) بە ڕابەرایەتی جەلال تاڵەبانی.

کە تای شەڕ بەلای ئێراندا زیاتر شۆڕبووەوە، بەغدا ناچارما هەرچۆنێك و بە چەندبێ بەدوای چارەیەك بگەڕێ لەگەڵ کوردەکاندا جەلال تاڵەبانی توانی کۆمەڵە دەسکەوتێك لە چنگی سەدام حوسێن بپچڕێ کە گەلێ لەوانە فراوانتر بوون کە ساڵی ١٩٧٠ بەگوێرەی پێکهاتنەکەی لەگەڵ مستەفا بارزانییدا بونییان بوو بوو. ناوچەی ئۆتۆنۆمی وا دانرابوو بەجۆرێك فراوان بکرێتەوە کە هەموو ئەو شوێنانە بگرێتەوە کە هەردوولا بەدرێژە بگرەو بەردەیان لەسەر دەکرد بە کەرکوکیشەوە پایەو پلەی ئۆتۆنۆمیەکەش دەبوو زیاتر بچەسپێنرێ تا هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ناوخۆش بگرێتەوە، هەروەها وا ڕێککەوتبوون کە (٢٥٪-٣٠٪)ی داهاتی گشتی عێراقیش بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەرێمەکە تەرخان بکرێ ئەمما چ سوود. چونکە سەدام گفتەکانی هەموو لەژێر فشاری زەرف و زەمانی ئەو ڕۆژانەدا دابوو، زۆر جێی گومان بوو ئەگەر ئیمزاش بکرایە و لەلایەن (ئەنجومەنەکانی دەوڵەتیشەوە، وەرگێڕ).

بەڵێی پێ بدرایە، ئەم ڕێککەوتنە چاوتێرانەیە لەلایەن بەغداوە بخرایەتە کار، بێ ئەوەی دوای ئاگربەستی ١٩٨٨، گۆڕانی سەرەکیی تێدا بکات.

بە گوێرەی هەفتەنامەی ئیکۆنۆمیست "گفتوگۆکانی تاڵەبانی - بەغدا کاتێك شکستیان هێنا، کە وەزیری دەرەوەی تورکیا خۆی گەیاندە بەغداو ڕایگەیاند کە ئەو ناوچانەی بەتەمان

بخرێنە ناو هەرێمی ئۆتۆنۆمی و ئەو دەسەڵاتانەی كە خەریكن بیدەنێ گەلێ لەوە زۆرترە كە توركیا بۆی قووت بدرێ، بۆیە رێككەوتنەكە، كە ئەوكاتە لە هاكا و ناكای ئیمزا كرندابوو، دەبێ راگیرێ، لەبەر ئەوەش كە عێراق دەستی لەژێر باری توركیادابوو، چونكە بۆریە سەرەكیەكانی نەوت ناردنی بۆ دەرەوە بە خاكی ئەودا رەت كرابوون، ناچار ملی بۆ دلخوازیەكانی ئەم دراوسێ گەورەیە كەچ كردو ئاوات و داواكانی كردە هێلكەیەك و كێشای بە گازەرایی دیواردا.

هەر بەمەشەوە نەوەستا هەمان ساڵ توركیای تەرخانكرد كە بەكردەوەی سەربازی گەرم بەم دیوو ئەودیوی سنووری هەردولادا، بكەوێتە سەر كوردە لە دەست دەرچووەكانی خۆی" (بڕوانە ئیكۆنۆمیست، ژمارەی (٢٧)ی نیسان (ئەڤریل)ی ١٩٩١–٤٦).

هەندەی پێ نەچوو شەڕ لەنێوان هێزەكانی كورد و عێراقدا هەڵاسایەوەو تا چوار ساڵی داهاتوو هەر بەردەوام بوو، تا لەنێوان مارت (مارس) و ئاب (ئۆگست)ی ١٩٨٨ دا، بەغدا بە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی بەرامبەر بە پارتیزانەكان و ئاپۆرای خەڵكەكە بێ جیاوازی، راپەڕینەكەی دامركاندەوە.

خۆی لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە سوپای عێراق چەكی كیمیاوی بە پارێزەوە دژ بە پێشمەرگە، دوایی بە خەڵكی سیویلیش بەكارهێنابوو، بەڵام كە بێ دەنگی لە ئەمەریكا و كۆمەڵی نێودەوڵەتی و سازمانی نەتەوە یەككرتووەكان پاش بە كارهێنانی چەند جارەی دژ بە هێزەكانی ئێران بینی، ئیتر یەكجاری شووڵی هەڵكێشا و لە مارت (مارس)ی ١٩٨٨دا شاری هەڵەبجەی كوردنشین بوو بە ئامانجی دەست وەشاندنێكی یەكجار فراوانی چەكی كیمیاوی دژ بە خەڵكی سیویل دەست وەشاندنێك كە لەو كاتەوە پاش جەنگی یەكەمی جیهان قەدەغەكرا، بەو جۆرە بەكارهێنرابوو، ئەوە بوو بە گوێرەی راپۆرتەكان (٥٠٠٠)كەس لە هەڵەبجە بوون بە قوربانیی ئەو زەریە بێ ئامانە.

هەرچەند مانگێكی نەبرد، كە ئاگربەست لەنێوان ئێران و عێراقدا راگەیەنرا و بەوە شەڕە هەشت ساڵەكەی نێوانیان كۆتایی هات، كە بەغدا هەستی كرد ئیتر دەستی بەرەڵایە چی لە كوردە یاخییەكان بكا یان نەكا، قۆڵی هەڵماڵی و تا بۆی كرا بە چەكی كیمیاویی دریغی لێیان نەكرد.

ساڵی ١٩٨٨، ناوچەیەکی باکووری مووسڵ بوو بە قوربانیی، ناوچەکە بریتی بوو لە سێ سووچەکەی سەر سنوورەکانی عێراق لەگەڵ سوریا و تورکیادا و دەستی ئەویەری کە پشتی بە سنوورەکانی ئێران و عێراقەوەیە هەر سێ شاری زاخۆ و دهۆك و ئامێدی سێ گۆشەی سێسووچەکە پێکدێنن، هەر بەم ناوچەیە خۆیدا هێڵی نەوتی عێراق- تورکیا بەرەو دەریای سپیی ناوەڕاست و شارێی عێراق کەبە تورکیادا تێدەپەڕێ دەکشێن. تاکە ڕێگای ئاسنینیش کە عێراق بە ئەورووپاوە دەلکێنێ و بە سوریادا تێپەڕ دەبێ هەر ١٠ میلێك لەوێوە دوورە بە هەموو حیسابێك ناوچەکە بایەخێکی یەکجار زۆر گەورەی بۆ بەغدا هەیە. ئەو بۆمبا پڕ لە گازی ژەهراویانەی کە بە فڕۆکە و هەلیکۆپتەر هەڵڕژێنرانە خوارەوە، بێ ئەوەی هیچ ئاوایی، کۆختە، یان کێڵگەیەك ببوێرن، بە ئاشکرا دیاربوون کە قڕی تەوا و بە هەموو هەناسە کێشێك دێنن لەناوچەکەدا لە ئاکامدا چەند هەزاری کوژراوو، ڕەوکردنێکی (٦٠) هەزار کەسەی کوردانی ئەو ناوە بەرەو تورکیای لێ کەوتەوە.

بە ئامانجی ئەوەی قایمتر چنگ لەناوچەکە گیربکا و نەهێڵێ خەڵکەکە یارمەتی لۆجستی بە پێشمەرگەکان بگەیەنن، بەغدا لە ساڵی (١٩٨٨)ەوە دەستی کرد بە بەکارهێنانی سیاسەتی سەرزەمینی سووتەڵ لە کوردستاندا، لەهەمان جۆری کە فارسەکان لە سەدەکانی ١٦ و ١٧دا بەکاریان دەهێنا (بڕوانە سەرەتای مێژووی هاوچەرخ) ئەو کارەی بۆ خاپوور کردنی سەدەها گوند و ئەو ژێر خانانەی کە ڕاگری ژیانی دێهاتی کوردستانی ناوەندە بوون، بەکارهێنراوە سەرسووڕێنەر و لەڕادەبەدەرە. هەرچی خانووبەرەو ساختمان هەیە، گشتی لە پێشدا تەقێراونەتەوە ئەمجا بە بەلدۆزەر لەگەڵ خاکدا یەکسان کراون، ئینجا چەمەنتۆی تۆز بە وردی و وەستایانە ڕشێنراوەتە ناو کانی و بیر و جۆگەلەکانەوە تا بە تەواوی کوێر ببنەوە.

هەرچی هێڵی کارەبا هەیە ڕاکێش کراون ئینجا سووتێنراون ئەگەر لە داربووبن، یان بە دێنابێت هەپرون بە هەپرون کراون ئەگەر کونکریت بووبن. پیا وکە بە چاوی خۆی ئەم کارامەیی و خەرجگرانییەی بەغدا لە دوورترین کون و قوژبنی کوردستانی عێراقدا دەبینێ، لە داخا هیچی بۆ ناکرێ مەگەر بیدا لە قاقای پێکەنین بەرامبەر ئەم دیمەنە تراجیدی و لە هەمان کاتدا کۆمیدییەی لادێی کورنشیندا. بەڵێ ناوچەکە بەڕاستی پێویستی بەو لالێکردنەوە و خەمخواریە بەرفراوانە هەبوو کە بەغدا بەدرۆ دەیدا بە بای فیشاڵدا ئەو خەم و خەرجە هەمووی

بۆ ئاوەدانكردنەوە پێویست بوو، نەك وێرانكاری وەكو ئەوەی ئێستا دەكرا.

لە ئاب (ئاغستۆس)ی ١٩٩٠دا عێراق كوێتی دراوسێی بچووك بەڵام دەوڵەمەندی خۆی بە چەپۆكێك داگیر كرد. بەڵام وەڵامێكی توندی چەكدارانەی كۆمەڵی نێودەوڵەتی لەوێ دەربیەڕاند و لەو پرۆسەیەدا زۆربەی زۆری ئابووری و سوپای عێراق تەفروتونا كرا لە مارت (مارس)ی ١٩٩١دا، هەفتەیەك كەمتر پاش ئاگربەسی (٢٨)ی شوبات (فەبرایەر) كە هێزە هاوپەیمانەكان ڕایانگەیاند، كوردەكان ڕاپەڕینێكی گەورەیان لەسەرتاسەری كوردستانی عێراقدا بەرپاكرد لە كاتێكدا گاردی هەڵبژاردەی كۆماریی عێراق لە باشوور ڕاپەڕینێكی شیعەكانیان دادەپاچی و دایان دەمركاندەوە، هێزە كوردیەكان كە لەژێر ئاڵای بەرەیەكی سەراپاگیری هاوپەیمانیەتی حیزبە كوردستانیە سیاسیە سەرەكیەكاندا گردبووبوونەوە، هەموو ناوچە كوردنشینەكانی عێراق و بگرە زیاتریشیان داگیركرد ئەمە تەنها سەركەوتنێكی بەتاڵ بەولاوە هیچی تر نەبوو، پاش دامركاندنەوەی شیعەكان لە باشوور، سەربازەكانی گاردی كۆماری، كە هارو شەڕەسوو و سێ ئەوەندەی تر جەربەزە بوویوون بەرەو كوردستان ملیان نا، ئەم هێرشە فراوانە ڕەوێكی بە كۆمەڵی كوردانی لێ كەوتەوە نزیكەی نیوەی كوردەكانی عێراق بەرەو سنوورەكانی توركیا و ئێران ڕەتان.

ئەوەی ڕوویدا وێنەیەكی ترسناكی مەرگی بەكۆمەڵی دانیشتووان بوو، شان بەشانی لەسەرما تەزین و بەدەم پەتا و نەخۆشیەوە ناڵاندن و لە هەمووشی خراپتر لەشكری عێراق و توركیا وەكو مۆتەكە لە كۆڵی خەڵكە چارە ڕەشەكە نەدەبوونەوە نزیكەی ٢،١ ملیۆن كورد چوونە ئێرانەوە، (٥٠٠) هەزاری تریش لە سنووری توركیا بەودیودا پەڕینەوە. لەمانە تەنها (٢٠٠) هەزاریان هێڵرانەوە، چونكە هەردوو ڕۆژ دوای لێقەومانەكە توركیا سنووری خۆی خڕ داخست.

هێزی هاوپەیمانان (كە ئەمەریكایی و ئینگلیز بوون بەشێوەیەكی سەرەكیی) ڕەوانەی باكووری عێراق كرا بۆ پاراستنی كوردەكان هەروەها هەموو ناوچەكانی ژوور خەتی (٣٦)یان لە فڕۆكەكانی عێراق قەدەغەكرد. ئەم كردەوەیە تا ڕادەیەك سرنجكێش بوو، چونكە ئەو هێڵەی سنووری ئەتنی كورد لەهی عەرەب جیا دەكاتەوە لە عێراقدا، كەم و زۆر لە باكوورەوە دەست پێدەكا و لە باشوور كۆتایی دێت، بۆیە ناوچەكە عەرەبێكی زۆری دەگرتەوە بەمووسڵیشەوە

کە شارێکی فرە ڕەگەن و دووەم شاری پڕ دانیشتووانە لە عێراقدا، جگە لەمە، هەرچەندە هەرێمە دەستنیشانکراوەکە هەولێر و چەند وردەشاریشی دەگرتەوە، لە سێ بەش، دوو بەشی کوردستانی عێراقی لە دەرەوە دەهێشتەوە بە سولەیمانی و کەرکووك و کفری و خانەقینیشەوە. هێزە هاوپەیمانەکان هەروەها "ناوچەیەکی پارێزراو"یشییان دانا کە بریتی بوو لە هەرێمێکی تەسکی باکووری مووسڵ و شارەکانی کوردستانی وەکو زاخۆ و عەمادیە و کەم و زۆر دهۆکیشی دەگرتەوە واتە هەمان ناوچەکە بەچڕی ئابی ١٩٨٨ لەلایەن بەغداوە گاز باران کرابوو، دەستنیشان کردنی ئەم ناوچە پارێزراوە بەو مەبەستە بوو کوردە پەرتەوازە بووەکان بکێشێتەوە جێی خۆیان. ناوچەکە، بەم دواییە درایە دەست و دەسەڵاتی کوردەکان.

دوابەدوای ئەوە کوردەکان دامودەزگاکانی حکومەتیان لەناوچەکە دەرپەڕاند و ئەمەش وای لە حکوومەتی عێراق کرد هەموو ناوچەکە بخاتە ژێر ئابڵووقەی گشت لایەنەوە هەر لە کۆتایی ساڵی (١٩٩١)ەوە ناوچەکە بەرەبەرە تا نزیکەی (٤٠٪)ی کوردستانی عێراقی گرتۆتە خۆ و لە سنوورەکانی سوریاوە بۆ سنوورەکانی تورکیا و ئێران لە لایەکەوە تا سەر ڕووباری دیالە دەگرێتەوە، لە لایەکی ترەوە.

لەو کاتەشەوە تورگوت ئۆزال هاتە سەر مەکۆی کار لە تورکیا، ئەنقەرە کەوتە گۆڕینی ئەو سیاسەتەی لە حەفتا ساڵی ڕابردوودا لەمەڕ مەسەلەی کوردەوە لەو وڵاتەدا گرتبوویە بەر. ئەو گۆڕانەی کە ساڵی ١٩٨٩ لە ڕەفتارکردنی دژ لەگەڵ عەلەویەکاندا هێنایە کایەوە و دوابەدوای ئەوە ماوەدان بە بەکارهێنانی زمانی زگماك لەلایەن کوردەکانەوە لە تشرینی یەکەم (نوامبر)ی ١٩٩٠دا، نیشانەیەکی دیکەی ئەم سیاسەت گۆڕینەبوو.

بە درێژەی چەند سەدەی دوابەدوای یەك سوڵتانە عوسمانلیە سوننییە توندمەزهەبەکانی ئەستەمووڵ لە فشار خستنەسەر و هەراسانکردنی "عەلەوییە پیسەکان" دەرفەت بوێریان نەدەکرد، کە لەپاڵ کوردەکاندا تورکمانێکی زۆریان لە ئەنەدۆڵ لەژێر باڵدا بوو (بڕوانە عەلەوییەت).

ڕووداوە خوێناویەکانی ساڵانی ١٩٣٧-١٩٣٨ی دەرسیم، ڕێك ڕەنگدانەوەی ڕەفتارە ڕەق و زەقەکانی ڕابردوو بوون، بێگومان ئەمجارەیان خوێنێکی زۆرتری تێدا بە خەرجدرا، کەچی لە دوادوایی ١٩٨٩دا، جۆرە دڵگۆڕینێك بەرامبەر بە عەلەویەکان خرایە ناوانەوە، کۆماری تورك کە

لە ساڵی (١٩٢١)ەوە دەوڵەتی دنیاداریی جاڕدابوو (٦٨) ساڵ دوای ئەوە وا خەریکە پەیڕە و لەم جۆرە سیاسەتە دەکا، ئەوەبوو بەڕەسمی دان بە ئاییینی عەلەوییدانرا (هەڵبەت پاش ئەوەی وایان دایە قەڵەم کە بەشێکە لە ئاییینی ئیسلام).

هەرچەند ئەمە هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو بۆ عەلەویەکان، چ کورد چ نا کورد، لە هەمان کاتدا خزمەتێکی باشی ئەنقەرەشی دەکرد ئەمە بوو بە داردەستێکی باش بۆ ئەنقەرە بۆ سەرکوتکردنی گیانی بەرهەڵستکاری چەکدارانە لەناو عەلەویەکاندا کە هەم هەستیان بە چەوساندنەوەی ئاییینی دەکرد هەم هی نەتەوەیی. گەلێ ئاهەنگی تایبەت بە عەلەوییەکان، وەکو نەورۆز (جەژنی ساڵی نوێ) کە گشت کوردان پابەندی گێڕانین، دەکرا بە بۆنەیەك بۆ دەربڕینی هەستی توندی سیاسی دژ بە حکومەت، ئێستا دوای ئەوەی عەلەوییەت بەڕەسمی ناسراوە، ئیتر جەژنەکانیشیان بەهەمان شێوە نەك هەر دەناسرێن بەڵکو سەراسوێش دەکرێن (بڕوانە فیستیڤاڵ و ئاهەنگ و ساڵنامە) لە پەنای ئەوەشدا، وەکو بۆ گاڵتە دەیگێڕنەوە دەوڵەت هەوڵدەدا کوردە عەلەویەکان هەڵخەڵەتێنێ و بەهەر شێوە و شێوازێك بێ لە بەشداریکردن لە بزووتنەوەی ڕادیکاڵی کورد دووریان خاتەوە، چونکە ئەوان ڕۆڵێکی بەرچاویان تا ئێستا لەو بزاڤەدا بینیوە، (بڕوانە حیزبە سیاسیەکان). جگە لەوە عەلەوییەکان دەکرێ بکرێن بە پوازێکی بەکار دژ بە دوژمنە دێرینەکانی حکوومەتی تورك، واتە ئیسلامییە سوننییە توندڕەوەکان کە تێیاندا بیروباوەڕی توندڕەوی ئیسلامی بە جۆرێکی ترسناك ماتەی داوە و بۆن و بەرامەی خەریکە گەلێ لە ڕابردوو توندتر دەوروبەر دەگرێتەوە، لاواندنی عەلەوییەکان سوودێکی تریشی بە دواوەیە، بەوە دەتوانرێ بەشداریکردنی ئەوان لەگەڵ کوردە مسوڵمانەکان کەمتر بکرێتەوە، بەوەی ڕەفتارە دڕەکانی ڕابردوویان بەرامبەر بە عەلەوییەکان بخەنەوە سەر بەرە.

ئەوەی جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە بۆچی تورکان، لە ڕابردوودا ئەم سیاسەتەیان نەدەگرتە بەر؟ ئێرانی دراوسێ لە سیاسەتی خۆشگوزەرانی و سەراسوێیی بەردەوام و هەموو لایەنە بەرامبەر بە ئازەریەکانی، ئاکامی زۆر باشی وەدەستهێنابوو، بە جۆرێك ئەوان بە تەواوەتی نووسابوون بە بەدەنی دەوڵەتەوە، بە لکاندنی سیاسی و ئابووری ئازەریەکان لەگەڵ دامو دەزگا و دامەزراوەکانی وڵاتەکەدا (بڕوانە ئێزەدی ١٩٨٨).

وەکو دەردەکەوێ ئەنقەرە تازە سوود و قازانجەکانی ئەم جۆرە سیاسەتەی بۆ دەرکەوتووە و تاقیکردنەوەکەی عەلەوییەکان خەریکە بە هەنگاوی تا ڕادەیەک خێرا هەموو کوردەکان دەگرێتەوە.

پاش ئەوەی ساڵی ۱۹۹۱، "یاسای زمانەکان" بەڵێی درایە دەرگای بۆ بەکارهێنانی ئاشکرای زمانی کوردی کردەوە، بڵاوکردنەوەش بەزمانی کوردی، کە دەیەها ساڵ بوو لە تورکیا قەدەغەکرابوو، بەری بەرەڵاکرا تاقیکردنەوەی دوو ساڵی ڕابردوو وا نیشاندەدا کە بەڵێ هاوڵاتیە کوردو تورکەکانی تورکیا وا خەریکن هەوڵدەدەن پێکەوە ئاشتیانە هەڵکەن. بە هاوتێگەیشتن و ڕەفتاری دادپەروەرانە لەلایەن حکوومەتی ئەنقەرەوە، لەوانەیە هیچ بیانوویەک بە دەستەوە نەمێنێ بۆ کردەوە و کرداری دڕ و ڕەخنەگرتن کە تێیدا مەسەلەی کورد بکرێ بە بەهانە.

لە ئێران، تەنانەت کوشتنی عەبدولڕەحمان قاسملو، ڕابەری بە دیمەنی گرنگترین پارتی سیاسی کورد (KDP—۱) لە ساڵی ۱۹۸۸دا (بڕوانە پارتە سیاسیەکان).

لە کاتێکدا خەریکبوو سەروکاری گفتوگۆی ئاشتیی لەگەڵ ئێرانیەکاندا سازدەدا، نەبوو بە بزوێنەرێکی ئەوتۆی کوردەکانی ئێران.

ڕۆژنامەکانی ئێران ئێستا دەڵێن گوایە جێگرەکەی قاسملو، سەعیدی شەرەفکەندی، خەریکی دەورەیەکی تری گفتوگۆی ئاشتیە، وەکو دەردەکەوێ لە قاسملو دڵنیاترە کەوا ئەویش لەم یاریەدا بە دەردی ئەو ناچی[19v].

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە.—

**General Bibliography**

A valuable source to consult on many Kurdish historical issues is the *Encyclopaedia of Islam* under various headings, particularly "Kurds," "Kurdistan," and "Kurdish"; for historical background on religious movements, "Ahl-i Haqq," "Alevi," "Yezidi," "Gholāt," and "Sufism"; and for dynastic information under the names of the dynasties as provided in this study. Also, G.R. Driver, "Studies in Kurdish History," *Bulletin of the School of Oriental Studies*, II (1921-23); Hasan Arfa, *The Kurds, An Historic and Political Study* (London: Oxford University Press, 1966); V. Minorsky, "Les origines des Kurdes," *Actes du XXe Congrès International des Orientalistes* 1938 (1940); H. Arfa, *The Kurds* (Oxford: Oxford University Press, 1966); Drek Ninnane, *The Kurds and Kurdistan* (London: Oxford University Press, 1964); G.R. Driver, "The Name Kurd and its Philological Connexions," *Journal of the Royal Asiatic Society of Great Britain and Ireland* (1923); Basil Nikitine, *Les Kurdes. Etude Sociologique et Historique.* (Paris, 1956); Arshak Safrastian, *Arabs and Kurds and Kurdistan* (London, 1946); *Kurdish Times*, semi-annual journal of the Kurdish Library, Brooklyn, New York 1985-present.

---

[19] پێشبینیەکەی د. میهردادی ئیزەدی ڕاست دەرچووو، ئەوەبوو دوکتۆر شەرەفکەندییش لە ئەڵمانیا بەهەمان دەردی دوکتۆر قاسملو چوو- وەرگێڕ.

# فەسڵی چوارەم

## جوگرافیای مرۆیی

ئەگەر بتەوێ کوردێك تەنها بە سەروسیما لە دراوسێکانی جیاکەیتەوە، ئەوا هەرگیز سەرکەوتوو دەرنایەیت، چونکە گشت شێوە ڕوخسارو چڕ و چارەی هەر کوردێك، دەتوانرێ لە هی پرانی دراوسێ ئەتنیە ڕەسەنەکانیدا بەدی بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کوردان ئێستا زۆرترین دەچنەوە سەر ڕەگەزی دەریای سپیی ناوەڕاست و زیاتر لەڕەنگ و بۆو پێکهاتەی بەدەندا لە دانیشتووانی باشووری ئەوروپا و ڕۆژهەڵات دەکەن. بە هەرحاڵ، زۆربەی زۆری کوردەکان بەم ڕوو شێوە ڕوخسارەدا شۆڕ دەبنەوە: ١) کەسێکی تێر گەنم ڕەنگی، باڵا کورتی، سەلك نە زل نە بچووکی لە دانیشتووە هەرە کۆنەکانی قەفقاس چوو، یان کەسێکی٢) سوورەی لە تایپی کۆنە ئەلپنشینە سەر نە زل نە بچووکەکان، هەندێ جاریش سەر درێژی سکەندینافی تەبار ئەم جۆرەی هەرە دوایی زۆرتر لە هەرێمی زاخۆ — ئۆرمیە — شنۆ، یان کرمانشاە — هەمەدان بەرچاو دەکەون، هەروەها لە کوردستانی ئەوپەڕی باکووری ڕۆژاوا لە چیاکانی پۆنتۆس. لە کوردستانی ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات ئەم تایپە کەمتر بەدی دەکرێ، لە کاتێکدا کوردستانی ناوەندو ڕۆژاوا لەنێوان هەردوو تایپەکەدا گەنم و جۆن.

بۆ نموونە، لە لێکۆلینەوەیەکدا کە هێنری فیلد لە عێراق لەسەر (٥٩٨) کورد کردوویەتی، وا دەرکەوتووە کە سێ یەکی ئەو ژمارەیە سوورە یان سوور و سپی (چاوشین یان کاڵ و قژ ڕەش) بوونە.

بەڵام کە لە زاخۆوە بەرەو کەرکوك و سولەیمانی شۆڕدەبێتەوە ئەم نیشاندەرە بەرەبەرە دائەبەزێ (field 1959).

بەشێوەیەکی گشتی باڵای شارنشینەکان یان لادێ نشینەکان (٣"، ٥' – ٧"، ٥') کورترە لە باڵای چیانشینە (جاران) کۆچەرەکان (٧"، ٥'، ٦'). بەشێکی زۆری ئەم جیاوازیە لە باڵادا لەوانەیە هی سیستەمی خواردەمەنی بێ لەم گرووپ بۆ ئەو گرووپ، بەڵام جیاوازی جینی نابێ بە هیچ جۆرێك لە حیسابەکە دەرکرێ. زۆربەی ئەو گەڕیدە ڕۆژاواییانەی لە سەدەکانی (١٩) و (٢٠)دا هاتوونەتە ناوچەکە، لە ڕاپۆرتەکانیاندا ئەوەیان دەرخستووە کە چ جوتیارە کوردەکان چ شارنشینەکان ڕەگەزێکی ڕەنگ بۆر و کەم داروبار بوونە لە بەدەندا، و هەمیشە سەرانەیان بەخێڵە ڕەوەندەکان داوە کۆیلەییان بۆ کردوون. ئەوان لەناو خێڵەکیەکاندا کە بە پێست گەنم ڕەنگ و بە باڵا بڵندتر بوون و بە خۆیان دەوت "کرمانج"، بە "گۆران" دەناسران. ئەم جیاوازیە بەدەنیە تا ئێستاش لە ناوەندی ئەو هەرێمە تەسکەی دەکەوێتە نێوان پاوە و شاه ئابادەوە بەدی دەکرێ، کە مەڵبەندی دوا پاشماوەی بە گۆرانی نوەکانەو تێیدا گەلێ وەرزێڕ و شارنشینی بۆر ڕەنگی باڵا کورت شان بەشانی گەنم ڕەنگی کۆنە ڕەوەند (کە ئێستا هەژاری و نەبوونی زەدەن)، پێکەوە دەژین، تەنها جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە ئێستا ڕۆڵی مێژوویيان ئاوەژوو کراوەتەوە: گۆرانە گوزەران خۆشەکان ئێستا بۆ گوزەراندنی کارەکانیان، کرێکار و ڕەنجبەر لەناو چنگ زەرد و ژووردەستە ڕەوەندەکانی پێشووی بەکرێ دەگرن و ئێستا بە تەوس وتوانجەوە پێیان دەڵێن داری هەڵ واتە "داری زڕ یان گەڵا هەڵوەریو".

وەکو دەردەکەوێ پرۆسەی "ئاریائیزە"بوونی کوردە سەرەتایی و هەرە کەونارا قەفقاسیەکان لە ڕووی زمان و کەلتوور و ڕەگەزەوە لەگەڵ سەرەتای دوو هەزارەی پێش میلاددا و لە پاڵ کۆچکردن و جێگیربوونی پەیتا پەیتای چەندین گرووپی بە زمانی هیندی-ئەورووپی دوو وەکو میتانیەکان، هیتیەکان، مادەکان، ساگارتیەکان، سیتیەکان، فارسەکان و ئالانەکاندا ڕوویدابێ. دەبێ ژمارەی ئەم کۆچکەرە گەنم ڕەنگانە ئەوەندە زۆر بووبێ کە بایی گۆڕانی بنەڕەتی کەلتووری (هەرچەندە نەگەیشتۆتە ڕەگ) تێدا بووبێ.

سەرەڕای هەموو ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی کە لەبارەی باری نەمەبوویی یان یەك ڕەنگبوونی کەلتوورەوە باسیان دەکرێ، جا پێش هاتنی ئاریاییەکان بێ یان پاش، هیچ تەباییەك لە یەکڕەگیی (جینی) کورداندا هەرگیز ڕووی نەداوە، تەنها تەماشایەکی کورت و خێراش بەڕەنگ و ڕووخساری کوردانی ئەم سەردەمە لە گشت کون و قوژبنی وڵاتەکەیان بەڵگەیەکی خۆنووی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەم بڕیارە.

ئەوەی زیاتر سرنجکێشە لە بارەی بن و بنەچەی ئەتنیی کوردەوە، چەند ڕەگەزییەتی.

هۆی ڕاستەوخۆی ئەم چەند ڕەگەزییەش لەوانەیە هی ئەو هەموو گواستنەوە و داگیرکاریە بێ
کە لە چەندین هەزار ساڵی یەك لە دوای یەکدا بەسەر کوردستاندا هاتوون. بۆ نموونە، تەنانەت
شوێنەواری ڕەگەزێکی وەکو مەنغولییش لەگەڵی جێگای کوردستاندا، جار بەجار، بەدی
دەکرێ، چونکە هەر لە سەدەی (١٢)وە بەدواوە چەندین شەپۆلی گەلە تورك ڕەگەزەکان
ڕشاونەتە کوردستانەوە و تێیدا جێگیر بوونە ڕاستییەکەی، خەرمانی ڕەگەزیی کورد
تێکەڵەیەکە کە هەموو ئەم گەلانە تێدا جێزبوونە.

تایپی هەرە باوباوی خوێن لە کوردستاندا (B)ە، ئینجا (A)– هەروەها تێکەڵەی ABیش–
ئینجا (O). تایپ (B) کە ئەویش باوە لەناو کورداندا، وەکو دەردەکەوێ پارێزگاری سروشتیی
بەخشیوە بە کوردان دژ بە کۆلێرا، کە ئێستاش جار بەجار خۆیان تێهەڵدەکاو قوربانیشیان لێ
دەخاتەوە تایپ (A) بەرگرە لە پەتا دبلییەکان (تاعوون) لە کاتێکدا بوونی بەربڵاو
دەستوەشێنی نەخۆشییەکە لە ئەوروپادا بەندە بەجۆری دانیشتووانەکەیەوە. هەروەها
ئەوەش دەردەخا کە نەخۆشیەکە لە ڕابردووشدا ئەوەندە بکوژ نەبوە لە کوردستاندا.
تاڕادەیەك کەمیی خوێنی تایپی (B) لە کوردستاندا، کە بەرگری ئاوڵەیە کە لە ڕۆژهەلاتی
ناوەڕاستدا باوە، وا دەردەخات نەخۆشیەکە ئەوەندە بەربڵاو نەبوە لە چیاکانی کوردستاندا.
ئەم بەڵگە پەتاوارە[1] دەبێ لە هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەدا ڕەچاو بکرێ کە لەسەر باری
دیموگرافیای کورد دەکرێ، بە تایبەتی لەو کاتانەدا ژمارەی قوربانیانی پەتاکان لە سەردەمە
جۆراوجۆرەکاندا دەگیرێن (بڕوانە دیموگرافیا).

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography**: C.U. Ariëns Kappers, "Contributions to the Anthropology of the Near East, V: Kurds, Circassians and Persians," *Proceedings of the Section of Sciences* XXXIV (Amsterdam: Koninklijke Akademie van Wetenschappen te Amsterdam, 1931); Henry Field, *The Anthropology of Iran* (Chicago: Field Museum Press, 1939); Henry Field, *The Anthropology of Iraq* (Cambridge: Harvard Peabody Museum of Anthropology, 1952); R.H. Dyson, "Ninth Century [BC] Man in Western Iran," *Archaeology* 17 (1964).

---

[1] واتە لەسەر بوون و نەبوونی پەتا بنیات نراوە-وەرگێڕ.

# هۆزەکان

کوردستان ئەمڕۆ مەڵبەندی ژمارەیەکی زۆری خێڵ و هۆز و گەلەهۆزە، کە هەریەکەیان خاوەنی زێد و واری خۆیەتی (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢٧) و زۆربەی زۆریان بەهەمان ناوەوە لە چەندین هەزار ساڵەوە هەن. بۆ نموونە، هۆزی زێباری لەسەرچاوە سۆمەری و ئەکەدیەکاندا بە ساوبار و یان سیبارو ناوی هاتووە. جیاوازی ناوە هۆزیەکانی هۆزەکانی بوهتان، ماناکان، هازابان، بەکران، پیران و بەراز لە تۆماریەندیەکانی گریک–رۆمەکان ئارامیەکان، فارسیە ناوەندیەکان و ئەرمەنیەکاندا (وەکو بوختانۆی، مامیگۆنیان، ئەدیابین، باگرات، پارێن و ڤیراز هاتوون) سەرچاوە ئیسلامیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، لیستەی دوور و درێژی ناوی هۆزە کوردەکانیان تێدایە هەر لە تەنگەی هورمزەوە بگرە تا دەگەیتە ناوچەرگەی ئەنەدۆڵ و زۆربەی ئەو هۆزانە هێشتا هەر لەناوماندا دەژین، هەرچەندە جێیان گۆڕیبێ ئەو لیستە دوور و درێژانەی کە مێژوونووسی کورد شەرەفەددینی بتلیسی ساڵی ١٥٩٦ پاش میلاد لە شەرەفنامەدا دایڕشتوە (بڕوانە سەرەتای مێژووی هاوچەرخ و ئەدەب)، هەروەها گەڕیدەو و فەرمانبەری بەرزی عوسمانی ئەولیا چەلەبی (١٦١١–١٦٨٢) لە (سیاحەتنامە) گەڕیدا بە تانیدا چووە، ئەو بۆشایی زانیاریانە پڕدەکەنەوە کە لە ئەم لاو ئەولا کردن و دابەشکردنی هۆزە کوردەکاندا بەتایبەتی و گەلی کوردیشدا بە گشتی لەماوەی نێوان سەدەکانی ناوەڕاست و هاوچەرخدا ڕوویان داوە.

بڕە زانیاریەکی بەنرخیش لە بارەی شوێنەواری کۆنی هەندێ لە هۆزەکانەوە، لەوانەیە لەناوی هەندێ ڕووناکبیری ئیسلامی سەدە ناوەڕاستینەکانیشەوە هەڵێنجرێ کە ناوی هۆزەکانیان خستۆتە پاڵ ناوی خۆیان و جێگای لە دایکبوونیان زانراوە.

لکاندنی ناوی هۆز بەناوی خۆیانو بنەماڵەوە لە سەدە ناوەڕاستینەکانەوە، بگرە لەوە بەرتریشەوە کارێکی باوبوە. بۆ نموونە، ئیبنی خەلکانی مێژوونووس (کەسەر بە هۆزی خەلکان بوە)، بەبن و بنەچە خەلکی کوردستانی ناوەندە، لەکاتێکدا ئیبن فەزلانی یەکەم گەڕیدەی ناسراوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە لە گەڕیدەیی گەیوەتە قوتب و ناوچەی

سكەندیناڤیا، سەر بەهۆزی فەزلان فـەزلوونی كونفیدراسیۆنی شـەدداری (شـادلووی ئێستا) و كوردستانی باشووره ئێستاكە پەڵە پەڵەی هۆزی فەزلان لە كوردستانی بـاكوور و لـە خۆراسـان و خەلكانیەكانیش هەر تۆزێكیان لە قوژبنێكی كوردستان دەژین.

هۆكارێكی گرنگی دابەشبوونی ئەم سەردەمەی هۆزە كوردەكان، ئەو ئایینانەی لەسـەرین و ئەو دایەلەكتانـەی پێـی دەدوون، تەنانـەت جیاوازیـەكانیش لـە بـەدەن و ڕوخسارياندا، وا لـەو لێقەومان و گواستنەوە بەكۆمەلانـەدا كـە لـەناوەوەی خـاكی كوردسـتانەوە بـۆ دەرەوەی و لـە دەرەوەیەوە بۆ ناوەوەی كراوە. كۆچپێكردنی بـە كۆمـەڵ، چ لـە ڕابردوودا و چ ئێـستا، بۆتـە بایسی جیاوازی لـە پێكهاتـەی هـۆزەكی كوردسـتاندا هـەروەها كوردەكـانی لـە گـەلێ گرووپـی ئەتنی دیكەی ناوچەكەش نزیك كردۆتەوە و پەیوەندیی جۆراوجۆری لەنێوانیاندا دروستكردوە.

كۆزەر و بەرپایەكی باشـی ئـەم مەسـەلەیە و پـشتەڵەكە مێژووییـەكانی لـەژێر بابەتـەكانی (كۆچـكردنە مێژوویـیـەكان، دەربەدەركردنـەكان و دەربەدەركردنـە زۆرەكیـەكان و مێـژووی كلاسیك و سەدەكانی ناوەڕاست)دا كراوە.

بۆ ئەوەی بتوانیٚ شوێن پێی گواستنەوەی هۆزە كوردەكان هەلگری، كەم و زۆر دەبێ چـاو بە بەلگەی زیندوو و سەرچاوە سەرەتاییەكانی ڕابردووی ئەم گەلەدا بخشێنی بۆ نموونـە هـۆزی مێژوویی هەزەبانی، كە خێزانێكـی نـاوداری سـەر بـە ئـەو حكـومڕانی كوردسـتانی ناوەنـدی لـە سەدەی یەكەمی پێش میلادەوە تا سەدەی سێیەمی پاش میلادكردوە، نـاوی خـۆی خـستۆتە سەر ناوچەكە، واتە، ئەدیابین كـە چـەندجار و لـە چـەند جـێ سەرچـاوە گریكـی و لاتینیـەكان ناویان بردوە.

بەهەر حاڵ، لقێكی ئەم هۆزە، نۆ سەدە دوای ئەوە، خۆی لە نزیك دوین و ئانی لە باكووری ئەرمەنستان گرتەوە هەر لەم لقە خۆیەوە بنەماڵەی ئـەیوبی هەلكـەوتوە كـە دوا دوا بـۆ خـاكی كۆنە ئەدیابین گەڕانەوە هەر دوای ئەم گەڕانەوەیە سوڵتان سەلاحەدینی بنیاتگوزاری بنەماڵـەی ئەیوبی، لە تكریت، كە یەكێك بوو لە شارەكانی ناو قەڵـەمڕەوی بنەماڵەكـە، لـە دایك بـوو ئـەم هۆزی هەزەبانییە، ئێستا بە چەند نـاوی نزیـك لـەناوە ڕەسـەنەكەی خۆیـەوە، بەپەڕاگەنـدەیی هەر لە خۆراسانەوە تا سوریا دەژین.

نەخشەی ژمارە (27)- هۆز و گەلە هۆزەکان
بەراز- گەلە هۆزێکی سەرەکییە.
رەشوەند - هۆزێکی گەورەیە.
ئەو ناوچانەی ئێستا زۆربەی دانیشتووانیان کوردن.
سەرچاوەکان: مارک سایکس/ 1908 (سەرچاوەی سەرەکیی)، نیکتین (1927)، هێنری فیڵد (1939 و 1952)، سووسە (1953)، ئەریستۆڤا (1958)، بڕوانە بیبلیۆگرافی. هەروەها ئیرەجی ئەفشار (1978).
تێبینی: گەلێ لە هۆزەکان لە زیاتر لە یەک شوێن بەسکراون. هەندێ جار ناوی هۆزێک، هی گەلە هۆزەکەیە، هەندێ جاریش هی هۆزێکی گەورە یان بچووکە. میلاتەکان نموونەن بۆ ئەمە.
Khurâsâni Enclave
TURKMENISTAN
ASHKHABAD
IRAN
MESHHAD
MOSUL
Arbil
KIRKUK
HAMADAN
Scale Km. 0 100 200
Miles 0 50 100 150

هۆزی باوەند (باڤەند) كە ئێستا لە دەورووبەری كرماشان نیشتەجێن، كاكەییەكان كە لە نزیكی كەركوك دەژین (هەروەها كاكەوەندەكان كە بەچیای ئەلبورزەوە و لە كرماشانیش نیشتەجێن)، و هۆزی شەدادان كە لە توركیا و سوریا لەنزیكی حەڵەب دەژین، نەوەی ئەو كوردانەن كە میرنشینە سەدە ناوەڕاستینەكانی باوەندی و كاكوكیی و شەدادییان دروستكرد كە لە دوای یەك هەرێمەكانی سەر كەناری دەریای خەزەر و ناوەندی ئێران و سەرزەمینەكانی قەفقاس– ئەرمەنستان– باكووری كوردستانیان بەدەستەوە بوو. ناوی كۆنفیدراسیۆنی مەزنی بابان كە لەژێر سێبەری عوسمانیەكاندا حوكمی هەموو كوردستانی ناوەندی تا ساڵی ١٨٤٨ دەڕانی، زۆر وێ دەچێ لە باوەندەوە هاتبێ هەروەها لە هۆزەكانی دیمیلییەوە بنەماڵە پاشازادەكەی بوەیهیان و چەندین بنەماڵەی پاشازادەی تر هەڵكەوتن بارستی، هەرە گەورەی دیمیلیان هێشتا هەر لە باكووری ڕۆژاوای كوردستان لە ئەنەدۆڵ بە ناوی "زازا" وە بە پاوەیە.

گەر چاو ژیركەیتەوە، مرۆڤ چەندین هۆزە ناوی تری كورد لەناو خانەوادە ئەریستوكرات و میرزادە ئەرمەنی، گورجی و هی گەلانی تری دراوسێدا دەدۆزێتەوە سەر هۆزە مەزنەكانی بەڕازی یان ڤەرازیەكان، یەكێك بوون لە حەوت خانەوادەی فیوداڵی حكومڕانی سەردەمی دوور و درێژی پارتیەكان (٢٤٧ پێش میلاد – ٢٢٤پاش میلاد) و هەر لە سووریاوە بگرە بە ئەرمەنستاندا تا دەگەیتە سنوورەكانی ئەریابینیان لە قەڵەمڕەودا بوو ئێستاش لەم سەردەمەدا، كۆنفیدراسیۆنی هۆزی كوردی بەڕازی نیوەی ڕۆژاوای ئەم سەرزەمینە یان بە دەستەوەیە.

لە هۆزی مامەكانیش خانەوادەیەكی فیوداڵی ئەریستوكرات هەڵكەوت (ناخار لە زمانی ئەرمەنییدان)، كە بریتیە لە خانەوادەی مامیكۆنیان یان مامیگۆنیان كە ماوەیەكی زۆر جڵەو بەدەستی ئەرمەنیان بوو هەر لەم خانەوادەیە خۆی دوو جەنەڕاڵی بیزەنتی هەڵكەوتن ڤارتان و ڤاهان مامیكۆنیا كە لە سەدەی شەشەمدا ناوبانگیان دایەوە هەروەها چاكێكی وەكو سانت ڤاردان مامیكۆنیان لێ كەوتەوە كە قارەمانی شەڕی ئەڤاریا (٤٥١ پاش میلاد) بوو. ئەم مامیكۆنیانانە، بە گوێرەی كۆنە هەواڵی ئەرمەنیان، هەرێمی "تایك و تارۆن و باگراڤاندین و ئەسیلسینیان" واتە، هەرێمەكانی مووش – موس، بتلیس، سێرت و هەكاری ئێستای سەرسنووری نێوان باكوور و ڕۆژاوای كوردستان لە نزیك و دەورووبەری گۆلی وانیان

بەدەستەوە بووە ئێستا مامیکۆنەکان لە هەمان دەوروبەر، پەڵەیەك لێرە،پەڵەیەك لەوێ، لە باکوور و ڕۆژهەلات و خوارووی گۆلی وان دەژین لقی کۆنتری مامیکانەکان لەوانەیە مامەش و مامەسانیەکان بن کە بەچڕی لە ناوەند و باشووری زنجیرە چیای زاگرۆس دەژین لە کاتێکدا مامیکۆنیەکان بە ئەرمەنی دەدوان، مامەسانیەکان دایەلەکتی لوڕی فارسییان بۆ خۆیان کردووە بە زمان، کە چی مامەشەکان و پاشماوەکانی تری مامیکۆنەکان تەنها لقن کە بە کوردی دەدوون و تا ئێستاش هەرماون.

هۆزی بەکران یان بەگران کە لە شاری دیاربەکر دەژین و هەرناوی ئەوانیشە وا بە شارەکەوە،بنەماڵەی پاشازادەی بە گرانی لێکەوتەوە کە، جار ناجار، جڵەوی حوکمیشی بە دەستەوە بووە، جارێکیان بە سەر ئەرمەنیەکانەوە و جارێکی تر بە سەر گورجیەکانەوە و ئەمە چەند جار لەنێوان سەدەی نۆیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا دووبارە بۆتەوە.

بە گوێرەی قسەی تێر– غیونریان، مەڵبەندی هەرە دێرینی بەگراتیە کۆنەکان ئەو هەرێمە بووە کە دەکەوێتە نێوان دیاربەکر و بینگۆلەوە لە باکووری ڕۆژاوای کوردستان بەکرانیەکان نەوەی هۆزی بەگراوەندن کە (٢٢) سەدە لەمەوبەر کلۆدیۆس پتۆلەمی جوگرافیاناس ناوبانی بە باگراوەندە هێناوە و ناوی وڵاتەکەیانی، کە دەکەوێتە نێوان گۆلی وان و ڕووباری دیجلەوە، بە باگراواندین ڕیجیو bayvave ndine reyio واتە "هەرێم یان وڵاتی بەگرەوەندەکان، ناویردوە".

مارك سایکس نووسیویە دەڵێ " بە گوێرەی ئەو قسانەی لە باوباپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە بەکرانەکانی ئەم سەردەمە لەو باوەڕەدان کەوا ئەوان بە بنەچە دەچنەوە سەر بەگراتیەکان". "پیاوە ئاییینیە ئەرمەنیەکان بەگشتی بە دڵنیاییەوە ئەم بۆچوونە دەردەبڕن". مرۆڤ دەتوانێ پەی بەجۆرە پەیوەندیەکیش بەرێ لەنێوان هۆزی تیرکان و پادشا تیگران، کە گەورەترین پادشایی ئەرمەنیان بووە لەسەردەمە دێرینە کاندا. سایکس لەم بارەیەوە دێتەوە وتارو دەڵێ "ئەو تیرکانانەی من سەردانم کردن زۆر بە میهرەبانی و لوتفەوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەرمەنیە بچووکەدا ڕەفتاریان دەکرد کە لەناویاندا دەژیان".

"ئەو ئەرمەنیانە دەڵێن، هۆی ئەمە ئەوەیە ئێمە لەیەك ڕچەڵەکین (لەگەڵ تیرکانەکاندا) و کەوا ئەوان (ئەو ئەرمەنیانە) لە بنەڕەتدا ئەرمەنی نین ئەرمەنیەکانی دیاربەکر چ ئاییینی چ نائاییینیی پا لەمە نانێن، بەڵام من ئەمەم لە زاری یەکێکەوە بۆ ساغ بوەوە کە هەم قەشەو

هەمیش كەسایەتیەكی ئایینیی مەسیحیەكانی ناوچەكەیە)( 464،sykes 1908).

هەر لەم بوارە سرنجكێشەدا، دەتوانین ناوێكی تریش ببەین، ئەویش تیرگانە (دەورووبەری ٢٢٥٥ پێش میلاد)، كە پادشایی قوتیلەكانی سەردەمانی دێرین بوو (بڕوانە مێژووی كۆن) وەكو لەسەرەوە باسمان كرد، لە سەرەتای سەدە ناوەڕاستینەكانەوە هۆزە ناو نراونەتە سەر بنەماڵەی حكومڕان و كەسایەتی دەسڕۆتیرگان كە ناوێكی خوتیلییە، لەوانەیە جاری یەكەم لەلایەن پادشاییەكی چیانشینی كوردەوە بۆ خۆی وەكو هۆزە ناو بەكارهێنرا بێ و هەزارەها ساڵی دوای ئەوەش كرابێت بە ئادەت ڕاستیەكەی بەكارهێنانی ناوە هۆز لەگەڵ ناوی كوردانی بەر لە شارستانیەت وای لە هەندێ كەسی وەكو عەلا فەیروز كردووە كە بڵێ كورد یەكەم گرووپی ئەتنی سەر رووی زەمینن كە لەقەبیان بۆخۆیان داناوە.

هۆزێكی تری بەناوبانگی كورد كە ئێستاش لەو جێیەی خۆی نیشتەجێیە كە بتۆلمی باسی كردووە كۆنفیدراڵی بەلیكانە. بتۆلمی بە ولاتی ئەم بەلیكانانە دەڵێ بەلیكانیا و دەیخاتە سەرسنووری توركیا و سوریا لە باكوور و باكووری ڕۆژهەلاتی حەڵەبەوە بە درێژایی مێژوویان، گەلێ هۆز لە ئەنجامی ڕەهەندەكردن یان كۆچكردنی خۆ بە خۆدا پەرش و بڵاوەوە بوونە بۆ نموونە، هۆزی خەلكان ئەمڕۆ پەڵە پەڵە لە نزیكی هەولێر (لە عێراق)، لە نزیكی كرمانشا (لەئێران بەناوی چەوتەوەكراوی قەڵغانەوە)، لەنێوان ئەنقەرە و قۆنیە لە توركیا، هەروەها لە خۆراسان و توركمەنستان و ئەرمەنستان و لە سنووری نێوان ئێران و توركیا لە نزیكی شاری ماكۆ نیشتەجێن كۆنترین تۆماریەندی بەردەست لە بارەی مەڵبەندی خەڵكانەوە، دەیانخاتە دەورووبەری هەولێرەوە.

لەم سەردەمانەی ئێستا بەتایبەتی لە سەرەتای (١٩٣٠) یەكانەوە، دارەڕاو ڕێكخراوە هۆزیەندیە كۆنەكانی كوردان لە توركیا كەوتۆتە بەرفشار و زوڵم و زۆرێكی زۆر، بەڵام هەرگیز نەبۆتە هۆی نەمانی هۆزە كوردەكان لەوێ نەخێر مەسەلەكە زۆر دوورە لەوە هەربوونی بە هێزی ئەوانە لە مەیداندا كەوا هەژمانی لە حكومەتی تورك بڕیوە. لەم دواییەدا چەند بەشێكی ڕاپۆرتێكی نهێنی حكومەتی توركیا لە بارەی هۆزە كوردەكان و پلەی پشتگیریان لە دەوڵەت بەشێوەیەكی نایاسایی لە پەخشنامەی "ئیكی بینە دۆغرو"دا و لە باسێكدا بەناوی "ڕاپۆرتێكی زۆر نهێنی لە هەڵسەنگاندنێكی حكوومەتدا لەبارەی هۆزە خائین و دڵسۆزەكانەوە

"چوق گیزلی راپۆر، دولتبی گوزیله خائین و یانداش عشیرتلر" کانونی یەکەم – دیسامبری ۱۹۸۷)دا بلاوکراوەتەوە.

لە راپۆرتەکەدا، مەڵبەندی هەر هۆزە کوردێك دەستنیشان کراوە، هەروەها ژمارەیان، شێوەی دیالێکتی دوانیان، سەرکردەکانیان، و رابردویان لە رووی دڵسۆزی و نا دڵسۆزییەوە بۆ دەوڵەت هەر لە دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە تا ئەمڕۆ ئەو بەشانەی راپۆرتەکە کە دەست کەوتون، سەرچاوەی بێ هاوتان بۆ گەیشتن لە باروبۆخی ئێستای هۆزە کوردەکان لە تورکیا.

لەسەرزەمینەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران، پەیوەندی سەر بە هۆز بوون لەناو کوردەکانی ئەرمەنستان و گورجستان و تورکمانستان هەر ماوەتەوە، بەلام لەناو کوردەکانی ئازەربایجاندا کەمتر، کوردەکانی ئازەربایجان بە کۆمەڵی گەورە گەورە رەهەندی کون و قوژبنی ئۆراسیا کران و کەلتووری ئەو کوردانەش کە مانەوە لەلایەن ئازەرییەکانەوە خرایە ژێر فشارەوە ئەریسیتۆڤا ساڵی(۱۹۵۸) باسی ئەوەی کردووە، کە تەنها دوو کوردی ئازەرەیی سۆڤیەتی دۆزیوەتەوە، کە توانیبێتیان خۆیان بەرنەوە سەر هۆزەکانیان بەر لە راپەرینەکان، لە کاتێکدا کوردەکانی تری سۆڤیەت باسی چەندین هۆز و وردە هۆزیان کردووە و باو باپیرانیان بردۆتەوە سەر ئەوان.

لە ئێران و عێراق و سوریا، رایەڵبەندی گەلێ هۆز وەکو خۆیان بێ گۆڕان ماونەتەوە، لە خشتەی ژمارە (۱)دا لیستەیەکی تەواوی گەلە هۆز و گەورە هۆزی تر لەم ولاتانە دارێژراوە.

لێکۆڵینەوەکەی ساڵی (۱۹۰۸)ی سایکس (مەبەستی مارك سایکسە وەرگێڕ) ڕستبەندی ژمارە و جێگای هۆزە کوردەکانی کردووە و تێبینی کورتیشی لە بارەی باروبۆخی کۆمەلایەتی کەلتووریانەوە داوە هەرچەندە ئەم بەرهەمەی سایکس باسی هەرێمە کوردنشینەکانی فارس زەمین ناکات، بەلام بایەخی خۆی لەوەدا سەندوە کە بەر لە دابەشکاری و زوڵم و زۆرەکانی بیستەکاندا نووسراوە و کەوتۆتە ناوانەوە.

ئەو بەرهەمانەی دوای ئەوە بلاوکراونەتەوە، وەکو هینەکانی ڤیلەچێڤسکی یان ئێدمونددز، یان نیکیتیی یان موکری، زانیاری نوێیان خستۆتە سەر ئەو زانیاریانەی کە لە بارەی هۆزەکانەوە بە دەستەوە بوون هەرچەندە لە هەندێ بابەتدا لەگەڵ یەکدا زۆر ڕێك نین هەرچی

(فیلد)ە، بەركارە مەیدانیەی كە لە عێراق و ئێراندا ئەنجامیداوە، هەندێ نەخشەو ئامارگیری و ڕومالكاری هۆزە كوردەكانی بە زمانی ئینگلیزی تۆمار بەندی كردووە، كە كەم هاوتان لە جۆری خۆیاندا چەندین كاری پڕ نرخی تر لەم بوارەدا بە زمانەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەنجام دراون .

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە: —

**Further Readings and Bibliography:** Claudius Ptolemy, *Geographia*, trans. E. Stevenson (New York: New York Public Library, 1932); Henry Field and J.B. Glubb, *The Yezidis, Sulubba and other Tribes of Iraq and Adjacent Regions* (Menasha, Wisconsin, 1943); Henry Field, *Contribution to the Anthropology of Iran* (Chicago, 1939); Ahmad Sousa, *Atlas of Iraq* (Baghdad, 1953); Mark Sykes, "The Kurdish Tribes of the Ottoman Empire," *The Journal of the Royal Anthropological Institute of Great Britain and Ireland* XXXVIII (1908); V. Minorsky, "The Tribes of Western Iran," *Journal of the Royal Anthropological Society of Great Britain and Ireland* LXXV (1945); W. Ivanov, "Notes on the Ethnology of Khurasan," *The Geographical Journal* LXVII-2 (London, 1926); *Sovremennii Iran: Spravochnik* ("Contemporary Iran: A Reference Book') (Moscow, 1957); Alexandre Jaba, *Recueil de Notices et Récits kourdes* (St. Petersburg, 1860); Henry Field, *The Anthropology of Iraq* (Cambridge: Harvard Peabody Museum of Anthropology, 1952); J.B. Noel, *Notes on Kurdish Tribes: On and Beyond the Borders of the Mosul Vilayet and Westward to the Euphrates* (Baghdad, 1919); W.D. Hütteroth, "Bergnomaden und Yaylabaurern im mittleren kurdischen Taurus," *Marburger Geographischer Schriften* II (Marburg, 1959); Aram Ter-Ghewondian, *The Arab Emirates in Bagratid Armenia*, trans. N. Garsoïan (Lisbon: Livraria Bertrand, 1976); H.L. Rabino, "A Journey in Mazandaran (from Resht to Sari)," *The Geographical Journal* 42 (1913); J.B. Noel, "A Reconnaissance in the Caspian Provinces of Persia," *Geographical Journal* 57 (1921); Marcel Bazin and Christian Bromberger et al., *Gilân et Âzerbâyjân Oriental: Cartes et Documents Ethnographic* (Paris: Éditions Recherche sur les civilisations, 1982); Mark Sykes, *The Caliph's Last Heritage* (New York: Arno Press, 1973, reprint of the 1915 London edition); Office of the Civil [Iraq's British Administration] Commissioner, *Notes on Kurdish Tribes, on and Beyond the Borders of the Mosul Villages* and *Westward to the Euphrates, and Notes on the Tribes of Southern Kurdistan Between the Greater Zab and the Dialeh* (Baghdad, 1919); Fu'ad Khurshed, *Notes on the Tribes of Southern Kurdistan* (Baghdad, 1919); Sharaf al-Din Bitlisi, *Chèref-nameh [ Sharafnâma] ou Fastes de la nation kourde*, French trans. Charmoy, 2 vols. (St. Petersburg, 1868-75); T.F. Aristova and G.P. Vasil'yeva, "Kurds of the Turkmen SSR," *Central Asian Review* 13-4 (1965); Evliyâ Chelebi, *Siyâhatnâma: Narrative of Travels in Europe, Asia, and Africa*, trans. Joseph von Hammer, 3 vols. (London, 1834-50).

## HISTORICAL MIGRATIONS

Familiarity with historical Kurdish migration patterns is perhaps the single most important tool in accurately reconstructing Kurdish history. The utter lack of knowledge of and interest in the population movements, and their interconnection with historical and social events in Kurdistan, is surprising, given the availability of information. Ignorance of these historical events has been the source of the puzzlement of most modern writers over questions of Kurdish national identity, the Kurdish role in and contributions to Middle Eastern history, and the complexity of their modern religious, linguistic, and racial composition. The large body of work and attention given to past Turkic migrations, for example, has clarified many otherwise puzzling historical points about those peoples. The same degree of attention to Kurdish migration patterns can also

# هۆز و کونفیدراسیونی هۆزە کوردەکان

لە ڕیزبەندی هۆزەکاندا، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا دەستمان پێکردووە، بەڵام هەندێ هەڵاواردنیش کراوە، واتە تەنها ناوی کونفیدراسیۆنە هۆزیەکان و تاقە هۆزە گرنگەکان براوە ئەندامانی هەر کۆنفیدراسیۆنە بە نەزمی ئەلفەباتیك لەژێرەوە باس کراون.

ئەو تێبینیانەی لەناو کەوانەدا دراون، ناوەکانی تری هۆزەکە دەردەخەن، لەپاڵ مەڵبەندو دەیالێکت و ئایین و شتی تردا، دەبێ کوردە (حەمکاو)ەکانی هەرێمەکانی بوخارا و فەرغانە (ئۆزبەکستان)یش بخەینە سەر لیستەکان هەرچەند نەمزانی بیانخەمە سەر کام هۆز. ئەو کوردانەی دوای(١٩٢٥) رەهەندەو دەربەدەر کراون لەم لیستەیەدا ناو نەبراون، جا پەیوەندی هۆزبەندیانەی خۆیان لە مەڵبەندی نوێیاندا ڕاگیر کردبێ یان نە.

١- لە هەرێمی خۆراسان

ا - باکووری خۆراسان: (هەموو هۆزەکانی ئەم ناوچەیە، بەکرمانجی ژوورووی دوو و سوننی مەزەبن، لە هەندێ جێگەشدا تێکەڵەی سوننی و شیعەن، یان جۆری ترن کە لە شوێنی خۆیدا باس دەکرێن). خشتبەندی (١)

گەلە هۆزی زافەرانلو (یان زەعفەرانلو چەمیشگەزەك)لەسێ دوو بەشی هەموو ناوچەکە لە ئێران و لە تورکمانستانیشدا پێکدێنێ.

عەمەرلو (هۆزێکی زۆر گەورەیە).

ئەمیران.

بەکران (یان بیچران).

باچڤان (یان باچیان).

بادەلان (یان بەهادوران).

باریڤان (یان بریکان، بە هاروەندی هەرە کۆن؟ یارسانی بە لەکی دوون).

بۆرەکەیی (بەشێکن لە بۆرەکەییەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، سوننی و بە کرمانجی

باشوور بوون).

گاولیان (هۆزێکی زۆر گەورەیە).

هیزۆلان (یان ئیزۆلی).

هازوان (یان هەمزاکان، بەشێکن لە هاضەبان / هاضەبانی دێرین).

هەڤادان (یەزیدی بە کرمانجی باکوور دوون).

ئیزان.

جەلالی.

کایکان.

کۆوا (یان کوڤانلو، کاڤیانلو، کۆوەند).

کووخبان (یان کوخبانیکلو، کوهانیکلو).

میلان (میللی).

موژداکان.

پالۆڤولان.

پاهلەوان (فەیلین؟).

پالۆکان.

قەرە چورلو (یان قەرەچول).

قارمان (قەهرەمانلو).

قاچکان.

رەشوان (یان ڕەشەوەند).

روتاکان.

شاران.

شایخکان

شاملو (بیجرانلو)

سیلسە پۆران.

سیواکان (یان سیوەرەك، عەلەوی بە دیمیلی دوون).

سۆفیان.

تۆپکان (زۆر گەورەیە).

وێران.

زەیدان.

گەلە هۆزی شادلو (شەداد) گشت چمکی باشووری ڕۆژاوای هەرێمی خۆراسان دەگرێتەوە.

ئالان.

بوغان.

دیرقان.

گاریوان.

گوردان.

ئینران.

جابان (یان جاپا لەوانەیە پەیوەندی بە جاف گەورە هۆزەوە هەبێ).

جویان.

کاغان.

[illegible]

قیلیچان.

قراباشلو.

قوپران (یان کوپران).

**ئەو هۆزانەی بەشێك نین لە هیچ گەلە هۆزێك:**

لەك (لە ئەبیوەردەوە تا چەهچەهە دەگرنەوە، یارسانی بەلەکی دوون).

قەرەچورلو (لە چەند بەشێکی باکووری ڕۆژاوای وڵاتەکەو و هەندێ بەشی لەو بچووکتری ڕۆژاوایدا دەژین).

زەند (لە ئەبیوەردەوە تا چەهچەهە، یارسانی بەلەکی دوون).

ب– کۆهستان– ناوچەی بیرچەند.

بوهلوولی (لە قائینەوە بۆ تەبیات، یارسانی بەلەکی دوون).

مەناوەند. لە بڵندایییەکانی مەناوەند و خۆشئاوا دەژین، یارسانی، بەلەکی دوون.

بۆشنەوەند (ڕەشەوەند، ناوچەی تەبەس و مەسیتا، یارسانی، بەلەکی دوون).

تۆمقانلو (کاشمەر و بەکران کوە باشووری بیرچەند، سوننی بە کرمانجی ژوور و دوون).

٢–کێوەکانی ئەلبورز.

أ–هەرێمی مازەندەران.

گەلە هۆزی خاجەوەند (لە نور و قەجور و کلاردەشت و پول دەژین و یارسانی بەلەکی دوون).

دیلفان.

کاکەوەند (کاکەوەند).

لەك.

سوڵتانقولیخان.

ئەو هۆزانەی بەشێك نین لە هیچ گەلە هۆزێك (گشتیان سوننی بە کرمانجی باکوور دوون– یان جۆری دیکەی کە لە شوێنی خۆیدا باس دەکرێن):–

عەلیکانی (لەناوچەی دەماوەند و لار، عەلەوی بە دیمیلی دوون).

بەلیکان (لە بڵندیەکانی گەچسار– کاندووان دەژین، سوننی بە دیمیلی دوون).

گریلی (گرایلی، لەسەر ڕووباری نیکا دەژین، سوننی بە دیمیلی دوون).

گوڵبادی لەنێوان بیهشەهر و بەندەرگەزدا دەژین، سوننی– کرمانجی ژوورپوو).

لاریجانی (لە بڵندییەکانی دەوربەری لاریجان).

ماشائی (نزیکی بەندەرگەن).

نەوائی (نزیکی ئامول).

نێکا (لەسەر ڕووباری نێکا).

نوری (لە دەوروبەری شاری نور).

عومرانلو (لەناوچەی گالوگاه).

ب- هەرێمی گیلان

گەلە هۆزی عەمەرلو (لە دەیلەمان و سیاقەلەوە تا ڕووباری شاهڕوود. خۆیان لەو باوەڕەدان کە پەراگەندەی گەلەهۆزی گەورەی بابانن، سوننی، بە کرمانجی باکوور دوون)

بەها دەواللو.

بایشان.

دەوالو (دەواللو).

شاملو (شامقان).

شاقولان (شامقانلو).

ستاجلو (ئیستاجلو).

ئەو هۆزانەی کە بەشێك نین لە هیچ گەلەهۆزێك:-

باجەلان (یارسانی، گورانی).

بوهنوویی (بوهتانی، سوننی، کرمانجی باکوور).

چیگینی (باکووری ڕووباری شاهڕوود، سوننی، کرمانجی باشوور).

چەمیشکەزەك (عەلەوی، دیمیلی).

جەلیلوەند (یان جەلالوەند، یارسانی، لەکی).

کەلهوڕ (یارسانی، گورانی).

کاکەوەند (یارسانی، لەکی).

کرمانی (یارسانی- کرمانجی باشوور).

مافی (بەشێکن لە مافییەکانی کرمانشاه، یارسانی و شیعە، لەکی).

قیاسوەند (لە دووبەشی کوماسی و سیلاخور پێکهاتوون، یارسانی، لەکی).

ڕەشەوەند (ڕەشفەند، سوننی، کرمانجی باکوور).

والی یاری (یارسانی، کرمانجی باشوور).

یەمینی (سوننی، کرمانجی باشوور).

ج- هەرێمی زەنجان- خەڵخاڵ.

دەلیقان (ناوچەی خەڵخاڵ، سوننی، کرمانجی باکوور).

جانپولاد (یان جامبەلاد، ڕۆژاوای خەڵخاڵ–سوننی، كرمانجی باكوور).

كیلیشانی (سوننی، كرمانجی باكوور).

شاترانی (باشووری ئەردەبیل، شیعە، كرمانجی باكوور و ئازەری).

٣–ناوەندی ئێران.

أ–ناوچەی كاشان–قوم.

بەغدادی (یان ئەنجیلەوەند، ڕۆژاوای ساوە، یارسانی، لەكی).

كەڵهوڕ (لە قەرەچای باشووری ساوە، یارسانی، گۆرانی و كرمانجی باشوور).

لەك (قوهەك و ناوچەكانی "كوردەكان"ی چیای كەركەس).

پازوكی (پازیكی یان بازیكی لە دەوروبەری وەرامین ڕۆژهەڵاتی تاران، سوننی و شیعە، كرمانجیی باكوور).

ئوسانلو (گەرمە سار و وەرامین، یارسانی و شیعە، لەكی).

زەند (باشووری ڕۆژاوای قوم، یارسانی، لەكی).

ب–فارس.

كاكەیی: (لە شیرازەوە بەرەو باكووری ڕۆژاوا، یارسانی، لەكی).

كوردشولی (بڵندییەكانی مەرە سورخی و شاری نۆ و جەهروم، یارسانی، لەكی).

ج–بلووچستان.

گۆران (بەمپوور، یارسانی و شیعە، گۆرانی و لەكی، هێزی كارن بۆ سەرهۆزەكانی یەلهانی).

زەنگەنە (بەمپوور، سوننی، كرمانجیی باشوور).

كەڵهوڕ (بڵندییە بوركانییەكانی تەفتان، یارسانی، گۆرانی،ئێستا خەریكن دەبن بەبلووچ).

یەلهانی (بەمپوور سوننی، كرمانجی باشوور، هۆزێكی بچووكن).

٤–كوردستانی ڕۆژهەڵات

(بەگشتی سوننی بە كرمانجی باشوور دوو، تاك و تەرای لێدەرچی).

گەلە هۆزی بڵباس (باشووری ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ).

مامەش.

مەنگوڕ.

ئۆجاق (ئوشاق).

پیران (گەورەهۆز).

رەمەک.

سن.

گەلە هۆزی گولباخی (ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژاوای بیجار).

چۆخە ڕەشی (یان چۆخەرەشتی).

گاملی.

جووجەرەشی.

قاڵقەنی (قاڵقاڵی).

کاکاوەند (یان کاکاسوەندی).

کاملی.

مۆراد گورانی.

پیتاوە سەری.

قومری.

سندۆڵی.

گەلەهۆزی جاف (لە جوانڕۆ وە تا سنە، بەشێکن لە جاف گەورەی کوردستانی ناوەند لە عێراق).

باشووگی.

گەلاڵی.

هاڕوونی.

ئێناخی.

ئیسماعیل عەزیزی (دەبێ ئیسماعیل عوزێری بێ – وەرگێڕ).

كەلاشی (كەلاشین).

كەماڵی.

مەندومی

میكائیلی.

قوبادی (كەوە).

روخزادی.

شاتری.

تەرخانی.

وەڵەدبەگی.

گەلەهۆزی مەندومی (باشووری ڕۆژاوای بیجار)

تاری موڕادی.

عەلیموڕادی.

لاولەرزی.

گەلەهۆزی موكری (باشووری گۆلی و ڕۆمی تا مەهاباد و دیواندەرە، ئـەم گەلـەهۆزە ئێـستا بە تەواوی شێواوە).

بەگزادە.

دێبوكری.

جاف (هی ناوچەی مەهاباد).

قاسملو.

ئەو هۆزانەی گەلەهۆزێك ناهێنن:

(گشتیان سەردەمانێك بەشێك بوون لە ئەردەڵانەكان تا ئەو كاتەی شێوان و لێكهەڵوەشان، هەموو سوننی و بە كرمانجی باشوور دەدوێن، تاك و تەرای لێدەرچێ كە لـە جێـی خۆیـدا بـاس دەكرێن).

ئەحمەدی (نزیك بانە).

ئالان (نزیك سەردەشت).

ئەردەڵان (باکووری ڕۆژاوای سنە، ئەم هۆزە تا ڕادەیەك نوێیە، و نـاوی ئـەردەڵانی دێرینی بۆ خۆی وەرگرتوە).

باوە جانی (یارسانی، گۆرانی).

بارام بەگی (لە دزڵی و شەمشەمانی نزیکی بانە دەژین).

با لەوەند (یارسانی، لەکی).

باشووکی.

باسکو لە (ڕۆژاوی سەردەشت).

بیریاهی (نزیکی سەردەشت).

بیستارە وەند.

بۆرەکەیی.

دوڕاجی.

فەیزوڵا بەگی (نزیکی بانە و تەکاب و سەقز).

گاشکی (یان کاشکی نزیکی کامیاران).

گەرگەیی.

گەورکا (یان گەورك سەردەشت تا سەقز و مەهاباد).

حەمەوەیسی.

هەیدەر بەگی (نزیکی مەریوان).

جەلالی (ڕۆژاوای سنە).

کەڵاڵی (یان گەڵاڵی، جەلالی– دەوروبەری سەقز).

کەلاسی (نزیکی سەردەشت).

کەمانگەر (نزیکی کامیاران).

کۆلی (یان گولی باکووری ڕۆژهەڵاتی سنە).

کۆماسی (نێوان مەریوان و سنە).

لەك (یارسانی، لەکی).

لوتفوڵا بەگی (نزیکی بانە).

مەریوانی (لە مەریوانەوە تا پێنجوێن).

عوسمان بەگی (باشووری مەهاباد).

قوبادی.

سورسوری.

سەرشیو.

زەند (دەووروویەری قووروە، یارسانی، لەکی).

وەڵەد بەگی.

٥ – کوردستانی باشوور.

گەلەهۆزی ئەرکەوازی.

(مەهران، بەدرە و چوار، یارسانی، لەکی).

بان سەردە (یان بانزەردە).

بانقیزا.

بی.

کەرشوەند.

کوردەل.

مەلیکشوەند.

مەیسەمی.

میر.

سوما.

مورت.

قەیتوونی (قەیتوولی؟– وەرگێڕ).

قروشوەند.

گەلەهۆزی هەورامان.

(لەناوچەی هەوارامان دەژین، یارسانی، بە دەیالەکتی هەورامی گۆرانی دەدوون).

لەهۆنی (جافەرسوڵتان).

تەختی.

بەهرام بەگی.

حەسەن سووڵتانی.

مستەفا سووڵتانی.

گەلەهۆزی ئەیڤان (ئیڤان).

نەفت شاە، نەفتخانە و مەندەلی، سوننی، کرمانجیی باشوور).

بانسەیرە.

چولاق.

گەلە هۆزی باجەڵان (باژاروان)— قەسری شیرین، خانەقین، قۆرەتوو، شێخان، دەرگەزێن (نزیکی سولەیمانی)، هۆرێن و جیزانی (یارسانی، گۆرانی) (باجەڵان لە نزیکی کەرکووك و مووسلیش هەن — وەرگێڕ).

جوموور (یان جومهوور).

قازانلو.

گەلە هۆزی بەیرانوەند (سیلاخور) دیراوەندی سەدەکانی ناوەڕاست، لە باشووری هەمەدانەوە تا ناوچەی سیلاخوڕی لوڕستان، گەلەهۆزێکی گەورە و گرانە، یارسانی و شیعە، لەکی).

ئەلاینو.

چەقەڵوەند

داشەینو

کۆماسی.

رەشڤەند (یان ڕەشوەند).

زەند.

گەلەهۆزی گۆران(لە کرمانشاوە بۆ پاوە (یارسانی، گۆرانی).

بیبیان.

بیاوەنیج.

دانیالی.

گەوارە (گەهوارە).

حەیدەری.

نیرژی.

قەڵخانی بەهرامی (خاڵكان).

قەڵخانی سپەری (خاڵكان).

شەبەنكارە (شوپانكارە).

توفەنگچی.

یاسەمی.

گەلەهۆزی هۆلەیلان(ڕۆژاوای كرمانشاه، دەووروبەری سونتور، یارسانی، لەكی).

باڵەوەند.

جەلالەوەند.

عوسمانەوەند.

تارهان.

زەردەلآن.

گەلەهۆزی جومیر(جوموور، جومهوور) (باشووری هەمەدان، یارسانی، لەك).

عەبداڵی.

بەرازی.

گۆمە.

شاهوەیسی.

گەلەهۆزی كەڵهوڕ(لە خانەقینەوە بۆ كرمانشاه، لەوانەیە لەم دەمەدا گەورەترین گەلـەهۆزی كوربن، یارسانین، زۆرترین بە گۆرانی و هەندێكیشیان بە كرمانجی باشوور دەدوون):

ئەبولمحەمەدی

عەلیرە زاوەند

ئەڵوەندی

بەرگە شەیبانی.

بوداغ بەگی

چیلائی

فەڕووخی

گەلەدار

هارون ئابادی

جلەوگیر

کەلەپا

کەللەجوب

کەمەر

کەرەم پەناه

کازم خانی

کەرگا

خالیدی

خۆمان

کریبان

مەنسووری

مایدەشتی (ماهیدەشتی)

میرعەزیزی

موئمینی

موغیرە

موشگیر

پاپیران

قولامی

قومچی

رەجەب

رەمەزانی

ڕیزاوەند.

ڕووتۆەند.

سەیدنازە.

سەبیادە.

سالکە

شاهینی.

شەبیانی

شیرزادی.

شوانکارە (شوان).

سیاسیا.

تەلەش (تالیش).

زەینەڵخانی.

گەلەهۆزی خیزر (قیزیل یان قەزئەل).

(مەندەلی و سۆمار، یارسانی، لەکی).

خیزروەند.

مورشیدوەند.

قولیوەند.

شەمسیوەند.

گەلەهۆزی پەهلە (فەیلی).

(پەڵە پەڵە لەباقووبەوە تا لوڕستان، یارسانی وشیعە، لەکی).

باپیروەند.

براسپی.

چایدەروەند.

دوستەلیوەند.

گۆران.

هەیوەری.

جابیروەند.

جوگی.

کالکوە.

خیزروەند.

کۆلیوەند.

مامسیوەند

مەمی.

مەمووس.

مارال

مراوەرزی

مورادخانی.

نەورۆزوەند.

پاپی

شەکەر بەگی

شەرەکە.

سولەیمان خانی.

زەرگووش.

گەلـەهۆزی قـەڵخانی (خـەلکان) (بـاکووری ڕۆژاوای کرمانـشا و دەوروویـەری کـوزاران، دەچنەوەسەر خەلکانەکان، یارسانی، گۆرانی).

ئایینەوەند.

بەچەحاڵی.

باراولی (بارووەلی).

بیریزابادی.

دەنگی.

دیوەکە.

مەلگی (مەلیکی).

نەجەفی.

پشتماڵە.

قەلزنجیری (قولوزەنجیری).

قەری.

قەرکە.

روستەم.

سەبزە.

سەرلوارە.

ویستاڵی.

گەلەهۆزی قەرەوڵوسی (لەمەندەلییەوە بۆ تەنگی سۆمار، سوننی، کرمانجیی باشوور).

چەرمەوەند.

گاوسواری.

گێژ.

قەیتوون.

کاکەوەند.

نەفتچی.

گەلەهۆزی سەلاس (لە ڕۆژئاوای کرمانشاوە بۆ کەرەند. سوننی، کرمانجی باشوور، لە سێ گەلەهۆزی بچووکتر پێکهاتووە).

١–بابەجانی.

بەگزادە.

زەمکانی.

٢-قوبادی.

بازانی.

بەگزادە.

میرەکی.

تەختە.

تەنگی ئیژدەها.

زیلانی.

٢-وەڵەدبەگی (وەڵەدبێگی).

عەلیاغایی.

دەروێش.

دیلاژێری.

دورویی.

**کالەکا**

خاڵوان (ئایانزیکن لە خەلکان؟).

رەشید.

گەلەهۆزی سەنجابی (لە پاوەوە بۆ ماییدەشت، یارسانی، گۆرانی).

عەباسوەند.

عەلیوەند.

ئەللاهیارخانی (ئیلاهیخانی).

باغی.

باوان (باوەند).

چەلاوی (چالابی).

داتازا.

دەوڵەتمەند.

دارخوار.

حەقنەزەرخانی.

جەلاوەند (جەلالوەند).

كەلالەوەند (كەلالوەند).

كاكا.

خوسرەوی.

كۆلكۆڵ.

نەزكەتەرگە.

سیمینوەند.

سوفی.

سورخەكی.

سورخەوەند.

گەلەهۆزی شەرەفبەیانی (لە چیاكانی شیوالدر و ڕووباری سیروانەوە بۆ شەیخان).

كورەكی.

ئەمیرخان بەگی.

عەزیز بەگی.

گەخاری.

نادری.

گەلەهۆزی سوارەمیری (خانەقین، شەهرەبان، و ئەبوجسرە، یارسانی، لەكی و كرمانجیی باشوور).

كەڵهوڕ.

توتیك.

مەمەكان (یان مەمەجان).

ئینانتیر.

گەلەهۆزی تیرکەشوەند (لە ئەسەدابادەوە بۆ هەمەدان و توسیرکان، یارسانی، لەکی)[2].

عەلیجانی.

عەلیمورشید.

رەحمەتی.

سولەیمانی.

زەند.

گەلەهۆزی زەند (باشوور و باکووری ڕۆژاوای هەمەدان، یارسانی و شیعە، لەکی).

عەلیان.

مەمەد.

کانی.

سالح ئاغا.

تاهیر خانی.

هەندێ هۆز کە بەش نین لە هیچ لە هۆزێك:

بابانی (یان بەبانی، هۆزێکی بچووکن، لە خانەقین و باکووری کەرکووك نیشتەجێن، سوننی، کرمانجیی باشوور).

بانزەردە (باکووری سەرپولی زەهاو. یارسانی، گورانی و کرمانجی باشوور).

باوەند (دینەوەر و شاەئاباد، یارسانی، گورانی).

دنیاروەند (دێهلوڕان، چیاکانی دالّپەری و دینار. یارسانی و شیعە، لەکی).

دوون (یان دووم، دەوروویەری دینەوەر و قەندوڵە، یارسانی، گورانی) (دۆم؟—وەرگێڕ).

گەشکی (باکووری کرمانشا، سوننی، کرمانجیی باشوور).

ئیمامی (جاران بەشێك بوون لە جاف، سوننی، کرمانجیی باشوور).

عیراقی (جاران بەشێك بوون لە جاف— سوننی، کرمانجیی باشوور).

جوانرۆیی (جاران بەشێك بوون لە جاف. سوننی، کرمانجیی باشوور).

قاید (موسیان و دیهلوڕان، سوننی، کرمانجیی باشوور).

---

[2] لە ناوچەی لەیلان سەربە پارێزگای کەرکووك ناوایی یەك هەیە ناوی "ترکەشکان"ـەوەرگێڕ.

قایخوردە (دەوروبەری دیهلوڕان– سوننی، كرمانجیی باشوور).

كرند– كرێند (دەوروبەری شاری كرند، سوننی، كرمانجی باشوور).

كولیایی (نیوان سونگوڕ و قوروە، سوننی، كرمانجی باشوور).

مافی (ڕۆژهەلاتی كرمانشاە– یارسانی و شیعە، لەكی).

ئوسانلو (بەشێكن لە ئوسیوەند؟ یارسانی، لەكی).

پایرەوەند (كرمانشاە، سوننی، كرمانجی).

وەرژاوەند (نێوان سەحنە و كەنگەوەر، یارسانی، لەكی).

زەنگەنە (باشووری ڕۆژاوای كرمانشاە، یارسانی، گورانی و كرمانجی باشوور).

زەردەلان (یان باڵەوەند، یارسانی، لەكی

زولە (باكووری ڕۆژاوی كرمانشاە، سوننی، كرمانجی باشوور).

٦–كوردستانی ناوەند.

(هەمەوەندیان لێدەرچێ، زۆربەی هۆزەكانی كوردستانی ناوەند دەچنەوە سەر گەلەهۆزی گەورەی بابان– باوەندی سەدەكانی ناوەند– تا ئەو كاتەی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا هەڵتەكا. هەموو سوننی بەزاراوەی كرمانجی باشوور دوون، تاك و تەرایانی لێدەرچێ كە لە جێی خۆیدا باس دەكرێن).

گەلەهۆزی دەلۆ (وردە گەلەهۆزن. لە چیاكانی خوشەوە تا سەرقەلا و خانەقین دەگرنەوە).

گەش.

چەمرێزی.

كارێز.

پەنجا نگوشی.

سەلیم وەیسی.

تەركەوەند.

گەلەهۆزی دزەئیی (دزەیی).

(زۆر بە هەژەڵن. لە هەولێرەوە تا سەر ڕووباری دیجلە دەگرنەوە).

گوندۆڵە (یان گونتوڵە).

مامەن.

پیران.

گەلەهۆزی هەمەوەند

(گەلـەهۆزێکی گەورەیـە، لـە چەمـچەماڵەوە تـا ڕوویـاری سـیروان، هـەروەها لەناوچـەی بازیانیش دادەنیشن، یارسانی، گۆرانی)[3].

بەگزادە.

چنگنی.

کافرۆشی.

مامەند.

پیریائی (پیریادی؟– وەرگێڕ).

ڕەمەوەند.

ڕەشەوەند.

سەفەرەوەند.

شیتە بێسەر (سێتە بەسەر–وەرگێڕ).

سۆفیەوەند.

گەلەهۆزی جاف (گەلەهۆزێکی زۆر گەورەیە، لە سولەیمانیەوە بـۆ کـەلار و بـۆ هەڵەبجـە، و لـەوێوە بـە پەڵەپەڵـەی گـەورە لـە کوردسـتانی باشـوور و ڕۆژهەڵاتیـشدا نیـشتەجێن، سـوننی، کرمانجی باشوور).

ئەمەلە (عەمەلە).

بادغی (؟).

باسیری.

باشکی.

---

[3] هەمەوەندەکانی چەمچەماڵ و بازیان مسوڵمانی سونین- وەرگێڕ.

هارپوونی.

عیسایی.

ئیسماعیل عوزێری.

جەلالی (یان گەلاڵە).

جاوانروودی (جوانرۆودی).

کەماڵی.

میکایلی.

موورادی.

ناورۆڵی.

پشتماڵە.

رەشوباری.

روغائی (روغزایی–وەرگێڕ).

سەدەنی.

سەفیوەند.

شاتری.

ئێخ ئیسماعیلی.

تەرخانی.

تاوگۆزی.

یەزدانبەخش.

یارومیسی.

یوسفجانی.

گەلەهۆزی کیزە (یان کەزە)– (گەلەهۆزێکی بچووکن لە سکی کیفیر (ئاسکی کفری؟– وەرگێڕ) تا چنچاڵدان (شیوی چنچاڵ؟– وەرگێڕ) نیشتە جێن.

سەندوڵەبەگی.

کوێخا بارام.

سەرقەڵا.

گەلەهۆزی شوان (شیوان)[4].

(گەلەهۆزێکی گەورەیە، لە باکووری کەرکووک نێوان ڕووباری خاسە و زێ نیشتەجێن).

بازیانی.

خاسە.

گەلەهۆزی زەند (لە کفرییەوە بۆ ڕووباری سیروان. یارسانی، لەکی).

عەلیان (ئەلیان).

غەنی (قینی).

مام ساڵح.

تایەرخانی.

ئەو هۆزانەی سەر بە گەلەهۆزنین.

ئاکۆ (گەورەیە لە دەورووبەری ڕانیە نیشتەجێن).

هەمەوەندەکانی چەمچەماڵ و بازیان مسوڵمانی سوننین– وەرگێڕ.

بابان (یان بابانی هۆزێکی بچووکە، لە باکووری کەرکووک و خانەقین نیشتەجێن).

بەڵیکان (یان باڵێک، باڵیکیان، گەورەیە، لەنێوان ڕەواندزو ڕایات لە بڵندیەکانی ڕایات نیشتەجێن).

بەرزنجی (یان بیرزینجی، هوزیکی گەورەیە، خانەقین، هەندێکیان یارسانین).

بەیاتی (لە دووزخورماتووەوە بۆ کفری) (ئەوەی زانراوە بەیاتەکان تورکمانن– وەرگێڕ).

بزێنی (یان شێخ بزەینی لە هەولێرەوە بۆ کەرکووک).

بۆلێ (بچووکن، خوارووی باڵەك).

چگنی (باکووری سولەیمانی).

دومبولی (دونبێلی شێخان).

داودی (یان داودە، گەورەیە، لە تاوغ و کفریەوە بۆ دووزخورماتوو).

گاخۆر (قەرەتەپە).

---

[4] (ئەوەی زانراوە هۆزی شوان لە دووبەشی کێشك و خاسەپێك دێن-وەرگێڕ).

گیردی (باكووری هەولێر و كۆیسەنجەق)(مەبەسەتی هۆزی گەردییە—وەرگێڕ)

هۆمەرمل (لەسەر قەڵاوە بۆ قۆچەچیان).

جەباری (یان جەبزاری. ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتی كەركوك تا چەمچەماڵ و لەیلان).

كاكـەیی (لـە كەركوكـەوە بـۆ دووزخورمـاتوو، پارسـانی)(كاكەییيـەكان گـۆرانیی دوون—وەرگێڕ)

خەلكان (یان خەلهانی (باكووری چیاكانی باڵەك و باكووری ڕۆژهەلاتی هەولێر).

خۆشناو (زۆر گەورەیە، دەورووبەری شەقلاوە).

كورە (كۆڕێ؟— وەرگێڕ) (هەولێر— شەقلاوە).

لەیلانی (لەیلان).

پەڵهانی (پالانی؟— وەرگێڕ) (زەناباد— قەرەتەپە).

پژدەر (یان پشدەر دەورووبەری قەلادزێ).

ساڵحی (نێوان كـەركوك و قەرەحەسـەن، هـەروەها لـە دیمەشـقی سـوریا، (ئـەی سـاڵەیی نێوان كەركوك و پردی— ئاڵتوون كۆپری؟— وەرگێڕ).

شێروان (باكووری ڕەواندز).

سیان (باكووری كەركوك).

سورچی (زۆر گەورەیە، لەناوەڕاستی زێی گەورەوە تا ڕەواندز).

تاڵەبانی (گەورەیە، پەڵەپەڵە لە باشووری ڕۆژهەلاتی كەركوك و باكووری ڕۆژهەلاتی كەلار).

تاڵشانی (یان تەلشانی لە ئاسكی كفرییەوە بۆ زەرداو).

زەنگنە (بەشێكن لـە زەنگنـەی كوردسـتانی باشـوور، لـە كفرییـەوە بـۆ كـەلار، پارسـانی، گۆرانی و كرمانجیی باشوور).

زراری (باكووری بەستۆرەچای).

زوودی (ناوچەی ڕەواندز).

٧—كوردستانی باكوور.

(گشتیان سوننی بە زاراوەی كرمانجیی باكوور دوون مەگەر جۆرێكی دیكە بـوترێ. زۆربـەی

ئەو هۆزە ڕۆژاواییيانە لە تورکیا دەژین، پاشگری لی/لوویان خستە سەر ناوی هۆزەکانیان، لەجیاتی کان/ئان، یان ڤان/ ڤەند/ وەند.

هەندێ جاریش پاشگرە تورکییەکە خراوەتە سەر پاشگرە کوردیەکەش، ئەم شتە لێرەدا ڕەچاو نەکراوە تەنها کان/ ئان خراوەتە سەر ناوەکان(٭).

گەلەهۆی ئەرتووش (یان هەرتووشی یان هەر تووش، زۆر گەورەیە، لە باشووری گۆلی وانەوە تا زاخۆ و دهۆك دەگرێتەوە)

ئالان.

ئەز دینان.

گاڤدان.

گراڤیان.

هەڤیشتان.

هولەیلان (یان هەلیلان).

مام خۆران.

قەشووران.

پیران.

شەرەفان.

شیدان.

زەوکان.

ژێریکی.

زەیدان.

گەلەهۆزی بارزانی (لەسەر ڕۆخەکانی ژووپووی زێی گەورەوە تا ڕۆژاوای هەکاری).

بارووشی.

دۆلەمەیری.

مزوری (لە گەلەهۆزی مزوری ڕۆژاوای کوردستان جیا بوونەتەوە).

نێروە.

رەیكانی.

شێروانی.

گەلەهۆزی بوهتان(بۆتان) (لەسەر هەردوو ڕۆخی ڕووباری بوهتان، باشووری گۆلی وان ئەمیش گەلەهۆزێکی گەورە و گرانی وەکو بابانەکان و ئەردەلانەکان بوو بەر لەوەی هەرسیّ لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەناویچن).

شیرناك.

تیان.

گەلەهۆزی هەرکی (یان هێرکی، زۆر گەورەیە، لە شنۆوە بۆ هەکاری و ڕەواندز، بە جلوبەرگی جوان و بابەتی خۆ ڕازاندنەوە بەناویانگن).

مەندان.

سەرحەددی (سیحەتتی).

سەیدان (زەیدان).

گەلەهۆزی جەلالی (یان جێلالی، لە ماکۆوە بۆ بایەزید و قارس، لەگەلّ جەلاوندەکانی کوردستانی باشوور و جیلۆکانی باشووری زاگرۆسی بەر لە سەردەمی ئیسلامدا خزمن).

عەلیموحاولو (عەلیمو حەممەدلو).

بەلیکان.

حەسۆ خەلەف.

جەنیکانلو.

خەلکان (خەلیکان، سەردارەکانی جەلالیان زۆرتر لەم هۆزەن).

میسریکان.

ئوتابلو.

قادیکان.

قیزیلباش.

ساکان (سەکان).

گەلەهۆزی جیبران (گیبران، گەوران) (باکووری ڕۆژهەلاتی بینگۆل، لەوانەیە ناوەکە

پەیوەندی بە گۆڕانەوە هەبێ).

عەلیکی.

ئاغا.

ئەزدینانی.

مەمەکان (مەمەگان).

موخیل.

شەیخەکان.

شادەری.

تورینی.

گەلەهۆزی میلان (باکووری ڕۆژاوای گۆلی وەرمێ، لە سەلمەسەوە بۆ خۆی، ئەمە بەشێکی دیاری گەلەهۆزی میلانی یان ملی کوردستانی ڕۆژاوایە، عەلەوین).

دیلمەکان (دیمیلەکان).

دۆلان (دلیان).

دودەکان.

خەلکان.

مەمەکان (مامەکان).

مەندولەکان.

سارمان.

شەیخەکان.

گەلەهۆزی پنییان (یان پنییانیشلی. باکووری هەرێمی هەکاری، گوایە (٥٠٠٠)یان کوردی مەسیحی بوونە لە سەرەتای سەدەی (٢٠)دا، ئێستا نازانرێ چەندیان بەمەسیحیەتی ماونەتەوە).

بەرکۆشان.

بیلیجان (بەلیکان).

گەلەهۆزی شکاک (ڕەوەند) (لە ناوچەی دوستان و قوتور، لە باکووری گۆلی وانەوە تا

گۆلی وەرمێ، كۆنە ناوەكەیان كە شاە كاك بووە، دەیانباتەوە سەر كاكەییەكانی كوردستانی ناوەند و كاكۆییەكانی باشووری هەرێمی زاگرۆس).

عەیداوی (عەبدۆیی؟ — وەرگێڕ).

بوهتان.

داری.

دۆلان.

ئێڤاری.

فەنەك.

گوریك.

هۆنەرە.

كاركار.

خەڵەف.

خدری.

موەقەری.

نەعمەتی.

نیسان.

ئۆتەمانی.

پەچیك.

پاس ئاغا.

شاپیرانی (دیلمەقانی).

شوكری.

گەلەهۆزی سپیكان (یان سیپیكان. باكووری ڕۆژاوای گۆلی وان. بە هەژەڵن بەلام بە هۆز. كەم ژمارەن).

مەمەكان.

سپیكان.

ئەو هۆزانەی سەر بە گەلەهۆزنین.

ئادیامان (باکووری بایەزید).

بەرادۆست (گەورەیە. لە ڕەواندزەوە تا هەکاری).

باض لە چوکورجەوە تا ئورامان، ناوەکەیان دەچێتەوە سەر هۆزی دێرینی باض یان بەض).

بزەینێ (ڕۆژاوای ئەرزەرۆم و باکووری ئاگری، ئەمانیش ناوەکەیان دەچێتەوە سەر هۆزی دیرینی باض یان بەض).

بەگزادە (ڕۆژاوای ورمێ).

بروکان (باکووری ڕۆژهەلاتی وان و ڕۆژاوای خۆی).

دۆسکی (گەورەیە. باکووری دهۆك و لە هەکاریش هەن).

گیردی (باکووری ئاگری).

گۆیان (باکووری ئولۆدەرە).

هەلاجی (باشووری ڕۆژهەلاتی بتلیس).

حەمدیکان (زۆر گەورەیە. لەناوچەکانی مەلازگیرت، خونیس و وارتو نیشتەجێن).

هەسەنان هوزێکی زۆر گەورەیە لە ناوچەکانی مەلازگرد خونیس و وارتو نیشتەجین.

هەواتان (باشووری ڕۆژهەلاتی بتلیس).

حەیدەرانلو (باکووری شاری جزیرە)

هەیرونی (باکووری ڕۆژاوای شاری جزیرە)

کاکا (یان کەکا. هەکاری).

خەیلانی (نزیکی ڕەواندن).

خانیان (یان خانێ. هۆزی ئەحمەدی خانێی شاعیرە).

کوراسونی (یان کوریشانی. باکووری ڕۆژاوای خۆی).

مەنوران (باشووری ئاگری).

مەماکان یان مەمەکان ڕۆژاوای خۆی

میران (ڕۆژهەلاتی بتلیس).

نوشییان (یان نوچییان، هەكاری).

ئۆرامار (هەكاری).

پازیكی (یان بازیكی یان پازوكی. باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەرزەرۆم).

ڕەشوەند (یان ڕەشوەن. باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەرزەرۆم).

ڕواندۆك (یان ڕەواندوز لە هەكاری).

شەمسیكی (ڕۆژهەڵاتی وان).

سندی (باكووری زاخۆ).

سلوپی (یان سیلوپی، ڕۆژهەڵاتی شاری جزیرە).

سورچی (باكووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر و نزیكی ئاكرێ).

تاكوولی (ڕۆژئاوای وان).

زەرزا (دەورووبەری شنۆ، زۆرتر بە زاراوەی دیمیلی دەدوێن).

زێباری (گەورەیە، دەورووبەری ناوەڕاستی زێی گەورە).

٨–كوردستانی ڕۆژئاوا

(زۆربەی هۆزەكانی ڕۆژئاوا كە لە توركیا دەژین، لی/ لوی توركییان لەباتی (ان یان ڤەن/ڤەند/وەندی كوردی خستۆتە سەر ناوەكانی خۆیان. زۆرجار ئەم پاشناوانە خراونەتە سەر پاشناوە كوردیەكان، ئێستا ئەم بەزمە گۆڕاوە و لێرەدا تەنها تا ن (ان) دراوە).

گەلەهۆزی بەراز (لە سەمساتەوە بۆ عێنتەب و مەراش و حەڵەب، عەلەوی و هەندێكیان سونین، كرمانجیی باكوور).

عەلیدینلی.

دیدان.

دینان.

قەرەقیچان.

قەیتكان.

مەعافان.

میر.

ئۆقیان.

پیجان.

شەددا دان (یان شەددا د).

شێخان.

زەروان.

گەلەهۆزی بەرواری (لە عەمادیەوە بۆ ئولۆدەوە).

بەرواری بالا.

بەرواری ژێر.

گەلـەهۆزی چـاوەڕەش (لـە بـاکوور و ڕۆژاوای بـاکووری ئادیـەمان. عەلـەوی، دیمیلـی و کرمانجیی باکوور).

بریمسان.

تاشیك.

زیراواکان (یان زیرۆسکان).

گەلەهۆزی دەرسیملی (دیلەمان).

(لە ئەرزنجانەوە بۆ دەرسیم و ئەلازیگ. عەلەوی، دیمیلی دوو).

عەباسان.

بەختیاری.

بەلە ئوشاغی (یان ئوشاق یان ئوجاق، باکووری ڕۆژهەلاتی دەرسیم).

فەرهاد ئوشاغی (یان ئوشاق یان ئوجاق، ڕۆژهەلاتی دەرسیم).

گۆران (یان گەوران).

کەرەبار.

کۆچمەن (یان کیچیر. قەرەجن).

کوزلیچان.

لاچین.

میلان.

میرزان.

شەبەك (یان شەوەك).

نۆشاق (یان نۆجاغ).

گەلـەهۆزی هـەڤیركا (یـان هـەویرکا، لەناوچـەی تورعابـدین و مـاردین. سـوننی کرمـانجی باکوور).

عەلیان.

داسیکان.

گیرگیر.

مەحەلیمی (مەهەلیمی).

میزیداغ.

میزیزاخ.

مۆمان.

گەلەهۆزی قۆچگیری (زۆر گەورەیە، ڕۆژاوای ڕووبـاری فـورات و بـەرەو سـیواس. عەلـەوی، دیمیلی).

بەرلان.

گەراوان (گەراوەند).

ئیبان.

سەران.

گەلەهۆزی قورێش (ڕۆژهەلات و بـاکووری ڕۆژهەلاتـی ئـەرزنجان بـەرەو ئـەرزەرۆم. عەلـەوی، کرمانجی باکوور).

بارل.

بالابران.

شادر.

گەلـەهۆزی مـیلان (ملـی) (لـە فوراتـەوە بـۆ مـاردین و چیای سـنجار، سـوننی. کرمـانجی

باکوور).

عەلیا

بارگوهان

بێسکی (یان سالارگان)

بوجاغ (یان بوچاق).

چەقەڵی.

چامیکان.

چیارەش.

دەنان.

داشی.

دەرەژان.

حاجی بایرام.

هوشییان.

عیسی عادەت.

ئیزۆلی.

جانبەکی.

قەلاندیلان.

کەسیانی.

کەوات.

کەلیش.

خەلکان (یان خەلەجان).

کۆمارەش.

مەندان.

مەرد.

مەتمیا.

مانلی.

مەشكان.

نەسریان.

پۆرغا.

سەرتان.

شەركان.

شوان (یان شیوان).

تیركان.

زەیدان.

زرافكان. لەوە

گەلەهۆزی مۆتیكان (مۆدكی یان مۆتی).

(لە بینگۆلەوە تا نزیكی دیاریەكر، جاران برپرەی گەلەهۆزی چەمیشگە زەك بوو، سوننی، دیمیلی دوون، ناوەكەیان ئەشێ بیانباتەوە سەر میدیەكان).

ئەریكی.

بۆبان (یان بابان).

قەیبوران.

كوسان.

پیرمووسی.

روشابە.

زەیدان.

گەلەهۆزی سیلڤان (یان سلیڤان، لە جزیرە بۆ زاخۆ و دهۆك، سوننی، كرمانجی باكوور).

دو دواتە.

كولی.

سەیدەهر.

سینا (یان سینان).

سندی.

گەلەهۆزی یەزیدی (بەش بەش لە مووسڵەوە تا ئەنتیۆش (ئەنتاکیە) پووری گەورەیان لە هەرێمی چیای سنجارە، لەناو ئەو هۆزانەدا کە بە کرمانجی باکوور دەئاخاون، ئەم گەلەهۆزە زیاتر هاوپەیمانییەکی ئایینی پێکدێنن، ئەندامەکانی ئەم هاوپەیمانیە یەزیدیەتی زیاتر لە پەیوەندی هاوپەیمانی ناو هۆزی پێکەوە لکاندوونی، هەموو ملکەچی بنەماڵەی میرزادەی چۆلین، کە لە هەمان کاتدا رۆڵی رابەری ئایینیاشیان لە ئەستۆدایە).

ئالییان.

ئنیدی (دانەدی).

بەلەد.

داسنی (یان دەسنائی).

دەسیکان.

دۆرکان.

خالیتی.

مەندیکان (مەندوکیانی ناو سەرچاوە ئەرمەنیەکانی سەدەکانی ناوەند).

ساموگا (سموقی وەرگێر).

ساشیلی.

ئەو هۆزانەی سەر بەهیچ گەلەهۆزێك نین (هەموو سوننی، بە کرمانجیی باکوور دوون، ئەوانەی لێدەرچێ کە لە شوێنی خۆیدا باس دەکرێن).

عەلیکان (باشووری رۆژاوای ئەلازیك تا دیاربەکر. عەلەوی، کرمانجی باکوور).

ئەشیتا (ناوچەی جەزیرەی سوریا).

ئەتمانیکان (زۆر گەورەیە. پەڵەپەڵە لە دیاربەکرەوە تا هەکاری).

بەرەکەت (باشووری عێنتەب).

بەلیکان (زۆر گەورەیە. باکووری بینگۆل و باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی عێنتەب، ئەوانەی بینگۆل عەلەوین و بە زاراوەی دیمیلی دەئاخاون و ئەوانەی عێنتەب بە کرمانجی دەدوون).

بەشنی (ئادیەمان و دەورووبەری).

دەخۆری (باشووری ڕۆژاوای دیاربەكر تا عاموودە لە سوریا.)

دەلیكان (ڕۆژاوا و باكووری ڕۆژاوای حەلەب، هەندێكیان عەلەوین).

دیریجان (باكووری ڕۆژاوای مەلاتیە. عەلەوی، كرمانجی باكوور و دیمیلی).

دوودەری (باكووری ڕۆژهەڵاتی ماردین).

دومبولی (دونبەلی چیای سنجار. دیمیلی).

گابارا (دەورووبەری عامووده لە سوریا).

گۆیان (گەورەیە. لە كیلابانی باكووری سلوپی دەژین، هەندێكیان بە دیمیلی دەئاخاوەن).

گولی (یان گلی، گیلی، لە زاخۆوە بۆ ڕووباری فیشخابوور).

هەوێركا (ناوچەی جزیرەی سوریا).

ئیزۆلی (لە ئادیەمانەوە بۆ ئۆرفە).

جەلیكان (یان جەلیلكان لە باشووری ئادیەمانەوە بۆ عێنتەب).

جانبەگی (لە ئادیەمانەوە بۆ سیوەرەك).

گەرەگیچ (یان قەرەگیچ. گەورەن. لە سیوەرەكەوە بۆ دیاربەكر، پەڵەپەڵەشیان لە تورعابدین هەیە. عەلەوین و بە دیمیلی دەئاخاون).

خدرسور (باكووری ڕۆژاوای ئادیەمان. عەلەوی كرمانجی باكوور).

كیكی (لە باشووری عێنتەبەوە بۆ حەڵەب).

كۆتی (باشووری ڕۆژهەڵاتی مەلاتیە).

كۆوا (یان كاو یان كۆڤانلو، ڕۆژهەڵاتی ئادیەمان. عەلەوی، كرمانجی باكوور).

لەك كوردی (دەورووبەری ڕووباری جەیحان، ڕۆژهەڵات و باكووری ڕۆژهەڵاتی ئەدەنە. عەلەوین. هەندێكیان بە لەكی و هەندێكیان بە كرمانجی دەدوون، مەلیكان (ڕۆژهەڵاتی مەلاتیە).

مەندوكان (یان مەندیكان، تەل عەفەر، بە كرمانجی باكوور دەدوێن، نیمچە یەزیدین، لە زۆر جێگای ناو مێژووی كۆنی ئەرمەنیاندا وا باس كراون كە بنەماڵەی ئەریستۆكراتی مەندوكانیانی ئەرمەنی دەچنەوە سەر ئەم هۆزە).

مەرداس (یان ماردیس لە نارنجەوەتا ڕووباری فورات. سوننی، كرمانجی باكوور).

میران (گەورە، جزیرە).

میرسینان، (باشووری دیاربەکر)

مزوری (گەورەیە، دهۆك).

پازیکی (یان مازیکی، دەورووبەری سمساط، عەلەوی، کرمانجی باکوور).

پشنیك (باکووری ڕۆژاوای ئادیەمان. عەلەوی، کرمانجی باکوور).

پورقا (یان پورکا) (باشووری مەلاتیە. عەلەوی، بە دیمیلی و بە کرمانجی باکووریش دەئاخاوِن).

شەبەك (یان شەڤەك، باکووری ئەلازیگ بەرەو دەرسیم و بینگۆل، عەلەوی، دیمیلی).

شوەیش (دەورووبەری ئامووداا لە سوریا).

سینامینی (یان سینان، زۆر گەورەیە، باشوور و باکووری ڕۆژاوای مەلاتیە و باکووری عەینتەب عەلەوی، لەکی).

سندی (گەورەیە. نێوان زاخۆ و ڕووباری فیشخابوور).

تیریکان (باکووری ڕۆژهەلاتی دیاربەکر).

زەیدان (ڕۆژهەلاتی بینگۆل و، باکووری موس. بەشێکن لە گەلەهۆزی دێرینی ڕۆژەکی کە لە سەدەی (١٩)دا هەڵتەکان).

**٩–بەشی دابڕاوی ئەنەتۆلیا**

(هەموو سوننین و بە کرمانجی باکوور دەدوێن، مەگەر بەجۆرێکی تر باس بکرێن).

أ–بەری باشوور

بزەینی (ڕوژهەلاتی توززگوێلو)

جانبەکی (زۆر گەورەیە، نیوەی ڕۆژاوای وڵاتەکە لە یۆناکەوە تا پولاتلی).

جودیکان (باکووری توززگوێلو).

خەلکان (دەورووبەری جیهانبەیلی).

مۆتکی (باشووری ڕۆژهەلاتی گۆلی توززگوێلو. سوننی، دیمیلی).

ناسرلی (دەورووبەری شاری بالا).

سینامینلی (سینان) (ڕۆژهەلاتی توززگوێلو. عەلەوی، دیمیلی).

سەیفكانی (دەوروبەری شاری هەیمانە).

ب—بەری باكوور.

ئەتمانیكان (باكووری ڕۆژهەڵاتی ئەنقەرە).

بەدەلی (باشوور و باشووری ڕۆژئاوای یوزغات).

بەرەكەت (باكووری نەوشەهر بە قیزیل ئیرمەقدا).

بـزەینی (بـاكووری ڕۆژئاوای چـوروم و ڕۆژئاوا و بـاكووری ڕۆژئاوای قیرشـەهر بـە قیزیـل ئیرمەقدا).

حاجیبانی (یان هەضەبانی، باكووری قەیسەری بە قیزیل ئیرمەقدا).

خاتون ئۆغڵی (باشووری یوزغات).

مەخانی (ڤیرشەهر و دەوروبەری میلان یان میللی، باكووری چوروم).

شەڤەلی (ڕۆژئاوای چوروم بەقیزیل ئیرمەقدا).

تیریكان (ڕۆژئاوای ئەنقەرە و باشووری جانكیری)

ئۆخچیجەمی (باكووری ڕۆژئاوای سیواس).

عومرانلی (یان عەمەرلو، قیرشەهر).

ئورووقچی (زۆر گەورەیە، لە تۆقاتەوە بۆ ئەماسیا و یوزغات).

زیریكان (باشووری ڕۆژهەڵاتی جانكیری و ڕۆژئاوای سامسۆن).

# کۆچکردنە مێژووییەکان

ئەگەر بمانەوێ سەرلەنوێ بە وردی مێژووی کورد دابڕێژینەوە، تاقە ڕێگامان ئەوەیە لەگەڵ شێوە مێژوویییەکانی کۆچکردنە بە کۆمەڵەکانی کورداندا ئاشنایی تەواو دروست بکەین. زۆر کەمیی زانیاری لەسەر گواستنەوەکاری دانیشتووان و کەمتەرخەمی لە کۆڵینەوە بە دوایدا، هەروەها پەیوەندی ئەم گواستنەوە کارییانە لەگەڵ ڕووداوە مێژوویی و سیاسیەکانی ناو کوردستاندا، بەڕاستی جێی سەرسووڕمانە مەگەر مەسەلەی نەبوونی زانیاری لەم بارەیەوە ببێتە پاساو. پشتگوێ خستنی ئەم ڕووداوە مێژوویییانە بۆتە هۆی سەرسووڕمانی زۆربەی نووسەرەکانی ئەم دەمە لە بارەی هەندێ مەسەلەی وەکو ناسنامەی نەتەوەیی کورد، بەشداری کردنی کورد و ڕۆڵی لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و ئاڵۆزکاویەتی پێکهاتەی ئایینی و زمانی و ڕەگەزایەتی ئێستاکەیانەوە. بۆ نموونە، ئەو قەڵاتە کارو بایەخەی لە بارەی گواستنەوەکاریە کۆنەکانی گەلانی تورك زمانەوە هەڵچنراوە پەردەیان لە ڕووی کۆمەڵێکی زۆری ڕووداوی مێژووی سەرسووڕێنەر لە بارەی ئەم گەلانەوە هەڵماڵیوە. ئەگەر بهاتایە وا هەمان شێوە و ئاستی نرخ و بایەخ بە گواستنەوەکاریە جۆراوجۆرەکانی کوردانیش بدرایە، ئەوا گەلێ پرسی وەکو جیهان نەمای ئەو چەند سەدەیەی کە دەکەونە نێوان هاتنی ئیسلامەکانەوە لە سەدەی حەوتەمدا و کاردانەوەی کرانەوەی دەرگا لەبەردەم هەڕکردنی تورکان بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەدەی (١٢)دا وەڵام دەدرانەوە. زانیاری مێژوویی پێویست لە بارەی پێکهاتەی هاوچەرخ و بەر لە هاوچەرخی هۆز و گەلە هۆزە کوردەکان لەو بەشانەی ئەم کتێبەدا دراون کە باسی مێژووی کۆن و ناوەڕاست و سەرەتای هاوچەرخ و بارپێکردن و بە زۆر جێگیرکردن و هۆزەکان دەکەن.

لە مێژووی کوردستاندا، دوو شێوەی کۆچکردن بەدی دەکرێن و دەشکرێن بە بەردەبازی متمانەپێکراو: دەرەکی و ناوەکی، لەناو کۆچکردنە دەرەکییە هەرە گرنگەکاندا دەبێ لای گیرسانەوەی هۆزە ئارییەکان لە کوردستان لە کۆتایی سەردەمە کۆنەکاندا و هەڕکردنی بە کۆمەڵی کوردان و گیرسانەوەیان لەسەرزەمینەکانی دەورووپشت لەسەردەمە کلاسیك و

سەرەتای سەدە ناوەڕاستییەكاندا هەڵوێستە بكرێ و چاوی سرنج و وردبوونەوە بخرێتە كار تاریكستانیەكان "یان دەریانشینەكانی"ی سەرەتای سەردەمە كۆنەكان، هەروەها ڕەوەندە تورك ڕەگەزەكانی دوادوای سەدەكانی ناوەڕاست، هەموو بە كوردستاندا پەڕیونەوە، بەڵام بە دەگمەن نەبێ كەسیانی لێ نەنیشتۆتەوە و هیچ جێ دەستێكی كەلتووری ئەوتۆیان لە دوای خۆیان بەجێ نەهێشتوە.

هەرچی كۆچكردنە ناوخۆییەكانە، بە هەر چوارلادا گواستنەوە و بڵاوبوونەوەی پرئاپۆڕای بەڵام لەسەر خۆی بەشێكی زۆری دانیشتووانی كوردستان بەناو وڵاتاكە خۆیدا دەگرێتە. ئەم گواستنەوەیە تێكەڵبوونێكی فراوانی كەلتووری و زمانی و ئابووری و كۆمەڵایەتی لێ كەوتۆتەوە. ئەم كۆچكردنە ناوخۆییە دەمدەمی یانە، توانیویانە دەرگا لە جیاوازییە ناوخۆییەكان بگرن و نەیانهێڵن ببنە مایەی پارچەپارچە كردنی هەمیشەیی گەلەكە. هەروەها ئەم كۆچكردنانە خۆشیان، وەكو دەردەكەوێ، هەرگیز نەبوونەتە مایەی تێكەڵبوونی كولتووری تەواوی ناو كوردان، چونكە سروشتی سەختی سەرزەمینەكە. زیاتر بۆ كانتۆنكاری خێرای كۆمەڵگای وڵاتەكە لە بارترە وەكو یەكگرتنی لەیەك چوارچێوەدا. تەنانەت ئەمڕۆكەش، هێشتا گەلێ لقەكۆڵەی زمان و كەلتوور و شێوەی ڕەگەزی و شتی كۆنی تر ماون، كە بەڵگەن لەسەر پەلپەلیی كۆمەڵگا و كەلتووری كورد لەسەر دەمە هەرە كۆنەكانەوە، هەرچەندە، جار بەجار، دەرفەتی تێكەڵبوونیشیان بۆ ڕەخسابێ.

وەكو دەزانین دوو كۆچكردنی گەورە لە چاخە كلاسیكیەكان و دەسپێكی چاخی مۆدێرندا ڕوویان داوە، كە لە بارەی هەردووكیانەوە زانیاری باشمان بەدەستەوەیە. جگە لەمە بەڵگەی زۆر لە ئارادان كە كۆچكردنێكی گەورەی دیكە گەلێ زووتر لەوە ڕوویداوە. بەڵام ئەم بەڵگانە هەم كزو پچڕپچڕ، هەم تێكەڵ و پێكەڵ و ناڕاستە و خۆن. ئەفراندنی نوێی تەكنۆلۆجی، بێ گومان زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی لێ دەكەوێتەوە (ئەم دیاردەیە یەكەم جار بەر لە گشت جێی تری جیهان لە كوردستاندا ڕوویدا) و ئەمەش كۆچكردنێكی گەورەی لە كوردستانەوە لێكەوتۆوە لە ماوەی ١٠٠٠٠ تا ٨٠٠٠ی پێش میلاددا (بڕوانە قۆناغی پێش مێژوو و پێشكەوتنی تەكنۆلۆجی).

گواستنەوە لە شێوەی خانووی سێكوچكەییەوە بۆ شێوەی خڕ لەسەرلاپای كوردستاندا لە

سەرەتای قۆناغی شارستانی حەلەفدا (٦٠٠٠/٥٠٠٠ پێش میلاد) (بڕوانە نەخشەکاری بیناسازی و شارستانی) دەکرێ نیشانەی چیرۆکی کۆچکردنێکی هەزار بەهەزارە بێ بەرەو کوردستان، بۆ نموونە وەکو ئەوەی ئارییەکان کە ٢٥٠٠ ساڵ دوای ئەوە ڕوویدا، یان کۆچکاریەکی درێژەکێشی ناوخۆیی گەورە، وەکو ئەوەی لە دوادوای چاخی کلاسیك و سەرەتای سەدەکانی ناوەندا ڕوویدا (بڕوانە ئەو باسەی دوابەدوای ئەمە دێت).

هەندێ بەڵگەی تر خەریکن لەسەر چیرۆکێکی تری کۆچکاری هەزارە دەردەکەون، کە لە دەورووبەری (٣٠٠٠)ەی پێش میلاددا ڕوویداوە، ئەمە سەردەمی کۆچکاری خورییەکانە. خورییەکان کە لەم سەردەمەدا ناویان بە چیای ئەراراتەوە ماوەتەوە (ئۆرارتو ئەرارات) گەلێك بوون بە زمانێکی باکووری ڕۆژهەڵاتی قەفقاس دەدوان کە دەچێتەوە سەر زمانی گورجی هاوچەرخ (دەیاکۆنوف و ستاروستین ١٩٨٩)، ئەم خوریانە بەرەبەرە بە کوردستاندا هەر لە ئەنەدۆڵەوە بگرە تا دەگەیتە بڵندابییەکانی ئێران بڵاوبوونەوە، تەنانەت بەرەو دەرەوەی هەرێمی زاگرۆسیش پەرتەیان کرد. ئەم پەرتەکردنەی خورییەکان، زۆرتر و پێ دەچێ دەرەنجامی ڕووداوێکی درێژخایەنی کۆچکاری هەزار بەهەزارەی لە باکوورەوە بەرەو باشووری ناوخۆی کوردستان بووبێ، نەك وەکو ئەو بۆچوونانەی لە زۆر جێدا باسکراون، کە دەڵێن لە چیاکانی قەفقاسەوە ڕوویداوە (Dyson 1989). ئەو بستە زەوییە تەسکەی ڕۆژهەڵاتی قەفقاس کە بژوونیەکی ئەوتۆی دانیشتووانی قەت نەبووە، هەرگیز ناچێتە ئەقڵەوە بووبێ بە سەرچاوەی هەڵقوڵانی ئەو ئاپۆرای کۆچکەرانە بۆ پووردان لە یەکێك لەسەرزەمینە هەرە قەرەباڵغەکانی جیهان، واتە کوردستانی (٢٠٠٠)ەی پێش میلاد.

بەڵگە زمانییە کۆنەکان و کەندەکارەیەکان وای دەردەخەن کە ڕەوکردنی خورییەکان بووبێ بە مایەی یەك زمانی و یەك کەلتووری بۆ کوردستان (Dyson 1989،Kamp &Yoffee 1980 ) ئەمە بە خێرایی بووشە بەهۆی هەڵکەوتنی پادشانشینی بەهێز لە شوێنە جیاجیاکانی خاکی کوردستان و هەر ئەمە خۆشی بوە بە مایەی یەکگرتنی سیاسی کۆمەڵگاکانی سەرزەمینی کوردستان لەسەر دەستی قوتیلەکان، کە هۆزێکی کورد بوون و بووبوون بە خوری. ئەم خوریە زەبەردەستانە هەر لە کوردستان خۆیان نەگرت بەڵکو بەرەو دەرەوەی وڵاتەکەش پەرتەیان کرد، چەندین سەرزەمین و وڵاتی تریان شکاندو خستە سەر خاکی خۆیان. بۆ نموونە،

میزوپۆتامیایەکێك بوو لەوانە. یەکگرتنی کەلتووری کوردستان، لەم قۆناغ و ئەو قۆناغی مێژوییدا، کە لە کۆچکاریە پڕ هەژەلەناوخۆییەکان کەوتەوە، هەمیشە بوە بە مایەی تەنینەوەی دەسەلاتی سیاسی و سەربازیی کوردان. ڕووداوی خورییەکان کۆنترین نموونەیە بۆ ئەم بۆچوونە.

لەناوەڕاستی دووەم هەزارەی پێش میلادەوە، کۆچکەرە بەزمانی هیندۆئەورووپی دووەکان کە لە هەڵەتەکانی ئۆراسیاوە کەوتبوونە ڕێ، بە ئاپۆرا لە کوردستان و سەرزەمینەکانی دەوروبەری نیشتنەوە، بەلام سەرەتایان لە چەندین هەزار ساڵی پێشترەوە هاتبوە ولاتەکە، هەرچەندە لێشاویان تا ئەم سەردەمە، هێشتا هێرشی نەهێنابوو. وا دەردەکەوێ ئەم لافاوی هیندۆئەورووپیانە بەرەو کوردستان سەرەتای لە باکوور و باکووری ڕۆژاواوە هەڵقولابێ. ئاوێستای کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان، دەڵێ سەرماو زریان لە ولاتەکەیان، کە هێشتا نەناسرا و بوو دەرپەڕاندوون، بەڵگە ئەرکیۆ لۆجیەکانیش وای دەردەخەن کە ئەم جۆرە شێوانە لەباری کەش و هەوادا کە ملنانی ڕووەو باشووری زریانی یەکجار توند(jet stream) هۆکاری سەرەکییەتی، تا دەوروبەری (٢٠٠٠)ەی پێش زایین لە دەشتاییەکانی ئەورووپا، نەنیشتووەتەوە (بڕوانە ژینگە و کەش و هەوا) (نەخشەی ژمارە ٢٨).

لەگەڵ ئەمەشدا مشتومڕی گەرم لەسەر ئەوەی زمانە هیندۆئەورووپیەکان لە بنەڕەتدا لە کوێوە هاتوون، هێشتا هەر لە ئارادایە. هەندێ لە تیۆرو بووچوونەکان لەم بارەیەوە لە (پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیا لەسەردەمەکانی بەر لە مێژوو و سەردەمانی کۆندا)، باس کراون.

بەهەرحاڵ، لە ئەنجامی ئەم کۆچکردنانەدا، نزیکەی زۆربەی گەلانی باکووری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ناوەندی ئاسیا، بە کوردەکانیشەوە، لە دەوروبەری (٥٠٠)ەی پێش زاییندا بەشێوەیەکی سەرەتایی بە زمانی هیندۆئەورووپی دەدوان. زۆربەی ئەم کۆچکەرانە بەرەو کوردستان، فارسستان، ئاسیای ناوەڕاست و هیندستان ناوی ئەتنی خۆیان نا (ئێر) یان (ئاریا): (ئاریایی). ئەم ناوە ئەتنییە خۆی لەژێر چەتری جوغراف و زمانی و ئەتنی (ئێران) یان (ئێرانی)دا گرتەوە کە کوردە کانی ئەم سەردەمەشی دەکەوێتە بەر، (بڕوانە زمان و ناسنامەی نەتەوەیی).

بە ئاری بوونی کوردان کە لە هەزارەی یەکەمی پێش میلاددا ڕوویدا، یەکەم ڕووداوی گرنگە لە یەکناسنامەیی کوردستاندا و ئەم ڕاستیە بە بەڵگەو بەگشتی سەلماوە. بێ گومان ئەم

پرۆسەیە بێ بوونی ئاپۆرایەکی یەکجار گەورەی کۆچکار هەرگیز نەدەهاتەدی، ئێمە باش دەزانین کە میدیەکان دوای سێ سەدەی یەکبینی قەتلوعام، و کۆیلەگیری و ڕەهەندە کردن لەسەر دەستی ئاشوورییەکان ئینجا کوردستانی ناوەندیان ئاوەدان کردەوە. ئەم کردەوانە تا ساڵی ٦١٢ی پێش میلاد بەردەوام بوون. حوکمدارە میدیەکان. لەلایەن براگەورە و ڕیش سپی گەلەهۆزەکان و بنەماڵە حوکمڕانەکانەوە بۆ حوکمفەرمایی وڵاتەکانی ژێر قەڵەمڕەویان هەڵدەبژێرران، لەبەر ئەوەش کە کوردەکان بڕبڕەی پشت و هێزی شەڕکەری ئیمراتۆریەتی میدییان پێکدەهێنا، زۆر جێی خۆیەتی گەر بوترێ ئەو ئاڕاستانەی ئیمراتۆریەتەکە لە تەنینەوەدا گرتیە بەر، بەشێوەیەکی گشتی ئەو سەرزەمینانەن کە بوون بەزێد و نیشتمانی کوردان لەو سەردەمەدا. ئەم سەرزەمینانە، بەتایبەتی خاکی دەورووبەری چیاکانی زاگرۆس و پۆنتۆس و ئەلبورزیان دەگرتەوە. بەهەرحاڵ، بۆ باشتر دەرخستنی شێوە و ڕووکاری گواستنەوەی دانیشتووانی کورد، مرۆڤ دەبێ دان بەخۆیدا بگرێ تا دەچێتە دویمایی سەردەمی کلاسیك و چاوبگێرێ بە سەرچاوەی گرێك و ڕۆمان و فارس ناوەند و ئارامیەکاندا کە باس و خواسی بەپێزیان لەم بارەیەوە لە دوو توێدایە.

کەی ئەخساری پادشای میدی، پاش ئەوەی لە ساڵی ٦١٢ی پێش میلاددا ئاشورستانی بە تەواوی تەفروتونا کرد، ساگارتیەکی زۆری، کە گەلێکی سەر بە میدیەکان بوو، لە هەرێمەکانی ناوەندی کوردستان، بە تایبەتی لەناو و دەورووبەری هەولێرو و کەرکوکدا چاند. ساگارتیەکان، کە ناوی زاگرۆس لەناوی ئەوانەوە هاتووە، لەسەرەتادا لەسەرزەمینی بەختیاری و لوڕستان تا دەگاتە کرمانشای ئێستا، (ناوەند و باشووری هەرێمی زاگرۆس) دەژیان.

ڕاستییەکەی، نازانین تا چ ڕادەیەك دەتوانین واژەی (بەزۆر) بخەینە سەر نیشتەجێبوونی ئاپۆرای کۆچکەران لە ناوەندی کوردستان لە سەردەمی میدیایی و ئەخمینیەکاندا، چونکە ئەمە، سەرەنجام، وەستانەوەی لافاوی گەلە هیندۆئەوروپی دووەکانیش بۆ سەرزەمینەکە بەگشتی دەگرێتەوە دانیشتنی ساگارتیەکان و سەر لەنوێ ئاوادەکردنەوەی وڵاتی کەرکوك لەلایەن هۆزە ئارییەکانەوە بە دەسکاریی کەی ئەخساری میدی و دارایەکەمی ئەخێمێنی بوو ئەوەی تا ئێستا زانراوە، ئەم دوو پادشاییە لەمەولاوە هیچ لە خاکی خۆ هەڵکەندن یان بەزۆر دانیشاندێکی دیکەیان نەکردوە. دەبێ ئەمە بەچەند پرۆسەی یەك لە دوای یەك کرابێ کە

تێیاندا هۆزە ئارییەکان لە شوێنی خۆیان هەڵکەندراون و لەسەرزەمینی تر داچێنراون لەسەر دەسنیشانکردن و ڕاسپاردەی ئەم دوو پادشایە.

تۆماریەندیە مێژووییەکان بەڕوونی دەردەخەن کەوا ئەم کۆچکەرە ئاریانە دانیشتووانە کۆنەکانیان کردوە بە کۆیلە و بەیاسای کۆیلەیەتی ڕەفتاریان لەگەڵدا کردوون.

داڕووخانی ئیمپڕاتۆریی ئەخێمێنی لەسەر دەستی ئەسکەندەری مەزن لە شەڕی ئەربیلا (ئەربیلی ئەم سەردەمە)دا ولاتەکەی بۆ گیرسانەوەو دانیشتنی یۆنانیەکان والاکردەوە کوردستان بە تایبەتی بەشەکانی ڕۆژاوا و باشووری، بوون بە شوێنی گیرسانەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی یۆنانی نەژاد کارەکە هەر بەمەوە نەوەستا، ئەوەندەی پێ نەچوو هەندێ خەڵکی پارثی نەژادیش بە زۆری ڕژانە کوردستانەوە سام و هەیبەتی سەریازیی ئیمپڕاتۆریەتی پارثی، سێبەری بەسەر ئیمپڕاتۆریەتی سلووقی یۆنانی تەبارداکێشابوو لە ڕۆژەلاتی ناوەڕاستدا پارثیەکان ئامۆزای هاوکەلتووری کوردان بوون و لەگەڵ یۆنانیەکاندا نزیکەی زۆریەی دانیشتووانی شارنشینی باشووری کوردستان و لوڕستانیان پێکدەهێنا لە ڕاستیدا پارثیەکان ناوی خۆیان بڕی بەسەر هەرێمەکەشدا کە ئیتر بوو بە پەهلە. پەهلەش دەچێتەوە سەر ناوی ئەتنیکی پارثیەکان (لە پارثا/ پالثا/ پالە/پەهلە)وە هاتووە، پاشماوەی داب و ڕەسمی یۆنانیەکان، ئێستا لە کەلتووری شانۆگەری، پاڵەوانبازی و زۆرانبازی و هەروەها لە پەیکەرسازی سروشتیدا بەدی دەکرێ. هەروەها میراتبەندی پارثیەکان لەناوی یەکێك لە دوو گرووپە زمانیەکەی ئەم سەردەمەی کوردییدا بەدی دەکرێ کە ئەویش پەهلەوانییە (بڕوانە زمان) کە پارثیەکە کردبوویان بەزمانی خۆیان. ئەمە هەروەها لەناوی کوردە فەیلیەکاندا خۆی دەنوێنێ، هەروەها لە وشەی پەهلەواندا ئەو وشەیەی کە بۆ شەرەف و مەردایەتی بە کاردێ (بڕوانە کەسایەتی نەتەوەیی).

لەو سەرچاوە کۆنانەوە کە ئێستا لە بەردەستدان و باس لە قۆناغی دووەمی کۆچکردنەکان دەکەن لێشاوێکی بەردەوامی هۆزی کورد لە باشووری ڕۆژەلاتەوە بەرەو باکووری ڕۆژاوا بە ئاسانی دەبینرێ کە جیاوازە لەوانەی قۆناغی دووەمی کۆچکردنەکان (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢٩). ئەم کۆچکاریە لە نزیکەی سەدەی چوارەمەوە تا سەدەی پێنجەمی پاش میلاد هەر بەردەوام بووە.

شەش بەڵگە بە دەستەوەن کە ئەمە ڕوون دەکەنەوە:

نەخشەی ژمارە(29): نەخشەی كۆچكردنی كوردەكان لە سەدەی (5)ی پێش میلاد تا سەدەی چوارەمی پاش میلاد: یەكرەنگبوونی ئەتنی لەدوا دوای قۆناغی كلاسیكدا

١–زۆربەی هەرە زۆری ئەو هۆزانەی لە شوێنە دووردەستەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی زاگرۆس لە وڵاتی فارس نیشتەجێن، بە تاك و بەگشتی لقوپۆپیان لە کوردستانی ناوەند دوایی لە کوردستانی باکووریشدا بەدی دەکرێ.

٢–کۆنە چیرۆکەکانی ئەرمەنیەکان پڕن لە باسی ناڕاستەوخۆ لە باری خانەوادەی دەوڵەمەند و دەرەبەگی بێگانەی دەسەڵاتدارکە خۆیان لە ئەرمەنستان لەسەرەتاکانی سەدەی سێیەمی پێش میلادەوە پێگەیاندوە و پێکەوە ناوە. زۆربەی ئەم خانەوادانە ئەگەر نەڵێم هەموویان ناوی ئێرانی ئەوتۆیان پێوە بووە کە هاوکۆتەرەن لەگەڵ ناوی هۆزە کوردەکانی هەرێمەکانی باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەرمەنستاندا.

٣–لە کێشە کۆنەکانی جوغرافیادا، وەکو ئەوانەی ستراوبۆوپتولمی، ناوی چەندین سەرزەمین لە باکوور و ڕۆژاوای کوردستان لەناوی کوردیی ئەو هۆزانەوە هاتووە کە نیشتەجێی ئەو شوێنانە بوون: وەکو ڤەندیان وەند لە باشوور، بەرامبەر بە کان/گان/ئان لە باکووری کوردستان، نزیکەی پڕانی ئەو هۆزانە کە پتر لە هەزار ساڵی ڕابردووە بە پاشناوە هۆزیی باشوورەوە خۆیان شەنگاندوە، لە کۆتایی قۆناغی ناوەڕاستەوە پاشناوی باکووریان خستۆتە سەر ناوی هۆزەکانیان، پاش ناوەکانی باشوور تەنها لە کوردستانی باشوور لە لوڕستان (کە فرێ بە کوردایەتییەوە نەماوە)، هەروەها لە باشووری زاگرۆس، ماونەتەوە.

٤–زوم ناوێکی تری هۆزیە (بەهەڵە، زۆرتر بە ڕوم یان ڕام دەخوێنرێتەوە) کە لەسەرچاوە ئیسلامیەکاندا لە باسی هۆزە کوردەکانی باشووری زاگرۆسدا هاتووە، ئەم ناوە ئێستا تەنها لە باکوور و باکووری ناوەندی زاگرۆس لە کوردستاندا بەدی دەکرێ. لە کوردی نوێدا لە شێوەی زومادا دێ و بە هۆبەیەکی مەڕ لە وەرێنی کۆچەر دەوترێ.

٥–هەندێ ئایین و بیروباوەڕ و زاراوەی کوردیی کە هی باشووری کوردستان بوون، بۆ کوردستانی باکوور و ڕۆژاوا پەرتەیان کردوە.

٦–ئەو سەرچاوەیە ئەرمەنیانەی مێژوو کە بۆ جاری یەکەم باسی هۆزی وەکو باگرەڤەند (بەکران) تیگرانەڤەند (تیریکان)، هەضەبانی، شەدادان و مامکان (مامیکۆن) دەکەن، مەڵبەندیان دەبەنە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی سنوورەکانی ئەرمەنستان، کەچی ئەم سەرچاوە ئەرمەنییانەی دوایی تاك تاکیان، یان هەر هەموویان دەبەنە باکووری ئەو وڵاتە.

بۆ نموونە، بەگرەڤەندەکان، یەکەم جار لە سەدەی چوارەمی پێش میلاددا لە نزیکی هەرێمی چیای سنجار و موسڵ دەردەکەون (ناڤاتێس مۆنن)، دوایی لە سەدەی سێیەمی پێش زاییندا دێنە باکووری ڕووباری دیجلە (ئەمەئە و کاتەیە پتولمی ناوی هێناون)، ئینجا سەرزەمینەکانی باکووری ڕۆژاوای گۆلی وان لە سەدەی یەکەمی پاش میلاددا، کەچی لە سەدەی سێیەمی پاش میلاددا دێنە باکووری ئەرمەنستان و باشووری گورجبستان. لە ناوەندی باشووری کوردستان لە نزیکی شاری تازە بنیاتنراوی سولەیمانی، شوێنەواری ڕەتانی هۆزی بەکران لە دەشتی بەکراوا و شارۆچکەی بەکرەجۆدا خۆی دەنوێنێ. لە ڕووی زانستی وشەگیری (Etymology)ـیەوە دەتوانرێ بەگراوەندینە کۆنەکان ببرێنەوە سەر هۆزەکانی بەجراوان یان باجەلان کە لە کوردستانی باشوور و ناوەند نیشتە جێن. هەردوو هۆز هێشتا بە زاراوەی گۆرانی دەدوێن و لە باری ئایینەوە دەچنەوە سەر کۆنە ئایینی کوردی (تیرەی فریشتەکان) — وێش دەچێ بەگراوەندەکانیش هەر لەسەر ئەم ئایینە بووبن. ئێستا کە لە نزیکی مووسڵ لەسەر ڕووباری مووسڵ، واتە لە سنووورە باشووریەکانی بەگرەوەندین ریجیۆ Bagravandine Regioی پتولمی و هەروەها لە نزیك شاری خانەقین نیشتەجێن. پەیوەندیەکانی نێوان هۆزی بەکران لەگەڵ بنەماڵە شازادەکانی ئەرمەنستان و دوایی گورجستانیش، هەروەها هی هۆزی تیریکان لەگەڵ تیگرانی مەزنی پادشایی ئەرمەنستاندا (١٤٠– ٥٥ پێش میلاد) بەدرێژی لە فەسڵی هۆزەکان و مێژووی کلاسیکدا باسکراوە، ئەو بەڵگانەش کە لە بارەی ئەم پەیوەندیانەوە بە دەستەوەن، ڕووناکی زیاتر دەخەنە سەر ئەو ڕێگاو ئاراستانەی کۆچ کردنە یەك لە دوای یەکەکانی کوردان گرتوویانەتە بەر.

ئەوەی کە لە دێرزەمانەوە باوە ئەوەیە، کە تیگرانی پادشایی ئەرمەنستان بە بنەچە ئەرمەنی نەبوە. موسێسی چۆرین (یان موفسێس خۆریناتیس) کە مێژوونووسێکی ئەرمەنیی سەردەمی بەڕایی سەدەی ناوەندیەکانە و لە دەورووبەری ٤٩٠ و ٧٦٠ پاش میلاددا ژیاوە، دەڵێ باوباپیرانی تیگران لە شوێنێکی ترەوە هاتوون بۆ ئەرمەنستان و لە وڵاتی خۆیانەوە لە دەستی ئەژی دەهاکی پادشای میدیا (د. ٥٨٤–٥٤٩ پێش میلاد) کە خزمیان بوو، و لە قەڵەمڕەوی ئەودا ژیاون هەڵاتوون. بەم جۆرە مۆسێس زێدی بنەڕەتیی بنەماڵە و هۆزی تیگران دەباتەوە کوردستانی باشوور. لە سەردەمی مۆسێسیدا میدیا (کە لە ئەرمەنییدا مار و لە

کوردییدا مای و لە فارسیدا ماه—ی پێ دەوترێ)، تەنها ناوچەرگەی میدیای کۆنی دەگرتەوە واتە کوردستانی باشوور و باکووری لوڕستان، هەر لەبەر ئەم هۆیەش، دەبێ بنەماڵەو خزمانی تیگران، کە لە شوێنی خۆیان هەڵکەنراون، ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژاوایان گرتبێتە بەر.

ئەم هەڵێنجانە زیاتر بەوە خۆی دەگرێ، کە پتولمی ناوی تیگرانوان تەنها بەو سەرزەمینە دەدا کە گۆلی وانی ئێستا و ڕێك ڕۆژهەڵاتی زێدی هۆزی بەگرەوەند (بەکران) دەگرێتەوە.

ئەمە ئەو ناوچەیەیە کە دەبێ بنەماڵە لقە عەشرەتی تیگران بەر لە چوونە سەر تەختی ئەرمەنستان داگیری کردبێ. دەتوانرێ ناوەکە ببرێتەوە سەر تیگرانەڤەند. هۆزە پاشناوی ڤەند بەبێ یەك و دوو لێکردن دەزانرێ کە لە باشووری هەرێمی کوردنشین باوە.

چەند هۆزی جێ و ڕێ داری کورد کە ئەم بارکردنە دوور مەودایەیان بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژاوا کردووە، شایستەی سرنجی تایبەتین چونکە ڕۆڵی مێژوویی بەرچاویان لە هەرێمەکەدا هەبوە، کەچی زۆر کەمیان لە بارەوە تۆمار کراوە. ئەم هۆزانە بریتین لە مەمەکانەکان، جیلۆکان، دیلەمەکان، و هەضەبانیەکان، لیستەی ئەم هۆزە مێژووییە گرنگانە دەکرێ زۆر ناوی تری بخرێتەسەر وەکو شەبانکارە (شوانکارە شوان) خەلکان (کالْخان)، زەنگیان (زەنگەنە) و گەلێکی دیکە.

پەیوەندی مێژوویی نێوان ماميکۆنیە ئەرمەنی زمانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و هۆزەکانی مەمقان و مامەش (کە هەردوو کورد زمانن و لە کوردستانی ناوەند نیشتەجێن) لەلایەکەوە و مەمەسەنییە لوڕ زمانەکانی باشووری زاگرۆس لەلایەکی ترەوە و ئاراستەی هەڕکردنەکانی هەرەزووی هۆزە کوردەکان بە باشی بەرجەستەو بەچاکی دەری دەخا لە کوێوە هاتوون و لەکوێ نیشتوونەتەوە. دەبێ زۆر دوور ڕەتابن، بۆیە دەبینین پەلە جیاجیاکانی ئەم هۆزە دێرینەیە زیاتر لە(١٠٠٠) میل لێك دوور کەوتوونەتەوە.

هۆزی گەورەو گرانی جەلالیش کە ئێستا دراوسێی مەمقانەکانن کاتی خۆی ڕەوێکی ئەوها دوور دەستیان کردووە. ئەمان جاری یەکەم لە بەرایی سەدە ناوەڕاستییەکاندا ناویان لەفارس و هەرە باشووری زاگرۆسدا هاتووە، دوای ئەوە بەرەو باکووری ڕۆژاوا پەرتەیان کردوەو ئێستا، سەرەڕای باشووری زاگرۆس (کە بە گێلو یان هۆزەکانی کوە گیلویە، یان جیلویەکانی

سەدەكانی ناوەڕاست ناسراون) لە ناوەندی زاگرۆسیش هەن (بە گەلاوەند و جەلالەوەند ناسراون) و لە باكووری زاگرۆسیش (كە بە جەلالی ناسراون).

جگە لەمانە، پەلێكی تریان، بەرلەوە لە هۆزەكانی گیلو/ گیلۆی باشووری زاگرۆس تاكاونەتەوەو بەرەو باكوور لە سەدەمی سێیەمی پێش میلاددا ڕەویان كردوەو لە ڕۆژاوای چیاكانی ئەلبورز و نزمایییەكانی دەریای خەزەر نیشتوونەتەوە. ئەم گیلویانە ناوی خۆیان داوەتە گیلانی ئەم دەمە كە تاسەدەی سێیەمی پێش میلادیش بە (كادوسبا) بەناوبانگ بوو. لە نووسراوەكانی سترا بۆ و پلوتارك و پلینیدا، زیاتر بەو ولاتەیان وتووە سەرزەمینی گیلۆی.

لە پەنای پەرتەكردنی لەسەرخۆیان بە گەلێ شوێنی تری دەوروبەری زنجیرە چیاكانی زاگرۆسدا، گیلۆكان و بەر لەوەی دوا قۆناغ لە دەوروبەری دەریای خەزەر بنیشنەوە ناوی خۆیان بەسەر گەلێ شوێندا چەسپاندوە. بۆیە گەلێ جێگاو هۆزە ناو هەن لە كوردستان كە یان (گیلو)یان شێوە جیا جیاكانیان پێوەیە و هەر ئەمە خۆی بەلگەیەكی بەرجەستەكەری ئەم بۆچوونەیە.

هۆزێكی دیكە كە لە گرانییدا هاوشانی گیلۆكانە، هۆزی دەیلەمە (دەیلەمییەكانی سەدەكانی ناوەڕاست) كە دولبەدوای گیلۆكان پێشەنگیان گەیشتۆتە ڕۆژاوای چیاكانی ئەلبورزو لە سەدەی سێیەمی پێش میلاددا ئەوانیش لەوێ جێگیربوون. بەپێچەوانەی گیلۆكانەوە، ئەمان بەدوای كاروانی خزمەكانیاندا تا سەدەكانی دواتریش بەرەو ئەو ولاتە هەر دادەڕژان، ئەمانە لەسەرزەمینی دێرینی دیلەمەكانەوە، واتە لە هەرێمەكانی دەوروبەری بەشی باكووری ڕووباری دیجلە لە ئەنەدۆڵەوە، ڕێچكەیان دەبەست ئەم كۆچكردنە تا سەدەی چوارەمی پاش میلاد و سەرەتای دووەم ڕووداوی گەورەی كۆچكاری كوردان هەر بەردەوام بوو.

لە كاتێكدا ئەرمەنستان، و تا ڕادەیەكی نزمتر گورجستان و ئاران لە ڕۆژهەڵاتی باكووری كوردستان، بەرەبەرە دەبوونە مەڵبەندی نیشتنەوەی ئەم كوردە كۆچكەرانە، كۆماجین و كەپەدۆچیاو پونتۆسی هەرە باكووری ڕۆژهەڵاتیش، دەكەوتنە بەر لافاوی كۆچكەری بێشوماری تر، بۆیە دەبینین میثریداتیسی پادشای كوردی پونتۆس، لەیەك جەنگییدا لەگەڵ ڕۆمەكاندا، هاوپەیمانییەكی (١٤) هۆزەی ئەم هۆزانە دەخاتە مەیدانی شەڕەوە و تا ناو یۆنان و ئۆكرانیا بە دوایاندا ناوەستێتەوە (بڕوانە مێژووی كلاسیك).

برێکی بەرچاوی ئەدەبیاتی سەربەم لێقەومان و کۆچە مێژوویی و دوایی لەم جیّ و لەوجیّ نیشتنەوانە، پاشان کەوتنە ناو سەرچاوە سریانیەکانەوە، کە لە بنەڕەتدا ئەمانیش لە ئەرشیفە کۆنەکانی بنەماڵە پادشازادەکانی کوردستانەوە، وەکو ئەدیابین و کەرخو (کەرکووك) خەستکرا بوونەوە و چات کرابوون. ئەم دوکۆمێنتانە دوایی لە دەورووبەری سەدەی شەشەمی پاش میلاددا کەوتنە ناو ئەرشیفی کەنیشتی نەستووریەوە (بڕوانە مەسیحیەت).

بەگشتی، بەڵگەکان دەڵێن کە دوانزە هۆز لە سەردەمی پارثیەکاندا لە هەرێمی گەرمیان-کەرکووك نیشتەجیّ بوونە. سێ خانەوادەناو یان هۆزەناوی سەرۆکەکانی ئەم هۆزانە جێی سرنجی تایبەتیین. ئەم سێ هۆزە بریتین لە: ڤیراز، بورزان و پارێن کە، بە خاوخێزان و خزم و خوێش و عەشرەتەوە هاتوونە بۆ وڵاتی کەرکووك "Pigulevskaya1963" ئەم سێ هۆزە، بەشێکن لە حەوت هۆزی ئەریستۆکراتی پارثیا، کە هەر یەکەیان دەستێکی باڵایان لە سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی دەوڵەتی پارثیاندا هەبوە، بەرەی ئەم سەردەمەی ئەم سێ هۆزە بریتین لە هۆزە کوردەکانی بەراز و بارزان و پیران.

دەڵێی بارکردنی پرۆگرانی هۆزەکان ڕووەو ڕۆژهەڵاتی باشوور - ڕۆژاوای باکوور لەو دەمەدا بزوونیی دانیشتووانی لە قووڵایی باشووردا تەنکترکردۆتەوە، لەبەر ئەوە ئێستا زۆر هەرێمی وەکو لورستان، بەختیاری، گیلو (کوە گیلویە) و بانەکانی پێرسیس فارس، کە جاران کوردنشین بوون ئێستا وانین. لەوانەیە ئەو هەڵکەنرانە بە کۆمەڵە، سەبارەت بە فشاری ئابووری و ژینگەبووبن بە جۆرێك کە ژیانیان لە باشووری زاگرۆس بۆ نەبرابێتە سەر. لەوانەشە سەبارەت بە شێوان و لەناوچوونی سەردەمێکی خۆشی ژیان بوویێ کە بەر لەوە ئاپۆرایەکی زۆری خەڵکی کێشابێتە هەرێمەکە، دوایی پاڵی بە خەڵکەکەوە نابیّ کە بۆ ژیانی باشتر ڕوویکەنە جێی تر. بەهەمان شێوە لەوانەیە خۆشی ژینگە و باری ژیان لە باکووری زاگرۆس و لە پونتۆس و تۆرۆس ئاپۆرای کوردانی ئەو شوێنانەی لە ڕۆژهەڵاتی باشوورەوە کێشابێتە خۆ، هۆکار هەرچی بوویێ، ئەوەی لەسەر بەڕەیە لە دوا دوایی سەدەی پێنجەمی پاش میلاددا، ئەوان لەویّ نەمابوون.

هاتنی بەردەوامی لێشاوی کوردانی باشوور و ئەو پەرەسەندنە دیموگرافیەی بە دوای

خۆیەوە هێنایە باكوور و ڕۆژاوای كوردستان لەسەرەتاوە و لە دواییدا بۆ ناوەندیشی، لە بەرایی سەدەی چوارەمی پێش میلاددا بوو بەمایەی سەركردنی بڕوونیی دانیشتووان لەو ناوچانەدا ئەم پڕوونیە، سەرهەڵگرتنی كوردانی لەوێوە بۆ هەموو هەرێمەكانی دراوسێ و تەنانەت بەولاتریشەوە بۆ ولاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لێكەوتەوە. هەموو ئەم كۆچكاریانە لە باكوور و ڕۆژاوای كوردستانەوە هەڵقوڵان و لە نزیكەی سەدەی چوارەمەوە تا سەدەی یانزەیەمی پاش میلاد بەردەوام بوون. لەم دوو كۆچكاریەو لەوانی پێشووشدا، گواستنەوەكان ئەوەندە لەسەرخۆ بوون، كە دانیشتووانی ئەو سەرزەمینانەی لێی جێگیر دەبوون هەستێكی ئەوهایان پێ نەدەكردن. لەم ڕووەوە تێرغیوندیانی مێژوونوسی ئەرمەنی دەڵێ: "نیشنەجێ بوونی كوردان لە ئەرمەنستان ئەوەندە لەسەر خۆبوو، كە زۆر گرانە سەرەپەتی ڕێچكەكەی دەستنیشان كەی".

بۆ نموونە، دەیلەمییەكان و ڕیڤەندەكان، بە دوو قولێی بە ئاپۆرای كۆچكردن دەركەوتن دیلەمییەكان، كە پێشەنگیان چوار سەدە لەوەبەر لە ڕۆژاوای چیاكانی ئەلبورزدا تەنیبوویانەوە، ئەم جارەیان ئەوەندە بە ئاپۆراوە ملیان نا، كە نەك تەنها گشت چیاكانی دەورووبەری ئەلبورزی باشووری دەریای خەزەریان گرتەوە بەڵكو بەرەو هەزار بە هەزارەی سەرزەمینی ئیسلامی دەورووبەریش ئێقیان دایەوە. لەم سەروەختەدا، بە گوێرەی قسەكانی ناسر خوسرەوی گەڕیدەی ئیسلامیی سەدەكانی ناوەند، دەیلەمییەكان تەنانەت توانیان چواریەكی شارێكی دوور دەستی وەكو قاهیرەش لە سەدەی یانزەیەمدا پڕ كەنەوە، لە كاتێكدا ڕیڤەندەكان هەموو باكووری خۆراسانیان گرتەوە و هەر لەوەشەوە (بانەكانی ڕیڤەند) هاتەكایەوە، (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣٠).

هەر ئەو دارژانەی كوردان بەم لاو بەولادا، وەڵامدەرەوەی چۆنیەتیی و هۆی بوونی كوردە لە لوبنان و ڕۆخەكانی سوریا كە لەسەردەمەكانی پێش ئیسلامدا ژمارەیەكی زۆریان بە مەسیحیەتی لە شارەكانی بەعەلبەك و لانیقە دەژیان. دوای ئەوەی بە عەلبەك كەوتە دەستی جیهانگیرە مسولمانەكانەوە لە سەدەی هەشتەمدا هەندێ لەو ڕەهەندانە كشانەوە بۆ ئەنتاكیە و تەرسووس لەناوەوەی ئیمپراتۆریەتی كرژەوەبووی بیزەنتەدا. ئەو كوردە عەلەویانەی كە نەبوون بە مسوڵمان، نەك هەر مانەوە، بەڵكو ژمارەیان بە هاتنی كوردی دیكە بۆلایان، لە ڕووی ئەتنیكیەوە، زیادیشی كرد(Cahen 1940). زۆربەی ئەم كوردانە دوایی توانەوەو بوون بەو عەرەبە عەلەویانەی ئێستا لە كنارەكانی سوریا دەژین و زۆربەی دانیشتووانی سەرزەمینەكەش پێك دێنین.

نەخشەی ژمارە (30): نەخشەی کۆچکردنی کوردەکان لە سەدەی (5)ی پاش میلادەوە تا سەدەی (12): هەڵقوولاّن و سەرکردنی ژمارەی دانیشتووان.
ئاراستەی کۆچکردنەکان.
ئەو شوێنانەی ئێستا زۆربەی دانیشتووانیان کوردن.

لە باشووری کوردستان، سەرچاوە فارسیە ناوەندیە کۆنەکان، هەروەها کۆڵینەوەکانی یۆنانی و ڕۆمەکان لەسەر جوغرافیا و دوایی ئەوکارانەی گەڕیدەو کۆڵەرە مسوڵمانەکان لەو دواییانەدا کردوویانە، هەموو باسی کۆمەڵگایەکی گەورە و بە جۆشی کورد دەکەن کە خۆی بە

خوارووی چیای زاگرۆسدا تا نزیك تەنگەی هورمز گەیاندوە. بۆ نموونە ئیبنو حەوقەل لە (سووره تول ئەرز/ صورة الارض)ە كەیدا كە بابەشێكی جوگرافییە، و لە دەورووبەری (٩٨٠)ی پاش زاییندا نووسراوە لیستەیەكی (٣٣) هۆزیی گرتووە كە گوایە ناوی "ئەو هۆزانەی تێدایە كە زیاتر ناسراون و هەر لە ولاتی فارس "باشووری زاگرۆس" دەژین و كە گوایە ژمارەی تەواوی ئەو هۆزانە خۆی دەدا لە (١٠٠) و لە (٥٠٠٠٠٠) خێزان پێكهاتوون. ئیبنو حەوقەل خۆی خەڵكی نیسیبین (شاری نەسیبینی ئێستا لە كوردستانی رۆژاوا ) بوە و زۆر چاك زانیویە چی دەڵێ كاتێ كە باسی كوردی لە كارەكانیدا كردووە. ئیبن بەلخی (ابن بلخی) كە خەڵكی فارس بووە، سەدەو نیوێك لەوەدوا لە (فارسنامە)كەیدا كە ئەویش هەر بابەشێكی جوگرافییە (١١١٦ پا.م) لیستەی پێنج هۆزیان گەلە هۆزی كورد دەدا لەوێ كە بریتی بوونە لە (١٠٠٠٠٠) خێزان.

زۆریەی ئەم هۆزانە هێشتا هەر ماون و ناویان، تەنانەت ناوی لقوپۆپەكانیشان لەو ناوانەی كە لە لیستە كۆنەكانی هۆزەكانی باشووری زاگرۆسدا هاتوون زۆر دوورنین.

ئەم هۆزانە بەسەر سێ گرووپدا دابەش دەبن: ١) ئەوانەی كە هێشتا هەر بە كوردی ماونەتەوە وەكو شەبانكارە و گۆرانەكان، بەلام لە ناوەندی زاگرۆس یان لە باكووری زاگرۆس یان لە هەردوكیاندا دەژین. ٢) ئەوانەی هەر لەوێ ماون، بەلام بە كوردی نادوێن وەكو لوڕەكان و گیلۆكان كە لە باشووری زاگرۆس دەژین ٣) ئەوانەی كە لە هەردوو شێوەن وەكو مامەشەكورد زمانەكان و مەمە سەنییە لوڕزمانەكان (كە هەردووكیان توخمی هۆزی مەمەسەنی سەدەكانی ناوەڕاستن و جاران لە باشووری زاگرۆس دەژیان).

لە كۆتایی سەدەی نۆیەمی پاش میلاددا، ئاپۆرایەكی زۆری كۆچكەر، كە لە ئاكامی هەڵقولان و جێ نەبوونەوەدا هەریان كردبوو، بە ولاتی كوردنشیندا بلاوبوونەوە، مەسعوودی مێژوونووسی سەدەكانی ناوەند، لە ئەلتەنبیهدا (التنبیه)، لیستێكی (١٦) هۆزی گەورەی كورد پێشكەش دەكا و ئەو سەرزەمینانەی بە كورد داپۆشراون لە سەردەمی ئەودا بەمانەی خوارەوە دیاری دەكا: فارس، كرمان، سیستان، ئیسفەهان، خوراسان و جیبال (زاگرۆسی ناوەند و باكوور)، ماهات (میدیا، واتە لوڕستان و كرمانشاه)، هەمەدان، شارەزوور (سولەیمانی)، ئازەربایجان، ئەرمەنستان، ئاران، بابول ئەبواب (باب الابواب)— واتە شیروان، جەزیره، بیلیفان (رۆژەلاتی ناوەندی ئەنەدۆل)، سوریا و دەرگاكانی (سوریا) ئەنتاكیا و

ئەدەنە کوردان ئێستا لە شەش هەرێمی ئەمانەدا زۆرەکین و لـە چوارياندا کەمایـەتی گرانن، و لەوانی تردا سووکە کەمایـەتین ئـەو هەرێمانـەی کـە لەنووسـراوە کۆنەکانـدا کوردیـان لێبـوە و ئێستا زۆر بەکەمی دەردەکەون، هەرێمەکانی باشووری زاگرۆسن لە فارس و کرمـان و سیـستان (واتە سیستان و بلوجستانی ئەم سەردەمە)و ئیسفەهانن تاقـە هـەرێمێ کـە کـوردی تیانـەمابێ بابول ئەبواب (باب الابواب)، واتە (شەروانی باکوور– داغستانی ڕووسی)یە. بوونی هـەژەلگرانی کـورد لـەم هەرێمانـەدا، هۆکـارێکی بـەهێزی دروسـتبوونی بنەماڵـە حوکمفـەرما کوردەکـانی سەدەکانی ناوەڕاست بوو کە بەشـێکی زۆری لای ڕۆژهەڵاتـی جیهـانی ئیسلامیان بـە دەسـتەوە بوو.

کـوردێکی زۆری باشـووری زاگـرۆس بەرەبـەرە، بـەڵام بەشـێوەیەکی بـەردەوام ناسـنامەی نەتـەوەی کوردییـان لـە دەسـت داوە. ئێستا وابەڵگـە دێنـە دەسـتەوە کـەوا لـە دەوروویـەری سـەدەی دەیەمـدا، هـۆزێکی گرانـی فـارس زمـان لـە بـاکووری ئەفغانـستان یـان باشـووری تاجیکستانەوە ڕژاونەتـە باشـووری زاگرۆسـەوە و هەرێمەکـەیان داگیر کـردوە (ماوەیـەکی زۆر درەنگ دوای ئەوە گەلێ هـۆزی کۆچـەری تـورك ڕەگـەزیش وەکـو هـۆزی قەشـقایی، بەهـەمان ڕێگەدا هاتوونەتە وڵاتەکەوە).

ئەم هۆزە دوای بە( بەختیاری) ناوی داوەتەوە وەکو دەردەکـەوێ بـە ئاسـانی و دەسـوبرد ئاییـنی ئیسلامی خۆشیان بە هۆزە کوردەکانی ئەوێ بەخشیبێ، کە تا ئەوکاتـە ئیـسلام نـەبوو بوون و بە ئاسپاییش زمانی فارسشیان خستبێتە پاڵی بۆیان کە بوو بە بناغە بۆ زاراوەی لـوڕی – بەختیاریـەکان لـە سـەدەی پانزەیەمـەوە، ئـیتر باشـووری زاگـرۆس کـەمتر بـە هـەرێمێکی کوردنشین دەناسێنرا لەلایەن توێژەرەکانی ئـەو سـەردەمانەوە فـەخرەدینی گورگـانی، کـە بـە شیعر ڕۆمانی دێرینی (ڤیزو ڕامین)ی هەڵبەستووە (١٠٤٠–١٠٥٠ پـاش میـلاد) یەکـەم نووسـەرە کە کورد و لوڕی لێك جیاکردۆتەوە لەو سەردەمەوە باشـووری زاگـرۆس، پـتر بـەرگی لـوڕی بـە بالای خۆیدا بڕیـوە و بـەرە بـەرە لـە کوردسـتانێتی تاکاوەتـەوە هـەمان پرۆسـە ئـەمڕۆ لەگـەڵ لەکەکاندا دووپات دەبێتەوە، کە بە پەلـە خـەریکن خۆیـان لـە کوردەکـانی تـر دووردەخەنـەوە وەکو دەردەکەوێ ئەم جۆرە گۆڕانە، چ لـە ئـایین چ لـە ناسـنامەی نەتەوەییـدا لـەناو کوردانـدا شتێکی کۆن و باوو بەردەوام بووە.

ئەوەی مایەی خۆشحاڵیە، چ لۆرەكان چ بەختیاریەكان هێشتا كە هاتە باس، خۆیان هەر بە كورد یان زۆر نزیك لێیان دادەنێن ناوی گەلێ جێگاو بابەتی سرووشتیی ناوچەكە هێشتا مۆركی كوردیان هەر پێوەیە، وەكو "شاری كورد"ی پایتەختی هەرێمی بەختیاری و ڕووباری "كوردستان"لە هەرێمی مەمەسەنی ناو لوڕەكانی نزیكی تۆكەندی فارس جگە لەمە وشەكانی زاراوەی لوڕی هێشتا هەر كوردین، هەرچەند سیستەمی كردارەكان و بیناكاری زاراوەكە فارسن.

لەم بوارەدا، جێی خۆیەتی سەرێك بەلای بلووچەكانیشدا شۆڕكەینەوە چیرۆكە میللییە بلووچییەكان و ئەو بابەتە مێژووییانەی لەلایەن بلووچیەكۆنەكانەوە تۆمار كراون دەڵێن كەوا ئەوان بە ڕەگەز كوردن.

گرنگترینی ئەو بابەتانە كوردگەلنامەك "كوردگەلنامە"یە كە ساڵی (١٦٤٠)ی پاش میلاد لەلایەن ئاخوند محەمەد ساڵح زەنگنە بلوچەوە نووسراوە (Ahmad Zai 1986). كورد گەلنامە واتە"چیرۆكە میللیە كوردییەكان" جگە لەمە، دەبێ ئامارژە بە دەپتەر شەعر یان شەجەر "دەفتەری سەجەرە"بكرێ كە بالۆرەیەكی كۆنی بەناوبانگە لەناو هەر (١٧) هۆزە سەرەكیەكەی بلووچەكاندا بالۆرە كە باسی ئەوە دەكا كە كورد و بلووچەكان لە یەك پشتن و دوایی لێك جیابوونەتەوە و هەریەكە بۆ خۆی ناسنامەیەكی نەتەوەیی وەرگرتەوە (بڕوانە Harrison1981،Dames1907 ) مەسەلەی ئەسڵی زمانی بلووچی دەتوانرێ لەم چوارچێوەیەدا ساغ بكرێتەوە كە ئەویش وەكو كوردی زمانێكی ئێرانی باكووڕۆژاواییە (بڕوانە زمان– ٢)، هەرچەندە، جێگەی لە جیاكردنەوەی خێزانییدا دەكەوێتەوە ئەوپەڕی باشووری ڕۆژهەڵاتی جیهانی زمانە ئێرانیەكانەوە واتە نزیكی ڕۆخەكانی ڕووباری ئیندۆس لە پاكستان بلووچییەكان، ئێستا زیاتر لە (١٠٠٠) میل لە نزیكترین خزمی زمانییان، واتە كوردان، دوورن.

هەرگیز لە هیچ تۆمارێكی پێش سەدەی پێنجەمی پاش میلاددا، تەنانەت باسێكیش چییە لە بارەی بلووچەوە نەهاتووە، لە كاتێكدا هەندێ گرووپی ئەتنیی دیكە (وەكو گیدروسی و مەكەكان كە لەسەرچاوە كۆنە یۆنانییەكاندا بە ئیهثیوفاگی یان ماسی خۆرەكان ناسراون) وا باسكروان كە ئەوان دانیشتووانی بلووچستانی ئێستاكە بوون. دەركەوتنی بلووچەكان هاوكاتە لەگەڵ هەڵقولانی كوردان لە ژمارەدا لە باشووری زاگرۆسەوە و داڕژانیان بەرەو باكووری ڕۆژاوا

.. لە شانامەدا وتراوە کەوا خوسرەوی یەکەم، لە گەڕانەوەیدا لە جەنگی هیندستانەوە بەرەنگاری بلووچ و دەیلەمییەکان بووە و هەر ئەو سەرچاوەیە خۆی باشووری زاگرۆس بە وڵاتی ئەسڵی ئەوان دادەنێ، واتە ڕێی نێوان هیندستان و تەسیفۆنی پایتەختی ساسانیەکان.

بوونی هۆزی شەبانکارەی کورد لە هەرێمی کرمانی دراوسێی بلووچستان، لە سەدەی هەشتەمەوە تا سەدەی چواردەیەم مەسەلەیەکی ساخکراوەی مێژوویی هاشا هەڵنەگرە. مێژووناسانی سەدەکانی ناوەند وەکو ئیبنی حەوقەل و ئیبنی خەلەکان (کە خۆی کوردێکی هەولێریە)، پێ لەسەر ئەو ڕاستییە دادەگرن کە پلووچەکان نەوەی هەندێ کوردن کە لە شوێنی خۆیان هەڵکەنراون و هاتوونەتە ئەو سەرزەمینە.

ئەو کۆچکاریە گەورەیەی کوردان کە لە سەدەی پێنجەمی پێش میلادەوە تا سەدەی پێنجەمی پاش میلادی کێشا، زۆر لە گوینە بووبێ بە مایەی دەرپەڕاندنی هەندێ خەڵك بە ئاراستەی بەرامبەردا، واتە، ڕووەو ڕۆژهەڵات: کرمان وسیستان و پلوچستانی ئێستا.

هۆکاری ئەم کۆچکارییە نائاساییە ڕووەو ڕۆژهەڵات، لەوانەیە خودی هێرشەکانی خوسرەوی یەکەم بووبێ. بەهەرحاڵ، ئەم کوردانەش لە پاشان ناسنامەی ئەتنیی خۆیان، وەکو کوردەکانی باشووری زاگرۆس گۆڕی. بە بۆچوونێکی بۆسوێرثیش (١٩٧٦)، بلووچەکان کە دراوسێی دەیلەمییەکان بوون، لە شوێنی خۆیانەوە لە دەورووبەری دەریاچەی خەزەرەوە هاتوون بۆ ئەم جێگایەی ئێستایان. هەرچەندە ئەم باسە، پەیوەندی نزیکی نێوان کورد و بلووچ دووپات دەکاتەوە، بەلام کەمتر ئەقڵ دەیگرێ، چونکە، ئەوەی تۆمار کراوە لەسەر جێگۆڕکردنی بلووچەکان، ئەوە ساغ دەکاتەوە کە ئەوان لە ڕۆژاواوە بۆ ڕۆژهەڵات هاتوون، چون باووباپیرانیان لە باشووری زاگرۆس ژیاون، نەك لە باکوورەوە بۆ باشوور، وەکو بۆچوونەکەی بۆسوێرث باسی دەکا. وابێ یان وانەبێ، بلووچەکان ئێستا گرووپێکی ئەتنیی سەربەخۆن، و لە پەیوەندی مێژوویی و زمانی بەولاوە فریان بە کوردەوە نییە.

دەرەنجامێکی چاوەڕوان نەکراوو خراپی ئەم شێوانە ئەتنییە لە باشووری زاگرۆسدا بەداخەوە، خۆی لەسەرلێشێوانی هەندێ لە مێژووناس و زانای ئەم سەردەمەدا گرتۆتەوە کە باس و خواسێکی زۆر و بۆریان لەبارەی لێوڕێژی ئەو هەرێمەوە بە کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەڵڕشتوە. ئەم باس و خواسانە، ئەو مێژووناس و زانایانە دەخەنە ناو گومان و ئاو

ناوە لە بارەی وشەی (كورد)ەوە. بە گوێرەی ئەوان، دەبێ وشەی كورد لەسەردەمەكانی دێریندا بە هەر كەسێك یان كەسانێك وترابێ كە ژیانیان بە مەڕداری و مەڕ لەوەڕاندن بردبێتە سەر، ئەم بۆچوونەش لەسەرەتاوە لەسەر ئەو ڕاستییە دامەزراوە، كە ئێستا مەگەر تاك و تەرا، ئەگینا ئەوەی لە ڕووی ئەتنییەوە بە كورد دابنرێ لە باشووری زاگرۆسدا نەماوە. ئەمە ئەنجامگیرییەكی سادەكارانەیە، چونكە تا ئێستا كەسێك توێژینەوەیەكی ئەوتۆی لەسەر جۆرە جیاجیاكانی كۆچكردن و گۆڕانی دیموگرافی كورد نەكردووە، تا بتوانێ بیكا بە بەردەباز بۆ بۆچوونێكی ئەوها گشتی و سەراپاگیر (بڕوانە ناسنامەی نەتەوەیی).

هەر لە سەدەی پانزەیەمەوە بگرە، بە بەردەوامی، هەتا نزیكەی چوارسەد ساڵ، كوردستان بوە بە مۆڵگەی خەڵكانی عەرەب، ئینجا ژمارەی زۆرتری ئارامی و تێكەڵەی تورك — مەغۆل. لەهەمان سەردەمدا، كوردەكان خۆشیان، بەلای تردا لە كۆچكردندا بوون. ئەمڕۆ ناوی عەرەبی و ئارامی و توركی و مەغۆلی بەسەر زۆر جێگاوەن لە كوردستاندا. چەند پەڵەیەكی بچووكی كەمی توركمان و ئارامی (كە ئێستا بە ئاشووری مەسیحی... ناسراون بڕوانە مەسیحیەت) لە كوردستانی عێراق و هەندێ جوولەكەی لێدەرچێ (كە ژمارەیان هەر لە كەمبووندایە) هەموو ئەم تازەهاتانە بە تەواوی لەناو كۆمەڵگای كورددا تواونەتەوە.

كوردەكانی ڕۆژاوا بە هاتنە سەركاری ئەیوبیەكان كەوتنە ڕۆژگارێكی خۆشەوە (سەدەی داونزەیەم) و دیسانەوە چوونەوە ناو گەلێ لەو سەرزەمینانەی كە لە ڕووی مێژووەوە بە هی كورد دادەنران و لە هەڵكەنرانەكانی سەردەمانی پێشوودا لە دەستیان دابوو، بەتایبەتی ئەوانەی دەم ڕۆژهەلاتی دەریای سپیی ناوەڕاست و هەروەها ئەوانەش كە دەكەوتنە مێزوپۆتامیاوە. هەندێ سەرزەمینی تری كورد، كە كەوتبوونە دەستی عەرەبە مسوڵمانەكان و ئارامییە مەسیحییەكانەوە، چ لە سەردەمی ئەمەوییەكان، چ لە سەردەمی بیزەنتییەكاندا، دیسانەوە داواكرانەوە. بۆ نموونە، زنجیرە چیای ئەمانۆس و دوڵی ئەمیق ساڵی ١١٤٩ لەلایەن شێركۆی ئەیوبییەوە (مەبەستی ئەسەدەدین شێركۆیە — وەرگێڕ) ستێنرانەوە و كەتنەوە دەستی كوردان، هەروەها ئەنتاكیەو ئەسكەندەڕۆنە ساڵی ١١٨٨ لەسەر دەستی سەلاحەدین خۆی وەرگیرانەوە و بەو جۆرە كوردەكان توانیان بگەڕێنەوە ئەو شارانەی (١٤) سەدە لەوەوبەر لە بنیاتنانیاندا دەستێكی بالایان هەبوو. كوردەكان هەر بەمەوە نەوەستان بەڵكو

بەرەو باشوور هەڵیانکوتایە سەر "قەڵای سوارچاکان یان "حصن الاکراد" کە نـاوی عـەرەبیی "قەڵای کوردان"ە لە چیاکانی ڕۆژاوای سوریا کە دەکەونە سەر دەریا تەنانـەت لوبنـانیش لـەم سەردەمەدا، دوای سێ سەدساڵ پێ برین لێی کوردی تێ زایەوە، هەرچەندە ئەم سەرزەمینانە هەموو دوایی بەرەبەرە عەرەبێنران، بـەڵام مـۆرکی کوردییـان هـەر پێوەمـا: ئێـستاش زۆریـەی هەرە زۆری دانیشتووانی ناوچە چیاییەکان و ئەو ناوچانەی کە دەکەونە سەر کەناری دەریـا لـە سوریا، بە حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریاشەوە، هەموو عەلەوی ئایینن (بڕوانە عەلەوییەت).

ئەم شەپۆلە نوێیەی کورد کـە لـەو شـوێنانە جـێگیر بـوون، هێـشتا شـوێن و شـوێنەواریان دەتوانرێ بە ئاسانی ببرێتەوە سەر ناوە هۆزیـەکانیان، هەرچـەندە خۆیـان بوونـە بـە عـەرەب. هـەر بـە نموونـە بیگـرین، خانـەوادەی بەدیمـەنی وەکـو بـەرازی بێـرازی، جیـبران گیـبران و جەمبەلات (مەبەستی جونبولاتە – وەرگێڕ) هێشتا هەر ئەو ناوە هۆزیانەیان هـەر پێوەیـە، کـە تا ئێستاش بنەسەرەکیەکانیان لە وڵاتی کوردستان هەر بە پێوەن و هاوار دەکەن.

وێکچوونە سەرەکیەکانی نێوان ئایینی درووزو تـیرەی فریـشتەکان، بەتایبـەتی عەلەویـەت، باس لە پەیوەندییەکی قووڵ و بەتینی نێوان پەیڕەوانی ئەم دوو ئایینە دەکا لە ڕابردوودا.

شـەهابەددین فـەزلوڵلا ئەلعومـەری ئینسایکلۆپێدیـستی میـسری (١٣٣٨ پـاش مـیلاد) لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ و بەنرخی لەکێتبە بەناوبانگەکەی "مسالك الأبصار"دا لـە بـارەی هۆزە کوردەکانی ئەو سەردەمەوە ئەنجام داوە. ئەو شتانەی لە بـارەی مەڵبەنـد و جێگـۆرکێی هۆزەکانەوە تۆمـاری کـردوون، ئـەو بۆشـاییە مێژوویـیـەیان پـڕ کردۆتـەوە کـە لـە تۆماریەندیـە کۆنەکاندا هەبوو وەکـو ئەوانـەی مەسـعوودی و ئیبنوحەوقـەل و یەکـەم مێـژووی سـەرتاپاگیرو لیستەگیری هۆزەکان کە شەرەفەددینی بیتلیسی لە (١٥٩٦ – ٩٧)دا کردوویەتی.

لە کۆتایی سەدەی سیانزەدا، سەربوردنامەی کۆچکردنی بە کۆمەڵی کـوردان بـۆ دەرەوەی کوردسـتان هاتـە کۆتـایی، بـەڵام لـە سـەرەتای سـەدەی چـواردەوە جـۆرە کۆچـکردنێکی تـر هاتۆتەکایەوە، ئـەم جـۆرە نوێیـە بریتییـە لـە کۆچـکردنی نـاوخۆیی، واتـە لـەناوخودی خـاکی کوردستاندا و بە ناسنامەیەکی نوێوە.

سیمای هەرە زەقـی ئـەم کۆچـکردنە ناوخۆییـە تەنینـەوەی بەرەبـەرەی کـوردە ڕەوەنـدە بەکرمانجی دوەکانە بۆ بەشەکانی تری کوردستان. (نەخشەی ژمارە ٣١)

بەر لەوە، ئەم كوردانە تەنها لەو هەرێمەدا دەگەڕان كە كەوتووەتە نێوان هەردوو گۆلی وان و ورمێوە و ناوچەرگەكەشیان وڵاتی هەكاری بوو، دوایی وای لێهات وردە وردە بەشەكانی تری كوردستانیان گرتەوە. لەم تەنینەوەیەدا، كوردە كشتوكاڵ پیشە ئاوایی نشینەكانیان دەرپەڕاند یان كردنیانە كۆیلە، كە زۆربەیان دیمیلی یان گۆرانی زمان بوون و تاك و تەرایان لێدەرچێ هەموو بە ئایین لە تیرەی فریشتەكان بوون. ئەم كوردە ئاوایی نشینانە وردە وردە بەرەو شارەكانی كوردستان ڕەتێنران، بەڵام داب و نەریتی ڕەوەندەكانیان وەرگرت و تەنها هەرێمە دیمیلی یان گوران نشینەكانی هەرە باكوور یان هەرە باشووری كوردستانی لێدەرچێ، ئەگینا، چ كورد، چ كوردستان لە زماندا زیاتر بەلای زاراوەی كرمانجی و لە ئایینندا بەلای مەزەبی سوننیدا شكان (بڕوانە ئایین و زمان).

لە باسكردنی هەر لایەنێكی دیموگرافی یان ژمارەی دانیشتواندا كە پەیوەندی بە كوردەوە هەبێ، دەبێ سەرزەمینی ئەرمەنستان لەسەرنج دەرنەكرێ، چونكە نزیكەی نیوەی سەرزەمینی مێژوویی ئەرمەنیان، لە ڕاستییداو بەرە بەرە خراوەتە سەرزەمینی كوردان (لە كوردستانی باكوور) لە پرۆسەیەكی چەند هەزار ساڵەی یەكبینی كۆچكاری و گیرسانەوەدا،(بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤).

هەر وەكو لە باسەكانی پێشوودا دەرمان خست، دەتوانین تا (٢٣٠٠)ساڵ لەمەوبەر بە ڕێچكەی گیرسانەوەی كورددا بەرەو ئەرمەنستان بچین. وا دەردەكەوێ كە كۆچكردن و گیرسانەوە و دامەزرانی كورد لە ئەرمەنستان، بگەڕێتەوە بۆ سەردەمە كۆنەكانی پێش ئیسلامەتی، بێ ئەوەی ئەو كۆچكەرانە مۆرك و نیشانی هۆزایەتی خۆیان لە دەست بدەن. كۆچكردنی بەردەوامی كوردان لە سەدەی پێنجەمەوە تا سەدەی پانزەیەمی پاش میلاد بۆ ناو خاكی ئەرمەنستان سەرەنجام بوو بە مایەی گۆڕینی پێكهاتەی ئەتنی ئەو وڵاتە. هەر لە سەدەی شەشەمەوە، لە هەر شوێنێكی ناوتەلموودا بەتایبەتی "تارگووم" باسی ئەرارات كرابێ، ئەوا مەبەست تەنها كوردستانە هەرچەند ئەرارات لە ڕووی مێژووییەوە بە ناوچەرگەی ئەرمەنستان دادەنرێ (بڕوانە تەلموود).

نەخشەی ژمارە (31): کۆچکردنی کوردەکان لە سەدەی (12)ی پاش میلادەوە تا ئێستا: نەخشەکە بڵاودان و تەنینەوەی هۆزە کۆچەرە، کرمانجی زمان و سوننی مەزهەبەکان دەردەخا.

ئاراستە و مەودای کرمانجیی باکوور لە کۆتایی هەر سەدەیەدا

ئاراستە و مەودای کرمانجیی باشوور لە کۆتایی هەر سەدەیەدا

ئەو شوێنانەی ئێستا زۆربەی دانیشتووانیان کوردن.

تێبینی: ئەم نەخشەیە لەسەر دابەشکردنی هۆزەکان چ لە رابردوو چ لەم دەمەی ئێستادا دروستکراوە. لە هەندێ نموونەدا، ئەم هۆزە رەوەندانەلەناو خەڵکی ناوچەکەدا تواونەتەوە، بە تایبەتی ئەگەر چووبنە دەرەوەی خاکی کوردستان. و لە ناوچە جیاییەکان دەرچووین. وەکو ئەوانەی کە کەوتوونەتە دەشتەکانی ئازەربایجانەوە.

لـە دەوروبــەری ســەرەتای ئــەم هەزارەیــەی ئێـستادا، لـە هــەموو كـون و قــوژبنێكی ئەرمەنـستاندا هـۆزێكی زۆری كـورد هـەبوون كـە هێـشتا هـیچ گـۆڕانێكی ئـەتنیكیان بەسـەردا نەهاتبوو. ئەوان لە دەوری كۆنە بازێڕی (دوین) كە دەكەوێتە باكووری یەریڤانەوە لەناوەڕاستی سەدەی دەیەمدا بـە چـڕی دەژیـان هـەروەها لـەوە و ژوورتـریش، واتـە لـە (ئـەنی) پایتـەختی ئەرمەنستانی باگراتی و لە كۆتایی سەدەی یازدەدا. ئەم كوردانـە بـوون بـە كۆتـەرەی چـەندین بنەماڵەی میرنشین كـە بـە درێـژایی چـەندین سـەدە حـوكمڕانی ئـەو هەرێمـەیان كـردووە. ئـەو كاتەی بزووتنەوەی كۆچكاری كـورد كەوتـە خاوبوونـەوە (ناوەڕاسـتی سـەدەی چـواردەیەم)، ڕێژەی دانیشتووانی كورد لە ئەرمەنستان تا ڕادەیەك لە سنوورێكدا ڕاوەستاو دەرەنجامی ئەمـە ئەوەی لێ كەوتەوە، كەوا دانیشتووانی شـارەكان بەگشتی ئەرمـەنی و دانیـشتووانی لادێكـانی دەوروبەر زیاتر كورد بن...

لە لایەكی ترەوە، فشاری لافاوی یەك لە دوای یەكی هۆزە كۆچـەرە تـورك ڕەگـەزەكان كـە لـە ڕۆژهەڵاتــەوە ڕووەو ســەرزەمینەكانی بیزەنتییــەكان دەهــاتن، ژمارەیــەكی زۆری خــەڵكی ئەرمەنی بـەرەو سیلیـسیای كـەناری دەریـای سپیی ناوەڕاست ڕادا و لـەوێ دەوڵـەتێكیان بـۆ خۆیان دامەزراند، ئەمە بوو بەهۆی برەودانی زیاتر بە كۆچكردن و لە كەمیدانی زیاتری ڕەگـەزی ئەرمەنی لەسەرزەمینی دێرینی ئەرمەنستان و سەرنجام زیاد بوونی ڕێـژەی دانیـشتووانی كـورد لەو سەرزەمینانەدا.

دەرنجامــە ماڵوێرانكــەرەكانی شــەڕ و ڕەتانــدنی بــە كۆمــەڵی ســەدەكانی (١٦–١٧) كاریگەرییـەكی گرانـی چ لەسـەر ئەرمەنیـەكان، چ لەسـەر كوردەكـان وەكـو یـەك هـەبوو، لـە ئەنجامدا، ئەرمەنیەكی زۆر بە خواستیی خۆیان قەلفڕیان لێكرد، پاش ئەوەی لـە وڵاتـی خۆیـان دەرەتانیان لێ بڕا. ئەم پرۆسەیە تا سەدەی نۆزدەیـەم هـەر بـەردەوام بـوو، ئەنجامەكەشـی وا كەوتەوە كە كۆمەڵگـەی وەرزێـڕی لادێ نـشینی ئەرمـەنی پـاش چـەند سـەدەی وەڕز كـردن و بێزراندنی بەر فـشاری سیاسـی و سـەختیی ژیـان، لـە سـەرزەمینەكەی خۆیانـدا كرژبوونـەوە و بوون بـە كەمایـەتی. لەگـەڵ ئەمەشـدا، تـا سـەرەتای سـەدەی بیـستەم، ئەرمەنیـەكان، پـاش كوردەكـان، گـرنگترین پێكهاتـەی ڕۆژهەڵاتـی ئەنـەدۆڵ بـوون و ئەگەرچـی ژمارەیـەكی كـەمی ئەرمــەنی لــە لادێكــانی دەوروبــەردا مانــەوە، لــە زۆربــەی شــار و شارۆچــكەكانی بــاكووری

کوردسـتاندا، ئەرمەنیـەکان نـەك بـەزۆری مانـەوە، بـەڵکو لـە زۆربەیانـدا زۆرینـەی زۆری دانیشتووانیشیان پێك دەهێنا.

لە ئەنجامی ئاگاداریی تەندورستی پێشکەوتوتر و خوێندەواری و خۆراکی باشتردا، ڕێـژەی دانیشتووانی ئەرمەنی لە سەدەی نۆزدەیەمدا زیـاتر پـەرەی سـەند بـە جۆرێـك کـە نـەك تـەنها ئاسەواری کۆچکردنەکانی سڕیەوە، بەڵکو لە دەرویەری گۆلی واندا ئـەوان بـوون بـە زۆرینـەی دانیشتووانیش، بەڵام ئەمە ئەوەندە بڕی نەکرد (بڕوانە دیموگرافیا).

لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئەم گەلە دێرینە لە ئاکامی چەندین هەڵمەتی سـەربڕین بە فیتی عوسمانیەکان و ڕەتاندن و قـەتڵوعام کـردن هـەر لەسـەر دەسـتی ئـەوان، کـە تێیانـدا سەرەك هۆز و ڕابەری ئایین و کرێ گرتە کوردەکان دەستێکی درێژیان هەبوو، لـەناوبرا (بڕوانـە سەرەتای مێژووی نوێ) ئەمـەش ئـەوەی لێکەوتـەوە، کـە بڵندایـیە ئەرمـەنی نـشینەکان تـەنها بەشە ڕەسەنەکەی دیکەی دانیشتووانی، واتە کوردەکانی، تێدا بمێنێتەوە. ئێستا، نزیکەی دوو بەش لە سێ بەشی کوردستانی باکوور لـە بەشـە کوردێنراوەکـانی ناوەڕاسـت و ڕۆژاوای خـاکی دێرینی ئەرمەنستان پێکهاتووە.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە لەسەرەلەقێی پێش مەرگدا و لە هـەموو بەرەکانـدا لـە شـکانی یەك لە دوای یەکدابوو لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ناچـار بـۆ پـارە و پـوول و سـەرباز کۆکردنـەوە، ملی دەنا بە هۆزە کوردە نیمچە سەر بە خۆکانی کوردستانەوە. شـان بەشـانی ئـەم هەوڵانـە، کـارێکی زۆر بـۆ نیـشتەجێ کردنـی کـوردە ڕەوەنـدەکان دەدرا کـە لـە سـنوورە بـە پیتـەکانی ڕۆژاوای کوردستان دەژیان تا بەو جـۆرە ژمارەیـان زیـاتر بـێ و بـاج و دەرامـەدی زیاتریـان لـێ بکەوێتەوە بۆ دەوڵەت، بۆیە پەرەسەندنی دە کەرەتەی دانیشتووان، کە بەشێوەیەکی ئاسـایی لە ئەنجامی گواستنەوە لە ئابووری کۆچەریەوە بۆ ئابووری کشتوکاڵی دێتە دەست، دەبـێ بـۆ عوسمانییەکان مایەی دڵخۆشییەکی یەکجار زۆر بـووبێ. لـە ئەنجامـدا هـۆزێکی زۆری کۆچـەری کورد خۆیان لە دەست بە تۆبزنیـشتەجێکردن دەربـاز کـرد و بـەرەو ڕۆژاوا و باشـووری ڕۆژاوا و لەوێوە چوون بۆ ڕۆژەلاتی چیای تۆرۆس تا نزیك ئەدەنە، هەروەها بەرەو چیاکانی ئـەمانۆس و باکوور و باکووری ڕۆژاوای حەڵەبیش پەرتەیان کرد (بڕوانە De Planhol 1959).

یاسای ژیانی ناو هۆزەکـان وایـە، ئەگـەر هۆزێـك بـە زۆر یـان بـە خوایـشت لەسـەرزەمینیك

نیشتەوە چاولێكەری وا لە هی تریش دەكا، دوایان كەون و بێنە دەوروویەریان. بۆ نموونـە، لـە زنجیرە چیاكانی ئەمانۆسی سەر دەریای سپیی ناوەڕاست، هاتنی هۆزی بەناوبانگی جانبولات، هەڵەتەكانی دەوروویەری لە بەردەم هۆزێكی كوردی تـردا كـردەوە، واتـە ڕەشـوەندەكان، كـە ئەوانیش لە سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتن و نیشتەجێ بوون لەوێ.

هەندێ هۆزی كۆچەری دیكەی كورد، ڕوویان كردە باشوور بۆ شوێنێكی دووردەستی وەكـو جەبەل سنجار لە وڵاتی جەزیرە، لـەوێ خۆیـان نـەك هـەر لـە بەرامبـەر هـۆزە كـوردە یەزیـدی ئایینەكاندا دیتەوە، بەڵكو بەرەنگاری هەنـدێ عـەرەبی كۆچـەریش بـوون كـە وەكـو مێـرووو لـە بیابانی عەرەبەوە بەرەو باكوور دەهاتن و لە وڵاتی خۆیان لەسەر بڕین بە دەسـتی وەهابیـەكان هەڵاتبوون و لەبەر ئەوەی چ كوردەكان، چ عەرەبەكان، هەر یەكەیان پاوانی خۆیـان هـەبوو بـۆ لەوەڕاندنی مـەڕ و ماڵاتـەكانیان گێروگرفتێكـی ئـەوتۆ لەسـەر لـەوەڕگا دروسـت نـەدەبوو: ئـەو لەوەڕگایانەی عەرەبەكان لە زستاندا بەكاریان دەهێنـا، لـە هاوینـدا دەبـوو بـەهی كوردەكـان و كـەس ئەوەنـدە لـە كـەس نەدەكـەوت، لەمـەوە گەلـەهۆزی نـوێ لـە هـۆزی كـوردو عـەرەب و توركمان دروستبوو كە پێكەوە لەم سامانە ئابووریەدابوون بە هاویەش، گـەلێكیان چـوونە ژێـر ئاڵای دامـەزراوەی بەدەسـەڵاتی هۆزبەنـدیی میلانـی یـان میللییـە كوردەكانـەوە. هـەر كۆمەڵـە خەڵكێك كە لەم گەلەهۆزە ڕۆژهەڵاتی سوریا نشینەوە تا كابێتـەوە ڕووەو ڕۆژاوا ڕۆیـشتووە و لـە هەرێمی بەپیتی ئەنتاكیە و ئەمانۆس نیشتۆتەوە.

بڵندییەكانی جەبەڵ سنجاری لێدەرچێ (كە قەڵای قـایمی كـوردە یەزیدیـەكان بـوو)، وڵاتـی جەزیرە كەڵكی جێگیربوونی بێ سەریەشەی پێوە نـەبوو. لـە سـەرەتای خاوەنداریـەتی سـاڵی (١٩٢٢)ی فەرەنسییەكان لە سوریا، لە هەموو هەرێمی باشـووری جـەزیرەدا، جگـە لـە هەنـدێ ئاوایی یەزیدی و بەدووی گـەڕۆكی عـەرەب بـەولاوە ئـاوەدانی تـری تێدانـەبوو (بڕوانـە حـۆڕانی ١٩٤٧—٨٠).

لەبەر بەپیت و بەرەكەتیی، حكوومەتی فەرەنسا، بڕیاریدا هەرێمەكە ئاوەدان كاتەوە، ئەمە لە هەمان كاتی ئەو هەڵقوڵانـە دیمۆگرافیـەیی ئەنەدۆڵـدا ڕوویدا كـە سـەدەها هـەزار خـەڵك، لـە ئاشووری و ئەرمەنی و عەرەب و سریانی و توركمان و كورد بۆ خۆپەنادان لـە دەسـتی سـوپای تورك لە ئەنەدۆڵەوە بە سوورەكانی سووریادا بۆ ناوەوەی ئـەو وڵاتـە ڕەویـان كـرد، ئـەوە بـوو

جەزیرە بوو بە مەڵبەندی ژمارەیەکی زۆری ئەو ڕەوکردووانە کە زۆربەی هەرە زۆریان کورد بوون.

ئاپۆرای هەرە گەورەی ڕەوکەرە عەرەبەکان چ مسوڵمان چ مەسیحی بەرەو ڕۆژاوای سوریا چوون کە لە بەشەکانی تری وڵاتەکە پێشکەوتوو تربوو، بەمە تای تەرازووی ئەتنیکی لەملا بەلای کوردەکاندا داهات چونکە لەو ڕەوەدا زۆربەیان لە دواوە مانەوە.

بەم ملنانە لەسەر خۆیەی عەرەب و ئەرمەنی و ئاشووری ڕووەو ڕۆژاوا ئێستاکە جەزیرە تەنها ناسنامەیەکی کوردانەی سفتی وەرگرتوە، ئەمە هەروا دەڕوا ئەگەر دەرکردنی بەکۆمەڵ و بە تۆبزیی خەڵکەکە لەوێ تێکی نەدا. ئەمە زۆر لەگویندایە چونکە زۆر لەم کوردانە هێشتا ناسنامەی هاووڵاتییەتی سوریایان پێ نەدراوە (ئەگەر چی ئەوان لە سێ پشت زیاترە کە لەو وڵاتەدا دەژین) بە بیانووی ئەوەی گوایە "تازە هات"ن و لەودیوی سنووری ئێستاکەی سووریاوە دزەیان کردۆتە ئەمدیو.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: T. Cuyler Young, Jr., "The Iranian Migration into the Zagros," *Iran* V (1967); R.H. Dyson, "Architecture of the Iron I Period at Hasanlu in Western Iran and its Implications for Theories of Migration on the Iranian Plateau," in *Le plateau iranien et l'asi centrale des origines à la conquête islamique* (Paris: Colloques internationaux du centre national de la recherche scientifique, No. 567, 1976); N. Pigulevskaya, *Goroda Irana v Pannem Crednevekovie* (Leningrad, 1955), in French translation, *Les Villes de l'Etat Iranien* (Paris, 1963); Aram Ter-Ghewondian, *The Arab Emirates in Bagratid Armenia*, trans. N. Garsoian (Lisbon: Livraria Bertrand, 1976); Moses Khorenats'i, *History of the Armenians*, trans. Robert Thomson (Cambridge: Harvard University Press, 1978); Albert Hourani, *Minorities in the Arab World* (London: Oxford University Press, 1947); Ismet Vanly, "Le déplacement du pays Kurde vers l'ouest, X-XV siècles, étude de géographie et de sociologie historieques," *Actes du XXIX Congrès International des Orientalistes* (Paris, 1973); Agha Naseer Khan Ahmadzai, "Akhund Muhammed Saleh, the author of Koordgal-Nâmak," *Newsletter of Baluchistan Studies* 3 (Napels, 1986); C.E. Bosworth, "The Kufichis or Qufs in Persian History," *Iran* XIV (1976); Claude Cahen, *La Syrie du Nord* (Paris: Institut farançais de Damas, 1940); Rene Dussaud, *Topographie historique de la Syrie antique et Medievale* (Paris, 1927).

# كۆچكردن و دەربەدەری

لە چارەكە سەدەی ڕابردوودا، كوردان پەیتا پەیتا لەناوچە لادێییە ئابووری لاوازەكانەوە لەپێشدا ڕووەو شارە گەورەكانی كوردستان هاتوون و دوایی بەرەو شوێنی تری ناو ئەو وڵاتانەی ئێستا تێیاندا دەژین و زیاتر دەرفەتی كارو كاسبی ژیندەنییان تێدا هەیە چوون. لە توركیا، بۆ نموونە، كە كوردێك لەجێی خۆی هەڵدەكەنرێ، ئەستەمووڵ مەنزڵگەی یەكەمیەتی، دوایی ئەو ئەنقەرە، ئینجا ئەدەنە، چوارەم ئیزمیرە. لەبەر دوور دەستی، لە ئێرانیش جێگۆڕكێ كردنی كوردان، لە چوارچێوەی كوردستاندایە، لەوێوە بەرەو تاران كە پایتەخت و دایكە شاری وڵاتەكەیە. لە پاڵ ئەمەدا وردە گواستنەوەش. هەرچەندە گەلێك لەوە كەمترن، بەرەو شارە نەوتزاكانی چون ئابادان و ئەهواز لە هەرێمی خوزستان و تەورێز لە ئازەربایجان هەیە تەورێز زیاتر مەنزڵگەی كوردەكانی بەشی ژوور سنەی كوردستانی ئێرانە.

لە عێراق، كوردەكان بە خێرایی بوونە شارنشین، شارە كوردنشینەكانی ناوچەكە خۆی هەندەی بەغدا خەڵكی نوێیان گرتۆتە خۆ. لە شاری كوردنشینی كەركووك كە مەڵبەندی سەروەتی نەوتی عێراقە، كوردەكان لەگەڵ ناكوردەكاندا هەمیشە لە پێشەبڕكێدا بوونە بۆ پڕكردنی بازاڕی كارو دروستكردنی زۆرینەو كەمینە ئەتنیكی هەم لەناو شارەكە و هەم لە دەوروبەرییدا. گواستنەوەكاری بەخوایشتی كوردان لە عێراقدا، بەهەرحاڵ، بە دەستی حكوومەتە بەك لە دوای یەكەكانی ئەو وڵاتە بەربەست كراوە و دەبێ لە چوارچێوەی ئەو ڕاستییەدا بخوێنرێتەوە (بڕوانە ڕەتاندن و بە زۆر جێگركردن).

كۆچكردن بۆ دەوروبەری ئەو پێنج دەوڵەتە سەربەخۆیەش كە لە وڵاتی كورداندا هاوبەشن لەم ساڵانەی دواییدا ڕووی لە پەرەسەندن بووە. زۆربەی كوردە كۆچكەرەكان ڕوودەكەنە ئیسرائیل و لوبنان و وڵاتانی كەنداوی عەرەب. و ئەم وڵاتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لێدەرچێ، بۆ ئەڵمانیا و ئەوستریا و فەرەنسا و سوید و ئوسترالیا و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا.

كردنی لێكدانەوەیەكی باش بۆ ژمارەی ئەو كوردانەی لە دەورەبەری كوردستان دەژین، لەبەر هۆی زانراو، ئاسان نییە. با توركیا وەرگرین، قایا تۆپەریی و تەبێژی دەوڵەتی توركیا لە

چاوپێکەوتنێکی ڕادیۆیی کە لە (١)ی مارسی ١٩٩١ لەگەڵ "ئەمریکان ناشنال پەبلێك ڕادیۆ"دا کردوویەتی دەڵێ لەو ٧–١٢ ملیۆن بەڕەگەز کوردەی کە لە تورکیا دەژین، دوو لە سێ یان لە دەرەوەی هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵات دەژین. کوردەکان خۆیان لەو باوەڕەدان ئێستا لەسێ یەکەوە تا نیوەی گەلەکەیان لە تورکیا، لە دەرەوەی سنووره دێرینەکانی کوردستان دەژین (وانلی ١٩٨٦).

بەڵگەی زۆری تریش بەدەستەوەن کە پشتگیری ئەم ڕاستییە ڕاچڵەکێنە دەکەن، ئەو بزوێنەرانەی کە شان بەشانی پەرەسەندنی تەقینەوە ئاسایی دیموگرافیی لەناو کورداندا ڕوودەدەن یەکێکن لەو بەڵگانە. ئەگەر ڕووباری فورات بە سنووری باکوور و ڕۆژاوای سەرزەمینی کوردستان دابنێین لە تورکیا، بۆمان دەردەکەوێ کە زۆر وێ دەچێ کە زیاتر لە نیوەی کوردەکانی ئەنەدۆڵ لە دەرەوەی ئەم هەرێمە بژین و لەوانەشە، لە دەربەدەری لە بەشەکانی تری تورکیا سەریان کزکردبێ. لە مانە، نزیکەی نیوەیان لەوانەیە لەو سەرزەمینانە بژین کە دەکەونە باکوور و ڕۆژاوای ڕووباری فوراتەوە، واتە لە زنجیرەی چیاکانی تۆرس و پۆنتۆس، بە شارەکانی ئەدەنەو سیواسیشەوە، نیوەکەی تر لەوانەیە لە بەشە دابڕاوەکەی ئەنەدۆڵی ناوەند و شارە سەرەکییەکانی ڕۆژاوا و ناوەندی تورکیا، کە گرنگترینیان ئەستەموڵ و ئەنقەرە و ئیزمیرن بژین. ئەگەر گشت جۆرە گۆڕانێکی هەژێنەر لە تورکیا بە دوور بگرین، ئەم بەزمە هەر بەم نەزمە دەڕوا و کوردی زۆرتر لە داهاتووی دیاردا ڕەهەندەی بەشەکانی تورکیا دەکات، هەر ئەمە خۆشی دەبێتە هۆی ئەوەی تورکەکانی تورکیا باشتر لووتیان ببێ بە لووتی هاووڵاتیە کوردەکانیانەوە و باشتریش بیانناسن.

چونکە کورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی نییە تا پاسپۆرت بۆ هاوڵاتیانی دەرکا، کەس پاسپۆرتی کوردیی پێ نییە، بۆیە زۆر گرانە بتوانی ژمارەی کوردان لە وڵاتانی بێگانە دەستنیشان کەی. زۆر سەرچاوە سەرجەمی ژمارەی کوردی دانیشتووی ئێستاکەی لوبنان بە (٥٠٠٠٠) کەس دەستنیشان دەکەن، ئەگەر وابێ، دەبێ ژمارەی کوردی لوبنان (٦٪ی دانیشتووانی گشت وڵاتەکە) لە ژمارەی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران زۆرتربێ (١٤٪) کە چەند پارچەیەکی وردی سەرزەمینی کوردستانی بەدەستەوەیە، ئەم ئەنجامە سەرسووڕێنەر نییە، ئەگەر لە چوارچێوەی جێگیربوونی پەردەوامی کورد لە لوبناندا تەماشا بکرێ (بڕوانە کوچکردنە مێژووییەکان).

## چەردەباسێك لە بارەی كوردانەوە

گەلێ ڕێكخراوی كورد ژمارەی كوردانی دانیشتووی وڵاتە ئەوروپاییەكان بە نیوملیۆن تا سێ چارەكە ملیۆن دادەنێن. لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا، لە (١٩٣٠)كانەوە یەكەم سەرەتای كۆچكەرەكان گەیشتوونەتە باكووری دۆڵی ئوهایۆ و ناوچە پیشەسازیەكانی ڕۆژهەڵاتی میشیگان، ئەوانە ئەو پەنابەرانە بوون كە پاش شەڕ و ڕاپەڕینەكانی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ و داوی سەرهەڵدانەكەی خۆیبوون خۆیان گەیاندبووە ئەوێ، ژمارەیان نزیكی ١٠٠٠ كەسێ بوو (بەدرخان و پلەچ ١٩٣٠) و وەكو دەردەكەوێ تواونەتەوە لەناو كۆمەڵگای ئەو وڵاتەدا. دووەم شەپۆلی كۆچكەر و پەنابەری كورد ساڵی ١٩٧٠، پاش هەرەسهێنانی شۆڕشەكەی ژەنەراڵ بارزانی لە كوردستانی عێراق. گەیشتنە ئەمەریكا.

ئێستا نزیكەی ٣٥٠٠٠ كورد لە وڵاتە یەكگرتووەكان دەژین، زۆربەیان ئێرانین، لە شۆڕشەكەی ئێران و لە ئەنجامییدا، تا ٧٥٠٠٠٠ ئێرانی ڕوویان كردە ئەمەریكا، كوردەكان نزیكەی ١٢٪ی ژمارەی گشتی دانیشتووانی ئێران پێكدێنن، بۆیە زۆر لە ڕاستی دوور ناكەوینەوە گەر بڵێین ٣٪ی ئەو ئێرانیانەی لەوڵاتە یەكگرتووەكان دەژین كوردن، ئەگەروا حیسابی كەین، ئەوا ژمارەكە خۆیدەدا لە ٢٣٠٠٠ كەس و ئەگەر نیوەی ئەم ژمارەیە بۆ كوردانی بەشەكانی دیكەی كوردستان دانێین، كە ٧٦٪ی گشت كوردانیان تێدا دەژین، ئەو ٣٥٠٠٠ كەسەكە زیادەڕۆیی تێدا نەكراوە.

چەندین ڕێكخراوی كورد لە غەریبایەتی، خۆیان بۆ پەروەردەكردنی منداڵان و كاری ڕووناكبیری بە كوردی تەرخانكردووە، وڵاتانی داكەری ئەو كوردانە، هەر كەسە بە گوێرەی خۆی یارمەتیان دەدەن لەمەدا، لە سوید حكوومەت پرۆگرامێكی بەرینی بۆ كوردە هاتووەكان داناوە و ئێستا كتێبی قوتابخانە، هەواڵنامە و شتی تر بە هەردوو زاراوەی كرمانجی باكوور و باشوور بە دوو پیت (لاتینی و عەرەبی/ وەرگێڕ) دەردەكا، تا بەم جۆرە، پێویستی كوردەكانی عێراق هەروەها توركیاش دابین بكا (بڕوانە زمان و پەروەردە).

لە فەرەنسا و ئەوستریا (نەمسا) و تا ڕادەیەك ئەڵمانیاش، حكوومەت پارەی بۆ چاپ و بڵاوكردنەوەی نووسراوی كوردی و چالاكی دیكەی فەرهەنگی و پەروەردەیی تەرخان كردووە و ئەم هەوڵانە، بەهەرحاڵ، گەلێ لە خوار ئەوانەی سویدەوەن كە بەڕاستی كەم وێنە و ئاراستەدار و بەهێزترن.

لە کاتێکدا لە کەنەداش هەندێ باربووی دارایی و تەکنیکی، بەتایبەتی بۆ کاروباری کتێبی قوتابخانە و پەروەردە بەگشتی، لە ئوسترالیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە دانیشتوویەکی زۆرتری کوردیان لێن، نەهیچ کراوە و نەهیچ دیارە بکرێ. ئەنجامی ئەمەش لەوەدا ڕەنگی داوەتەوە کە هیچ ئاسەوارێکی فەرهەنگی و پەروەردەیی کوردی لەم وڵاتەدا نەکەوتۆتە ڕوو، تاقە سەنتەرێ، بۆ کوردۆلۆجی کە لە ڕۆژاوی جیهان هەبێ، کتێبخانە و مۆزەی کوردیە لە بروکلین – نیویۆرك، کە سەرتاپای چالاکیەکانی بە پیتاکی خەڵك و خواوە، دەگەڕێ.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography:** A valuable reference book on the achievements and engagements of Kurds in diaspora is Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico internationa, 1991); Marcel Bazin et al, *Gilân et Âzarbâyjân Oriental: Cartes et Documents Ethnographiques* (Paris: A.D.P.F., 1982); Ismet Ch. Vanly, *Kurdistan und die Kurden*, vol. 2, *Türkei und Irak* (Göttingen: Gesellshaft für bedrohte Völker, 1986); Sureya Badir Khan and Chirug Bletch. *La Question Kurde* (Cairo, 1930); Sharaf al-Din Bitlisi, *Chèref-nameh [ Sharafnâma] ou Fastes de la nation kourde*, French trans. Charmoy, 2 vols. (St. Petersbourg, 1868-75).

# کۆچ پێکردن و بە زۆر نیشتەجێکردن

بارپێکردن هەمیشە لە مێژووی کورددا ڕۆڵێکی گران و کاریگەری بووە، هەر لە دەورووبەری دوو هەزارەی پێش میلادەوە و لە دەرکەوتنی یەکەم ئیمپراتۆریی ئەکەدی و ئاشوورییانەوە، بە زۆر بارپێکردنی بە کۆمەڵەی دانیشتووانی سەرزەمینە کوردنشینە داگیرکراوەکان کارێکی ئاسایی و بێ چوون و چرابوە (بڕوانە Wright and Johnson1995) پشتەڵەکی مێژوویی ئەم مەسەلەیە لە هەردوو بابەتی (مێژوو) و (کۆچکردنە مێژووییەکان)دا باس کراوە.

سیماو سروشتی ئەو سیاسەتانەی کە دەبوونە مایەی بە زۆر بارپێکردن و درێژەپێدانی هەرچییەك و هەر چۆنێك بووبن، گۆڕانی دیموگرافیی زۆر قووڵیان لێکەوتۆتەوە، چونکە ئەو سیاسەتانە لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خەڵکانی تریان لێکەوتووتەوە بۆ پڕکردنەوەی جێگای بارپێکراوەکان، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، بارپێکردنە هەرە کۆنەکانی

کوردەکان لەلایەن ئاشوورییەکانەوە بەباشی دۆکومەنتبەندی کراون، بوستەنای ئۆدەد باسی هەژدە (١٨) جاری جیاجیای بارپێکردنی بە کۆمەڵ دەکا لە باشوور و ناوەندی کوردستانەوە (مادایا) و (١٢) جاری تر لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە (مەننا) تەنها لە قۆناغی نۆ – ئاشووری ئەو ئیمپراتۆریەدا (٧٤٥–٦١٢ پێش میلاد).

زۆرێکی زۆر لەم بارپێکراوانە لەسەرزەمینەکانی نزیك سێ پایتەختی ئاشورستان جێنشین کران (ئاشوور، کەلهو، نەینەوا)، کە هەموو دەکەونە سەر بەشی ژوورووی ڕووباری دیجلە بەرامبەر بە گرد و چیاکانی کوردستانی ناوەند)، لە کاتێکدا ئەوانەی کە لەو سەرزەمینانە دەژیان بەرەو شوێنی دوور دەستی وەکو ڕۆخەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست و هەرێمی ئونکی (کە لە پاشدا بوو بە ئەنتاکیە) ڕەتێنران. گەلێ خەڵکی تر لە شوێنی دیکەوە بە زۆر هێنران و لە خانوبەرە چۆلکراوەکانی ئەواندا داکران.

سەرەنجام ئەو خەڵکەی کە بە زۆر بۆ نزیك شارە سەرەکییەکانی ئاشوورستان لە هەرێمە دوورەکانەوە دەهێنران زیاتر بوون لەوانەی کە باریان پێدەکرا (ئۆدەد ١٩٧٩). بەهەرحاڵ، ژمارەیەکی زۆری ئەو خەڵکەی بەری لێقەومانەکەیان نەدەگرت چونکە بژێوی ئەوتۆیان نەبوو پێی بەڕێوەبچن، ناچار دەبوون بەمشوور خۆیان لەگەڵ بارودۆخەکەدا بگونجێنن، لەم ناوەدا. تەنها ئەوانە توانیان دەربەرن کە لە شارەکاندا دەژیان (بۆ نموونە جوولەکەکان).

لەبەر نزیکیی لە شادەماری ئاشوورییەکان، کوردستانی ناوەند لە هەموو هەرێمەکان پتر دووچاری گیروگرفت بوو. جارێکیان بە یەك قەڵەم ٦٥٠٠٠ کەس لە هەرێمی سولەیمانی ئێستاوە (کۆنەشارە دەوڵەتی نەمری) لە کوردستانی ناوەند ڕەهەندەکران، ئەمە ژمارەیەکی یەکجار زۆر گەورەیە چونکە نزیکەی هەموو دانیشتووانی هەرێمەکەی دەگرتەوە لەسەردەمەدا، و لەو دەمەدا هەموو دانیشتووانی کوردستان لە ملیۆن و نیوێك تێ نەدەپەڕین (بروانە دیموگرافیا).

وەکو دەردەکەوێ، کوردستانی ناوەند کە جاران جمەی دانیشتووانی دەهات، ئێستا بەمەو بە (١٤) دەست ڕەهەندەکردنی دیکە بوو بە نیمچە چۆڵەوانیەك، بەجۆرێك کەی ئەخساری (سیاخاریس) پادشایی ماد، یەکەم کاری دوای ڕووخاندنی ئیمپراتۆری ئاشووری، هێنانی ژمارەیەکی زۆری ساگاری بوو لە هەرێمی باشووری کوردستان و باکووری لوڕستانەوە تا وڵاتەکەی پێ ئاوەدان بکاتەوە.

گەلێ بەڵگەی تر لەسەر ئەم ڕەهەندەکردن و نیشتەجێکردنە بە دەستەوەن. بەگوێرەی ئەوەی لە تەلموودا باسکراوە، ئاشوورییەکان هەندێ لە جوولەکە ڕەهەندەکانی دەریەدەرکردنی یەکەمیشیان لە کوردستان جێگیر کردووە، هەرچەندە ئەمانە لە ژمارەدا ئەوەندە زۆر نەبوونە.

ڕەهەندەکردنی کوردان لە هەندێ سەرچاوەی فارسی سەدە ناوەندەکانیشدا باسکراوە و لێرە و لەوێ ئاماژەی بۆکراوە، جگە لە ڕەهەندەکردنی هەندێ لە بارزانیان بۆ هەرێمی کارمانیا (کرمانجی ئەم سەردەمە) ئاپۆرایەکی گەورەی بلووچیش بەزۆر بەرەو بیابانە وێرانەوارە بورکانیەکانی ماکران (بلووچستانی ئێستا) لەسەر دەستی خوسرەوی یەکەمی ئەنوشێروان (د/٥٣١–٥٧٩ پاش میلاد) و خوسرەوی دووەمی پەروێز (د/٥٩١–٦٢٨ پاش میلاد) ڕەتێنراون، لەبەر ئەوەی بلووچییەکان خۆیان لەو کاتەدا لە بارکردندا بوون، لەوانەیە فشاری ساسانیەکان هەر ئاراستەی کۆچکردنەکەیانی گۆڕیبێ بەرەو ڕۆژهەڵات و بەوە لە ڕێچکەگیری کوردەکانی تری لادابن کە لەو دەمەدا زۆرترین ڕووەو باکووری ڕۆژاوا دەچوون، جگە لەمە ساسانیەکان، لە سەدەی سێیەمی پاش میلاددا چەند جار ناوچەی کەرکووکیان بە هێنان و نیشیتەجێکردنی ئەو خوزیە نۆئیلامیانەی کە لە هەرێمی میشان/ مەیسان هەڵیانکەندبوون سەرلەنوێ پڕ کردۆتەوە.

لە سەردەمی دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، ئیمپراتوریی بیزەنتی بەسوود وەرگرتن لە لاوازبوونی دەسەڵاتی سوپایی مسوڵمانەکان لە سەدەی (١٠)ەوە تا (١٢)، دیسانەوە کەوتەوە تەنینەوە بۆ ئەولاتری سنوورەکانی، ئەوەبوو هەموو ئەنەدۆڵ و قەفقاسی گرتەوە و تا سنوورەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ئێستای تورکیا چوو. هەر کە ناوچەکانیان داگیرکرد، بیزەنتییەکان یەکسەر کەوتنە سەربڕین و بەزۆر ڕەتاندنی هەموو دانیشتووانە نامەسیحییەکان کە زۆربەی هەرە زۆریان کوردبوون لەسەرزەمینەکانی ڕۆژاوای ڕووباری فورات و باکووری هالیس (قیزیل ئیرماق) لە ڕۆژهەڵاتی تۆرۆس توانیان دانیشتووانە کوردە دێرینەکانی کۆماجین، کەبەدۆچیا، ڕۆژهەڵاتی پونتۆس و تاڕادەیەك ناوچەی جەزیرەش لە ڕەگەوە دەرکەن. لەجیاتی ئەمان، بیزەنتییەکان، بەتایبەتی لەسەر دەستی، ئیمپراتۆر نیسفورەس فۆکەس (د/٩٦٣–٩٦٩) دەستیان کرد بە هەڵمەتێکی بێهودەی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتە کۆن کوردنشینەکە

بەهێنانی هەندێ ئارامی مەسیحی كە تۆمارگرە بیزەنتییەكان لە نووسینەكانیاندا "سووریایی سپی" یان پێدەڵێن.

لیستەی ئەو شارانەی نیسیفۆرەس بۆ ئەم ئاوەدانكردنەوەیە دەستنیشانی كردوون كورتە باسێكی ئەو شوێنانەمان بۆ دەگێڕنەوە كە چۆڵدەكران و لەهەمان كاتدا ئەو وێرانكاری و ماڵوێرانیەش كە ئەستۆی خەڵكەكەی دەگرتەوە، مالاتیە، ماراش، ئورفە، قەیسەری، سیواس و ئەرزنجان، هەروەها دیاربەكر و ماردین و نەسیبین لە جەزیرە تەنها وردە نموونەی ئەم لێقەومانانەبوون، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو، دەركەوت ئەم ستراتیژیە دڕندانەیەی بە زۆر ڕەتاندن و ئینجا ئاوەدانكردنەوەیە بوو بە چ بەڵایەكی كوشندە و ملشكێن بۆ بیزەنتییەكان خۆیان. هەرچەندە ئەوان هەوڵ و تەقەلایەكی زۆریان بۆ پڕ خەڵككردنەوەی هەرێمەكەدا، بەڵام نزیك یەك سەدە لەوەودوا، لە كاتێكدا وڵاتەكە نیمچە چۆڵەوانیی بوو، لێشاوی كۆچەری تورك ڕەگەز پاش شەڕی مانزیكەرت (١٠٧١) ڕشانە ئەنەدۆڵەوە و دەسوبرد هەموو ئەو سەرزەمینانەیان گرت كە بیزەنتییەكان بێ خۆگرتنێكی ئەوتۆ بەجێیان هێشتبوو.

وانەبوایە واتە گەر دانیشتووانە كوردە ڕەسەنەكەی سەخڵەت نەكرایەو بە پاڵە پەستۆ و بەزۆر دەرنەكرایە، ئەوا هیچ گومان لەوەدا نەبوو كە بەریان لە لێشاوەكە دەگرت و سەرزەمینەكە نەدەبوو بە لەوەڕگەیەكی بەپیت ئەو داگیركەرە سەرهەڵگرتوانەی تێدا بزەڵێنەوە و بیكەن بە مۆلگە بۆ هاتنی شەپۆلی دوای شەپۆلی بیابانشینی توركڕەگەز، تا هەموو وڵاتەكە و دوپماكار دەوڵەتی بیزەنتەش داگیركەن. ئێستا پاش ئەوەی چەند سەدە بەسەر ئەو كارەساتەدا دەگوزەرێ، كوردان بە ئاشتی و لەسەرخۆ داوای گێڕانەوەی ئەو سەرزەمینە لە دەستچوانەیان دەكەنەوە.

هەر لە شەڕی چالدێرانەوە (١٥١٤) و بە درێژەتا مۆركردنی ڕێكەوتننامەی زەهاو (١٦٣٩) لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی دەستەویەخەی ئێران و عوسمانییدا، ئێران، تا ڕادەیەكی كەمتر عوسمانییش، هەر خەریكی جێبەجێكردنی سیاسەتێكی دڕندانەی چۆلكردنی بە زۆری كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا بوون. ئەم سیاسەتە، پێنج ئامانجی سەرەكی دەگرتەبەر بە ڕەهەندەكردنی كوردان بەگشتی: ١) دڕپێدان و لێك ترازاندنی ئەو هۆزانەی كە شەڕەنگێزبوون، یان لێیان دەوەشایەوە و گرانیی تایبەتیان هەبوو ٢) كردنی بە زۆری كوردەكان بە پاسەوانی

شوێنە ناسکەکانی سنووری ئیمپراتۆریەت لە دەرەوەی کوردستان ۳) ئاوەدانکردنەوەی هەندێ هەرێم لە دەرەوەی کوردستان کە دەوڵەت مەبەستی بوو پڕ زەلام بکرێنەوە، ٤) لابردنی هەندێ ئەو دانیشتووانانەی کە دەوڵەت لە دڵسۆزییان دوودڵ بوو، ٥) کردنی هەر هەرێمێك کە دەوڵەت لە دڵسۆزی بە گومان بوو بە چۆڵەوانی تا هیچ دەرفەتی حەوانەوەی بۆ دوژمن تێدا نەمێنێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکەکە هەموو دەردەپەڕێنراو سامانی کشتوکاڵ و ئابووری تەفروتوونا دەکرا، واتە سیاسەتی سەرزەمینی سووتاوی تێدا بەجێ دەهێنرا، .((Perry1975

هەرچی سەفەویەکان بوون لابردنی دانیشتووان لە سنوورەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانییدا لە کوردستان و لە قەفقاسەکان بایەخێکی ستراتیژی یەکجار زۆری بۆیان هەبوو، لەوەدەچێ ئەمان تەنانەت بە مسۆگەرکەری مانەوەی ئیمپراتۆریەکەیان دانابێ، بەم جۆرە، ئەوەبوو هەزار کورد لەگەڵ خەڵکێکی زۆری ئەرمەنی و ئازەری و تورکمان بە زۆر لە هەرێمە سنووریەکان هەڵکەندران و لەناوەوەی خاکی ئێراندا نیشتەجێ کرانەوە. هەر کە سنوورەکان بەرەبەرە بەرەو ڕۆژهەڵات خزان، و عوسمانیەکان زیاتر بۆ ناو خاکی ئێران ترازان، چەندین هەرێمی کوردنشینی ئەنەدۆڵ کەوتنە بەر تاڵانکردن و بە زۆر گواستنەوە، ئەم پرۆسەیە لە سەردەمی شاه تەهما سەپی سەفەوییدا دەستی پێکرد (د/١٥٢٤–١٥٧٦). لەنێوان (١٥٢٤)ەوە تا (١٥٣٥) تەهما سەپ دەستی کرد بە بەرنامەیەکی یەکبینی وێرانکردنی شار و لادێ کوردنشینەکان هەرچی دەغڵودانێك بەپێوە بوو ئاگری تێ بەردراو هەموو دامەزراوەکانی ئاودێری سەرەوژێرکران، بیر و جۆگەلەیان پڕکرانەوە یان ژەهراوی کران، کاتێکیش کە لەبەردەم سوپای عوسمانییدا پاشەکشێی دەکرد، تەهما سەپ، فەرمانی دا هەرچی دەغڵودان و مەزرا و ئاوەدانی هەیە، گەورە یان بچووك، خاپوور بکرێن و دانیشتووانەکەی بەزۆر بەرەو ئازەربایجان دایە پێش، دوایی بە وێشەوە نەوەستا، ڕەهەندەی نزیکەی (١٠٠٠) میل دوورتری کردن بەرەو ڕۆژهەڵات تا گەیشتنە خۆراسان. هەندێ هۆزی کورد، لەوێشەوە، بەرەو گەلێ دوورتر ئەفەرۆز کران تا لە غارجستان، لە چیاکانی هیندوکوش (لە ئەفغانستانی ئێستا) خۆیان گرتەوە، واتە نزیکەی (١٥٠٠) میل دوور لە ماڵ و موڵکی خۆیان لە کوردستانی ڕۆژاوا .

قەوارەی ئەو گەردەلوولی وێرانکاریەی لەسەر دەستی سەفەویەکان کەوتەوە، مەگەر لە

نووسینی مێژوونووسەکانی دەرباری سەفەوییەوە هەڵێنجریٚ. یەکێك لەوانە، ئەسکەندەریەگی مونشییە، کە تەنها باسی یەکێك لەو لێقەومانە گەورانە دەکات، ئەو لە "عالەم ئارای عەبباسی"دا دەڵیٚ کەوا شا عەبباسی یەکەم لە درێژەدانی سیاسەتی زەمینی سووتاو کە لەلایەن شاهانی پێش خۆیەوە بەرپا کرابوو" هێرشی بردە سەر ئەو ولاتانەی دەکەوتنە باکووری ئاراس و ڕۆژاوای ئورمیەو نێوان فارس و گۆلی وانەوە واتە کوردستانی باکوور و فەرمانی دا ولاتەکە خاپوور و خەڵکەکەشی چ شارنشین چ لادێی کۆبکرێنەوە و لە دروستکردنی مەترسی بخرێن" هەروەها دەڵیٚ کەوا "هەر بەربەرەکانییەك بە سەربڕین و پلیشاندنەوە وەلام درایەوە، هەر سامانێکی نەگوازراوە کە هەبوو وەکو خانوبەرە، کەنیسە، مزگەوت هەروەها دەغلۆدان گشتی لەناوبرا، گیراوەکان بە گەلە بەرەو ڕۆژهەلاتی باشوور بەر لەوەی عوسمانیەکان بکەونە دژە هێرش، ڕادران" (بڕوانەPerry1975) گەلیٚ لەم کوردانە خۆیان لە خۆراسان گرتەوە، هەندێکی تریان بەدەوروبەری چیاکانی ئەلبورزو ناوەندی ئێران و تەنانەت بلووچستانیشدا پەرتەوازە بوون، لەو شوێنانە بوون بە ناوکی دروستبوونی چەندین قەوارەی مۆدێرنی کورد لە دەرەوەی خاکی کوردستان، لە ئێران و تورکمانستان.

هەرچەندە عوسمانیەکان لە ڕووبەڕوویی دژ بە سەفەویەکاندا بە درێژە لەسەرەوە بوون بەلام ئەوانیش هەرگیز لەو کردارە وێرانکاریانە خۆیان نەپاراستوە، بەزۆر کۆچپێکردنەکانیان، هەرچەند ئەوەندە فراوان نەبوو کە بگاتە ئاستی ئەوانەی لەسەر دەستی سەفەویەکان ئەنجام دەدران، بەلام ئەمان لەوان زووتر دەستیان بەم کردەوە دڕندانانە کرد، هێشتا هەر تازە کوردستانی ڕۆژاوا چووبوە ناو خاکی عوسمانیەوە پاش شەڕی چالدیران، کە سوڵتان سەلیمی یەکەم (سەلیمی زەلەندە)، چەندین هۆزی گەورە و گرانی کوردی بەرەو باشووری ئەنقەرەی[5] ئێستا لە ناوەندی ئەنەدۆڵ دوورخستەوەو لەجیاتی ئەوان ژمارەیەکی کەمی هۆزی تورکمانی زیاتر دڵسۆزی دارسکان، بەلام ئەم کوردانە بوون بە ناوکی پارچەی داپساوی کوردنشینی ئەنەدۆڵی ناوەند، هەرچی هۆزە تورکمانەکانی کوردستان بوون سەرەنجام لەناو خەڵکی ولاتەکەدا توانەوە.

---

[5] ئێستا بەشێکی زۆری هۆزی شێخ بزێنی لە دەوروبەری شاری هەیمانا دەژین و هەر بە زمانی پەهلەوانی دەدوێن. ئەمانە دەبیٚ پاشماوەی ئەو دوورخراوانە بن – وەرگێڕ.

بەڵام ڕووداوەکانی سەدەکانی ١٦ و ١٧ لە شتێکی تریشدا کاریگەر بوون، ئەویش ئەوەیە کە بوون بە مایەی ڕیزبوونەوەیەکی بنەڕەتیی فەرهەنگی، ئەوەبوو باڵادەستیی لە کوردە نیشتەجێ پەهلەوانی دوەکانەوە، چوە دەستی کوردە کۆچەرەکان لە کوردستانی باکوورو ڕۆژاوا کە لە بنەڕەتدا بە کرمانجی دەدوان. خۆی ئەم پرۆسەیە وەکو دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی گۆڕانە کەمتر ئاشکراکانی سەدەکانی ١٦–١٧ لە بواری ڕێگا بازرگانیە جیهانیەکاندا هاتە کایەوە، پرۆسەکەیە وێرانکاری سەربازیی یەکجار ئاشکرای گەل و نیشتمان قووڵتر بوەوە و ئاسەواری زەقتر دەرکەوت. ئەم ڕوداوانە ئابووری کشتوکاڵ بنەمای وڵاتەکەی لە ڕەگەوە هەڵکەند و کرمانجە ڕەوەندەکان، وەکو تاقە دەستەی کورد مانەوە کە توانای ژیان و بەردەوامبوونیان بوویێ و بتوانن بتەننەوە و لەو زەمینە ڕەقە بێ پیتەی بە دەستیانەوە بوو شتێك بۆ ژیانی خۆیان بکلاشن.

لە ساڵی ١٦٣٩ و مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی زەهاوەوە لەنێوان دەوڵەتانی عوسمانی و ئێراندا، جۆرە هێمنییەك باڵی بەسەر کوردستان و حوکمڕانیە تۆتۆتومەکانیدا کێشا. ئەم هێمنییە تا ساڵی ١٧٢٢ هەر بەردەوام بوو.

هەرەس هێنان و دارمانی سەفەوییەکان، دەرفەتی بۆ عوسمانیەکان ڕەخساند کە بەشەکانی تری کوردستان لە وڵاتی فارس بپچڕن، بەڵام نادر شای ئەفشاری دانەری بەهێزی زنجیرەی پادشاییەتی ئەفشاری لە ئێران، بە توندی دژ بە داگیرکاریەکانی عوسمانیەکان لە کوردستان و عێراقدا وەستایەوە. ساڵە تاریکەکانی پاش چاڵدیران دیسانەوە گەڕانەوە – وێرانکاری ئەم جارە کوردستانی باشوور و ڕۆژاوا و ناوەندی گرتەوە واتە ئەو سەرزەمینانەی کوردستان کە لە دوو سەدە وێرانکاری بەردەوامی پێشوودا کە ناوچەکانی باکوور و ڕۆژاوای وڵاتەکەی گرتبووەوە ڕزگاریان بوو بوو. ئەم سەرزەمینانە ئێستا بوون بە مەیدانی سەرەکیی شەڕی نێوان هەر دوو ئیمپراتۆریەکە، شار و شارۆچکە کەوتنە بەر شاڵاوی وێرانکاری، چەندین کۆمەڵگەی کشتوکاڵی تاڵان کران و وەرزێرە نیشتەجێکان ناچار کران لەبن پای لەشکرەکان خۆیان ڕزگارکەن. دوا پاشماوەکانی کەلتوور و ژیانی شارستانی کۆنی کورد کە زۆریەیان لە دوو سەدەی ڕابردوودا لە ڕووداوەکانی باکوور و ڕۆژاوای کوردستان بەسەلامەتی دەرچووو بوون، ئەمجارەیان تەفروتونا کران.

وێرانكردنی جەستەی ئەم هەرێمە نوێیانە، نەدەكرا جێگۆڕكێ و بەزۆر جێنشینی كردنی دانیشتووانی بەدواوە نەبێ، ئەوەبوو ژمارەیەكی زۆری كوردی ئەم سەرزەمینانە تا چیاكانی ئەلبورز و خۆراسان و هەروەها بڵندایییەكانی بانەكانی ئێران ڕەهەندە كران. زۆربەی ئەم لێقەومانە كەوتە سەر لەكەكان، هەر لەم كاتەدا دوا پاشماوەی هۆزی دێرینی پادشایی هەضەبانی (ئەدیابین)ی ناوەندی كوردستان لەناوچەرگەی كوردستان هەڵكەنراو ڕەهەندەی خۆراسان كرا كە تا ئێستاش هەر لەوێ ماونەتەوە (نەخشەی ژمارە ٣٢) لقە هۆزێك لە لەكە ڕەهەندە كراوەكانی خۆراسان، هۆزی زەندە كە خەڵكی (دەهپەری) كوردستانی باشوور بوون لە هەناوی ئەم زەندانەوە كەریم خانی زەند دەركەوت، كە ساڵی (١٧٥٠) بوو بە جێگیری ئەفشاریەكان و دوا بنەماڵەی پادشاییی كوردی دامەزراند كە دەكرێ بە هاوتای بنەماڵە پادشاییە كوردەكانی سەدەكانی ئەیوبی و دەیلەمییەكانی بنێین.

زۆربەی ئەو نیشتگە نوێ یانەی كە لە ئەنجامی ئەم ڕەهەندە كردنانەوە دروستبوون، تێكەڵەیەكی بەرچاوی كورد و نەتەوەی تر، زاراوە، ئایین و داب و نەریتی جیا جیایان بەشێوەیەكی نارێك تێدا كۆبووەوە. ئەم نەزمە تا ئێستاش هەر وەكو خۆی ماوەتەوە، نەخشەی ئەتنۆگرافی هەرێمی كەلات لە هەرێمی خۆراسان، باشترین نموونەیە بۆ یەكێك لەو ڕەهەندە كردنانەی كە لە سەدەكانی (١٦- ١٨)دا ڕوویانداوە. لە هەرێمێكدا كە بە پانایی دوورگەی مانهاتنە دانیشتووانەكەی (جگە لە توركمان و ئازەری و لوڕ و فارس) بریتین لە كوردی بە زاراوەكانی كرمانجی باكوور و باشوور، لەكی گۆرانی و دیمیلی دوو، بە ئایین ئیسلامی سوننی و شیعە، یارسانی، عەلەوی. جگە لەمانە هەندێ گوندی یەزیدی ڕەهەندی سێرت كە ئێستا لەوێ لە نزیك شاری دوغائی نیشتەجێن یەزیدی ئایینن.

نەخشەی ژمارە (32)، دەستی سەرەکیی دەربەدەرکردنی کوردان لە سەدەکانی 16 و 17دا (کوردستانی باکوور و ڕۆژاوا) و لە سەدەی 18دا (کوردستانی ناوەند و ڕۆژهەڵات و باشوور).

ئازایەتی و دلاوەری ئەم چیانشینە كوردانە، هەمیشە كردوونی بە نموونەی سەرباز چاكی لە لەشكرەكانی بابل و فارس و یۆنان و عەرەب و تورك و تەنانەت رووسیشدا. ئێستاش لە مێژووی سوڤیەتدا باسی یەكەیەكی سەربازیی كورد دەكرێت كە شاری مینسكی پایتەختی بیلەرووسی لە نازیەكان ئازاد كردووە، ئەم یەكەیە لە نەوەی ئەو كوردانە پێكهاتبوو كە لە سەردەمی شەرەكانی قرمدا گیرابوون و لەلایەن رووسەكانەوە رەهەندەی هەرێمی سمولینسكی رۆژاوای رووسیا كرابوون. هەندێ جار، كوردێكی زۆری بە كۆمەڵ بۆ سنوورێكی دوور دەستی یەكێك لە ئیمپراتۆریەكان بۆ پاراستنی لە دوژمن دادر دەكرا و دەنێررا، لە ئاكامی ئەم جۆرە كردارانەدا كورد بۆتە ئاردی ناو درك و بۆ هەر جێیەك دەچی هەندێ كوردی لێیە بەتایبەتی هەرێمە چیاییەكانی ناوەند و باشووری رۆژاوای ئاسیا، واتە سنوورە نەتەوەییەكانی گەلە دژ بەیەكەكانی ئەم سەرزەمینانە. بۆ نموونە، ئەو كوردانەی ئێستا وان لەسەرزەمینی وەكو بەمپوور لە بلوچستان و كوردەكانی جەمناو لە بوخارا و فەرغانە، نەوەی ئەو كوردانەن كە سەردەمانێك بۆ پاراستنی ئەو جێیانە رەهەندە كراون.

هەروەها، سەركوتكردنی ئایینی كوردە یەزیدی و بابی و نامسوڵمانەكانی تر، زۆرجار لە شێوەی قەتڵوعامی گشتیدا خۆی نواندوەو بۆتە مایەی رەهەندە بوونی سەدان هەزار. لە سەدەكانی (١٧ و ١٨)دا یەزیدیەكان دووچاری چەندین قەتڵوعام بوون لەسەر دەستی عوسمانیەكان هەمان قەتڵوعام لەناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمدا دژ بە یەزیدیەكان لە ئاكامی رەوكردنی بە كۆمەڵیان بۆ ناوچەكانی سەر بە رووسیا لە قەفقاسیا كرایەوە، تەنها لەنێوان سالانی (١٦٤٠) وە تا (١٩١٠) لیسكۆت (٢٠) قەتڵوعامی دژ بە یەزیدیەكانی ژماردوە (بروانە یەزیدیەتی) لە دوا دوای سەدەی نۆزدەیەم قەتڵوعامێكی گەورە كە دژ بە بابیەكان كرا و لە ئەنجامدا هەموو سەری خۆیان هەلگرت، بوو بە مایەی سرینەوەی ئاسەواری ئەم كۆمەڵە خەڵكە ژیرو پێگە یشتوەی كوردستان (بروانە بابیەت و بەهائیەن).

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، قەبارەی رەهەندە كردنەكان دیسانەوە فراوانتر بۆنەوە، لە توركیا و پاش راپەرینی كوردەكانی لە دوا دوای جەنگی جیهانی یەكەمدا، بە سەدەها هەزار كورد بە كۆمەڵ لە جێی خۆیان هەڵكەندران و لەلایەن سوپای كۆماری توركیاوە رەهەندە كران لە هەرێمی دەرسیم و دەورووبەری رووباری فورات هەزاران كورد تەرتەووەرتەی جێگای

جیاجیای تورك و غەیرە تورك نشینی تورکیا کران بەتایبەتی هەرێمەکانی کەناری دەریای ئیجە، کە ماوەیەك لەوە زووتر نزیکەی نیو ملیۆن یۆنانی تەواریان لێهەڵکەندرابوو لە ئاکامی جەنگی جیهانی یەکەمدا. ئەم بە ئاردی ناو درك کردنەی کوردان، بە مەبەستی ئەوەبوو ئەوان لەو شوێنانەدا بتوێنەوە لەناو کۆمەڵگا نوێیەکاندا بتورکێنرێن، جگە لەمە نزیکەی سەد هەزار کوردی تر، بە سنوورە نوێیەکانی کۆماری تازە دروسبووی تورکیادا ڕەهەندەی وڵاتە دراوسێکان کران (بڕوانە ئاوێتە بوون و تێکدا توانەوە).

یەکێتی سۆڤیەتیش، وەکو بەشێك لە سیاسەتە بەدناوەکانی لەمەڕ ڕەهەندە کردنی نەتەوەکانەوە لە جەنگی جیهانی دووەم و دوایشیدا، کوردێکی زۆری قەفقاسیای سۆڤیەتی ڕەهەندە کردو دەربەدەری ئاسیای ناوەندو قازاخستان و سایبریای کردن.

لە (١٩٦٠)کاندا، سوریا بە بیانووی ئەوەی کوردەکانی تازە هات و داگیر کەرن ئەگەرچی ئەوان چەند هەزار ساڵە نیشتەجێی ئەو شوێنانەن نزیکەی سێ یەکی دانیشتووانە کوردەکانی لەجێی خۆیان هەڵکەندو هەندێکیان ڕووەو سنوورەکان و ئەوانی تری بۆ ناوەوەی وڵاتەکە تا دەورووبەری شارەکانی حەسا و دیمەشق ڕەهەندە کرد. ڕاستییەکەی، پاش ئەوەی هێزە کۆماریەکانی تورکیا پەلاماری کوردە سەر هەڵداوەکانی دا لە (١٩٢٠) و (١٩٣٠)کاندا لە ئەنەدۆڵ، کوردێکی زۆر بۆ خۆ پاراستن ڕوویانکردە سوریا، زۆریان لەوێوە سەری خۆیان بەرەو لوبنان و فەلەستین و ئەردەن و میسر هەڵگرت، کە ئێستا لەوێ جێگیر و دەوڵەمەند بوون و ژیانێکی سەرکەوتوانە دەبەنەسەر، تەنانەت لە ئەردەن ئێستا نزیکەی (١٥٠٠٠) کورد دەژین، چەند کەسێکیان نەك هەر سەر دەرکردوانە دەژین بەڵکو بوونە بە زاوای خانەوادەی پادشاییەتی ئوردونیش.

سوریا (لە شەستەکانەوە) عێراق (لە دوادوای حەفتاکانەوە) و تورکیا (لە سەرەتای هەشتاکانەوە)، لەسەر سنوورەکانیان (هەرێمی ئاسایش)یان لە سنوورەکانیان بە بەزۆر دەربەدەرکردنی دانیشتووانی ئەو ناوچە سنووریانە لە زێدی خۆیان و جێنشینکردنیان لە شوێنی تر، دروست کردووە. لە سنوورەکانی عێراقدا پانایی ئەم ناوچانە خۆیان دەدەن لە (٢٠) میل، ئامانجی دابڕاندنی کوردەکان لەیەکدی بەم جۆرە سنووریەندیانە ئەوەیە نەهێڵن لە کاروباری ڕاپەڕینە نیشتمانیەکاندا دەستی یارمەتی بۆ یەکدی درێژ بکەن، لە سوریا و عێراق، کارەکە لەمەش ئەولاتر چوو، کاتێك کە دەوڵەت لە هەردوولا هەوڵێکی نەزۆکیدا بۆ نیشتەجێکردنی عەرەب لە شوێنە چۆڵکراوەکاندا

(نەخشەی ژمارە ٣٣).

لە (١٩٨٠) کانەوە تورکیا هەندێ ناوچەی خستۆتە خانەی ناوچە چەتوونەکانەوە.

دەرسیم یەکێکە لەو ناوچانە، کە بۆ بەزۆر ڕەهەندەکردنی دانیشتووانەکەی دەوڵەت پەنای بردۆتە بەر یاسای" پاراستنی دارستان" بەڵام پیاو، نازانێ ئایا تورکیا تاسەر لەسەر ئەم سیاسەتە دەڕوا یان نە، چونکە حکوومەتی عەسکەری لەسەر کار لادراوە و ئێستا لە جێی حکوومەتی سیویل لەسەر کارە.

لە ئێران و لە سەردەمی ڕەزا شادا (١٩٢٥– ١٩٤١) هەندێ هۆزی کورد تا فارس و کرمان دوورخرانەوە، چەند بەشێکی هۆزی جەلالی کە لە (١٩٢٠)کاندا بۆ فارس دوور خرابوونەوە، هەر لەوێ لەناوچەیەکی یەکگرتوودا لە ڕۆژاوای شیراز مانەوە، ئەوانی تریان پاش ئەوەی هێزە هاوپەیمانەکان لەشەڕی جیهانی دووەمدا ئێرانیان داگیرکرد، گەڕانەوە کوردستان. دوای ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٨٠)کانی نێوان دەوڵەت و کوردەکان باس لە هەندێ ڕەهەندەکردن کرا، بەڵام شتەکە وانەبوو کە بکەوێتە سەر ئاوو ورتەش لە ڕێکخراوە کوردەکانەوە لەو بارەیەوە نەهات.

دەوڵەتی عێراق لە کەمتر لە (٥٠) ساڵی تەمەنییدا، لە ڕەهەندەکردنی کورداندا، هەر لە ڕێککەوتننامەی زەهاوەوە بیگرە تا ئێستا، گوێی لە هەموو دراوسێکانی بردۆتەوە، لەبەر بایەخی ستراتیژی گەورەیان بۆ ئاسایشی سەربازی و ئابووریی بەغدا، سەرکردایەتی عێراق لە سەرەتای سیاسەتی ڕەهەندەکردنی کورداندا، دوو مۆڵگەی بە توانای کوردی کردە دەستەگوڵ یەکەمیان فەیلی لەك زمان (پەهلە دێرینەکان) کە پورگایان هەر لە سنوورەکانی ئێرانەوە، بە درێژایی ڕووباری دیالە (سیروان – وەرگێڕ) تا قەبرغەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی بەغدا دەکشا. بە بیانووی لێڵی ڕەگەزنامەیانەوە (چونکە زۆربەیان لە باری مێژووییەوە کۆنە دانیشتووی ئێرانن) حکوومەت (٥٠٠٠٠)ی لێیان لە سنوورەکانەوە ئاودیوی ئێران کرد دووەمیان، کە زیاتر خەتەرناکتربوو، ئەو ڕەهەندە کردنانە بوو کە لە هەرێمی کەرکووك ڕوویدا. کەرکووك بە کێڵگە نەوتیە گەورەکانی و چەند دامەزراوەی پاڵاوتنەوە، بۆتە ناوەندی سەروەتی نەوتی عێراق. لە کۆنەوە بەغداو کوردەکان لەسەر بەشکردنی داهاتەکانی لە بێنە و بەردەدان، و هەر لەبەر ئەو بایەخە زۆرەی کەرکووك بۆ ئابووری عێراق، دەوڵەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق لە کۆنەوە کەوتوونەتە تەقەللای گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی بەهێنانی عەرەب بۆ شارەکەو هەموو

ناوچەكە. لە كۆنەوە، كەمایەتیەكی عەرەب و نەستۆری (ئاشووری) و جوولەكەو توركمان لە كەركووك ژیاون– هەندێكیان لە شێوەی پەلەی بچووكدا لە دەشتەكانی باكوور و باشووری رۆژاوای شارەكەدا نیشتەجێ بوونە. عێراق بەدرێژە خەریكی دەرپەڕاندنی كوردەكان بووە چ لە شارەكە خۆی چ لە دەورووبەری، لە بەرامبەردا چەشەكارییەكی زۆری بۆ زیادكردنی رێژەی كەمایەتی عەرەبی شارەكە بەخەرج داوە بێگومان ئاستی بەرزی گوزەران لە كەركووكدا، مایەی بكێشكردنی زیاترە بۆ عەرەبەكان و دەولەت ئەم پرۆژەیەی بە برەودانێكی یەكجار گەورە وەگرتۆتە ئەستۆ، بەم جۆرە، نزیكەی (١٠٠) هەزار كورد لەناوچەكەوە هەلكەنراون، هێشتا باش روون نەبوەتەوە، سیاسەتی عەرەب ڕزكاندن لەسەر دەستی دەولەت چەند سەری گرتوە، بەلام راپۆرتەكان دەلێن ئیتر شارەكە زۆربەی بە كوردنشینی نەماوەتەوەوە و دەورووبەریشی بەرەبەرە خەریكە ئاواییە كوردنشینە دێرینەكانی چۆل و هۆل دەكرێ.

هەردوو بەیتی كەركوك و فەیلیەكان تەنانەت سەرەتایەك بوو بۆ داستانێكی پڕ كارەساتی دڕندانەی ڕەهەندە كردن كە بەدوادا هاتن. هەر لەناوەڕاستی (١٩٦٠)كانەوە، كوردەكانی عێراق بە زۆر و بە هەزارەها ناچاركراون كە بۆ ولاتانی دراوسێ سەری خۆیان هەلگرن. بەزۆر ڕەتاندن بۆ شوێنە جیاجیاكانی ناوخۆی عێراق، وەكو دیوانیەو ناسریە و ڕەمادی لەو هەرێمانە كۆمەلگای كوردی سەد هەزار كەسییان دروستكردووە.

لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەدا كە پاش شەڕی ١٩٩١ی كەنداو هاتنە ئاراوە، كوردێكی زۆرتر ناچار كران زێدوواری خۆیان جێبهێلن. ئەمڕۆكە، نزیكەی سێیەكی كوردانی عێراق لە دەریەدەرگاكان دەژین یان لەو ولاتە دراوسێكان، یان لە كامپی ئاوارەكان لەناوەوەی عێراقدا، وێ ناچێ، لە داهاتوویەكی نزیكدا چ گۆڕانێكی ئەوتۆ بەسەر ئەم وەزعەدا بێت.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography**: John Perry, "Forced Migration in Iran During the Seventeenth and Eighteenth Centuries," *Iranian Studies*, VIII-4 (1975); Bustenai Oded, *Forced Migrations and Deportations of People in the Assyrian Empire* (Wiesbaden: Reichert, 1979); Editors, "De la question Kurde, la loi de deportation et de dispersion des Kurdes," *Hawar* 8 (Damascus, 1934); H. Wright and G. Johnson, "Population Exchange and Early State Formation in Southwestern Iran," *American Anthropologist* 77 (1975); Sharaf al-Din Bitlisi, *Chèref-nameh [Sharafnâma] ou Fastes de la nation kourde*, French trans. Charmoy, 2 vols. (St. Petersburg, 1868-75); Robert Conquest, *The Nation-Killers: The Soviet Deportation of Nationalities* (New York: Macmillan, 1970).

# ئاوێتەبوون و تێکداتوانەوە

بە درێژەی پێکەوەژیانی گەلان، لێکداتونەوە هەر بووەوە و ئێستاش هەیەو لە دوارۆژیشدا وەکو پرۆسەیەکی سروشتی هەر بەردەوام دەبێ. کوردان لەم یاسایە بەدەرنین و دلواناکەن بخرێنە خانەیەکی جیاوازەوە، ئەوەی لێرەدا پێویستی بە سەرنج و هەڵوێستەی تایبەتی هەیە، ئەو جۆرە تێکداتوانەوەی گەلانە کە بە زۆری زۆردارەکی دەکرێ.

نموونەیەکی باشی تێکداتوانەوەی خوایشتیی کوردان، نموونەی لەکەکانە. لەم چەند سەدەی دواییدا بەشێك لەگەلی کورد، واتە لەکەکانی باشووری کوردستان، بەرەبەرە لەناو پێکهاتەیەکی ئەتنی دراوسێیاندا، واتە لورەکان خەریکی توانەوەن، لەکەکان هێشتا هەر بە زاراوەیەکی کوردی دەدوون کە لە لوڕی جیاوازە. لوڕی خۆی زاراوەیەکی فارسیە، لەکەکان لەسەر ئایینی نەتەوەی کورد، یارسانین، لە کاتێکدا لوڕەکان مسوڵمانی شیعەن (بڕوانە زمان و ئایین) لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆری لەك ئەمڕۆ خۆیان بە لوڕ دەزانن و خەریکن زمان و ئایینەکەشیان دەگۆڕن هیچ دەوڵەتێك دەستی لەم گۆڕانەدا نەبوەو نیە.

بە ئامانجی یەکڕەنگیی ئەتنیکی کە یەکێکە لە پێویستیەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی لەسەر ئەو شێوەیەی ئەوروپاییەکان پەیڕەویان لێکرد، هەریەکە لەو دەوڵەتانەی کە ئەمڕۆکە بەشێك لە نەتەوەی کوردیان تێدا دەژی، دەستیان کردووە بە تواندنەوەی چ کورد چ کەمایەتیە نەتەوەییەکان لەناو نەتەوەی دەسەڵاتداردا. بێگومان ئەمە ئەو دەوڵەتانە ناگرێتەوە کە کوردەکانیان ڕێژەیەکی ئەوتۆی دانیشتووان پێك ناهێنن کە بۆنی مەترسییان لێ بکرێ، وەکو گورجستان و ئەرمەنستان، یاخۆ لەو وڵاتانەی کە دانیشتووان بۆ ئامانجی تر بەکاردێن وەکو سوریای پاش ۱۹۷٥.

ئەو میکانیزمەی بۆ بەجێهێنانی ئەم ئامانجە بەکارهێنراوە، زۆرتر بریتی بوە لە بەکارهێنانی هێزی یەکجار دڕندانە، جار جاریش شێوازی تر لەلایەن بیروکراتەکانی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتەوە، خراونەتە ڕوو. ئامرازی خەفەکردنی فەرهەنگ و مێژوو و زمانی کوردی، تا کار گەیوەتە ئەوەی بەکارهێنانی وشەی کورد خۆشی بە تاوانێك دانرێ، لە یاسای

دەوڵەتەکاندا، چەند جار لە (٧٠) ساڵی ڕابردوودا، چەسپاوە و بەکارهێنراوە، عێراقی لێدەرچێ، خوێندن بە زمانی کوردی، بە توندی قەدەغە کراوە، لەهەمان کاتدا، کوردستان، لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە پشتگوێ خراوە، یان بە قەستی دواخراوە و بە تەواوی لە بەشەکانی تری وڵات جیاواز گیراوە.

ئامانجی ئەم دەوڵەتانە لە بەکارهێنانی ئەو سیاسەتە ئەوەیە کورد بە چاوی خۆیان ببینن سووربوونیان لەسەر بە کوردی مانەوە و نەتوانەوە لەناو نەتەوەی دەسەڵاتداردا چەند بەگران لەسەریان دەکەوێ، بەڵام ئەم ئاواتەیان هەرگیز نەهاتۆتە دی.

یەکێك لە دەهۆلکوتە هەرە دیارەکانی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی لە سەردەمی کۆماری تورکیا و دەسەڵاتداری ئەتاتورکدا، شوکری محەمەد سەگبان ناوێك بوو، کە خۆی بە نەتەوە کورد بوو ئەو مێژوویەکی ساختەی بۆ کوردان دروستکردبوو، لەگەڵ هەندێ تروهانی زمانە وانییدا، بۆ ئەوەی سابوون لەبنی پێی کوردان بساوێ و بیانخلیسکێنێتە ناو خێزانبەندی گەلانی تورك زمانەوە و کوربوونیان لاببێزرێنێ و بۆیان دەرخا مانەوەیان وەکو کەمایەتیەکی نەتەوەیی و زمانیی لەناو دەورووپشتێکی نەیاردا چ بارێکی گرانە بۆیان.

سەگبان، ساڵی ١٩٣٣ نووسیویە دەڵێ:

" لەم ڕووەوە، بۆ دەبێ ئێمە لەوە بترسین زمانمان لەناو کۆمەڵی زمانی تردا بتوێتەوە؟ ئەو کەمایەتیە لاوازانەی لەناو زۆرایەتیەکی بەهێزدا تواونەتەوە قازانجیان کردووە هەر ئەوە خۆی بەسە، کە لە دەستی جیاوازکاری ڕزگاریان بووە... کە لە کۆتایی شەڕی گەورەوە تا ئێستا (١٩٣٣) لە گەڵیاندا بە کاردێ.

زمانی کوردی لە پرۆسەی پەروەردەدا لە هەموو قوتابخانەکانی سولەیمانیەی عێراق بەکارهاتووە کوردان لەمە هیچ سوودێکیان دەست نەکەوتوە ئەوانەی ئەم قوتابخانە سەرەتاییانەی دەبڕن، چیدەکەن؟ بە چ زمانێك خوێندن تەواو دەکەن؟ تا ئێستاکە ئەم هەوڵە نەزۆکە و هیچ سوودێك ناهێنێتە دەست... ئەگەر سەد ساڵ پروپاگەندە بۆ زمانی کوردی بکرێ، ئینجا ناتوانرێ بهێنرێتە ئاستی (زمانی) گەلە پێشکەوتوەکان. ئایا گەلی کورد بەوە ڕازی دەبێ لەلایەن ئەو پشتانەی پێشوەوە ڕابەری بکرێ کە خشتێکیان نەخستۆتە سەر دیواری شارستانیەت و هیچیان بۆی جێبەجێ نەهێشتوە؟ دەبێ بە متمانەوە قایل بین کەوا

بیرۆکەی خوێندن بە زمانی زگماکی خۆکوژ لەناو خۆماندا دەرپەڕێنین..."‌.

با لەوە لاچین، مێژوونووسی بەناوبانگی ئینگلیز. لورد کینرۆس، چل ساڵ دوای دانان و بەکارهێنانی ئەو یاسایانەی خوێندنیان بە زمانی کەمایەتیەکان لە تورکیا قەدەغە کرد، دەڵێ ئەو یاسانە ئامانجی پێچەوانەیان دایە دەستەوە، لە هەرێمە هەرە دوورەکانی رۆژهەڵات کە هاوسنووری عێراق و ئێران بوون زۆربەی دایکوباوکە کوردەکان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە رۆڵەکانیان تەنیا بە کوردی دەرس بخوێنن و ئەوەندە ئارەزوومەندی زمانی رەسمی نەبوون. نەبوونی شێوەی پەروەردەی ستاندارد و نوێش تا رادەیەك دەستی هەبوە لە بەرگرتن لە پێشکەوتنی ئەو هەرێمانەدا کە کەمایەتییەکانی تێدا نیشتەجێن و بۆتە مایەی درێژەکێشانی قایم نەبوونی جێ پێیان لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و پێشکەوتنەوە بەگشتی، بۆیە کوردەکان بەگشتی پشتیان کردووە لە هەموو گۆڕانێك کە دەوڵەتی تورك بەزۆر ویستویەتی دایسەپێنێ (بڕوانە پەروەردە).

کۆمیسیۆنی نیشتمانی بۆ کاروباری پەروەردە لە راپۆرتێکی ساڵی (١٩٥٩)یدا بە روونی کاریەدەستانی ژوورتری لەم مەسەلەیە ئاگادار کردۆتەوە و هەندێ لەو کاریەدەستانە هەڵوێستێکی رەخنەگرانەیان لەو بارەیەوە دەربڕیوە:

"ئەگەر بەشێك لەو خەڵکەی ئەمڕۆ لە تورکیا دەژین، لەوانی تر هەژارتر و دواکەوتووترن، ئەوە خەتای ئاوو هەوای وڵاتەکە یان کەسایەتی ئەو خەڵکەنیە، بەڵکو خەتای لاوازی باری پەروەردە کردنە پێشکەوتن و گەشەکردنی خاکی تورکیا بەندن بە گەشەکردنی ئەو خەڵکەوە کە لەسەری دەژین، هیچ پرۆژەیەکی گەشەکردن، کە بە گەشەکردنی پەروەردە دەستپێ نەکا چاوی بە سەرکەوتن ناکەوێ.."

کوردێکی زۆر کەم لە شوێن خۆیان بەرەو گۆشە و کەناری دەوڵەتی تر، چ لەڕابردوودا و چ ئێستا، هەڵکەنراون (بڕوانە رەهەندە کردن و بەزۆر نیشتەجێکردن).

ئەمانە، بەردەوام، بە کۆمەڵ لە مەڵبەندێکی تر نیشتەجێ کروان ئەم راستییە تورکیا ناگرێتەوە، ئەم وڵاتە لە رەهەندە کردنەکانی ساڵانی (١٩٢٣- ١٩٣٨)دا کوردەکانی بە دەستە دەستەی چەند خێزانی بەرەو کۆمەڵگای بێگانە لەوان دەریەدەرکرد بە هیوای ئەوەی ئەم جیاکردنەوە و تەنیاییە، ئیرادەی پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییان وردوخاش دەکا و ناچار، چ

بۆ خاتری خۆیان چ بۆ خاتری نەوەكانیان، لەناو ژینگە نوێیەكەدا دەتوێنەوە، بەڵام هەموو ئەو چەرمەسەرێیەی بە سەر ئەو خەڵكە هات، لەوانەیە چەند نموونەیەكی توانەوەی، ئەویش تاك و تەرای، لێ كەوتبێتەوە كە ببن بە مایەی دڵخۆشی بۆ ئەوانەی هایان بۆ ئەم سیاسەتە كرد و خستنیانە سەر پا.

یاسایەك كەساڵی (١٩٣٢) بۆ گواستنەوەو، بەتایبەتی پەرتە پێكردنی كوردان لە توركیا، بە ئامانجی توانەوەیان لەناو كۆمەڵگای نوێدا دەركراوە پەنجەی شەرت ڕادەوەشێنێ و دەڵێ:
چوار نموونەی ناوچەی نیشتەجێكردن لە توركیا بە ڕەسمی دەناسرێن.. ئەم چوار ناوچەیە لەسەر نەخشەیەك دەردەخرێن كە وەزیری ناوخۆ دەری دەكا و لەلایەن وەزارەتەكانی تریشەوە بەڵێی بۆ دەكرێ.

ناوچەی یەكەم، ئەو هەرێمانە دەگرێتەوە كە زیادكردنی ژمارەی دانیشتوانی توركی تێدا بە پێویست دەزانرێ ناوچەی دووەم ئەو هەرێمانە دەگرێتەوە كەوا بە باش دەزانرێ هەندێ خەڵكانی بۆ بهێنرێ كە دەبێ لەناو فەرهەنگی توركدا بتوێنەوە، ناوچەی سێیەم ئەو هەرێمانە دەگرێتەوە كە كۆچكەرە تورك فەرهەنگەكانی تێدا بە خۆبەخۆیی و بێ یاریدەی دەوڵەت تێدا بحەوێنەوە و بچەسپێن. ناوچەی چوارەم هەموو ئەو هەرێمانە دەگرێتەوە كە لەبەر هۆی وەكو پاراستنی تەندروستی گشتی، یان هۆی ماددی و فەرهەنگی و سیاسی و ستراتیژی و باری ئاسایش بڕیاردراوە داخرێن یان چۆڵكرێن (بڕوانە Challiand 1980).

ئەو كوردانەی ڕەهەندە دەكران دەبوو بە جۆرێكی ئەوتۆ تەنك تۆو بكرێن كە نەتوانن ئاوایی پێك بهێنن و دیسانەوە بە كۆمەڵ سەرینێنەوە بەسەر یەكەوە و هەرگیز نەتوانن دەیەكی دانیشتووانی نیشتگە تازەكانیان پێك بێنن بەڵام ئەم یاسا توندەش لە بواری تواندنەوەی كورداندا هیچی نەكرد بە هیچ.

كەسێك كە ڕۆڵەی پشتی سێیەمی یەكێك لەو خێزانە دەربەدەرانە بوو، لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ نووسەری ئەم باسە داستانی خێزانەكەی خۆی گێڕایەوە.

"ئەوان لە تونجەلی (دەرسیم) هەڵكەندرابوون و برابوون بۆ هەڵەتێك كە بەسەر دەریای ئیجەدا دەیڕوانی، بێ ئەوەی یەك وشە لە زمانە توركیەكەی دانیشتووانە وەرزێرەكانی تێبگەن هەرچەندە ئەم دراوسێ نوێ یانە خۆش ڕەفتارو میهرەبان بوون لەگەڵیاندا هەروەها

فەرمانداری ناوچەکە خۆشی تاڕادەیەك بەخشندەو دڵچاك بوو، ئەو بیست و پێنج ساڵەی کە تاگەڕانەوەیان بۆ کوردستان لەوێ مانەوە، بەلایانەوە لە زیندانێك بەولاوە هیچی تر نەبوو..." کاتێك کە چوونەوە سەر ماڵ و موڵکی خۆیان لە کەلاوە و وێرانە بەولاوە، لە ئابووریەکی تەفرو تونا زیاتر، نەبوونی پەروەردە و هیچ بابەشێکی پێشکەوتن سەرەڕای چاوەدێری کردن و نەفەس ژمێری بێ وچان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە هیچی تریان نەبینی، بۆیە پشتی دووەمی خێزانەکە سەری خۆیان بەرەو ئەورووپای ڕۆژاوا بۆ کرێکاری هەڵگرت پشتی سێیەم کە زۆربەیان لە ئەورووپا لە دایك بوونە و پێگەیشتوونە، لە ئەورووپا و ئەمریکا توانیویانە پلەی باشی خوێندەواری و زانیاری بە دەست بێنن. ئەوان ئێستاش لەسەر ئەو بڕیارەن کە دەبێ بۆ وڵاتەکەی باوباپیرانیان "شتێك بکەن" و نەهێڵن منداڵەکانیان لە بیریان بچێ کە "ئەوان بەڕاستی چین و خەڵکی کوێن".

مێژوو لەکەم جێگەدا گوێ بردنەوەی داوەتە دەستی بەرنامەکانی بە زۆر تواندنەوەی گەلان، لە کاتێکدا پڕە لە چیرۆکی تواندنەوەی خوایشتی (Izady 1995) کوردانیش لەم یاسایە بە دەرنین. مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ چەندین نموونەی توانەوەی ئاسایی کوردان دەستنیشان بکا لە ڕابردوودا و دڵنیاشم لە دوا ڕۆژیشدا ئەم یاسایە هەرکارایە هۆزێکی زۆری کورد وەکو شکاکەکان و کوردانلیەکانی ئازەربایجان، لەکەکانی داغستانی ڕووسی، شێوخەکانی دەوروبەری ئەنتاکیە و نۆ- عەرەبەکانی ناو عەلەویەکانی سووریا گشتیان ناسنامەی کوردیی خۆیان دۆڕاندوەو هی تریان وەرگرتووە هەرئێستا کە هەندێ کوردی وەکو شاترا ناوەکانی باکووری ناوەندی ئێران و لەکەکانی باشووری کوردستان کە لەشوێنی تریشدا باسکراون، ئەوەندەیان نەماوە کاژی کوردییەتی خۆیان فرێ دەن و لەناو دەوروبەرەکانیاندا بە تەواوی بتوێنەوە.

لیستەی ئەو ناودارە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیانەی کە بەڕەسەن و ڕچەڵەك کوردن و بەرە بەرە تواونەتەوە، گەلێ درێژە و هەندێ جار پڕن لە پەندی تفتی مێژوویی.

عەبدوڵا جەودەت و ئیسحاق سکوتی، دوو ئەندامی دامەزرێنەری بزووتنەوەی تورکانی لاو، زیا گوکئەڵپی بناغەڕێژی نەتەوەچیەتیی گشت تورکان (تۆرانیزم- وەرگێڕ) (بڕوانە Ramsaur 1957 Heyd 950 berkes 1959) و عصمت ئینۆنۆی هەڤاڵ و سەرۆك وەزیرانی کەمال ئەتاتورك و

ئەو پیاوەی کە سەرپەرشتی وێرانکردنی دەرسیمی کورد زەمینی کرد، هەروەها ژەنەراڵ کەنعان ئێڤرینی سەرۆك كۆماری عەسكەریی كۆماری توركیا لە سەرەتای (١٩٨٠)كانـدا و دارەڕادانەری شەپۆلی سەرلەنوێ زوڵم و ستەم بۆ کوردەکانی تورکیا، ئێستا وا سەرکۆماری ئەم سەردەمەی كۆماری توركیاش چووە ناو لیستەی ئەوانەوە، ئەوەتا تورگوت ئۆزالی سەرکۆمار دەڵێ لە نەنکەوە دەچێتەوە سەر کوردان و دوڕەکە کوردە.

لە عێراق، لیستەی دەسەڵاتدارە کوردە تەواوەکان، عەبدولکەریم قاسم سەرۆك كۆمار (عەبدولكەریم قاسم سەرەك وەزیران بوو – وەرگێڕ)، کە ڕژێمی پاشایەتی وەرگەڕاندو پەڕەی ڕۆژی کوردی خستە ناو ئاڵای دەوڵەتەوە (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ). دەگرێتە خۆ. تەنانەت سەدام حوسێن خۆی، لە باوانەوە دوڕەکە کوردە (برایەکی ناوی بەرزانە).

لە سوریا، سەرکۆمار (حافز ئەسەد) و سەرکردەکانی تری عەلەوییەکانی خزمی، و خانەوادەی ئەترەش هەموو ڕەگێكیان دەچێتەوە سەر کورد. لە لوبنان، بنەماڵەی جامباڵاتی (جانپۆلات – وەرگێڕ) سەرکردەی سیاسی و ڕووحی دورزییەکان، خەلیل جبرانی شاعیر، و جورجی زەیدانی لێکدەرەوەی ئایینیی شیعە مەزەبان (١٨٦١– ١٩١٤) هەموو کوردی لە نەتەوەی تردا تواوەن (بڕوانە هۆزەکان و کۆچکاریە مێژووییەکان).

لە ئێران، لەبەر ئەوەی فشار لەسەر ناسنامە و فەرهەنگی کوردی لە هەموو شوێنێ کەمتر ئاشکرایە، و لە ڕووی کۆمەڵایەتی – ئابوورییەوە کوردەکان لە هەموو جێگاکانی تر زۆرتر سمڕاونەتە ناو دەریای کۆمەڵگاوە، توانەوە هەمیشە لە هەموو شوێنێكی تر بەرفراوانتر بووە. هیچ گومان لەوەدانیە کەلێك نزیکی و باڵادەستی فەرهەنگی فارس لەگەڵ هی کورددا لەم توانەوەیەدا دەستێکی گەورەی هەبووە لەگەڵ ئەمەشدا، توانەوەی زۆربەی کوردە ئێرانیەکان نەگەیشتۆتە ئەوەی ڕابردووی کوردبوونی خۆیان فەرامۆش کەن، تەنانەت ئەوانەش کە ماوەیەکی دوور و درێژ لە دەرەوەی کوردستان ژیاون و زمانی خۆیان بەکار نەهێناوە. زۆرێکی زۆری کەسایەتی ئێرانی لە بوارەکانی ئەدەب، هونەر، سیاسەت، ئیدارە، و هێزە چەکدارەکاندا هۆزە ناوی کورییان بە ناوەوەیە کە بیر خەرەوەی بەڕەگەز کورد بوونیانە. کەسانێکی بەناوبانگی وەکو کەریمی سنجابی ڕابەری گرنگترین پارتی سیاسی نائاییینی لە ئێران، بەرەی گەلیی (جەبهەی میللی – وەرگێڕ) پڕ سەنگ و سیما، پەری زەنگەنەی گۆرانیبێژی ناوداری ئۆپرا، شانۆگەری نووسی بە دیمەن عەلی موحەممەدی ئەفغانی، هەموو لە جێی خۆیدا خۆ بە ڕۆڵەی کورد دەناسێنن، هەرچەندە بە کوردی نادوێن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: L. Molyneux-Seel, "Journey into Dersim," *Geographical Journal* 44-1 (1914); G. Perrot "Les Kurdes de Haimaneh," *Revue des deux Mondes* 55 (1865); Mehrdad Izady, "Persian Carrot and Turkish Stick," *Kurdish Times* III-2 (1990); United States Helsinki Watch Committee, *Destroying Ethnic Identity: The Kurds of Turkey* (New York: USHWC, 1988); Lord Kinross, *Within the Taurus* (London, 1954); Lord Kinross, *Atatürk: The Rebirth of a Nation* (London: Weidenfeld, 1964); Martin van Bruinessen, "The Ethnic Identity of the Kurds," in Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); Sukru Mehmed Sekban, *La question kurde. Des Problèmes des minorités* (Paris: Les Presses Universitaires de France, 1933); G. Challiand, ed., *People without a Country* (New York: Zed, 1980); Ernest Ramsauer, *The Young Turks* (Princeton, 1957); Uriel Heyd, *Foundation of Turkish Nationalism* (London, 1950); Niyazi Berkes, *Turkish Nationalism and Western Civilization* (New York: Columbia University Press, 1959); F. McDermott and J. Short, *The Kurds* (London: Minority Rights Group, 1975).

# دیموگرافیا

تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی دیموگرافی، چ تەسك چ فراوان، کە بەتایبەتی بۆ کوردان تەرخان کرابێ، نەکراوە، لە کاتێکدا، چەندین لێکۆڵینەوەی بەنرخ لەسەر بزووتنەوەو جموجۆڵی دیموگرافی گەلانی دیکەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، چ کۆنیان چ تازەیان بە دەستەوەن. ژمارەی کوردان، لەهەر قۆناغێکی مێژوویيدا، دەتوانرێ لەم لێکۆڵینەوانە دەربکرێ، لەبەر ئەوەی کوردستان بە جێگا دەکەوێتە ناوجەرگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە، زانیاریەکانیش دەورووبەری هەرهەمان جێگایان گرتۆتەوە. گیروگرفت لەوەدایە، چۆن بزانرێ ژمارەی کوردان لە هەر سەردەم و جێگایەکدا چەندبووە و چەندنەبووە. ئەو شێوازەی لێرەدا بەکارهێنراوە، یەکەم دەرگایە بۆ ژماردنی هەموو ئەوانەی لە چیاکانی کوردنشین ژیاون یان دەژین، ئینجا باسکردنی ئەوەی ئایا ئەوانە کوردن یا نەتەوەی تر.

لە سەردەمی ئێستاماندا، مەسەلەکە نەختێ ئاسانتربووە، بەلام هێشتا نەك ئەو ئاسانیە. سەرژمێریە ناوخۆییەکان کەمتر زانیاری لە بارەی باری ئەتنیکی دانیشتووانەوە دەدەن، ئەگەر بیشیاندەن، کەمتر جێگەی پشت بەستنن، لەبەر ئەو هۆیانەی لەمەو پێش باسمان کردن (ئاوێتە بوون و تێکدا توانەوە و ناسنامەی نەتەوەیی).

لە کاتێکدا سەرژمێری ڕێکوپێك و باوەڕپێکراو و ناوبەناو کراو بە دەستەوەنین، زاناو

دیموگرافیستەكان ناچار پشتیان بەستووە بە هەندێ قەرەساندنی سەرپێی كە ئەوانیش خۆیان لە بنەڕەتدا زۆر جێگەی متمانە و باوەڕ نەبوونە. تاكە زانیاریەك كە دەرچوووی دەستی حكوومەتە ناوخۆییەكان بووبێ و باسی لە شتە گشتییەكانی ناوچە جۆراوجۆرەكان كردبێ، ئەو ژمارانەن كە لە بارەی هۆزە كۆچەر و نیمچە كۆچەرە كوردەكانەوە دراون، لەكاتێكدا، هاونیشتمانە كوردە نیشتەجێكان، بەتایبەتی شارنشینەكان، هەمیشە بە بەشێك لە نەتەوەی بالادەست لەهەر ولاتەدا دانراون.

سەرژمێریە دەولەتیە ساختە سازەكان لەبەر چەند هۆی تر هی ئەوەنین كە پشتیان پێ ببەسرێ. پشتێك لەمەوبەر تی، ایف، ئەریستۆڤا لە كاتی لێكۆلینەوەدا ئەوەی بەرچاو دەكەوت كە "لەبەر ئەوەی سەرژمێریەكان بە مەبەستی باجگیری یان سەربازگیری دەكران، هۆزە رەوەندەكان هەولی ئەوەیان دەدا كەمتر ژمارە بدەن و زۆربەی جارەكان لە كاتی سەرژمێریەكاندا دەپەڕینەوە ئەوبەری سنوورەكان ((Aristova 1958)) هەندێ هۆزی مەڕلەوەڕێنی وەكو هەركی كە بە دوای لەوەڕدا چەند سنووری نێودەولەتی دەبەزێنن لە تۆماری سەرژمێری چەند دەولەتدا ناونووس كراون، جگە لەمە، دەفتەری سەرژمێریەكانی توركیا، تەنیا ئەوانە بە كورد دەنووسن كە زاراوەی كرمانجی بە زمانی مادەرزای خۆیان دادەنێن و ئەمەش تەنها تا سالی ١٩٦٥ لە هەر ئەو پێنج ویلایەتەدا كراوە كە تێیاندا نیشتەجێن وەكو ئەریستۆڤا دەلێ: "ئەو ژمارانەی گۆیاهی سەركۆی دانیشتووانی كوردن گەلێ لە ڕاستییەوە دوورن".

دەرەنجامی هەموو ئەوانە لەیەك ڕاستیدا خۆی دەنوێنێ ئەویش ئەوەیە كە سەرجەمی ئەو ژمارە جیاجیایانەی لەمەڕ ژمارەی گشتیی كوردانەوە دراون لەم سەدەیەدا هیچیان لەوی تر ناچن. ڕاستییەكەی ئەوەیە، ئەم بابەتە بووەتە مەسەلەیەكی سیاسی تا بلێی گەرم لەم دەمەدا، چونكە كەمی و زۆری دانیشتووان، لای هەندێ كەس، نیشانەی هێزی سیاسی و ئابوورییە، جگە لەمە، لە زۆر جێگەدا دەركەوتووە كە ڕەگی نەتەوەیی هەر لێكۆلەرێك فاكتەرێكی گرنگە لە دەربڕینی ڕاست و دروستی ژمارەگیریەكاندا. بۆ نموونە لە ماوەی نێوان (١٩٨٠ و ١٩٨٦)دا پەلەتییر(ئەمەریكییە) ژمارەی گشتی كورد بە (٥،٧) ملیۆن و دەشنەر (ئەلمانە) بە زیاتر لە (١٥) ملیۆن و مۆر (فەرەنسییە) بە (١٠،٢٠) ملیۆن دادەنێن، لە كاتێكدا وانلی (كە كوردە) بە (٢٠) ملیۆن (كوردی هەندەرانی لێدەرچێ) و ئیكمان (كە ئەمریكییە و

لەسەرچاوەی ئینگلیزەوە زانیاریەکانی وەرگرتووە) گەورەترین ژمارە واتە(٥،٢٣) ملیۆن دەدا. لەهەمان کاتدا، کوردۆیەڤ کە کوردێکی سۆڤیەتیە، لە سالّی (١٩٥٧)دا باسی تاقەیەك کوردی نەکردووە لە یەکێتی سۆڤیەتدا!.

تەنها لەبارەی ژمارەی کوردەکانی تورکیاوە، کایا تۆپەری قسەکەری ڕەسمی بە ناوی سەرکۆماری تورکیا تورگوت ئۆزالەوە، واتە ولاتێك کە بە درێژەی مێژووی خۆی تەنانەت بوونی کوردی وەکو نەتەوەیەك لەناو خۆیدا هاشا کردووە، لە (١)ی مارتی (١٩٩١) لە لێدوانێکدا بۆ ڕادیۆی گشت ئەمەریکا کەرەمی (٧-١٢) ملیۆن بۆ هەموو هاوولاتیە "کوردە رەسەنەکانی" تورکیا دەکا، کەچی هەر خۆی سێ هەفتە دوای ئەوە لە هەمان ڕادیۆوە ژمارەکە دەگەیەنێ بە (١٢- ١٤) ملیۆن بۆ، هەر لە هەمان دیداردا ئەو وتی نزیکەی "سێ یەکی ئەوانە - واتە هی کوردان - لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلات دەژین" بەم جۆرە دەبینین گەورەترین ژمارەی کوردان، هەر نەبێ ئەوانی لە تورکیا دەژین، لەسەر زمانی کابرایەکەوە دێت کە چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێ- واتە تورکێك کە قسەکەری بەرزترین دەسەلاتی ولاتەکەیە نزمترین ژمارە لە بارەی کوردانی تورکیاوە کابرایەکی ئەمەریکی داویەتی (پالاتین ١٩٨٤) ڕاستییەکەی ئەو دەلێ لە ١٩٩١دا ژمارەی کوردەکانی تورکیا ٨ ملیۆن بوە، واتە ٢٥٠٪ پتر لەوەی (٧) سال لەوەبەر دابووی. ئەمە خۆی لەخۆیدا نیشاندەری ئەو شپرزەیی و شێوانەیە کە لەو لێکۆلینەوەیەو چەندین لێکۆلینەوەی تردا لە بارەی ژمارەی گشتیی کوردانەوە ئەنجام دراون.

شاردنەوەی دوا ئامار بەندییە گشتیەکان لەلایەن دەزگاکانی دەولەتەوە هەروەها ئەو زانیاریانەش کە پەیوەندییان بە پاشوپێشکردنی باری دیموگرافیەوە هەیە هۆی سەرەکیی ئەو شێواویەن کە لە کاری زۆریەی ئەو نووسەر و توێژەرەنەدا بەدی دەکرێن کە لە بارەی سەرژمێری کوردانەوە شتیان نووسیوە.

بۆ نموونە سالّی ١٩٩٠، یەکێکی وەکو مەکدۆنالد لە کاتێکدا ژمارەی گشتی کوردان لە ئێران بە ٥ ملیۆن و لە تورکیا بە ٩ ملیۆن دادەنێ، دەلێ ڕێژەی کوردان لە ئێران ٣٪ی گشت ژمارەی دانیشتووانی ولاتەکەو لە تورکیا ١٢٪ی گشت ژمارەی دانیشتووانە بەگوێرەی ئەو ئامارکاریەی کە هەردوو دەولەت کردوویانە.

ئەگەر ئەو زانیاریەی مەکدۆنالد بکەینە بناغە، دەبێ ژمارەی گشتی دانیشتووانی ئێران لە

ساڵی ١٩٩٩٠دا بە ١٦٧ ملیۆن و هی توركیا بە ٧٥ ملیۆن دانرابێ، لە كاتێكدا ئامارگیریە دەوڵەتیەكانی (١٩٩٠)ی ئەو دوو دەوڵەتە، ژمارەی دانیشتووانی ئێران بە ٦،٥٥ ملیۆن و هی توركیا بە ٧،٥٦ ملیۆن دەدەن.

ڕاستیەكەی ئەم جیاوازیە، بەتایبەتی بەو فراوانیە، نەدەبوو ڕوویدا چونكە لە هەموو حاڵێكدا لە هەموو دەوڵەتەكاندا سەرژمێری گشتی و ئاماریەندی دانیشتووان هەیە. تەنها بە نزیككردنەوە و لێكدانێكی ڕاست و ساكار دەتوانرێ ژمارەی دانیشتووانی كوردی ئەو وڵاتە دەربخرێ. مەسەلەكە تەنها پێویستی بە بەكارهێنانی هەندێ بەراوردكاری زانستی و مودێرن هەیە، لەوانە دەستنیشانكردنی ژمارەی پێكهاتە ئەتنییەكانی ترو بە نەزەر وەرگرتنی ئامارە جیهانی و نیشتمانییەكان و ئینجا دەركردنی ژمارەی زۆر لە ڕاستی نزیكی هەموو پێكهاتە ئەتنییەكان بەم جۆرە دەتوانرێ لانی كەم لە (١٩٢٠)ەكانەوە ژمارەی دانیشتووانی كورد دابنرێ و لەسەر ئەوە ژمارەی ساڵانی داهاتووش دەربخرێ.

ئەو كورتەیەی لە خوارەوە یادداشت كراوە، سەرەنجامی یەكەم توێژینەوەی باری دیموگرافی كوردانە كە نووسەری ئەم كێتبە دەریهێناوە بۆ دەرخستنی كوردبوون یان نەبوونی هەر كەسێك، ئەو پێودانگە بەكارهێنراوە كە لە "پێشەكی" ئەم كێتبەدا دراوە، ئەم توێژینەوەیە بەڕێزەوە داوای هەر كەسێك كە بڵێ كوردم و لەوێدا باسم نەكراوە وەردەگرێ و ئەو باسانەی كە پەیوەندییان بە دابەشبوونی جوگرافیایی كوردانەوە هەیە لە بەشی نەخشەی كێشانی دابەشكردنی جوگرافیایی كورداندا باس كراوە. هەر كە ئەم پرسیارانە وەڵامیان درایەوە، ئەوكات ئیشەكە دەكەوێتە سەر ڕچی ڕاستی خۆی، سەر ژمێریە ناوخۆیی و دەرەكییەكان، توێژینەوەكان، ئەو ژمارانەی بە مەزەندە دانراون، هەموو بۆ دەركردنی ئەم ژمارانەی لێرەدا دراون بەكار هێنراون.

پشتەڵەكی مێژویی ئەم بەشە لە بابەتی مێژوودا دەرخراوە، لە كاتێكدا بەشی كۆچكردنە مێژووییەكان و ڕەهەندەكردن و بەزۆر نیشتەجێكردنەكان بۆ گەیشتن لە گۆڕانی دیموگرافیی كوردان بایەخێكی تەواوی هەیە و دەبێ بەر لە هەموو شتێك باش بەسەریدا بچرێ.

بە خۆڕایی و ڕێككەوت نیە كەوا كوردستان سەرزەمینیكی پڕە لە ڕووی دانیشتووانەوە، نەك هەر ئەمە بەڵكو تا سنووری لێوڕێژی خەڵكی تر ڕووی تێكردووە ((Smith and Young 1982

لەبەر ئەوەی ئەم ولاتە مەڵبەندی (یان یەکێك لە مەڵبەندەکانی) گەلێ نوێکاری قووڵی تەکنۆلۆجی بووە، کە مایەی لێورووژانی دانیشتووان و پەرەسەندنی بووە، وەکو دەسەمۆکردنی ئاژەڵ و زیندەوەر و پێشکەواندنی کشتوکاڵ. مەگەر بەدەگمەن، ئەگینا هەرگیز لە هیچ یەکێك لە هەرێمە دراوسێکانی لە پەرەسەندنی دانیشتوواندا دوانەکەوتوە، چیاکانی کوردستان وەکو قەلایەکی سروشتی بەریان لە چەپۆکان و هێرشهێنانی داگیرکارانی بێگانە گرتووە کە پەیتا پەیتا لە هەڵپەی هەڵرشاندا بوونە بە هەرێمەکەدا، هەر لەبەر ئەمەش بەریان لە هەموو لافاوێکی دانیشتووان گرتووە کە لە ئەنجامی شەڕ و شۆڕی بەردەوامدا ڕوویان کردبێتە ولاتەکە، و ئەمە بێگومان تا ئەم سەدەیەش هەر بەردەوام بووە، تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم ژمارەی کوردان (٥١،٣ ملیۆن) خۆی دەدا لە ژمارەی دانیشتووانی میسر (٢,٥ملیۆن بە گوێرەی ئەو تۆمار بەندییانەی دەسوپێوەندە تۆمارچییەکانی ناپلیۆن ساڵی ١٧٩٩ لە میسر یادداشیان کردووە)، ئەمڕۆ کە ژمارەی کوردان ناگاتە نیوەی ژمارەی دانیشتووانی میسر (٢٨ ملیۆن کورد لە بەرامبەر ٥٧ ملیۆن میسرییدا).

لەسەردەمە هەرە کۆنەکاندا، پەرەسەندنی خێرای ڕێژەی دانیشتووانی مێزوپۆتامیا و ڕۆژەلات بەشێنەیی لە ژمارەی گشتی دانیشتووانی کوردی ڕۆژهەڵاتی ناوینیان دەخوارد لە دەوروبەری ٢٠٠٠ی پێش میلاددا ڕێژەکە تا ڕادەی ١٢٪ هاتە خوارەوە، دوایی دیسانەوە سەرکەوتەوە (بڕوانە خشتبەندیی ژمارە ٢).

لە هەزارەی یەکەم و دووەمی پێش میلاددا، گەلە ڕەوەندی هیندۆئەورووپی زمان بەلێشاو ڕژانە هەرێمەکەوە. ئەم پرۆسەیە نزیکەی ١٥٠٠ ساڵی بردو تا چوارسەد ساڵی پێش میلاد هەر بەردەوام بوو (ئەگەرچی ڕۆژاوای کوردستان تا سەدەی دووەمی پاش میلاد هەر خانە خۆیی شەپۆل شەپۆلی کۆچەری ئاریا نەژاد بوو، کە بریتی بوون لەو ئالانانەی کە لە بلندایییە ئەورووپایییەکانی قەفقاسەوە دەهاتن) ئەمە بوو بەهۆی کزبوونی ڕێژەی پەرەسەندنی دانیشتووان بەوەی هەندێکیان لە خەڵکی کوردستان لە ئابووریەکی نیشتەجێی کشتوکاڵیی پڕ خەڵکەوە گۆڕی بۆ ئابووریەکی ڕەوەندتەباری تەنك خەڵك بەم جۆرە، کێشانەی کوردان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زیادی کرد (لە ١٢٪ەوە بوو بە ١٢،٥٪)، ئەویش، بەهەرحاڵ، لەبەر ئەوەی کە دانیشتووانی هەرێمە دووردەستەکانی بانی ئێران و ئاسیای ناوەندو ناوەند و

ڕۆژاوای ئەنەدۆڵ گەلێك لە كوردەكان زیاتر تووشی كەمبوونەوەی دانیشتووان بوون.

لە سەردەمی كۆچكردنی ئاری نەژادەكاندا بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، تەنها گەلانی مێزوپۆتامیا و ڕۆژهەلات بەرێژەی بازدەر پەرەیان سەند، هەرچەندە ئەو پەرەسەندنەش وەكو جاران بلەز نەبوون لە كۆتایی ئەم داستانەدا، و لە سەدەی چوارەمی پێش میلاددا ڕێژەی زیاد بوونی دانیشتووان دیسانەوە لووتی بەرز كردەوە. زاگرۆسی باشوور كە بەشێكی دیاری نیشتمانی نەتەوەیی كورد بوو، هەر لە سەدەی حەوتەمی پێش میلادەوە بگرە تا سەدەی دوانزەیەمی پاش میلاد (واتە ئەو دەمەی كە گۆنەڵی پێكهاتن و مەیینی ئەتنی خەڵكان بوو (بڕوانە كۆچكاریە مێژووییەكان)- بەشێوەیەكی تایبەتی بە لێوڕێژییەكی یەكجار گەورەی دانیشتوواندا تێپەڕی لە ئاكامی هاتنی لێشاوی خەڵكێكی زۆری ڕەوەنددا. زاگرۆسی باشوور هەر خۆی لە رووی پێكهاتەی زەمینییەوە، هەمیشە سەرزەمینێكی زۆر لە باربوە بۆ لە خۆگرتنی ژمارەیەكی یەكجار گەورەی دانیشتووانی مەڕ لەوەڕێن - ئەمە لە زۆر هۆوە هاتووە لەوانە، شوێنەكەی كە یەكجار قایمە بۆ خۆپاراستن لە هێرشی دەرەكی هەروەها لەبەر ئەوەی لەوەڕگا و پاوانێكی یەكجار گەورە و بەرفراوانی بە بەرەوەیە، تەنانەت ئەمڕۆكانەش، گەورەترین مۆڵگەی ڕەوەندی پەزدار لە هەموو جیهاندا لەو مەرز و بوومەدا نیشتەجێن.

هەر لە سەرەتای سەدەی چوارەی پێش میلادەوە تا سەدەی پێنجەمی پاش میلاد، كوردان شەپۆل لە دوای شەپۆل ڕووەو باكووری ڕۆژاوا كەوتنە گواستنەوە، لە باشووری زاگرۆسەوە بەرەو ناوەند و باكووری زاگرۆس و ڕۆژاوای ئەلبورز و ڕۆژهەلاتی زنجیرە چیاكانی تورۆس و پۆنتۆس ڕەوەیەك تەنانەت ڕووەو ڕۆژهەلات گەیشتنە هەرێمی ماكران (بلوجستانی ئێستاكە)، لەم داستانی كۆچكردنی ناوخۆییەدا لەوانەیە لە نیو ملیۆنەوە تا سێ چارەكە ملیۆن كورد (٢٥-٣٠٪ی ژمارەی گشتی كورد لەو دەمەدا) بەرەو باكووری ڕۆژاوا جێگۆڕكێیان كردبێ.

لە دەورووبەری سەرەتای سەدەی پێنجەمی پاش میلاددا، كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا پاش كۆتایی هاتنی ئەم زنجیرە كۆچكردنە، گەیشتنە ڕادەی سەركردن لە دانیشتوواندا و ئەمە بو بەهۆی ئەوەی خەڵكێكی زۆر لە دەست پاڵەپەستۆی بێ ئامانجی دانیشتووان بۆ وڵاتی دوور دەست مل بنێن و لەوێ پەلەی گەورە گەورەی كوردی دەرەوەی خاكی كوردستان پێك بهێنن. ئەم بەزمە هەر بەو نەزمە ڕۆیشت تا سەدەی یانزەیەم كە سەرەتای شریتەكردنی هەزار بەهەزاری كۆچكردووی وێڵی تورك زمان لە ڕۆژهەلاتەوە ملیان نا، ئەمانە لەو هەڵپەی سەرهەلگرتنەدا بەرەو سەرزەمینی بیزەنتی و مێزوپۆتامیا، كوردستانیان كرد بە قۆناغ و كاروانسەرای نیشتنەوە.

**خشتبەندی ژمارە(٢) گۆڕانی دیموگرافی کوردان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا**

| ساڵ | ژمارەی گشتی دانیشتووانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست* | ژمارەی گشتی کورد | ڕێژەی٪ی کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا |
|---|---|---|---|
| ٤٠٠٠ پ. ز | ١ ملیۆن | ٠,١٥ ملیۆن | ١٥ |
| ٣٠٠٠ | ٥٤٢ | ٠,٣٢ | ١٣ |
| ٢٠٠٠ | ٥,٥ | ٠,٦٦ | ١٢ |
| ١٠٠٠ | ٩ | ١,١٢ | ١٢,٥ |
| ٥٠٠ | ١٢ | ١,٧٧ | ١٢,٥ |

تێبینی: ئەو ژمارانەی کە لە بارەی دانیشتووانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە لە ٣٠٠٠، ٢٠٠٠ و ١٠٠٠ی پێش میلاددا دراون لە McEvedy and R.jones 1978)-C. ل ١٢٣—١٢٥) وەرگیراون، ژمارەکانی ٤٠٠٠ پێش زایین لەلایەن دانەری ئەم کتێبەوە دانراون. بۆ سەرچاوەی ژمارەکانی ٥٠٠ی پێش زایینی، (بڕوانە سەرچاوەکانی خشتبەندی ژمارە ٤).

ژمارەبەندی (١): ڕوکاری دیموگرافیی کورد لە ٦٠٠ پێش میلادەوە تا ١٩٠٠ پاش میلاد.

ژمارە (1): ئاراستە دیموگرافییەکانی کوردان لە (600)ی پێش میلادەوە تا (1900)ی پاش میلاد

سەرچاوە: McEvedy and R. Jones (1978)

* ئەم زانیاریە باکووری ئەفریقا ناگرێتەوە.

دەرپەڕاندنی دانیشتووانی کوردی ناوچەکان و ئەو زیانانەی بەرماڵ و گیانیان کەوت لە ئاکامی ئەو لافاوە بەشەریەدا، لەهەمان کاتدا، دیموگرافیی زەرەرمەندیشی لێکەوتەوە.

ئەو هەڵقوڵانە دێوانەوارەی تورکان کە لە سەدەی دەیەمدا هاتە کزبوون دوایی کۆتاییشی هات، لەگەڵ خۆیدا نەخۆشی ڕشانەوەی بەدیاری بۆ کوردان لە کۆتایی سەدەی چواردە و سەرەتای سەدەی پانزەدا هێناو بە هەزارەهای لە خەڵکەکە لەناوبرد شان بەشانی ئەنەدۆڵی ڕۆژاوا و قەفقاسەکان، کوردستانیش بەشی هەرەگەورەی ئەم پەتا ماڵوێرانکەرەی بەرکەوت، لە کاتێکدا سەرزەمینە بیابان سروشتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەبەر سەختی و وشکی باری کەش و هەوای کەمتری لەم پەتا کوشندەیە بەخەگیربوو. بەهەرحاڵ، گرانی پەتاکە لەسەر کوردستان، بەقەی گرانی لەسەر ئەورووپا ماڵوێرانکەر بوو.

ئەگەر ئەو تیۆریەی کە دەڵێ: تایپی خوێنی (A) لە هەرێمێکدا زیاتر دۆستە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوونی دبلیی، و تایپی B لەگەڵ کۆلێرادا، ڕاست بێ، ئەوە دەبێ کوردستان زیاتر تووشی کۆلێرا بوویێ و کەمتر تاعوونی دبلی، لە کوردستاندا خوێنی تایپ B لە هەموو تایپێکی تر باوترە، ئینجا تایپی A (بڕوانە ئەنترۆپۆ لۆجیای لەش) لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەو دوو دەستە گەورەیەوە کە تاعوونی دبلی لە سەدەکانی شەش و چواردەی پاش میلاددا بە توندی وەشاندنی، ناچارین چاوێك بە ژمارەی دانیشتواندا بگێڕینەوە، هەرچەندە زەبری هەرە گەورە لە ئەورووپا کەوت، لە هەمان کاتدا کەمیی تایپی (O) کە وەکو دەردەکەوێ دژ بە نەخۆشی ئاوڵەیە، لەوانەیە یەکێك بێ لە هۆکانی کەمیی ئەم نەخۆشییە لە کوردستاندا هەر بۆیەشە، هەرگیز نابێ دەسکاری ژمارەی دانیشتووانی کوردستان بکرێ، ئەگەر ئاوڵە دانیشتووان و وڵاتانی دراوسێشی گرتبێتەوە.

لە کۆتایی دەورەی، ڕەهەندەکردن و کۆچکاری و دەست وەشاندنی وەباکان، لە دەورووبەری (١٤٢٥)ەکاندا، ژمارەی دانیشتووانی کوردستان شۆڕبووەوە بۆ ٢,٤٨ملیۆن، ئەمەش نزمترین ژمارەی بو لە ساڵی (٥٠)ی دوای میلادەوە، لە سەدەی داهاتوودا، ژمارەی دانیشتووانی کوردستان بەشێوەیەکی سەرسووڕێنەر هەڵسایەوە و لە ساڵی ١٥٢٠دا بە ڕێژەی ٢٠٪ بەرزبوەوە تا خۆیدا لە ١،٢ ملیۆن. لەم دەمەدا دانیشتووانی گەلان و وڵاتانی دراوسێش پەرەسەندنی لەو شێوەیان بە خۆوە دیت.

بەڵام دوو هۆکاری جیاواز بەخێرایی ئەم گۆڕانە دیموگرافیە پۆزەتیفەیان ئاوەژوو کرد لەناو کورداندا: ١) وێرانبوونی ئابووری دێرینەی بازرگانی بنەما بەهۆی گۆڕینی ڕێ و بانی بازرگانی جیهانی کە کاروانە ڕێیان بە کوردستاندا تێدەپەڕی، بۆ ڕێگاوبانی دەریایی، و ٢) شەڕ و شۆڕی دوور خایەن (بەو سیاسەتی زەوی سوتاوەوە کە ئێرانیەکان لە سیاسەتی بەرەنگاربوونەوەیان لەگەڵ عوسمانیەکاندا بەکاریان دەهێنا) و داستانی لێقەومانە گەورەکانی ڕەهەندەکردنی بە کۆمەڵی دانیشتووان، وێرانبوونی ئابووری و زۆربەی زەویوزاری کوردستان، لە دوو سەدەی داهاتوودا، لە ساڵی ١٦٣٨دا خۆی لە کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتووانی کوردستاندا بە زەقی دەرخستەوە. لەم ساڵەدا ڕێککەوتنامەی ئاشتی زەهاو لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆری دژ بەیەکدا ئیمزا کرا.

پاش بە ئیمزا گەیشتنی ڕێککەوتنامەکە، ژمارەی دانیشتووان دیسانەوە لووتی دایەوە لە بەرزی، بەڵام بە شێنەیی. ئەم شێنەییەش یەکەم، لەبەر پەرەسەندنی پەیوەندیی ڕەوەندیەتی بوو لەناو کورداندا، کە لە ماوەی سەدەکانی ڕابردوودا نیشتەجێی کشتوکاڵی ژیانێکی گەورەی لێدابوون و دڵنیا کەری ژیانیان نەبوو، چونکە وەکو وەرزێر بەردەوام لەبەر مەترسی تاڵانکردن و گرتن و ڕاوەدوونان و ڕەهەندە کردن، یان بە کۆیلەگیری بوون لەلایەن هێزە ئیمپراتۆریەکان خۆیان یان تاخمە چەتە زەلەندەکانیانەوە کە هەمیشە بەم سەر و ئەوسەری کوردستاندا تەراتێنیان دەکرد گومان لەوەدانیە لە باری دیموگرافیەوە، ئابووری کشتوکاڵی دەتوانێ بە ئاسانی لە یەکەیەکی زەوییدا دە جار بەقەی ئابووری کۆچەری خەڵك بەخێوکا.

کرژبوونەوەی ئابووری بەهۆی وەستانی بازرگانی جیهانییەوە، بە قووڵی سەرلەنوێ گەشانەوەی ئابووری کشتوکاڵیی کوردستانی خاو کردەوە و ئەوەش بوو بە مایەی ئەوەی ڕێژەی دانیشتووان هەر بەتەنکی بمێنێتەوە و تا دەورووبەری ساڵی ١٧٢٥ کوردستان نەیتوانی بچێتەوە دۆخی ساڵانی ١٥٢٠ لە ڕووی چڕی دانیشتووانەوە.

باشوور و باکووری کوردستان، کە بەر لەوە لە (١٧٢٥)ەوە تا (١٧٥٠) بێ سەریەشە بردبوویانە سەر، ئەمجارە کەوتنە بەر داستانی لێقەومانی شەڕ و ڕەهەندە کردن. ئەمە زەبری لە ڕێژەی گەشەکردنی وەلا کەوەشاند، چونکە خۆی لەخۆیدا لەسەرخۆ و لاواز بوو، هەر ئەم داستانە خۆی، کارێکی کاریگەرتری کردە سەر باری فەرهەنگی کوردستان، گەلێ زیاتر لەوەی

کە بۆ سەرباری دیموگرافی کردبووی و بە یەکجاری پاشماوەی ئەو فەرهەنگە پایە کۆچەریەشی لەناوبرد کە بەرهەمی چینی ناوەندی خوێندەواری ئەو سەردەمە بوو سەرو پۆتەڵاکی ئەو فەرهەنگە خۆی بە تەواوی بەهۆی شەڕە بێ ئامانەکانی سەدەکانی پێشووی فارس و عوسمانیەکانیەوە هەڵقاچرابوو، ئەمەشی هاتە سەرو کاری بە یەکجاری کاریی کرد. سەرەڕای هەموو ئەم کارە ساتانە، ڕێژەی گشتی دانیشتووان لە دەوروبەری (١٧٥٠)دا دیسانەوە دایەوە لە بەرزی، بگرە سەریشی کرد لە (١،٣) ملیۆنەکەی سالانی (١٥٢٥) ڕێژەی گەشەکردنیش هەر لووتی لە بەرزی بوو و تا ساڵی ١٩١٤ هەر بەم نەزمە بێ تەگەرەی گرنگ مایەوە.

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، جیهانی نوێخواز، سەرەنجام توانی خۆی لە کوردستاندا بنوێنێ، بەوەی یەکێك لە ئەندامانی، واتە ڕووسیای تزاری، بە تەنینەوە بۆ ناو قەفقاسەکان گوێی لە ئاسۆگەی وڵاتەکەوە قووتەوە کرد. تەکنۆلۆژیای نوێ، شێوازی تازەی بەرهەمهێنان، ئاگاداری لە پێشکەوتووترین شێوەی تەندروستی، سەرباری چەند شێوازی تری پێشکەوتن، کە لەسەر دەستی ئەوروپاییەکان هێنرانە ڕۆژهەڵاتەوە، بوون بە مایەی تەقینەوەی ڕێژەی گەشەکردنی سرووشتیی لەناو کوردان و دراوسێکانیشیاندا. دیسانەوە کاروباری بازرگانی جیهانی، ئەمجارەیان ڕووەو باکوور لەگەڵ ڕوسیادا، لە کوردستاندا گەرم بووەوە، هەرچەندە ڕەوتەکەی زۆر توند نەبوو: ئابووری کشتوکاڵی تینی تێ هاتەوە و کەوتەوە خواردنەوەی ئابووری کۆچەری و ئەمە خۆی نامەی مەرگی هەتا هەتایی ئەم ئابووریەی بە دەستەوە بوو. لە ئاکامدا، ژمارەی گشتی دانیشتووان لە ٥١،٣ ملیۆنەکەی (١٨٠٠)ەوە، ساڵی ١٨٥٠ خۆیدا لە (٩،٣) ملیۆن و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بازیدا بۆ (٤،٥) ملیۆن.

کەچی ئەم گەشەکردنە خێرایانە زۆر دەوامیان نەکرد، لە دەیەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا دیسانەوە لووتی ژەنیەوە خوارەوە. بەهۆی کارەساتە دڵتەزێنەکانی جەنگی جیهانی یەکەم و ئاکامە وێرانکەریەکانیەوە لە کوردستاندا، لە ساڵی (١٩١٤)ەوە کوردەکان، بەرەبەرە کەوتبوونە لە دەستدانی زەوی و وڵات. سوودمەند لەمە دراوسێ ئەتنیەکانیان واتە تورك و ئەرمەنیەکان بوون، تەقینەوەی شەڕ تەنها کارەکەی خراترکرد. ساڵی ١٩٢٠، مەسەلەکە بە باشی هەستی پێ دەکراو زەق هەڵزەپیبوەوە، ئەمە خۆی لە کارەساتە بەرفراوانەکانی قەتڵوعام و ڕەهەندە کردن و گرانی و قڕانەکاندا دەردەخست کە چ خاکی کوردستان چ

ئابووریەکەی و چ باری تەندروستی دانیشتووانەکەی بەسەریەکەوە نەهێشت. ئەم زانیاریانەی خوارەوە، ئاوێنەی بەشێکن، لەو بارە ماڵوێرانکەرەی لەم کارەساتانەوە کەوتەوە:

هەر لە ماوەی جەنگەکەدا، هەر چوار ولایەتی وان و بتلیس و دیاریەکر و ئێلازیك، دوابەدوای یەك (١٢٪، ٤٢٪، ٢٦٪ و ١٦٪)ی دانیشتووانە کوردەکەی خۆیان لە دەستدا (ئەمە مەسیحییەکان، واتە ئەرمەنی و ئاشووریەکان ناگرێتەوە کە بەچڕی لەم ولایەتانەدا نیشتەجێ بوون) ڕاستە مردن دەستێکی باڵای لەم کارەساتەدا هەبوو بەڵام گشت هۆیەکە نەبوو. سەرجەمی ژمارەی لە دەستچووەکانی ئەم چوار ویلایەتە خۆی دەدا لە (٦١١٠٠٠)کەس (بڕوانە Mc Carthy 1983) لەمە لەوانەیە(٥٠٠,٠٠٠ — ٤٥٠,٠٠٠)ی مردن بوویێ کە لەنێوان (٣٥٠٠٠٠) تا (٤٠٠٠٠٠) یان بەر کورد دەکەون، چونکە هەرە زۆریەی دانیشتووانە مسوڵمانەکەی ناوچەکان تەنها کورد بوون.

هەرچی ڕێژەی لە دەستچوون لەنێو دانیشتووانی ویلایەتەکانی تردایە، لەبەر نەبوونی ژمارەبەندیی ڕاست و دروست، ناچار هەر دەتوانین مەزەندەی بۆ بەکاربێنین. لێرەشدا لەبەر ئەو هەموو جێگۆڕپێکردنی دانیشتووانەدا کە چ لە کاتی شەڕەکەدا و چ لە پاشدا ڕوویاندا، کارەکەمان ڕاست نایەت. زۆر وێ دەچێ وڵاتی فارس بەشی گەورەی ئەم لەدەستچوونەی بەرکەوتبێ. ئەم دەست و ئەو دەستکردنی چەند جارە لەنێوان ١٩١٤ و ١٩٢٣دا، بەتەواوی ڕوخساری ئەتنیکی مەڵبەندەکەی شێواند و ئەمەش پەردەی بەسەر هەموو مەزەندەکاریەکی چاکدا کێشا کە بۆ زیانی گیانی، ون بوون یان دەربەدەر بوون بکرێ. چاوژێر کردنەوەیەکی باش، زیانی کوردان بەگشتی لە وڵاتی عوسمانی و ڕووسیاو ئێران دەگەیەنێتە (٥٠٠٠٠٠) کەس بەو زیانانەوە کە لە شەڕی یەکەم و پاشەلەقە کانیشیەوە کەوتنەوە، واتە لە ساڵی (١٩١٤)ەوە تا ساڵی (١٩٢٥). ئەمە (١٠٪) ژمارەی گشتی ساڵی (١٩١٤)ی کوردان دەگرێتەوە (نەخشەی ژمارە ٣٤).

لەنێوان (١٩١٤ و ١٩٣٠)دا ژمارەی گشتیی کوردان دای لە کزییەکی زۆر گەورە، ئەمە لەکاتێکدا بوو، کە ئەرمەنیەکانی لێدەرچێ، ژمارە گشتی هەموو نەتەوەکانی تر لە زیادبووندابوو. تا ساڵی ١٩٥٠، کورد چ لەخاکدا چ لە ژمارەی دانیشتوواندا هەر لە کورتیداندا بوو، دوای ئەمە وچانێکی ڕاوەستان هاتە ئاراوە، تا لە ١٩٥٥ بەدواوە مەسەلەکە بە

پێچەوانەوە وەرگەڕا (بڕوانە خشتبەندی ژمارە ٣).

لە ناوەڕاستی (١٩٦٠)ەكانەوە تەرزیەندی دیموگرافی كوردان دیسانەوە لووتی بە خێرایی و بە توندی بەرزكردۆتەوە و وا خەریكە بە شێنەیی خۆی دەباتەوە نۆخی جاران و دەگاتەوە (١٥٪)ی هەموو دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەمە ئاكامێكی ڕاستەوخۆی ئەو سیاسەتی

ئەپارتایدی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەیە کە تورکیا لەسەری ڕۆیشتووە. هەر ئەم سیاسەتە خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکی دیموگرافیی ئەوتۆی هێناوەتە کایەوە کە بوە بە مایەی شڵەژان لە پێکهاتەی ئەتنی هەر دەوڵەتێکی تردا کە هەمان جۆرە سیاسەتی پەیڕەو کردبێ. لە کاتێکدا سیستەمی پێشکەوتووی تەندروستی لە تورکیا بە قووڵی ڕێژەی مردنی منداڵانی لەو وڵاتەدا کەم کردۆتەوە و بۆتە مایەی تەمەن درێژی بۆ دانیشتووان بەگشتی، سیستەمی کۆمەڵایەتی-ئابووری ڕێژەی گەلێ نزمتری لە بواری پەروەردە و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری لێکەوتۆتەوە لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردنشین کە خۆی لە خۆیدا گەلێ لەناوچەکانی ڕۆژئاوا دواکەوتووترە، بۆیە دەبینین دەرفەتی کەمتری خوێندەواری و کار دەسکەوتن بۆ کوردەکان بەگشتی و ژنان بەتایبەتی دێتە دەستەوە. هەرچەندە سیستەمی دەوڵەتیی تورکیا توانیویە لە ٤٠ ساڵی ڕابردوودا ڕێژەی مردنی منداڵ لەسەرخۆ کەمترکاتەوە لەناو کورددا، دەرفەتی کەمتر بۆ ژنان ڕەخسێنراوە کە لە شێوازەکانی نەهێشتنی منداڵ بوون سوود وەرگرن، تا بەو جۆرە بتوانن چ ئاستی ژیانی خۆیان باشتر کەن و چ دەرفەتی زۆرتری کار پەیدا کردن بێننە دەست. هەرچەندە ئەوانەی لە ڕووی ئەتنیەوە خۆ بە تورك دادەنێن ڕێژەی منداڵبوونیان گەیاندۆتە ئاستی وڵاتە ئەورووپاییەکان، هاووڵاتیە کوردەکان هەر لەسەر شێوازی وڵاتانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێ دەخوڕن.

هەمان دیاردە کە بە پەلە خەریکە تورکیا زۆرتر دەکوردێنێ، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و کاریگەر توانی ڕێژەی سپی پێستەکان لە وڵاتێکی وەکو ئەفەریقای باشوور لە (٢٨٪)ەوە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بۆ ١٦٪ داشکێنێ لە ١٩٧٠ و ١٠٪ لە ڕۆژی ئەمڕۆدا. بەشێوەیەکی گشتی ئەو ئەورووپاییانەی کە لە (١٩٠٠)دا سێ یەکی هەموو جیهان بوون، ئێستا تەنها (٩٪)ی ژمارەی گشتی دانیشتووانی جیهانن.

بۆ مەبەستی ئەم توێژینەوەیە، نەشونماکردنی دیموگرافی کورد لە تورکیا لەسەر تەرزهەڵدانی گشتیی دیموگرافی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست حیساب کراوە، (واتا بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ڕێژەی زۆر نزم و لەسەر خۆی ئەورووپا کە تورکەکان لەسەری دەڕۆن بڕوانە خشتبەندی ژمارە ٤ ب) هەر لەم بوارەدا، ڕێژەی نەشونما کردنم لە وڵاتانی سوریا و ئێران و عێراق لە ساڵێکدا کردووە بە بنەما بۆ حیسابکردنی ژمارەی دانیشتووانی بیست ساڵی

ڕابردووی کوردستان. لەمە تەنها دەیەی شەستەکانم بواردوە، کە ڕێژەی دەوڵەتی لە تورکیا ژمارەی گشتی کوردانیش دەگرێتەوە، چونکە لە کاتێکدا کە (١٩٥٠) کاندا کوردەکان لە تورکیا خێراتر لە تورکەکان زیادەیان کرد، لە دەرەوەی تورکیا وانەبوو. بەم جۆرە، ئەمسەرو ئەوسەر، ئامارە دەوڵەتیەکانی تورکەکان ڕاست و دروست دەردەچوون.

ئەم پەرەسەندنە دیموگرافیەی کورد ئێستا خەریکە خۆی لە باری جوگرافیشدا دەنوێنێ، بەتایبەنی لە تورکیا. زۆربەی مەڵبەندەکانی گوزەران لە تورکیا خەریکن بەرەبەرە دەکەونە ڕۆژئاوای ئەو وڵاتە، ئەم ڕاستییە بۆتە مایەی بکێشکردنی ئاپۆڕایەکی خەڵکی کەم گوزەرانی کورد لە ئەنەدۆڵەوە کە ناوەندی چڕی دیموگرافی کوردە ڕووەو ڕۆژئاوا لە چیاکانی زاگرۆسەوە، بۆ چیاکانی تۆرۆس و پۆنتۆس (بڕوانە شارنشینی و ناوەندە شارنشینییەکان). ئەمە ئاوەژوکردنەوەی ئەو کارەیە کە بیزەنتییەکان نزیکەی ١١٠٠ ساڵ لەوەبەر دەیانکرد و کوردیان لەناوچەکانی تورۆس و پۆنتوس دەردەپەڕاند.

سەرەڕای هەموو ئەو لێڵاییەی لە بارەی ژمارەی گشتی کوردانەوە، لەناو هەموو ئامارگیریەکاندا هەیە، باوەڕی گشتی وایە کە ئەمڕۆکە کورد دوای عەرەب و فارس و تورك چوارەم گەورەترین پێکهاتەی ئەتنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی مەزن پێکدێنێ.

زۆربەی زۆری کوردان لەم دەمەدا لە تورکیادا جێگیرن (٥٢٪ی گشت کوردان پێکدێنن) ئینجا ئێران بە (٢،٢٥٪)ەوە، پاشان عێراق بە (١٦,٨٪)ەوە، دوایی سوریا بە (٩،٤٪)ەوە و ئینجا یەکیەتی دەوڵەتە سەربەخۆکان بە (١،١)ەوە. تا ساڵی ١٩٧٥، کوردەکانی عێراق ٥،١٧٪ی هەموو کوردانیان پێکدەهێنا، ئەو بەشە زۆرەی کوردانی عێراق کە پاش ڕووداوەکان لە ئێران بوون بە پەناهەندە لە ژمارەی کوردی عێراق داماڵراون و چوونەتە سەر کوردانی ئێران لە ڕووی ئامارییەوە چونکە لە هەموو لایەنێکەوە لەگەڵ باروبۆخی تازەیاندا گونجان و جێگیر بوون، بەم جۆرە (٨،١٦٪)ەکە ئەو داشکانە کۆنەی دانیشتووانی کوردی عێراق دەردەخا، نەك ئەو زیانە گەورانەی لە (١٩٨٠)کان و ١٩٩١ لێیان کەوت چونکە پۆرتاخی ئەمەی دوایی هێشتا بە باشی دەرنەکەوتوە، بۆیە، بە زۆر مەزەندە ژمارەی گشتی کوردان ئێستا لە عێراقدا لە (١٢٪)ی گشت کوردان تێناپەڕێ.

## خشتەبەندی ژمارە (٣): تەرزبەندییەکانی دیموگرافی کوردان لە سەدەی بیستەمدا.

| سالٚ | تورکیا | | | ئێران | | | عێراق | | | سوریا | | | قەفقاس + ئاسیا ناوەند | ٪١٠٠ گشتی گۆڕین | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | گشت | کورد | ٪١٠٠ | گشت | کورد | ٪١٠٠ | گشت | کورد | ٪١٠٠ | گشت | کورد | ٪١٠٠ | کورد | کورد | دەیەی پێشوو |
| ١٩٠٠ | ١٢,٢ | ٢,٩٩ | ٢٢,٥ | ١٠ | ١,٢ | ١٢ | ٢,٢٥ | ٠,٦١ | ٢٧ | ١,٧٥ | ٠,١٧ | ١٠ | ٠,٠٧ | ٥,٠٤ | — |
| ١٩١٠ | ١٤,٢ | ٢,١٥ | ٢٢,٢ | ١١,٨ | ١,٢٥ | ١١,٥ | ٢,٢٩ | ٠,٦٤ | ٢٨ | ٢ | ٠,١٨ | ٩ | ٠,٠٦ | ٥,٢٨ | ٦,٧٥ |
| ١٩٢٠ | ١٣,١ | ٢,٨٥ | ٢١,٧ | ١٠ | ١,٣٠ | ١٢ | ٢,٥ | ٠,٦٧ | ٢٧ | ٢,١ | ٠,١٨ | ٨,٦ | ٠,٠٥ | ٥,٠٥ | -٦,١٢ |
| ١٩٣٠ | ١٤,٤ | ٢,٩٥ | ٢٠,٥ | ١٢,١ | ١,٥١ | ١٢,٥ | ٢,٠ | ٠,٧٥ | ٢٥ | ٢,٢٥ | ٠,٢٩ | ١٢,٩** | ٠,٠٧ | ٥,٥٧ | ١٠,٢ |
| ١٩٤٠ | ١٧,٨ | ٢,٢٩ | ١٩,١ | ١٣,٨ | ١,٦٦ | ١٢ | ٢,٨ | ٠,٨٧ | ٣٢ | ٢,٥ | ٠,٢٦ | ١٠,٤ | ٠,١٣ | ٦,٣١ | ١٣,٢٩ |
| ١٩٥٠ | ٢٩ | ٣,٩٧ | ١٩ | ١٧,٥ | ٢,١ | ١٢ | ٤,٧٧ | ١,١ | ٢٣ | ٢,٢٥ | ٠,٢٢ | ٩,٨ | ٠,١٢ | ٧,٦١ | ٢,٦ |
| ١٩٦٠ | ٢٧,٨ | ٥,٢٥ | ١٨,٩ | ٢٢,٦ | ٢,٧١ | ١٢ | ٦,٥ | ١,٤٦ | ٢٢,٥ | ٤,٤٢ | ٠,٤١ | ٩,٢ | ٠,١٦ | ٩,٩٩ | ٣١,٢٧ |
| ١٩٧٠ | ٣٦,٠ | ٧,٠٤ | ١٩,٥ | ٢٨,٧ | ٣,٥ | ١٢,٢ | ٩,٨ | ٢,٢٥ | ٢٣ | ٦,٦ | ٠,٥٩ | ٩ | ٠,٢٢ | ١٢,٦١ | ٣٦,٢٤ |
| ١٩٨٠ | ٤٦,٠ | ٩,٧٨ | ٢١,٢ | ٢٩ | ٤,٨ | ١٢,٤ | ١٢,١ | ٢,١٥ | ٢٥* | ٩,١ | ٠,٨٣ | ٩,١ | ٠,٢٨ | ١٨,٨٤ | ٢٨,٢٤ |
| ١٩٩٠ | ٥٦,٧ | ١٢,٦٥ | ٢٤,١ | ٥٥,٦ | ٦,٦ | ١٢,٤# | ١٨,٨ | ٤,٤ | ٢٢,٥* | ١٢,٦ | ١,١٦ | ٩,٢ | ٠,٣٤ | ٢٦,١٥ | ٣٧,٢١ |

ژمارەی دانیشتووان بە ملیۆن دانراوە، (ژمارەکان نزیك کراونەتەوە).

تێبینی: لە هەندێ دەوڵەتی وەکو ئێران کە هەر پێنج سالٚ جارێك ئاماری گشتی دەکات، ئەو ژمارانەی کە بۆ دەساڵ دانراون بەرهەمی لێکدانەوەی خۆمن و پشتم بەڕێژەی پەرەسەندنی ساڵانەی دانیشتووان بەستوە.

ژمارەی گشتی ئەو کوردانەی ئێستا (١٩٩١) لە عێراق دەژین لە ٥،٣ ملیۆندایە و بەمە تەنها ٢١،١٪ی ژمارەی گشتی دانیشتووانی عێراق واتە ٦،١٦ ملیۆن پێکدێنن، (ژمارەی گشتی دانیشتووانی عێراق کە ١٨،٨ ملیۆن بوو لە ١٩٩٠دا دەبێ ٢,٦ملیۆنی لێ دەربکرێ بۆ ئەو کوردانەی کە لەوێ دەرپەڕیون و نزیکەی ١,٥ ملیۆن کرێکاری وڵاتانی تری عەرەب و شیعە سەرەڕای نزیکەی (٠,٢) ملیۆن کە بوون بە قوربانی جەنگ).

** ئەمە زیاتر لەبەر ئەوەی پەنابەرێکی زۆری کورد لە ئەنەدۆڵەوە ڕێچکەیان کردووە، لەمانە، نزیکەی (٥٠) هەزاریان لە ١٥ ساڵی دواییدا ڕوویانکردۆتە لوبنان و ئەردەن و فەلەستین.

* (لە ساڵی ١٩٧٥)ەوە لە عێراق کوردێکی زۆر بە تۆبزی ڕەهەندەی وڵاتانی دراوسێ، بەتایبەتی ئێران کراون. هەرچەندە زۆربەی ئەمانە دەگەڕێنەوە، بەڵام هەندێکیان هەر دەمێننەوە یان بەرەو دەرەوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سەرهەڵدەگرن.

# ڕێژەی سەدیی کوردان لە دانیشتووانی ئێراندا لەنێوان ١٩٧٠–١٩٩٠دا دابەزیوە (چونکە ڕێژەی سروشتیی پەرەسەندن لەوە نزمتر بوە کە دەوڵەت داویەتی) و لەوانەیە ئەو کوردانەشی تێخرابێ کە لەو دەمەدا لە عێراقەوە هاتبوونە ئەودیو و وێ نەچوو جارێکی تر نەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.

* (لە ساڵی ١٩٧٥)ەوە لە عێراق کوردێکی زۆر بە تۆبزی ڕەهەندەی وڵاتانی دراوسێ، بەتایبەتی ئێران کراون. هەرچەندە زۆربەی ئەمانە دەگەڕێنەوە، بەڵام هەندێکیان هەر دەمێننەوە یان بەرەو دەرەوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سەرهەڵدەگرن.

سەرچاوەكان (سەرباری ئەوانەی كە لە دەقەكەدا ناویان هاتووە):
World Development Report(1986)، Turkey James Spitler&Michael Roof، Detail Statistics on the Urban and Population of Turkey 1950-2000(1982)

# ڕووكارەكانی ئایندە

ڕووكارەكانی دواڕۆژی باری دیموگرافی كوردستان شان بەشانی ڕووكارەكانی دیموگرافی وڵاتانی سوریا و عێراق و ئێران دەڕۆن و لەگەڵ ڕێژەی پەرەسەندنی ئەوان ڕێ دەكەن لەجیاتی ڕێژەگیری پەرەسەندن لە هەرسێ وڵاتەكەدا (بە دابەشكردنی كۆی هەرسێكیان بەسەر سێدا وەرگێڕ) وەكو ئەوەی بۆ ساڵانی ١٩٧٠–١٩٩٠ بەكارهێنراوە، ژمارەی ناوەندی هەر سێ وڵاتمان بۆ ئەم مەبەستە دەنەزەر گرتوە. بەم جۆرە پەیوەندیی دیموگرافی ئەوانمان لەگەڵ هی كورددا بە ڕوونی بۆ دەردەكەوێ. هەر بەم جۆرە پەرەسەندنی گشتی دیموگرافیی كورد لە داهاتووی نزیكدا، هاوشان دەردێ لەگەڵ پەرەسەندنی دیموگرافی سوریا لە ماوەی ١٩٩٠–٢٠٠٠ و هی عێراق لە ماوەی ٢٠٠٠–٢٠٢٠ و ناوەڕاستی هی عێراق و ئێران لە ماوەی ٢٠٢٠–٢٠٥٠دا. لەبەر ئەوەی وا چاوەڕوان دەكرێ ئێران پەرەسەندنێكی دیموگرافیی گەلێ گەورەتر لە هی دوانەكەی تر دەستگیركا لە ٢٠٢٠ بە نانەوە، ڕەچاوكردنی مەزەندە گیرییەكی مامناوەندی لەنێوان ئێران و عێراقدا ڕێكترە بەكاربهێنرێ، چونكە ئەو ژمارانەی بۆ پەرەسەندنی دیموگرافی كوردان دراون لە ڕێژە بەولاوە چی ترنین، بۆیە مەسەلەیەكی سروشتییە كە لە هەر ماوەیەكی دیاریكراودا، دانیشتووانی دراوسێی ئەوتۆ هەبن كە ڕێژەی پەرەسەندنیان لە هی كوردان بەرزتر بێ هەروەها هی تریش هەبن كە ڕێژەی پەرەسەندنیان لە هی كوردان نزمتر بێ. خشتبەندی ژمارە (٤ب) ئەم بەراوردكاریانە دەردەخا.

جارێكیان (جۆن ماینارد كینەس) لە سایشتێكیدا وتی: "زۆربەی جارەكان ڕووداوە مێژووییەكان بەهۆی گۆڕانی لەسەر خۆی دیموگرافیەوە دێنەكایەوە، بێ ئەوەی لەكاتی ڕووداندا هەستیان پێ بكرێ" دەتوانرێ كورد بە باشترین تاقیكەرەوەی ئەم ڕاستییە دابنرێ. ئەگەر تووشی لێقەومانێكی گەورە نەبن، كورد لە ساڵی (٢٠٠٠)دا دەبنە سێیەم گرووپی ئەتنی چڕی دانیشتووان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، پاش ئەوەی جێگەی توركەكان لەم پلەیەدا

دەگرنەوە. جگە لەمە، ئەگەر ئەم ڕووکارە دیموگرافیە بەم نەزمە بڕوا، کەوێ دەچێ هەرواش بێ، لە ماوەی دوورپشتدا کوردەکان لە خودی تورکیادا جێگەی تورکەکان دەگرنەوە لە چڕیی دانیشتوواندا و دەبنە زۆرینەی ئەتنی و دیسانەوە، وەکو لە سەردەمی حیثیەکاندا تا نەمانی بیزەنتیەکان، چۆن بوو، ئەوها زمانێکی هیندۆئەورووپی (واتە کوردی) دەکەنەوە زمانی سەرەکیی ئەو سەرزەمینە.

ژمارەی گشتی دانیشتووانی کورد بە نزیکەی (١) ملیۆن لە سالێکدا زیاد دەکا، لەوانەشە پاش سالّی (٢٠٠٠) بپەڕێ بۆ (١،٥) ملیۆن و بەم نەزمە تا دەورووبەری (٢٠٢٠) دەڕوا پاش ئەوە پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتووان کزتر دەبێ بەڵام بە شێنەیی تا دەگاتە کەمتر لە (١) ملیۆن لە سالێکدا پاش سالّی (٢٠٣٥)، تا لە سالّی (٢٠٤٥)دا دێتە سەر نیوەی ئەم ژمارەیە. ڕێژەکە لەنێوان سالانی ٢٠٥٥–٢٠٦٥دا دەچێتە سفر، چونکە ئەوسا ژمارەی گشتی کوردان دەکەوێتە قۆناغێکی دوور و درێژی لە کزیدانەوە بەهۆی چوونە ناو قۆناغی گەیوی دیموگرافی پاش مودێرنیتییەوە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتربڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: P. Smith and T. Cuyler Young, "The Force of Numbers: Population Pressure in the Central Zagros 12000-4500 BC," *The Hilly Flanks, Essays on the Prehistory of Southwestern Asia* (Chicago: The Oriental Institute of the University of Chicago Press, 1982); B.B. Spooner, ed., *Population Growth: Anthropological Implications* (Cambridge: Harvard University Press, 1972), particularly, P. Smith and T. Young's article, "The Evolution of Early Agriculture and Culture in Greater Mesopotamia: A Trial Model"; P. Smith, "Iran 9000-4000 BC," *Expedition* 13 (1971); J.B. Bridsell, "Some Population Problems Involving Pleistocene Man," *Population Studies: Animal Ecology and Demography, Cold Spring Harbor Symposia in Quantitative Biology* 22 (Cold Spring, Colorado, 1957); T. Cuyler Young, "Population Dynamics and Philosophical Dichotomies," in L.D. Levine and T.C. Young, Jr., eds., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia* (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, vol. 7, 1977); Ahmad Sousa, *Atlas of Iraq* (Baghdad, 1953); Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Ludwig Reichert Publisher, 1989); T.F. Aristova, "Poyezdka k Kurdam Zakavka'ya" ("A Visit to the Kurds of Transcaucasia") *Sovetskaya Etnografiya* VI (Moscow,

خشتبەندی ٤أ باری دیموگرافی كوردان لە ئێستاو دوای ڕۆژی نزیكدا.

| ساڵ | ١٩٩٠ | | | ٢٠٠٠ | | | ٢٠٢٠ | | | ٢٠٥٠ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دەولەت | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ |
| توركیا | ٥٦,٧ | ١٣,٧ | ٢٤,١ | ٦٥,٩ | ١٨,٧ | ٢٨,٤ | ٨٧,٥ | ٣٢,٣ | ٣٦,٩ | ١٠٥,٨ | ٤٧,٠ | ٤٤,٤ |
| ئێران | ٥٥,٦ | ٦,٦ | ١٢,٤ | ٧٣,٩ | ٩,٠ | ١٢,٦ | ١٣٠,٦ | ١٦,٢ | ١٢ | ١٩٢,٥ | ٢٢,١ | ١٢,١ |
| عێراق | ١٨,٨ | ٤,٤ | ٢٣,٥ | ٣٦,٥ | ٦,٤ | ٢٤ | ٤٤,٨ | ١٠,٩ | ٢٤,٥ | ٣٦,١٠ | ١٥,٠ | ٢٥ |
| سوریا | ١٢,٦ | ١,٣ | ٩,٢ | ١٧,٢ | ١,٦ | ٩,٢ | ٢٨ | ٢,٧ | ٩,٨ | ٣٣,٧ | ٢,٩ | ١١ |
| قەفقاس و ئاسیای ناوەند* | | ٠,٣ | | | ٠,٥ | | | ٠,٩ | | | ١,١ | |
| گشت | ٣٦,٣ | | | ٣٦,٢ | | | ٦٢,٠ | | | ٩٠,٢ | | |

١: ژمارە گشتی دانیشتووان. ٢: ژمارەی گشتی كوردان. ٣: ڕێژەی ١٠٠٪ی كوردان

خشتبەندی ٤ب ڕێژەی پەرەسەندنی دانیشتووان لە ڕابردوو و ئایندەی نزیكدا.

| دەوڵەت | پەرسەندن لە ڕابردوودا (١٠٠٪) | | | پەرسەندنی ڕەچاوكراو ١٠٠٪ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٧٣ — ١٩٦٥ | ٨٤ - ٧٣ | ٩٠ - ٨٤ | ٢٠٠٠ -١٩٩٠ | ٢٠٢٠-٢٠٠٠ | ٢٠٥٠-٢٠٢٠ |
| توركیا | ٢,٥ | ٢,٢ | ١ .٢ | ١٦,٢ | ٣٢,٧ | ٢,٩ |
| ئێران | ٣ | ٣,١ | ٣,٦ | ٣٢,٩ | ٧٦,٧ | ٤٧,٤ |
| عێراق | ٣,٣ | ٣,٦ | ٣,٩ | ٤١,٠ | ٧١,٨ | ٣٨,٨ |
| سوریا | ٣,٤ | ٣,٤ | ٣,٨ | ٣٦,٥ | ٦٢,٨ | ٢٤ |
| كورد | ٣,٥ | ٣,٨ | ٣,٧ | ٣٦,٥ | ٧١,٨ | ٤٣,١ |

ژمارەی دانیشتووان بە ملیۆن دانراون.

هەموو ژمارەكان نزیك خراونەتەوە

سەرچاوەكان:-

World Population Datasheets(Washington DC, Population Raference Bureau annual report sheet for 1990)

* سۆڤییەتی پێشوو.

# شارنشینی و مەڵبەندە شارییەکان

پاشماوەی بەپاوەی هەندێ شوێنەوار لە کوردستان باس لە یەکەم هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەکەن لەگەڵ شارستان نشینییدا لەم ڕووەوە، کۆنترین مەڵبەند، کە دەکرێ بە شار ناوببرێن نەك بە گوند، لە کوردستاندا دۆزراونەتەوە. کۆنە شارێك لە گوندێك بەوە جیادەکرێتەوە کە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی لە چەندین چین و پیشەوەر پێکهاتووی ئەوتۆی تێدا نیشتەجێ بێت کە هەر یەکە لە ئەندامانی دەسگیرکردنی جۆرە کالآیەکی بەکارهێنانی بەدەستەوە بێ و بۆ ئەم مەبەستە سەرزەمینیکی دیاریکراوی بەدەستەوە بێ و پەرەسەندنی ئابووری خۆی لەسەر بنەمای ئەو سەرچاوانەی بەدەستیەوەن بدەمێنێ و خاوەنی هێزێکی ولآت پارێزی چەکداریان میلیشیاتەوار بێ بۆخۆی. لەم دواییانەدا، نوسینیش بۆ یادداشتکردنی سەوداکاریە بازرگانیەکان و پێویستی تر خرانە پاڵ ئەوانە (بڕوانە پێشکەوتنەکانی پێش مێژوو سەرەتاکانی پەیدابوونی تەکنۆلۆجیا).

ئەگەر گشتیان نەبێ، زۆربەی ئەم شارە سەرەتاییانە قەڵەمڕەوی دەسەلآتی خۆیان بەرەو کۆمەڵە گوندەکانی دەوروبەریان ڕادا و ئەمە بوو بەهۆی پەیدابوونی شارە دەوڵەت شارە دەوڵەتەکانیش، بەرەبەرە تەنییانەوە و شارە دەوڵەتەکانی تریان هەڵلووشی، تا قەوارەیەکی ئەوتۆیان لێکەوتەوە، کە دەتوانین پێیان بڵێین شانشین (Kingdoms) و شارە مەزنەکانیان بۆ بوو بە پایتەخت.

ژمارەیەکی زۆری کۆنە شوێنەوارەکان لە کوردستان ئەم پێناسەیەیان پڕ بە پێستەو دەتوانین بڵێین لە سەرەتادا کۆنەشار بوونە. نموونەی هەندێ لەناوە ناودارەکانی ئەم بابەتە چای ئۆێنو (کوردستانی ڕۆژاوا)، چەرموو تەپەگەورە (کوردستانی ناوەند)، گەنج دارا و گۆدین (کوردستانی باشوور)ن کە هەموو بەر لە ٥٠٠٠ی پێش میلاد دروستکراون. گەلێ شوێنەواری شارستانی تەباری تر کە لەوانە نوێترن لە دەشتەکانی کوردستاندا هەن و هی قۆناغی پێش مێژوون (دەوروبەری ٣٠٠٠ پێش میلاد)، و لە هەموویان گرنگتر شوێنەوارەکانی سی گایی و حاجی فیرۆزن.

## چەردەباسێك لە بارەی کوردانەوە

کە قۆناغی مێژوو هاتە کایەوە، شارنشینی بوو بوو بەشتێکی باو لە کوردستاندا. شارە کوردنشینەکان، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ، هەموو لە دانیشتواندا تەنك بوون و هەر یەکەیان نزیکەی دەیەکی دانیشتووانی شارێکی ئێستاکەی ولاتی مێزوپۆتامیای تێدا دەژیا، بەلام بە ژمارە زۆرتر بوون لە هی ئەو ولاتە.

ڕووخسارێکی تری ئەم شارە سەرەتاییانە لە کوردستاندا بە نووسین لەسەر تاشەبەردینەکانی سەردەمی ئاشووریەکان لە سەدەکانی ٩ و ٧ی پێش میلاددا باس کروان. لە هەموو ئەو شارانەی کە کەوتبوونە بەر ئابلۆوقەو تالانکردنی ئاشووریەکان لە بلندییەکانی کوردستاندا، وەکو دەردەکەوێ چۆرە نەخشەکێشانێکی شارستانی تاکی کورد شێواز بەکارهێنرابێ (بڕوانە بیناسازی و نەخشەسازی شارستانی).

هەندێ شاری کوردنشینی ئەم سەردەمە مێژووی یەکجار دێرینی خۆیان دەبەنەوە سەر ئەو مەلبەندە شارنشینە کۆنانە، بۆ نموونە، هەمەدان و ئەربیل و مەلاتیەی ئەم دەمە، ئەکباتانا و ئەربائیلۆ و (ئەربێلای ناونووسراوە یۆنانی و لاتینیەکان) و مەلیدی (مەلیتینەی ناو نووسراوە یۆنانی و لاتینیەکان)ی ئەو سەردەمەن. زۆربەی ئەم شارانە لە ماوەی ٤٠٠٠ سالی ڕابردوودا ئاوەدان بوونە. ڕاستییەکەی، ئەو وێرانانەی کە نیشاندەری ئەو ئاوەدانیەن هێشتا لەناو جەرگەی هەمەدان و ئەربیل و مەلاتیە و شاە ئاباد و کرماشان هەر بە پێوەن.

زۆربەی شارە کوردنشینەکانی ئەم سەردەمە، دەتوانن مێژووی ڕاست و ڕەوانی خۆیان تەنها تا سەرەتای قۆناغی کلاسیك (سەدەی پێنجەمی پێش میلاد) ببەنەوە کەنگاوەر (کانکوباری دێرین)، دینەوەر (دون)، کرند (کارینا)، سەقز (ساکایەس)، سولەیمانی (شارەزوور)، کەرکووك (کەرخو دەبێت سەلوخ)، شەهرەبان (سەتراپ)، دیاربەکر (ئامەد) ئورفە (روها) و ماردین (ماردیس) بەشێکن لەمانە.

کۆتایی قۆناغی کلاسیك و سەرەتای سەدە ناوەندیەکانی مێژوویی کورد بە باشی بەلگەبەند کراون، چونکە لەو سەردەمانەدا شارە کوردنشینەکان چەندین کەرەستەی بەلگەبەندییان تێدا هەبوو (بڕوانە مێژوویی کلاسیك) پاراستنی ئەم کەلەپوورە بەنرخە خۆی لەخۆیدا کارێکی شایستەی ستایشە و دەتوانرێ بە بەرهەمی خەمخواردنێکی باشی شارستانیەت دابنرێ کە بۆتە مایەی پاراستنی لەو سەردەمەدا. لەپال ئەوانەشدا، بەلگەی تر

هەن کە پشتگیری ئەو بۆچوونە دەکەن کە دەڵێ ڕادەی شارنشینی لەو سەردەمەدا لە پەرەسەندندا بوە.

چ سەرچاوە خۆییەکان، چ ئەوانی بێگانە لە چەند جێگا باسی چەندین شاردەکەن کە شازادەکانی ساسانی و هی تر لە کوردستاندا بنیاتیان ناون، لە پاڵ ئەمەشدا نیشانەی زۆری جموجۆڵکردنی خەڵکیش هەن کە بۆ شارنشینی ڕوویان کردۆتە ئەو شارانە، چ لەناوچەکانی دەوروبەریان چ لە شوێنی دوورەوە. کەرکووك نموونەیەکی ڕێك و پڕ بە پێستە بۆ ئەم باسە (بڕوانە ڕەهەندەکردن و بەزۆر جێگیرکردن).

سروشتی شارستانیەت تەباری نیسبەتەن بەهێزی کۆمەڵگای کوردەواری بە باشی لە چاخەکانی سەرەتای ناوەند و ئیسلامەتیشدا هەر بەردەوام و کاریگەر بوو، هەرچەندە لە دەوروبەری سەدەی دوانزەیەمدا تا ڕادەیەك خاو بوەوە، ئەم بارە نوێیە هاوکات بوو لەگەڵ هێرش هێنانی کۆچەرە تورکەکان بۆ ناو وڵاتەکە و لەوێوە ملنانیان بەرەو ڕۆژاوا زەمین. گۆڕانی خێرای ئابووری کوردەواری بۆ ئابووریەکی کۆچەریانەی لاواز و کەم دەرەتان لە سەرەتای سەدەی شانزەیەمەوە، هەروەها بەرپابوونی شەڕ و شۆڕی دوا بەدوای یەك، ڕەهەندەکردن، و چۆڵکردنی مەڵبەندە دێهاتیەکان گشت پێکەوە شارە کوردنشینەکانیان کردە دوورگەی لێکبڕاو و شارەقەڵاو قەڵاچەی سەخت لەناو دەرو دراوسێیەکی مەڕوماڵات لەوەڕێنی دژە شارنشینی چڕ و بەرفراواندا. جگە لەمە لە کارکەوتن و کۆتایی هاتنی بازرگانیی ڕۆژهەڵات – ڕۆژاوا بە کاروانەڕێیە مەزنەکانی کوردستاندا بەهۆی شەڕ و شۆڕی نەبڕاوە و ڕووکردنە بازرگانیی دەریایی بە دەریاکانی باشووردا، سفرەی بەرەکەتی لە مەڵبەندە شاریە کەونارا و دێرین و پڕ کارەکانی کوردستان لوول دا.

قەڵا و قەڵایچە ڕوختە و جوان و بەدیمەنەکانی باکوورو ڕۆژاوای کوردستان، وەکو پاڵەوانی بەهێز و بۆشناخ بەسەر لووتکەی چیا و بڵندایییەکانەوە قووت بوو بوونەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێستا ئەمانە بنکەی پێشەوەی پاراستن، یان ماڵ و هێلینی سەرەك هۆزە زەبەردەستەکانی کوردن، بەڵام ئەوەش بە بای گوێی بینەردا دەدەن کە سەردەمانێك شار و بازێڕی هەرە پڕو چڕی کوردنشین بوونە، دوایی بەرەبەرە کراون بە مەڵبەندی سوپاسروشتی دوور لە شێوە و شێوازی شارنشینان. هەرچەند بچووك بوون لە قەوارەدا، بەڵام خنجیلە بوون

لە دیمەندا و لە چەند هەزار كەسێك و چەند ماڵباتێكی ئەریستۆكرات بەوڵاوە كەسی تریان بۆ بەخۆوە نەدەگیراو لە سێبەری ئەم ماڵباتە ئەریستۆكراتانەدا ناسكترین جۆری هونەر و فەرهەنگ چەكەرەیان دەردەكردو دەگەشانەوە. هەموو بەهرەیەكی بریسكەدار لە ژیانی فەرهەنگیی سەرەتای چاخە نوێیەكانی كوردانـدا، لەناو ئەم شارە قەڵاشێوانەدا گوزەرانێكی پشت ئەستوور و دەستەبەركراوای دەست دەكەوت و دەیتوانی بە باشی فووی گەشانەوە بە بەهرەو تواناكانی خۆیدا بكاو دایانبەستێ نموونەی بەرچاوی ئەم بەهرەدارانە، مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی بە ناوو دەنگن (بڕوانە وێژە).

مەڵبەندەكانی شارستانی كوردستان، تازە تازە وا خەریكن تۆزی نزیكەی (٨٠٠) ساڵ سەرەنگرێی و دواكەوتنی یەكبین لە خۆیان دەتەكێنن. دەتوانین بڵێین لە (١٩٥٠)كانەوە، ژیانی شارستانی بەرەبەرە كەوتۆتەوە وەرگرتنەوەی تین و بایەخەكەی جارانی.

ئێستا یەك شاری كورنشین هەیە كە ژمارەی دانیشتووانی خۆی بدا لە یەك ملیۆن كەس ئەویش (كرمانشاه/ كەرمانشاه /كرمانشان)ە دوو شاریش هەن كە خۆیان بدەن لە نزیكەی نیو ملیۆن (دیاربەكیر/ دیاربەكر و كێركوك/ كەركوك)، چواریش كە ژمارەی دانیشتووانیان لەنێوان چارەكە ملیۆنێك و نیو ملیۆندا (مەلاتیە، ئورفە/ شانلی ئورفە، ئەربیل/ هەولێر، سولەیمانیە/ سلێمانی و هەمەدان) و ١٨ شاریش لە ١٠٠٠٠٠–٢٥٠٠٠٠ كەس (تونجەلی/ دیرسم/ دەرسیم، بینگۆل چاپاغچور، مووش، ئاگری/ قەرەكوسە/ كوسە، سەنەندەج سنە، مەهاباد/ ساوج بولاخ/ سابلاخ، شاه ئاباد/ هارون ئاباد/ ئیسلام ئاباد/ شائاباد، خانەقین، ماردین، ئادیەمان، ئەردەهان، ئێلازیغ/ خەرپووت، ئەرزنجان ئەرزنگان، غازی ئەنتێپ/ ئەنتێپ، دوهۆك/ دەهوك، كفری قوچان قۆچان و پولاتلی) ناوی باوی هەر شارە، چەند ناوی تری لە پەنادا هەیە، ناوە كوردیە ڕەسەنەكە ئەوەیە كە بەپیتی جیاواز نووسراوە، (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣٥و ٣٦).

بەهەمان شێوەی پەروەردە، شارنشینیش نیشاندەرێكی باشە بۆ دەرخستنی تێكەڵاوبوون یان كێشانەوەی كوردان لە چوارچێوەی ژیانی نیشتمانی و مەودای دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانەی تێیاندا دەژین مرۆڤ ئەگەر ئامارگریەكانی دەوڵەت لەسەر پەروەردە و شارنشینی بەكاربێنێ و لێكیان بداتەوە دەگاتە هەندێ سەرەنجامی سرنجكێش. ئەم ئامارگیریانە بە توونـدی دووقـۆڵی ڕاستە و خـۆی نێـوان ڕێـژەی خوێنـدەواری و شارنیـشنی دەردەخـەن، لـە كاتێكـدا ڕێـژەی

خوێندەواری خۆی ڕاستەوخۆ هاوبەندە لەگەڵ ئاستی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە بواری پەروەردەدا (بڕوانە پەروەردە و ئاوێتە بوون و تێکدا توانەوە) تەنها لە عێراق و ناوچەکانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەتی بەرێ کوردان لەو دەسکەوتە پەروەردەییە سوودمەند بوونە، و هەر لەوێش بەرزترین ڕادەی شارنشینی لەناو کورداندا خۆی دەنوێنێ لە کاتێکدا، لە تورکیا کە کوردان کزترین مافی ئەتنیکی و فەرهەنگی و زمانییان هەیە و نیە و دەکەونە بەر توندترین شاڵاوی تواندنەوە، لە ڕووی شارنشینیەوە هەرێمە کوردنشینەکان و کوردەکان بەشێوەی گشتی لە هەموو هەرێمەکانی دیکە کز و لاواز ترن و تەنانەت خۆ نادەن لە نیوەی ڕادەی نیشتمانی وڵاتەکەش. لە ئێران ئاماری ساڵی ١٩٨٦ وای نیشاندا کە ڕێژەی نیشتمانی شارنشینی خۆی دەدا لە ٥٤،٢٪. ئەم ڕێژەیە لە هەرێمەکانی ئازربایجانی ڕۆژاوا، کوردستان، کرمانشاهان و ئیلام یەك لە دوای یەك خۆی دەدا لە ٤٥,٨٪، ٣٩,٦٢٪، ٥٦،٢٨٪ و ٤٠،٨٠٪ی کۆی گشتی دانیشتووان، هەرچەندە ژمارەکان لە ڕووی وردییەوە زۆر جێی متمانە نین. ئەگەر دانیشتووانی دور شاری گەورەی کرماشان و ئورمیە بە لێکدراوای لەم ژمارانە دەرکەین، چونکە ناکرێ بە بەڵگەی شارستانی کوردان دابنرێن بە تەنهایی، ئەوا ڕێژەی سەد لەسەدی ئازەربایجانی ڕۆژاوا و کرمانشاهان دادەشکێ بۆ ٣٢٪و ٣٦٪و بەمە هەرێمە کوردنشینەکان دەبنە کەمترین شارنشین بووی هەر (٢٤) هەرێمەکەی تری ئێران. هەرێمی کوهگیلۆیەی پڕ دانیشتووانی پەز لە وەرینیان لێدەرچێ، تەنانەت هەرێمێکی دووردەستی چەپی وەکو پلوچستانیش زیاتر لە کوردستان شارنشینتر دەردەچێ.

دوو هەرێمی هەمەدان و لوڕستانیش کە دراوسێی کوردستانن و دانیشتووانێکی زۆری کوردنشینیان تێدایە، ئەوانیش بە ڕێژەی ٣٧،١٪و ٤٦،٦٪ ڕادەیەکی نزمی شارنشینیان بەردەکەوێ.

بە پێچەوانەی پەروەردە و خوێندەوارییەوە، پەیوەندیەکی دووقۆڵی ئەوتۆ بەهێز لەنێوان ئاوێتەبوونی ئابووری کوردستان لەناو دەوڵەتە ناوخۆییەکان و ڕادەی شارنشین بوونی کورداندا بەدی ناکرێ. بۆ نموونە، لە ئێران هەرچەندە ئاوێتەبوونی ئابووری لە هەرێمە کوردنشینەکان بەهێزترە کەچی کوردانی ئێران و هەرێمەکانیان هێشتا لە هەموو کەمینە و هەرێمەکانی تری ئێران لە ڕووی شارنشینیەوە کزترن.

بەشێوەکی گشتی، کوردان لە هەموو گرووپە ئەتنییەکانی تری ئێران و سوریا و تورکیا لە ڕووی شارنشینییەوە کزترن، و لە عێراقدا تۆزێك لە ڕێژەی گشت وڵات لە خوارترەوەن.

نەخشەی ژمارە (35): شارو شارۆچکەی باشوور و ناوەند و ڕۆژهەڵاتی کوردستان

لە كاتێكدا كە شارە كوردنشینەكان تا دێن پان و پۆڕتر دەبن، هەرچەند لەسەر خۆ و بە شێنەییش بێ، سەدەها گوند و شارۆچكەی كوردنشین لە عێراق لە شەڕوشۆڕ و ململانێ جۆراوجۆرەكاندا خاپوور كراون. ئەمە لە ئێرانیش بەشێوەیەكی جیاوازتر لە (١٧) ساڵی ڕابردوودا كراوەو زۆربەی دانیشتووانی ئەو ئاوایی و شارۆچكانە بە زۆر ڕەهەندەی شارەكان كراون، بەڵام لە عێراقدا بۆ دەرەوەی كوردستان ئاوارە كراون.

كوردستانی عێراق لەگەڵ گەلێ بەشی بەرامبەری لە كوردستانی ئێران بەشێوەیەكی كارەساتاوی بەر ئاكامەكانی ئەم بارەگرانە كەوتوون. شەپۆلی یەك لەدوای یەكی ئاوارەی كورد كە لە عێراقەوە بەرەو ئێران هەڵقولاون، بوونەتە مایەی بارگرانیەكی یەكجار گەورەی بەشەری بۆ شارە كوردنشینەكانی كوردستانی ئێران، سەرباری ئەو گوندنشینە كوردانەی سەر سنوور كە لە دەست دەرەنجامە مەینەتبارەكانی شەڕی ئێران و عێراقی ساڵی ١٩٨٠ ڕەهەندەی شارەكانی ئێران بوونە. بەگوێرەی ئامارە دەوڵەتیەكانی ئێران ٢٦٧٠٠٠ كوردی عێراق لە ساڵی (١٩٨٨)ەوە تەنها بۆ كرماشان هاتوون و بەمە ژمارەی دانیشتووانی شارەكەیان گەیاندۆتە نزیكەی یەك ملیۆن كەس. لە ئامارگیریەكانی دانیشتوواندا، دەوڵەتی ئێران پەنابەرەكان بە بەشێك لە دانیشتووانی وڵاتی خۆی دانانێ، لەبەر ئەمە گەلێ شاری كوردنشینی ئێران، لە ڕووی بەڵگە ڕەسمیەكانەوە، ژمارەی دانیشتوانیان كەمترە لەوەی كە هەیانە، بۆ نموونە، شارەكانی سەردەشت، بانە، مەریوان، پاوە و بۆكان، بە گوێرەی بەڵگە دەوڵەتیەكان تەنها نیوەیان سێیەكی دانیشتووانی ڕاستەقینەیان تۆمار كراون. بەهەرحاڵ زۆر بە ئاسانی دەتوانرێ ژمارەی ڕاستەقینەی دانیشتووانی ئەم شارانە دەربخرێ، چونكە ئامارە ڕەسمیەكانی دەوڵەت هەم دانیشتووانی شارەكەو هەم ژمارەی ئاوارەكانیان باش دەستنیشان كردووە.

ئەو هەرێمانەی كوردستان كەوان لەناو سوریا و توركیا و یەكێتی سۆڤیەتدا،كەمتریان لەم ڕووتێكردنە بەركەوتوە بۆیە سیمای شارەكانیان لە ڕووی چڕ بوونەوە زۆر نەگۆڕاون.

پەرەسەندنی دیموگرافیی كورد لەو شارانەی توركیادا كە دەكەونە دەورووبەری كوردستان و دوورتریش بەرەبەرە دەبنە مایەی گۆڕانی پێكهاتەی ئەتنی ئەو شارانە. بۆ نموونە، هەموو ئەو شارانەی دەكەونە دەوری زنجیرە چیای تۆرۆس هەر لە ئەرزنجان و ئەلازیگەوە بگرە تا دەگەیتە مەلاتیە و عێنتاب و مەراش، ئێستا یان بە زۆربە كوردنشینن یان لە كۆتایی ئەم

دەیەیەدا وایان لێ دێ، ئەم شارانە کاروانسەرای یەکەمن لەو هەڵپەی ڕووەو ڕۆژاوا جمینە ئابووریەی کوردان کە ئێستا وا لە پۆپەی جۆشاندا (بڕوانە کۆچکردنی سەردەم و دەربەدەری) ئەوانەی لەم جمینەدا لەو شارانە دەگیرسێنەوە دەچنە سەر بەشی کورد لە پێکهاتەی ئەتنی ئەو شارانەدا، ئەم شارانەی ڕۆژهەڵاتی زنجیرە چیاکانی تۆرۆس لەبەر ئەوەی لەسەر لێواری "ڕۆژهەڵاتی دڕندەن" بەرەبەرە دانیشتووانە تورک نەژادەکانیان دادەماڵرێن بێ ئەوەی لەجیاتی ئەوان خەڵکی نوێی تورک جێیان بگرێتەوە، بۆیە بە پەلە ئەم شارانە دەچنە ڕیزی شارە کوردنشینەکانەوە. هەر ئەم هۆکارە خۆی وایکردووە لەوانەبێ شارێکی پڕ دانیشتووانی وەکو دیاربەکر بە زوویی لە گەورە شاریی کوردنشین لە ئەنەدۆڵدا بکەوێ، و لەم بوارەدا مەلاتیە یان عەنتاب، کە خەریکی بە پەلەپەل دەهاوێژن و بەرین دەبنەوە گۆی گەورە شاری لێ ببەنەوە.

لە قووڵایی هەرە ژوورووی باکوور، لە کاتێکدا شاری بچوکتری وەکو ئەردەهان، ئارپاچای و گوێل بە پێکهاتەی ئەتنی کوردنشینن، شارێکی گەورە و ستراتیژی وەکو قارس ئێستا بە نزیکەی (٣٠٠) هەزار کەس دانیشتووانەوە لە قووڵایی ڕۆژهەڵاتدا بۆتە بنکەی هەرە پێشەوەی ناکوردی تورکیای ڕۆژاوایی. شارەکە ئێستا تازە وا خەریکە ئاشنایی لەگەڵ گرانایی شەپۆلی کۆچەرە کوردە لە کارگەرەکاندا پەیدا دەکات، لە کاتێکدا ئاوایی و دێهاتی دەورووبەری شارەکە، زۆربەی هەرە زۆریان کوردنشینن.

لەوێش دوورتر، کوردان، بە ئاپۆرایەکی چڕەوە، لیسیان لە چەندین گەورە شاری تورکی وەکو ئەدەنە، ئەنقەرە و ئەستەمووڵ داوە. لەو شارانەدا یانەو خانەی نەتەوەیی چاک و مەجلیس گەرمیان بۆخۆیان پێکهێناوە، بەرادەیەک شاری ئەستەمووڵ کە شارێکی جیهانی سیمایە، لە هەموو شارەکانی تری تورکیا، بە شارەکانی کوردستان خۆشیەوە، زیاتر کوردی گرتۆتە خۆی.

هەمان دیاردەی کۆچکردن کە تورکیا بەخۆیەوە دەبینێ، بە گورجی وا کەنە لە پێکهاتەی ئەتنیکی شاری وەکو هەمەدان و کرماشان، هەروەها چەند شاری تری ئێران دەکا وەکو ئورمیەو شاە ئاباد و کەنگاوەر کە جاران تێیاندا کورد لە کەمایەتیەک بەولاوە چیتر نەبوون (بڕوانە کەمایەتیە ئەتنیکیەکان لە کوردستاندا).

لە بەرامبەردا، شاری کەرکوک دووچاری وەزعێکی بە تەواوی پێچەوانەی ئەو شار و

شوێنانە بوە كە باسمان كردن، مەسەلەكە جێی سرنجە، كەركووك كە ناوەندی سەنعەتی نەوتی عێراقە، ئێستاكانە بۆتە مەڵبەندی زۆرینەیەكی عەرەب، لە كاتێكدا پێكهاتەی ئەتنی شارەكە هەمیشە تێكەڵە بوە.

گەشانەوەی شارەكە لە ڕووی ئابوورییەوە لە نیوەی سەدەی ڕابردوودا، دەبوو بیكردایە بە گەورەترین ناوەندی شارنشینی كورد بە گشتی، بەڵام دەستێوەردانی دەوڵەت بۆ بەندوبەست دروستكردن لەبەردەم بە كوردبوونی شارەكەدا، نەیهێشتوە سیمای سروشتی كوردانەی خۆی وەربگرێ. دیارە ئەو باری ئەتنییەی ئێستا لە شارەكەدا باوە دەرەنجامێكی ڕاستەوخۆی ئەوەیە كە شارەكە بوەتە مەڵبەندێكی ئابووری ئەوەندە بە توانا، كە ئاپۆڕای خەڵكی لە كارگەڕی هەموو عێراقیی بۆلای خۆی بكێش كردووە.

هەمان بارودۆخ لە شارە نەوتدارەكانی ئێران، وەكو ئەهواز و ماهشەهر و ئابادان جێی سەرنجن، لەم هەموو كون و قوژبنێكی وڵاتەكەوە هاتوو، بە كوردیشەوە، ماش و برنج بووە.

لەم لاشەوە، مووسڵ كە پاش بەغدا گەورەترین شاری عێراقە، وا خەریكە بە دەست سەرتێكردنی یەكبینی كوردانی لە دەست شەڕی كوردستان دەرپەڕی و نقەنقی پێ كەوتوە... وەكو ئەزانین، شارەكە لە سێ لاوە بە دانیشتووانی كورد دەورەدراوە، ناوچەی نەبی یونسیش (نەینەوای دێرین)، كە دەكەوێتە بەری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوە بەر لە داهاتنی ئەم سەدەیەوە زۆرینەیەكی تەواوی كوردی تێدا جێ نشینە. لەبەر ئەوەی عەرەبەكانی دەوروبەری شارەكە ئەوەندە لە ژمارەدا چڕوپڕ نین و شارەكە خۆشی لە ڕووی ئابوورییەوە هی ئەوە نیە كە عەرەبی شوێنە دوور دەستەكان بكێش بكا، ئەو پان و پۆڕبوونەی شارەكە ئێستا وا بە خۆیەوە دەبینێ، تەنها هی ئەوەیە كوردەكانی دەوروبەری تێی هەڵدەقوڵێن، كە زۆریەیان بریتین لەو خەڵكەی لە دەست شەڕی بێ ئامانجی دوو دەهەی ڕابردوو لە دەوروبەرەوە هەڵاتوون، یا خۆ ئەوانەی كە لە ئاكامی ئەم شەڕەدا ماڵ و موڵك و ئاواییان وێران بوەو بێ جێ و ڕێ ماونەتەوە. هیچ گومان لەوەدانیە كە هەر وەكو عێنتاب و مەلاتیە و كرماشان، مووسڵیش كە ئێستاكانە. یان پاش دە ساڵی تر دەبێ بەشارێكی زۆرینە كورد، وای لێدێ كە جێگەی هەولێر بگرێتەوە، وەكو گەورەترین شاری زۆریە كوردنشینی وڵاتی عێراق. مووسڵیش، وەكو عێنتاب و مە لاتیە و كرماشان، وەكو شارێكی فرە — ئەتنی دەمێنێتەوە و

هەمیشە سیمایەکی جیهانی زۆر جیا لە سیمای شارە کوردنشینەکانی ناوجەرگەی چیاکان دەبەخشێ. لەوانەیە ئەمانە لە دوارۆژدا ببنە کوردەشاری سەرەکی، بەو هەڵپەو جۆشەی بۆ پەیداکردنی شارستانیەت دەیەن.

بۆیە دوارۆژێکی گەورەو گەشی پێشکەوتن و پەرەسەندنیان لەبەردەمدایە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Special note must be made of Gwyn Williams, *Eastern Turkey: A Guide and History* (London: Faber & Faber, 1972), for the historical background and current conditions of cities in western and northern Kurdistan in Anatolia. Also A.H.M. Jones, *The Cities of the Eastern Roman Provinces* (Oxford, 1937); Evliyâ Chelebi, *Siyâhatnâma: Narrative of Travels in Europe, Asia, and Africa*, 3 vols., trans. Joseph von Hammer (London, 1834-50); *The Population and Household Census, 1986* (Teheran: Iranian Census Bureau, 1987), "the secret edition"; William M. Masters, "Rowanduz: A Kurdish Administrative and Mercantile Center," unpublished doctoral dissertation (Ann Arbor: University of Michigan, 1953); R.H. Dyson, "The Death of a City (Hasanlu)," *Expedition* 2.3 (1960); R.H. Dyson, "Hasanlu and Early Iran," *Archaeology* 13 (1960); R.H. Dyson, "Excavating the Mannaean Citadel of Hasanlu...," *Illustrated London News* (September 9, 1961). An excellent resource on the Iranian Kurds, remains A. Razmara, ed., *Geographical Dictionary of Iran*, 10 vols. (Teheran: The Iranian Armed Forces Geographical Bureau, 1949-51). The text is in Persian, and still in print.

# كەمایەتیە نەتەوەیی یەكانی كوردستان

لە سەردەمیكی زۆر دێرینەوە، چەند كەمینـەی نەتـەوەیی غـەیرە كـورد لـەناو كوردسـتاندا ژیاون (نەخـشەی ژمـارە ٣٧) هەنـدێكیان، وەكـو ئاشـووریەكان و قەرەپاپاغـەكان ئـەو پارچـە زەویـەی لەسـەری دەژیـن لـەناو خـاكی كوردسـتاندا بـە كۆنـە سـەرزەمینی خۆیـان دادەنـێن، هەندێكی تریان وەكو تورك، فـارس، عـەرەب، توركمـەن (توركومـان) و ئەرمـەنییش لەلایـەكی ترەوە، وڵاتی سەرەكیی خۆیان لە دەرەوەی كوردستان هەیە.

كوردۆیێڤ ساڵی ١٩٥٧، ژمارەی گشتی ئەو كەمایەتیانەی لەناو خاكی كوردسـتاندا دەژیـن بە نزیكەی چواریەكی دانیـشتووانی وڵاتەكـە مەزەنـدە كـردووە. سـاڵی (١٩٨٠) وانلـی ژمـارەی كەمایەتیەكانی كوردستانی عێراقی بە (٨،٦٪)ی ژمـارەی گـشتی وڵاتەكـە دانـاوە و كـە گوایـە نیوەیـان، واتــە (١٣٠٠٠٠)یـان توركمـانن (Challiand1980). بـە هـەرحاڵ زۆر گرانـە بـەڵكو لـە كردنیش نایەت، بتوانرێ ئامارێكی دەقاو دەق و رێكی كەمینەكانی كوردستان دەربكرێ.

هەرچۆنێك بێ، مەسەلەیەكی دیار و ئاشكرایە كە ژمارەی ئـەو غـەیرە كوردانـەی ئێـستا لـە كوردستاندا دەژین گەلێ لەهی سەدەیەك لەمەوبەر كەمترە. لـەو سـەردەمەدا ژمارەیـەكی زۆری ئەرمەنی و ئاشووری و تورك و توركمەن و عەرەب و ئازەری لە چوارچێوەی خاكی كوردسـتاندا نیشتەجێ بوون، بەڵام جەنگی یەكەمی جیهانی ئـەم رایەڵـەی بـە تـەواوی تێكـدا لـە (١٩٢٥)دا، هەموو ئەرمەنیـەكان یـان كـوژرا بـوون، یـان هـەڵاتبوون و تەنانـەت لـە كۆمەڵگەیـەكی (١٠٠٠٠) كەسی لەولاوە ئاسەواریان لە وڵاتەكەدا نەمابوو، لە كاتێكـدا لـە سـەرەتای سـەدەدا، ژمارەیـان خۆی دەدا لە نزیكەی نیوملیۆن كەس. ئاشووریەكان (كە ناوێكی تازە و نادروسـتە میـسیونێرە رۆژاواییەكان بۆ مەسیحیە نەستۆریەكانی ناوچەكە دایان تاشیوەو ئـەوان نەتەوەیـەكی دێـرین و بەشێوەی سەرەكی ئارامی زمانن) سەردەمێك بەشێوەیەكی چڕو پڕتر لە كوردسـتاندا، هـەر لـە دەورووبەری مووسڵەوە بیگرە تـا گەیـشتە كـەنارەكانی گۆلی وان و ورمـێ نیـشتەجێ بـوون و دوایی، پاش قەتڵوعامەكانی دوا دوای سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتایی سـەدەی بیـستەم ناچـار هەڵاتن و سەری خۆیان هەڵگرت. ئەوان ئێستا لـە لێوارەكـانی كوردسـتان، نزیكـی سـەلماس و ورمێ لە ئێران و نزیكی دهۆك و هەولێر و مووسڵ لە عێـراق و و قامیـشلوو مـاردین و سـێرت لـە سوریا و توركیـا دەژیـن. ئێـستا لەوانەیـە ژمارەیـان لـەناو كوردسـتاندا خـۆی بدا لـە (٢٥٠٠٠٠) كەس.

نەخشەی ژمارە (37): کەمینە نەتنییەکانی کوردستان

سەرچاوە: بەشێکی لە: S. Bruk and V. Apenchenko
Atlas Narodov Mira (Moscow: Akademii Nauk,1964) وەرگیراوە.

ئەوەندەی پەیوەندی بە جوولەكەكانەوە هەیە، زۆر ئاسان نیە بڕیار بدرێ ئایا دەكرێ جوولەكە كوردەكان بە كەمایەتیەكی نەتەوەیی دانێین یان ئەوانیش هەر وەكو (عەلەوی یان یەزیدیە كوردەكان بە كەمینەیەكی ئایینی بدەینە قەڵەم، چونكە ئەوان لە ڕووی فەرهەنگییەوە زیاتر بە پارێزەوە خۆیان بە كورد داناوە، لە كوردە غەیرە جوولەكەكان. بە هەرحاڵ، ئەوان ئێستا زۆرتر لە شارەكانی كوردستانی ئێران، وەكو سەنەندەج، كرماشان، سەحنە و هەمەدان نیشتەجێن، هەر چی ئەو كۆمەڵگە چڕە جوولەكە كوردەی عێراقە كە لە كەركووكەوە بگرە بۆ هەولێر و زاخۆ نیشتەجێبوون لە (لە پەنجاو شەستەكان)دا لەژێر فشاری دەوڵەتی بەغدادا بۆ ئیسرائیل باریان كرد.

زۆربەی ئەو توركانەی لە باكوور و ڕۆژاوای كوردستان دەژیان، لە (١٩٦٠)ەكانەوە وڵاتەكەیان بەجێ هێشتووە، لەبەر ئەوەی خۆیان بەڕۆڵەی نەتەوەی باڵادەست دەزانی، هیچ هۆیەكیان نەبوو لە دوا كەوتووترین هەرێمی كۆماری توركیادا و لەناو گەمارۆی نەیارانەی خەڵكەكەی و لە بەر چنگی چالاكی گەریلایی پڕ جۆش و تەراتێنی سوپا و ئاكامی دەستەو یەخەی گەریلا و خەڵك لەلایەك و دەوڵەت و سوپا لەلایەكی ترەوە بمێننەوە. زۆر شاری كوردنشینی باكوور و ڕۆژاوا، كە سەردەمێك لە ئاوارەی تورك زمانی بەڵقانەكان جمەیان دەهات، بەرەبەرە دەستی بەڕێخستنیان بەرەو ڕۆژاوا و دەرەوەی خاكی كوردستان بۆ ئەم میوانانە ڕاوەشاند، پرۆسەكەش ئێستاش لەسەرخۆ بەردەوامە. ئەمانە لە كۆتایی جەنگی یەكەمی جیهانییدا لە كوردستان جێگیر بوو بوون و لەسەرزەمینانەدا دایان كوتابوو كە ئەرمەنیەكان، چ كۆچەریان چ وەرزێڕیان، بەجێیان هێشتبوو، ئێستا ژمارەی ڕۆژ بەڕۆژ لە كزیدەری ئەم توركانە كە لە كوردستاندا وەكو كەمینە دەژین لەوانەیە لەنێوان (٢،٥) ملیۆن كەسدا بێ.

ئازەریەكان، بەتایبەتی قەرەپاپاغەكان، لەم دواییەدا نێوانیان لەگەڵ كوردەكاندا تێكچوو. ئەمانە، كە شیعەی تورك زمانن، لە سێ پەڵە زەوی كوردستاندا، واتە لە ڕۆژهەڵاتی ئەردەهان و باشووری ڕۆژاوای ئاگری لە توركیا و لەناوو دەوروبەری نەغەدە لە ئێران دەژین. بەڵام پەڵەی هەرە گەورەیان لە ئێرانە. قەرە پاپاغەكان، لە ئاكامی داگیركردنی قەفقاسیا لەلایەن ڕووسەكانەوە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لەوێوە هاتوونەتە ناو ئێرانەوە و لە هەرێمی سولدوزی

باشووری گۆلی ورمیٚ نیشتەجیٚ بوونە، مەڵبەندی ئێستایان شاری نەغەدەیە لەنێوان مەهاباد و شنۆدا (نزیك شوێنەوارە وێرانەکانی مانیەکان لە حەسەنلو). هەرچەندە تازە هاتبوون، بەڵام کوردەکانیان لەو شوێنانە هەڵقەندوو لە جێیان دایانکوتا. لەگەڵ دارمانی پادشاییەتی لە ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ و کۆتایی هاتنی داگیرکردنی سوپایی هەرێمەکە شەڕێکی گەرم لەنێوان کوردەکان و قەرەپاپاغەکاندا قەوما لەسەر هەرێمی سولدوز و شاری نەغەدە، و تا ئێستاش مەسەلەکە نەبڕاوەتەوە و پێکدا پڕژانی جار ناجارە هەر ڕوودەدا. ژمارەی لە ڕاستی نزیکی ئەم قەرەپاپاغانە لە کوردستان خۆی دەدا لە (١٠٠٠٠٠) کەس.

لە کاتێکدا کەمینەی ئازەری دانیشتووی هەرێمی بۆکانی کوردستانی ڕۆژاوا (باشووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد) هەمیشە لەگەڵ کوردەکاندا نارێك بوونە، ئەو پەڵەپەڵە ئازەریانەی لە کوردستانی باکوور لە دەورووبەری چیای ئەرارات و شارەکانی ئاگری و ئەرارات نیشتەجێن هەمیشە لەگەڵ کوردەکان بەوپەڕی تەبایی و خۆشیەوە ژیاون. لە نزیکی هەمەدان و سونگوڕو سەحنەش لە کوردستانی باشوور لە ئێران هەندیٚ پەڵەپەڵە ئازەری هەن، بەگشتی ژمارەی ئەو ئازەریانەی لەسەر خاکی کوردستان پەڵەیەك لێرە و پەڵەیەك لەویٚ دەژین خۆی دەدا لە ١٥٠٠٠٠ کەس.

هەرچی کەمینەی تورکمانە لە دوو مەڵبەندی سەرەکی دەژین: لە عێراق، بەشێوەی پەڵەی بچووك بچووك لە هەڵەت و پێدەشتەکانی دامێنی کوردستان هەر لە کفرییەوە بگرە، تا مووسڵ بە کەرکووك و هەولێردا، لە تورکیاش لە ئەلازیگەوە تا مەلاتیە و عێنتاپ ژمارەی گشتییان لە عێراقدا خۆی دەدا لە (٣٦٠٠٠٠)کەس، لەوانەیە نیوەی ئەم ژمارەیە لەناوچە کوردنشینەکان نیشتەجیٚ بن، ئەم ژمارەیە وا دەگەیەنیٚ کە لە (١٩٤٧)ەوە ژمارەیان چوار جار زیادی کردووە، چونکە ژمارەیان لەو ساڵەدا بە گوێرەی ئامارەبەندیەکانی عێراق خۆی دەدا لە (٩٢٠٠٠ ) (Batatu1978.48)، لەلایەکی ترەوە هیچ ئامارێکی باوەڕپێکراوی ئەوتۆ لە بارەی تورکمانەکانی کوردستانی تورکیاوە بە دەستەوە نین، چونکە ئەو ئامارگیریانەی لەو وڵاتە کراون خانە بەندییان بۆ گەلە تورك زمانەکان نەکردووە (واتە تورکەکان و تورکمانەکانیان جیا نەکردۆتەوە) کۆچەرەکانیان لێدەرچیٚ. بە هەرحاڵ، دەزگاکانی ئامارگیری دەوڵەت لەوەی ساڵی ١٩٦٥ بە دواوە ئیتر باسی جیاوازی ئەتنییان نەکردووە لەوانەیە ژمارەی تورکمانەکانی

ئەنەدۆڵ کە لە کوردستانی تورکیا نیشتەجێن خۆی بدا لە (١) ملیۆن.

هەروەها نابێ ئەو دوو پەڵە چەرکەسەمان لە بیرچێ کە لە کاغیزمان و باشووری عێنتاپ دەژین کە سەرباز و بن بار خۆبدەن لە ٥٠٠٠٠ کەس.

لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان کەمینەیەکی فارس زمانی (٤٠٠ — ٥٠٠) هەزار کەسیش هێشتا هەر هەن، زۆربەی ئەمانە کۆنە کوردی شیعەی تواوەن کە لەکاتی چوونە سەر مەزەبی شیعە، زمانەکەشیان لە گەڵێدا فەرامۆش کردووە، ئەمە دیاردەیەکە، کە چەندین جاری تر لە مێژووی گەلی کورددا ڕوویداوە، کاتێك کە کۆمەڵێك دەستیان لە ئایین یان مەزەبی خۆیان هەڵگرتوە (بڕوانە کۆچکردنە مێژووییەکان و مەسیحیەت). ڕاستییەکەی، تا پشتێکیش لەمەوبەر کرماشان کە گەورەترین شاری کوردستانە زۆربەیەکی فارس بێژی تێدا بوو، لەوانەیە هەر ئێستاکە هەمەدان زۆرینەیەکی ئەوهای تێدابێ!

ژمارەیەکی زۆری خێزانی کوردی فارس یان، باشترە بڵێم تازە فارسێنراو، لە هەرێمە جۆراو جۆرەکانی کوردستانی ئێرانەوە، یان بە شارە گەورەکانی ئێراندا پەرتەیان کردووە یان ڕوویان کردۆتە وڵاتانی ئەودیوی دەریاکان و لەگەڵ خۆیاندا هەم سامان و هەم فەرهەنگی خۆییان بۆ ئەو شوێنانە بردووە. ئەو سیاسەتی چاکسازی زەوییەی کە دەوڵەت لە ساڵانی (١٩٦٠)دا خستیەکار، توێژ و چینە پلە بڵند و ناوەندیە فارس زمانەکانی کوردستانی ئێرانی لە شوێنی خۆیان هەڵکەندو بەم لاو بەولادا پەرتەی پێکردن. جێگاکەیان، بە ئۆخەیەوە و بە گورجی، لەلایەن سەرەك هۆزە کوردە دەسترۆ و مۆڵکدارە ناوخۆییەکانەوە پڕکرایەوە، ئەم کردارە بوو بەهۆی گۆڕانی ناسنامەی ئەتنی گەلێ شاری کوردنشینی ئێران و شێوازی ژیانی شارستانی تێیاندا.

ئامارکردنی کەمینە عەرەبەکانی ناو کوردستان زۆر بە ئاسانی نایەتە دەستەوە، چونکە ژمارەیان هەمیشە بە گوێرەی هەوڵ و تەقەلای پشتەڵەك سیاسیانەی دەوڵەتەکانی سوریا و عێراق لە کەم و زیاد کردندایە کە لە هەڵپەی هێنانی تا دەکرێ عەرەبدا بۆ ناو خاکی کوردستان لە کۆششدان و مەسەلەکە بەندە بە دەسترۆیشتنی دەوڵەت لەو ناوچانەدا و توانای پاراستنی عەرەبە هاوردەکانەوە. پەڵە پەڵەی ئەم کەمینە عەرەبانە لە کوردستاندا، زۆرتر لە دەوروبەری ئورفە و ماردین و سێرت لە تورکیا و هەولێر و کەرکوك و خانەقین لە عێراقدا

بەدی دەکرێن، بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم کە ئێستا کەرکوک زۆرینەیەکی عەرەبی تێدا جێگیرە (بڕوانە شارنشینی و مەڵبەندە شارنشینەکان). بەگشتی دەتوانرێ ژمارەی عەرەبەکانی دانیشتووانی کوردستان بە نزیکەی نیو ملیۆن بدرێتە قەڵەم، تازە هاتووەکان ئەوەندە جێگیر نەبوونە کە مرۆڤ بتوانێ بیانخاتە دەفتەرەوە.

دەوڵەتی تورک، کە لە سیاسەتی تورکخوایی و تورکاندنی نەتەوەکانی تردا شێتگیرانە لە هەڵپەدایە، تورکێکی زۆری ئاوارەی پەستاوەتە هەرێمەکانی کوردستانەوە. زۆربەیانی لەو شوێنانەدا لێداوە کە غەیرە کوردیان تێدانیە، هەرە دوا ڕەوەی ئەم ئاوارانە بریتی بوون لە (٥٠٠٠)قرغیزیی بڵندابیەکانی پامێری ئەفغانستان کە لە دەست هێزە داگیرکەرە سوڤیەتیەکان هەڵاتبوون، ئەم قرغیزانە لە دەوروبەری گۆلی وان لە کوردستانی باکوور جێگیرکران. بەرلەوە ڕەوەی گەورەتری قازاغ و تەتار و ئۆزبەگی لە ئاسیای ناوەندەوە هەڵفریوێنراو لەلایەن ئەنقەرەوە لە دەورو بەری وان و عێنتاپ و ئورفە گیرسێنرابوونەوە. ئەمانە ناچنە لیستەی کەمایەتیە نەتەوەییەکانی کوردستانەوە، بەڵکو وەکو ڕێبوار لە شێوەی ئەو عەرەبانەی ئەم دواییەدا کە سوریا و عێراق ناشتنیان و هێچیان لێ شین نەبوو، دادەنرێن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); Paul Magnarella, "A Note on Aspects of Social Life among the Jewish Kurds of Sanandaj, Iran," *Jewish Journal of Sociology* XI.1 (1969); G. Challiand, ed., *People Without a Country* (London: Zed, 1980); Walter Fischel, "The Jews of Kurdistan, a Hundred Years Ago," *Jewish Social Studies* (1944); Hanna Batatu, *The Old Social Classes and the Revolutionary Movements of Iraq* (Princeton: Princeton University Press, 1978).

**General Bibliography**

Huntington Ellsworth, "The Valley of the Upper Euphrates River and Its People," *Bulletin of the American Geographical Society of New York* 34 (1902); Ahmad Sousa, *Atlas of Iraq* (Baghdad, 1953); C.J. Edmonds, *Kurds, Turks and Arabs* (London: Oxford University Press, 1957); Henry Field, *The Anthropology of Iran* (Chicago: Field Museum Press, 1939); Henry Field, *The Anthropology of Iraq* (Cambridge: Harvard Peabody Museum of Anthropology, 1952); W.E. Ainsworth, *Travels and Research in Asia Minor* (London: 1842); J.C.A. Johnson, "The Kurds of Iraq," *Geographical Magazine* 11:50–59 (1940); Mark Sykes, *The Caliph's Last Heritage* (New York: Arno Press, 1973, reprint of the 1915 London edition); R.H. Dyson, "Ninth Century [BC] Man in Western Iran," *Archaeology* 17 (1964); D. Kinnane, *The Kurds and Kurdistan* (London: Oxford University Press, 1964); *Kurdish Times*, semi-annual journal of the Kurdish Library, Brooklyn, New York, 1985-present.

# فەسڵی پێنجەم

# ئایین

## سایشتێكی گشتی

بڵاوبوونەوەی زمان و فەرهەنگ و ڕەگەزی هیندۆئەورووپی (ئێرانی) بەناو كورداندا لە دوو هەزارەی بەر لە سەردەمی مەسیحیەتدا، لەگەڵ خۆیدا داب و ڕەسمە ئایینە ئارياییەكانیشی كێشایە ناو ئەو ئایین (یان ئایینانە)ەوە كە كوردان بەر لەوە لەسەری بوون. بەم جۆرە، زەردەشتیەت، جوولەكەیەتی، مانیزم و مەسیحیەت، یەك لەدوای یەك ڕێچكەیان بۆ ناو كوردستان بەست. یەكێك لە سێ ئاتەشكەدە هەرە پیرۆزەكانی زەردەشتیان، واتە ئەوەی ئازەرگوشەسپ، كە لە مەڵبەندی پیرۆزی گەنزەك (تەكاوی ئێستا) لە كوردستانی ڕۆژهەڵات و لە دەورووبەری باكووری شاری بیجار بنیات نرابوو. كەلاوە بەدیمەنەكانی هێشتا هەر بەپێوەن. سەرەڕای ئەمەش، زەردەشتیەت نەیتوانی، هیچ ئاپۆرایەكی ئەوتۆ بەرچاوی كوردان وەرگێڕێتە سەر خۆی، ڕاستییەكەی ئەو ئایینە تایبەتی و خۆوڵاتیانەی كە كوردان لەسەری بوون، سەر باری ئەوەی كارێكی زۆریان كردە سەر خودی زەردەشتیەت، دوو جار هەوڵی هەڵلوشینیشیان دا.

لە پاڵ ئەمەدا، كۆمەڵگایەكی قەرەباڵغی جووی دوورەوەخراویش لە كوردستان دەژیا، ئەمانە هی سەردەمی ئیمپراتۆریی نوێی ئاشووریان بوون.. بە گوێرەی گێڕانەوەی تەلموود، ئەم ئاوارە جوولەكانە لەلایەن مالم و ڕابەرەكانیانەوە ئیزن درابوون كە تا دەكرێ خەڵكی كوردستانی ناوەند بۆ ئایینی جوولەكە پەلكێش و ڕێنمایی بكەن. ئەوان لەمەدا بە جۆرێك سەركەوتووبوون كە نزیكەی گشت دانیشتووانی وڵاتەكە هاتنە سەر ئەم ئایینە دوای ئەوە، مەسیحیەت لە جوولەكایەتی باشتر لە وڵاتەكەدا بڵاویوەوە، كوردێكی زۆری دانیشتووی كوردستانی ڕۆژاوا و ناوەندیش وەرگەڕانە سەر مەسیحیەت، بەڵام هەندەی پێ نەچوو ئیسلام هاتە كایەوە، ئەمیش ڕەنگێكی هێنایە ناو ڕەنگە ئایینیەكانی دیكەی كوردستانەوە.

خشتەی ژمارە (٥) کە پێکهاتەی ئاینی کوردستان دەردەخا، دەرەنجامی ئاماریەندییە جۆرا و جۆرە دەوڵەتیەکان و کاری مەیدانی ئەتنوگرافیك و هەندێ سایشتی بێ لایەنی جیاجیان (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣٨)، (زانیاری زیاتر لە بارەی سنوورە هەرێمیەکانەوە لە بابەتی "دابەشکاریە ناوخۆییەکاندا دراوە).

## چەردەباسێك لە بارەی کوردانەوە

زانیاریەکی زۆر بە نرخ لە بارەی پشتەڵەکی داهاتن و بڵاوبوونەوەی ئیسلام و تیرە و تایەفە و بزووتنەوەکانی ناو ئیسلامەوە، هەروەها لە بارەی ئەو ئایینە غەیرە ئیسلامیانەوە کە کاریگەرییوونە لەسەر ئیسلام یان تێك هەڵسونییان لەگەڵیدا هەبوە، چ بەر لەپەیدا بوون چ لە سەردەمی ئیسلامدا، لە دووتۆی کتێبی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا هەیە، بۆ ئەم مەبەستە چاك وایە بەتایبەتی چاپی دووەم بپشکنرێ (کە لە ١٩٦٠ بەدواوە لە چاپدراوە) چاپی یەکەمیش (کە ١٩١٣–١٩٣٦ دا چاپکراوە) سەرچاوەیەکی بەنرخە لەم بوارەدا، هەروەها ئینسکلۆپیدیای بریتانیش (Encyclopaedia Britanica) گەنجینەیەکی پڕ زانیاری بەهادارە، بەتایبەتی بۆ ئایین و بزووتنەوەکانی بەر لە ئیسلام، وەکو زەردەشتیەت، میترائیەت، و بزووتنەوەی مەزدەکیەت.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography**: A. Gabriel, *Religionsgeographie von Persien* (Vienna, 1971); K.E. Müller, *Kulturhistorische Studien zur Genese pseudo-islamisheer Sekterngebilde in Vorderasien* (Wiesbaden, 1969); Thomas Bois, *Connaissance des Kurdes* (Beirut: Khayats, 1965); *Köy Envanter Etüdleri* ("Village Inventory Studies [of Turkey]") in Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); *Annual Abstract ofStatistics, 1970* (Baghdad: Government of Iraq, 1971); *Statistical Abstract 1973* (Damascus: Government of Syria, 1973); *Population Census 1970* (Damascus: Government of Syria, 1972); *The Population and Household Census, 1986* (Teheran: Iranian Census Bureau, 1987), "the secret edition," text available in English. An excellent resource on the Iranian Kurds, remains A. Razmara, ed., *Geographical Dictionary of Iran*, 10 vols. (Teheran: The Iranian Armed Forces Geographical Bureau, 1949-51); the text is in Persian, and still in print.

**خشتبەندی ژمارە(٥): پێکهاتە ئایینییەکان لەو ولات و شارانەدا کە کوردنشینن و ڕێژەی (٪)یان.**

| ولات / شار | ئیسلام | | ئێرەی فریشتەکان | | | مەسیحی | ئایینی تر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | سوننی | شیعە | عەلەوی | پارسانی | یەزیدی | | |
| تورکیا | | | | | | | |
| ئەدەنە*# | ٪٧،٧٢ | | ٪٢٧،٣ | | | | |
| ئادیەمان | ٨،٧٧ | | ٢،٢٢ | | | | |
| ئاگری | ٩٥ | ٥ | | | | | |
| ئەماسیا* | ٦٩ | | ٣١ | | | | |
| عێنتاب | ٩٦،١ | | ٣،٩ | | | | |
| ئەنتاکیا* | ٦٢ | | ٣٨ | | | | |
| بینگۆل* | ٨٦،٧ | | ١٣،٣ | | | | |
| بتلیس | ٩٨ | | ٢ | | | | |
| جانقری** | ٩٩ | | ١ | | | | |
| چوورووم* | ٨٣،٤ | | ١٦،٦ | | | | |
| دیاربەرکر | ٩٦،٦ | | ٣،٤ | | | | |
| ئەلازیگ | ٨٧،٥ | | ١٢،٥ | | | | |
| ئەرزنجان | ٩٣،٧ | | ٦،٣ | | | | |
| ئەرزرۆم | ٩٣،٧ | | ٦،٣ | | | | |
| هەکاری | ٩٩ | | | ١ | | | |
| گوموشخانە** | ٩٥،٥ | | ٤،٥ | | | | |
| قەیسەری** | ٩٧،٥ | | ٢،٥ | | | | |
| قارس | ٨٤،٨ | ٨٢ | ٥ | | | ٢ | |
| قیرشەهر | ٩٢،٣ | | ٧،٨ | | | | |
| قۆنیە* | ٩٨،٢ | | ١،٨ | | | | |
| مەلاتیە | ٧٢،٢ | | ٢٨،٨ | | | | |
| مەراش* | ٧٩،٥ | | ٢٠،٥ | | | | |
| ماردین | ٩٥،٢ | | ٢،٥ | | ٥ | ٣ | |
| نەوشەهر* | ٩٥ | | ٥ | | | | |
| نیگدە** | ٩٧ | | ٣ | | | | |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سێرت | ٨٦ | | ٤ | | ٦ | ٤ | |
| موش | ٩٠ | | ١٠ | | | | |
| سیواس* | ٦٧,٥ | | ٣٢,٥ | | | | |
| تۆقات | ٧٥,٥ | | ٢٤,٥ | | | | |
| تونجەلی/دەرسیم | ١٣,٤ | | ٨٦,٦ | | | | |
| ئورفە# | ٩٥,١ | | ٣,٩ | | | | |
| وان | ٩٥ | ٤ | | | | ١ | |
| یوزغات* | ٩٧,٧ | | ٢,٣ | | | | |
| ئێران | | | | | | | |
| ئازەربایجانی ڕۆژهەلات** | ٨,٨ | ٧٦,٩ | | ١٤,٢ | | | |
| ئازەربایجانی ڕۆژئاوا | ٣٥ | ٥٥ | | ٩ | | ١ | |
| گیلان** | ١٥,٢ | ٧٥,٦ | | ٩,٢ | | | |
| هەمەدان* | ١٧ | ٧٧,٨ | | ٤ | | | ١,٢ (جوو) |
| ئیلام | ٣٤ | ٤٦ | | ٢٠ | | | |
| خوراسان* | ١٧ | ٦٨ | ٤ | ٢ | ١ | | ٨(ئیسماعیلی) |
| کرماشان | ٤٧,١ | ١٣,٨ | | ٣٧,٣ | | | ١٠,٨ (جوو) |
| کوردستان | ٧٠ | ١٣ | | ١٦ | | | ١ (جوو) |
| لورستان* | ٨,٦ | ٧١,٤ | | ٢٠ | | | |
| ماوەندەران** | ٢١,١ | ٧١,١ | | ٧,٨ | | | |
| عێراق | | | | | | | |
| هەولێر | ٩٤ | | | | | ٦ | |
| دیالە | ٥٢,٥ | ٤٧,٥ | | | | | |
| دهۆک | ٨٠,٥ | ٦,٥ | | | ٦,٥ | ٦,٥ | |
| کەرکوک# | ٨٧,٥ | ٨,٣ | | | | ٤,٢ | |
| موسڵ (نەینەوا) | ٧٨,٥ | ٦ | | | ١٠ | ٥,٥ | |
| سولەیمانی# | ٩٧,٥ | | | | | ٢,٥ | |
| سوریا | | | | | | | |
| حەسەکە | ٧٣ | | | | ٣,٥ | ٢٣,٥ | |

| (جەزیرە) | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئێرەزوور* | ٩٧ | | | | | ٣ | |
| حەلەب* | ٨٥ | | | | | | ١٣٢ئیسماعیلی |
| حەما** | ٥٨,٦ | | ٣٢ | | | | ٩,٤نوورزی |
| لازقیە** | ٢٤ | | ٦٤ | | | ١٢ | |
| حیمس** | ٦٠ | | ١٦ | | | ٢٤ | |
| ئیدلیب* | ٣٨ | | ٤٧ | | | ١٥ | |

## بۆ دەستنیشانکردنی سنووری وڵات و شارەکان، بڕوانە نەخشەی ژمارە (٤)

ڕێنما: ئەو شارانەی ئەستێرەیان بەسەرەوە نیە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن ئەوەی یەك ئەستێرەی بە سەرەوەیە، کەمینەیەکی گەورەی کوردی تێدا جێنشینە، دوو ئەستێرە واتە کورد ١٠–٢٠٪ی دانیشتووانن، بۆ ئەو شوێنانەی نیشانەی(#) یان بە سەرەوەیە بڕوانە تێبینیەکانی خوارەوە.

تێبینیەکان: لە تورکیا ناوبەندی ئایینی وەکو چەقەری/جەعفەری، قیزلباش، عەلەوی و نوسەیری بە ئاسانی لە بەشە جیاجیاکانی عەلەویەت دراون... ژمارەیەکی یەکجار کەمی شیعەی دوانزە ئیمامی ئازەریش لە ئاگری و قارس و وان لە کوردستانی ناوەند (تورکیا) هەن. لە هەموو ناوچەکانی تر ئەمانە بە عەلەوی دانراون ئاماربەندیەکان پڕن لە هەڵەوشێواوی، چونکە تەنانەت خودی پەیڕەوانی وردە تیرە ئایینیەکان، خۆیان لە هەر جێیە بە ناوێك دەناسێنن، هەندێك لە ترسا ڕاستی ئایینەکانی خۆیان نادرکێنن تا لە بەلاو دەردەسەری دوورکەونەوە، بۆیە بە درۆ خۆیان دەدەنە پاڵ ئایینی باوی دەوڵەت، ناوچەکانی ئورفە و عێنتاپ لە تورکیا و سولەیمانی و دیالە و کەرکوك لە عێراق نموونەی باشن بۆ دەرخستنی ئەم خۆبواردنە ناچارانەیە (عەلەوی و یارسانییەکان) لەبەر ئەمە ئەو ئاماری (٢٥–٣٠٪)ەی بۆ عەلەویەکانی ئورفە و عێنتاپ وتراوە دانراوەیەکی نزمە، هەروەها ١٥–٢٠٪ بۆ یارسانەکانی سولەیمانی و دیالە و کەرکوك، لە دوادوای حەفتاکاندا گشت ناوچەکانی کەرکوك (عێراق) لێك ترازێنران، لەوەی کە هێشتیانەوە لە پارێزگاکە شتێکیان دروست کردوو ناویان نا (تەئمیم). ناوچەکانی تر، لکێنران بە پارێزگایەکی تازە دروستکراوەوە بە ناوی سەلاحەدینەوە کە پایتەختەکەی لە تکریت دانرا، یان دران بە پارێزگاکانی دراوسێ.

# ئیسلام

نزیکەی سێ لە پێنجی کوردان، کە هەموو کرمانجی زمانن، ئەمڕۆکە لە ڕووی ئایینەوە مسوڵمانی سوننی و لە ڕووی مەزەبەوە شافعین. لە پاڵ ئەمەدا، هەندێکیش سەر بە مەزەبی دوانزە ئیمامیی شیعەن بەتایبەتی ئەوانەی لەناو و چواردەوری شارەکانی کرماشان، کەنگاوەر، هەمەدان، قوروە و بیجار لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان لە ئێران و بە ژمارەی بچووکترین لەناو و دەورووبەری مەلاتیە، ئادیەمان و مەراش لە قووڵایی کوردستانی ڕۆژاوا لە تورکیا دەژین، ژمارەیەکی زۆری شیعەی کوردیش لە خۆراسان نیشتەجێن، بەڵام لەوێ زۆرینەی نین، وەکو هەندێ سەرچاوە بە هەڵە باسیان کردووە. شیعە کوردەکان لە ١–١،٥ ملیۆن واتە لەنێوان ٥٪–٧٪ی دانیشتووانی گشتی کورد زیاتر نابن.

مەزەبی شافیعی سوننی لە سەدە ناوەندەکان لەناو کرمانجەکاندا بڵاوبوەوە، واتە لەو کاتەدا کە ئێرانیەکانیش لەسەر هەمان مەزەب بوون. لە کۆتایی سەدەکانی ناوەنددا، ڕەوە هۆزێکی گەورەی تورك زمان لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتن و لە باشترین بەشی ئەنەدۆڵدا جێگیر بوون و لەگەڵ خۆیاندا مەزەبی حەنەفییان هێنایە سەرزەمینەکە، چونکە ئەو مەزەبە لەناوەڕاستی ئاسیادا سەردەمانێك بوو باوبوو، ئەم مەزەبە لەو سەرزەمینانەی ڕۆژاوای کوردستان کە جاران مەسیحی بیزەنتی بوون باش ڕەگی داکوتا، بەڵام کارێکی ئەوتۆی نەکردە سەر کوردە شافیعی مەزەبەکان: تاکە کارێك کە کردی ئەوە بوو کە ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستان هێنایە ناوانەوە، چونکە ئەو ڕێبازە لە ئاسیای ناوەند باوبوو (بڕوانە ڕێبازە سۆفیەکان).

ئێستا سوننی مەزەبە کوردەکان گەورەترین کۆمەڵگەی پەیڕەوانی ئەم مەزەبە پێکدێنن لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە سەردەمانێك هەموو مسوڵمانەکانی لەسەر ئەم مەزەبە بوون، ئێستا ئەم شافیعی مەزەبانە کەوتوونەتە نێوان تێکەڵەیەکی مەزەبی جۆرا جۆرەوە: شیعە ئازەری و فارسەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە، تورکە حەنەفیەکان لە ڕۆژاوا و باکوورەوە و عەرەبە حەنەفیەکان لە سوریا و باکووری عێراق (زادەگای حەنەفیەت بە خۆی) لە باشوورەوە.

کوردستان ناوجەرگەو ناوەندی خاکی ئیسلامە، لە بەغداوە (٥٠) میل و لە دیمەشقەوە

(٢٠٠) دووره، کە هەردووکیان لە سەدە ناوەندەکاندا مەڵبەندی فەرهەنگی و ڕووحی خیلافەتی ئیسلام بوون. خاکی کوردستان یەکەم سەرزەمین بوە کە لەلایەن هێزە ئیسلامیەکانەوە، هەر لە سەدەی حەوتەمی پاش میلادەوە سنوورشکێن کراوە، لەگەڵ ئەمەشدا، لە کوردستاندا، بە شارەکانیشەوە، ژمارەیەکی ئەوتۆی مزگەوت نییە، بۆ دەبێ وابێ؟

تا دەورووبەری سەدەی دوانزەیەم، زۆربەی کوردان، لەلایەن نووسەرە ئیسلامییە دەسڕۆکانی سەدەکانی ناوەندی چون نیزا مولمولك و ئەبو مەنسوور ئەلبەغدادی و ئیبن ئەثیرەوە بە نامسولمان دادەنران و ئەم نووسەرانە کوردیان بە موشریك ناو دەبرد. ئەوان لەوەدا بەهەڵە نەچوویوون، وەکو دەردەکەوێ ئیسلام زۆر ڕووکەشانە، و لە سەرەتاوە تەنها ڕاگوزارانە، خۆی لە دانیشتووانی سەرزەمینی کوردستان داوە و لە کاتێکدا کەمینەیەکی بەرچاوی مسوڵمانی کورد پەیدابووە، زۆربەی کوردان لەسەر ئایینە کۆنەکانی خۆیان (تیرەی فریشتەکان، جوولەکەیی، مەسیحیەت) ماون، تا گۆڕانێکی لەسەرخۆ لە ژیانی کۆمەڵایەتی-ئابووری کۆمەڵگای کشتوکاڵی باوی کوردستاندا کەوتە شکڵگیری بە درێژایی سەدەکانی (١٢) و (١٥) ئینجا دارشانی گەلەی پارەشی وێرانکەری تورکە کۆچەرەکان بۆ ناو خاکی کوردستان (بڕوانە کۆچکردنە مێژووییەکان).

ئەو ڕاستییەی کە زۆربەی زانا و پیاوە ناسراوە کوردە مسوڵمانەکانی زوو، بەچەی شاری وەکو دینەوەرو سوهرەوەردو هەمەدان، یان هۆزی وەکو خەلکانەکان و خەزلانەکانن و هەموو دانیشتووی سەر سنووری گرووپە ئەتنییە مسوڵمانەکانی ترن، ئەو بیروڕایە پایەدارتر دەکا کە زۆربەی کوردە مسوڵمانەکان، نۆ مسوڵمانی دواکەوتوو بوونەو لەوانەیە تا داهاتنی سەدەی شانزەیەم ئەوان هەر لەسەر ئایینە کۆنەکانی خۆیان بووبن. ئەم سەردەمە، هاوکاتە لەگەڵ دەسپێکردنی سەرەنگرێ بوونێکی دووروودرێژی کۆمەڵایەتی- ئابووری لە کوردستاندا، و هەر ئەم ڕاستییە خۆشی، دەربڕی کەمیی دەرامەدی خەڵك و کزیی باری گوزەرانیان بوەو هەر بۆیەشە نەتوانراوە تەلاریەندیی ئەو تۆگران بۆ مزگەوتسازی بەکاربهێنرێ کە بتوانێ ماوەیەکی دووروودرێژ بە پێوە بمێنێ، ئەگەر مزگەوتی تەلار ئاسای منارە لە هەور چەقیو لە کوردستان بە دەگمەن دەبینرێن، نهێنییەکەی وا لەم هۆکارەدا.

لە دەورووبەری کۆتایی سەدەی پانزەیەمدا، ئایینە کۆنەکان لەسەرخۆ بە چەپۆکی

نەهامەتیە كۆمەڵایەتی– ئابووریەكان چووبوونەوە و لە ئاسەوار بەولاوە چیدیان لیٚ نەمابوو. ئەم نەهامەتییانەش لە ئەنجامی دارشانی هۆزە كۆچەرەكان بە ناوچەكەدا هاتبوونە ئاراوە، لە سەرەتای سەدەی شانزەیەمەوە، پەرتەكردنی ئەم كۆچەرانە بە وڵاتەكەدا جێیان بە وەرزێرە ئاوایی نشینەكان تەنگ كردبوو بەڵام كە گوژمیان پاشان خاویوەوە، كوردە كۆچەرە كرمانجی زمانەكان، زیاتر لە هەرێمی هەكاریدا بڵاوبوونەوە (واتە باشووری ڕۆژاوای گۆلی ورمیٚ) تا وای لێهات هەموو وڵاتی كوردستانیان گرتەوە.

كرمانجەكان سوننی شافیعی بوون و شان بەشانی بڵاوەكردنیان بە وڵاتەكەدا ئایینەكەشیان، واتە ئایینی ئیسلامیان تێیدا بڵاوكردەوە، بەوەش هێزوتوانای تەواویان، لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزەیەمدا گرتە دەست، ئەم گۆڕانەش لەگەڵ برانی شەقامە بازرگانیە دێرینەكان كە بە كوردستاندا تێدەپەڕین و شێوانی ئابووری كورددا هاوكات بوو (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی زوو، ئابووری كۆچەری و بازرگانی).

كرمانجە ڕەوەندەكان دەسوبرد كوردە گوند و شارنشینە پەهلەوانی دوە مسوڵمانەكانیان لە زۆریەی خاكی كوردستاندا ئایین و وەرگێڕ كرد. ئەم جۆرە گۆڕانە لە شێوازە زمان و ئایینـدا زووتر جارێكی دیكە ڕوویدابوو، واتە ئەو دەمەی كە كوردەكانی باشووری چەپی زاگرۆس بوون بە ئیسلامی شیعە مەزەب. ئەم كوردە باشووریانە بەوەشەوە نەوەستان، بەڵكو زمانەكەشیان گۆڕیە فارس و بوون بە باوباپیرانی دێرینی لوڕەكانی ئەم سەردەمەی ئێستا و گرووپە ئەتنییەكانی باشووری چیای زاگرۆس (بڕوانە ئاوێتە بوون و ئەسیمیلاسیۆن) كۆمەڵگای كورد لەم دەمەدا، وا خەریكە هەموو دەبێتە كرمانجی زمان، ئەم پرۆسەیە لەژێر ئاڵای ئیسلام و مەزەبی شافیعییدا ڕوو دەدا.

درەنگی لە وەرگەڕاندا بۆ سەر ئیسلام، نیشانەی بایەخ نەدان و بەكەم زانینی ئەم ئایینە نیە لەلایەن كوردانەوە، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا و لە شار و شارۆچكە گەورەكاندا كە زۆریەی دانیشتووانیان بەدڵسۆزیەوە خۆ بە موخلیسی ڕابەرە بەناوبانگەكانی ئیسلام دەزانن. ئەوی ڕاستە، تەنانەت لە سەردەمە ناوەندەكانیشدا، كوردان چەندین زاناو دانەری مسوڵمانی ئەوتۆ سەرشوناسیان بەخشیوە بە ئیسلامەتی كە زادەی بیری قووڵیان لە كۆمەڵە بەرهەمێكی زۆر گرنگدا خۆی نواندوە، ئەو بەرهەمانە تا ئەمڕۆكەش لە جیهانی ئیسلامدا بەناوبانگن

کوردانی وەکو ئەلدینـەوەری و ئیبنولئـەثـیر، ئـیبن فـەزلان، ئـیبن خـەلکان، سـوهرەوەردی و بەدیعولزەمانی هەمەدانی، ئەستێرەی هەرەگەشـن لـە ئاسمـانی مەدەنیـەتی ئیسلامدا (بڕوانـە مێژووی سەردەمە ناوەندەکان).

لەو دەمەوە کە کوردان وەرگەڕاونەتـە سـەر ئیـسلام، هـەرا و کێشمەکێشی نێـوان گرووپـە جیاجیاکانی ئیسلام یەخەی کوردانیشی لەسەر لایەنگری کردن لـەم گـرووپ یـان لـەو، گرتـوە، بەتایبـەتی نێـوان سـوننی و شـیعەکان و ئەمـە هـەرگیز لـە بگـرە و بـەردە هاوشـێوەکانی شوێنەکانی تری جیهانی ئیسلام چ لە توندی چ لە سروشت، یـان بەردەوامییـدا جیـاواز نـەبوە، بۆ نموونە، لە دەوروبەری شاری کرماشـان لـە کوردسـتانی باشـوور کـە زۆربـەی دانیـشتووانی شیعەی دوانزە ئیمایین خەڵکەکە جۆرە جەژنێك دەگێڕن کە تێیـدا، لـەناو زریـق و زاق و چـەپڵە ڕێزان و دەیدەی کردندا، ئاگر لـە پەیکـەرێکی خەلیفـە عومـەر بـەردەدەن کـە لای مـسوڵمانانی سوننی جێی ڕێزو خۆشەویستییە (بڕوانە کەلتووری میللی) ئەم کارە هەرچەند مایەی نـاڕەزایی کوردە سوننیەکانی ناو شارەکە و دەرەوەیەتی بەڵام بکەرانی هـەر لەسـەری دەڕۆن و زۆر جـار تـەنها بـۆ وروروژانـدنیان دەیکـەن. شـیعەگەریی کـوردی، کـە لـە هـی گـەلانی دیکـە تونـدترە، ژمارەیـەکی زۆر داب و ڕەسمـی نەیارانـەو وروورژێنـەرو قـسەو بـەیتو بـالۆرەی برینداركـەری لێکەوتۆتەوە کە تەنها بۆ ئەوە دانراون مـرۆڤ ببەنـەوە سـەردەمە توندڕەوانـە و پـڕ لـە فیتنـە و فرتەنـەکانی وڵاتـی فـارس لـە سـەردەمی شـیعەگەریی سـەفەویەکاندا بـەو ڕەگوڕیـشە و پەیوەندییانەوە کە لەگەڵ کورداندا هەیبوو و لەمەودوا لە بابەتی "تیرەی فریشتەکان"دا دێینـە سەری (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی هەرەزوو).

سـەرکوتکردنی شـیعەکان لەسـەر دەسـتی سـوننیەکان، لـە ئەنـەدۆڵ لـە هـی ئێـران زۆر توندتربوە. لە بەرامبەردا ئێرانیەکانیش بە درێژەی چەندین سەدە تۆڵەی ئـەم کردەوانـەیان بـە دەستەوایی سەندۆتەوە. لە ئەنەدۆڵ، کاتێك کـە سـوڵتانی عوسمـانی، سـەلیمی زەلەنـدە، لـە سەرەتای سەدەی شانزەدا دەستی کرد بە زنجیرەیەك قەتڵوعام کردنی شیعەو عەلەویەکان (چ کورد چ تورکمان)، پیاوە ئایینیە سوننییە کوردەکان بـە خواسـتی خۆیـان یارمەتیـەکی زۆری سوڵتانیان لە بەجێهێنانی ئەو قڕکردنانەدادا.

لە دوا دەمەکانی سەدەی نۆزدەیەم و بـە تایبـەتی لـە هـەوەڵ دەیـەکانی ئـەم سەدەیەدا،

سۆزو جۆشی بیریارە ئەڵمانەکان بۆ دۆزینـەوەی ڕەگ و ڕیشەی ئاریانەژادانـەی خۆیـان پـاڵی پێوەنان، کە لە بارەی ئایینە ئارياييەكانەوە بكۆڵنەوە و وردبنەوە و ئینجا بـەو سـەرەنجامەوە دەرچـن کـە گوایـە ئـەم ئایینانـە لـە ئایینـە سـامییەکان (جوولەکـە و مەسـیحیەت) بـەرزتر و دروسـتترن. ئایینـەکانی هیندسـتان و زەردەشـتیەتی وڵاتـی فـارس بـۆ ئـەم "ناسیۆنالیـستە ئاریاییانە " بوون بە کەڵەکی سنووریەندی و خۆ جیاکردنەوە. هەندێ ئینتەلیجنسیای کوردیش کە ڕەتانە پایتەختەکانی ئەورووپا و لەوێ بەتوندی کەوتنە بەر تەئسیری بیروڕای ئەو بیریارانـە، هاتنـە سـەر ئـەوەی ئیـسلام کـە ئـەویش ئـایینێکی سـامییە بەهـەمان چاوببینن کـە ئاوەڵـە ئەڵمانـەکانیان مەسـیحیەت و جوولەکـەیان دەبـینی. بـە مەبەسـتی وەرگـەڕان لـە ئیـسلام و پشتکردن لێی، کە ئایینی "عەرەبانە"، گۆڤاری هاوار، کە پەخشنامەیەکی ئـەدەبی فەرهـەنگی بوو (لە ساڵانی ١٩٣٢-١٩٤٣ دەردەچـوو) (بڕوانـە چاپەمەنی و میدیای ئەلـەکترۆنی) ئـایینی یەزیدی وەکو ئایینی نەتەوەیی کورد دەرخستوە، کە گوایە پاکژی نەتەوەیی خـۆی سـەرەڕای چەندین سەدەی فشارو زوڵم لێکـردن پاراسـتوە. بۆچـوونە هەڵەکـەیان بـەوە خـۆی چـواند کـە گوایە یەزیدیەتی هاوشانێکی ڕاستەوخۆی زەردەشتیەت بوە، واتە ئەو ئایینـە، "ئاریـایی"یـەی کە بیریارە ئەڵمانەکان هاواری بەرز ڕاگرتنیان بۆ دەکرد.

شـکاندنی ئیـسلام و بـە کـەمزانینی پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ کوردانـدا (یـا باشـترە بڵـێم ناسیۆنالیزمی کورددا) تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی بنێشتە خۆشەی سەردانان بوو، واتە تا ئەو کاتەی ئاریایزم بە فەوتان و بەخۆڵەمێش بوونی ڕایخی سێیەم، بوو بە بڵقـی سـەر ئـاو و سەری نایەوە.

کەچی سەرەڕای ئەمە، گەلێ خوێندەواری کورد هەر لەسەر بەرز ناسینی ئایینەکانی پـێش ئیسلامی گەلەکەیان ڕۆیشتن و کوێر کوێرانە زەردەشتیەتی کۆنە ئایینی فارسـەکانیان هـەر بـە ئایینی ڕەسەنی خۆیان دانا، شاعیرێکی وەکو جگەرخوێن (١٩٠٣-١٩٨٤)ماوەیەکی زۆری ژیانی خۆی و بەشێکی گـەورەی کارەکـانی بـۆ بەرزکردنـەوەی زەردەشـت لەسـەر حیسابی ئیسلام سەرفکردووە، تەنانەت لە دوادوای ژیانیدا و پاش ئەوەی بارودۆخەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەلای ئیسلامدا شکان، ئەو بەلای ئیسلامدا شکایەوە بەڵام تەنها جۆرێکی تایبـەتی ئیسلام:- تەمومژاوی، ئایدیالیست، دژ بە عەرەب و دوور لە نەفەس و بیروڕای مەلا و زانایانی ئیسلام.

تەنانەت ئەمڕۆکەش گەلێ ڕۆشنبیری کوردی بە دیمەنتریش هەن کە سۆز و جۆشیان بۆ زەردەشتیەت و یەزیدیزم و ئایینە نەتەوەییەکانی تر بە ئەندازەی ڕەق و کینەیان لە ئیسلام توندە. بە هەرحاڵ دەبێ ئێستا لە هێرش بردنە سەر ئیسلامدا هۆشیارانەتر بجووڵێنەوە، لە کات و ساتێکدا زیندووبوونەوەی ڕادیکاڵانەی ئیسلام بۆتە دەستوور و ئامانجی گەلێ دەوڵەت و کۆمەڵی سیاسی لەناوچەکەدا.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Martin van Bruinessen, "Kurdischer Nationalismus und Sunni–Schi'i Konflikt," in *Geschichte und Politik religiöser Bewegungen im Iran, Jahrbuch zur Geschichte und Gesellshchaft des Mittleren Orients* (Berlin/Frankfurt, 1981).

## تیرەی فریشتەکان

زۆربەی ئەو کوردانەی کە مسوڵمان نین، سەر بەیەکێك لە چەند ئایینی جۆراوجۆری خۆیی کوردن کە یەك لە یەك کۆنتر و ڕەسەنترن لەناو کورداندا. سەرچەمی گشت ئەم ئایینانەش دەچنەوە سەر ئایینێکی کۆن و باوی ناو کوردان کە بەگشتی بە "تیرەی فریشتەکان" یان تیرەی فریشتەکان ناوێکە لەو باوانەی کە ئێستا بە یەکێك لە لقەکانی واتە یەزیدیەتی یەزدانیەت ناسراوە لەناویاندا. ناوی ڕاستەقینەی ئایینەکە، لەناو گێژەنگی گۆڕانی ڕۆژگاردا سواوە و ون بووە و چەند ناوی جۆرا و جۆری لێکەوتۆتەوە، یەزدانیەت یان تیرەی فریشتەکان ناوێکە لەو ناوانەی کە ئێستا بە یەکێك لە لقەکانی واتە بەزیدیەتی دەوترێ، ئەم ناوە لە رووی مانای و وشەییەوە واتە "فریشتە پەرستەکان" هەندێ بەڵگە دەڵێن ناوی ئایینەکە بەر لەوەی کەرت و پەرت بێ، یەزدانیەت بووە، لەوانەشە یەکێ لە هەرە کۆنترین ناوەکانی ئەم باوەڕە "هەق" بووبێ، "هەق" ئەو ناوەیە کە دراوە بە ڕووحی گەردوونی، واتە ئەو پەرستراوە ئەزەلییەی خاوەنی گشت بوونەوەرەمانە. کورتە باسێك لە بارەی ئەم بووچوونەوە لەم فەسڵەدا لەژێر بابەتی "ئێزدییەت"دا دراوە.

لە سەردەمانی هەرە دێرینەوە تا ئەمڕۆكە، تەنها سێ لقی تیرەی فریشتەكان ماونەتەوە، كە بریتین لە ئێزدیایەتی، عەلەویەت و یارسانیەت (كە بە عەلیوللاهی یان ئەهلی حەقیش ناسراون). ئەمڕۆكە نووسەیریەتیش هەر دەچێتە ناو خانەی عەلەویەتەوە، پەیڕەوانی ئەم دەمەی نووسەیریەت بریتین لە كەمینەیەكی ناو عەرەبی سوریا و زۆریەی كەمینەی عەرەبی توركیا.

ئێستا و لە ڕابردووشدا، هەموو پەیڕەوانی ئەم تیرانە لەسەر یەك باوەڕی بنەڕەتی ڕژد بوونە، بە حەوت بوونەوەری فریشتەیی نوورانیی شووشەیی نادیار كە دنیا لە حەوت بوونەوەری خراپی تاریكیدۆستی زیانبەخش دەپارێزن. لە پاڵ ئەمەشدا، تیرەكان باوەڕێكی تریشیان هەیە، ئەویش "دۆناو دۆن"ە واتە گوێزانەوەی گیان لە جەستەیەكەوە بۆ جەستەیەكی تر. بەم جۆرە، بەرجەستەبوونی خودایی، بەرجەستە بوونە گەورە و بچكەی ئەو دۆنا دۆنە خۆیەتی.

تیرەی فریشتان، باوەڕیان بە بوونی گیانێكی گەردوونی واتە "هەق" هەیە، كە سنوور نازانێ و گشت لادەگریتەوە و سەریەخۆشە. تاقە پەیوەندی ئەم گیانە بە جیهانی ماددییەوە، دەر كەوتنی سەرەتاییەتی وەكو بەرجەستەكەرێكی هەرە بەرز. كە كاتێ خودی خۆی هاتە بوون، گەردوونی ئەفراند، (لەمەوە دەبێ بڵێین گەلێ كەس وا تێدەگەن وشەی هەق لە حەقی عەرەبییەوە واتە ڕاستی، هاتووە، لە كاتێكدا ئەم بۆچوونە ڕاست نیە). ئەم گیانە لە دەرەوەی كاروباری دنیای ماددیدا مایەوە، ئەوەندەی لێدەرچێ كە ئەم دنیایەی لێكدا و لە چوارچێوەی گەوهەرەكەیدا كردیە یەك. بەرجەستەكاری سەرەكیی كە بوو بە پەروەردگار لەلای هەموو لقەكانی تیرەكە، یەزیدیاتی لێدەرچێ، بە خودای مەزن ناسراوە. ئەم مەسەلەیە لە خوارەوە باسكراوە، لەگەڵ پرۆسەكانی ئەفراندن یان دوابەدوای ئەو پرۆسانە، پەروەردگار خۆی لە پێنج شێوەی دیكەدا نواند (بابا یان باب، كە لەوانەیە لە وشەی بابی ئارامی واتە دەرگا یان دەروازەوە هاتبێ) كە پاشان ئەركی جێگرەكانی ئەویان بۆ درێژەدان و هەڵسوڕاندنی پرۆسەی ئەفراندن گرتە ئەستۆ. ئەو جێگرانە ئەو فریشتە پایە بڵندانەن كە لەگەڵ پەروەردگار و گیانی ئامادەدا حەوت بوونەوەرە پیرۆزەكەی سەردەمی سەرەتایی ژیانی گەردوون پێكدێنن. ئەم چەرخەش دەبوو شەش چەرخی تری بە دواوەبێ، هەر چەرخەش كاتێك دادەهات كە گیان یان گەوهەری بەرجەستەكارەكانی چەرخی ڕابردوو بۆ ناو بەرجەستەكاری نوێ دۆناو دۆنیان دەكرد تا بەو جۆرە لەگەڵ ئەم گیانەدا ژمارە(٧)ە پیرۆزە كە هەر پایەداربێ. دەشێ پاش ئەم

حەوت چەرخە بنەڕەتی و بەرجەستەکارە سەرەکییانە، بەرجەستەکاری نوێ بەڵام گچکەو ناو بەناو، سەرهەڵدەن و پەیدا بن، بەڵام، ئەم بەرجەستە بوونانە کەم بایەخترن، کاریگەریشیان لەسەر ئەو زمان و سەردەمەی کە تێیدا دەردەکەون ئەوەندە بە تین نابێ. لەم سەدەیەدا سێ کەس گەیشتوونەتە پلەی "باب" یان "بەرجەستەکار": شێخ ئەحمەدی بارزانی (کە بە ڕابەرێکی مسوڵمان دادەنرێ)، سولەیمان مورشید (عەلەوییەکی عەرەبی سوریا) (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ) و نورعەلی ئیلاهی (کە ڕابەرێکی یارسانانە). کاریگەریی ئەمانە، بەهەرحاڵ، درێژخایەن نەبوە، بەڵام ئەم بووچوونە بەرجەستەکارێکی تر ناگرێتەوە کە سەدەیەك لەوەبەر دەرکەوتبوو.

لە سەدەی نۆزدەیەمدا، میرزا عەلی محەمەد، کە ئێستا لەناو خەڵکدا بە "باب" ناسراوە ئایینی بابیەتی دامەزراند، کە ئەوەندەی پێ نەچوو بوو بە ئایینێکی دنیایی و بە بەهائیەت ناوبانگی پرژاند. ئەم ئایینە وەکو ئاگری ناو پووش، بەهەمان شێوەی میترائیەتی سەردەمانی دێرین، لە ماوەی سەدەیەکدا هەر لە تۆکەندی فارسیەوە گرتیەوە تا دەگاتە بەریتانیا (بڕوانە بابیەت و بە هائیەت).

داب و ڕەسمەکانی تیرەکە زۆر بە نهێنی ڕاگراون بەتایبەتی لەوانەی کە دەرەکین، تەنانەت لە کاتی شێنەییشدا، ئەم ڕەفتارە هەر بەم شێوەیە ڕۆیوە. لەم سەدەیەی ئێستاماندا، ژمارەیەکی بەرچاوی نووسراو لە بارەی لقەکانی تیرەی فریشتەکانەوە کەوتوونەتە بەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و بڵاوکردنەوە، و ئەم نووسراوانە دەرفەتێکی باشتریان بۆ دەرخستنی بنج و بناوانی ئەم ئایینە نەتەوەییە کوردیە وکارکردنی، لە ئایینەکانی تر ڕەخساندوە.

ئایینەکە پڕاوپڕ یۆنیڤەرسالیست (جیهانی)یە.. ئەو هەموو ئایینەکانی تر بە مەزهەری دروستی هەمان بیرۆکەی بنەڕەتیی باوەڕی مرۆڤ بە ڕووح دادەنێ. دانەرانی ئەم ئایینانە هەموو نموونەی بایەخدانی هەمیشەیی پەروەردگارن بە کاروباری دونیا لە شێوەی بەرجەستەکردنی ناویەناودا لە ڕێگەی پێغەمبەرێکی نوێوە کە نامەی ڕزگاری بۆ خەڵکەکە دێنێ، هەر لەبەر ئەمەش لای پەیڕەوانی ئایینەکە ئەوەندە گران نییە، لەگەڵ ئیسلام، مەسیحیەت، زەردەشتیەت یان هەر ئایینێکی تردا بدوێن، چونکە بەلای ئەوانەوە هەموو ئەم ئایینانە هەمان شێوەی ئایینە کۆنەکەن، هەروەها ئەوان زۆر بە ئاسانی دەتوانن بچنە ژێر ئاڵای هەر یەکێك

لەم ئایینانەوە هەر كات بە پێویستیان زانی. ئایینەكانی تر كە خۆیان وەكو تاكە ڕێگای نزیكی گەیشتن بە خودا و نزیكبوونەوە لێی دادەنێن و تەنها خۆیان بەڕاست و درووست دەزانن، هەر بە ئەندازەی ڕەنگەكانی ناو پەلكەزێڕینە لێك جیان: ئەوان جیان لە دەركەوتنی شێوەكانیاندا، بەڵام هەموو چوون یەكن لەوەدا كە گشت جۆرەكانیان، هەرچەند هەر یەكەیان ڕەنگێك دەدەن، هەموو لەلایەن پەروەردگارەوە دروستكراون لەو دەمەدا كە جیهانی ماددی دروستكردووە. ئەم جۆرە بۆچوونە ئایینی هیندۆسیەت و دیدی گشتگیری ئەو ئایینەمان لە بارەی ئایینەكانی ترەوە دێنێتەوە یاد.

لە هەمان كاتدا تیرەكە هەمیشە باوەشی گەرمی بۆ گرتنە خۆی ئایینەكانی تر كردۆتەوە كە زۆر و كەم لێیان نزیك كەوتبێتەوە. لەم پێناوەدا لقی نوێی ئایینەكە بە وەرگرتنی پیاوی ناوداری ئەو ئایینانە بۆ ناوخۆی كراوەتەوە. بۆ نموونە، عەلەویەت لە پرۆسەی ئەو كۆششەی تیرەكەدا دروستبوو كە لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمدا بۆ هەڵلووشینی ئیسلامی شیعە دای. ئەم جۆرە كۆششە كە بەردەوام و بەدرێژەی مێژووی تیرەكە لە هەر كاردابوە، نابێ هەمیشە بە هەوڵێكی ڕێكخراوو ڕایەڵدانراوی مەبەست خراپی دەزگایەكی ڕابەرایەتی و ناوەندی تیرەكە دابنرێ، ئەم كۆششانە بەگشتی دەستپێشخەریی سەربەخۆیانەی هەندێ لق و پەلی پەیڕەوانی ئەو تیرانە بوونە، كە لەناو هەڵسوكەوتیان لەگەڵ ئایینێكی جیا لەوەی خۆیاندا، بەرەبەرە بەشێكی زۆری ئەو ئایینە فێر بوون بە جۆرێك توانیویانە تێی بخرێن و بیكەن بە ئایینی خۆیان، دوایی ئاڵای ڕابەری دڵسۆزانەیان تێدا هەڵكردووە و خستویانەتە ژێر دەستی خۆیانەوە و بوونیشە بە سەركردە و ڕابەر و سەردەركردوو تێیدا.

گەلێ لە ئایین و بزووتنەوەكانی هەرەزوو، كە ئێستا بوونە بە قەوارەی گەورە، ڕوون و ئاشكرا دیارە كەوا بوون و پێكهاتنیان بەهەمان شێوەی عەلەویەت ڕوویداوە و لە نوادا وەكو لقێكی تیرەی فریشتەكان هاتووەنەتە كایەوە. لەناو ئەم ئایینانەدا پیاو دەتوانێ، هەرچەندە بە پارێزو وریایشەوە بێ، ئایینە گنوستیەكانی میثرائیەت و زوروانیەت و بزووتنەوە كۆمەڵایەتی- ئابووری قەوارەكانی وەكو مەزدەكیەت خوڕەمیەت و قەرمەتیەت، بخاتە پاڵ یەك. هەر ئەم تیرەیە خۆی، كاری كردۆتە ئایینێكی تری گنوستیش واتە مانیەت. هەروەها شیعەی ئیسماعیلیە (حەوتەوانە) و دورزیەت و بەتایبەت (تا ڕادەیەكی كەم) زەردەشتیەت و

شیعەی دوانزە ئیمامی و بەهائیەتیش. ئێستا وا دەردەکەوێ کە بزووتنەوەی ئایینی میثرائیەت تەنها پەردەیەك بوە لە پشتییەوە پەیرەوانی تیرەکە هەولّیان داوە بچنە سەر کۆنە ئایینی یۆنانی پانتەیزم کە تیرەکە لە سەرەتای دروستبوونی قۆناغی هیلینیستی سەدەی چوارەمی پێش زاییندا پەیوەندی و سەوداکاری لەگەڵیدا هەبوە. میثرائیەت سەرکەوتنێکی بەرچاوی وەدەست هێنا، لە سەردەمی کۆنستانتین و دەستڕۆیی مەسیحیەتدا، میثرائیەت ئەوەندە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆماندا بەبرەو بوە کە لەوانەیە ئاهەنگگێڕانی دەولەتی ڕۆم بەبۆنەی لەدایکبوونی خوداوەند میثراوە لە (٢٥)ی کانوونی یەکەمدا، بووبێ بە بناغە بۆ دانانی ڕۆژی لە دایکبوونی مەسیح. ئەم ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا ڕووحی گەردوونی بۆ جاری یەکەم خۆی لە بەرجەستەکاری مەزنیدا دەرخست، واتە خوداوەندی پەروەردگار کە میثراییەکان بە میثراسی دادەنێن.

لقی یەزیدیی تیرەی فریشتەکان و بزووتنەوەی نوسیریەی ناو عەلەویەکان، ئێستاش یادی هەندێ پاشماوەی ئەم دەرکەوتنە سەرەتاییەی میثراس دەکەنەوە لە ئاهەنگ و شایی گێڕانە ئایینییەکانیاندا.

هەرچەندە تیرەکە، گەلێ سەرزەمین و ماوەی کاریگەریی کۆنی خۆی لە بەرامبەر ئیسلامدا لە دەست داوە بەلاّم هێشتا کاریگەری خۆی لە ژیانی هەموو کورداندا هەر پاراستوە، ئەمە لە فەرهەنگی میللی و فۆلکلۆری و گێڕانی هەندێ بۆنەو ئاهەنگی ئایینییدا دەردەکەوێ. بۆ نموونە ڕێزگرتن لە خدر، یان خزر پێغەمبەر "خزری زیندەی دەشت و چۆلان" هێشتا کە لەناو کوردە مسولّمانەکاندا هەر باوە. لە هەموو کوردستاندا، نزرگەی خدر لە پەنای کانیاوەکانەوە بەدی دەکرێن (بڕوانە فولکلۆر و چیرۆکە میللییەکان) کوردان چیرۆکی خدریان لەگەڵ هی پێغەمبەر ئیلیادا گرێداوە، کە ئەویش وەکو خدر، لە کانیاوی ژیانی خواردۆتەوە و هەتا هەتایە هەر دەمێنێ. خدری زیندە، کە لە ئاو و خاك دروستبوە، (ناویشی لەوانەیە بە مانای "سەوز"بێ) لە قوولایی گۆم و کانیاوەکاندا دەژی و هەر جارە بەشێوەیەك خۆی دەردەخا و هەر کەسێ هانای بۆ بەری بە هانایەوە دێ.

گەلێ ئاهەنگ و جەژنی ئایینی، کە هی تیرە ئایینییە جۆراوجۆرەکانی کوردەکانن لەسەر نزرگەی خدر دەگێڕڕێن (بڕوانە میهرەجان، جەژن و ئاهەنگەکان و ساڵنامە)، تەمەن درێژی

خدر، سیمبولبەندیی خۆی لە تەمەنی درێژی كیسەڵەكانی ناو ئەو گۆل و كانیاوانەدا ڕەنگداوەتەوە كە بە دەوری نزرگەكانیەوەن. بەو جۆرە، كیسەڵ لە گەلێ بابەتی نەخشكاری ئایینی كورددا دەردەكەون (بڕوانە نەخشكاری و وێنەبەندی). جەژنگێڕیەكانی خدر دەكەونە وەرزی بەهارەوە، واتە ئەو كاتەی سروشت خۆی نوێ دەكاتەوە، بەڵام ڕۆژەكەی لە ئایینێكەوە بۆ ئایینێكی تر جیاوازە، هەروەها لە مەڵبەندێكەوە بۆ مەڵبەندێكی دیكە. هەموو لقەكانی تیرەكە پابەندی ئاهەنگ گێڕانەكانن، تەنانەت هەندێ كۆڕی مسوڵمانیش دەیانگێڕن، لە هەندێ سەردەمی هەرەزوودا، تیرەكە بە بەرهەڵستێكی توندی زەردەشتیەتی كۆن دادەنرا. ئەمە دەبێ هی پێش كۆتایی سەردەمی میدی بێت و هەوڵی چوونە سەر ئایینی زەردەشتی لەوانەیە لەسەر دەستی ڕشتیڤێگا ئەژی دەهاكی (٥٨٤–٥٤٩ پێش میلاد)دوا پادشایی میدیا ئەنجام درابێ. ئێستا بەڵگەی بە هێز بەدەستەوەن كەوا كوشتنی زەردەشت خۆی و لە تەخت لادانی ڤیشتا سپاشای پاڵپشت و پارێزەری بە دەستی ڕشتیڤێگا ئەژی دەهاك لە ساڵی (٥٥ پ ن) و لە كاتی ڕۆیشتنیدا بەرەو ڕۆژهەلات و دەوربەری ڕووباری هاریرود–مورغاب لە باكووری ڕۆژاوای ئەفغانستان. هەر لەو سەردەمەوە لەسەرینی ئەوەوە ئیتر ئەم پادشاییە بە ئەهریمەن دانراوە لەناو زەردەشتیەكانی زوودا و لە میثۆلۆجیای زەردەشتیان و گشت ئێرانیاندا بە خیانەتكار و ستەمكارێكی گەورە دانراوە و لە شاكارێكی گەورەی وەكو شانامەدا. هەر بەو جۆرە ناوزەد كراوە هەر لەوەشەوە وشەی ئەژدەها بۆ مارێكی حەوسەری یەكجار درندە و خەتەرناك لە زمانی فارس (و كوردیشدا– وەرگێڕ) دانراوە، هێرۆدۆتس ناوی ئەژی دەهاكی، وەكو دوا پادشایی ماد، بەشێوەی چەوتەوەكراوی ئەستیاگس هێناوە.

دوا بابەتی كارتێككردنی درێژەكێش لەنێوان هەردوو ئایینەكەدا ئەو سیستەمی چینی پیاو و ڕابەری ئایینیە پشتاوپشتە بوو كە تیرەی فریشتەكان خستیە ناو ئایینی زەردەشتیەوە و بە (موغ)ەكان ناوی دەركرد. ئەم سیستەمە جێی ئەو سیستەمە ساكارەی ڕابەرایەتی ئایینی گرتەوە كە زەردەشت پێكی هێنابوو.

زەردەشتیەت و تیرەی فریشتەكان لە زۆر شتدا هاوبەشن، لەوانە، هەردوولا باوەڕیان وایە كەوا حەوت فریشتە چاك و حەوتی "بەد" سەرەوكاری ئەم دونیایەیان بە دەستەوەیە، هەردوو لاشیان باوەڕیان بە زنجیرەیەك پیاوی ئایینی پشتاو پشت هاتوو هەیە ئەم بابەتە هاوبەشانە

دەرەنجامی سروشتی پێکەوە ژیانی دوور و درێژ و پڕ ڕووداون لەنێوان هەردوو ئایینەکەدا. شتە هاوبەشەکانی تر لەوانەیە، شوێن پەنجەی ئایینی تازە نیشتەجێ بوە ئارییایەکانی کوردستان بێ، کە دەشێ ئایینی ئەسڵییان هەمان ئایین بێ کە زەردەشت پێغەمبەر خۆی دوایی پوختەی کردو ئایینی زەردەشتی لێ دروستکرد لە شێوە و شێوازی ئێستایدا تیرەکە ئایینەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر ئیسلام و پێکەوە تەبایان دەکەن، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی هەردوو ئایینەکە پێکەوە دراوسێیەتیەکی (١٤) سەدەییان بەسەر بردوە. نزیکەی هەزار ساڵ دوای یەکەم هەوڵ بۆ گۆڕینی زەردەشتیەت، پەیڕەوانی تیرەکە جووڵەیەکی تریان کرد، هەرچەندە کەمتر سەرکەوتوو. بۆ یەکجاری هەڵوەشینی یان هەر لە بنی نەهێشتنی زەردەشتیەت، ئەم هەوڵە، بەڕواڵەت خۆی لە پەیدابوونی بزووتنەوەی مەزدەکیەتدا نیشاندا.

تیرە یان بزووتنەوەی مەزدەکیەت کە لە سەدەی پێنجەمی پاش میلاددا وەکو بەرخودانێك دژ بەو سیستەمی چینایەتی– ئابووری– کۆمەڵایەتییە ستەمکارانەیەی کە زەردەشتی ئایینی دەوڵەتی ساسانی لە وڵاتی فارس بناغەرێژی کردبوو سەری هەڵدا... بزاڤەکە لە هەرێمی زاگرۆسەوە لەسەر دەستی ڕۆڵەیەکی ئەم وڵاتە، واتە مەزدەکەوە هەڵقوڵا کە سەرەنجام توانی کاڤات یان قوبادی پادشایی سەردەمیش بێنێتە سەر ئایینەکەی خۆی (٤٤٨–٥٣١ پاش میلاد).

باوەڕی پتەوو نەگۆڕی مەزدەکیەکان بە یەکسانیی کۆمەڵایەتی هەموو خەڵك کە تا ئێستاش بە بڵاوی لەناو تیرەی فریشتەکاندا باوە، خەڵکێکی زۆری هەژار و پامالّی جیاوازیی چینایەتی کێشایە ناو خۆیەوە، مەزدەك (کە ناوەکەی لەوانەیە مەزدەگچکە بگرێتەوە و مەزدە خۆی کورتکراوەی خواوەندی هەرە گەورەی زەردەشتیان ئاهۆڕا مەزدا بێ) بانگی هاوبەشیەتی هەموو خەڵکانی لەگەلێ بابەتی دنیاییدا دەدا و بەوەش تاوانبار دەکرا کە ژنیشی لەو بابەتانەدا داناوە–واتە تۆمەتی لێنەپرسینەوەی هیچ سنوورێك لە مەسەلەی جنسدا کە ئێستاش دەدرێتە پاڵ تیرەی فریشتەکان: پەیڕەوکردنی هاوبەشیەتی لە موڵکیەتدا گەلێ نووسەری ئەم سەردەمەی خستوتە سەر ئەو باوەڕەی، بێ هیچ چۆن و چرایەك، تیرەی مەزدەکان بە یەکەم سیستەمی کۆمۆنیستی جیهان دابنێن (بڕوانە مێژووی کلاسیك). هەر لەناو ئەم ئایینەدا گەلێ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی ناو ئیسلام پێگەیشت و تەنیەوە لە شێوەی

بزووتنەوەی ئەم سەردەمەی ئیسلامدا، ئەمە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ تا ئێستا لە بزووتنەوەی ئەم سەردەمەی شیعەدا خۆی دەنوێنێ.

سەرەڕای سەر كەوتنەكانی زوویان، یان باشترە بڵێین لە پای ئەو سەركەوتنانەیاندا، زۆرێكی وای پێ نەچوو كە مەزدەكیەكان لە دوادوای سەردەمی كاڤاتدا لە (٥٢٨)ی پاش میلاددا (چونكە ئەو لەو دەمەدا وەرگەڕابووە سەر زەردەشتیەت) كەوتنە بەر شاڵاوی قەتڵوعامێكی بەرباڵو، كە دەسەڵات چوە دەستی خوسرەوی یەكەمی نەوشیروانی كوڕیەوە، مەزدەكی قڕانەكە گشت كون و قوژبنی وڵاتەكەی بە جۆرێك گرتەوە، كە پادشا توانی بە تەواوی قەلاچۆكردنیان جاڕبدا بەڵام گشت ئەو هەوڵ و هەڵپانە نەزۆك بوون و هێندەی پێ نەچوو مەزدەكیەكان سەریان قوت كردەوە، هەرچەندە بە پەراگەندەییش، بەتایبەتی پاش ڕوخانی ئیمپراتۆری ساسانی كە زەردەشتیەوارێكی یەكجار سەختگیر بوو. مەزدەك یەكێكە لە دوو پیاوچاكی یەكجار بەرێز لەناو هۆزی گەورە و گرانی خۆشناودا لە كوردستانی ناوەند (بڕوانە Sykes 1908-457).

كە كار كەوتە دەست ئیسلامەكان، حوكمڕانە مسوڵمانەكان بەردەوام ناچار بوون لە جەنگ و دامركاندنەوەی شەپۆل لە دوای شەپۆلی بزووتنەوەی ئایینی ئابووری تەباری ناوخۆییدا بن كە لە هەمان ئەم سەرزەمینی (جیبالەوە) سەری هەڵدەدا (عەرەبەكان بە چیاكانی زاگرۆس واتە میدیای دێرینیان دەوات هەرێمی جیبال). هەرە گرنگی ئەم بزوتنەوانە، واتە خورەمیە، بە سەركردەی بابەك كرا كە سەردارێكی سوپایی و لە هەمان كاتدا ئایینیش بوو، بزووتنەوەكە باوەڕی بە دۆناودۆن كردنی ڕووح هەبوو، بەتایبەتی هی سەركردە و ڕابەرە ئایینەكان.

بابەك و یارانیشی بەهەمان وێنەی مەزدەك و مەزدەكیانی زوو، بەوە ناسرابوون كە لە موڵكداریەتی هەموو شتومەك و ئامێر و كەرەستەی بەرهەمهێنانی ئابوورییدا گشتییان برابەشن و جیاوازیەكی كۆمەڵایەتی ئەوتۆ دیاریان لەنێواندا نیە.

هەر لە هەمان سەردەمی بابەكدا، كە مەڵبەندی چالاكییەكانی لەناو جەرگەی هۆزە كوردە ڕەهەندەكانی ئازەربایجاندا بوو، كوردێكی نارسە ناو (كە مەسعوودیی مێژووناسی سەدەكانی ناوەندیە) نەسیری كورد ناوی دەبا) لە كوردستانی باشوور (ناوجەرگەی وڵاتی تیرەی فریشتەكان) بزووتنەوەی خورەمیەی بەرپاكرد كە سەرەنجام لەلایەن موعتەسەمی خەلیفەی عەباسیەوە دامركێنرایەوە...

ئەلتەبەری مێژووناسی ئیسلام دەڵێ: نزیکەی (٦٠٠٠) لە یارانی نارسە لەلایەن ئیسلامەکانەوە کوژران و ئەوانی تر، بە نارسە خۆشیەوە، ناچار ساڵی ٨٣٣ی پاش میلاد چوونە ولاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیانەوە (بڕوانە مێژوی سەردەمی ناوەند).

نیشانەی مەزدەکیەکان و خوڕەمیەکانیش، مێزەرە سوورەکانی سەریان بوو، بۆیە بە "سورخ عەلەمان" واتە ئالا سووران، یان "سورخ جامەگان" واتە سوور پۆشان ناویان دابوەوە، ئەم نیشانە دیسانەوە لە سەدەکانی ١٤و١٥ دا لە بزووتنەوەیەکی تری پەیڕەوانی تیرەکەدا سەری هەڵدایەوە، ئەو کاتە کە عەلەویەکان بە مێزەرە سوورەکانیانەوە ناویان بە قزلْباش، واتە سەر سوور "دەرکرد (بڕوانە عەلەویەت و مێژووی سەدەکانی ناوەند).

پاش دامرکاندنەوەی لەلایەن خەلیفەی عەباسیەکانی هەرە زوەوە، ترووسکەیەکی تری خوڕەمیە لە باشووری عێراق و دوایی لە لەحسایان ئەحساد "الاحساء"ی ڕۆژهەلاتی شانشینی عەرەبستانی سعوودی هەڵبوەوە ئەمانیش ناوی قەرامیتەیان لە خۆیان نابوو و لەگەڵ بیروڕا دێرینەکەدا بەوە یەکیان دەگرتەوە کە یەکسانی کۆمەلایەتی ئابووری و بیروڕاکانی تری ئەویان هەلگرتبوو ناصر خوسرەوی گەڕیدەی بە ئایین ئیسماعیلیی سەدەکانی ناوەند، داب و ڕوسمە ئایینییەکانی دانیشتووانی ولاتی لەحسا بە "خاوەنداریەتی گشتیی هەموو ماڵ و موڵك و شتومەك" باس دەکاو پەنجە بۆ پەیوەندی نێوان مەزدەکیەتی کۆن و بزووتنەوەی قەرامیتە دەکێشیّ. ئێستاش ولاتی لەحسا لە ڕووی مەزەبەوە لە سعودیە جیایە، واتە ئەو ناسوننی و ئەم کانگای سوننییەتی گەرم. ئێستا دانیشتووانی ئەحسا بە شیعەی ئیمامی دەدرێنە قەڵەم، ئەم دابڕینە هەر بە ئەندازەی ئەو دابڕینە ڕاستە کە سەردەمانێك تیرەی فریشتەکانی بە شیعەی ئیسلام دەدایە قەڵەم.

لە سەدەی پانزەیەمدا، موحەممەد نووربەخش ناوێك بە بزووتنەوەیەکی سۆفیگەرییەوە لە ئەحساسەری قوت کردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو بزووتنەوەکەی بە چوارلادا تەنیەوە و لەگەڵ بیروڕاکانی تیرەی فریشتەکاندا یەکگیربوون. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەشدا، سۆفیەکی تری خەڵکی لەحسا، شێخ ئەحمەدی لەحسایی، لە لەحسا پەیدابوو و لەوێوە ڕوویکردە ئێران و لەوێ بناغەی بزووتنەوەی بابییەتی دانا. بیروڕاکانی شێخ ئەحمەد کە لە چوارچێوەیەکی کۆمەلایەتی - ئابووری خۆ ولاتیدا بوون، زۆر لە بزووتنەوە دێرینەکەی

مەزدەكیەكان نزیك بوون (بیروراكانی شێخ ئەحمەد لەلایەن عەلی محەمەد بابەوە بڵاوكرایەوە) ئەویش لە نزیكیدا لەگەڵ تیرەی فریشتەكان، بە ئەندازەی بزووتنەوەكەی نووریەخش لێی نزیك بووە (بڕوانە بابیەت و بەهائیەت).

هەموو لقەكانی تیرەكە، هەر لە مەزدەكیەتەوە بیگرە تا دەگاتە عەلەویەكانی ئەم سەردەمە، بە گشتی تۆمەتی مێگەلیبیان لە پەیوەندی جنسییدا دراوەتە پاڵ، مسوڵمانەكان لەو باوەڕەدان كە ئەوان لە كۆبوونەوە تیرەییە ئایینیەكانیاندا ژنەكانیان بە هاوبەشی بەكاردێنن. تا ئێستاش بە مەبەستی ڕیسواكردنی پەیڕەوانی تیرەكە، باس لە ئاهەنگێك دەكرێ كە گوایە لە ئەنەدۆڵ "موم سوندی" واتە مۆم كوژانەوە و لە ئێران "چراغ كوشان"ە واتە چرا كوژاندنەوەی پێ دەوترێ. ئەم باڵۆرەیە لەلایەن دراوسێ مسوڵمانەكانی تیرەكەوە لێدەدرێ و ئاراستەی چەندین كەمینەی تری ئایینی دەكرێ كە لە زۆر لاوە لە تیرەی فریشتەكان نزیكن وەكو ئیسماعیلیەكان لە ئەفغانستان (Canfield 1978) عەلەوەیەكانی توركیا و سوریا (Yalman 1964) و دورووزیەكانی ڕۆژهەڵات (Eickelman 1981)) سەیر ئەوەیە پسپۆرگەلێكی چون هێنری ڕاولینسن و مەكدونالد كیتێرو ج. ر. درایڤەریش بەم باڵۆرانە هەڵخەڵەتاون. هەرچی درایڤەرە لەگەڵ ئاهەنگەكانی (بۆنا دیا)دا بەراوردی دەكا كە لە ڕۆما بەرپا دەكرا، بگرە لەو ئاهەنگانەش زیاتر ڕیسواكەرانە باسیان دەكا (Driver 1921-23)) لە كاتێكدا راولینسن دەڵێ: هەرچەندە باوەڕی نەكردووە كەوا ئەو كردەوانە لە سەردەمی ئەو (١٨٣٦)دا مابێ، بەڵام بە بیروڕای ئەو نیوسەدە لەوەبەر هەبوە هەروەها دەڵێ، دەبێ ئەم كردەوانە پاشماوەی پەرستنی خواوەندەكانی وەچخستنەوە بووبن كە لەناو تیرەكانی میثراو ئەناهیتادا و هەروەها لەناو تیرەی سیسورتیسدا باو بوە كە ئەندامەكانی جنسیان دەپەرست. كینێر، تەنانەت ئامارەی بۆ ئەوەش كردووە كە خۆی هەر نەبێ ئاهەنگێكی لەوانەی ساڵی ١٨١٨ بە چاوی خۆی دیوە، ئەگەر بە كردەوە بەشداریی تێدا نەكردبێ.

پەیڕەوانی گشت لقەكانی تیرەی فریشتەكان، كۆبوونەوەیەكی خۆییان هەیە كە پێی دەڵێن جەم، ئایینی جەم یان جەمخانە (جەمهانە لە توركیا) و لە شوێنێكی پەنهاندا دەیگرن، لەوێدا نووسراوی پیرۆز دەخوێنرێتەوە و ڕابەرە ئایینیەكان وتار دادەدەن و گفتی نوێكردنەوەی برایەتی و دڵسۆزی بۆ یەكتر لە چوارچێوەی تیرەكەدا بەڕاوەشاندنی دەست، دەدەن.

یەکسانیی کۆمەڵایەتی نێوانیان بەوە دووپات دەکرێتەوە کە هەموو لایەك لە یەك ئاستدا دادەنیشن بێ ئەوەی کەس بکەوێتە ژوور کەسی ترەوە.. کۆبوونەوەکان لەوانە دەشاردرێتەوە کە باوەڕیان بە ئایین و ئەتواری کۆبوەوەکان نیە نەك پێیان بزانن و ببێ بە مایەی سەریەشە و سەغڵەتی بۆیان. هەر ئەم توندنهێنی گرتنەی کۆبوونەوەکانە کە جڵەوی خەیاڵی هەندێ کەسی شلکردووە کە گوایە کارێکی جنسی لە پشت پەردەوە لە ئارادایە. قەدەغەکردنی ژن لە ئامادەبوونی جەمخانەکان لەلایەن هەندێ لقی یارسانەوە کاردانەوەی ئەم تۆمەتسازیانە، هەرچەندە ئەمە لەگەڵ ئەو پلەو پایەیەدا هەرگیز ناگونجێ کە کورد وەکو نەریتێکی دێرین داویە بە ئافرەت (بڕوانە پلەوپایەی ژنان و ژیانی خێزانی).

بۆ ئەگێریەکی بچووکی جەمیش هەیە کە هەموو حەفتەی جارێك دەگێڕرێ، بەڵام جەمی هەرە گرنگ ئەوەیە کە هەر ساڵە جارێك دەیگێڕن، وەکو لە خوارەوە باسی دەکەین. هەر لقە بۆ خۆی کاتێکی لە ساڵ بۆ جەژنگێڕی هەڵبژاردوە.

لە سەردەمی ئیسلامدا، ئایینەکە هەم کاری کردۆتە سەر گەلێ لقی ئایینی ئیسلام و هەم لێیانەوە وەریگرتوە، بەتایبەتی لە شیعە دوانزە ئیمامی و لە ئیسماعیلیە حەوت ئیمامیەکان... گەورەترین و درێژەکێشترین کرداری تیرەی فریشتەکان لەسەر ئیسلام لە سەردەمی زنجیرەی قەرەقۆینلوودا لە ڕۆژهەلاتی ئەنەدۆڵ و ڕۆژاوای ئێراندا (١٣٨٠-١٤٦٨) هاتە کایەوە، هەروەها لە قۆناغە هەرە زووەکانی پەیدابوون و پێکهاتنی زنجیرەی سەفەوییدا لە سەرەتای ١٥٠١ی پاش زاییندا. پێکهێنەری زنجیرەکە، ئیسماعیلی یەکەم، گڕ گرتوویەکی سەختگیری عەلەویەت بوو. تەنانەت خۆی بە مەزهەری خوداوەندیش دادەنا. ئەو ئێستاش لە دڵ و دەروونی عەلەوییەکاندا پلەو پایەیەکی یەکجار بڵندی هەیەو بە "ساحێبی زەمان" واتە سەردەمداری دنیا دادەنرێ. ڕاستییەکەی، تەنها پاش چەند پشتی یەك لە دوای یەك سەفەویەکان ئینجا توانیان ئایینەکەی خۆیان لە دەنگ و ڕەنگ و ڕیشەی تیرەی فریشتەکان پاك بکەنەوە. پاش ئەوە بە هەر چۆنێك بێ، خۆیان لێی بوارد و هەر لەو کاتەوە بەدواوە ئیتر شیعەی دوانزە ئیمامی توانی هەر دووپێ بەسەر زینی ئێراندا شۆڕکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەر باسێکی بێ لایەنانە لە بارەی باوەڕ و ئاکاری ئایینی سەفەویەکانی هەرە زووەوە بکرێ، ناتوانی لە بازنەی تیرەی فریشتەکان (بەتایبەتی عەلەویەت)، نەك ئیسلامی شیعە، دەرچێ.

بۆ ئەوەی خۆیـان لـەم كـافرە نامسولْمانانە جیـا بگـرن، شـیعە ئیمامیـەكان لـە سـەرەتای سەدەی (١٦)ەوە ناوی "جەعفەری"یان لە خۆیان نا (لەسەر ناوی جەعفەری صـادقی ئیمـامی شەشەمی شیعیان). بەوە ناوە كۆنەكەیان، (شیعە) وەلانا. شیعە كە كورتەی "شیعە علـی"یـە وشـەیەكی عەرەبیـە و "هـەوادارانی عـەلی" دەگرێتـەوە. مەبەسـت عـەلی زاوای محمـدە. بـە دڵنیاییەوە لەوەی، ناوی عەلەوی یان عەلیولاهی كە كوردە نامسولْمانەكان و دوابەدوای ئـەوان توركمان و عەرەبەكان لە خۆیان نا، لەناوی ئیمـام عەلییـەوە وەرگیـراوە (ئـەم بۆچـوونەش لـە دوو توێیدا جۆرە خواوەندیەك بـە عـەلی دەبەخـشێ وەكـو مەزهـەرێكی هـەرە گرنگـی ڕووحـی گـشتی لەسـەر ڕووی زەمـین كـە دوو لەسـێی تـیرەی فریـشتەكان باوەڕیـان پێیـەتی) شـیعە ئیمامییەكان زۆرتر ناوی "جەعفەری"یان بۆخۆیان پێ باشتر بوو لـە شـیعە، چـونكە ئـەم نـاوە هەرچـەندە ئـەو زەقیـەی نیـە كـە "شـیعە" هەیـەتی، بـەلام سـەلامەتترە. كـە لـە (١٧٢٠)دا سەفەوییەكان جڵەوی حوكمیان لە دەست دەركرا، ئەم ناوە بووبوو بە باوترین ناو بۆ شیعەكان بەگشتی بۆیە مەترسییەكی ڕاستیان لەوە هـەبوو كـە بخرێنـە پـاڵ عەلـەوی و عەلیولاهییـە بـە ئاشـكرا نامـسولْمانەكان یـان تێكـەڵ بكـرێن لەگـەڵ ئەوانـدا بـە پێـچەوانەی خواسـت و ویـستی ئەمانەوە ژمارەیەك لە عەلەویەكانی ئەنەدۆڵ لە سەدەی بیستەمدا ناوی "جەعفەری"یان نـا لـە خۆیان و لە ناونووسە گشتییەكانی دەوڵەتدا خۆیان بەو ناوە ناساند (بڕوانە خشتەی ژمارە (٥) تێبینەكان).

سەركەوتنی تیرەكە لە بواری بنبالگرتن و خاوەندارێتی ئایینە لایدەكاندا، لە پـەنای جەستە گۆڕكردن و دۆنادۆن كردنی گیانەوە، هەمان كارمان دێنێتە یـاد كـە ئـایینی هیندۆسـیەت كـاتی خـۆی كـردی، ئـەوەبوو هیندۆسـیەت بـونیـەتی هەڵلوشـی بـەو بنەمایـەوە كـە بـوداش (بەرجەستەكەر)ێكی تری ڕووحە بەلام ئەویش لە گرنگیدا هیچ لـە ڤیشنووشیڤا و ڕامـا كـەمتر نییە، هەندێ لە هیندۆسەكان هەمان باریان بۆ محەمـەد پێغەمبـەریش لێنـا، بـەلام نەگەیشتنە مەنزڵ.

"زەوتكردنی" عەلی و محەمەد لەلایـەن تـیرەی فریـشتەكانەوە لـە سـەردەمیكدا، وا دیـارە یارمەتی تیرەكەی داوە لە قووتـدانی شیعەكاندا لـە سـەرەتای سـەدەی پانزەیەمـەوە تـا ئـەو كاتەی شا عەباسی گەورە چۆتە سەر تەختی پادشاییەتی سەفەوی لە ١٥٨٨دا. بەلام لە ئامێز

گرتنی گەرمی ڕابەرەکانی شیعەی دوانزە ئیمامی لەلایەن شا عەباسەوە هەر لە مەدینە و لوبنان و میزوپۆتامیاوە بگرە تا دەگەیتە خۆراسان، سەرەنجام ئەو تۆز و گەردەلوولی عەلیپەرستییەی ڕەوانەوە کە تیرەی فریشتەکان بەرپایان کردبوو. پسپۆڕ و زانا ئیسلامیەکانی شا عەباس، شیعە دوانزە ئیمامیەکانیان بە توندی یاسابەست و سنوورگیر کرد بە بەستنەوەیان بەشێوەی ڕەسەنی پێشوویان واتە پێش دەستەمۆکردنیان لەلایەن تیرەی فریشتەکانەوە. عەللامە بەتلیسی کە پڕترینیی ئەم زانا پایە بڵندە شیعانەیە، لە "بحار الأنوار"دا، کە یەکێکە لە بەرهەمە هەرە قووڵەکانی لەم بوارەدا، هەر بە بێزاندنی تایرەی فریشتەکانەوە ناوەستێ بەڵکو لەسەر تاوانبار کردن و بگرە ڕیسواکردنیشیان دوور دەڕوا، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شیعەگەریی هاوچاخ لەگەڵی لە داب و دەستوورەکانیدا ڕەنگی تیرەی فریشتەکانی لە خۆی بە تەواوەتی نەسڕیوەتەوە بەتایبەتی ئەوانەی کە لەلایەن سونیەکانەوە زۆر بە سەختگیر و لە ڕێباز بەدەر دادەنرێن. سەرەنجام ڕەفتاری لە ڕادەبەدەر دژی قەرەقۆینلوو سەفەویەکانی زوو (واتە ئەو کاتەی لەسەر ڕێبازی عەلەوی بوون) زۆربەی مسوڵمانەکانی ئێران و قەفقاسیای لە سوننیەتی وەرگێڕا. چاکسازیەکانی دوایی و هێنانە پێشەوەی شیعەگەریی دێرین شێوازی پاش سەدەی حەڤدەیەم، هەرگیز نەیانتوانی شوێنی پەنجەی تیرەی فریشتەکان لە داب و دەستوورە گشتیەکانی ئایینەکە بسڕنەوە. ئەوەتا ئێستاش ڕەنگ و بۆی تیرەکە لە ڕادیکالیەت و یەکسانیخوازی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیمای شەهید پەرستی خۆی لەناو شیعەگەریی ئێران و قەفقاسیادا بەزەقی دەردەخا، بەڵام لای شیعەکانی عێراق ئەوەندە بە توندی دەرناکەوێ. دانیشتووانی ئەو وڵاتەی ئێستا عێراقی پێ دەوترێ زۆربەیان شیعە بوون بەر لە دەرچوونی عەلەوییە شۆڕشگێڕەکان بۆ دەرەوەی ئەنەدۆڵ و هەرگیز وەرنەگەڕانە سەر عەلەویەت، بەڵام، لەگەڵ ئەمەشدا، وڵاتەکە بە تەواوەی دوور لە بای عەلەویەت نەمایەوە، چونکە لقێکی تری تیرەکە واتە یارسانیەت لە ڕۆژانی هەرە زووی ئیسلامەوە لەسەر خۆ و بێ قرە و برە هاتبوە وڵاتی میزۆپۆتامیاوە.

عەبدولڕەحمانی موحەمەدی جامی شاعیر و زانای بەناوبانگی مەزەبی سوننی سەدەی پانزەیەم و ڕابەری ڕێبازی سۆفیگەری، لە (ڕەشە حاتی جامی)دا، بە هەندێ وشەی تۆمەتاوی باسی شیعەکان دەکا کە دوایی دەرکەوت خودی ڕاستین. ئەو بەڕاکشاوی ئەو شیعانەی لە

بەغدا تێكەڵاویان بوو بوو بە: "دۆنادونی" وەسف دەكا (باوەڕێكی بنەڕەتی ئایینی ناو تیرەكە كە بە واتای تەناسوخی دوابەدوای ڕووحەكان دێ)، (بڕوانە یارسانیەت).

جامی بە نەریت ڕێز لە مسوڵمانە شیعەكانی ناوەڕاستی ئاسیا و هەرێمی خوراسانی نیشتمانی خۆی دەگرێ. دوژمنایەتی گەورەی لەگەڵ شیعەكانی ڕۆژاوای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەغداشی پێوە، لەوەدا خۆی دەنوێنێ كە بە توندی دژی ئەوەیە ناویان بنرێ شیعە، بەڕای ئەو دەبێ پێیان بوترێ "رافزی" واتە وەرگەڕاوەكان. ئەم جۆرە هەڵوێستە دوژمنانەیە، یان جۆری تری، لەلایەن زاناكانی ئیسلامیی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئیسلامەوە بەرامبەر بە شیعەگەرییی ڕۆژاوا (هەرچەندە ئەو زانایانە هەڵوێستی زۆر دۆستانەیان بەرامبەر بە شیعە ئیمامیەكان دەنواند)، لە كاتێكدا هاتنە كارەوە كە تیرەی فریشتەكان هەر ئاسا سەری ژەنیبوە ناو شیعەگەرییی سوننەتیەوە و كەنەی لێدەكرد.

یاوەری ئەستووری شیعەكان بە ژمارەیەكی بەرچاوی چاكان و دانانیان بە ڕزگاركەر "ساحیبولزەمانێكی زیندوو و زەمانداری سەردەم و هی تر"، هەموو دەچێتەوە سەر تیرەی فریشتەكان. تیرەی فریشتەكان باوەڕی بە هەموو ئەو چەمكانە هەیە، هی ئەو ڕزگاركەرەی لێدەرچێ كە گوایە لە كۆتایی دنیادا دەردەكەوێ، بۆیە ئەوەندە گران نیە بۆیان گەر پێویستی كرد خۆیان وەكو شیعە بنوێنن، تەنانەت ئەمڕۆكەش، هەندێ لقی تیرەكە خۆیان بە ئیسلامی شیعەی ڕاستەقینە و ڕەسەن دەناسێن، هەرچەندە بیر و باوەڕە بنەڕەتیەكانیان لە ڕاستیدا هەرگیز لەگەڵ ئەوانەی ئیسلامدا كە لە قورئاندا هاتوون، ناگونجێ.

تیرەكە خاوەنی ئەدەبیاتێكی بەرچاوە لە بارەی دروستبوون و كۆتایی دنیا و مەسەلەی پاشە ڕۆژ و حیساب و حیسابكاریدا، دەقاودەق بەو جۆرەی كە لەناو یارساندا پارێزراوە و لە بابەتی یارسانیدا باس و تاوتوێ كراوە. ژمارە(٧) لای ئەم ئایینە پایەیەكی پیرۆزی هەیە، ئەو ژمارەی ئاسمانەكان، فریشتە ڕووناكەكان (هەروەها دژایەتییان لەگەڵ هێزە تاریكەكانی مادەدا)، ژمارەی مەزهەرە سەرەكیەكانی ڕووحی گشتگیر و ژمارەی دەورانەكانی ژیانی جیهانی ماددی و ژمارەی ئەو بنەماڵە پایە بەرزانەشە كە لە ئایینەكەدا پشتا و پشت ڕابەرییان كردووە. لە دووتوێی ژمارە (٧)دا ژمارەیەكی دیكەی پیرۆز تر، بەڵام كەمتر بەكارهێنراو هەیە ئەویش ژمارەی (٣)ە كە دەربڕی هەندێ سیفەتی پەروەردگار خۆیەتی. هەر ئەم ژمارانە خۆیان بێگومان، لە

گەلێ ئایین و ئایینزای تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کەم یان زۆر، بە پیرۆز دادەنرێن. لێرەدا پێویستە سێکوچکەی پیرۆزی مەسیحیەت و ڕێزی ژمارە (٧)مان لە ئەستێرەناسییدا لەبیر نەچێ، جێی سرنجە کە ژمارە (١٢) لای تیرەی فریشتەکان بایەخی نییە، کەچی لای جوولەکەو مەسیحی و ئیسلامیش ژمارەیەکی پیرۆزە (ئاماژەیە بۆ(١٢) هۆزەکەی جوولەکان، (١٢) ئاوەڵەکەی عیسا و (١٢) ئیمامەکەی شیعییان).

ڕۆژوگرتن لەم ئایینەدا تەنها بەسێ ڕۆژ براوەتەوە. نوێژ هەر لە کۆبوونەوە ئایینیەکانی جەمخانەدا دەکرێ، قەدەغەکاری جۆری خۆراك لە لقێکەوە بۆ لقێکی تری ئایینەکە دەگۆڕێ بەڵام. بە گشتی شلە یان زۆر تەمومژاویە. بۆ نموونە خواردنەوەی ئەلکولی و گۆشتی بەراز هیچ قەدەغەکاریەکی ئەوتۆیان لەسەر نییە، چونکە لە نووسراوە ئایینیەکەدا ڕاستەوخۆ دەستی نەخراوەتە بەر.

تیرەکە لە بنەڕەتەوە بریتییە لە ئایینێکی ناسامی. دارەڕاکەی ئاریانەیە لە قاوغی ئایینی خۆرلاتیی سەرزەمینی زاگرۆسدا، هەر هەوڵێك بۆ کلاسبەندی کردنی تیرەکە یان هەر یەکێ لە لقەکانی وەکو بەشێك لە ئایینی ئیسلام لە هەڵەیەکی نەزانانە بەولاوە هیچی تر نیەو لەبێ ئاگایی لە بارەی مێژوو و ڕسوماتی ئایینەکەوە هەڵقوڵاوە. ئەم ئایینە لە هەزار ساڵ بەرەو ژوور لە ئیسلام کۆنترە، هەرچەندە کارتێکردنی زۆر لەنێوان هەردوو لقی عەلەوی و یارسانیی ئەم ئایینە و ئیسلامی شیعەدا هەیە، هەڵەیەکی زۆر زلە گەر ئەم دوو لقە بە شیعە دابنرێن یان بە پێچەوانەوە.

هۆی بە هەڵەداچوون لەم بوارەدا زۆرن، لە هەموویان گرنگتر ئەو پلەو پایە بەرزەیە کە عەلی ئیمامی مسوڵمانانی شیعە چ لەناو یارسانیەت چ لەناو عەلەویەتدا هەیەتی. بە بەرزکرنەوەی عەلی بۆ پایەی مەزهەری ڕاستەقینەی ڕووح، عەلەویەت و یارسانیەت ناوی عەلیوڵلاهیان (واتە عەلیپەرستان) لە دراوسێ مسوڵمانەکانەوە پێ بەخشراوە. بەکارهێنانی خۆپارێزی ئایینیش – وەکو ئەوەی لەناو مسوڵمانەکاندا تەقیەی پێ دەڵێن – بابەشێکی تری دروستکردنی تەمومژە لەناو خەڵکانی دەرەکییدا. لەپاڵ ئەمانەدا، هەوڵەکانی جارانی تیرەکە بۆ هەڵلووشینی شیعەگەرییی بە بیانووی یەك ڕەگیەوە، بۆتە مایەی سەرشێوان بۆ گەلێ مێژوونووسی بەسزمان، بەهەمان شێوە کە دراوسێ مسوڵمانە تووڕەکانیان بێ دەسەڵاتانە

ناوی شیعەی سەختگیر یان غولاتیان، بەسەریاندا بڕیوە. ئەمڕۆ زۆربەی مسوڵمانان گەر دەمی پرسیاریان لە بارەی ئەم تیرەیەوە لێ بکرێ یەکسەر دەڵێن: ئەمانە جۆرێکی نامۆن لە مسوڵمانی شیعە، (ئەمە یەزیدیەکان ناگرێتەوە).

چونکە ژمارەی تیرەکە لە چوار سەدەی ڕابردوودا هەر لە کزیی داوە، هەروەها دووڕوویی ڕابەرەکانیان لە دەرخستنی ناسنامەی ئاییںی ڕاستەقینەی خۆیاندا و بە بەردەوامی ناساندنی تیرەکە وەکو لقێکی ئسلامی شیعە، بوونەتە مایەی داشکاندنی بایەخی تیرەکە لەناو مسوڵمانەکاندا. وێ دەچێ کوردە مسوڵمانەکانیش لەمەدا دەستیان هەبێ و بەشداربووبن بەوەی کە لە سەدەی (١٩) و سەرەتای سەدەی (٢٠)دا ئازار و فشارێکی زۆریان بە قسە و ڕێنمایی مەلا پلە و پایە و مورید جۆکانیان خستە سەریان. لە گشت خەڵك بەدەر تەنیا ئەم مسوڵمانانە پەیڕەوانی تیرەکەیان دایە بەر بای نەیاری و بەدکاری، (بڕوانە سەرەتایی مێژووی هاوچەرخ).

وەکو ئایینەکانی دیکە کە خاوەنی کتێبی خۆیانن، ئەم تیرەیە کتێبێکی لە ئاسمانەوە دابەزیوی تایبەت بە خۆی نییە، ڕاستییەکەشی، لەبەر بوونی بەرجەستەکەری زۆر و لەبەر ئەوەی لەم ئایینەدا سروش و بەرجەستەبوون دووشتی بەردەوامن، بوونی کتێب زۆر لەجێی خۆی نەدەبوو. لەجیاتی کتێب، چەند نووسراوی پیرۆزیان هەیە کە لە کاتی جیاجیاو بە زمانی جودا جودا و لەسەر بابەتی جۆرا و جۆر لەلایەن چاکانی تیرەکەوە نووسراونەتەوە. ئەوی ڕاست بێ، نورعەلی ئیلاهی کە خۆی بەرجەستەکەرێکی پلەی خوارەوەی ئایینەکەیەو دانەری نووسراوی "بورهان"— کتێبی پیرۆزە — کە لەم دوا دواییەدا دایناوە، (بڕوانە یارسانیەت) ساڵی ١٩٧٥ کۆچی دوایی کرد. نەبوونی کتێبی تایبەتی بە هیچ جۆرێك نەبۆتە کۆسپ بۆ تیرەکە کە دیدی تایبەتی خۆی لە بارەی دروستبوونی دنیا و مەسەلەی ئاخیرەت و دەرزدادان و گێڕانی دەستوورە ئایینەکانەوە هەبێ، دیدێکی یەکجار سەرنجکێش و ڕاوەستێنەر، کە تا ئێستاش هەموو لقەکانی تیرەکە، بەم شێوە یان بەو شێوە، هەرچەندە وردە جیاوازیشیان تێدا هەبێ، پەیڕەوی دەکەن و لەسەری دەڕۆن.

چاکە و خراپە، لە دیدو باوەڕی تیرەکەدا، بە قەت یەك گرنگ و بایەخدارن بۆ دروستکردن و بەردەوامبوونی جیهانی ماددی، بۆیە فریشتە چاکەکان بە قەی فریشتە بەدەکان جێی ڕێزن.

ڕاستییەکەی بێ ئەم ناکۆکییە دوولایەنە، جیهان ناتوانێ هەبێ و بەردەوام بێ. ساردی بۆیە هەیە. چونکە پێچەوانەی، واتا گەرمی، هەیە ژوور بۆیە هەیە، چونکە ژێر هەیە، چاك ناتوانێ بەردەوام بێ، گەر بەد تای تەرازووی بەردەوامیەکە ڕانەگرێ، چونکە چاك و خراپ هەردووك بەهەمان هاوسەنگی لە مرۆڤدا هەن. "زانیاری" و "هۆشیاری"یش بۆ مرۆڤ نیشانەی ڕەفتارن تا لەبوونی خۆی بگاو تەرازووی بوونی خۆی پێ بەرامبەر ڕاگرێ. وەکو نەریتێك، چاك لە شێوەی سەگێکدا و بەدیش لە شێوەی مارێکدا سومبولبەندی کراون، هەردووکیان لە شێوەی مارێکی سەگسەردا پێکەوە لکێنراون تا پێکڕا کرداری دروستکردنی دنیا دەرخەن: واتە تێکەڵەی مادە و ڕووح، چاك و بەد، و هەموو شتە دژ بە یەکەکان کە ئەم جیهانەیان پێك هێناوە. هەندێ ڕاپۆری گەڕیدە ئەوروپیەکان کەهی دوا دوای سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمن کە باسی ڕێزگرتنی عەلەویەکان لە سەگ دەکەن، ئەگەر ڕاست بن لەوانەیە ئاماژەیەك بن بۆ پەرستنی سومبولی چاکە، چونکە بەڵگەیەکی زۆر لەسەر ڕێزگرتنی یەزیدییەکان لە سومبولی مار (واتە سەر) لە کارە هونەریەکاندا هەیە، نیشانەی ئەمە لەو نەخشانەوە دەردەکەوێ کەوان بەسەر گۆڕی پیاوە ئایینەکانیانەوە لە لالش (بڕوانە یەزیدیایەتی).

جگە لەمە، ماری سەگسەر وەکو سونبولێك لە کارە هونەریە کوردیەکانی سەردەمی مانیەکان، واتە سەدەی نۆیەمی پێش میلادیشدا بەدی دەکرێ. شان بەشانی ئەمە، سومبولکاری سەگ و مار لە هەموو کارە هونەریەکانی ناو دێرە میترایییەکاندا بەرجەستەیە هەر لە ئینگلتەرەوە بیگرە تا دەگاتە ئێران.

تیرەکە باوەڕی بە داستانی بەهەشت یان دۆزەخ نییە، کە لە کۆتایی دنیادا دامەزرێن و ببن بە جێگەی فریشتە و شەیتان. ماڵوێرانیەکانی ناو دۆزەخ و خوشڕابواردنەکانی ناو بەهەشت لەم دنیایەدا دێنە دی، چونکە مرۆڤ دوای مردن یەکسەر دۆناودۆن دەکا و یان دەچێتە ناو ژیانی خۆشی و زەلانەوە یان دەکەوێتە کولۆڵی و مەینەتەوە پێ بەپێی شێوەی ئەو ژیانەی بەر لە مردن لەناو لەشی خۆیدا ڕاییبواردوە، بە هەرحاڵ، لە کۆتایی زەماندا تەنها "ئادەمیزادە" ڕاست و تەواوەکان کە لە پەڕینەوەی پردی دوا حەق و حیسابدا "پردی وەرێ" سەردەکەون، بە نەمری ڕووحی جیهانیی شاد دەبن، ئەوانەی لەوێ سەرناکەون، تا هەتایە هەتایە لەگەڵ دنیای

ماندیدا تێك دەهەنجرێن.

باوەڕداریی تیرەكە بە مەسەلەی دۆزەخ و بەهەشت بە زەقیی لەگەڵ باوەڕی گەلێ ڕێبازی سۆفیگەرییدا یەك دەگرنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی كەوتونەتە بەر كاریگەریی بیروبۆچوونی تیرەكە (بڕوانە داب و دەستووری سۆفیان).

لە پەنای هەوڵ و تەقەلای تیرەی فریشتەكاندا بۆ هەڵلوشینی ئیسلامی شیعە، لە هەزار ساڵی ڕابردوودا، پەیڕەوانی تیرەكە خەڵكێكی زۆری توركمانی ئەنەدۆڵ و عەرەبی كنارەكانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستیان هێناوەتە سەر ئایینەكەی خۆیان، هەروەها خەڵكێكی زۆر لە ئازربایجان و گیلان و مازەندەران چوونەتە سەر ئایینی تیرەكە (بڕوانە خشتەی ژمارە ٥).

لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ ئەوەش بزانین كە هەموو پەیڕەوكارە غەیرە كوردەكانی لقە جیاجیاكانی ئەم تیرەیە هەر بریتی نین لە وەرگەڕاوی تیرە و ئایینی تر. لە كاتێكدا زۆربەی هەوادارە غەیرە كوردەكانی عەلەویەت، لە ئەنەدۆڵ وەرگەڕاوی توركمانن، كەچی عەرەبەكانی باشووری چیاكانی ئەمانۆس و هەرێمە ڕۆخ دەریاییەكانی سوریا، زۆربەیان كوردی تەواوەن كە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لەو هەرێمانە نیشتەجێ بوونە. بەهەمان شێوە هەوادارەكانی تیرەكە لە ئازەربایجان و گیلان و مازەندەران و كنارەكانی دەریای خەزەرنەوەی كۆنە كوردە تەواوەكانن كە هەموو ڕەگ و ڕیشاڵی نەتەوەیی كۆنی خۆیان، ئایینەكەی لێدەرچێ، لەدەست داوە. (بڕوانە كۆچكردنە مێژووییەكان و یەكگرتن و ئەسیمیلاسیۆن) هۆی فرەزمانی نووسراوە ئایینیەكانی تیرەكە لەوانەیە لەوەدابێ كە دانەرانی ویستبێتیان بابەتەكان بۆ هەر گرووپە بە زمانی خۆی بگەیەنن بە جۆرێك تێگەیشتنێكی باش دەستەبەر بكا. ئەم كارە لە ئایینەكانی مانی (كە ئێستا زۆر زۆر كەمن) و دروز و ئیسماعیلییدا بەدی دەكرێ، كە هەموو سەردەمانێكی ڕابردوو پەیوەندیەكی زۆر توندوتۆكمەیان لەگەڵ تیرەكەدا هەبوە.

بەهەرحاڵ، كار هەر بەمەوە نەوەستاوە، بەڵكو تیرەكە لە ڕابردووشدا هەوادارێكی زۆری لە دەست داوە. بۆ نموونە نزیكەی گشت لوڕەكان لەم ئایینە وەرگەڕان و بوونەتە ئیسلامی شیعە چونكە لە وڵاتەكەدا زۆر باو بووە، لەكەكانیش وا خەریكن بە پەلە لە دوای لوڕەكاندا هەنگاو دەنێن. وەكو دەردەكەوێ ئەم نەریتی ئایین گۆڕینە لەناو كورداندا هەمیشە گۆڕینی زمان و شێوەی ژیانیشی بە دواوە بووە، لوڕەكان لە شێوە جۆراوجۆرەكانی، كوردی گۆرانیەوە،

گۆڕیانە فارس، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەتی کە تا ئێستاش ڕەنگ و بۆی کوردیی پێوە دیارە زۆربەی هەوادارە کوردە کشتوکاڵ پیشەکانی تیرەکە لەگەڵ وەرگەڕانە سەر ئیسلام زمانەکەشیان لە پەهلەوانیەوە گۆڕیە سەر کرمانجیی و شێوە جۆراوجۆرەکانی. تەنها ناوچەکانی موکری نشینی دەوروبەری شاری مەهابادی لێدەرچێ، هەموو ئەو ناوچانەی ئێستا بەشێوەی کرمانجی باشووری زاراوەی سۆرانی دەدوێن (بڕوانە زمانەکان) تا نزیکەی سێ سەدە لەمەوبەر مەڵبەندی یارسانیەت و زاراوەی گۆرانی بوون (بڕوانە کۆچە مێژووییەکان) لە کاتێکدا ئەو کاتە مەڵبەندی کرمانجی باکوور لە بنەوانەوە و تا سەدەی شانزەیەم ئەو جێیانە بوو کە ئێستا بە زمان دیمیلی دوون و بە ئایین عەلەوین.

لە کۆتایی سەدەکەدا ٣٣–٤٠٪ی کوردان هەواداری ئەم ئایینە دێرینە بوون، لەم سەدەیەی ئێستاماندا، ڕێژەی ئەو هەوادارانەی تیرەکە کە وەردەگەڕێنە سەر ئیسلام لە کزیدایە و ئێستا هەوادارانی لقە جۆراوجۆرەکانی خۆیدەدا لە ٣٠–٣٥٪ی هەموو کوردان. زانیاری زیاتر لەمەودوا لە باسی لقە جۆراوجۆرەکانی تیرەکەدا دەدرێ.

هەوادارانی تیرەکە هەمیشە لەلایەن میسیۆنێرە جۆراوجۆرەکانەوە، بەتایبەتی هی مەسیحییەکان، کراون بە ئامانجی وەرگەڕاندن و پاشگەز کردنەوە، ئەم کارە لە زۆر زووەوە، لە کوردستان و بە ئاراستەی لقە جۆراوجۆرەکانی تیرەکە، لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە بە چالاکی ئەنجام دراوە. لە پاڵ ئەمەدا و بۆ ئاسانکردنی ئامانجەکەیان، ئەم مسیۆنێرانە هەندێ کاری فەرهەنگیشیان، ئەنجام داوە، لەوانە هەندێ فەرهەنگی هەرە کۆنی زمانی کوردی یان وەرگێڕاوی ئینجیل بۆ کوردی کە هێشتا هەر ماون کردەی دەستی ئەوانن (بڕوانە ئەدەبیات) بەشێوەیەکی گشتی، ئەم میسیۆنێرانە، بۆیان دەرکەوتوە کە کارکردن لەسەر ئەم کوردانە (کە زۆربەیان کشتوکاڵ پیشەبوون) ئاسانتر بوە لە کوردەکانی تر (کە زۆربەیان پەز لەوەڕێن و کۆچەر بوون).

تەنانەت ئەمڕۆکەش ڕووی کاری مسیۆنێرە مەسیحی و بەهائیەکان هەر کوردە هەوادارەکانی ئەم تیرەیەن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: A. Christensen, *Le règne du roi Kawadh I et le communisme mazdakite* (Copenhagen, 1925); O. Klima, *Mazdak* (Prague, 1957); F. Altheim, *Ein asiatischer Staat* (Wiesbaden, 1954); M. Rekaya, "Mise au point sur Thèophobe et l'alliance de Bâbek avec Thèophile (839/840)," *Byzantia* 44 (1974); J.B. Bury, *A History of the Eastern Roman Empire from the Fall of Irene to the Accession of Basil I: AD 802-867* (Brussels, 1935); H. Grègoire, "Manuel et Thèophobe et l'ambassade de Jean le Grammairien chez les Arabes," in A. Vasiliev, *Byzance et les Arabes*, vol. 1 (Brussels, 1935); J. Rosser, "Theophilus' Khurramite Policy and Its Finale: The Revolt of Theophobus' Persian Troops in 838," *Byzantia* 6 (1974); W.A. Wright, "Bâbak of Badhdh and al-Afshin during the Years 816-41 AD: Symbols of Iranian Persistence against Islamic Penetration in North Iran," *Muslim World* 38 (1948).

# یارسانیەت

پەیڕەوانی یارسانیەت، کە بە یارسان، عەلیوڵلاهی، عەلی ئیلاهی (واتە ئەوانەی عەلی دەپەرستن"، عەلیحەق، ئەهلی حەق (واتە ڕاستیخوازیان) ئەهلی هاك (واتە "روحپەروەران"— هاك یان هەك)، شەیتانپەرست، نوسەیری (خەڵکی ناسرە واتە مەسیحی)— هتد ناسراون، پاش چەند جێ گوازەکێ، لێرەوە بۆ ئەوێ، لە کوردستانی باشوور لە ئێران و عێراق گیرساونەتەوە. ماوایان هاوسنوورە لەگەڵ گۆرانیەکاندا (بە لەکەکانیشەوە)، واتە لەگەڵ گۆرانیدوەکاندا، هەرچەندە ئەم دابەشکردنە لە هەموو شوێنێکدا چون یەك نیە. ئایینزاکە، ئێستاکە بەسەر دوو یان سێ وردە تیرەی لێك جیاواز لە قەوارەدا دابەش کراوە.

١— ئەهلی حەق: ڕاستەوخۆ لەگەڵ شیعە مسوڵمانەکاندا ڕیزبەندی دەکرێن، هەرچەندە لە ڕێنمایی ئایینیاندا لەگەڵ دەستەیەکی باوەڕ تەومژلویدا هاوبەشن کە لەلایەن نورعەلی ئیلاهییەوە ڕابەری دەکرێن (کە خۆی بۆخۆی گچکە بەرجەستەکەرێکە و ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە) هەروەها لەلایەن نیعمەتوڵلای جەیحونابادی باوکیەوە. نورعەلی ئیلاهی دانەری "بورهان"ە کە کتێبێکی پیرۆزی ئەهلی حەقەکانە، بورهان بە کتێبی ئایینی ئەوان دادەنرێ و گشت داب و دەستوورەکانی تاخمەکەی تێدایە، هەرچەندە شیعەکان زۆر بەجۆشەوە خۆیان وەکو شیعەی ئیمامی دەردەخەن (یان هەندێ جار دەڵێن کە ئایینەکە بریتییە لە جۆرێکی

سەربەخۆی شیعەگەریی)، چاو خشاندنێکی کورت بە بورهان و وتاربەندیەکانی نورعەلی ئیلاهی و باوکی دەرفەت بۆ هیچ گومانێك ناهێڵنەوە کە مەسەلەکە لە ڕواڵەتسازی بەولاوە هیچی ترنیە و مەبەستی تەنها چەپاڵەدانی هەوادارانی ئەهلی حەقە لە زوڵم و ستەمی دراوسێ مسوڵمانەکانیان، وەکو نورعەلی باسی کردووە، هەر لە سەرەتای (۱۹۲۰)ەکانەوە مسوڵمانەکان، لە قەلاچۆکردنی یارسانیەکاندا درێغییان نەکردووە.

٢- تایفەسانیەکان کە تەنها لەم دواییەدا دەستیانکردووە بە خۆدانە پاڵ ئامۆژگاری و دەرسدانیەکانی نورعەلی بەرامبەر بە ئیسلام. بەهەرحاڵ، ئەوان بەقەی ئەهلی حەقەکان بۆ خۆلکاندنی ئاشکرا بە شیعەگەرییەوە، بە جۆش و پڕتاو نین. بە گوێرەی وتاری نورعەلی. تایفەسانیەکان، هاوشانی یارسانیەکان و پا بەپا لەگەڵیاندا هەواداری ئەون. ئەم دوو گرووپە لە هەموو لقەکانی تری یارسانیەکان شارسانیتر و زیرترن و شوێن دەستی کۆمەڵگای ئێرانیان پێوە دیارە و ئەو لقە بچووکەی لە عێراق هەیانە لەسەر ئەم ڕێبازەن.

٣- دێرینەوارەکان: (واتە ئەوانەی خۆیان بە ڕێبازە دێرینەکەوە چەسپاندووە وەرگێڕ) کە بریتین لە خەڵکە گشتی و گوندنشینەکان و زۆربەی زۆری هەوادارەکان پێکدێنن و بە خۆیان دەڵێن یارسان، جارجاریش بە گوێرەی ڕۆژ و جێگا دەبن بە نووسەیرییە یان عەلیوڵلاهی. ئەمانە زۆرتر لەلایەن دراوسێ مسوڵمانەکانیانەوە دەدرێنە بەر شالاوی زوڵم و ستەم، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هەموو گرووپەکانی تر بە ئایینە دێرینەکەوە پابەندن، هەرگیز بەڕواڵەت خۆیان ناکەن بە مسوڵمان، لەبەر ئەوەش کە بە ژمارە و هەژەل لە هەموو بەشەکانی تر گەورەترن، ناوی یارسان پڕ بە بالاو پێستیانە بە گوێرەی بۆچوونی یارسانیەکان، ناوەکە لە (یاری سان)ەوە، یارو یاوەر هەڤاڵ، یان میللەتی سوڵتان" واتە سوڵتان سەهاکەوە هاتووە، وێ دەچێ ئەمە لێکدانەوەیەکی ساکارانەی خەڵکەکە بێ، بۆیە مانا دروستەکە هێشتا لێکدانەوەی گەرەکە.

یارسانیەکان خاوەنی کۆمەڵە دید و بۆچونێکی سرنجکێشن لەمەڕ دروستبوونی جیهان و گەردوونەوە. بە بۆچوونی ئەوان، جیهان کاتێك دروستکراوە کە گیانی گەردوونی (هەق) کە وەکو مروارییەك (یان لە دووتوێی مرواریيەکدا) لەناو ئەزەل (واتە بەر لە ئەبەدیەت) جێگیر بووە، خۆی لە شێوەی بەرجەستەکەرێکی سەرەکیی خواوەندی مەزن (خاوەندگار)دا نیشانداوە و بووە بەسەرلمەدی چەرخی یەکەم لە حەوت چەرخ یان (بیابا)کەی ژیانی گەردوونی: ئینجا

پەروەردگاری مەزن دەستی كردووە بە ئەفراندنی جیهان، پاشان ڕووح خۆی لە شێوەی پێنج بەرجەستەكەرە گچكە (زاتی میهمان)دا دەرخستووە تا بەو جۆرە لەگەڵ ڕووحدا حەوتەوانەی پیرۆز پێكبێنن ئەمە یەكەم چەرخی ئەفراندن واتە (ساجناری) یان " تیۆری دروستبوون" بوو. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٦).

یەكەم چەرخ یان دەوران، شەش دەورانی تری بەدواوا هاتووە (یەكێكیان زاتی بەشەر، پێنجەكەی تر زاتی میهمان)، لە هەر دەورانەدا ڕووحەكە خۆی لە شێوەی شەش بەرجەستەكەری نوێدا دەرخستووە تا بەو جۆرە پێكڕا ببن بە حەوت و بەوە ژمارەكە تەواو بكەن، لە كاتێكدا دەكرێ بەرجەستەكەرەكانی دەورانی یەكەم ڕێك بەرامبەر بە ناوی سەر فریشتەكانی ئایینە سامییەكان دابنێن، بەرجەستەكەرەكانی دەورانی دووەم، كە بە عەلی، وەكو مەزهەری سەرەكیی، دەست پێدەكا نووسەیریان لێدەرچێ هەموو كەسایەتی ئیسلامن. لەوانەیە مەبەست لە نوسەیر، "نەسرانی" واتە "یەسووعی مەسیح" بێ، یان ئەو نەرسەیە بێ، كە خۆی گچكە بەرجەستەكەرێك بوو، دوایی ناوی خۆی گۆڕی بو شێۆفۆبۆس (بڕوانە مێژووی كلاسیك) سێیەم دەوران هی شاە خوشین یان خورشیدە" واتە خۆر"، واتە خواوەند میثراس یان میهرو زنجیرەكەی، (بڕوانە بابەتی فۆلكلۆر و چیرۆكە میللییەكان).

دەورانی چوارەم لە سوڵتان سەهاكەوە دەست پێدەكا، ئاوەڵە بەرجەستەكەرەكانی سوڵتان لە بنەڕەتەوە بریتین لە كەسایەتی جوولەكەی وەكو موسا، داود و بنیامین. بەرجەستەكەرەكانی دەورانی حەوتەم هەموو لەقەبی "بەگ"[٦] یان پێوەیە كە وشەیەكی توركیەو پایەی بەرزی هەڵگری، واتە "گەورە"یی دەردەخا. ئەم گۆڕانانە لە كەسایەتی و بنەڕەتی ناوی بەرجەستەكەرەكان، لەهەر یەكێ لە دەورانەكاندا، لەوانەیە ڕەنگدانەوەی ڕووداوە كۆمەڵایەتی و مێژووییەكانی ژیانی كورد بن لەو سەردەمانەدا. لەوانەیە ئەو ڕووداوانە بابەتی وەكو سەرهەڵدانی بزووتنەوەی میثرائیەت (لە سەدەی دووەمی پێش میلادەوە تا سەدەی سێیەمی پاش میلاد) لە

---

[6] بە بیروڕای دكتۆر كەمال مەزهەر، "بەگ" لە ڕەچەڵەكدا وشەیەكی باوە لە ناو زمانە هیندۆئەوروپییەكاندا و واتای "گەورە" بەكارهاتووە، تەنانەت"بۆگ" لە زمانی ڕووسیدا مانای خودایە.

هەرچەندە من زمانی ڕووسی نازانم، بەڵام لەبەر ئەو كاریگەرییەی زمانی توركی بەهەموو لقەكانییەوە لەسەر زمانی ڕووسی هەیبووە، كە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی تێكەڵكێش و دوور و درێژی هەردوولا، لەوانەیە وشەی "بۆگ" ی ڕووسی لە "بێویك"ی توركی، واتە گەورە، دوور نەبێ - وەرگێڕ.

کوردستانی باکوور و رۆژاوایان هاتنی داب و دەستووری جوولەکە – مەسیحی بۆ ناو کوردستانی ناوەند لە سەدەی یەکەمی پێش میلاددا پاشان بەشەکانی تری کوردستان کە تا سەدەی حەوتەمی پاش میلاد بەردەوام بوو. هاتنی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمدا، هەڵرشانەکانی تورکان لە سەدەکانی(١٢) تا (١٥)دا، ئینجا ڕەوەندبەند بوونی کۆمەڵگای کوردستان بن لە سەدەکانی (١٧– ١٩)دا (بڕوانە مێژوو).

ناوی بەرجەستەکەرەکانی دەورانی پێنجەم لەوانەیە بەزەقی دەرخەری بزووتنەوە شۆڕشگێڕانەکانی هەرەزووی سەردەمانی ناوەند بێ لەناو تیرەکەدا. لەوانەیە "قرمزی" واتە سوورە کە بەرجەستەکەرێکی سەرەکیی تیرەکەیە ئاوەڵناوی بابەك یان نەرسەبێ. ئێمە لەسەرەوە باسی ئالآ و جلوبەرگی سووری ئەم شۆڕشگێڕانەمان کردووە، وشەی "یار" واتە "ئاوەڵ" یان هەوادار کە بەدوان لە گچکە بەرجەستەکەرەکانی ئەم دەورانەوەیە، ناوێکی زۆر باوەو بە گەلێ کەسەوەیە کە لە سەردەمانی ناوەندا ناویان هاتووە. نموونەیەکی تر کە پەیوەندی بەمەوە هەیە، مازیارە (ماە یەزد یار) واتە "ئاوەڵی فریشتەی میدیا" کە ناوی شۆڕشگێڕێکی تیرەکەیەو ئەو هاوکات لەگەڵ بابەك و نەرسەدا، لە ناوچەکانی دەریای خەزەر ڕاپەڕینی بەرپاکردووە (Rekaya 1973) لە هەمان سەردەمدا، لە بەغداش کۆمەڵەیەکی نهێنی، یان براڵەییەکی کۆمەلآنی خەڵك و چاکسازیخوازی شۆڕشگێڕ، کە بەخۆیان دەوت "عەییار"، لە کاردا بوو.

بەرجەستەکەرەکانی دەورانی چوارەم، تەنانەت سەهاك خۆشی، ئێستا لەلای یارسانیەکان بە هەرە گرنگترین دەرکەوتنی ڕووح دادەنرێن، پاش بەرجەستەکەری یەکەم واتە پاش پەروەردگاری مەزن. لە کاتێکدا عەلەویەکان، دەورانی یەکەم و عەلی بە خاوەنی ئەم پلە سەرەکییە دەزانن، کەچی یەزیدیەکان، کە لەوان توندتر بایانداوەتەوە شێخ ئادی و بەرجەستەکەرەکانی دەخەنە ئەم پایە گەورەیەوە، هەرچەندە نازانرێ ئەمانە سەر بە چ دەورانێکن.

خاوەندگار، عەلی و سەهاك، سێ سوچکە سەرەکییەکەی ناو حەوتەوانەکەن لای یارسانیەکان، لە کاتێکدا لای عەلەویەکان بەم جۆرەن: خاوەندگار، عەلی، بەکتاش (بڕوانە ڕێبازەکانی سۆفیگەری)، بەڵام لای یەزیدیەکان شتەکە بەم جۆرەیە: شەیتان، ئادی، یەزید.

یەزیدیەكان شەیتان یان مەلەك تاوس دەخەنە ناو بەرجەستەكەرەكانی دەورانی سەرەكیی یان یەكەمەوە، لە خشتەی ژمارە (٦)دا ئەم ریزبەندیە بە جۆرێك كراوە كە شەیتان نراوەتە جێی خاوەندگار خۆی، چونكە وا نەبوایە نەدەكرا شەیتان هەم لە دەورانی یەكەمدا بێ و هەم ئادیش وەكو یەكێك لە بەرجەستەكەرە سەرەكیەكانی بخرێتە دەورانەكانی دوای ئەوەوە. هەر بەرجەستەكەرە دۆناودۆن دەكاتە ناو ئەوی دوای خۆیەوە (نێریێ یان مێ) لە دەورانەكەی پاش خۆیدا. بەم جۆرە خاوەندگار دۆناودۆن دەكاتە ناوی عەلییەوە لە دەورانی دووەمدا، و ناو شاخوشینەوە لە دەورانی سێیەمدا و ئینجا ناو سولتان سەهاكەوە لە دەورانی چوارەمدا و بەم جۆرە شتەكە دەڕوا.

لە هەر دەورانێكدا بەرجەستەكەرێكی مێینە هەیە بۆ ڕووحی گشتگیر، ئەمەش نیشاندەری پلەی هەرە بەرزی ئافرەتە لە فەرهەنگ و نەریتی كوردانـدا (بڕوانە ڕەوشـی ژن و ژیـانی خێزانی).

گەورەترین كەسایەتی یارسانیەت، واتە سولتان سەهاك، بە زۆری لەلایەن هەندێ دەمراستی ئەهلی هەق و تایفەسایەوە بە سولتان ئیسحاق ناو دەبرێ واتە شێوە ناوێ ئیسلامیانەی (ئایزیك)ی ئینگلیزی و ئەم، لەقەبە پڕا و پڕ، لەگەڵ ناوە جوولەكانەكانی تری بەرجەستەكەرەكانی دەورانی چوارەمدا دەگونجێ. سەهاك یان ئیسحاق، بە گوێرەی لێكدانەوەیەك، دەبێ لەنێوان سەدەی ١١ و ١٢دا، لە شارەدێی پیرۆزی بەرزنجەی ڕۆژاوای باكووری سلێمانی لەدایك بووبێ. بەرزنجە ئێستا مەڵبەندی ڕێبازی سۆفیگەریی قادرییە (بڕوانە ڕێبازەكانی سۆفیگەری). شێخ مەحموود، كە ڕابەرێكی ڕێبازی قادری بووە، و پاش جەنگی یەكەمی جیهانی شۆڕشێكی دوانزە ساڵەی دژ بە ئیدارەی بریتانیا لە عێراق بەرپاكردووە و لە ئەنجامدا خۆی بە "مەلیكی كوردستان" جاڕداوە "بڕوانە مێژووی نوێ". خۆی بە نەوەی برایەكی سولتان سەهاك لە پشتی دوانزەیەم داناوە، هەرچی یارسانیەكانن، لەو باوەڕەدان سولتان سەهاك ئادەمیزادێكی نائاسایی بووەو بە بەرجەستەكەرێكی هەرە پایە بەرزی ڕووحی گشتیگریی دادەنێن و گوایە چەندین سەدە ژیاوە و خاوەنی توانای لەڕادەبەدەر بووە و ئێستا وەكو گیانێكی جیهان پارێزی چیانشین لەناو ئەشكەوتەكان و بە لووتكە هەرە بەرزەكانی چیاكانەوە دەژێ.

سەهاك شێوەیەكی یەكجار گۆڕاوی ضەحاك یان دەهاكە، كە لە هەمان كاتدا لەقەبی شاهانەی دوا پادشایی مادەكان، ڕشتی - ڤێگا ئەژی دەهاك بوو (بڕوانە مێژووی هەرە كۆن). ناوەكە لە چەندین باسی مێژوویی قۆناغەكانی كلاسیك و ناوەندیدا كە هەرێمی زاگرۆس دەگرنەوە بەرچاو دەكەوێ، هەروەها لە باسی هەموو ئەو شوێنانەشدا كە كوردی لێ نیشتەجێ بووە، بە ئەرمەنستانیشەوە. بۆ نموونە، باس لە سانت سەهاك بارتەڤێك دەكرێ كە پەترەكی كەمینەی ئەرمەنی بووە و لە كۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی پاش میلاددا ژیاوە هەروەها گەلێ ڕووناكبیری تری سەدە ناوەندەكانی ئەرمەنستان هەمان ناویان هەیە. لەم كاتەدا كوردێكی زۆر لە ڕۆژهەڵاتی باشوورەوە بەرەو ئەرمەنستان ڕەویان دەكرد (بڕوانە مێژووی كلاسیك و كۆچكردنە مێژووییەكان).

بە گوێرەی بۆچوونی یارسانیەت، ئادەمیزادان دوا بەرهەمی گەشتی جیهانیی پڕ گۆڕانی ڕووحن لە پێشدا ڕووح گەشتەكەی بە چوونە ناوەوەی شتی بێ گیان دەست پێدەكا، كە ئەو پرۆسەیەی تەواو كرد ڕووح دەچێتە ناو شینایی ئینجا زیندەوەرەوە و لە كۆتاییدا، دەچێتە لەشی پیاوێك یان ژنێكەوە. بەو جۆرە ئەو كەسە، ژن بێ یان پیاو، چوار سرووشتی تێدا دەبێ: هی شتەكان، هی شینایییەكان، هی زیندەوەرەكان و ئیجا هی ئادەمیزاد. لەكاتی چوونە ناو لەشی ئادەمیزاددا، ڕووح دەست دەكا بە گەشتێكی تری فرە جێگا، كە لەوانەیە (١٠٠١) جار دۆناودۆن بكێشێ، تا بە پێوەری كات بگا بەو (٥٠٠٠) ساڵەی بۆ تەمەنی گەردوون دانراوە. بەمە ئەوترێ قۆناغی دۆناودۆن (كە بە مانای " لە جەستەیەكەوە بۆ جەستەیەكی تر" لێك دەدرێتەوە، یان گەشتی ناو لەشێكی مردوو بۆ ناو یەكێكی تر، یان لە دۆنێكەوە بۆ دۆنێكی تر كە هەمان مانا دەدا) لە كۆتایی ئەم گەشتە گۆڕان ئامێزەدا كەسەكە پیاوبێ یان ژن دەگاتە ڕزگاری و دەبێ بە مرۆڤ، مرۆڤێكی پاكیزە و تەواوی ئەوتۆ كە شایستەی پلە نوێیەكەی بێ لە ئاسمانە بڵندەكاندا و بۆ یەككگیریی تەواو لەگەڵ ڕووحی گەردوونییدا بەهەزرێ.

ڕزگار بوون لە یارسانیەتدا ئەركی سەرشانی ئەو كەسە خۆیەتی. كۆمەڵگا هیچ بەرپرسیاریەكی نیە یارمەتی كەسێك بدا بگا بە مرۆڤیەتی. تەنانەت ئەو دەستی یارمەتیەش كە لەلایەن ئامۆژگارو ڕابەرە ئایینیەكانەوە درێژ دەكرێ، خوایشتیە نەك ئەركی سەرشان.

بوون یان نەبوونی ئەم یارمەتییە پەیوەندی بە بارودۆخی ڕووحی كەسانەوەنیە. لەڕووی بنەماكانەوە، مرۆڤ دەتوانێ بگاتە پلەی بەرزی مرۆڤیەتی، تەنها ئەگەر ماوەیەكی زۆری تەمەنی بە كۆششی سەختەوە بەسەر بەرێ، لەوانەیە دەورەیەكی تەواوی (١٠٠٠) دۆناودۆنی ژیانی بوێ (دوا ژیانی دوای هەزارەم ژیانی ڕزگاریە و بە دۆناودۆن نازمێرێ) كەسانی گوناهبار لەوانەیە لە شێوەی شێواوی زیندەوەرێكدا دۆناودۆن بكرێن و ئەوكاتە ژیانی ئەو زیندەوەرە ناچێتە ناو (١٠٠٠) ژیانەكەوە، هەروەها دۆناودۆن كردن بۆ ناو لەشی منداڵێكی تازە لە دایكبوو كە نەگاتە ٤٠ ڕۆژ ناكرێ. ئەگەر پاش (١٠٠٠)ساڵی دۆناودۆن یان پاش (٥٠٠٠٠) ساڵەی گەردوون (كامیان لە پێشدا ڕوو بدەن) گیانێك نەیتوانی خۆی بۆ پلەی ئادەمیزاد بەرز بكاتەوە، ئینجا لەگەڵ گیانە سەرنەكەوتوەكانی تردا، لە ڕۆژی دوا دادگایی – یان پەردێوەریدا – پردی پەڕینەوە دادگایی دەكرێن.

سەبارەت بەم باوەڕە قایمە بە دۆناودۆن، یارسانیەكان كەمتر بۆ مردووەكانیان سوێ دەخۆن چونكە ئەوان وا چاوەڕێ دەكەن بە زووترین كات بگەڕێنەوە، ئەگەر هەر یەكسەر نەگەڕێنەوە لە گیانی ئادەمیزادێكدا كە تازە لە دایك دەبێ. ڕاستییەكەی، هەتا ڕابردوویەكی نزیك ڕابەرە ئایینیەكان كەمتر ناویان لە منداڵێكی تازە لە دایكبوو دەنا كەوا گیانی كەسێكی مردوو هاتبوە ناو لەشیەوە.

جیا لە لقەكانی تری تیرەی فریشتەكان، یارسانیەت خاوەنی كتێبێكی خودایی پیرۆزی وەكو هی ئەوان نیە.

لەجیاتی كتێب، كۆمەڵێك وتەیان هەیە پێی دەڵێن "كەلام" لەپاڵ هەندێ داب و دەستووردا كە پێی دەڵێن "دەفتەر" و هەردووك لای ئەوان پیرۆزن. هەردوو نووسراوەكە، لە كات و سات و بەچەند زمانی جیاواز نووسراون و هەر نووسینە، لە سەردەمیكدا دانراوە كە لە مێژووی درێژی ئەواندا شوێن پەنجەی هەبوە. هەرە گرنگترینی "كەلام"ەكان "سەرەنجام"ە كە بە "كەلامی خەزنە"ش ناسراوە "كە لەوانەیە بەمانای گەنجینە بێت" و بریتییە لە وتەكانی سوڵتان سەهاك و چاكەكانی سەردەمی ئەو، هەروەها هی كەسایەتیە ئایینیەكانی یارسانیزم كە بەر لەو هاتوون. ئەم كتێبە بە سەرچاوە دادەنرێ و لە هەموو ئەوانی تر كاریگەرترە، كارەكە بە شیعر دانراوە و بەشێوەی هەورامانی سەر بە زاراوەی گۆرانی هەڵبەستراوە (بڕوانە

زمانەکان). کەلام و دەفتەرەکانی تر هەموو بە گۆرانین، بەڵام هەندێکیان بە لوڕی و فارس و زاراوە تورکی نما جۆراوجۆرەکانن. بابەتە نووسراوەکانی تریان، بریتین لە "دەورەی بەهلوول "کە دەڵێن: لەلایەن بەهلوول ماهی ناوێکەوە (بەهلوولی میدی) نووسراوەکە لە سەدەی هەشتەمی پاش میلاددا ژیاوە، ئەم نووسراوە بە شیعر و بە جۆرە گۆرانییەکی فەرسوودە نووسراوە. هەروەها "شانامەی حەق" کە نیعمەتوڵلای جەیحونابادی موکری و "بورهان" کە نوورعەلی ئیلاهی نووسیویە، هەردووك لەم دوا دواییانەدا بە فارسیەکی پڕ لە وشەی گۆرانی نووسراون و لە چەندین جێگەش ئایەتی قورئانیان بە عەرەبی تێ ترێنجراوە ئەمانە هەموو بە بابەتی پیرۆزی یارسانیەت دادەنرێن.

مەڵبەندی یارسانیەت وا لە قووڵایی هەرێمی گۆرانان، لە شاری گەهوارە (یان گەوارە) (٤٠)میل ڕۆژەڵاتی کرماشان. مەزارگەی "بابا یادگار" وا لە دێیەك کە هەر ئەم ناوەی پێوەیە و (٥٠)میل لە گەهوارەوە دوورە و ئێستا لای یارسانیەکان بە پیرۆزترین جێگا دادەنرێ.

دوو ڕۆژ پێش ئاهەنگەکانی ساڵی تازە، یان نەورۆزە، (بڕوانە میهرەجان و جەژن و ئاهەنگەکان و ساڵنامە). هەواداران بار و بارگە لێدەنێن و ڕوو دەکەنە ئەو مەزارگەیەو لەوێ دەکەونە شایی و سەیران و خوێندنی بابەتی ئاینی لە بارەی بنەما ئایینییەکانی یارسانیەتەوە، مامۆستاو ڕابەری ئاینی، یان پیر، بابەشێك دەخوێنێتەوە کە لە شێوەی پرسیاردایە، هەوادارانیش بە بابەشێکی تر وەڵامی دەدەنەوە، نەریتی جەدەل بازی لە کار و باری ئایینیدا و سروودەکانی ناو ئاهەنگە ئایینیەکان، مێژوویەکی قووڵی لە هەرێمی زاگرۆسدا هەیە. هەر ئەم نەریتە باوە بە بابەتە ئایینیەکانی زەردەشتەکانیشەوە دیارە وەکو "زەندی ئاوێستا" و سامانی شیعری هەموو ئەو گەلانەش کە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسەوەن—یەکێك لەو دەستوورە ئایینیانەی کە یارسانیەکان لەم بۆنەیەدا دەیکەن سەربڕینی کە لە شێرە. (کەڵەشێر لای یەزیدیەکان وەکو بانگدەری هەڵاتنی ڕۆژ ڕێزی لێدەگیرێ بۆیە ئەم نەریتەی یارسانیەکان بە کارێکی حەرام و بە هیچ جۆرێك کردەنی نازانن).

هەرچەندە پاشماوەی ئەو سامانی باوەڕ و داب و دەستوورە ئایینیانە سرنجکێش و جێی ڕێزن بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە بەشێکی زۆریان لە بیر چوونەتەوە، یان کۆزەر و بەربا کراون، یان بەشێوەیەك گۆڕراون. ئەم دیاردەیە گشت لقەکانی تیرەی فریشتەکان دەگرێتەوە.

هەرە گرنگترنین زاراوە ئایینییەکان، سەردەمبەندیی ڕووداوەکان، یان شتە هەرە تەوەرییەکانی ئاینەکە، لە چیرۆك و ئەفسانە باوەکانی ناو کۆمەڵ یان پڕوپووچ بازیەکانی ناو مێژوو و بابەتە دروستکراوەکانی کارگەی مێشکی تیژ خەیاڵی "پیر"ەکانی یارسانانەوە

دەرچووە. بۆ نموونە، بۆ ڕووداوەكانی ساجناری و پردێوەر لە بارەی ئەڤراندنی گەردوونـەوە، بـە هەیبـەت و ڕێزێكـی زۆرەوە ئاهـەنگ دەگێـڕن، بـەڵام جگـە لـە ئاهـەنگگێڕان بـەوڵاوە و تروسكەیەكی كزی لێدەرچێ فریان بە ئەسڵی بابەتەكەوە نییە. هەموو زانیارییان لە بارەیانەوو لە هەندێ قسە و باسی لە بابەوە بۆ كوڕ هاتوو بەوڵاوە بڕ ناكا.

شتێكی سەیری تری ناو هـەوادارانی یارسـانیەت، هێشتنەوەی سمێڵ و تەنانـەت بنپـەڕچ نەكردنیشیەتی، ئەوەتە سمێڵـەكانیان تـا بـڕوا بەردەدەنـەوە، لـە كاتێكدا ڕیشیان لـە بنـەوە دەتاشن. ئەم دەستوورە لە ئیسلامدا قەدەغەیـە (چـونكە دەبـێ سمێـڵ هەمیشە بـە كـورتی بهێڵرێتەوە). ئەمە پاشان بوو بە نیشانەیەكی گشتی بۆ شیعە سەختگیرەكان، كە ئەوانیش لـە عەلەویەكان وەریان گرت. دەمووچـاوی تیـف تیفـە دراوی پادشـا سـەفەویەكان، سمێڵـە فـشە زلەكانیانی لێدەرچێ، وەكو لە وێنە دەسـكردەكانی ئـەو سـەردەمەیاندا دەردەكـەوێ، دەكـرێ بكرێ بەنموونە بۆ هەموو هەوادارانی ئەمڕۆی تیرەی فریـشتەكان، ئـەم دەسـتوورە ئێـستا لای زۆرایەتی شیعەكان دەستی لێ هەڵگیراوە، چونكە لە دابی گشتی ئیسلامدا نەی لێكـراوە، بۆیـە ئێـستا تـەنها بـۆ سەرسـپردەكانی تـیرەی فریـشتەكان، بەتایبـەتی یارسـانیی و یەزیدیـەكان، ماوەتەوە.

هەوادارانی یارەسانیەت ئێستا بە چڕی لە باشووری كوردستان و بـە پەڵەپـەڵە لـە شـوێنی تری دەرەوەی كوردستاندا وەكو چیاكانی ئـەلبورزو ئازەربایجـان و عێـراق نیشتەجێن (بڕوانـە خـشتەی ژمـارە ٥). بابـە تـاهیری (هەمـەدانی–وەرگێـڕ) شـاعیری بـەناوبانگی سـەدەكانی ناوەڕاست و (أديب الملك)ی شاعیری ناسراوی سەدەی نۆزدەیەم لە هـەوادارانی ئـەم تیرەیـەن (نـەك هـەر ئەمـە، بابـا تـاهیر یەكێكـە كـە وردە بەرجەسـتەكەرەكانی پلـەی دووی دەورانـی سـێیەم). كـوردە سـارڵییەكان، كاكەییـەكان و بازەڵانـەكان (كـە بـە باجـەڵان و بـەژەروانیش ناسراون)، كە بەشێوەی پەڵە پەڵە لێرە و لەوێ هەر لە قەسری شـیرینەوە بگـرە تـا دەگەیتـە كەركووك و لـەوێوە بـۆ موسـڵ نیشتەجێن، هـەموو جـۆری جۆراوجـۆری یارسـانیەتن. ئێـستە هەوادارانی یارسانیەت ١٠–١٥٪ی گشت كوردان پێكدێنن.

خشتەبەندی ژمارە(٦) دەورانەکانی دروستبوون و ناوی بەرجەستەکەرەکانی ڕووحی گەردوونی لە یارسانییەتدا

| ڕووحی گەردوونی(هەق) | | بەرجەستەکەرەکان (باوەکان) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دەوران | پلەی یەک زاتی بەشەر | پلەی دوو(زاتی میهمان) | | | | مێیینە |
| | | | | | | | |
| | ١ | خاوەندگار | جبرائیل | میکائیل | ئیسرافیل | عیزرائیل | ؟ |
| | ٢ | عەلی | سەلمان | قەمبەر | محەمەد | نوصەیر | فاتیمە |
| | ٣ | شاه خۆشین*(میثراس) | باوە بزورك | کاکە ڕەزا | پیری شالیار | بابە تاهیر | مامە جەلالە |
| | ٤ | سوڵتان سەهاك* | خدر (بنیامین) | داوود | پیرمووسی باوە یادگار* | ئیبراهیم تەیار** | دایراك ڕەزبار |
| | ٥ | قرمزی (شاه وەیس) | قەمبەر (دەستەوەر) | یاریجان | یار عەلی | شاه سوار | زەڕبانوو |
| | ٦ | محەمەد بەگ (نوور بەخش) | کامەریجان | کامەلەك | ؟[?] | قەرەپۆست | دۆستی |
| | ٧ | ئاتەش بەگ | جەمشید بەگ | ئەڵماس بەگ | عەلادین خان | عەبداڵ بەگ | پەری خانم |

سەرچاوەکان:— خەزانە، شانامەی حەقیقەت، بورهان.

* گوایە باوکی نەبوە.

* گوایە باوکی نەبوە.

* گوایە باوکی نەبوە.

** گوایە دایکی نەبوە.

؟ یان نەیبوە, یان زۆری هەبوە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: V. Minorsky, "Ahl-i Haqq," in *The Encyclopaedia of Islam*; Mohammed Mokri, *Le Chasseur de Dieu et le mythe du Roi-Aigle* (Wiesbaden: Otto Harrassowitz, 1967); Shâh-Nâma-ye Haqiqat, French commentary and partial translation by Mohammad Mokri (Paris: Institute Français d'Iranologie, Bibliothèque Iranienne, 1971); Robert Canfield, "What They Do When the Lights Are Out: Myth and Social Order in Afghanistan," paper presented at the ACLS/SSRC Joint Committee on the Near and Middle East Conference on Symbols of Social Differentiation (Baltimore, 1978); Reza M. Hamzeh'i, *The Yaresan: A Sociological, Historical and Religio-Historical Study of a Kurdish Community* (Berlin: Klaus Schwarz Verlag, 1990); W. Ivanow, *The Truth-Worshippers of Kurdistan: Ahl-i Haqq Texts* (Leiden: Brill, 1953); V. Minorsky, "Notes sur la secte des Ahlè Haqq," *Revue du Monde Musulman* 40–41 (1920 and 1921); Mohammed Mokri, *Recherches de kurdologie: Contribution scientifique aux études iraniennes* (Paris: Klincksieck, 1970); Dale Eickelman, *The Middle East: An Anthropological Approach* (Englewood Cliffs: Prentice-Hall, 1981); Henry Rawlinson, *Journey from Zohab to Khuzistan* (London, 1836); Henry Rawlinson, "Notes on a march from Zohab," *Journal of Royal Geographic Society* (London, 1839); John Macdonald Kinnier, *A Geographical Memoir of the Persian Empire* (London, 1813); John Macdonald Kinnier, *Journey through Asia Minor, Armenia and Koordistan, in the years 1813 and 1814* (London, 1818); Edith Porada, "Of Deer, Bells and Pomegranates," *Iranica Antiqua* vii (1967); Mohammed Mokri, *L'Esotérisme kurde* (Paris, 1966); Matti Moosa, *Extremist Shiites: The Ghulat Sects* (Syracuse: Syracuse University Press, 1988); M. Rekaya, "Mâzyâr: Résistance ou intégration d'un province iranienne au monde musulman au milieu du IXe siècle ap. J.C.," *Studia Iranica* 2 (1973).

# عەلەویەت

زۆرینەی زۆری کوردە دیمیلیەکانی ئەنەدۆڵ و هەندێ لە درواسیێ کرمانجی دووەکانیان هەواداری لقێکی تیرەی فریشتەکانن، بەمانە تۆپ دەڵێن عەلەوی (هەوادارانی عەلی) یان (ئەڵەویان)، کە دەنگ لە ئاگر پەرستی یان زەردەشتیەتەوە دەدا و دەچێتەوە سەر ئەڵەو (هالاوی کوردی – وەرگێڕ) واتە "ئاگر" یان قزلباشەکان "سەرسوورەکان" سەبارەت بە مێزەرە سوورەکەی سەریان، (بڕوانە جل و بەرگ و خشل). هەروەها نووسەیریەکان (کە دەکرێ وەکو "نەسرانیەکان" واتە مەسیحی یان وەکو "هەوادارای" نەرسە"ی شۆڕشگێڕی کوردی سەرەتای سەدە ناوەندەکان کە سەرکردەیەکی بزووتنەوەی خۆرەمیە بوو و خۆی و هەوادارانی لە ئەنەدۆڵ گیرسانەوە) دەگرێتەوە، عەلەویەکان عەلی بە هەرە گرنگترینی بەرجەستەکەرە سەرەکیەکانی ڕووحی گشتگیر دادەنێن لە دەورانی دووەمی ژیانی دنیاییدا (بڕوانە یارسانیەت). سۆزی یەکجار پڕ جۆش و خرۆشیشیان بۆی وەکو ئیمامێکی مسوڵمانی شیعە مەزهەب هەر لەوێوە هەڵدەقوڵێ. لەوانەیە ئەو ناوەی پێیانەوەیە لەم ڕاستییەوە سەری هەڵدابێ، بەهەمان شێوەی کە خەڵکی دەرەکی ناوی عەلیوڵلاهی (عەلی پەرستان)یان بەسەر یارسانیەکاندا. یەك شت هەیە کە دەبێ سرنجی لێ بدەین ئەویش ئەوەیە، بە پێچەوانەی یارسانیەتەوە، عەلی لە عەلەویەتدا دوو کەسایەتی هەیە، عەلەویەکان ئیمام عەلی و محەمەد پێغەمبەر پێکەوە دەکەنە یەك کەس و پێی دەڵێن: عەلی محەمەد و ئینجا بە یەك تاقە بەرجەستەکەری دادەنێن، بەلام ئەم تاقە بەرجەستەکەرە بە دوو شێوە دەردەکەوێ. بنیاتنەری زنجیرەی سەفەویە، واتە شاه ئیسماعیلی یەکەم، لە نووسینەکانیدا، ئەگەر خۆی بە (حەق) واتە ڕووح ناو نەبردایە ئەوا خۆی بە عەلی محەمەد ناو دەبرد.

هەرچەندە عەلی لەناو ئایینی ئیسلام و لقە جیا جیاکانییدا خۆشەویست و گرنگبێ عەلەوییەت بە تەواوی بە ئایینێکی ئیسلامی دانانرێ بەڵکو هەر بە بەشێك لە تیرەی فریشتەکان دەمێنێتەوە وەکو لقەکانی تری تیرەکە، لایەنی ئایینی و بنەڕەتیی عەلەویەت هەرگیز لەگەڵ نامەو ڕووحی قورئاندا لە بابەتە گرنگەکاندا ناگەنەوە یەك، لە کاتێکدا ئایینە

سەربەخۆ ناسامییەكان لەگەلیّ لاوە لەگەلّ ئیسلامدا یەك دەگرنەوە.

عەلەویەت ئێستا لەلایەن گەلیّ لە عەرەبەكانی سوریاوە پەیرەوی لیّ دەكریّ و ڕێژەی عەلەویەكان خۆی دەدا لە (١٣٪)ی دانیشتووانی ئەو وڵاتە. لەویّ زیاتر بە نووسەیری دەناسرێن و مەڵبەندەكانیان پتر دەكەونە شارە بەندەریەكانی كەناری دەریاوە وەكو لازقیەو تەرتووس، كوردیش وەكو پێكهاتەیەكی ئەتنی سەردەمانێك لەو هەرێمە زۆر بوون و ئێستا ئەوان زۆرتر نەك هەر لە باكوور بەڵكو لە ڕۆژهەڵاتی ئەوێشەوە بەرەو شاری حەما هەر هەن، بەم جۆرە عەرەبە عەلەویەكان، یان عەرەبی لە ئایین وەرگەڕاو یان كوردی تواوەن (بڕوانە كۆچكردنە مێژووییەكان) سەرۆكی ئێستا، حافیز ئەلئەسەد، عەلەویە (یان وردتر بڵێین، نووسەیرییە سەیری لای خوارەوە بكە). لە سەردەمی خاوەندارێتی فەرەنسەدا، ئەم هەرێمەی سوریا، لەبەر ئەم تایبەتمەندیە ئایینییەی كرابو بە هەرێمێكی ئۆتۆنۆمی.

گەلیّ لە توركمانەكانی توركیا، كە هاوسنووری كوردەكانن و لە چیاكانی تۆرۆس و پۆنتۆس لە نزیكی شارەكانی ئەدەنە، سیواس، توقات، ئەماسیا دەژین، هەواداری عەلەویەتن، بە پێچەوانەی سوریاوە، عەلەویە غەیرە كوردەكانی ئەنەدۆلّ لە بنەكانەوە وەرگەڕاوی توركن نەك تەواوەی كورد ڕەسەن. شان بەشانی عەلەویە كوردەكان ئەم توركمانانەن بڕبڕەی پشتی ئەو هێزە چەكدارە بوون كە پشتی لە سەر پاوەستانی سەفەویەكانی لە ئێران گرت (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی هەرەزوو). ئێستا توركمانە عەلەویەكان، ئەگەر لە كوردەكان زیاتر نەبن كەمترنین، شەبەكەكانیش كە لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی مووسلّ جێگیرن لە كوردستانی ناوەند و دراوسێی باجەڵانە یارسانیەكانن، پەیڕەویی جۆرێك لەم عەلەویەتە دیمیلیە دەكەن.

دیمیلیە عەلەویەكان لە یارسانیەكان زیاتر پەیوەندییان لەگەلّ تیرە ئارییایە كۆنەكاندا هەیە، لە داب و دەستوورە ئایینیەكانی ئەماندا، كڕنووش بردن بۆ ڕۆژ و مانگ و خوێندنی سرووود و ویردی ئایینی زۆرتر دەكریّ. ئەمان بە كۆبوونەوەی جەمخانە دەڵێن "ئایینی جەم". جەمی هەرە گەورەیان كۆبوونەوەی هەرە گەورەی ساڵانە لەگەلّ جەژنی قوربانی موسوڵماناندا یەككات دەكریّ واتە ئەو كاتەی دەكەوێتە كۆتایی حەجكردنی مسوڵمانانەوە بۆ مەككەو تێیدا مەڕێك دەكریّ بە قوربان. جەم (كە لەناو زەردەشتیان بە جەمشید و لەناو ڤیدادا بە یەما ناسراوە) لە داب و دەستووری زەردەشتیەكاندا قارەمانی مەزنی ئارییایەكانەوە

جەژنگێڕانی نەورۆز – ساڵی نوێی کورد و ئێرانیەکان–بەخۆشی ئەو و بۆ ئەو تەرخانکراوە. بە گوێرەی ئەو چیرۆکە ئەفسانەییەی لەم بوارەدا هەڵبەستراوە، جەم لە کۆتایی ماوەی دەسرۆیشتنیدا ئەلایەن ئەژی دەهاکەوە کراوە بە قوربانی. ئەوەی ڕاستە، لە شانامەی فیردەوسیدا، کە بەناوبانگترین داستانی نەتەوەیی ئێرانیەکانە، جەمشید وەکو "ڕۆژ و مانگ پەرست" باسکراوە، (بڕوانە ئەو فەسڵەی کە باسی دەرکەوتنی زەردەشت دەکا) عەلەوییەکانیش هەر باوەڕیان وایە.

ئایینی جەم، لە بنەکانەوە، لە شێوە و لە پلەی ئایینیشدا، بەرامبەری جەمخانەی یارسانیەکان و جەمی یەزیدیەکانە–عەلەویەکان، سەرباری هەموو بەیت و بالۆرەی خەڵکانی دەرەکیی، هێشتا هەر دەرفەتێکی باشیان بۆ ژنان هێشتۆتەوە بۆ بەشداریکردن لە بۆنە وداب و دەستووره ئایینیەکاندا، بەتایبەتی لە گێڕانی ئایینامەکانی ئایینی جەمدا. ئەمەیە، بێ کەم و زیاد، کە دەرەکیەکان پەنجەی تیر و توانجی بۆ درێژ دەکەن و بە ئاهەنگی تێک بەربوونی نێر و مێ، یان "پف لە چراکردن" باسی دەکەن کە لەوەبەر ئاماژەمان بۆ کردووە.

هەندێ لە عەلەویەکانیش، هەروەها یەزیدیەکانیش، هێشتا لەسەر داب و دەستوورێك دەڕۆن کە ئێرانیەکانی سەردەمانی هەرەزوو دەیانکرد، واتە کڕنووش بردن بۆ شمشێری لە زەمین چەقێنراو، بە نیشانەی پەرستشی خواوەند. مارك سایکسی ساڵی ١٩٠٨ باسی بەجێهێنانی ئەم ڕێ و ڕەسمە دەکا لەناو هەندێ هۆزی دیمیلی دا: وەکو بۆسیکانەکان، کوریانەکان، هەروەها وا دەیەوێ زەکیریەکان و موسیەکان، و سارمیەکانیش بخاتە پاڵیان، هەرچەندە دەڵێ لەو کاتەدا ئەو شتە کەی نووسیوە، ئەم سیانەی دوایی دەستیان لە گێڕانی بۆنەکە هەڵگرتوە. هیرۆدۆتس باسی هەمان ئایین دەکات کە گوایە سیثی و سارماتیە ئێرانیەکان (واتە خزمانی کوردەکان و گەلە ئێرانیەکانی تر) (٢٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر لە ئوکرانیا گێڕاویانە (لێرەدا لێکچوونی ناوی هۆزی سارمی دیمیلی نەژاد و سارماتیەکان جێی سرنجە) وێنەی شمشێری لە زەمین یان کەرتە شاخ ڕۆکراو، بێگومان، لە بیرۆکەی هاوشێوەی بریتانی دەچێ و زۆر لە وانەشە پەیوەندیەکیان لەنێواندا هەبێ. ساڵی ١٧٥ی پێش میلاد، مارکۆس ئۆریلیۆس تیپێکی لە سارماتیەکان لە پانۆنیا (هەنگاریای ئێستا)وە نارد بۆ ئینگلتەرە و سکۆتلەندە (ناوی سەرکردەکەیان لوشیاس ئەرتۆریەس کاستەس بوو). بە گوتەی گێڕانەوەی

نیكل لەوانەیە بنەمای ئەفسانەكە لەلایەن ئەم سامارتیانەوە هاتبێتە بریتانیاوە و بەم جۆرە لەوانەیە بچێتەوە سەر بابەتی هاوشێوەی عەلەوییە دیمیلیەكان. دیمیلیەكان دوا كۆمەڵی ئێرانین كە هێشتا هەر ئەم داب و دەستووره دێرینە دەگێڕن.

هەندێ گەڕیدەی ئەوروپایی كە لەم دواییانەدا هاتوونەتە ناوچەكە، لە دەمی خەڵكەوە دەگێڕنەوە كەوا هەندێ لە قزڵباشەكان گەماڵێكی ڕەشی زل وەكو بەرجەستەكەرێكی خودایی دەپەرستی (Driver 1921-23).

هەرچەندە شێوازی گێڕانەوەكەی درایڤەر گاڵتە ئامێزە چ بە عەلەویەكان چ بەوەی دەیكەن، كە وێ دەچێ خۆشی زۆر باوەڕی بەڕاستی نەبێ، ڕێزگرتن لە سەگ وەكو سمبولێكی چاكی (بەرامبەر بە مار كە سیمبولی خراپەیە) بابەتێكی یەكجار دێرینە. هەر ئەم بابەتە خۆی بەشێوەی جۆراوجۆر لە هەموو ئایینە گنۆستییە كۆنەكاندا بەدی دەكرێ، بەتایبەتی میترائیەت (Jones 1963).

بەرز و پیرۆزڕاگرتنی عەلی لە پلەی خوداییدا لەلایەن عەلەویەكانەوە، چ لای قەرەقۆینلوەكان چ لای سەفەویەكانی هەرەزوو بوو بە نیشانەی هەرە زەقی ئایینی بۆ هەردوو لایان، ئەمەش شان بەشانی داب و دەستووره نا ئیسلامانەكانی تریان، تا بڵێی زیاتر لە دەوروبەرە ئیسلامەكانیان تا كاندیانیەوە، بۆیە بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی ئەو دراوسێیانەیان و سەپاندنی ئایینی عەلەوی بەسەریاندا، ناچار خۆیان دایە پاڵ شیعەچیەتییەوە. لەناو خەڵكدا ئەوان بەگشتی بە قزڵباش ناویان دەركرد، واتە ئەو ناوەی ئێستاش كوردە دیمیلییە عەلەویەكانی ڕۆژاوای ناوەندی ئەنەدۆڵ خۆیانی پێوە دەشەنگێنن ئەم ناوچەیە هەمان ناوچەیە كە لە سەردەمی پانزەیەمدا بزووتنەوەكە سەری لێوەهەڵدا.

لە سەدەكانی (١٥) و (١٦)دا عەلەویەكان دوو ڕاپەڕینیان بەرپاكرد. بۆ پێكەوەنانی هێزی پێویست بۆ هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینەكان دوو هۆكار یەكجار پێویست بوون: ١) ئەو دەسكەوتە دیموگرافیە بێ وێنانەی كە كوردەكان لەنێوان سالانی (١٤٠٠ و ١٥٢٠)داوە دەستیان هێنا (بڕوانە دیموگرافی) و ٢) وەرگەڕانی زووتری ژمارەیەكی زۆر لە هۆزە توركمانەكانی ئەنەدۆڵ و قەفقاسیا بۆ سەر ئایینی تیرەی فریشتەكان. پیشتگیرە هەرە زووەكانی عەلەویەت، كە زۆریەی مێژوونووسەكان بە ئیسلامە توندڕەوەكان ناویان دەبەن، بریتی بوون لە بنەماڵەی

پادشاهی قەرەقۆینلوی تورکمان، کـە ئەوکاتـە هـەموو ئێرانـی ئێستا و قەفقاسیا و ڕۆژهەڵاتـی ئەنـەدۆڵ لـە قەڵـەمڕەوی ئەوانـدا بـوو (بڕوانـە مێـژووی سـەدەکانی ناوەنـد) لایـەنگیریکردنی قەرەقونیلۆەکان لە تیرەی فریشتەکان و دوورکەوتنەوەیان لە ئیسلامەتی لـەو سـەردەمەدا زۆر ئاشکرا و ڕوونە. تەنانەت ئەمڕۆکەش پاشماوەکانی ئەم بنەماڵەیە کە لە سۆڤیەتی بـەرێ و لـە ئازەربایجانی ئێراندا دەژین، بـەگوێرەی قـسەی مینۆرسـکی، هـەواداری تـیرەی فریشتەکانن. لیستەی ئەو هۆزە کوردانەی کە لە بنەکانەوە بەشداربوون لە شۆڕشە عەلـەوی سرووشـتەکەی سەفەویەکاندا، نـاوی شـاملوەکان، شـێخەوەندەکان، شـادلوەکان، خاجەوەنـدەکان، زەفراتلـو (زەعفەرانلو)ەکان، ستاجلو (ئیستاجلو)ەکان و کوڤانلو (کوڤا)کانی تێدایە. هەموو ئـەم هۆزانـە ئێستاش هەر ماون و هەر کوردیشن (بڕوانە خشتەی ژمارە ١).

ئێستاکەش کـوردە دیمیلیـەکان، کـە بـە ئـایین عەلـەوین، هـەر ئـەو مێـزەرە سـوورەیان بەسـەرەوەیە کـە نـاوی قزڵبـاش واتـە "سـەر سـووری" لکانـدوە بـەم شۆڕشـگێڕانەوە. لـەو کوردانەدا کە عەلەوی نین، ڕێ و شوێنی ئەم قزڵباشانە تەنها لەناو بەرزانیەکاندا ماوە، سـەرانی گەلەهۆزی بارزانی، کە لە سەردەمانێکی دێرینەوە ڕابەرایەتییەکی تۆکمەی ئاینیشیان کردووە، لە گشت بـەدەر سـەر بـەرزی ئەوەشـیان هەیـە کـە وەکـو نیـشانەیەکی ئـایینی ئـەم مێـزەرە سوورەیان بۆ خانەوادەکەیان کردووە بەنیشانە (بڕوانە جـل و بـەرگ و خـشڵ) ڕەنگـی سـوور، هەروەها، مۆرکی تایبەتی بزووتنەوەی مەزدەکی و خوڕەمیەکانیش بـوو، کـە بـە بـاوانی بـیر و باوەڕی عەلەویەت دادەنرێن.

هەر وەکو یارسـانیەت، هەنـدێ لقـی عەلەویـەتیش، لەبـەر چـەندین هـۆی جیاجیـا، زۆر لـە شیعەگەریی باو نزیکتر بوونەتەوە و بە درێژەی سەدەکانی ١٥–١٧ یارمەتیان داون بگەنە ئـەم دۆخەی ئێستایان و لەم نزیکبوونەوەیـەدا بـە ئەنـدازەی ئـەهلی هەقـە هـەوادارەکانی نورعـەلی ئیلاهی لە شیعەگەریی چوونەتە نواوە، (بڕوانە یارسانیەت).

بەڵام هەرچییەك بکەن بۆ ئەوەی خۆیان وەکو ئیسلام یان شـیعەی دڵگـەرم دەرخـەن، بـە هیچ پیودانگێکی قورئان هیچیان هەرگیز ناچنە ناو خانەی ئیسلام یان شیعەیەتیەوە.

عەلەویەت بەردەوام لای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئایینێکی نەنگەویست بووە، سوڵتانەکان کـە خۆیـان بـە جێگـەداری پێغەمبـەر دادەنـا، لـە هـەمان کاتـدا سـوفیگەرییەکی یـەکجار

توندڕەوانەیان دەکرد، هەر بۆیەشە عەلەویەکان تووشی چەندین قەتلوعام بوون لەسەر دەست یان بە پەنجەی دەوڵەت پاش ئەوەی ئەنەدۆڵی ڕۆژهەڵات ساڵی ١٥١٤ لەسەر دەستی سولتان سەلیم لە قەڵەمڕەوی ئێران قرتێنرا و خرایە سەر دەوڵەتی عوسمانی.

لەگەڵ ئەمەشدا، عەلەویەکان هێشتا بە ئەندازەی یەزیدیەکان بەر زوڵم و سەرگەردانی نەکەوتوون، چونکە لە ژمارەدا لەوان زیاتر بوون، تەنانەت ئەمڕۆکەش هەوادارانی خۆیان دەدەن لە (٢٠٪)ی هەموو کوردان.

زوڵم و ستەمی چەندین سەدەی سەرکۆمەڵگای عەلەوی لەلایەن عوسمانیەکانەوە و هەمیشە گومانی دڵسۆزیان بۆ ئێرانیەکان هەرگیز بە ڕووخانی ئیمپراتۆرەیەتی ئالی عوسمان کۆتایی نەهات، بەڵکو بۆ سەردەمی ڕژێمی نوێش درێژەی کێشا بەتایبەتی لە (١٩٢٢) بەدواوە، هەرچەندە ڕژێمی کۆماریی کەوتە هەڵدانی بانگی عیلمانییەت و ئێرانیش لە خانەی دوژمن دەرچوو و هاتە خانەی دۆست و هاوپەیمانەوە، تەنها لەم دواییەدا هاتەوە یادی ئەنقەرە کەوا هیچ هۆیەکی ئەقڵگیر نیە چ عەلەوی و چ بەکتاشیە ئایین براکانیان ببوغزێنن. بە پێچەوانەوە، سیاسەتێکی ئەوها تەنها زیانی لێ دەکەوێتەوە، چونکە ئەم سیاسەتە بوو کە کوردە عەلەویەکانی (کە لە دوو لاوە خۆیان بە ستەم لێکراو دادەنا، لەسەر کورد بوون لەلایەك و لەسەر عەلەوی بوونیش لەلایەکی ترەوە) خستە ناو بزووتنەوە سیاسیە هەرە سەروەشێن و ڕادیکالییەکانەوە. هەڵوێستی یاخیگەریانەی عەلەویەکانی ئەم سەردەمە دژ بە دەوڵەتێکی ستەمگەر، یەکێك لە بزووتنەوەکانی پێشتری هەوادارانی تیرەی فریشتەکان دێنێتەوە یاد (واتە هی مەزدەکیەکان و خوڕەمیەکان) و ئەو توندڕەویەی کە لەوانەوە بە میرات بۆ شیعەکان مایەوە.

ئێستا دەوڵەتی تورکیا ڕێز لە عەلەویەت وەکو ئایینێکی "خۆواڵتی" هەرێمی ئەنەدۆڵ دەگرێ. نەك هەر ئەمە، بەڵکو بە ئامانجی تەرازوبەندی لەگەڵ بزووتنەوە ئیسلامیە سوونیە توندەکانیشدا، ئەنقەرە بەڕەسمی سەرپەرشتی گێڕانی هەندێ لە ئاهەنگەکانی عەلەویەکانیش دەکا هەرچەند لە کراسێکی نیشتمانی و میللی دەئاڵێنێ (بڕوانە میهرەجان و جەژن و ئاهەنگەکان و ساڵنامە).

لەم باسەدا، نابێ نوسەیریەت، واتە ئەو لقەی عەلەویەت لەبیر بخەین، کە بریتیە لە

تێکەڵکردنی بیر و باوەڕی تیرەی فریشتەکان لەگەڵ هەندێ داب و نەریتی عەرەباندا، لەسەر دەستی ئەو کوردە کۆچەرانەی کە بە دوای لەوەڕدا هاموشۆی هەرێمە کناردەریاییەکانی سوریایان دەکرد، لەبەر ئەوەش کە هەوادارانی بۆ نوسەیریەت لەم سەردەمەدا ئیتر خۆیان بە کورد ناخوێننەوە، لایەنی تێڕامان و داب و دەستوورەکانیان هەر ئەوەندەی لێماوە کە باسی دەکەین. ئەوان لەجیاتی عەلی، سەلمان بە بەرجەستەکەری هەرە گەورەی رووح دادەنێن، دوای زاتی پەروەردگار. سەلمان، ئێرانی بوو و یەکێك بوو لە ئاوەڵەکانی محەمەد، کەسایەتییەکانی تری ئیسلام لە پلەی دەورانی دووەمدا دادەنرێن (کە گرنگترین پلەی سەرزەمینە) لە ژیانی گەردووندا، بەهەمان شێوە کە لە عەلەویەتدا هەیە. جەژنە ساڵانە سەرەکیەکانی نووسەیریەکان رێك دەکەنە هەمان رۆژانی جەژنە سەرەکیە ساڵانەکانی یەزیدیەکانەوە. هەر دوولا پێکەوە (٢١ی مارت)، میثراکان (کە نووسەیریەکان میثراجانی پێ دەڵێن و لە ٦–١٣ ئوکتۆبەردا دەیگێڕن) و جەژنی یەزید (٢٥ی دیسەمبەر) دەگێڕن. جەژنی چوارەم کە یەزیدیەکان بە بۆنەی تیرەگانەوە لە کۆتایی مانگی تەمووزدا دەیگێڕن، لای نووسەیریەکان، سەدە دەچێتە جێی و لە مانگی کانوونی دووەم (جانوەری) دادەگێڕێ، واتە لەو کاتەدا، کە مەسیحییەکان جەژنی (خۆنقوم کردنEpipheny) دەگێڕن.

جیاوازی هەرە گەورەی نێوان نووسەیریەت، بگرە هەموو پەیڕەوانی تیرەی فریشتەکان، لە شەقامەڕێی ئاییندانیە، بەڵکو لە دیدی گشتیدایە بۆ کاروویاری کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لە مەسەلەی ژندا. بە تەواوەتی بە پێچەوانەی دید و رەفتاری کوردانەوە، بەڵام رێك و هاوشان لەگەڵ رەفتاری ئایینە سامیەکانی تردا، نووسەیریەکان زۆر بە چاوی سووکییەوە سەیری ژن دەکەن و لە پلەیەکی زۆر پاییندا دایدەنێن، ئەوی ڕاست بێ ئەوان لەو باوەڕەدان کە ژنان، هەر وەکو شت و حەیوان، رووحیان نیەو لەوانەیە رووحی پیاوێکی گوناهبار پاش مردنی بچێتە ناو پۆستی ژنێکەوە، تاکو ماوەیەکی ژیانی ژان کێشان و پاکبوونەوە لەوێ بەسەر بەرێ. هەر بۆیەشە ناوی فاتیمەی کچی پێغەمبەر محەمەد، لەناو لیستەی بەرجەستەکەرە سەرەکیەکانی ئەواندا، وەکو (فاتم) براوە. ئەوان لەو باوەڕەدان ئەو نێرینە بووە و تەنها بۆیە خۆی لەشێوەی ئافرەتدا دەرخستووە، تا نەوەکانی عەلی، حەسەن و حوسەین کە هەم نیرینەن و هەم ئیمامیشن، لێی ببن. ئەم بۆچوونە، بەرامبەرگیریەکی ئاشکرایە بۆ ئەو پلەوپایە بەرزەی کە

ژنان لە هەموو لقەكانی تیرەی فریشتەكاندا هەیانە و كە بەو پێیە لە هەر یەكێك لە قۆناغـەكانی نۆنـاونۆنی ڕووحــدا، بەرجەســتەكەرێكی ســەرەكیی مێینــە هــەر وەكــو خــشتەی ژمــارە (٦)داهاتووە، دەبێ هەڵكەوێ، (هەروەها بڕوانە بارودۆخی ژنان و ژنانی خێزانی).

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: P.J. Bumke, "Kizilbas Kurden in Dersim (Tunçeli, Türkei):Marginalität und Häresie," *Anthropos* 74 (1979); "The Kurdish Alevis: Boundaries and Perceptions," in Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); N. Yalman, "Islamic Reform and the Mystic Tradition in Eastern Turkey," *European Journal of Sociology* 10 (1969); F.W. Hasluck, "Heterodox Tribes of Asia Minor," *Journal of the Royal Anthropological Institute of Great Britain and Ireland* 51 (1921); Matti Moosa, *Extremist Shiites: The Ghulat Sects* (Syracuse: Syracuse University Press, 1988); James Reid, *Tribalism and Society in Islamic Iran, 1500-1629* (Malibu: Undena, 1983); Klaus Müller, *Kulturhistorische Studien zur Genese pseudo-islamischer Sektengebilde in Vorderasien* (Wiesbaden: Franz Steiner Verlag, 1967); P. Butyka, "Das ehemalige Vilayet Dersim," *Mitteilungen der kaiserlich-königlichen Geographischen Gesellschaft* 35 (Berlin, 1892); Peter J. Bumke, "Kizilbasç-Kurden in Dersim (Tunceli, Türkei): Marginalität und Häresie," *Anthropos* 74 (1979); Krisztina Kehl-Bodrogi, *Die Kizilbasç/Aleviten: Untersuchungen über eine esoterische Glaubensgemeinschaft in Anatolien* (Berlin: Klaus Schwarz Verlag, 1988); Rev. Henry H. Riggs, "The Religion of the Dersim Kurds," *Missionary Review of the World* 24 (1911); Hanna Sohrweide, "Der Sieg der Safaviden in Persien und seine Rückwirkungen auf die Shiiten Anatoliens im 16. Jahrhundert," *Der Islam* 41 (1965); Melville Charter, "The Kizilbash Clans of Kurdistan," *National Geographic Magazine* 54 (1928); Trowbridge, "The Alevis," *Harvard Theological Review* (1909); Helmut Nickel, "The Dawn of Chivalry," in Ann Farkas et al., eds., *From the Land of the Scythians* (New York: Metropolitan Museum of Arts, n.d.); Richard Antoun and Donald Quataert, eds., *Syria, Society, Culture, and Polity* (Albany: SUNY Press, 1991); Albert Hourani, *Minorities in the Arab World* (London: Oxford University Press, 1947); L. Molyneux-Steel, "Journey into Dersim," *Geographical Journal* 44-1 (London: 1914); M. Rekaya, "Mise au point sur Thèophobe et l'alliance de Bâbek avec Thèophile (839/840)," *Byzantion* 44 (1974); J. Rosser, "Theophilus' Khurramite Policy and Its Finale: The Revolt of Theophobus' Persian Troops in 838," *Byzantia* 6 (1974); Hans Jonas, *The Gnostic Religion* (Boston: Beacon, 1963).

# یەزیدیەت

پەیڕەوانی ئایینی یەزیدیەت، کە چەندین ناویان بۆخۆیان هەلگرتووە وەکو یەزیدی، یەزدانی، ئیزەدی، و دەسنەییش، لەلایەن خەلکی دەرەکییەوە بە مەبەستی تەوس و سووکی پێکردنەوە زۆرتر بە "شەیتان پەرست" ناویان دەبەن، بە ژمارە (٥٪)ی کۆی کوردان پێکدێنن، ئێستاکە بەشێوەی پەڵەپەڵەی پەراگەندە زۆرتر لە باکووری ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژهەلاتی سووریا، لە قەفقاسیا، لە باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا، بە بناری چیاکانی سنجارەوە لەسەر سنوورەکانی عێراق – سوریا و لە هەندێ ناوچەی باکووری شاری مووسڵ لە عێراق دەژین.

وەکو لقێك لە لقەکانی تیرەی فریشتەکان، یەزیدیەت سەروکارێکی زۆری لەگەڵ فریشتە و فریشتەبەندییدا هەیە. ناوەکەیان، واتە یەزیدی، لە وشەی (یەزاتا) یان (یەزدا) وەرگیراوە کە وشەیەکی کۆن یان ناوەندی ئێرانیە و بە مانای "فریشتە"دێ. بەو جۆرە ئەوانەی لەسەر ئەو ئایینەن ناوی "فریشتە پەرستان" وەردەگرن، ئەوان شەیتانیش دەخەنە ناو ئەم فریشتانەوە و بە "مەلەك تاوس"– واتە فریشتە تاوس– ناوی دەبەن. لای ئەوان شەیتان فریشتەیەکی پاکی بلوورینە و هیچ لەکەیەکی تاریکی و خراپەی پێوە نیە و سروشتی پڕا و پڕ سروشتی فریشتانەیە. نەك هەر ئەمە بەلکو گەلێ زیاتر بە خاوەنی توانا و دەسڕۆیوی بەسەر کاروباری دنیادا دایدەنێن.

لەمانەش زیاتر، لای ئەوان مەلەك تاوس ئەفرێنەری دنیای ماددیە و بۆ ئەم مەبەستە پارچەی لێکترازاوی توخمی بتەکانی، یان مرواری گەردوونی بەکارهێناوە کە لە دوو توێی خۆیدا ڕووحی پاراستوە.

هەرچەندە (دەڵێن) هەموو کتێبە ئایینیە سەرەکییەکانی یەزیدیەکان چاپکروان و وەرگێڕاوشیان پەیدا دەبن، کەچی هیشتا هەر پرسیاری زۆری قووڵ و سەرەکیی لە بارەی دید و تێڕوانینیانەوە بۆ گەردوون و ژیان لە ئارادان. بۆ نموونە مەسەلەی ئایا شەیتان هی چ چەرخێکی ژیانی گەردوونییە و جێگەی لە چ پلەو پایەیەکدایە هێشتا ساخ نەکراوەتەوە

ڕهێڵراوەتەوە بۆچوون و چرا و لێكدانەوە. بێگومان نابێ ئەو بە چاوی ڕووحی گەردوونی تەماشا بكرێ، چونكە ڕووح نابێ لە كرداری ئەفراندندا دەستی هەبێ. چ لە یارسانیەت، چ لە عەلەویەتدا خاوەندەگار، خودای پەروەردگار، وەكو یەكەم بەرجەستەكەری ڕووح، ئەركی ساجناری — دروستكردنی گەردوون دەگرێتە ئەستۆ. لەمەوە مرۆۋ زیاتر بەلای ئەوەدا دەشكێ. كەوا لە باوەڕی یەزیدیاتیدا شەیتان، لەجیاتی خودی خاوەندگار ئەركی دروستكردنی گەردوون دەگرێتە ئەستۆ، هەردوو كتێبی پیرۆزی (جلوە) و (مەسحەف) كە لەمەوپاش باسیان دەكرێ، ئەم بووچوونە بە ڕوونی باس دەكەن ئەم وەرگێڕانەی خوارەوە كە لەم دوو نووسراوە وەرگیراون هەموو لە نووسینەكەی گێست (Guest1981) وەرگیراون. جلوە دەڵێ:
"مەلەك تاوس بەر لە هەموو فریشتەكان هەبوە" و "من" مەلەك تاوس لە ئامێزی نەمریدا بوومە و دەبم، بەسەر هەموو خەلقەندەكاندا حوكمڕانم، جێگە نیە منی تێدا نەبم، هەر چەرخە بەرجەستەكەری خۆی هەیە و ئەمە لەسەر ڕێنمایی من دانراوە، هەر پشتە لەگەڵ سەرداری ئەم دنیایەدا دەگۆڕێ، بۆیە هەر یەكە لەم سەردارانە، لە سەردەم و زەمانی خۆیدا، ئەركی سەرشانی خۆی بەجێدێنێ، نابێ فریشتەكانی تر دەست وەردەن لە كردەوەكانی من: چی و چۆن بڕیاردەم هەر وا دەبێ". ئەو سیفەتانەی بەكارهێنراون هەمان ئەوانەی خاوەندگارن لە یارسانیەت و عەلەویەتدا. مەسحەف لەسەر ئەوە دادەگرێ كەوا "لەسەرەتادا خودا— كە هەر ڕووحی گەردوونی دەگرێتەوە—مرواری سپی لە گەوهەری هەرە گرنگی خۆی دروستكرد، باڵندەیەكی بە ناوی ئەنقەر خولقاند و مرواریەكەی نایە سەر پشتی و چل هەزار ساڵ بە پشتیەوە مایەوە، لە یەكەم ڕۆژدا (هی خولقاندن) كە یەكشەمە بوو فریشتەیەكی خولقاند و ناوی نا عەزازیل كە مەلەك تاوسە و كە سەرداری هەمووانە..." ئینجا مەسحەف لەسەری دەڕوات و باسی شەش فریشتەی تر دەكا، كە هەر یەكەیان لە ڕۆژەكانی ئەم هەفتەیەدا خولقێنراون و لە دەورانی یەكەمدا دروستكراون. ناوی ئەم فریشتانە دەقاودەق ئەوانەن كە لە یارسانیەت و عەلەویەتدا هاتوون، وەكو لە خشتەی ژمارە (٦)دا باس كراون. یەك جیاوازی هەیە، ئەویش ئەوەیە لەجیاتی شەش باسی حەوت بەرجەستەكەر كراوە، و بەم جۆرە ئیتر ڕووح لە كاروباری دنیادا دەوری نامێنێ. ئەمە، بە هەرحاڵ دەرەنجامی ئەو شڵەژانەیە كە پاشان كەوتۆتە لێكدانەوەی دروستكردنی گەردوونەوە و لەوانەشە ئەمە لە تەئسیری

مەسیحیەت—جوولەکەیەتی دوور نەبێ، بەشەکانی تری فەسڵی یەکەمی مەسحەف تەرخانکراوە بۆ باسی بنچینەی مرۆڤ و زۆرتر لە بۆچوونی جولەکە مەسیحی کە لە چیرۆکی ئادەم و حەوا و تیکەڵییان لەگەڵ شەیتاندا هاتووە نزیکە، هەرچەندە شەیتان، کە لێرەدا بە ئیبلیس ناو دەبرێ، تەنها وەکو ڕاوێژکار و ڕێ نیشاندەرێك یارمەتیان دەدا، بۆیە بە بەرپرسی هەموو خەڵقەندەکانی دنیا دانراوە.

چیرۆکی ڕاستەقینەی چەرخی یەکەم، بەهەرحاڵ لە یەك ڕستەدا و بەشێوەیەکی ئەومومژاوی لە کۆتایی بەشی یەکەمی مەسحەفدا بە پرتاوێك تێپەڕ دەکا.. وردبوونەوە لە ڕستەکە، باش دەریدەخا کە چەند لەگەڵ بۆچوونە سەرەکیەکانی تیرەی فریشتەکاندا تەبان، ڕستەکە دەڵێ: "ئەو لە جەوهەر و ڕووناکی خۆی شەش بەرجەستەکەری خولقاند، ئەم خولقاندنە وەکو ئەوە وابو چرایەك بە چرایەکی تر داگیرسێنی". بۆیە دروستە گەر وا هەڵێنجین کە بە باوەڕی بنچینەیی یەزیدیان شەیتان بەرجەستەکەری هەرە پێشەکیی ڕووحی گەردوونی بوە لە چەرخی یەکەمدا، و گشت شتەکانی تر لە بارەی دیدی گەردوونی تیرەی فریشتەکانەوە وەکو خۆی، بێ هیچ گۆڕانێك، دەمێنێتەوە... شەیتان خۆی، لە شێوەی مەلەك تاوس (فریشتە تاوس)، لە پەیکەری باڵندەیەکی لە تووج دروستکراودا خۆی دەنوێنێ و وەکو ڕەمزێکی پیرۆز کە ناوی "ئەنزەل واتە دێرین"ە هەموو ساڵێك لە "جەمی" هەرە گەورەدا لە لالش پیشانی هەواداران دەدرێ.

لالش هەر شوێنی ئەو ئایینگێڕیە نیە، بەڵکو مەزارگای شێخ ئادی کەسایەتی هەرە بەرزی ئایینی یەزیدیشە. دەوری ئادی لە یەزیدیایەتیدا، هەر وەکو ڕۆڵی سەهاك وایە لە یارەسانیدا و عەلی لە عەلەویەتدا. بەلای یەزیدیەکانەوە شێخ ئادی گرنگترین بەرجەستەکەری ڕووحی گەردوونە لە دەورانەکانی پاش دەورانی یەکەمدا. ئادی وەکو بەرجەستەکەرێکی سەرەکیی کەواتە بەرهەمی دۆناودۆنکردنی مەلەك تاوس خۆیەتی، ئەمڕۆکە پاش ئەوەی تۆزوگەرد لەسەر وێنە و باس و خواسی لادراوە و گوایە مێژووی پاکلەمەکراوە، بە دامەزرێنەرێکی سەرەکیی یەزیدیایەتی دادەنرێ. ئەوەی جێی سرنجە یارسانیەکانی ئەم سەردەمە هەر بەمەوە ناوەستن، تەنانەت بەهاوچاخی مێژوویی سوڵتان سەهاك واتە سەدەکانی (١٢–١٣)شی دادەنێن، (بە قسەیەکی تر لە دەورووبەری هەمان سەردەمدا کە دەوترێ بەکتاشی پیری

عەلەویەت تێیدا ژیاوە و كەوتۆتە دارەڕا دانان و دروستكردنی لقی عەلەویەت). بە گوێرەی قسە، چ ئادی چ سەهاك زیاتر لە سەدەیەك تەمەنیان بەسەر بردووە.

جگە لە پەیكەرە گەورە و بە هەیبەتەكەی باڵندەی "ئەنزەل"، مەلەك تاوس شەش بەچكە پەیكەری تری هەمان شێوەی هەن، بە هەر یەكێكیان دەوترێ "سەنجەق" واتە "ئەبرەشیە" مەبەست ئەبرەشیەی كۆمەڵگەی یەزیدیە–و هەریەكەیان هی ناوچەیەكن لەو ناوچانەی یەزیدیانی تێدا دەژین، هەر ساڵە ئەم سەنجەقانە بۆ پەرستش گرِدەدرێن بە ئەبرەشیەكانی سوریا و زۆزان (واتە ساسوون ساسۆن یان كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا لە ئەنەدۆڵ)، ئینجا هی سنجار و شێخان (واتە دەوروبەری زێی گەورە)، ئینجا تەورێز (ئازەربایجان)، ئینجا هی مسقۆف (موسكو، یان قەفقاسیای سۆڤیەتی).

سەنجەقەكانی تەورێز و مسقۆف چیتر گرِ نادرێن چونكە یەزیدیەكی ئەوتۆ لە ئازەربایجان نەماون و، حكوومەتی دژ بە ئایینی سۆڤیەت بەریگرتووە لە سەنجەق گێڕیی بۆ ناو كۆمەڵگەی یەزیدی نشینی قەفقاسیا.

یەزیدیایەتیش چون لقەكانی دیكەی تیرەی فریشتەكان كتێبی پیرۆزی ئاسمانیی تایبەتی خۆی نییە، ئەگەرچی چەند نووسراوی پیرۆزیان هەیە كە بیر و دەستوورەكانیان تۆپ لە خۆگرتووە، نووسراوێكی كورتی (٢٥٠٠) وشەی بە عەرەبی هەیە كە ویردەكانیان لە خۆگرتن كە ناوی "جلوە" واتە "دەركەوتن"ە و گوایە شێخ ئادی دانەریەتی. لەپاڵ ئەمەدا، كتێبێكی دوور و درێژشیان هەیە كە پێی دەڵێن: "مەسحەف ڕەش" واتە "پەرتووكی ڕەش" كە بە كوردی نووسراوە و گوایە شێخ حەسەنی ئادی دایناوە (دەوروبەری ١١٩٥ پاش میلاد)، كە نەوەی شێخ ئادی خۆیەتی.

مەسحەف ناسێنەرێكی باشی یەزیدتیە چونكە بابەشێكی زۆری لە بارەی دید و بۆچوون و بیركردنەوەی یەزیدیایەتیەوە تێدایە، هەرچەند پرِیشە لە بابەتی دژ بەیەك و لێك نەچوو و تەمومژاوی (گەلێ زیاتر لەوانی یارسانیەت).

لەوانەیە مەسحەف لە سەدەی (١٣)دا دانرابێ. لە كۆندا بەشێوەیەكی كوردی كرمانجی نووسرابوو، كە لە سەدەی (١٣)دا شێوەی باوی هەرێمی هەكاری بوو (بڕوانە كرمانجی). ئادی خۆی و حەسەنی نەوەی لە وڵاتی هەكاری بڵندبوونەوە و هەرچەندە یەزیدیەكان لەو

باوەڕەدان کە ئادی لە دۆڵی (بیقاع)ی لوبنان لە دایکبووە، بەڵام پاشان بە "عەدی ئەلحەکاری" واتە ئادی هەکاری ناوی دەرکردووە.

لە چوار جەژنە ساڵانە سەرەکییەکەی یەزیدیەکان (بڕوانە میهرەجان و جەژن و ئاهەنگگێڕان و ساڵنامە) دوانیان زۆر جێگەی سرنجن، واتە جەژنی جەم و ئاهەنگەکانی یەزید.

جەژنی هەرە گرنگی یەزیدیان، جەژنی ڕۆژەی (جەم)ە، کە تێیدا پەیکەری باڵندەی "ئەنزەل" دەردەخرێ و بە هەواداران نیشان دەدرێ. ئەم جەژنە دەکەوێتە (٦) و (١٣)ی ئۆکتۆبەر (تشرینی یەکەم)ەوە و ئامادەبوونی بۆ هەموو یەزیدیان پێویستە و گرتنی دەبێ لە لالش بێت، لالش دەکەوێتە باکووری موسڵەوە و شوێن ئارامگای ئادی و کەسایەتییە، پیرۆزەکانی یەزیدیانە بە حەسەنیشەوە. ئەم وادەیە هاوکاتە لەگەڵ (میثراگانی) گەورە جەژنی دێرینی ئاری نەژادان (میهراگانی زەردەشتیان و میهرەجانی نووسەیریان) (بڕوانە عەلەویەت)، کە بە گوێرەی داب و دەستووری هەمووان لە ناوەڕاستی ئۆکتۆبەردا دەگێڕێ، میثراگانە دێرینەکان، خولڤاندنی دنیایان لەلایەن میثراسی خواوندەڕۆژە وە بە جەژنگیری دەگێڕا. لەو جەژنەدا میثراس گای پیرۆز سەردەبڕێ و لالشە پەلپەلکراوەکەی بۆ خولڤاندنی ژیانی ماددی بەکاردێنێ. لە ئاهەنگگێڕانەکەی لالشدا چەند سوارێك گایەك دەگرن و بە دەوری ئارامگای شەمسەدین "ڕۆژی ئایین"دا دەیگێڕن، بەر لەوەی سەریببڕن و گۆشتەکەی بەسەر زیارەتکەران (حاجیان)دا ببەخشێننەوە.

یەزید، کە کەسایەتیەکی سەرسووڕێنەرە، لەلایەن ئیزەدیانەوە بەشێوەیەکی نەختێ ئاڵۆز ڕێزگیری لێدەکرێ، ئەو بە دانەری بناغەی ئایینەکە دانراوە (ناوەکەشی بۆ ئەم قسەیە بەڵگەیە)، یان پاش مەلەك تاوس بە هەرە گەورەترین کەسایەتی ئایینەکە، واتە بەرجەستەکەری ڕووح دادەنرێ (هەندێ کەس دەیباتە هەمان پلەی مەلەك تاوسەوە)، هەندێ جاریش لەلایەن یەزیدیانەوە دەکرێ بە یەزیدی کوڕی موعاویەی (٦٨٠–٦٨٣ پاش میلاد) خەلیفەی بەنی ئومەییە...، کە لای شیعەکان بە بەدترین دوژمن دادەنرێ. ئەم ڕچەڵەکبەندیە ساختەیە زیاتر لەلایەن حکوومەتەکانی سوریا و عێراقەوە قاوی بۆ دەدرێ (تا بەو جۆرە یەزیدیەکان لە کوردەکانی تر بپچڕنەوە و بیانبەستن بە ئومەییەکانەوە و بەو جۆرە بە عەرەب خانەبەندییان بکەن)، هەر لەو سۆنگەیەشەوە دەستیان داوە بە پشتی بنەماڵەی هەرە

بەناوبانگی (چۆلی) یەزیدیدا، جل و بەرگی عەرەبی لەبەر خۆ کەن و ناوی خەلیفەکانی بەنی ئومەییە لە خۆیان و نەتەوەکانیان بنێن، بەڵام ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیکە ناوەکە هەر دەچێتەوە سەر "یەزاد" واتە فریشتە، و بەو پلەو پایەی کە فریشتە لەناو یەزیدیاندا هەیەتی هەبێ و نەبێ لە فریشتەی ئەوان زیاتر نییە. ئەم شێوانە سەیرە کە کشاوەتە ناو ڕابەرایەتی یەزیدیانەوە بە جۆرێك کە کەسایەتی نەتەوەیی یانی لەقکردووە، کارێکی سەرسووڕێنەر نییە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو هەموو زوڵم و زۆرە لێکدەینەوە کە لە ڕابردوودا لێیان کراوە سەرەڕای ئەو هەموو بە ئاردی ناو دڕککردن و وێرانکردنەی بەسەر سامانیی ئایینی مێژوویی کۆنی یەزیدیان هاتووە و لە شتێکی کەم بەولاوە هیچی وای لێ نەهێشتووە.

بەپێی دید و بۆچوونی یەزیدیان لەمەڕ مەسەلەی پەیدابوونی گەردوونەوە، مەلەك تاوس هێلکە یان مرواری ئەزەلیی گەردوونی لەت لەت کردووە و لە لەتێکی جیهانی ماددی دروستکردووە. لەوانەیە لە بنەکانداو لە یەزیدیایەتی هەرە کۆندا ئەم مەلەك تاوسە خودی میثراس بووبێ و دوایی لە قۆناغی تردا بووبێ بە شەیتان. دووەم جەژنی هەرە گرنگی یەزیدیان زۆرتر ڕووەو ئەم ڕەهەندە دەچێ. ئەم جەژنە یادگاری لە دایکبوونی یەزید زیندوو دەکاتەوە و لەنێوان ناوەڕاست و کۆتایی دیسەمبەر (کانوونی یەکەم)دا دەگیرێ. لە دایکبوونی لە، یان نزیك، داهاتنی زستان، لەگەڵ میثراسدا گرێی دەدا، (پاشان میثرایزم لە سەدەی یەکەمی (پ. ز)دا بە ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا لەم سەرزەمینەوە تەشەنەی کرد و هەر وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، جەژنی تەمومژاوی میثراس بە مەزەندە خرایە (٢٥)ی دیسەمبەرەوە)، ئەم جەژنگیریە لە گرنگییدا هاوشانی جەژنی جەمی مەزنەکە لە ئۆکتوبەر (تشرینی یەکەم)دا دەگیرێ و جەژنگیریەکە بە سێ ڕۆژ ڕۆژوو دەستی پێ دەکرێ.

لە دیدی یەزیدیدا بۆ مەسەلەی دروستبوونی جیهان، باڵندە دەورێکی یەکجار تەوەرەیی هەیە لە هەموو ڕووداوە سەرەکیەکاندا کە لەبەر زۆری لێرەدا جێی یەك یەك ژماردنیان نیە پیرۆزڕاگرتنی دەرکەوتنی خواوەند لە شێوەی باڵندەیەکدا، واتە مەلەك تاوس، هەروەها پیرۆزڕاگرتنی باڵندەیەکی تر، واتە کەڵەشێر، دوو نموونەی بەرچاون لەم بوارەدا. ئەوەی زۆر مایەی سرنجە، بەڵام کەمتر لێکدراوەتەوە. ئەوەیە کە تەنها (٣٠)میل لەولای ئارامگاکانی لالشەوە، مەڵبەندە شوێنەواریەکانی شانیدەر– زەوی چەمی هەن کە بایەخێکی ئەرکیۆلۆژی

گـەورەیان هەیـە لـە کوردسـتانی ناوەنـددا، و تێیانـدا (سـۆلیکی) شـوێنەوارناس لـە کەندەکارییەکانییـدا هەنـدێ گـۆڕ و پاشمـاوەی باڵـە باڵـداری دۆزیوەتـەوە، بەتایبـەت کـە هەندێکیان هی چێرگ یان مێشەسی گەلێ گەورەن، و هـی (٣٠٠) سالێ کەمتر یـان زیاتر لـە (١٠٨٠٠) ساڵی ڕابردوون. پاشماوەکان بەڵگەی بەجێهێنانی هەندێ داب و دەستووری ئایینین کە باڵندە بەشێك بوون تێیاندا و لەوانەشە، باڵە زلەکانیان وەکو بەشێك لـە پۆشاکی پیاوانی ئایینی بەکارهێنرابن (بڕوانە Soliki.1944).

دەرکەوتنی باڵی باڵداران بە کەلەشـی خوداوەندانـەوە، دویماکـار بـوو بـە هونـەرێکی بـاوی مێزوپۆتامیا، بەتایبەتی لەو نەخشکاریانەدا کە ئاشووریەکان بۆ پادشاکانیان لەسەر تاشە بەرد هەڵیانکەندبوون. ئەوەشمان لە بیردابێ کە نەینەوای پایتەختی ئـەم ئاشـووریانە بـە باشـی لـە ئاسۆگەی لالشەوە دیارە. لێکگرێدانی هونەرییانـەی بـاڵی باڵنـدەو بوونـەوەری بـێ بـاڵی وەکو ئادەمیزاد (بۆ وێنەبەندیی خودایان) یـان شـێر (بـۆ وێنەبەنـدی درنـج) یـان گـا (بـۆ وێنەبەنـدی پادشاییان) یان ئەسپ (بۆ وێنەبەندی ئەسپی باڵدار)، هەروەها بۆ ڕازاندنەوەی بەرگی پیـاوانی ئایینی، لە گەلێ فەرهەنگ و کەلتووردا شتێکی باوە، بەڵام دەرخـستنی خوداوەندایـەتی هـەرە بەرز لە شێوەی باڵندەیەکی پڕ باڵ و پەڕدا تەنها هـی یەزیدیانـەو کەسـی تریـان هاوبـەش نیـە تێیدا. بەڵگەگەلێ لەسـەر داب و دەسـتووری قوربـانی سـەربڕین کـە لـە (زەوی چـەمی) هـەرە دێریندا بەجێهێنراوە، لەوانەیە بەهێزترین بەرجەستەکەری داب و نـەریتی پشتاوپـشت بـێ کـە ئێستاش یەزیدیان هەر لەسەری دەڕۆن.

ئەو باڵندەیەی پەیکەرەکەی لە بۆنەگێڕیەکانی لالشدا گڕ دەدرێ، هەر وەکو بە ناوەکەشـی دیارە بێیە کودوو تاوسـە، بـەڵام نـە لـە کوردسـتان و نـە لـەم مەرزوبوومـەی ئاسـیادا هـەرگیز نەبیستراوە تاوس هەبووبێ. لەو منەکاریانەوە کە لـە زەوی چـەمییدا کـراون، مێشەسی زیـاتر دەچـێتە سـەر پەیکـەرە باڵندەکـەی یەزیدیـەکان. مێـشەسی کەتـە یەکێکـە لـە باڵنـدە خـۆ وڵاتیەکانی کوردسـتان و لـەوێ بـە(شـەوات) بەناوبانگـە (بڕوانـە شـینایی و زینـدەوەر). کلکـی ڕەنگا و ڕەنگـەو زیـاتر لـە کلکـی عەلەشـیش دەچـێ (هـەروەها لـە کلکـی تاوسـیش دەچـێ هەرچەندە گەلێ لە کلکە تاوس بـچووکترە)، بێگومـان ئەگـەر لـە بـاری مەنتیقیـشەوە سـەیری مەسەلەکە بکەین، مێـشەسی گـەلێ نـزیکترە لـەم داب و دەسـتوورە کۆنینەیـەی یەزیدیـەکان،

چونکە ئەو خۆولاتیەو تاوس باڵندەیەکی هیندستانیە.

دەستووری سێ جار چەمانەوە بەرانبەر رۆژ لەگەڵ هەڵاتنیدا شان بەشانی خوێندنی ویردی تایبەتی لەلایەن یەزیدیەکانەوە، لەلایەن عەلەویەکانیشەوە دەکرێ (بروانە Nikitin1956).

یەزیدیەکان دابێکی تریشیان هەیە کە بریتییە لە پێشوازی کردنی "جەستەی رۆژ" بە ماچکردنی تیشکەکانی کە یەکەمجار دەدەن لە قەدی داران (Kamuran Ali Bedirkhan1934).

نیشانەیەکی بەرچاوی دیکەی عەلەویەکان، کە بریتیە لە بەرجەستەکردنی خواوەند لە شێوەی شمشێرێکی یان خەنجەرێکی لە زەوی چەقاودا، لە یەزیدیایەتیشدا هەیە، هەرچەندە مەبەستەکەی لای ئەمان کارووباری پەرستش نییە، بەڵکو بۆ پەیماندان و سوێندخواردن بەکاردێ (بروانە Bellino1918،Alexander1928 ).

جگە لەو چینە ئەریستۆکراتەی کە توێژی زووربنەی کۆمەڵگای یەزیدی پێکدێنێ، ئەم پێکهاتەیە وێکچوونێکی زۆری لە رووی سیستەمەوە لەگەڵ ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیە چینبەندیە سفتەدا هەیە کە لە سەردەمی ئیمپراتۆری زەردەشتی ساسانیاندا باویوو.

موغەزەردەشتیەکان، نەیاندەهێشت هیچ کەسێك کە سەر بەچینی موغ یان شازادە نەبێ، دەم لە رووناکبیری و خوێندەواری بدا. یەزیدیایەتی دێرینەواریش بە توندی دژی خوێندەواریە و قەدەغەی کردووە (هەندێ لە یارسانیەکانیش لەسەر هەمان رێباز دەڕۆن). ڕاستییەکەی لە چەند سەرچاوەوە نووپات کراوەتەوە کەواتا سەرەتای ئەم سەدەیە تەنها یەك کەس لەناو یەزیدیاندا، ئەویش ئەمینداری جلوە بوە، خوێندەواری هەبووبێ و توانیبێتی شت دەرکا Guest 1987.23)).

ئەم قەدەغەکاریە ئێستا ئاسەواری تا رادەیەکی زۆر براوەتەوە، هەرچەندە خڵتەی، وەکو نەریتێکی کۆن، هێشتا لە مێشکی هەندێك یەزیدیدا هەر ماوە، بۆیە بە گشتی ئەوەندە بە تەنگ خوێندەواریەوە نایەن.

ئەوەی جێی سرنجە، دەوڵەمەندترین شێخ و مەلای یەزیدی، بەرگ و لەچك و عەگالی عەرەبیی بەدەویانە لەبەر و لەسەر دەکەن و بەهەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەدوون و ناوی عەرەبی ئاساییشیان هەیە کەچی پیاوماقووڵ و رابەرە ئایینیە هەژارترەکانیان ناوی

کوردیان هەیە، تەنها بە کوردی دەدوون و بەرگ و مێزەری ئادەتیی کوردی لەبەر دەکەن و لەسەر دەنێن، (بڕوانە Lescot، 1938).

هەر لە زۆر زووەوە، واتە لە دەورووبەری سەدەی حەڤدەیەمەوە، بنەماڵەی میرانی (چۆل)یان ڕابەرایەتی دێرینەواری کۆمەڵگای یەزیدییان کردەوە، ئەوان پاش زنجیرەی ئەو میرانە، کاری میرایەتی یەزیدیان گرتە دەست کە دەڵێن لە شێخ حەسەنی دانەری مەسحەفەوە کەوتوونەتەوە (چۆل)یەکان لە ڕووی ئابووری و هەموو لایەنێکی ترەوە لەلایەن هەر یەزیدیەکەوە پاڵپشتی دەکرێن. بەجێهێنانی فرمانە ئایینیەکان، هەر وەکو یارسانیەکان، وا لە دەستی ئەندامانی حەوت بنەماڵەی پشت لە دوای پشت هاتووی ئایینیدا، کە (چۆل)یەکان یەکێکیانن.

بچووکیی کۆمەڵگای یەزیدی لەم سەردەمەدا، مرۆڤ دەخاتە نەختێ بەدگومانیەوە، لەو سەردەمەدا کە سەلاحەدین ئەنتاکیەی داگیرکرد، یەزیدیەکان لە هەموو شیوو ڕۆڵەکانی ئەوناوە، لە چیاکانی ئەمانۆس کە بەسەر کەناری دەریادا دەڕوانن، زۆریەی هەرە زۆری دانیشتووان بوون، و لە سەدەی (١٣)و کۆتایی سەدەی (١٤)دا، ولاتی یەزیدی نشینیان بە وەرگەڕاندنی مسوڵمان و مەسیحیەکی زۆر بۆ سەر ئایینەکەی خۆیان، لە ئەنتاکیەوە گەیاندبووە ورمێ و لە سیواسەوە گەیاندبوویانە ولاتی کەرکووك. لە پەنای ئەمەشدا هێزێکی سیاسی و سوپایی گەورەشیان بۆ خۆیان لێك دابوو. لەو چەرخەدا میرەکانی ولاتی جەزیرە (مێزوپۆتامیای ژووروو)، هەروەها یەکێك لە میرەکانی دیمەشقیش هەر یەزیدی بووە زەینەددین یوسف، کە گوفتاروانێکی یەزیدی بوو کۆمەڵگەیەکی یەزیدی لە نۆیەزیدیەکان (کە لەسەر دەستی ئەو وەرگەڕێنرابوون) لە دیمەشق ولە قاهیرە–کە هەر لەوێش ساڵی ١٢٩٧مرد–پێکەوەنا ئارامگا بە دیمەنەکەی تا ئێستاش لە قاهیرە بە پاوەیە، لەو (٣٠) گەلەهۆزە سەرەکیەی کە مێژوونووسی کورد شەرەفەددینی بتلیسی لە شەرەفنامەدا (ساڵی ١٥٩٦) یەك یەك ناوی بردوون، وەکو ئەو دەڵێ حەوتیان لە سەدەکانی هەرەزوودا یەزیدی ئایین بوونە. یەکێك لەو گەلەهۆزانە، بوهتانیە بە هەژەڵ و دێرینەکان بوە (کە هیرو دۆتز بە بوختانۆی ناویان دەبا).

ئینسایکلۆپیدستێکی دێرینی ئیسلامیش، واتە شەهابەددین فەزلوڵلا ئەلعومەری، دەڵێ

دونبولیەكانیش – یان دومبولی – لە ساڵی ١٣٨٨دا هەر یەزیدی ئایین بوونە. ئەم قسەیە، زانیاریەكی زۆر گرنگ دەداتە دەستەوە، كە دەشێ تاقە ئاماژەی دیاریێ لە بارەی تیرەی فریشتەكانەوە بەر لەوەی ئەوها لەتلەت ببن و بگەنە ئەم بارەی ئێستایان و ناوە باوەكەیان لە دەست بدەن.. چونكە دونبولیەكان لقێكی بەدیمەن و سامداری دەیلەمیە عەلەویەكان بوون و لەبەر ئەوەی گێڕانەوەكانی عومەریی زانا و زیرەك جێی متمانەو پشت بەستنیی، یەزیدی بوونی ئەم هۆزە لەوانەیە بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی كەوا ناوی یەزیدی (واتە فریشتەپەرستان) بە گشتی ناوی هەموو تیرەی فریشتەكان بوویێ، (مێژینە ناوی یەزدانی لێرەدا بۆ تیرەی فریشتەكان بەو مەبەستە بەكارهێنراوە تا لەگەڵ یەزیدیەتی نوێدا تێكەڵ و پێكەڵ نەبن).

هەوڵ و تەقەلای زۆر و بەردەوام لەلایەن دراوسێ مسوڵمان و مەسیحییەكانیانەوە دراوەتا یەزیدیەكان، بەزۆریان بە خوایشت، لە ئایینەكەی خۆیان وەرگێڕن. دەوڵەتی عوسمانلی و قوتابخانە سەربازیەكانی یەزیدیەكی زۆریان خستۆتە ڕێزی سوپاوەو دوایی وەرگێڕراونەتە سەر ئیسلامی سوننی، لە كاتێكدا لەناو چیاكاندا یەزیدیەكان هەر لەسەر ئایینی خۆیان بە سووری ماونەتەوە. سكاڵانامەیەك كە ساڵی ١٨٧٢ پێشكەش بە دەسەڵاتدارایێتی عوسمانی كراوە و تێیدا داوا كراوە یەزیدیان لە خزمەتی سەربازی ببوێرێن، بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر دانان لە بارەی بنەماو دەستووراتی ئایینی یەزیدیەوە (بۆ وەرگێڕاوە سەر ئینگلیزییەكەی دەقەكەی بڕوانە(Driver 1921-23)).

دوای ئەوەی عوسمانیەكان نەیانتوانی بە ئاشتی و بەخوایشت یەزیدیەكان لە ئایین وەرگێڕن، لە سەدەكانی (١٧) و (١٨)دا كەوتنە وێزەیان و قەتڵوعامێكی بەرفراوانیان لێكردن. قەتڵوعامەكە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، دیسانەوە كرایەوە لە چەند جێی ناو سەرزەمینی عوسمانییدا، و ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی یەزیدیەكی زۆر هەج بن و بەسەرگەردانی ڕوویكەنە ناوچەكانی قەفقاسیای ناو قەڵەمڕەوی ڕووسیاوە. لێسكۆت بیست قەتڵوعامی سەرەكیی لەنێوان ساڵەكانی (١٦٤٠)ەوە تا ساڵی ١٩٢٠ ژماردووە (بڕوانە كۆچپێكردن و بە زۆر نیشتەجێكردنەكان).

لەم سەروبەندەدا یەزیدیەكی زۆر خۆیان لە چیا سەختەكاندا قایم كرد، ئەوانی بەردەست كەوتی ئەگەر بە ڕواڵەتیش بێ، وەرگەڕانە سەر ئیسلامی سوننی. یاسای تۆماركردنی زەوی و زاری عوسمانی كە ساڵی ١٨٥٩ دەركراوە، بەتایبەتی بۆ ئەوە دانرابوو كە فشار بخاتە سەر

یەزیدیەکان ئایین بگۆڕن، بەوەی کە لە مولکداریەتی قەدەغەی کردبوون. گەلێ شێخی یەزیدی کە خاوەنی ڕاستەقینەی زەویەکان بوون، بە وەرگەڕان لە ئایین، مولکداریەتەکەی خۆیان پاراست، لە کاتێکدا ئەو ڕابەرانەی زەویەکانیان لە شوێنی سەخت و دوور دەست بوون، تووشی ئەم گرفتە نەبوون. پەزدار و خەڵکە بێ زەویەکانیش لەم بارە سەختە دەرباز بوون. بەر لە ساڵی ١٨٥٨، یەزیدیەکانی ناوچەکانی ئەنتاکیە و ئەمانۆس خۆیان دەدا لە (٢٠٠٠٠٠) و بەمە زۆرینەی دانیشتووان بوون. ساڵی ١٩٣٨، لێسکۆت تەنها (٦٠٠٠٠)ی ژماردو دیاربوو کە بوونە بە کەمینەیەکی بچووك لەو سەرزەمینە.

تەنانەت ئەمڕۆکەش فشارێکی زۆر لەسەر یەزیدیەکانە بە مەبەستی لە ئایین وەرگەڕاندنیان، لە پەنای ئەمەدا بزووتنەوەیەکی تر لە گۆڕێدایە، تا یەزیدیەکان لە ناسنامەی کوردی بخەن، بەوەی کە وەکو پێکهاتەیەکی ئەتنیکی جیاواز بیاندەنە قەڵەم یان بەوەی یەکسەر بە عەرەبیان دانێن، بۆیە حکوومەتەکانی عێراق و سوریا بە "عەرەبی ئومەوی" دایاندەنێن داردەستیشیان بۆ ئەمە ئەو ئالۆسکاوی و شێوانەیە کە لەناو یەزیدیەکاندا لەسەر خەلیفەی ئومەوی یەزیدی کوڕی مەعاویە هەیە، کە فرێ بەسەر ئەوانەوە نیە.

زۆربەی یەزیدیەکانی ئێستا لە سوریا، لە هەرێمی جزیرە و بڵندایییەکانی چیای سنجار و لە هەرێمی عەفرینی باکووری ڕۆژاوای حەڵەب دەژین، دوای ئەوان یەزیدیەکانی قەفقاس لە پلەدا دێن، نیوەی کوردەکانی ئەوێ یەزیدین. لە عێراق، کە پیرۆزترین ئارامگاکانی یەزیدیان لە لالشە، لە شریتێکدا دەژین، کە لە ڕۆژهەڵاتی جەبەل سنجار بەرەو دهۆك و لالشە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی موسڵ دەکشێ، ژمارەیەکی زۆری یەزیدی لە ئەنەدۆڵ هەبوو، بەر لەو قەتڵوعامانەی لەوێ کران لە سەدەی ڕابردوودا، ئەوانەی لە چوارچێوەی تورکیادا ماون، لە ماردینەوە بۆ سێرت و لە ئەنتاکیەو عێنتابەوە بۆ ئورفە، پەڵە پەڵە نیشتەجێن. ژمارەیەکی زۆری یەزیدی لە ئێرانیش هەن، بەتایبەتی لەنێوان شارەکانی قۆچان و دوغا لە خۆراسان و لە هەرێمی ئازەربایجان.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوە بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: R.H.W. Empson, *The Cult of the Peacock Angel* (London, 1928); E.S. Drower, *Peacock Angel* (London, 1941); G.R. Driver, "The Religion of the Kurds," *Bulletin of the School of Oriental and Studies* II (1921-23); John S. Guest, *The Yezidis* (New York: KPI, 1987); Isya Joseph, *Devil Worship* (Boston, 1919); Alphonse Mingana, "Devil-worshippers: Their Beliefs and their Sacred Books," *Journal of the Royal Asiatic Society* (1916); R.C. Zaehner, *Zurvân: A Zoroastrian Dilemma* (New York: Oxford University Press, 1955); R. Lescot, *Enquête sur les Yezidis de Syrie et du Djebel Sindjar, Mémoires de l'Institut Français de Damas*, vol. 5 (Beirut, 1938); Hugo Makas, *Kurdische Studien*, vol. 3, *Jezidengebete* (Heidelberg, 1900); Ralph Solecki, "Predatory Bird Rituals at Zawi Chemi Shanidar," *Sumer* XXXIII.1 (1977); Rose Solecki, "Zawi Chemi Shanidar, a Post-Pleistocene Village Site in Northern Iraq," *Report of the VI International Congress on Quaternary* (1964); Sami Said Ahmed, *The Yazidis: Their Life and Beliefs*, ed. Henry Field (Miami: Field Research Projects, 1975); E.S. Drower, *Peacock Angel: Being Some Account of Votaries of a Secret Cult and Their Sanctuaries*. (London, 1941); Cecil J. Edmonds, *A Pilgrimage to Lalish* (London: The Royal Asiatic Society, 1967); Theodor Menzel, "Ein Beitrag zur Kenntnis der Jeziden," in Hugo Grother, ed., *Meine Vorderasienexpedition 1906 und 1907*. Vol. 1. (Leipzig, 1911); Basile Nikitine, *Les Kurdes, etude sociologique et historique* (Paris, 1956); Kamurân Ali Badir Khân, "Les soleil chez les Kurdes," *Atlantis* 54, vii-viii (Paris, 1934); Constance Alexander, *Baghdad in Bygone Days, from the Journals of the Correspondence of Claudius Rich... 1808-1821* (London, 1928); Charles Bellino letter, 16 May 1816, to Hammer, included in *Fundgruben des Orients* 5 (1816).

# ڕێبازبەندیە سۆفیگەریەکان

زۆرینـەی هـەرە زۆری کـوردە مـسولمان و نـا مـسولمانەکان سـەر بـە یـەکێك لـە ڕێبـازە سۆفیەکان (یان تەریقەتە)کانن. پەیوەنـدی مسولمانە کوردەکـان، بـۆ نموونـە لەگـەڵ ڕێبـازە سـۆفیگەریە جۆراوجۆرەکانـدا هەمیـشە تونـدتر بـوە لـە پەیوەنـدییان لەگـەڵ ڕێبـازە تونـدە ئیسلامیەکاندا. ئەو داب و دەستوورە ئایینیانەی کـە سـۆفیەکانی کوردسـتان بـەجێیان دێـنن، لەژێر ڕابەریی خەلیفە یان شێخەکاندا، گەلێ ڕەفتاری ئەوتۆیان تێدایە کە بە ئاشکرا لەگـەڵ ڕێ و شوێنی ئیسلامەتی ڕاستەقینەدا نـاگونجێن و هـەر چاوەدێرێکی ژیـر و شـارەزا دەتـوانێ بـە سووکی لە هی ئیسلامی پابەند و ورد ڕەفتار جیایان بکاتەوە. شێخەکانی ڕێبـازی سـۆفیگەری جێگـەدارەکانیان (خەلیفـەکان) دەرزدادەدەن و دوایـی ئیزنیـان دەدەن بـە نـاوی شـێخەوە سەرپەرشتی و سەراسوێی هـەوادارانی بکـەن لـە هـەر جێیـەك بـن و ڕێبازەکـە بڵاوبکەنـەوە و دەستەندەی موریدەکانیش بۆ شێخ کۆبکەنەوە. هەر کەسە ئازادە لە هەڵبژاردنی ئەو شـێخەدا کە پەیڕەوی لێدەکا، بەڵام بۆ وەرگرتنی تەریقەت، دەبێ بە جۆرە پرۆسەیەکی تاقیکردنـەوەدا بـڕوا. ئەندامـەکان (موریـدەکان) دوای وەرگـرتنی تەریقـەت، بەشـداری لـە هەنـدێ داب و دەستووری تایبەت بە ڕێبازەکەدا دەکەن، وەکو سەمای سـۆفیانەو زیکـر و نوێـژکردن. ئەگـەر پێویست بکا، لەسەر فەرمانی شێخ دەچنە شەڕیشەوە، بـۆ نموونـە، شـێخ عوبەیـدوڵڵا، شـێخ سەعید، شێخ ئەحمەدی بەرزانی و شێخ مەحموودی بەرزنجی، و گەلێکی تر، شێخی تەریقـەت بـوون، کـارزارە سیاسـیەکانیان بـە پاڵپـشت و بەشـداربوونی موریدەکانیانـەوە کـراوە (بڕوانـە سەرەتای مێژووی هاوچەرخ و مێژووی هاوچەرخ).

لـە هـەمان کاتـدا پەیوەنـدی تونـد و تـۆڵی شـێخ و موریدایـەتی، ڕێگایـەکی زۆر کاریگـەرە تەنانەت بۆ ئەو هەڵبژاردنـە دیموکراتیانـەی کـە لـەم سەردەمانەشـدا دەکـرێن. بـەم جـۆرە بـە دەنگی موریدەکانیان، دۆستایەتی و ڕەزامەنـدی پارتـە سیاسـیەکان وەدەسـت دێـنن (بڕوانـە Van Bruinessen ١٩٩١).

سیان لە توندترین و پڕ تەپوتۆزترین بزووتنەوەی هەرەزووی سۆفیان، لەلایـەن حوسـەینی

ئیبنی مەنسووری هەلاج (كە لە ٩٩٢ی پاش میلاددا چوارمێخ كێشرا)، عەینولقوزاتی هەمەدانی (كە لە ساڵی ١١٣١دا چوارمێخ كێشرا) و شەهاب بەددینی سوهرەوەردی (كە ساڵی ١١٩١ چوارمێخ كێشرا) ڕابەریی كراون، هەموو ئەمانە بیر و ڕایەكیان بە خەڵك دەگەیاند كە لەگەڵ بنەڕەتە باوەكانی ئایینی ئیسلامدا نەدەگونجان، بەڵام ئەوەی جێی سەرسووڕمانە لەگەڵ بنەڕەتەكانی تیرەی فریشتەكاندا تێر و تەبا بوون. بۆ نموونە، حەلاج خۆی بە بەرجەستەكەرێكی خودایی جاڕدا، و بە ناو خەڵكدا بانگی "أنا الحق" واتە من حەق (ڕووح)مـی دا، كە بەرووبەرهەمی باوەڕ بە یەكیەتی خولقاندنن و كەوا هەموو خەڵقەندەكان چی بن و چۆن بن بەرجەستەكەری هەمان ڕووحی گەردوونی ئەزەلیین. حەللاجیش وەكو یەزیدیایەتی ڕایگەیاند كەوا شەیتان لە گوناهەكانی پاك بووەتەوە و بەرز كراوە بۆ بەرزترین پلەی ئاسمانی. و خۆشی لەسەر ئەمانە پاش ئازار و ئەشكەنجەدانی گران لە بەغدا چوارمێخ كێشرا، ئێستا یەزیدیەكان ئارامگایەكیان بەتایبەتی بۆ حەلاج لەناو كۆمەڵە ئارامگاكانی لالش، لەتەك ئارامگای شێخ ئادییەوە تەرخانكردووە.

بیروڕاكانی هەمەدانییش، وەكو ئەوانی حەلاج، باسیان لە "یەكیەتی بوون" دەكرد، ئەویش باوەڕی بەوە بوو كە هەموو خەڵقەندەكان بەرجەستەكەری ڕووحی ئەزەلیی گەردوونن. ڕووحیش، بەڕای ئەو، دابڕاوە لە ڕووداوەكانی ئەم جیهانە، بەهەمان شێوە كە تیرەی فریشتەكان بۆی دەچن كەوا ڕووح پاش دۆناودۆن كردنی ئەزەلیی و هەتا هەتاییش لە پەروەردگاری مەزندا واتە لە خولقێنەری جیهانی ماددی دا ئیتر بە تەواوی دابڕاوە. باوەڕی قایمی بە دوناودۆن كردنی یەك لە دوای یەك و پاك بوونەوەی شەیتان لە گوناهەكانی، سەرباری گوفتاردانە دژ بە ئیسلامیەكانی سەرەنجام بە دەردێكی خراپی برد، ئەوە بوو لە تەمەنی (٣٣) ساڵیدا لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئیسلامەوە لە دار دراو لەناو گڕی ئاگردا كڵۆكۆی دامرد.

هەمان بیرو ڕاگشتیەكانی حەلاج و هەمەدانی لە نووسین و كردەوەكانی سوهرەوەردییدا ڕەنگیان داوەتەوە، دەرزدانەكانی لەژێر سایە و سێبەری قوتابخانەی "ئێشراقدا" واتە "تیشكدانەوە" پڕن لە بیروڕای تیرەی فریشتەكان بە جۆرێك مرۆڤ هەست دەكا كە بەشێك بن لەوان، نەك بزووتنەوەیەكی سۆفیانەی ئیسلامی. وێكچوونەكە كاركردنێكی توندی بیروڕاكانی

هیلینستی و میزوپۆتامیای پێوە دیارە. لە یەکێك لە ویردەکانی کە ناوی "الهرخش الکبیر"ە – واتە خۆری مەزن – دەبێ هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هەڵاتنی خۆر ڕووەوڕۆژ بخوێنرێ و لە کۆتاییدا نزای بوونە خاوەن کتێبیش تێدایە، لە ویردەکەدا، بە ئاشکرا، هێمای نوێژی ڕۆژانەی تیرەی فریشتەکان بۆ ڕۆژی هەڵاتوو دیار و بەرجەستەیە "تۆ هۆرەخشی گەورە و بە توانای... ڕەوێنەرەوەی تاریکیت... پادشایی گشت فریشتەکانی... خاوەندی ڕووناکیەکانی بوونی، بە پشت و پەنای خودای بانی سەرەوە ئەی تیشکی پرشنگدەر، ئەی مامۆستا و بلیمەتی ئاگادار لە گشت، ئەی ڕۆڵەی پیرۆز و مەزنی تیشکە ڕوونکەرەوەکان، ئەی واریسی شاتیشکی گشت فریشتەکان، ڕووی تێ ئەکەم و لێی ئەپاڕێمەوە، تا ئەویش لە خودای خۆی، خودای گشت خودایان بپاڕێتەوە... (بەڵکو بەرەکەتم دەسبخا) (Moin۱۹٦۲ )، حەلاج لەسەر ئەو بۆچوونە سوور بوو، کە ڕووحی پەرستشکار بەرەبەرە ڕوون دەبێتەوە و زەنگ دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی خوداوەندی، هەرچەندە بەو ئاشکرایی و ڕاشکاویەوە نەیدەدرکاند کە تیرەی فریشتەکان دەیانکرد، سەرەنجام ئەم بۆچوونانەی بە گران کەوتن لەسەری و گیانی لە پێناویاندا دا بەبایی، ئەوە بوو لە تەمەنی (۳۸)ساڵییدا بە فیتی دەستەی عولەمای ئیسلام و بەدەستی کوردێکی تر، میری ئەیوبی حەڵەب، ساڵی ۱۱۹۱ لە داردرا هەمەدانی و سوهرەوەردیش، هەر وەکو حەلاج، لەناو تیرەکەدا، خرانە پایەی بەرجەستەکەرە پلە دووەکانی ڕووحی گەردوونییەوە.

حەلاج لە بەغدا لەدایك بووبوو، باوك و دایکی فارس بوون، لە هەرێمی (فارس)ی باشووری زاگرۆسەوە هاتبوون، لەو کاتەدا ئەو هەرێمە مەڵبەندی دەیەها هۆزی کورد بوو (بڕوانە کۆچکردنە مێژووییەکان). تەئسیری تیرەی فریشتەکان لەسەر بیروبۆچوونی حەلاج، گەلێ ئاسانترە لە ساخکردنەوەی ڕچەڵەکی نەتەوەیی ئەو، بەڵام هەمەدانی و سوهرەوەردی وانین، هەمەدانی لە هەمەدانی باشووری کوردستان لە دایکبووەو گەورە بووە، سوهرەوەردی خەڵکی شاری شەهرەوەردی (کە زۆرتر بە هەڵە بە سوهرەوەرد ناو دەبرێ) نێوان شارەزوور (سولەیمانی ئێستا) و زەنجانە. زەنجان (۱۵) میل لە بیجارەوە دوورە و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتیەوە. بە گوێرەی گێڕانەوەی ئیبن حەوقەلی جوگرافیاناسی ئیسلامی سەردەمەکانی ناوەند، سوهرەوەرد ئیمڕۆ چۆنە ئەو کاتەش زۆربەی دانیشتووانی کورد بوونە.

نزیكەی (٣٠٠) ساڵ دوای ئەوە هەوادارێكی دیكەی تیرەی فریشتەكان بزووتنەوەیەكی سۆفیگەریی فرتەنەسازتر و كۆمەڵ هەژێنتری هێنایە كایەوە. موحەمەدی نووربەخش لە ناوەڕاستی سەدەی (١٥)دا تروسكەی ئەم بزووتنەوەیەی بە گوتاربێژی لە بارەیەوە بریسكاندەوە، ئەو خەڵكی لەحسا (ئەحسای ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی سعودیە كە هەرێمێكی نەوتینە)بوو لە كۆنەوە، لەحسا كوانگی بزووتنەوەی توندڕەوی ئیسلامی بووە، وەكو بزووتنەوەكانی خوڕەمیەكان لە سەرەتای ئیسلامدا كە بیروبۆچوونە كۆمەڵایەتی و ئابووریەكانیان، هەروەها باوەڕیان بە دۆناودۆنكردنی ڕووح، دەیانبەستێ بە بزووتنەوەكانی زووتری خوڕەمیە و مەزدگیەكانی هەرێمی زاگرۆسەوە (بڕوانە تیرەی فریشتەكان) پەیوەندی ئەو لەگەڵ تیرەی فریشتەكاندا كاتێ پەردەی لەسەر لاچوو كە كەوڵی (هەمەدانیی)پێدرا. نووربەخشیش هەر وەكو حەللاج و سوهرەوەردی، خۆی بە بەرجەستەكەرێكی پلە دووی ڕووحی گەردوونی دادەنا، واتە بەشێك لەو ڕێچكەیەی كە لە دەورانی دووەمی ژیانی گەردونییدا، محەمەد پێغەمبەریشی دەگرتەوە (بڕوانە خشتەی ژمارە ٦). ئەو خۆی ناو نا مەهدی "ڕزگاركەر– مەسیح"و واشی ڕاگەیاند كە باوكی ناوی عەبدوڵلایە (واتە هەمان ناوی باوكی پێغەمبەر محەمەد)، كوڕێكیشی ناو نا قاسم و بەم جۆرە بوو بە "ئەبو لقاسم" (ئەمیش هەر بۆ ئەوەی بەجۆرێك خۆی بە محەمەدەوە ببەستێ). بە مەشەوە نەوەستا، ڕایگەیاند كەوا خاوەنی توانایەكی سەر و سروشتییە، لەو جۆرەی كە بەرجەستەكەرەكانی تیرەی فریشتەكان هەیانبوو. بەمەش خۆی بردە پلەی كوفركردن لە ئایینی ئیسلامدا، لەبەر ئەم ڕەفتارە و هەندێ ڕەفتاری تری سەختگیرانەی، بوو بە ئامانجی هێرش و دژایەتی عولەمای ئەو سەردەمەی سوننی و شیعە لەیەك كاتدا. یەكێك لەو زانایانەی كە بەتوندی دژی وەستان عەبدوڕەحمانی جامی بوو و بە هەرحاڵ ئەو بەو دەردە گرانە نەچوو، كە هەرسێ هاوبیرەكەی پێش خۆی حەلاج و هەمەدانی و سوهرەوەردی پێی چوون.

هەر كە پای نایە خاكی كوردستانەوە، نووربەخش خۆی بە خەلیفەی هەموو مسوڵمانانیش بۆ خەڵك ڕاگەیاند. كوردەكان دراویان بە ناوی ئەوەوە لێدا (١٤٤٣ پا، م) دوایی لەلایەن شاروخی پادشایی سەر بە تەیموور لەنگەوە گیراو لە زیندان توند كرا و تا ساڵی (١٤٤٤) تێیدا مایەوە. نووربەخش بە مردنی خوا مرد. لەوانەیە بەرپابوونی بزووتنەوەكەی لە كاتی لاوازیی شیعە

مسوڵمانەکان بەدەستی تیرەی فریشتەکان لە سەدەی (١٥)دا و بوونی چەند بنەماڵەی حوکمڕانی عەلەویش لە ناوچەکەدا، هۆبن لەوەدا کە ئەویش بەو دەردە سەختەی یارانی کۆنی نەچوو.

قاسمی کوڕی نووربەخش لەلایەن شاه ئیسماعیلی یەکەمی دامەزرێنەری بنەماڵەی حوکمڕانی سەفەویەوە دەستی بەسەردا هێنرا و قاسم خۆی و بزووتنەوەی نووربەخشیش بەرەبەرە بوون بە ئایینی دەوڵەت لە هەردوو سەدەی (١٦) و (١٧)دا (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی هەرەزوو)، لەوێوە بزووتنەوەی نووبەخشی بوو بە ڕێبازێکی شیعەگەرانەی بێ خەوش. ئەندامە کوردەکانیشی هەر لەناو شیعە کوردەکانەوە هاتبوون و دوایی خەڵکێکی زۆری غەیرە کوردیشی تێکەڵ بوو، تەنانەت لەناو هەوادارانیدا کۆمەڵێکی زۆری یارسانیشی بەدی دەکران.

کۆنترین ڕێبازی سۆفیگەری کە هێشتا لەناو کورداندا موریدێکی زۆری هەبێ ڕێبازی قادریە، کە بە ناوی عەبدولقادری گەیلانی (هەروەها گەیلانی و کەیلانی و خەیلانیش)( ١٠٧٧-١١٦٦)- گەلێ بنەماڵەی ئایینی کورد ئێستا و لە کۆنەوەش بە مورید و سەرسپردەی ئەم ڕێبازە ناسراون، هەرچەندە ئەم ڕێبازە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە، لەسەرخۆ، لەبەر فشاری ڕێبازێکی تری سۆفی، واتە نەقشبەندی لە کشانەوەی بەردەوامدایە.

هۆزی تاڵەبانی، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سەرکردایەتیەکەی و زۆربەی خەڵکی ناوچە باشوورییەکانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ڕۆژهەڵات (لە ئێران) قادرین.

مەڵبەندی سەرەکیی ڕێبازەکە وا لە شارۆچکەی دێرین و پیرۆزی بەرزنجەی نزیکی سولەیمانی، شێخ مەحموودی سەرکردەی چەندین ڕاپەڕینی کوردان دژ بە داگیرکاری ئینگلیز لە عێراقدا، ڕابەرێکی ڕێبازی قادری و لە بنەماڵەی بەرزنجەیی بوو، (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ).

ڕێبازی نەقشبەندی، لە ڕێبازی قادری نوێترە لە کوردستاندا، ئەم ڕێبازە لەلایەن بەهائەددینی نەقشبەندی بوخارایییەوە (١٣١٧-١٣٨٩) دامەزراوە و لە ئاسیای ناوەنددا بڵاوکراوەتەوە و دوایی لەوێوە لەوانەیە لەلایەن هۆزە تورکەکان یان تورکە باکشییەکانەوە کە لە سەدەی (١٢)ەوە دەستیان کردبوو بە کۆچکردن بۆ ئەم مەرزوبوومە هێنرابێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە (بڕوانە کۆچکردنە مێژووییەکان).

ئەمڕۆکە خەڵکی کوردستانی باکوور، و تاڕادەیەك کوردستانی ڕۆژاواش، هەواداری ئەم

ڕێبازەن، لە کاتێکدا کوردستانی ناوەندو ڕۆژهەڵات هێشتا هەر سەر بە ڕێبازی قادرین. هۆزی بارزانی، لەلایەن ڕابەرایەتی ڕێبازی سۆفیگەری نەقشبەندیەوە ڕابەری دەکرێ کە لە پاڵ تەئسیری ڕووحیدا، تەئسیری دونیایشییان لەناوچەکەدا هەیە، تا دوا دوای سەدەی ڕابردوو، بەهەرحاڵ، بارزانیەکانیش و هەموو هۆزو خێڵەکانی تری ئەم ناوچەیەش سەر بە ڕێبازی قادری بوون، ئەم وەرگەڕانەو گەلێ وەرگەڕانی تریش بەرەو ڕێبازی نەقشبەندی، دەرەنجامی ڕاستەوخۆی نفوزو کاری ماندوو نەناسانەی مەولانا خالید ناوێك بوو.

ساڵی ١٨١١ مەولانا خالید (لە دایکبووی ١٧٧٩)، کە شێخێکی کوردی سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی بوو، و بە هۆز دەچووەوە سەر هۆزی جاف شارە زوور (سولەیمانی ئێستا)، دەستی کرد بە جموجۆڵێکی چالاکانە و چوارلاگیری مورید کۆکردنەوە بە دانانی چەند خەلیفە لە کوردستان و دەوروبەرییدا. ئەم خەلیفانەش، دوای مردنی مەولانا لە ساڵی (١٨٢٧)دا، خەلیفەی تریان بۆ خۆیان دانا، ئەوەندەی نەبرد کوردستانی باکووری ناوەند بە مەڵبەندە ئایینیە بە هێزەکەی نەهرێشەوە (نزیکی ڕەواندز) هەتا هەتایە لە دەست قادرییەکان چوو، بۆیە دەبینین پارتی دیموکراتی کورد لە عێراق (دەبێ مەبەستی کوردستان بێ – وەرگێڕ) هەروەها بارزانی سەرۆکی، سەر بە ڕێبازی نەقشبەندین.

لە تورکیا، لە سەردەمی سەرۆك ئۆزالدا (کە خۆی ڕۆڵەی بنەماڵەیەکی نەقشبەندی بوو)، نەقشبەندیەکان وەکو ڕێباز گەڕانەوە تورکیا، پاش چەندەها ساڵی قەدەغەکردنی ڕەسمی و ڕاوەدوونانی دوابەدوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٢٥)ی شێخ سەعید (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ).

تەکیەکانی سۆفیەکان (خانەقا) بە هەموو کوردستاندا بڵاون و لە ڕاستیدا گەلێ لە مزگەوت و شوێنی تری پەرستن باوترن (لەوانەیە، ئەو دارو نزرگە پیرۆزانەی کە بۆ خدر تەرخان کراون لەمە بەدەر بێ) – (بڕوانە فەرهەنگی میللی).

کوردە نا مسوڵمانەکانیش ڕێبازی سۆفیگەری تایبەتی خۆیان هەیە، یان هی ئەو تیرەیە بە گشتی، کە خۆیان بەسەر سپردەی دەزانن. ئەم ڕێبازانە، ئەگەر بە ناویش بێ سەر بە مەزەبی شیعەن (بۆ نموونە هەردوو ڕێبازی نوور بەخشی و نیعمەتوڵلاهی).

عەلەویەکانی کوردستانی ڕۆژاوا و باکوور بە گشتی سەر بە ڕێبازی بەکتاشیین. ئەوی لای خەڵك باوە ڕێبازی بەکتاشی وەکو ڕێبازێکی سوننیگەرا خۆی دەربڕیوە، بەلام

سەرسپردەکانی ئەم ڕێبازە هەموو هەر بە عەلەویەتی مانەوە و هەوادارانی چ لەناو کوردا و چ لەناو نەتەوەکانی تردا هەبووە، هەر لە ئەنەدۆڵەوە تا دەچێتە بولگاریا و لەوێشەوە بۆ ئەلبانیاو بۆسنیاش.. ئەم ڕێبازە کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ژیانی کوردە عەلەویەکان کە تا بڵێی قایم و قووڵە. یەکێك لە ئاهەنگگێڕانە هەرە گرنگەکان کە کوردە عەلەویەکان بەجێ دێنن، ئەوەیە کە بۆ حاجی بەکتاشی دامەزرێنەری ڕێبازەکەو یەکێك لەبەرجەستەکەرە هەرە بنەڕەتیەکانی ڕووح لە عەلەویەتدا دەیگێڕن. لە کاتێکدا حکوومەتی کۆماریی تورکیا کە زۆریەی زۆری بەکتاشیەکان لەناو قەڵەمڕەوی ئەودا دەژین، هەوادارانی ئەم ڕێبازەی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ خستبووە بەر ڕێژنەی زوڵم و ستەم، ئێستا نەك هەر جڵەویشی بۆ شلکردوون لە بۆنەو جەژنەکانیاندا ئاهەنگ بگێڕن، بەڵکو هەندێ جار بەشێوەی ڕەسمیش دەستی لوتفی سەرپەرشتیکردنیشیان بەسەردا دەساوێ. لەوانەیە ئەم گۆڕانە دەستی سەرکۆمار ئۆزالی تێدابووبێ، کە هەرچەندە خێزانەکەی پشتەڵەکێکی نەقشبەندیانەی هەیە، بەڵام بە بنەچە خەڵکی شاری مەلاتیەن، کە شارێکی زۆرینە کوردنشینە و تێیدا شان بەشانی یەکدی هەردوو ڕێبازی نەقشەبەندی و بەکتاشیش هەوادارێکی زۆریان هەیە.

بەکتاشیەکان لە ڕۆژاوای تورکیا زۆرتر لە ڕێگەی "دەروێشە گێژخۆرەکان"نیانەوە ناسراون کە بەرگە سەرتاپا سپی و کلاوەسپییە سەتڵ شێوەکانیان مایەی سەرنج و بەدواداگەڕانی ئەو گەڕیدە ئەوروپاییانەن کە منەی ئایین و داب و دەستوورە ئاسیاییەکان دەکەن، مەڵبەندی هەرە گرنگ و تەماشایی بەکتاشیەکان، ئارامگای شاعیر و ڕابەری گەورەی سۆفیگەری، مەولانا جەلالەددینی بەلخی، ناسرا و بە ڕۆمییە. ئەم ئارامگایە لە شاری قۆنیەی ناوەڕاستی ئەنەدۆڵە کە هاوسنوورە لەگەڵ مەڵبەندێکی گەورەی کوردنشینی دەرەوەی خاکی کوردستان.

لە هەمان کاتدا، هەوادارانی ڕێبازی قادرییش، هەر وەکو دەروێشە خولخۆرە بەکتاشیەکان خاوەنی داب و دەستووری خۆیانن هەر لە سەماو سۆز و ئاوازەوە بگرە تا دەگاتە لێدانی ئامێری مۆسیقاش. نەقشبەندیەکانیش، لە لایەکی ترەوە، وەکو داب و دەستوورێکی دێرینی ڕێبازەکەیان، بازنەی سەماو گۆرانی دەبەستن بۆ گەیشتن بە حاڵەتی مەستی سۆفیانە کە لە هەموو تەریقەتەکاندا، شتێکی باوو بابەتییە، بەڵام لە هەمووان زیاتر بەکتاشیەکان بۆ

مەسەلەی ڕەقس و سەماو مۆسیقا لە پاڵ ئەم داب و دەستووره ئایینیانەدا ناوبانگیان داوەتەوە.

لێرەدا، نابێ بێ ناوهێنان بەسەر ڕێبازی ڕەففاعییدا تێپەڕکەین، كە جێی سرنج و تا ڕادەیەك سەرسووڕمانیشە. باوەڕی بەهێزی موریدانی ڕەففاعی بەوەی كە ڕووح دەتوانێ لەش بەجێبهێڵێ ئەگەر هاتوو خاوەنەكەی لە قووڵایی دڵ و ئیرادەوە سەرسپردەو ڕاهێنراوبێت، وایان لێ دەكا كە كاری ئەوتۆ ئەنجام بدەن وەكو بەپێی پەتی بەسەر ژیلەمووی سووردا ڕۆیشتن و قووتدانی شمشێر و زەرگ و تیغی تر لە خۆدان و لە پاشاندا، بێ هیچ زیانێك لێی دەرچن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** N. Yalman, "Islamic Reform and the Mystic Tradition in Eastern Turkey," *European Journal of Sociology* 10 (1969); S.H. Nasr, *Shihâbaddin Yahyâ Sohrawardi* (Paris: Institut Français d'Iranologie, Bibliothèque Iranienne, 1970); John Kingsley Birge, *The Bektashi Order of Dervishes* (London: Luzac, 1937); Martin van Bruinessen, "Religious Life in Diyarbekir: Religious Learning and the Role of the Tariqats," in Martin van Bruinessen and H. E. Boeschoten, eds., *Evliya Çelebi in Diyarbekir* (Leiden: Brill, 1988); Hamid Algar, "The Naqshbandi Order: A Preliminary Survey of Its History and Significance," *Studia Islamica* 44 (1976); Hamid Algar, "Said Nursi and the Risala-i Nur," *Islamic Perspectives: Studies in Honour of Sayyid Abul Ala Mawdudi.* (London, 1978); Halkawt Hakim, "Mawlana Khalid et les pouvoirs," in Marc Gaborieau, A. Popovic, and T. Zarcone, eds., *Naqshbandis: Historical Development and Present Situation of a Muslim Mystical Order* (Istanbul-Paris: Isis, 1990); Albert Hourani, "Shaikh Khalid and the Naqshbandi Order," in S. M. Stern, A. Hourani, and V. Brown, eds., *Islamic Philosophy and the Classical Tradition* (Oxford: Oxford University Press, 1972); Sherif Mardin, *Religion and Social Change in Modern Turkey: The Case of Bediuzzaman Said Nursi* (Albany: State University of New York Press, 1989); Wheeler Thackston, *The Mystical & Visionary Treatises of Suhrawardi* (London: Octagon, 1982); J.S. Trimingham, *The Sufi Orders in Islam* (New York and London: Oxford University Press, 1971); Martin van Bruinessen, "Religion in Kurdistan," *Kurdish Times* IV:1-2 (1991); 'Ain al-Qudât al-Hamadâni, *The Apologia*, A. J. Arberry, ed. and trans., as *A Sufi Marty* (London: George Allen and Unwin, 1969); Muhammad Mo'in, "Huraxs," in W.B. Henning and E. Yarshater, eds., *A Locust's Leg: Studies in the Honour of S.H. Taqizadeh* (London: Percy Lund, 1962).

# ئایینی جوولەکە

ئایینی جوولەکە لە کوردستان خاوەنی مێژوویەکی کۆنە، بە گوێرەی باسکردنی تەلموود دەربەدەرکراوانی جوولەکە لە (٢٨٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە لەسەر دەستی شەلمانئەسەری سێیەمی پادشایی ئاشووریان (٨٥٨–٨٢٤ پێش میلاد)ەوە لە کوردستان جێنشین کراون و تەلموود دەڵێ کەوا ئەو جوولەکانە، لە سەردەمێکی درەنگدا، ڕەزامەندی ڕابینەکانیان وەرگرت کە کوردەکانی هاووڵاتیان وەربگێڕنە سەر جوولەکە و ئەوان لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتنێکی بەرچاوییان دەزگیر بوو، بنەماڵەی پادشاییانەی بەناوبانگی ئەدیابین کە ئەربیل/ هەولێر پایتەختی بوو هەموو وەرگەڕانە سەر جوولەکایەتی لە ماوەی سەدەی یەکەمی پێش میلاددا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیە کوردەکانیاندا (بڕوانە بابەتی ئیربیل/ئەربیل لە ئینسایکلۆپیدیا جودیکادا)، ناوی مونوبازیسی (Monobazes) پادشایی کورد و ئیزاتیس (Izatis)ی کوڕ و جێگری (کە لە یازاتا واتە فریشتەوە هاتووە)، هەروەها هێلینای شاژن، لە سەرەوەی ناوی ئەوانەوە هاتووە کە لەناو ئەم خێزانە پادشاییییەدا وەرگەڕاونەتە سەر ئەم ئایینە (Ginzberg 1968.70-412)، بەڵام ئەمە لە ڕووی کات و ساتی مێژووییییەوە ڕاست نایەت چونکە مونوبازیس لە (١٨)ی پاش میلاددا دەسەڵاتی ڕاستەقینەی گرتە دەست. ئەوی ڕاست بێ، لەو کاتەی ڕۆمەکان یەهوودا و سامیرەیان داگیرکرد (٦٨–٦٧ی پێش میلاد) تەنها بنەماڵەی ئەدیابین بوو کە یارمەتی ئازووقەو هێزی بۆ ڕزگارکردنی گەلیلی نارد کە ئابلووقە درابوو (Grayzel 1968-163) و ئەگەر بنەماڵەی ئەدیابین خۆی جوولەکە ئایین نەبوایە، هەرگیز ئەمەی نەدەکرد (بڕوانە مێژووی کلاسیك). گەلێ مێژوناسی هاوچەرخی جوولەکە وەکو کەهلە (١٩٥٩) کە لەو باوەڕەدایە کە ئەدیابین لەناوەڕاستی سەدەی یەکەمی پێش میلاد جوولەکە ئایین بوە، هەروەها نوێسنەر (١٩٨٦) کە ئەم مەسەلە دەباتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی پاش میلاد، سەرنەکەوتوانە هەوڵی ئەوەیان داوە ئەم هەڵە مێژووییە پینەو پەڕۆ بکەن، بەڵام هەموو لایەك لەسەر ئەوە ڕێکن کەوا لە سەرەتای سەدەی دووەمی پاش میلاددا، ئایینی جوولەکە لە کوردستانی ناوەند هەردوو پێی بە توندی قایم کردبوو.

وەكو گەلێ كۆمەڵگای دیكەی جوولەكە، مەسیحیەتیش، جێ دەستێكی چاكی بۆ خۆی لە ئەدیابین دەسكەوت بۆ لە ئایین وەرگەڕان لە سەدەكانی (٤) و (٥)دا، كەچی سەرەڕای ئەمەش جوولەكەكان تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە كوردستاندا كۆمەڵگایەكی تا ڕادەیەك گرانیان هەبوو. لەناو ماڵی خۆیان و لە كۆبوونەوە ئایینیەكاندا، جوولەكە كوردەكان بەشێوەیەكی كۆنە ئارامی دەدوێن كە پێی دەوترێ سوریانی (واتە سریانی) و لە كاروباری سەوداكاری و بازرگانیدا و لەناو كۆمەڵگای فراوانتردا بە كوردی. گەلێ لایەنی ژیانی كورد و جوولەكە، هەروەها كەلتووریان، ئەوەندە پێكەوە ئاڵۆزكاون، كە زۆر بابەتی كۆن و ڕەسەنی كوردی، دەچنەوە سەر جوولەكە و هەندێ كەس لەو باوەڕەدان، كە كوردان بە ڕەسەن دەچنەوە سەر یەكێك لە هۆزە ونبوەكانی ئیسرائیل، لە كاتێكدا هەندێكی تر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن كە كوردەكان لە ڕووداوێكەوە داهاتوون كە تێیدا سولەیمان و ئەجنەكانی هاوكاریبوونە (بڕوانە فۆلكلۆر و چیرۆكە فۆلكلۆریەكان).

سەر بەستیی كەم و زۆری ژنی كورد لەناو كۆمەڵگای جوولەكەی كورددا، بوو بە هۆكاری ئەوەی لە سەدەی (١٧)دا، یەكەم ڕابی ژن دابنرێ. ئەو ڕابییە ئەسیناڤ بارازنییە كە كچی ڕابی بە ناو بانگ ساموئێل بەرزانی و (دەورووبەری ١٦٣٠ مردووە) دامەزرێنەری چەندین قوتابخانە و مەدارسی ئایینی بوە لە كوردستان. ناوی "تەنەئیث" كە واتای زانایەكی تەلموودناسی ژن دەگرێتەوە بەتایبەتی بالآبری ئەو كراوە. لە دواییدا، ماما (واتە خاتوون) ئەسێنات بوو بە سەرۆكی ئەكادیمیای پایەبڵندی جوولەكەناسی لە مووسڵ (Mann1932).

گۆڕی كەنارای پێغەمبەرەكانی ناو ئینجیل وەكو ناحۆم لە ئەلقۆش، یونا (یونس-وەرگێڕ) لە نەبی یونس (نەینەوای دێرین)، دانیال لە كەركووك، حەبەقووق لە تویسركان و شاژن ئیستەر و موردەخای لە هەمەدان، و چەندین ئەشكەوت كە دەڵێن ئەلیا سەردانی كردوون، بەشێكن لە ئارامگاو مەزارە هەرە گرنگەكانی جوولەكەكان لە كوردستان و ئەمڕۆكە هەموو جوولەكەكان ڕێزیان لێدەگرن و بە پیرۆزیان دەزانن.

هەر لە (١٩٠٦)ەوە، دانشگای ئەلیانسی ئیسرائیل (The AIliance Israelite universalIe) قوتابخانە و مەڵبەندی تری خوێندنی لە كوردستاندا كردۆتەوە و پێویستی پێشكەوتنی لەناو جوولەكە كوردەكاندا دەستەبەر كردووە (Cuenca 1960). لەم دەزگا و دامەزراوانە، كوردە

غەیرە جوولەکەکانیش زۆر سوودمەند بوونە، چونکە گشت منداڵانی دانیشتووان بێ هیچ جیاوازییەك لەم دەزگایانەدا وەردەگیران و بەمە توێژێکی تری کەسانی خوێندەوار و پەروەردەکراو لە کوردستان پێدەگەیشتن. تا هەندێك پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلیش، ئەلیانس هەر لەسەر چالاکیەکانی خۆی بەردەوام بوو.

کوردێکی جوولەکەی زۆر لەم دواییانەدا کۆچیان بۆ ئیسرائیل کردووە و لەوێ لە گەڕەکی تایبەتی خۆیان دەژین و تا ئێستاش ژیان و کەلتووری کوردانەی خۆیان پاراستووە و زیاتریش خەملاندووە، لەوانە ئاهەنگ و بۆنەو داب و نەریت دروشمی هەرە ڕەسەنی کوردانن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** *Encyclopaedia Judaica*, entries on Kurds and Irbil/Arbil; Louis Ginzberg, *The Legends of the Jews, 5th ed.* (Philadelphia: The Jewish Publication Society of America, 1968); Jacob Mann, *Texts and Studies in Jewish History and Literature*, vol. 1 (London, 1932); Yona Sabar, *The Folk Literature of the Kurdistani Jews* (New Haven: Yale University Press, 1982); Paul Magnarella, "A Note on Aspects of Social Life among the Jewish Kurds of Sanandaj, Iran," *Jewish Journal of Sociology* XI.1 (1969); Walter Fischel, "The Jews of Kurdistan," *Commentary* VIII.6 (1949); André Cuenca, "L'oeuvre de l'Allance Israélite Universelle en Iran," in *Les droits de l'éducation* (Paris: UNESCO, 1960); Dina Feitelson, "Aspects of the Social Life of Kurdish Jews," *Jewish Journal of Sociology* 1.2 (1910); Walter Fischel, "The Jews of Kurdistan, a Hundred Years Ago," *Jewish Social Studies* (1944); Solomon Grayzel, *A History of the Jews* (New York: Mentor, 1968); Paul Kahle, *The Cairo Geniza* (Oxford, 1959); Jacob Neusner, *Judaism, Christianity, and Zoroastrianism in Talmudic Babylonia* (New York; University Press of America, 1986).

# مەسیحیەت

مێــژووی زووی مەســیحیەت لــە كوردســتاندا، ڕێـك هاوكاتــە لەگــەڵ هــی ئەنــەدۆڵ و مێزوپۆتامیــادا، لــە ســەرەتای ســەدەی پێنجەمــدا، بنەماڵــەی پادشــاییی ئــەدیابین لــە جوولەكەییەوە وەرگەڕابووە سەر مەسیحیەت، ئەو ئەرشیفە زۆر و زەوەندی لە كەنشتەكانی ئەربیلا (ئەربیلی ئێستا)ی پایتەختیاندا پـارێزراوە سەرچاوەی سـەرەتایی بەنرخـە لـە بـارەی مێژووی كوردستانی ناوەندەوە. لە ناوەڕاستی سەردەمی پارتیەكانەوە (واتە سەدەی یەكـەمی پاش میلاد)، مەسیحیە كوردەكان، بەهەمان شێوەی جوولەكـەكانی بـەر لـەخۆیان، ئارامییـان بەكارهێناوە بۆ تۆماربەندیی ئەرشیفەكانیان، هەروەها بۆ زمانی ناو كەنیسەشیان.

ئەو زۆر و ستەمەی لەناو ئیمپراتۆریەتی ساسـانییدا كـەتبووە سـەر مەسـیحییەكان، لـەوێ چۆن بوو، لە كوردستانیش هەروابوو. تەنها پـشووی حەسـانەوە لـە دەسـت زوڵـم و فـشار كـە كێشابێتیان، ئـەو كاتـە بـوو كـە مەسـیحییەكانی ئیمپراتۆریەتەكـە وەرگەڕانـە لای كەنیـسەی نەسـتۆری ڕۆژهەڵاتــەوە (كــە ســەر بــە ســانت نیـستۆریاس–٤٤٠ پـاش مـیلاد–بـوو) و گـشت پەیوەندییەكیان لەگەڵ ڕۆما و قوستەنتینیە دابـڕی لـە سـەدەی شەشـەمدا لـە كـاتی داهـاتنی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمدا زۆربەی هەرە زۆری كوردستانی ناوەند مەسیحی نشین بوو.

لە لایەكی ترەوە، كوردەكانی ئەنەدۆڵ بە دووشێوەی جیاواز، بەرامبـەر ئـەم ئایینـە نوێیـە ڕەفتاریان كرد، كوردەكانی ڕۆژاوا، واتە، ئەوانی پۆنتۆس و هەرێمـە ڕۆژاواییـەكانی كەپەدۆچـیا و كیلیكیا لە ناوەند و باكووری ئەنەدۆڵ، بەر لە سەدەی حەوتەم وەرگەڕانە سەر مەسـیحیەت، بـەڵام وەرگەڕانەكـەیان، وەكـو دوایـی دەركـەوت، بـە لەدەسـتدانی كـە سـایەتی نەتـەوەییان كەوتەوە، ئـەوەبوو سـەرتاپایان بـەر لـە تێرشـانی شـەپۆلی كۆچـەرە توركـەكان لـە سـەدەی دوانزەیەمدا بۆ ناو وڵاتی ئەنەدۆڵ، بووبوون بە یۆنانی، هەرچی كوردەكانی ڕۆژهەڵاتـی ئەنـەدۆڵ بوون، بە كیلیكیا و كەپەدۆچیای ڕۆژهەڵاتیشەوە هـەروەها هـەموو ئەوانـەی ڕۆژهەڵاتـی ڕووبـاری فورات، وەرنەگەڕان و هەر لەبەر ئەو هۆیەش كەوتنە بەر زەبری تۆڵەساندنی بیزەنتییەكان.

كاتێك لە سـەدەكانی (٨) و (٩)دا بیزەنتیـەكان، دانیـشتووانە غـەیرە مەسـیحییەكانیان لـە

سەرزەمینەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دەرو دەربەدەر کرد، زۆربەی بارە گرانەکە بەر کوردەکان کەوت، ئەوەبوو کوردەکانی کەپەدۆچیاو کیلیکیا بە کۆمەڵ دەرپەڕێنران (بڕوانە ڕەهەندەکردن و نیشتەجێکردنە زۆرەملێکان).

مەسیحیەت کارێکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر کوردستانی باشوور، بەڵام کەم و زۆر شوێن دەستی هەر هەیە، تەئسیری بیر و بۆچوونە مەسیحیتەبارەکان لەسەر یارسانیەت، نیشاندەری ئاڵوگۆڕکردنێکی ڕاستەوخۆیە لەنێوان هەردو ئایینەکەدا.

لەگەڵ کزبوون و تا کانەوەی مەسیحیەت لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی بە وڵاتەکەدا، کۆمەڵگای لاوازی مەسیحیی کورد، بەرەبەرە دەستی کرد بە وازهێنان لە ناسنامەی نەتەوایەتی کوردی خۆی و گەوزی دابۆلای ناسنامەیەکی نوێ بەخۆ چەسپاندن بە مەسیحیە سامی نەژادە دراوسێکانەوە. مەسیحییە سریانی (نەستۆریە)کانی مێزوپۆتامیا و کوردستان کە لەم دواییەدا ناوی ئەتنی "ئاسووری"یان لە خۆیان نا، لە ڕاستیدا تێکەڵەیەکی ئارامی نوێ دووی کورد و گەلانی سامی نەژادن کە چوونەتەوە سەر کۆنە زمان و ئایینی کەنیسەی نەستوری و زمانی کۆشکی شاهانەی شانەشینی کۆنی ئەدیابین. ژمارەیەکی زۆری ئەم مەسیحییە سریانیانە تا فەلاکەتەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، لە قوڵایی ناوچە چیاییەکانی کوردستانی باکووردا ژیان، دوور لە هەر جۆرە تەئسیرێکی ئەتنی یان ڕەگەزیی مەسیحییە سامییەکانی دەشتاییەکانی مێزوپۆتامیا، دیمەن و هەڵکەوتەی بەدەنی بەرچاوییان، بە پێچەوانەی "برا" سامیەکانی ناوچەی مۆسڵیانەوە، بەڵگەیەکی ترە لەسەر ڕەسەنی کوردی ئەوان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بە ئارامی نوێ دەدوون و پێ لەسەر ئەوەش دادەگرن کە خاوەنی ناسنامەیەکی ئەتنی جیاوازن، لە بواری زماندا، مەسیحییەکانی کوردستان، هەر وەکو جوولەکەکانی ئەوێ، بە ئارامی نوێ دەدوون.

بەڵام، هەموو مەسیحیە کوردەکان ئەوەندە بە تەنگی گۆڕینی کەسایەتی نەتەوەیی خۆیانەوە نەهاتوون شان بەشانی گۆڕینی ئایینەکەیان، بۆیە دەبینین یەکێکی وەکو (مەسعودی) مێژووناس و توێژەری سەدەکانی ناوەڕاست، لە نووسینێکیدا کە لە سەدەی دەیەمدا نووسیویەتی باس لە هەندێ کوردی مەسیحی دەکا کە خۆی دیونی. جگە لەمە،

سالّی ١٢٧٢ ماركۆ پۆلۆ نووسیویەتی دەڵێ "لەسەرزەمینە شاخاویەكانی هەرێمی مووسڵ، رەگەزێكی بەشەری هەیە كە پێیان دەڵێن "كورد"، هەندێكیان مەسیحی نەستۆری سەر بە تیرە یەعقوبییەكانن و هەنێكی تریان محەمەدین (مسوڵمانن – وەرگێڕ) (بڕوانە I.Vi،Travels) پۆلۆ باسی خەڵكانی مەسیحی غەیرە كوردی ناوچەكەشی كردووە، ئەمەش بۆخۆی بەڵگەیەكە لەسەر بوونی كوردی مەسیحی لە پاڵ ئەواندا.

لە هەمان كاتدا، توماریەندیەكی تەواو بەدەستەوەیە لەسەر وەرگەڕانی هەندێ كورد بۆ مەسیحیەت لەسەر دەستی مسیۆنێرەكان لە سەدەی (١٥)ەوە بەدواوە. نموونەیەكی سرنجكێشی ئەم چالاكیە، ئەوەیە كە قەشە (سوبحالەماران) بەجێی هێناوە (Nikitin1956-231). مسیۆنێریەكی زۆرتر لە ئەورووپاو دوایی لە ئەمەریكاشەوە لەو دەمەوە ڕەوانەی كوردستان كراون و هەندێكیان یەكەم بەركوڵی لێكۆڵینەوەیان لەسەر زمان و كەلتووری كوردی كردووە، كە لە ناویاندا هەندێ فەرهەنگی زمانیش بەرچاو دەكەن، (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی زوو). گۆڕانی ئایینی لە زۆربەی جارەكاندا، گۆڕانی زمانیشی بەدواوە بووە (بڕوانە مێژووی كلاسیك و كۆچە مێژووییەكان).

زۆربەی ئەو كوردانەی كە وەرگەڕانە سەر مەسیحیەت، دویماكار بوون بە ئەرمەنی و ئارامیی نۆ و بۆیە بە بەشێك لەم كۆمەڵە ئەتنیانە ژمێرراون، نموونەیەكی بەرچاوی ئەم پرۆسەیە لە كۆتایی جەنگی یەكەمی جیهانییدا ڕوویدا.

لە بەرودوای داڕوخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا، ژمارەیەكی زۆری مەسیحی كە تەنها بە زمانی كوردی دەئاخاوتن، سەرزەمینی ڕۆژاوا و باكووری كوردستانیان بەجێهێشت و ڕوویان كردە ئەو ناوچانەی سوریا كە لەژێر دەستی فەرەنسییەكاندا بوون، لەوێ پێیان وترابوو ئەگەر مەسیحی بن، "دەبێ ببن بە ئەرمەنی"، بۆیە پاش ئاماریەست لەناو كۆمەڵە ئەرمەنیەكانی سوریا و لوبناندا توانەوە.

هەندێ كوردی غەیرە مەسیحی ئەنەدۆڵ، تەنانەت كوردستانی ناوەندیش، ئێستاش لە كاتی پانكرانەوەی ناندا لەسەر دەرخۆنە پێش ئەوەی بیخەنە سەر ساج یان بیدەن بە تەنووردا خاچێكی لەسەر دروست دەكەن، هەروەها بۆ زیارەت دەچنە كۆنە كەنیشت و شوێنە ئایینییە پیرۆزەكانی مەسیحییە ئەرمەنی و ئاشوورییەكان. ئەمە لەوانەیە داب و نەریتێك بێ لای

کوردان کە هی داورسێیەتی دوورو درێژیان بێ لەگەڵ مەسیحییەکاندا، یان زۆریش لە گویندایە هی سەردەمی مەسیحیەتی خودی خۆیان بێ لەسەردەمانی دێریندا.

تەنانەت ئەمڕۆکەش، ژمارەیەك کوردی مەسیحی هەر ماون، بە تایبەتی لە ناوچەکانی هەکاری لە باکووری کوردستانی ناوەند، لە تورعابدین لە کوردستانی ڕۆژاوا، و لەناو گەلەهۆزەکانی میلانی و بەرازی لە کوردستانی ڕۆژاوا لە تورکیا و سوریا. سایکس (مەبەستی مارك سایکسە—وەرگێڕ)ساڵی ۱۹۸۰ باسی نزیکەی (۵۰۰) خێزانی مەسیحی کورد دەکا کە سەر بە هۆزی پنیانشی دانیشتووی ناوچەی هەکاری بوونەو سەرۆکەکانیان لای ئەو بە توندی پێیان لەسەر ئەوە داگرتوە کە سەر بە کۆمەڵگایەکی دێرین بوونە کە پێش لە داهاتنی ئیسلام وەرگەڕاوە، شان بەشانی (۷۰۰) خێزانی تری سەر بە هۆزی دیکەی هەرێمەکە. بەهەرحاڵ سایکس نە لە دوور نە لەنزیکەوە توخنی مەسیحییە میلانییەکان ناکەوێ. لەگەڵ ئەمەشدا، پرسیارێك لە گۆڕایدا هەر دەمێنێتەوە، ئایا ئەمانەو هی تریش، بە ڕاستی وەچە و بنەچەی ئەم سەردەمەی کۆمەڵگا کوردیە مەسیحیەکانی سەردەمانی کۆنن، یا خۆ نۆ مەسیحی تازە وەرگەڕاوی سەر دەستی مەسیحیە ئەرمەنی و ئاسووری و مسیۆنەریە مەسیحییەکانی ڕۆژاوان؟ مەڵبەندێکی زۆر بۆ ئەم تازە وەرگەڕاوانە لە سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەناوەوە و دەوروبەری بتلیس و ئورفە و مووسڵ و ورمێ و سەلماس و گەلێ جێی تر کرابوەوە. لەوانەشە، کۆمەڵگای مەسیحی کورد لە تێکەڵەی کۆمەڵگا کۆنەکان و تازە وەرگەڕاوەکان پێکهاتبێ.

بە گوێرەی مەزەندەی کەسانی شارەزا، ژمارەی گشتی کوردە مەسیحییەکان (ئاشوورییەکانیان لێدەرچێ کە خۆ بە ڕۆڵەی نەتەوەیەکی جیا دادەنێن) خۆی دەدا لە دەیەها هەزار کە زۆریەیان لە تورکیا دەژین.

ئێستا، سەرلەنوێ کەڵکەڵەی کاری مسیۆنەریی لە کوردستاندا چۆتەوە ناوێشکی ژمارەیەك ڕێکخراوەی مەسیحی ئەوروپییەوە، بەتایبەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ڕاستییەکەی، یەکەم زمان کە پاش سەردەمی ڕاپەڕین لە ئەوروپا ئینجیلی وەرگێڕراوەتە سەر کوردی بووە، ئێستا هەوڵ لە ئارادایە بۆ وەرگێڕانی سەردەمی نوێی ئینجیل بۆ سەر کرمانجی ژووروو (بادینانی). ئامانجی ئەم چالاکیانە، هەر وەکو سەردەمی قەشە سوبحەلەمەران، هەر کوردەکانی

توركیایە.

هۆی ئەم هەولانە بۆچوونی هەڵەی ڕێكخراوە مسیۆنەریەكانە كە گوایە كوردەكانی كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا لە ئەنەدۆڵ، چونكە لە كۆندا لەژێر دەستی بیزەنتییەكاندا بوونە، دەبێ هەموو یان زۆربەیان مەسیحی بووبن. ئەمە كوردەكانی تر ناگرێتەوە، لەوانەیە مسیۆنەریەكان زۆرتر لە ناوەند و هەندێ بەشی باشووری كوردستان سەركەوتوو بووبن، واتە لەسەرزەمینەكانی پادشانشینە كۆنەكانی كوردانی ئەدیابین و كەرخوبت سلۆخ (كەركووك)، بەلام هەرگیز لە كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا وانەبوە. و لەبەر ئەوەی ئەمان زۆر مەیلیان بەلای مەسیحیەتەوە نەچوە، بیزەنتییەكان وا داریوون لە سەردەمانی زووتردا دەریەدەر و ئاوارەیان بكەن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Asahel Grant, *The Nestorians, or the Lost Tribes* (London, 1841); Thomas Laurie, *Dr. Grant and the Mountain Nestorians* (Cambridge, 1853); Helga Anschütz, *Die syrischen Christen vom Tor 'Abdin* (Würzburg: Reinhardt, 1984); Michel Chevalier, *Les montagnards chrétiens du Hakkari et du Kurdistan septentrional* (Paris: Département de Géographie de l'Université de Paris-Sorbonne, 1985); John Joseph, *The Nestorians and Their Muslim Neighbors* (Princeton: Princeton University Press, 1961); John Joseph, *Muslim-Christian Relations and Inter-Christian Rivalries in the Middle East: The Case of the Jacobites in an Age of Transition* (Albany: State University of New York Press, 1983); G.P. Badger, *The Nestorians and their Rituals* (London, 1892); Marco Polo, *Travels*, ed. John Masefield (London: Dent, 1975); Basile Nikitine. "Les Kurdes et le Christianisme," *Revue de l'Histoire des Religion* (Paris, 1929); William Ainsworth "An Account of a Visit to the Chaldeans Inhabiting Central Kurdistan, and of an Ascent of the Peak of Rowandiz (Tur Sheikhiwa) in the Summer of 1840," *Journal of the Royal Geographical Society* XI (1941).

# بابیەت و بەهائیەت

بابیەت، ساڵی ١٨٤٤ لە ئێران لەلایەن میرزا عەلی محەمەدەوە (١٨١٩–١٨٥٠) داهێنراوە. باب واتە دەرگا، یان دەرگا بۆ گەیشتن بەخودا–باب، یان بابا، کە بە مانای "بەرجەستەکەر" دێت بێگومان ئەو نازناوەیە، کە تیرەی فریشتەکان بۆ ئاماژەکردن بۆ دۆناودۆنە سەرەکیەکانی "حەق" یان ڕووحی گەردوونی بەکاریان هێناوە، باب خۆی کە بە بنەچە خەڵکی شیراز بوە (ئێران)، بوە بە موریدێکی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی، کە کاتی خۆی لە ئەحساوە هاتووە و لە کرمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران نیشتەجێ بووە. ئەحسا (کە لە سەدەکانی ناوەندا بە لەحسا بەناوبانگ بووە. هەرێمە دەم دەریاییەکانی ڕۆژهەڵاتی سعودیەی ئێستا دەگرێتەوە)، قەڵای قایمی بزووتنەوە کۆمەڵایەتی– ئایینییەکەی قەرمەتیەکان بوو، کە تیرەی فریشتەکان، بەتایبەتی بزووتنەوەی مەزدەکییەت کارێکی زۆری کردبوە سەر (هەر لەم ئەحسایە خۆیەوە لە سەدەی پانزدەدا محەمەد نووربەخش سەری هەڵداوە، کە بەر لەمە باسی پەیوەندییمان لەگەڵ تیرەی فریشتەکاندا کردووە – بڕوانە ڕێبازیەندی سۆفیگەری).

شێخ ئەحمەد و لەو دارەتەوە تیرەی فریشتەکانیش، کاریگەرییەکی بەتینیان کردبوە سەر میرزا محەمەد عەلی باب. ڕاستییەکەی، شێخ ئەحمەدی ئەحسانی لە کرماشانی باشووری کوردستان، واتە لە دڵی دێرینی تیرەکەوە، کاتی خۆی. ڕووحی خۆی بۆ باب وەکو بەرجەستەکەری نوێ دۆنادۆن کرد. ئەمەی لە بۆنەی مردنی عەلی کوڕیدا کرد، ئەوەبوو شێخ ئەحمەد هەمیشە بە موریدانی دەوت: "خەم مەخۆن، یاران چونکە من عەلی کوڕم نەزرکردبوو بۆ عەلی (گەورە–وەرگێڕ) کە هەموومان چاوەڕوانی دەرکەوتنین، و ئەوم بۆ ئەم مەبەستە بەخێو و ئامادە کردبوو. "Nabili A'azam-1932" باب لە هەمان ساڵدا لەدایکبوو و گوایە هەم ڕووحی شێخ و هەم ناوی ئەویشی وەرگرتبوو. باب هەڵگری ناو و ڕووحی عەلی ئیمامی شیعەو بەرجەستەکەری سەرەکیی دووەم دەوران بوو، دوایی سەریارکردنی ناوی عەلی بۆ سەر ناوی خۆی لە هەمان کاتدا ئەوی بۆ پلەی بەرجەستەکەری سەرەکی لە عەلەویەتدا بەرز کردەوە، (بڕوانە عەلەویەت).

بابیـەكان، بەتایبـەتی كوردەكانیـان، باوەڕیـان بـە دۆنـاودۆنكردنی ڕووح هـەبوو، بەهـەمان شێوەی هەوادارانی تیرەی فریشتەكان، ئەوان هەرگیز بۆ مردوو پرسەیان دانەدەنا، چونكە لـەو باوەڕەدا بوون كەوا ڕووحی هەر بابییەك پاش چەند ڕۆژێكی كەمی قۆناغی گواستنەوە، دەچێتە لەشی بابییەكی ترەوە، كە زیاتر منداڵێكی تازە لەدایكبوو دەبێ. بە باوەڕی ئەوان دۆناودۆنەكان لە سەردەمانێكی زۆر دێرینەوە ڕوویان داوە، بەتایبەتی ڕووحی ڕابەرە ئایینییەكان، كە گوایە لە لەشی پیاوچاك و شەهیدە هەرە كۆنـەكانی شیعەكاندا جێگیر بوونـە. بابیـەكانیش هـەروەها، تۆمەتی تێكبەربوونی نێر و مێ یان لە "بەزمی پف لە چراكردندا" خرابوە پـاڵ (بڕوانـە تـیرەی فریشتەكان) و لە ئێراندا ئەوەندە بەدڕندەیی ئازار و ئەشكەنجە درابوون كە زوڵم و ستـەمەكانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر یەزیدیەكان لە چاویدا ئاو خواردنەوە بوو.

شـێوەگلانی كوردەكـان لـە بابیەتـدا تـا ڕادەیـەك قـووڵ بـووە. یـەكێك لـە كـۆڕە هـەرە سەرەكیەكانی كۆنی بابیەكان كورد بـووە و بـە ژمـارە خـۆی داوە لـە ٥٠٠٠ كـەس. ئـەم كۆڕە لەنێوان شاری باشقەڵا و قوتووری وڵاتی هەكاری باكووری ناوەندی كوردستان و لەسەر سنووری ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بووە، بەهەرحاڵ، لە جولای (تەمووز)ی ١٨٥٠ كاتێك ناسرەدین شای پادشایی قەجەری ئێران فەرمانی لە سێدارەدانی بـابی لـە تـەورێز دەركـرد، هێزەكـانی هـۆزی شكاكی كورد و ئەرمەنیەكان فەرمانەكەیان جێبەجێ كرد.

ئەوەندەیەكی پێ نەچوو كە بابیەت، لەژێر سەراسویی كردنی میرزا حوسەین عەلی بەهائوڵڵا "ڕەونەقی خودا"دا ڕەنگوڕوویەكی جیهانداریەتی وەرگرت. لە ماوەی دوو ساڵی پێش ڕاگەیاندنی ئایینە نوێیەكەی و كاری ڕاگەیاندنی لە ئەڤریل (نیسان) ١٨٦٣دا، بەهائوڵڵا لە شاری كوردنشینی سلێمانی (كە كەمتر لە ٣٠ میل لە بەرزنجەی زادەگای ئەفسانەواری تیرەی فریشتەكان دوورە)، ژیا، لەوێ بژێوی خۆی بە پێشنوێژیی بۆ دانیشتووان بە ساختەناوی دەروێش موحەممـەدەوە بەسەر برد، گەلێ لەو دراوانەی كە بە جەژنانە داویە بە خەڵك، هێشتا وەكو دیاریەكی پیرۆز لایان پارێزراون و گەلێ كەس بۆ پەڕاندنی نەخۆشی لە بیماران بە كاریان دەهێنا. لە "الایقـان"دا كـە ناوی یەكێك لـە كتێبەكانیـەتی، بـەهائوڵڵا وێنەیـەكی جـوان و سرنجكێشی لـە بـارەی مـاوەی "خەڵوەتنشینیەكەی" كوردستانییەوە گێڕاوەتەوە.

محەممەد زەكی ئەلكوردی، كە بەهائیەكی كـوردە، سـاڵی ١٩٢٠ یەكـەم خانـەی پـەخش و

بڵاوکرنەوەی کوردی لە قاهیرە دامەزراندوە. لەوێ بڵاوکردنەوەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی، "کوردستان"ی گرتە ئەستۆ، (کوردستان لە پێشدا ساڵی ١٨٩٨ لە ئەستەموولْ دەرکرا بێ ئەوەی ئەو بەشداریێ* تێیدا)، دوایی پاش بەرپابوونی شەڕی یەکەمی جیهانی گوێزرایەوە قاهیرە. هەندێ بابەتی هەرە گرنگی ئەدەبیاتی بەهائی، وەکو "بەهائوڵلا و چەرخی نوێ" کەی جەی. ئی. ئیسلمۆنت وەریگێڕاوەتە سەر شێوەی سۆرانی (لەلایەن حوسێن** جەودەتەوە) ئینجا گۆرانی (لەلایەن نەناسراوێکەوە).

بەهائیەت ڕەنجێکی زۆری بە خەرج داوە تا خۆی لە بابیەت دوور ڕاگرێ. لە بەرگ و شێوەی ئایینێکی جیهانی نوێشدا، بەهائیەت هەوڵیداوە خۆی لە بای شیعەگەریی و تیرەی فریشتەکانیش (بەتایبەتی یارسانیەت) کە لە بابیەتدا بە زەقی دیاربوون، تەریك بگرێ. مینۆرسکی ساڵی ١٩٢٠ تەنها ناملیکەیەکی داکۆکیکارانەی بەهائیەکانی دەست کەوتووەو دوایی وەریگێڕاوە کە دژ بە یارسانیەکان دواوە. لەگەڵ ئەوانەشدا، گەلێ شێوە و وێنەی تیرەکە هێشتا بە زەقی بە بەهائیەتەوە هەر ماون، لەوانە: ١) جیهانگەری: واتە ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ ئایینەکانی تر بریتیین لە درێژەی هەمان بیرۆکەی ڕەسەنی ئیمان و هەمووشیان وەکو یەك جێی ڕێزن: ٢) باوەڕ بەوەی کە هەموو پێغەمبەر و چاکانی ئایینەکانی تر وێنەی خوداوەندیەتی یا ڕووحی باڵان، هەر لە بوذا و زەردەشتەوە بیگرە تا دەگەیتە مووساو عیسا و محەممەد ٣) باوەڕیەوەی گفتەی خودا هەروەها ڕووحیشی لەلایەن سەرفریشتەیەکی میانجیکەرەوە هاتوونەتە ناو دەڕوونی پێغەمبەرانەوە ٤) ئامادەبوون و جێبەجێکردنی بەزۆری کۆبوونەوەیەکی گشت یارانیی لە (مەحفەلەکان) وەکو کۆبوونەوەی "جەم"ی تیرەی فریشتەکان. بەڵام ئەم کۆبوونەوەیە دەبێ لە (١٩)ی هەر مانگێکدا بکرێ ٥) ئازادی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بۆ ژنان و بەرزراگرتنی ڕێزیان بە مافی کارکردنەوە لە ئەنجوومەنە بەرزە ئایینیەکانیشدا طاهیرە قورەتولعەینی بەرجەستەکەری مێینەی زنجیرەی دۆنادۆنی سەرەکیی بابیەکانی ساڵی ١٨٤٩ بە ئاشکرا و لەناو گشت کۆمەڵدا بە نیشانەی یەکسانیی نێوان ژن و پیاو پێچەی فرێداو کردی بە بنەڕەتێکی سەرەکیی ئایینی نوێی بابیەك (بڕوانە

* (کوردستان) لە ئەستەموولْ دەرنەکراوە، تەنها لە قاهیرە چاپکراوە.

** مەحموود جەودەت نەك حوسێن جەودەت.

بابەتی پلە و پایەی ئافرەت و ژیانی خێزانی). بەهائیەت لە كوردستاندا كەمتر بڵاو كرایەوە، چونكە ئایینەكە لووتی لە بڵاوبوونەوەی گشت جیهاندا بوو. كوردستان خاكێكی بەپیت بوو بۆ ئەم ئایینە نوێیە كە گەلێ شێوەی نزیكی تێدابوو لەگەڵ بەها ئایینی و كۆمەڵایەتی و داب و دەستووری كوردانـدا. ژمـارەی كـوردە بەهائیـەكان لـە چـەند هـەزارێك تێناپـەڕێ كـە لـە كوردسـتانی باشـوور و ناوەنـد ئەمڕۆكـە دەژیـن، لـە بـارەی ژمـارەی ئـەو بابییانـەوە كـە لـە كوردستان ماون پیاو پركێشی ناكابێ پەروایانە ژمارە بدات.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Muhammad Zarandi Nabil-i A'zam, *The Dawn-Breakers, Nabil's Narrative of the Early Days of the Bahá'i Revelation*, trans. and ed. Shoghi Effendi, (New York, 1932); J.E. Esslemont, *Bahá'u'lláh and the New Era* (Wilmette, Illinois: Bahá'i Publishing Trust, 1980, reprint of the 1923 original); E.G. Browne, *A Traveller's Narrative written to illustrate the Episode of the Bab*, 2 vols. (London, 1891); E.G. Browne, *Materials for the study of the Babi Religion* (London, 1918); E.G. Browne, "Bâbis of Persia," *Journal of Royal Asiatic Society* xxi (1898); Abbas Amanat, *Resurrection and Renewal: The Making of the Babi Movement in Iran, 1844-1850* (Ithaca: Cornell University Press, 1989); V. Minorsky, "Notes sur la secte des Ahlè Haqq," *Revue du Monde Musulman* 40–41 (1920 and 1921).

# فەسڵی شەشەم

## زمان، ئەدەب و چاپەمەنی

### زمان

شێوەی زمانەکانی کوردی بەشێکن لە چڵی باکووری ڕۆژاوای لقی ئێرانیی خێزانی زمانە هیندۆئەورووپییەکان، وشەیەکی زۆری کوردی لەگەڵ ئینگلیزیدا هاوڕەگن: گەمە = گێم، مارە = مێری، ستارە = ستار، ڕووبار = ڕیڤەر، دۆڵ = دێڵ یان ڤالی، برا = برازەر، مانگ = موون، سنۆی = سنۆ، فیرۆ = فری (وەکو لە Free of chargeدا)، ستاندن: توستاند (to stand) سور = شوور (sure) و گەلێکی تر، بەڵام نزیکترین زمانی ناو خێزانەکە کە لە کوردی زمانی فارسییە کە زمانی ڕەسمی وڵاتەکانی ئێران، ئەفغانستان و تاجیکستانە. خزمایەتی نزیکی کوردی و فارس وەکو خزمایەتی ئەڵمانی و دانیمارکی وایە.

زاراوە کوردیەکان بەسەر دوو گرووپدا دادەشکێن: ١) گرووپی کرمانجی، کە لە دوو لقی سەرەکیی پێکدێ: بادینانی (یان کرمانجی ژوورو = باکوور) و سۆرانی (یان کرمانجی خوارووو = باشوور) و ٢) گرووپی پەهلەوانی (یان پەهلەوانیك) کە ئەمیش لە دوو لقی سەرەکیی پێکدێ: دیمیلی (یان زازا) و گۆرانی (هێڵبەندیی ٢ و نەخشەی ٣٩). ئەمانەش زیاتر پەلیان وەشاندووە بۆ چەندین زاراوە و نیمچە زاراوە، هەندێکیان، وەکو هەورامانی و لەکی (کە هەردوو زاراوەی سەرەکیی گۆرانین) بارستێکی گەورە و گرانی ئەدەبیاتی نووسراویان لێ کەوتۆتەوە کە هی زیاتر لە هەزار ساڵی ڕابردوون. بەگوێرەی بۆچوونی مینۆڕسکی وشەی کرمانج لە پێکەوەلکاندنی (کورت) و (ماند)ەوە دروست بووە. هەردووکیان پێکەوە وشەی

(کوردی مادی)دەدەن. لێکدانەوەیەکی تر کە لەوانەیە لەمە بەهێزتریێ دەڵێ: دەشێ وشەکە لە "کورتماننا"وە هاتبێ واتە " کوردی مانی"، وەکو دەیزانین، زادەگای کرمانجان وڵاتی هەکاریە، کە دەکەوێتە ناوچەرگەی مەرز و بوومی ماننناوە (بۆ زانیاری لە بارەی ماننناوە بڕوانە مێژووی کۆن).

کۆنە ناوی پەهلەوانی کە بە زاراوەکانی گۆران و دیمیلی و هەندی زاراوەی نزیکی تری کۆنی کوردان دەوترا ئێستا بەکار ناهێنرێ، چ لەلایەن کورد و چ لەلایەن غەیری کوردەوە. پەهلەوانی کە لەلایەن نووسەرانی سەدەکانی ناوەندەوە بەکاردەهێنرا، ئێستا وەکو سەرناوی ئەو زاراوانەی لێی بوونەتەوە لە کار کەوتووە.

ئاشکرایە کە وشەی پەهلەوانی خۆی لە خۆیدا ڕێك لە "پەهلەوەند" واتە "پەهلەیی"یەوە هاتووە، بە پەهلە کوردستانی باشوور و باکووری لورستانی گرتبووەوە، کە لەوانەیە وڵاتی ئەسڵی زمانەکە بووبێ. پاشگری (وەند) لە فەسڵی "هۆزەکان"دا باسکراوە. وشەی پەهلە ئێستاش بە چەوتکراوەیی لە وشەی "فەیلی"دا هاتووە کە هۆزە ناوێکی کوردیە و کە هێشتا لە کوردستانی باشوور و لە کۆنە مەڵبەندی (پەهلە) دەژین.

لەبەر نەبوونی ساوساباتی دەوڵەتێك کە ئەرکی خەملاندنی زمانێکی ستاندەردی کوردی بگرێتە ئەستۆ، کوردەکان تا ئێستاش بە چەندین زاراوەی جۆراوجۆر دەئاخاون، هەرچەندە هەوڵی سەرکەوتووی کوردان لە ئارادایە بۆ دارشتنی زمانێکی ستاندەردی نەتەوەیی (بڕوانە پەروەردە و ناسنامەی نەتەوەیی).

ئەگەر بمانەوێ گرووپە زمانی کوردی لەگەڵ زمانە ڕەسەنە لاتینیەکاندا بەراوردکەین، خزمایەتی نێوان کرمانجی و پەهلەوانی، دەتوانین بە هی نێوان فەرەنسی و ئیتالی بشوبهێنین. هەر وەکو ئەم زمانە لاتینی ڕەسەنانە وەچی نوێی زمانی لاتینین و گۆڕانێکی جۆرا و جۆری زۆریان لە زمانی دایك بەسەر هاتووە، بەهەمان شێوە شێوەکانی کوردی ئەم سەردەمە وەچی یەك زمانن کە ئێستا نەماوە و ئاسەواری سڕاوەتەوە و دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی پێ بڵێین "میدیایی" یان "کوردی سەرەتایی" (بڕوانە هێڵبەندی ژمارە ٢).

کرمانجی و پەهلەوانی، بەهەمان شێوەی فەرەنسی و ئیتالی، وەکو دوو زمانی بە تەواوەتی جیاوازیان لێهاتووە نەك دوو شێوەی یەك زمان. لێك جیاوازیەکانیان ئەوەندە شاشن

کە بە هیچ پێودانگ و ستاندەردێکی زمانەوانی ناتوانرێ بە شێوە زاراوەی یەك زمان دابنرێن. جگە لەمە، ئاستی لێکگەیشتن لەنێوان قسەکەران بە هەردوو زمان، لە چاکترین بارودۆخدا لە (٥٠٪) ناترازێ. ئەم دوو شێوە زمانە کوردیە ئێستا بە شێوەیەکی یەکسان بەکار ناهێنرێن، چونکە سێ بەشی کوردان بە کرمانجی دەدوێن و بەشەکەی تری پەهلەوانی، ئەم جیاوازیە ئاکامی ڕاستەوخۆی ئەو جێگۆڕکێ مێژووییە گەورانەیە کە دانیشتووانی کوردستان هەر لەناوەڕاستی سەردەمی کلاسیکەوە شێوەی ئاڵێنراون، لە پاڵ داهاتنی ئایینی نوێ نوێ کە زۆرجار بوونە بە مایەی گۆڕینی شێوەی ئاخاوتنی ناوخۆیی و فەرهەنگ و ئابووریش (بڕوانە کۆچکردنە مێژووییەکان و ئایین) ئەم گۆڕانانە تەنها لە زمانی کوردانددا دەرناکەون بەڵکو لە هەموو گوڵەنگەی ڕەنگاو ڕەنگی کەلتوور و کۆمەڵایەتی و هی تردا خۆیان دەردەخەن، (بڕوانە پەل و پۆ هاوێژیە ناوخۆییەکان) چەندایەتی ئەو ئەدەب و سیستەمی نووسینەی کە لە هەر یەکە لە شێوەزارە کوردیەکاندا بەکارهێنراوە، لە بابەتی ئەدەب و پەروەردەدا باس کراوە.

ئەوی زیاتر ئەم مەسەلەیە گرێواوی ئەکا ئەوەیە، نە لای کوردەکان خۆیان، نە لای شارەزا ڕۆژاواییەکان ناوبەندییەکی تایبەتی بۆ ئەم لق و پەل و پۆپانەی زمانی کوردی نیە کە پێی لێك جیا بکرێتەوە. هەموو ناوبەندیە ئەو ناوخۆییانەی هەن لەسەر ئەو بنەڕەتە دانراون کە چۆن بیستەر وشە نا ئاشناکانی بەرگوێ دەکەوێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە، دیمیلییەکان خۆیان و زمانەکەشیان، بە (زازا) ناسراون لە لای بادینانی دووەکان چونکە پیتی (ز) لە قسەکانیاندا زۆر دووپات دەبێتەوە (Nikitin 1926)، کەچی دیمیلییەکان زاراوەی بادینانی و بەکارهێنەرانیشی بە (خەرەوەرە) ناوزەد دەکەن.

خێزانی زمانە هیندو ئەورووپییەكان
3500 BC
3000 BC
2500 BC
2000 BC
1500 BC
1000 BC
WEST IRANIC
To Kurdish
IRANIC
East Iranic
Kâfaric
Dardic
Indic
EASTERN
Armenian
Baltic
Balto-Slovonic
Slavic
"PROTO INDO-EUROPEAN"
Southern
Anatolian
"Tocharian"
Germanic
Hellenic
Illyrian
Western
Phyrigio-Thraco-Bithynian
Italic
Venetic
Mesopic
Celtic
3500 BC
3000 BC
2500 BC
2000 BC
1500 BC
1000 BC
هێڵبەندیی زمانی كوردی لە چوارچێوەی لقی ئێرانی ناو خێزانە زمانی زمانە هیندۆ ئەورووپییەكاندا.
هێڵبەندی زمانی كوردی و زاراوە سەرەكییەكانی
تێبینی: ئەو مێژووانەی بۆ جیابوونەوەی هەر لقە زمانە دانراون زۆر نزیك خراوەن.

* Only The Kurdish Group Is Shown In Detail.

زمانە هیندۆئەورووپییەکان لقی زمانی ئێرانی * گرووپی زمانی کوردی

گورانیەكان سۆرانیەكان بە (كوركورە) و (واوا) و سۆرانیەكانیش گورانیەكان و زاراوەكـەیان بە (گورانی یان ماچۆ ماچۆ) و بادینانی و زاراوەكەیان بە (ژ بابوو) ناو دەبەن. جا بابێینە سـەر ئەوەی ئایا ئەوانەی بەم زاراوانە دەدوێن، خۆیان بە زاراوەكانیان دەڵێن چی؟ ئەمـە بابەشـێكی خۆشـە. گورانیـەكان بـە زمانەكـەی خۆیـان دەڵێن "كـوردی"، لـە هـەمان كاتـدا سـۆرانیەكی ئاساییش بە زمانەكەی خۆی دەڵێ "كوردی"، ئەمە ناوی زمانە گشتییەكەیانە نـەك نـاوی ئـەو زاراوە ناوخۆییانەی كە بۆ هەر یەكەیان، لە كاتی پێویست و بە گـوێرەی جـێ و كـات نـاوێكی تایبەتی دادەنێن. ئەوانەی بە كرمـانجیی ژووروو (بادینـانی) دەدوێـن بەشـێوەیەكی گشتی بـە زمانەكەی خۆیان دەڵێن "كرمانجی" و هەرگیز ناوی "كوردی" لـێ نـانێن. ئەمـە مەسـەلەیەكە كە سرنجێكی زۆر دێنێ، چونكە ئەگەر بە ژمارە و هـەژماڵ بـێ، ئەوانـەی بـە كرمـانجی بـاكوور دەدوێن، وەكو باسمان كرد، زۆرینەی زۆری كوردان پێكدێنن، كەچی لە بەرامبەردا گورانیـەكان بە گشتی، دوایـی زۆربـەی كرمانجییـەكانی باشـوور بـە زمانەكـەی خۆیـان دەڵـێن "كـوردی". دیمیلیەكان لەناو خۆیاندا بە زمانەكەی خۆیان دەڵێن "دیمیلی" و ئەگەر بۆ كـوردێكی تـر، یـان كەسێكی تر، باسی بكەن، پێی دەڵێن زازا.

كوردە ڕۆشنبیرو شارەزاكان، ئێستا بۆ ئەم زمان و زاراوانـە، هـەمان ئـەو ناوانـە بـەكاردێنن كە لەم كتێبەدا هاتوون. تاكە شتێك كە لەمە بەدەربێ، ئەو نـاوە تـۆزێ گاڵتـە ئامێزەیـە، واتـە زازا، كە بۆ دیمیلی خۆیان و زمانەكەیان بەكاردێ و هەموو ئەو هەوڵ و تەقەلایەی كـە كـوردانی ڕۆشنبیر و پسپۆڕ داویانە و دەیدەن بۆ گۆڕینی كۆنە ناوەكان بە ناوی زیاتر لـە بـار و گونجـاو، تا ئێستا نەیتوانیوە هیچ بۆ گۆڕینی "زازا" بكا.

بابەت و بارودۆخی زمان لە كوردستان، لە ڕاستیدا، لە بـارێكی ئەوەنـدە دژواردا نیـە وەكـو ئەو بابەتبەنـدی و (تێرمینۆلۆجییـەی) سـەرەوە دەری دەخـەن. وێكچوونی بنـەڕەتیی نێـوان هـەردوو بەشـەكەی كرمـانجی، واتـە بادینـانی و سـۆرانی، تـا بلێـی بـەهێزە و قـسەكەر بـە هەریەكەیان دەتوانی تا ڕادەیەكی ئەقڵبڕ لە بەرامبەرەكەی بگات و چەند ڕۆژێكـی قـسەكردن و پراكتیزەكردن گرێیان لەبەیندا ناهێڵێ. هۆی ئەمەش ئەوەیە كە هەردوو زاراوەكە گەلێك دێرینـە كەلێك جیابوونەتەوە، واتە لەوانەیە زۆر زۆر بڕوا، لە (٣٠٠– ٤٠٠) ساڵ تێنەپەڕێ.

لە دووتوێی هەردوو زمانە كوردیەكەدا، گۆڕانێكی زمانـەوانی بەرچـاو لـەناو زاراوەكـانی نـاو

هەریەکەیاندا ڕوویداوە. بۆ نموونە، ئەگەر کرمانجی بگرین، دەبینین لە کاتێکدا بادینانی هێشتا چون جاران جیاوازی ڕەگەزی هەر پێوەدیارە، کەچی سۆرانی هیچ ئاسەواری جیاوازی ڕەگەزی تێدانیە. ناو لە زاراوەی هەورامانی سەربە گۆرانیشدا ڕەگەزی هەیە، لە کاتێکدا لەکیی نیەتی چونکە بەتەواوەتی لە دەستیداوە لەلایەکی ترەوە، ئەو کردارانەی لەگەڵ بەرکار(مفعول) ڕێك دەکەون نەك کارا(فاعل) لە هەموو زاراوەکانی کرمانجییدا هەن، بەڵام لقی پەهلەوانی لەم دارەڕا گرماتیکیەدا بەشدار نیە.

هەندێ شارەزای زمان جاران وای بۆ دەچوون کە کرمانجی (بە هەردو لقی باکوور و باشوورییەوە) هەر خۆی "کوردی ڕاست و دروستە" و بەمە لقی پەهلەوانیان بە کوردی نەدەخوێندەوە. ئەگەر بەم دانانە مەبەستیان ئەوە بووبێ کە پەهلەوانی بەشێك نیە لە کرماجی ئەوا هیچ قسەیەکمان نیە بە هەرحاڵ، وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، سەیر ئەوەیە لەم بوارەدا کەوا گۆرانەکان هەمیشە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە زاراوەکەی ئەوان کوردیی ڕاستەقینەیە، زۆربەی هەرە زۆری کرمانجەکان (کە بەکوردی ڕاستەقینە دادەنرێن) هەرگیز لە بارەی زاراوەکەی خۆیانەوە وانالێن بەڵام پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە پەهلەوانیەکان لە ڕووی ئەتنییەوە کوردنین، تەنها لەکەم ئاگاداریی لە مێژوو و کۆمەڵگای کوردەوە سەری هەڵداوە.

گۆرانەکان و دیمیلیەکان، کۆنترین بەشی نەتەوەی کوردن کە بتوانرێ بێ یەکو دوو دەستنیشان بکرێن— واتە گەلێ کۆنتر لە کرمانجەکان ئەوان لەپێش داهاتنی ئیسلامەوە لە سەدەی حەوتەمدا، بەردەوام خۆیان بەکورد زانادووە و خەڵکیش هەر بەکورد ناسیونی (بڕوانە مێژووی کلاسیك) زمانەکەیان لە ڕووی زمانەوانیەوە لەناو هەر گرووپێکدا کلاسیبەندی بکرێ، خۆیان لە ڕووی ئەتنییەوە هەر بە کوردی دەمێننەوە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوە بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** D.N. MacKenzie, "The Origins of Kurdish," *Transactions of the Philological Society* (London, 1961); Mohammed Mokri, "Kurdologie et Enseignement de la Langue Kurde en URSS," *Revue de la Société Ethnographie de Paris* (1963); C.J. Edmonds, "Some Developments in the Use of Latin Characters for the Writing of Kurdish," *Journal of the Royal Asiatic Society*, 2 parts (London, 1931 and 1933); Amir Hassanpour, "The Language Factor in National Development: The Standardization of the Kurdish Language, 1918-1985," unpublished doctoral dissertation (Urbana, Illinois: University of Illinois, 1989); Basile Nikitine, "Kurdish Stories from My Collection," *Bulletin of the School of Oriental and African Studies* IV (1926-28); V. Minorsky, "The Gûrân," *Bulletin of the School of Oriental and African Studies* XI (1943-46).

# كرمانجی

بڵاوترین زاراوەی زمانی كوردی ئەمڕۆ زاراوەی كرمانجی (یان كرمانچا)یە كە نزیكەی سێ بەشی كوردەكان ئەمڕۆكە پێی دەدوێن. كرمانجی، بەسەر دوو لقدا دابەش دەكرێ، باكوور (كە بادینانیشی پێ دەوترێ) و باشوور (كە سۆرانیشی پێ دەوترێ).

كرمانجیی باكوور، یان بادینانی، زمانی زۆربەی كوردەكانی توركیا و نزیكەی هەموو كوردەكانی سوریا و یەكێتی سوفیەتی جاران، و زمانی باوی كوردەكانی خوراسانیشە لە ئێران (نەخشەی ژمارە ٣٩).

ئەوی ڕاست بێ، هەر كرمانجی باكوور خۆی، زمانی تۆزێ لەسەرووی نیوەی كوردەكانە و بەوە زاراوەی هەرە باوی كوردیە. ژمارەی ئەوانەی پێی دەدوێن خۆی دەدا لە (١٥) ملیۆن. وردە زاراوە سەرەكیەكانی بریتین لە بوهتانی، بایەزیدی، هەكاری، ئورفەیی و بادینانی.

كرمانجی باشوور، یان سۆرانی، زمانی خەڵكێكی زۆری كوردە لە ئێران و عێراقدا. ژمارەی ئەوانەی پێی دەدوێن، بە گشتی خۆی دەدا لە (٦) ملیۆن. لقەكانی بریتین لە موكری، ئەردەلانی، گەرمیانی، خۆشناو، پشدەر، وارماوا، كرماشانی و هەولێری (یان وڵاتی باشوور). دەتوانرێ هێڵێك بكێشرێ بۆ دابەشكردنی هەرێمە بە سۆرانی دوەكان بۆ دوو بەش. بەشێكی فارسێنراو لە ڕۆژهەڵاتی باشوور، و بەشێكی پابەندتر كە دەكەوێتە باكووری ڕۆژاواوە و لە بیجارەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە كفری، بیناكاری كردار (ergative). لە سۆرانی فارسێنراودا خەریكە دوای دەبڕێتەوە، كاتێكدا لەو بەشەی باكووری ڕۆژاوا دا كە نە فارسێنراوە هەر باوە. هەروەها، لەژێر كارتێكردنی زمانی عەرەبی و ئارامی نوێدا، بەشی باكووری ڕۆژاوای زاراوەی سۆرانی هەردوو دەنگی (عەین و حێ—ع و ح) كە لە زمانە كوردیەكانی تر و تەنانەت لە گشت زمانە هیندۆئەورووپیەكاندا نییە، گرتوتە خۆ، جا چونكە كوردەكانی عێراق پەیان بەم ڕاستییە بردووە، بۆیە تێكڕا هەوڵدەدەن ئەم وشانە لە زمانەكەیان یان زیوان بژێركەن تا لە كارتێكردنی دراوسێ سامی نەژادە عەرەبەكانیان خۆیان دووربگرن، كە لە هەمان كاتیشدا باڵادەستن بەسەریانەوە. هەرچی كوردەكانی ئێرانن، كە كەمێكیان دەتوانن ئەو دەنگانە بێژن و گەلێ كەمتریشیان تەنانەت بەكاریشیان دێنن، ئارەزووی گشتییان بە پێچەوانەی هی كوردەكانی عێراقەوەیە، ئەمەش هەولێكە لەلایەن كوردەكانی ئێرانەوە، بۆ جیاواز دەرخستنی زمانەكەیان لە زمانی فارس و دەركردنی لە كارتێكردن.

گەلێ لە هۆزەکانی هەرێمی کرماشان هەم سۆرانی بێژیان لەناودایە هەم گۆرانی کەڵهوڕەکان، زەنگنەکان، سەنجابییەکان، و نانەکەلیەکان لەم هۆزانەن، هێڵبەندی ژمارە (٢) سۆرانی بێژ و گۆرانی ناو کەڵهوڕەکان دەردەخا لە چوارچێوەی لقەکانی سۆرانی و گۆرانییدا.

کرمانجی وەکو شێوەزارێکی سەرەکیی کوردی، تا ڕادەیەك نوێیە، ئەم پلەی سەرەکییەی کاتێ وەرگرت، کە توانی جێی پەهلەوانی بگرێتەوە کە سەردەمانێك شێوەزاری سەرەکیی بوو، ئەویش وەکو پەهلەوانی، لە میدیایی کۆن یان "کوردی ڕەسەن)ەوە کەوتۆتەوە. کرمانجی تا ماوەیەکی فرە دوور و درێژ، تاکە زمانی ئاخاوتنی کوردە ڕەوەندەکانی هەرێمی چیاکانی هەکاری ڕۆژاوای گۆلی وان بوو. تا سەرەتای سەدەی چواردەیەم و بڵاوبوونەوەی پەیتا پەیتای ژیانی ڕەوەندیەتی لە کوردستاندا، هێشتا بڵاوبوونەوەیەکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدیبوو، لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەیەمدا، کاتێ کە وێرانکردنی ئابووری کشتوکاڵی و کۆچکردنی بە کۆمەل بە کوردە جێنشینەکان، شان بەشانی نەمانی کاروانەڕێ بازرگانییە گەورەکان کە بە کوردستاندا تێپەڕدەبوون، ڕێگایان خۆش و ئاسان کرد بۆ داهاتنی گۆڕانێکی بنچینەیی لە ئابووری کوردستاندا، ئینجا کرمانجیی دەستی بە تەنینەوەی خێرا کرد، (بڕوانە مێژووی مودێرنی هەرەزوو) کە ڕەوەندەکان بەرەبەرە لە هەرێمی هەکاریەوە بە ناو خاکی کوردستاندا تەنیانەوە، لەگەڵ خۆیاندا زمانە کرمانجیەکەی خۆیان هێناو لە هەمان کاتیشدا سەپاندشیان بەسەر وەرزێرە نیشتەجێکانیشدا، لەگەڵیدا بابەشێکی تریشیان بڵاوکردەوە، ئەویش ئیسلامی سوننی شافیعی مەزەبە و کردیان بە ئایینی هەرە باوی وڵاتەکە.

کرمانجی لە پێشدا لە هەکاریەوە بە بادینانـدا لێشاوی هێنا و تا مووسڵ ملقی دا، ئەمە کوردستانی کردە دوو بەشەوە: دیمیلی لە نیوەی باکوور و گۆرانی لە نیوەی باشوور و لە ناوەڕاستیشدا کرمانجی بۆ خۆی پای داکوتا، ئینجا کرمانجی بەرەبەرە لووتی ژەنیە هەرێمی دیمیلی بێژەوە، چونکە ئەم هەرێمە یەکەم شوێن بوو کە بەرتین و تاوی لێقەومانە گەورە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمانی مودێرنی هەرەزوو کەوتبوو، لە هەمان کاتدا زاراوەی کرمانجی بادینانی بوو بە زمانی زاڵی باکوور و ڕۆژاوای کوردستان. هێرش بۆ سەر هەرێمی گۆرانی نشین کاتێك دەستی پێکرد کە باری کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەم بەشەی کوردستان لە ئاکامی شەڕی بەردەوام و کۆچپێکردندا شێوێنرا لە سەرەتای سەدەی هەژدەدا. شێوەزاری

کرمانجیی و ئەو ڕەوەندانەی لەگەڵ خۆیاندا هێنایان لە هەرێمی سۆرانەوە (ناوچەی هەولێر و ڕەواندزی ئێستا) بەرەو کوردستانی ناوەند و ڕۆژاوا تەنیانەوە و بەوە گۆرانییان خلیسکاند و پاڵیان پێوەنا. بەم جۆرە باڵکێشی زمانی پەهلەوانی بەسەر کوردستاندا، بەرەبەرە بە هاتنی کرمانجی ڕەوێنرایەوە کە لە ناوەندی جوگرافی وڵاتەکەوە دەیتەنیەوە. لەم ئەنجامدا پەهلەوانی پەسترایە ناو ئەو مەڵبەندانەوە کە ئێستا تێیاندا باوە لەمپەڕ و لەو پەڕی کوردستان.

## پەهلەوانی

لە قوولایی باکووری کوردستان و بە دەم سەرچاوە هەرە ژووروەکانی ڕووبارەکانی فورات و قیزیل ئیرمەق و مورادەوە لە تورکیا، لقی دیمیلی شێوەزاری پەهلەوانی (کە زۆرتر بە زازا ناسراوە هەرچەندە ئەم ناوە پڕ بەپێستی نیە)، زمانی (٤،٥)ملیۆن کوردی دیمیلییە: گەورەشاری وەکو دەرسیم (تونجەلی ئێستا)، چەپەخچوور (بینگۆلی ئێستا) و سیوەریك، هەروەها بەشێکی گەورەی کوردەکانی بیتلیس، دیمیلی بێژن. جگە لەمان، هەندێ پەڵە پەڵەی ئەم زمانە لە چەندین ناوچەی تری ئەنەدۆڵ، هەر لە ئادیەمانەوە بگرە تا دەگاتە مەلاتیە و مەراش و لە باکووری عێراقیش (کە بە شەبەك دەناسرێن، هەروەها لە باکووری ڕۆژاوای ئێران (هۆزەکانی دومبولی و هەندێ لە زەرزاکان)، بەدی دەکرێ. وا دەردەکەوێ کە لە دوا دوای چەرخە کلاسیکەکان و سەرەتای سەدە ناوەندیەکاندا ئەم زمانە، زۆر و کەم، زمانی باو بووبێ لە هەموو ئەو ناوچانەی کوردستاندا کە ئێستا بە کرمانجی ژووروو دەئاخاون. مەرز بەزاندنی ڕووەو ڕۆژاواش تا وڵاتی پونتۆس و کەپەدۆچیا و کلیکلیاش دەڕەتا بەر لەوەی قۆناغێکی تواندنەوە و ڕەتاندن لەسەر دەستی بیزەنتیەکان بوونی کورد لەو هەرێمانە بسڕێتەوە، (بڕوانە ئاوێتە بوون و تێکدا توانەوە). جگە لەمە، پاشان دیمیلی بەرەبەرە لەسەرزەمینە ڕۆژەلاتیەکانی، کشایەوە شوێنەکانی ئێستای لە بەردەم فشاری بەردەوامی پەز لەوەڕێنە کوردە کرمانجیی بێژەکان. ئەم مەرز لەدەستدانە کە لە سەرەتای سەدەی (١٦)وە دەستی پێ کردوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە.

دیمیلی و گۆرانی بەچکەی یەك پزدانن. ئەم پەیوەندیە هی سەردەمێکە کە یەك شێوەی

پەهلەوانی زمـانی سـەرزەمینیكی پـان و بـەرینی كوردسـتان بـووە، كاتێك كـە كوردسـتان لـە كۆتـایی دوا دوای سـەردەمی كلاسـیكدا، بـە كۆچـكردنی نـاوخۆیی یـەكرەنگ بووبـوو (بڕوانـە مێژووی كلاسیك و كۆچكردنە مێژوویییـەكان) لـەو سـەردەمەدا سـەرزەمینی زمـانی پەهلـەوانی لەمسەرو ئەوسەری كوردستاندا بارستی لەبەردانـەبوو. ئـەمڕۆ، تـەنها لەیـەك شـوێن، واتـە لـە دەورووبەری مووسڵ، گۆرانی (لە شێوەی زاراوەی باجەلانیدان) و دیمیلی (لە شـێوەی زاراوەی شـەبەكدا)شـان بەشـانی یـەكتر وەكـو دوو دراوسـێ ماونەتـەوە و لێـك دوور نەكەوتوونەتـەوە، وەرنـە، كۆمـەڵی بەهـەژەڵی دیمیلـی و گـۆرانی دوان ئێـستا كەوتوونەتـە ئەوپـەڕی دەسـتی ئەوبەری كوردستانەوە.

زاراوە سەرەكییەكانی دیمیلی بریتین لە سیوەریكی، كۆری، هـەزڕوو (یـان هـەزۆ)، مـۆتكی (یان مۆتی)، شەبەك و دومبلی. لەوانەیـە زاراوەی گایـشیش كـە ئێـستاكە لـە بانـەكانی گـیلان لەسـەر دەریـای خـەزەر بـەكاردێنرێ پـەلێكی دووركـەوتووی زاراوەی دیمیلـی بـێ و لەلایـەن دیلەمییـە كۆچـكردووەكانی سـەدەكانی ناوەڕاسـتەوە لـە ڕۆژاوا و بـاكووری كوردسـتانەوە هێنرابێ.

دیمیلی زمانی سەرەتایی كتێبە پیرۆزەكانی عەلەویەكان بوە، بەڵام نەك تاكە زمان. لەگـەڵ ئەمەشدا، لەو نووسـراوە هـەرە كۆنانـە شـتێكی وانـەماوە، كـە بتـوانین بەهۆیانـەوە شـارەزای شێوە كۆنەكانی ئەم زمانە و ئەو ئاڵو گۆڕانەبین كە بە سەری هاتوون. بەڵگـەكان هـی چـەندین سەرچاوەی جۆراوجۆرن: مێژوویەندیە ئیسلامیەكانی سەدەكانی ناوەڕاست، بـۆ نموونـە ئیـبنی ئەسفەندیار لە (مێژووی تەبرستان)یدا، هەندێ بڕگەی لـە زمـانی دەیلەمییـە نیشتەجێبوەكانی هەرێمی دەم دەریای خەزەرەوە هێناوەتەوە، كە زۆر لە زمانی ئەمڕۆی دیمیلییەكان دەچێ.

لە قوولایی كوردستانی باشوورەوە، چ لە عێراق چ لە ئێران، هەر لە هەڵەبجەو مەریوانـەوە بیگرە تا دەگەیتە دینەوەر و هەمەدان و كرماشان و خانەقین لەوێشەوە بـۆ مەنـدەلی، گـۆرانی زاراوەی باوی وڵاتەكەیە، هەروەها زاراوەی باوی هۆزی گرانی كاكەیی دەورووبەری كـەركووك و زەنگنەكانی لای كفریشە، پەڵە كوردنـشینە دابڕاوەكـەی بلوچـستانیش، بەگـشتی، بـە گـۆرانی دەخاون. لە دەورەبەری چیای ئەلبورزیش چەند پەڵە پەڵەیەكی قەرەباڵغی گۆرانی دوو هـەن. هەورامانی كە یەكێكە لە توخمەكانی زاراوەی گۆرانی و خـاوەنی هەیبـەت و پایەیـەكی زمـانیی

گەورەیە، و ئێستا لەو تیلماسکە خاکەدا بەکاردێ کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی هەڵەبجەو مەریوان و پاوەوە، سەردەمانێك سەرتۆپی هەرە باوی زاراوەکان بوو لە کوردستانی ناوەنداو ئێستا کرمانجی باشوور (سۆرانی) بۆتە جێگری. ئەوکە جاران زمانی وەرزێڕە ئاوایی نشینەکان و مەڵبەندە شارنشینیە کۆنەکان بوو، تا ساڵی ۱۸۷٦ کە ساڵی داڕووخانی میرنشینی ئەردەڵانە، زمانی بنەماڵەی میرەکانی ئەردەڵانیش بووە، تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، زۆربەی ئەو کارە شیعریە جوان و سەرزاریانەی کە لە سەدەی بنەماڵەی میرانی باباندا ئەنجام دراون، هەرچەندە بابانەکان خۆیان بە کرمانجی باشوور دەدوان، بەم زاراوەیە (واتە هەورامانی) نووسراون لەناو کورداندا واباوە کەبادانەوە بەلای کرمانجی باشووردا لە وڵاتی بابان، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم و لە سەردەمی حوکومڕانی عەبدولڕەحمان پاشای باباندا کراوە.

گۆرانی و بەچکە زاراوەکانی، لە سەدەکانی (۱۷–۱۸) ەوە لە بەردەم پاڵەپەستۆی کرمانجی باشووردا لە کشانەوەدان. ئەم کشانەوەیە هێشتا هەر بەردەوامە و گۆرانی هەر بەپاشدا دەچێ. بە لافاوی پەنابەرە کوردەکانی عیراق کە نزیکەی سەرجەمیان کرمانجی باشوور دوو بوون و ڕژانە ناو کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوورەوە لە ئێران، پرۆسەی چوونەوە و توانەوەی گۆرانی تاوێکی یەکجار بەگوڕی سەندووە کرماشان، کە سەردەمانێك ناو کۆی گۆرانی بوو، ئێستا شارێکی فرەزمانەو دەتوانرێ بوترێ کە زاراوەی کرمانجی باشوور تێیدا هەرە زاڵە دانیشتووانی هەڵەبجە، کە قەڵاوێزی دەستی هەرە باکووری زاراوەی گۆرانی بوو و پایگەیەکی کۆنی هەردوو بنەماڵەی بابان و ئەردەڵان بوو، ساڵی ۱۹۸۸ بەچەکی کیمیای دانیشتووبڕ کرا ئێستا زیاتر لە (۱۰۰) هەزار کوردی پەنابەری تێڕژاوەتەوە کە زۆربەی هەرە زۆریان کرمانجی باشوور دوون.

ئەوی ڕاست بێ پاوەو نەوسود و هەورامانی دێرین کە لە دەستی ئەمبەری سنووری ناو ئێرانن بەرامبەر بە هەڵەبجە و هەموو گۆرانی دوو بوون، ئێستا لەژێر کارتێکردنی ئەم ئاوارانەدا، گۆرانیەکەیان کەوتۆتە پتەپت.

شوێنەواری دەسەلاترەوی جارانی گۆرانی هێشتا لە هەندێ جێ هەر بەدی دەکرێ. باشترین نموونە ئەو پەڵەپەڵە وەرزێڕە گۆرانی دوانەیە کە هەر لە دەورووبەری هەکاریەوە لە

توركیا تووشیان دەبێ تا دەگەیتە مووسڵ (باجەڵان یان باجەروانەكان) لەوێشەوە بۆ شارەبان– كە كەمتر لە (٤٠) میل لە بەغدای پایتەختەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی باكوور دوورە. زاراوە سەرەكیەكانی دیكەی گۆرانی، جگە لە هەورامانی و باجەڵانی، بریتین لە كەڵهوڕی، نانەكەلی، قەندۆڵەیی، سەنجابی، زەنگەنە، كاكەیی (یان دەرگەزێنی) و كرماشانی– ئەمڕۆ هەرنەبێ (١،٥)ملیۆن گۆرانی دوو لە ئێران و عیراق هەن .

# لەكی

ئەم بەچكە زاراوەیە، تەنها پەلێكە لە گۆرانی و لێرەدا لەبەر هۆی گرنگی زمانیی جیامان نەكردۆتەوە، بەڵكو زیاتر لەبەر هۆی ئەتنۆلۆجی هەڵمان خستوە، لەكی دوەكان، بەرەبەرە خۆیان لە دایكە جەستەی كوردانەی خۆیان دەكێشنەوە و زیاتر خۆیان دەدەنە پاڵ لوڕەكان كە دراوسێی ئەتنیكیانن. ئەم دیاردەیە زیاتر بە زەقی لەنێوان خوێندەوار و شاریەكانیاندا خۆی دەردەخا–چونكە دانیشتووانی دەرەوەی شارەكان و لەو شوێنانەدا كە هاوسنووری كوردستانن خەڵكەكە هێشتا خۆیان هەر بە كورد دادەنێن، كەچی لەو شوێنانەدا كە هاوسنووری لوڕەكانن خۆیان بە لوڕ دەخوێننەوە. ئەم پرۆسەیە نموونەیەكی بەهێز و سرنجكێشی ئەو بزاڤەیە كە تیایدا هەموو باشووری زاگرۆس لە كۆتایی سەدە ناوەندیەكانەوە هەتا هەتایە لە كوردایەتی كەوت: واتە گۆڕانێكی ئەتنی ئەوتۆ ڕوویدا كە لوڕەكان، جیلۆكان، مامەسەنیەكان، شەبانكارەكان، لە كوردایەتیەوە بوون بە قەوارەیەكی ئەتنی نوێی سەریەخۆ (گرووپی گەورەی لوڕان) بەوەش بە تەواوی لە قەوارەی كوردان تاكانەوە (بڕوانە ئاوێتەبوون و تێكدا توانەوە).

لەكیی ئێستا زمانی باوە لە ناوچەكانی باشووری هەمەدان و شارەكانی نەهاوەند، نویسیركان، نوراباد، ئیلام، گیلان و پەهلەش دەگرێتەوە، هەروەها ناوچەكانی دەورووبەری هوڕوو، سیلاسێلا، سیلاخوڕ، و ئەلیشتەری باكوور لە خۆراوای ئێران. جگە لەمانە، ناوچەی گەورەی لەكنشینی تریش هەر لە خۆراسانەوە بگرە تا دەگەیتە كەنارەكانی دەریای سپیی ناوەڕاست بەدی دەكرێن، جگە لەمانەش، پەڵە پەڵەی تری لەك دوو لە ئازەربایجان، چیاكانی

ئەلبورز، هەرێمە کەناردەریاییەکانی دەم دەریای خەزەر، وڵاتی کوردنشینی خۆراسان (بەرەو خوار تا دەگاتە بیرجەندیش)، ناوچە شاخاویەکانی نێوان قوم و کاشان و ئەو هەرێمەی دەکەوێتە نێوان ئادیەمان و رووباری جەیحانەوە لە کوردستانی رۆژاوا لە ئەنەدۆڵ بەدی دەکرێن گەلێ. تیرەی کورد هەن کە بە لەك ناسراون و ئێستا بە زاراوەی تری کوردی دەدوێن (یان تەنانەت بە زمانی تریش) و هەر لە ئەدەنەوە تا ناوەراستی ئەنەدۆڵ لە تورکیا و لە داغستانی قەفقاسیای رووسی، و لە ئەهەرەوە تا دەم تاران لە ئێران بەدی دەکرێن (بروانە هۆزەکان).

وشەسازی و رستەبەندی لەکی، بە قووڵی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی لوریەوە، کە خۆی لە زمانی فارسی نوێوە تاکاوەتەوە. دەستووری بنەرەتی و شێوەی کار لە لەکییدا، وەکو هەموو زاراوەکانی تری کوردی، بە ئاشکرا دەچنەوە سەر ئێرانی باکووری رۆژاوا. ئەم خزمایەتییە زیاتر خۆی لە پاشماوەکانی لەکییدا، وەکو بەشێك لە زمانی کوردی، دەردەخا واتە بینای کردار (ergative)، لەبەر ئەمە، لەکی لە بنەرەتەوە لەگەڵ لوریدا لێك جیان و ناچنەوە سەریەك، بەڵکو زیاتر لە کوردی نزیکە و پێکەوە دەلوێن.

ئەمرۆ، لانی کەم (١،٥) ملیۆن لەکی دوو، بگرە زیاتریش هەن، چونکە لە زۆر جێگاو بۆنەدا بە لور دادەنرێن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بروانە:—

**Further Readings and Bibliography**: W. Ivanow, "Notes on Khorasani Kurdish," *Journal and Proceedings of the Asiatic Society of Bengal*, new series, XXIII:1 (1927); Ch. Bakaev, *Yazik Azerbaidzhanskii Kurdov* (Moscow: Akademi Nauk, 1965); Ch. Bakaev, *Govor Kurdov Turkmenii* (Moscow: Akademi Nauk, 1962); Karl Hadank, *Mundarten der Gûrân, besonders das Kändûlâî, Auramânî und Bâdschälânî* (Berlin, 1930); Karl Hadank, *Mundarten der Zâzâ, Hauptsächlich aus Siwerek und Kor* (Berlin, 1932); Karl Hadank, *Untersuchungen zum Westkurdischen: Bôtî und Êzädî* (Leipzig, 1936); Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Ludwig Reichert, 1989); Mehrdad Izady, "A Kurdish Lingua Franca?," *Kurdish Times* II-2 (1988); Hugo Makas, *Kurdische Studien: 1) Eine Probe des Dialektes von Diarbekir, 2)Ein Gedicht aus Gâwar, 3)Jezidengebete* (Heidelberg, 1900); Age Meyer Benedictsen, *Les Dialectes d'Awromân et de Pâwä* (Copenhagen, 1921); D.N. MacKenzie, *The Dialect of Awroman (Hawrâmân-î Luhôn): Grammatical Sketch, Texts, and Vocabulary* (Copenhagen: Kongelige Danske Videnskabernes Selskab, 1966); P. Pikkert, *A Basic Course in Modern Kurmanji* (Genk, Belgium: Alev Books, 1991).

# ئەدەب

زمانی كوردی خاوەنی سامانێكی گەورە و گرانی ئەدەبیە، كە ئێستا زۆریەی بەسەر زارانەوە دەگەڕێ. ئەم سامانە هی سەردەمانێكی ئەوتۆ دێرە كە هەندێكیان دەچنەوە پێش ئیسلام. بەشێكی زۆری ئەدەبی نووسراو لە ماوەی زیاتر لە هەشتصەد ساڵی جێگۆڕكێی كۆچەران بۆ ناو وڵاتی كوردستان، یان تێپەڕین پێیدا، فەوتاوە و لە پارچە و پلۆچەی تاك تاك بەولاوە هیچی دی لێنەماوە، هەرچەندە ئێستا لەلایەن خەڵكێكی كەمی كوردانەوە بەكاردێنرێ، گۆرانی خاوەنی هەرە زووترین ئەو بابەتە ئەدەبیانەیە كە هێشتا ماوە. پەهلەوانی بەگشتی و گۆرانی و نیمچە زاراوەكانی بەتایبەتی، سەردەمانێك خاوەنی پایە و پلەی شێوەی هەرە بەرزی ئەدەب و فەرهەنگ بوون، ئێستا لە هەموو زاراوەكانی كرمانجییدا كە باسی (گۆرانی) بكرێ، یەكسەر "شیعری گۆرانی" یان "بابەتی ستران" دێتە یاد. ئەم زاراوە وڵاتییە لەگەڵ هەورامانی بەچكە زاراوەیدا، تا ئەم دواییانە زمانی دەستەی توێژگی كۆمەڵ و هونەری ئەدەبیی جوان و هەڵبژاردەی كوردستان بوو، هەرچەندە زاراوەی باوی گفتوگۆ جۆرێكی تر بوو بێ. بۆ نموونە بنەماڵەی میرانی ئەردەلان (١١٦٨–١٨٦٧) تا لە ناوچوونی میرایەتیەكەیان هەر بە زاراوەی گۆران دەدوان. نابێ سەریشمان لە ڕاستییەك سووڕ بمێنێ، كەوا كاكڵەی ئەو ئەدەبیاتە كۆنەی كوردی كە ماوەتەوە، سەراپای بە زاراوەی پەهلەوانییە.

بابا تاهیری هەمەدانی (١٠٠٠ – ١٠٥٤) سەر دەستەیەكی یەكەمی ئەو شاعیرانەی ڕۆژهەڵاتە كە "چوارینە – ڕوباعیات"یان هەڵبەستوە، واتە ئەو هونەرەی كە بۆ عومەری خەیام بوو بە سەرمایەی ناوبانگ لە جیهاندا. شارەزایی و زانایی بابا تاهیر لە لەكی گۆرانی و لە فارسیشدا، كارە شیعریەكانی ئەوی لای كۆمەڵانی خەڵكی هەردوو زمانەكە زۆر بە نرخ و چێژ كردووە، ئەو كێشە شیعریە تایبەتیەی بە كاریهێناوە، وێ دەچێ هی سەردەمانێكی دێرینی ئەوتۆ كۆنی باشوور و ناوەندی كوردستان بێ كە خۆی بدا لە دەورانی پێش داهاتنی ئیسلام. بەرهەمێكی زۆری ئایینی یارسانان، هەروەها (جیلوە) كە بریتییە لە سۆزە ئایینیەكانی شێخ ئادیی

پێغەمبەری یەزیدیان، بەم شێوە شیعریە دانراون. بابا تاهیر خۆشی ئێستا لای تیرەی فریشتەکان لەناو کوردانداا پلەی بەرزی یەکێك لە بەرجەستەکەرەکانی گیانی گەردوونیی دراوەتێ.

شاعیرانی چون پەرێشان (دەورووبەری ١٣٩٨)، موحەممەد فەقێی تەیرانی (١٥٩٠–١٦٦٠) خەڵکی شاری مەکەس (کە چەندین چیرۆکە شیعری لێ بەجێماوە)، مستەفای بێسارانی (١٦٤١–١٧٠٢)، موحەممەدی قەندۆڵەیی (کۆتایی سەدەی ١٧)، خانای قوبادی (١٧٠٠–١٧٩٥) میرزا ئەڵماس خان و میرزا شەریفی کولیایی (ناوەڕاستی سەدەی "١٧")، شەیدای هەورامی (١٧٨٤–١٨٥٢)، ئەحمەد بەگی کۆماسی (١٧٩٦–١٨٨٩) و محەممەدی وەلی کرمانشاهی (دەورووبەری ١٩٠١) تەنها چەند نموونەیەکن لە کەڵە شاعیرەکانی زاراوەی گۆرانی و نیمچە زاراوەکانی: هەورامانی و لەکی.

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، هەندێ لە بەرهەمە بەرزەکانی ئەدەبی دنیاداریی کوردی کە هێشتا هەر ماون، بە زاراوەی کرمانجی باکوور وتراون، عەلی حەریرییان لێدەرچێ، هەموو شاعیرە کرمانجی بێژەکانی تر، کە زانیاریمان لە بارەیانەوە هەیەو کارەکانیان تا ئەمڕۆ زیندوون و بە دەستەوەن، پاش شەڕ و شۆڕ و دەربەدەرییەکانی سەدەی شانزەیەم بەرهەمەکانیان کەوتنە ناوان و خۆیان وەکو شاعیر ناسران (بڕوانە سەرەتای مێژووی هاوچەرخ و دەربەدەرکردن و بە زۆر نیشتەجێکردن).

هەرچەندێك و ئەو کارە ئەدەبیانەی بە کرمانجی ئەنجام دراون بەگشتی بەرهەمی ئەم دواییانەن، دەکرێ ئاماژە بۆ نووسراوێکی ئاینیی یەزیدیان (مەسحەفی ڕەش) بکرێ کە بەشێوەی کلاسیکی کرمانجی نووسراوە (کە زیاتر لە بادینانی نزیکترە وەکو سۆرانی) و زۆر لەوانەیە لە سەدەی (١٣)دا نووسرابێ. وا دەوترێ کە گوایە لەلایەن شێخ حەسەن ناوێکەوە دانراوە (شێخ حەسەن لە دەورووبەری ١١٩٥ی پاش میلاددا لە دایکبووە و گوایە ئامۆزای شێخ ئادی کوڕی موسافیری پێغەمبەری پایە بەرزی یەزیدیان بووە) (بڕوانە یەزیدیایەتی) ئەگەر ئەم مێژووە زیاتر ساخ بکرێتەوە ئەوا دەکرێ مەسحەف بە کۆنترین پارچەی بە کرمانجیی نووسراو دابنرێ و بەوە بە سەدان ساڵ دەچێتە پێش هەر بابەشێکی دیکەوە کە بەو زاراوەیە دانرابێ.

هەندێ شاعیر و هۆنەری تریش هەن کە هونەرەکەیان هێشتا هەر ماوە و باوە، لەوانە، عەلی حەریری کە خەڵکی شاری هەریری نزیکی ڕەواندزبوە لە وڵاتی هەکاری (١٤٢٥–١٤٩٠)، مەلا ئەحمەدی هەکاری (١٤١٧–١٤٩٤) دانەری "مەولوودنامە" کە بریتیە لە کۆمەڵە شیعرێکی هەڵبژاردە، سەلیم سەلمان کە ساڵی ١٥٨٦ ڕۆمانی یوسف و زولێخای داناوە، شێخ ئەحمەد (١٥٧٠–١٦٤٠) کە بە مەلای جزیری بەناوبانگە و خەڵکی وڵاتی بۆتان بوە و بە یەکێك لە سەرامەدی کەڵـە شاعیرەکانی کورد دادەنرێ، و ئیسماعیل بایەزیدی (١٦٥٤–١٧١٠) کە فەرهەنگێکی بچووکی کرمانجی– عەرەبی– فارسی بە ناوی گوڵژەن" بۆ لاوان داناوە جگە لە چەندین پارچە شیعری زادەی بیر و هزری خۆی.

درامای داستانیی مەم و زین (یان مەمی ئالان و زینی بۆتان) کە ساڵی ١٦٩٦ ئەحمەدی خانی (١٦٥٠–١٧٠٦) سەر بە هۆزی خانیانی هەکاری و دانیشتووی شاری بایەزیدی کوردستانی باکوور بە شیعر دایناوە، سامانێکی گەورەی کارەساتی ئەفسانەوار و مێژوویی ژیانی نەتەوەیی کوردە و ئاوێنەیەکی ڕوونی ئاوات و ئامانجە نیشتمانییەکانی ئەم گەلەیە.

مەم کە کوڕێکی هۆزی ئالانە و زین کە کچی هۆزی نەیاری بۆتانانە، دوو خۆشەویستن کە بەکر ناوێکی سەر بە هۆزی بەکران لەنێوانیاندا دەبێتە شۆفار و بەین شێوێن. لە کۆتایی داستانەکەدا مەم دەمرێ و زینیش لە داخدا و لە کاتێکدا بەسەر گۆڕەکەیەوە بە گەرمی شیوەن دەکا ئۆقرەی لێ دەبڕێ و دەمرێ و لە تەنیشت مەمەوە لە گۆڕ دەنرێ. بەکریش، کەشۆفارییەکەی دەردەکەوێ لە ترسی کوشتن خۆی لەنێوان هەردوو گۆڕەکەدا مەڵاس دەدا، خەڵکو خوا دێن بەسەردا و هەناسە بڕی دەکەن، لە خوێنەکەیەوە چقڵێك دەڕوێ، ڕەگی چقڵەکە کە سونبوولی ئێرەیی و خیانەتە، تا قووڵایی زەمین بە نێوان هەردوو گۆڕەکەدا دەچێ، بەوە تەنانەت بە لێکدابڕانی دنیایان تێر ناخوا، بەڵکو تەنانەت پاش مردنیش هەرلێکیان دەکا.

داستانی قارەمانانەی دمدم، چیرۆکێکی ئەفسانەواری ڕەگوریشە ڕاستە لە ژیانی کوردانـدا، داستانەکە باسی ئابڵووقەدانی قەڵای دمدم دەکا لە کوردستان کە بەرامبەر بە شا عەباسی سەفەوی لە سەدەی (١٧)دا، لەلایەن میرێکی کوردی سەرۆکی هۆزی برادۆستەوە، خانی پەنجە زێڕین، یان خانی لە پەزێڕین، داکۆکییەکی پاڵەوانانەی تێدا کراوە. داستانەکە پڕە لە

وێنە و ڕووداوی قارەمانیەتی جوان، هەرچەندە سیمبولێك، لە بارەی ئەو شەڕانەوە کە لەسەر قەڵاکە کراون و ئەو دلێریانەی کە خەڵك و سەربازانی ناو قەڵاکە نواندوویانە. یەکیەتی خان و ئابلۆوقەدانە کە لە ڕووی مێژووواریەوە هەندێ گرێواویە، بەڵام ئەمە لە بایەخی ئەدەبی داستانەکە بە قەی موویەك کەم ناکاتەوە. ئەو گیانی فیداکاری و لەخۆ بوردەییەی لە داستانی دمدمەوە هالا و دەدا، یەکێك لە ڕووبەڕووبوونەوە تاکە کەسیە، شەرەف گرەویانەی شەڕەکانی تەروادە دێنێتە یاد و بەرگری نائومێدانە، بەڵام سەر ڕەقانەی داکۆکیکەرەکانی مەسادامان لەبەر چاو زیندو دەکاتەوە، کە ژن و مێرد تا دوا زیندوو دەستیان لە چەك بەرنەداو شمشێریان لە دەست نەکەوتە خوارەوە، (بڕوانە سەرەتای مێژووی هاوچەرخ).

چەرگەرەکان، یان داستانسەرا یان ستایەرە گەڕۆکەنان، بەم سەر و بەوسەری وڵاتەکەدا دەگەڕێن، تا بۆ گوێکرەکانیان بەرهەمی سەدان ڕووداوی داستانیی "چەریگە" وەکو قەڵای دمدم و مەموزین کۆبکەنەوە و بە گۆرانی بۆیانی بگێڕنەوە (بڕوانە مۆسیقا).

ئەگەر لەگەڵ کرمانجیی باکووردا بەراوردی بکەین، کرمانجی باشوور تەنها ئەم دواییانە کاری ئەدەبیی تایبەت بە خۆی بەرهەمهێناوە. ئەوی ڕاست بێ، بەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم و کارەکانی موستەفا کوردی[1] (١٨٠٩–١٨٦٦) هیچ بەرهەمێکمان ناکەوێتە بەرچاو. ئەمە وا دەگەیەنێ، کە ئەم بەرهەمانە هەر نەبێ هەزار ساڵ پاش بەرهەمە بە زاراوەی گۆرانی وتراوەکان هاتوونەتە ناوانەوە. یەکەم کارگەلی ئەدەبی، کە بەرچاوی بن و لە باشووری کوردستان بەرهەم هێنرابن بەرهەمەکانی حاجی قادری کۆیی خەڵکی کۆیسنجەقی کوردستانی ناوەندن (١٨١٧–١٨٩٧) کە زیاتر بە هەست و سۆزە نیشتمانیەکانیان خۆیان دەردەخەن، وەکو نرخی ئەدەبییان و زۆر بە گرانی، بە هەرحاڵ، دەتوانرێ لەگەڵ کاری ئەدەبی کەڵە شاعیرانی کوردستانی باکووری وەکو حەریری و خانی یان جەزیریدا بەراورد بکرێ. لێرەدا، دەبێ یەك کەس دەبێ لەم پووچوونە بەدەربگیرێ، ئەویش شێخ ڕەزای تاڵەبانییە (١٨٣٥–١٩٠٩) کە قسە خۆش و گاڵتاوی و مزرەکانی هەروەها داشۆردنی ئەوانەی نەیاریان لەگەڵیدا کردووەیان بوونەتە کۆسپ بۆ ئارەزووەکانی (کە بەگوێرەی بارستی شیعرەکانی لە ستایش و هەجودا دەبێ زۆر بووبن) مرۆڤ بە توندی بۆ خوێندنەوە و لێکدانەوەیان بکێش دەکا (ئێدموندس ١٩٣٥).

---

[1] مەبەستی مستەفا بەگی کوردییە – وەرگێڕ.

لەم دەرفەتەدا دەبێ لایەك لە باسی دۆزینەوەی كۆنە پەرتووكێك بكەینەوە كە گوایە چەند ساڵێك لەمەوبەر دۆزراوەتەوە و هەندێ شیعری كوردی بەزاراوەی كرمانجی باشوور (سۆرانی) تێدایە.

شیعرەكە باسی هەندێ كوردی زەردەشتی ئایین دەكا كە لەلایەن موسڵمانە عەرەبە داگیركەرەكانەوە چەوسێنراونەتەوە و گوایە ئاتەشگەدەكانیان كوێر كردۆتەوە و بەهادێرینەكانیان پلیشاندۆتەوە. ئەم پەرتووكە، بایەخێكی زۆر گەورەی پێدراوە لەو ڕووەوە كە گوایە هی سەردەمانێكی زووی وەكو داهاتن و بڵاوكردنەوەی ئایینی ئیسلامە لە سەدەی حەوتەمدا. ئەم پەرتووكە، بێ هیچ چەندو چونێك كارێكی ساختەیە چونكە: ١) بەزاراوەی سۆرانی نووسراوە كە هەتا (١٠٠٠) ساڵ دوای ئەوە نەبووە بە زمانی نووسین (ئەگەر بەڵگەكە ڕاست و دروست بوایە، دەبوو بە گۆرانی بنووسرایە). ٢) كوردەكانی كوردستانی ناوەند كە گوایە دوكۆمێنتەكەی لێ دۆزراوەتەوە، لە سەردەمی پەرتەكردنی ئیسلامەكان بەناو وڵاتەكەدا بە زۆری مەسیحی بوون (بڕوانە مەسیحیەت) و ئەوانی تریان یارسانی بوون (زەردەشتیەكان و جوولەكەكان تەنها كەمینەیەكی ناچیز بوون). ٣) هیچ جۆرە ساخكردنەوەیەكی زانستیانەی دۆكۆمێنتەكە چ لە ڕووی مێژووی دانان و چ لە ڕووی ڕاستی و دروستییەوە نەكراوە. هەروەها هیچ وێنەیەكی فۆتۆگرافیشی نەخراوەتە ڕوو تا ئەو ئەلفبایەی پێی نووسراوە بخرێتە بەرباس و لێكدانەوە و ئەگەر و نەگەر. لەوانەیە بەڵگەكە هەواڵێكی نەزۆكی نەتەوە پەرستێكی تەڵەكەبازێ، هیوای ئەوەی بۆخۆی بارست كردبێ كە دەسكردەكەی بكا بەبنەمایەكی "مێژوو سازی" بۆ ئەدەبی نووسراوی كورد بە زاراوەی سۆرانی، بەشێوەیەكی تایبەت.

یەكێ لەهۆ گەورەكانی ئەوەی كە كرمانجی باشوور نەیتوانیوە لەمەو پێش ببێ بە خودانی ئەدەبی نووسراو، بێ هیچ گومانێك، هاوخاكیەتی زۆریەتی لەگەڵ كرمانجی باكووردا. هەر كارێكی ئەدەبی كە بە كرمانجی باكوور ئەنجام درابێ، بە ئاسانی كەوتۆتە بەردەست و دەمی كرمانجانی باشوور.

ئەوەی لەم ڕووەوە شایستەی ئاماژەیە ئەوەیە كە تەنها لە دوو سەدەی ڕابردوودا كرمانجی باشوور بڵاوبۆوە و كەوتۆتە تەنینەوە لە ناوچەكانی كوردستانی ناوەند و ڕۆژاوا دا لەسەر حیسابی گۆرانی و بەم جۆرە خەڵكێكی زۆری بە كرمانجی باشوور دوو پەیدابوون و هەر

ئەمەش زەمینەی بۆ پەیدابوون و گەشەکردنی زمانێکی ئەدەبی بەم زاراوەیە هێناوەتە کایەوە. ڕاستییەکەی گەورەترین بنەماڵەی میرایەتی کە بە کرمانجی باشوور ئاخاوتبن، واتە بابانەکان، بۆ گفتوگۆ و بابەتی ئەدەبیاتی ناو کۆشکی میرایەتی تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، هەر زاراوەی گۆرانییان بەکارهێناوە.

بایەخ و گرنگیی نا ئاسایی ئێستای کرمانجیی باشوور دەردادەی چەندین ڕووداوی مێژوویی نائاساین. یەکێ لە گرنگترینی ئەو ڕووداوانە، پارچە پارچەکردنی کوردستانە کە کرمانجی باشووری کردە زمانی زۆربەی کوردەکانی عێراق و زمانی زاڵیش لە ئێران. بەو ئازادیە کەم یان زۆرەی کە بۆ پێشکەوتن و پوختەبوونی لە عێراق دەستی کەوت، کرمانجی باشوور گەشەی کردو لە ئەنجامدا ئەو هەموو بەرهەمە چاپکراوەی لێکەوتەوە کە لەم دوو وڵاتەدا لە (٧٥) ساڵی ڕابردوودا بۆی بوو بە سەرمایە، لە کاتێکدا کرمانجی باکوور لەناو مەرزوبوومی خۆی لە تورکیادا، لە هەمان ماوەدا، هەر سەرکوت و خەفەکراوە.

مشتومالکردنێکی سەر پێی کارەکانی ئەو شاعیرە کوردانەی کە تا ئێستا پارێزراون، دەری دەخا کە لە هەزار ساڵی ڕابردووەوە تا سەرەتای ئەم سەدەیەی ئێستامان، (١٩) یان بە گۆرانی، (١٠) یان بە کرمانجی باکوور و (٨) یان بە کرمانجی باشوور نووسراون. ئەم دەرەنجامە هیچ نابێتە مایەی سەرسووڕمان ئەگەر مرۆڤ بایەخ و تەنینەوەی ڕابردووی پەهلەوانی بزانێ. کرمانجی باشوور هەرچەندە زۆر درەنگ هاتۆتە دەست، زیاتر لە (٤/٣)ی هەموو کارە ئەدەبیەکانی سەدەی بیستەمی کوردی گرتۆتە خۆ، و بەم جۆرە بۆتە زاراوەی هەرە کاراو باوی کوردیی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا.

بە درێژایی ئەم سەدەیەی ئێستامان، زمانی کوردی کەوتۆتە بەر وشارێکی یەکجار گران. بڵاوکردنەوە بە کوردی لە سوریا و تا ئەم دوا دواییانە لە ئێرانیش قەدەغە بووە. هەر لە دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە، تەنانەت قسەکردنیش بە کوردی یاسا شکێنی بووە و سزاکەی زیندانی کردن بووە. ئەمە سیاسەتێکی بەردەوامی دەوڵەت بووە – چەند ماوەیەکی کورتی لێدەرچێ – تا دیسەمبەر (کانوونی یەکەمی) ١٩٩٠ کە سەرکۆمار ئۆزال زمانی کوردی تەنها بۆ قسەکردن لەناو تورکیادا بە ڕێدرا و دانا، کە ئەمە لە فەبرایەر (شووبات)ی ١٩٩١ لە پارلەماندا کرا بە یاسا، خۆپیشاندانی شێتگیرانەی گەورە لە ئەنقەرە لەلایەن هەندێ ئەکادیمیستی

توركیاوە بۆ دژایەتی كردنی و پەكخستنی بەرپا كرا، هەرچەند ئەمە بۆ حكوومەتی توركیا نەبوو بە كۆسپ بەڵكو بەكارهێنانی زمانی كوردی زیاتر جڵەوی بۆ شل كرا تا وای لێهات بڵاوكردنەوەش بە كوردی كرا لە یاسایی. بەم جۆرە رۆژنامە و گۆڤاریش بە كوردی كەوتنە دەستان، (بڕوانە چاپەمەنی و میدیای ئەلەكترۆنی) هەرچەندە چاوی زەقی دەوڵەتیی تێدا هەر مایەوە. بە هەرحاڵ لەم گۆڕانكاریە بۆ زەتیڤانەی توركیادا كاری پەروەردە بە زمانی كوردی هێشتا هەر هەڵاوێردراوە. بەڵام نیشانەی زۆر لە ئاسۆوە سەرەتاتكێ دەكەن كەوا ڕاپەڕینێكی گەورەی ئەدەبیاتی كوردی لە توركیا – وڵاتێك كە ئەمڕۆ نیوەی تەواوی هەموو كوردانی تێدا دەژین بەڕێوەیە.

لە بەرامبەردا، لە عێراق یەك وڵات بڵاوكردنەوەی كوردی بە یاریدەو پشتگیری ڕاستەوخۆی دەوڵەت بە كرمانجی باشوور بڵاودەكرێتەوە، چەندین ساڵە زانكۆیەكی كوردی لە سولەیمانی لە كاردایەو تێدا بە هەردوو زمانی عەرەبی و كوردی دەرس دەوترێ و دەخوێندرێ و لە سایەیدا ئەدەبێكی پوختەی نووسراو بە كرمانجی باشوور (بە سۆرانی) دەزەلێتەوە.

كوردەكانی سوڤیەت هەرچەندە (یاخۆ لەبەر ئەوەی) بە ژمارە كەمن، لە ساڵانی دوور و درێژی ڕابردوودا كارووباری پەروەردەیان لە سەرەتاوە تا پلەی بەرز، بە كوردی و زمانە باوەكانی وڵاتەكە، جێبەجێ كردووە، ژمارەیەك كاری زۆر بە نرخی ئەدەبیاتی كوردی لەو وڵاتە بەرهەم هێنراوە، هەرچەندە ئەمە زۆرتر ئامانجی پڕوپاگاندە و لاق كێشانی بۆ كوردەكانی دەرەوەی سۆڤیەت پێوە بووە، نەك سوودی ئەو كەمایەتیە پەراگەندە كوردەی كە لەم سەرو لەوسەری وڵاتەكەدا دەژین، ساڵی ١٩٩١ كە سیستەمی سۆڤیەتی داڕوخاو لە جێی ئەو لە قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست ڕژێمی نوێ هاتنە سەر كار، وێناچێ كوردەكان هەمان بەختی سپی جارانیان كارابێ و دراوسێ هاوولاتەكانیان هەمان هەڵوێستی دڵ و دەست واڵایان لە بەرامبەردا بخەنە كار. ئەم پێكهاتە نەتەوەییە دراوسێیانەی كوردانی سۆڤیەتی جاران ئێستا لەگەڵ یەكدا تێك هەڵقژاون (گورجی لەگەڵ ئۆسیتیان و ئەبخازان و ئەرمەنیان لەگەڵ ئازەریان.. هتد) و هیچیان ئەوەندە بە تەنگ پێشكەوتن و گەشەكردنی ئەدەب و وێژەی كوردەوە نین.

لە عێراق و ئێراندا، ئەلفبابەكی دەسكاریكراوی عەرەبی فارس بۆ زمانی كوردی لەبار كراوە

کە پێویستیە دەنگییەکانی زاراوەی سۆرانی دابین دەکاو بۆ کار و باری بڵاوکردنەوەش بەکار دێنرێ. کوردەکانی تورکیا، بەم دواییانە، هەڵمەتێکی بەگوڕیان بۆ بڵاوکردنەوە بە زاراوەی کرمانجی باکوور بەهۆی ئەو خانەی بڵاوکردنەوانەوە کە لە ئەورووپا هەیانە، بە هیوای ئەوەی بگاتە دەستی هاو زمانە بێبەشەکانی ناو تورکیایان خستۆتە کار. بۆ ئەم مەبەستە شێوەیەکی لە بارکراوی لاتینیان داهێناوە. ئەم شێوەیە جاری یەکەم لە (١٩٣٠)ەکاندا لەلایەن میر کامەران بەدرخانەوە بەکار هێنراوە، کوردەکانی سۆڤیەت، لەسەرەتادا ئەلفبای ئەرمەنییان بۆ نووسینەکانیان بە زمانی کوردی لە (١٩٢٠)ەکاندا بەکار هێنا، دوایی لە (١٩٢٧)دا کردیان بە لاتینی، دوایی لە ١٩٤٥ گۆڕیان بۆ ئەلفبای سیریلی و ئێستا هەردوو ئەلفبای لاتینی و سیریلی بەکار دێنن. پێم وایە تەنها یەك بڵاوکراوەی هاوچەرخ بە دیمیلی دەردەچێ، کە ڕۆژنامەیەکە بە ناوی (تەیرا) و لە ئەوستریا (نەمسا) دەردەچێ، ئەم ڕۆژنامەیە بە ئەلفبای لاتینی لە بارکراو دەردەچێ کە بۆ کرمانجی باکوور بە کار دێنرێ و لەلایەن کوردە دەربەدەرەکانی وڵاتانی ئەورووپاوە دەردەکرێ. لەوانەیە، ئەو شلی نواندنەی کە لەم دواییە لە تورکیا خراوەتە کار، هەندێ کەشو هەواکە بگۆڕێ. لە کۆتایی (١٩٩١)ەوە هەواڵنامەیەکی کوردی بە ناوی "ڕۆژنامە"وە لە تورکیا دەردەچێ، کە دوو پەڕەی بە زاراوەی دیمیلی و (٣٨)ەکەی تری بە کرمانجی باکوورە. هەردوولا، وەکو بڵاوکراوەکانی ئەورووپایان، ئەلفبای لاتینی بەکار دێنن.

وەکو دەردەکەوێ، لە کاتێکدا زمانێکی ستاندەردی کوردی گشت کوردگیر لە ئارادا نییە، ئەلفبایەك کە هەر نەبێ بگیرەوەی سیستەمی دەنگیی زاراوە جۆرا و جۆرە کوردیەکان بێ، سوودێکی باشی بۆ گەیاندن بە بەرینترین کۆمەڵانی خەڵك دەبێ چونکە هەر نەبێ ئەمە دەبێ بەهۆی شاردنەوەی جیاوازیە زاراوەییەکان (بڕوانە پەروەردە) لە کاتێکدا بوونی تەنانەت یەك پارچە کاری ئەدەبیی کوردی کە بە ئەلفبایەکی لاتینی یان سیریلی بنەما نووسرابێ، بە پێچەوانەی ئەو ئامانجەوە ڕەنگ دەداتەوە.

ئەم سیستەمی نووسینانە خاوەنی شێوە تۆمارکردنێکی تا ڕادەیەك ڕاستن لە بواری بزوێن (ڤاوڵە) کورت و درێژەکان و بزوێنە دوولانەکان (دیفثۆنگەکان)یشدا. ئەلفبای فارسی – عەرەبی ڤاوڵ زەدە، لە بەرامبەردا، کارەکە بە جوانی بەڕێدەخا.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: B. Nikitine and E .Soane, "Tale of Suto and Tato: Kurdish Text with Translation and Notes," *Bulletin of the School of Oriental Studies* III (London, 1923-25); B. Nikitine and E .Soane, "Kurdish Stories from My Collection,"*Bulletin of the School of Oriental Studies* IV (London, 1948); R. Lescot, *Textes Kurdes. Deuxe`me Partie: Mamé Alan* (1942); Alexandre Jaba, *Recueil de Notices et Récits kourdes* (St.Petersburg, 1860); Abdul-Kader Amin (collected by), *Kurdish Proverbs* (New York: Kurdish Library, 1989); C.J. Edmonds, "A Kurdish Lampoonist: Shaikh Riza Talabani," *Journal of the Royal Central Asian Society* XXII (1935)

# پەروەردە

لەناو هەموو نەتەوە سەرەكیەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، تەنها كوردان هێشتا نەبوونەتە خاوەن زمانێكی ستاندەر كە هەموو بەشەكانی ئەم گەلە بە پاراوی پێ بدوێن و بخوێنن. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و ڕەنجەی كە چ لەلایەن كوردان خۆیان و تەنانەت خەڵكی تریشەوە (وەكو سی، جی، ئێدمۆندس ١٩٣١ و ١٩٣٣) دراوە، مانەوەی ئەم گەلە بە دابەشكراوی و سەختەتی و تەریككراوی هەموو ئەم هەوڵ و ڕەنجەی بێهودە هێشتۆتەوە (ئیزەدی ١٩٨٨، حەسەنپوور ١٩٨٩) هەر لەبەر ئەمە، ئێستا گرفتەكە هەر ئەوەنیە ئایا كوردی بۆ كاری خوێندن بەكاردێنرێ یان نا، بەڵكو ئەگەر بەكاریش هێنرا، كام زاراوە بەكاردێ؟ پوختەكردنی زمانێكی كوردی ستاندەردی گشت كوردانە، دەشێ ببێ بە بەردەباز بۆ گواستنەوەی بیر و ڕا و یەكگیربوونی كەلەپووری فەرهەنگی و ئەدەبی زاراوە كوردیە جیاجیاكان. تاقیكردنەوەی دراوسێ عەرەب و تورك و فارسەكان، دەتوانێ ببێ بە ڕابەرێكی چاوساغ بۆ چۆنیەتی بەدیهێنانی ئەم ئامانجە. بەر لەوەی زمانی عەرەبی بەم شێوەیە پوختە كراوەی ئێستای وەكو زمانێكی مودێرن و ستاندەرد بێتە مەیدانەوە (كە لە بنەڕەتەوە لەسەر زمانی قورئان، یان فوسحا دانراوە)، عەرەبەكانی دوورگەی عەرەب و باكووری ئەفریقیا، لەلێكگەیشتن كەمتر لە كوردانی ئەمڕۆ تووشی گیر و گرفت نەدەبوون. زاراوە ناوخۆییەكانیان، لە ڕاستیدا، ئەوەندە بەكاردەهێنرا و ڕەنگیان قووڵ بوو، كە كار دەگەیشتە ڕادەی لێك نەگەیشتن لەنێوانیاندا.

کوردیی خاوەنی کاری وا نیە کە خۆی بدا لە ئاستی قورئان یان ئاستی کارە ئەدەبیە کلاسیکیەکانی زمانی فارس، تا بکرێن بەسەر مەشق و ستانداردی زمانەوانی، بەڵام ئەمە لە لایەکی ترەوە، دەتوانرێ بە جۆرە نیعمەتێکی شارراوەش دابنرێ بۆ زمانی کوردی. بەرهەمهێنانی برێکی زۆری کاری ئەدەبیی بە نرخ و بایەخ بەهەر زمانێك، مەگەر بە دەگمەن ئەگینا هەمیشە بۆی بۆتە مایەی کەرِی و نەبانی بەرامبەر بە گۆران. نەك هەر ئەمەندە، بگرە لە بەرامبەر وەرگرتنی وشەبەندی نوێی تەکنۆلۆژیشدا زیت وەستاوەتەوە (بۆ ئەمە زمانی نوێی فەرەنسی باشترین نموونەیە). کوردی نەدەبوو دووچاری ئەم گرفتە بێ.

ستاندەردیزەکردنی زمانی کوردی، ئەوپەرەکەی، لەوانەیە ببێتە مایەی لە دەستدانی برێکی کەمی ئەدەبیات، کە بۆ کەلەپووری کوردی گرنگن، لە کاتێکدا دەبێ بە مایەی سوود و بەرزکردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کورد بەرادەیەك کە لە پێوان نایەت.

هەرچ زاراوەیەکی کوردی بۆ کاروباری پەروەردە بەکاربهێنرێ، یەکەم لایەنی سرنجکێشی پەروەردە لە کوردستاندا، یان لایەنی لاواز تێیدا، ئەو هاوپەیوەندیە راستەوخۆیەیە کە لەنێوان بەکارهێنانی کوردی بۆ مەنهەجی خوێندن لە قوتابخانەکان و ئاستی خوێندەواریدا هەیە. لە هەمان کاتدا، هاوپەیوەندیەکی راستەوخۆ لەنێوان ئاستەکانی پەروەردە و تەواوەتی کۆمەلایەتیدا هەیە، کە ئاستی شارنشینی لە بەشە جیاجیاکانی کوردستاندا ئاوێنەی ساف و بێگەردیەتی (بروانە شارنشینی و مەڵبەندە شارنشینەکان).

کوردەکانی عێراق، لەو کاتەوە کە پاش شەرِی جیهانی یەکەم خرانە پاڵ عێراق زمانی خوێندنیان لە قوتابخانە سەرەتایی و دوا ناوەندیەکاندا کوردی بوە لە پاڵ زمانی دەوڵەت، واتە عەرەبی، هەروەها زانکۆیەکێشیان بۆ کراوەتەوە لە سولەیمانی، هەرچەندە زانکۆ کە لەم دواییانەدا گوازرایەوە هەولێر.

بەکارهێنانی کوردی لە ئاستی خوێندنی زانکۆ لە کوردستانی عێراقدا بەرهەمی یەکجار بەرچاوی بێ کەوتۆتەوە، کوردان لەوێ، بەرزترین رادەی خوێندەواری و پەروەردەیان لەناو هەموو کوردی جیهاندا وەدەست هێناوە، لەمە، لەوانەیە کۆمەڵگا گچکەڵە کوردەکەی سۆڤیەت بەدەربێ.

لە ئێران، هەرچەندە ئاماری دەوڵەتی خوێندەواری لەناو دانیشتووانی تەمەن لە شەش

## چەردەباسێك لە بارەی کوردانەوە

ساڵ بەرەو ژووردا ساڵی ١٩٨٦، گەیشتۆتە ٩٦،٦١٪، ناوچە کوردنشینەکانی ئێران لە ئازەربایجانی ڕۆژاوا و کوردستان و کرمانشاو ئیلام و هەمەدان کە هەندێکی کوردن یەك لەدوای یەك ١٨،٤٧٪، ٦،٣٩٪، ٥٦٪، ٥٢٪، و ٢٨،٥٧٪ بوونە.

لەناو هەموو نەتەوە سەرەکیەکانی ئێراندا، کورد لە گشتیان کەم خوێندەوارترە و، ئامارگیری ساڵی ١٩٨٦ دەریدەخا کە لە (٢٤) ئوستانەکەی ئێران تەنها بلوچستان کە خۆی وڵاتێکی دوور دەستە لە خوێندەواردا لە هەرێمە کوردنشینەکان خوارترە. لەو ئامارەدا، شاری دێرێنی کوردنشینی قەسری شیرین نزمترین پلەی خوێندەواری لە هەموو وڵاتەکەدا نیشاندەدا. تەنها ٩،٨٧ی دانیشتووانی سەرو (٦) ساڵ دەچنە خانەی خوێندەوارانەوە. ئەوەی جێ سرنجە، شوێنێکی دووردەستی وەکو چاە بەهار لە بلوچستان، ڕاژەی ٢،٢١٪ی بۆ هەمان پلەی تەمەن لەو ئامارەدا وەرگرتوە.

لە هەموو وڵاتەکەدا، هەر فارسی زمانی خوێندن بوە لە هەموو ئاستێکدا و ئێستاش هەر وایە، بەر لە شۆڕشی ئیسلامی ساڵی ١٩٧٩، هیچ جۆرە بڵاوکردنەوەیەك بە زمانی کەمینەکان هەواڵ پەخشکردنی لێدەرچێ، پەسند نەدەکرا، بەڵام قەدەغەش نەدەکرا، شۆڕش ئەم سیاسەتەی بە ماوەدانی یاسایی بە زمانی کەمینەکان بۆ کاروباری چاپەمەنی و میدیای دەست جەمعی گۆڕی هەروەها خوێندنی بابەتی ئەدەبی کەمینەکان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا بەری بەرەڵلاکرا، بەڵام، ئەمە هێشتا نەبۆتە شتێکی باو لە هەموو وڵاتەکەدا، چونکە قوتابخانەو پەیمانگای خوێندنی باڵا هێشتا هەر زمانی فارس تاکە زمانی باوە تێیاندا، سوودی یەکەندەردەستی ئەم مافە یاساییە نوێیە، لەوەدایە کە زمانەکانی تریش، وەکو فارس، ئیتر مافی پێ بڵاوکردنەوەیان دراوەتێ و بەکاریشی دێنن.

کوردان لەم گۆڕانە یاساییە، کە سیایەتی زمانی دەوڵەت ئیتر ناوی نەماوە سوودێکی باشیان وەرگرتووە و ئاسەواری ئەم سوودە لە ئامارگیری ١٩٩٦ی دانیشتووان لە بارەی پەروەردەوە خۆی نواندوە.

لە تورکیا، بەکارهێنانی زمانی کوردی، بەتایبەتی لە بواری خوێندن و بڵاوکردنەوەدا، لە (٣)ی مارس (مارت)ی (١٩٢٤)ەوە، واتە لە ساڵێك دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی لۆزانەوە کە کوردستانی ئەنەدۆڵی بە تورکیا بەخشی قەدەغەکراوە (بڕوانە مێژووی هاوچەرخ). ئەم

قەدەغەکردنـە پامـاڵ کردنێکـی ئاشـکرای دەق و ئامـانجی ڕێککەوتننامەکەیـە کـە لـە برگـەی (٣٨)یدا دایدەنێ کە "نابێ هیچ جۆرە قەدەغەکاریەك بەسـەر هـیچ هاونیشتمانیەکی تورکیـادا بسەپێنرێ لە بـواری بـەکارهێنانی ئـازادی هـەر زمانێـك لـە گفتوگۆ کردنـی شەخسـی یـان لـە کاروویـاری بازرگـانی و ئـایین و گـشت جـۆرێ پـەخش و بڵاوکردنـەوەو لـە کۆبوونـەوە گشتیەکاندا".

لە سالانی (١٩٥٠)دا، قەدەغەکاریـەکان، تـا ڕادەیـەك بـەڵام نـەك لەسـەر ئاسـتی ڕەسمـی، شلکرانەوە تا مەسەلەکە تەنانەت گەیشتە ئاستی هەندێ کاری بڵاوکردنەوەش بە کوردی، ئـەم ڕەفتارە نەرمە، دیسانەوە لە (١٩٨٠)کاندا توند کرایەوە. هەر لەبەر ئەو قەدەغەکاریانە خۆیـان خوێندن و پەروەردە بە کوردی لە تورکیا نووزەیان نیە.

# چاپەمەنی و میدیای ئەلەکترۆنی

جیاوازی نێوان ئاستی خوێندەواری لەناو کوردان و ناو هاووڵاتیەکانی دیکە لە تورکیا گـەلێ زەقترە وەکو لە ئێران. کوردەکانی تورکیا کەمتر لە نیوەی ڕاژەی نیشتمانی وڵاتەکە لە بـواری خوێندەواری و پەروەردەدا دەگرنـەوە، و خـۆی لـە سـێ یـەکی ئـەو هەرێمانـەنادا کـە زۆربـەی دانیشتووان بە نەتەوە تورکن، لە کۆتایی ١٩٩١دا، ژمارەیەکی کەمی ڕۆژنامە و گۆڤاری کـوردی لە تورکیا دەرکەوتن، هەرچەند قەدەغەکاریە ڕەسمییـەکان هـەر لانەچـوو بوون و ئەگـەر ئـەو هەنگاوانەی لـە ١٩٩٠–١٩٩١دا هـەڵنراون، هەنـدێ دەسـت شـلکردنی تریـان بـە دواوە بـێ، تـا خۆیـان دەدەن لـە بـواری پـەروەردەو خوێنـدن و بڵاوکردنـەوە ئـەوا ئاسـتی خوێنـدەواری و گەشـانەوەی کۆمەڵایـەتی – ئـابووری بەشـێوەیەکی سەرسـام ئـاوەر بـەرز دەبنـەوە ئەمـەش کارێکە کە هەم لە سـوودو قـازانجی دەوڵـەتی تـورك و هـەم لـە هـی هاووڵاتیـە کوردەکانیدایـە (بڕوانە ئاوێتە بوون و توانەوە).

کـوردێکی زۆری تورکیـا کـە ئێـستا لـە ئـەوروپای خـۆراوا، بـە کرێکـاری، کۆچـبەری یـان پەنابەری دەژین بەرنامەیـەکی چـڕ و پڕیـان دانـاوە بـۆ فێرکردنـی منداڵـەکانیان بـە خوێنـدن و نووسین بە کوردی (بڕوانە کۆچکاریە هاوچەرخەکان و دەربەدەری وڵاتان). بۆ ئـەم مەبەسـتە،

ئەلفبای لاتینی بنەما بەكاردێنن، ئەم ئەلفبایە جاری یەكەم لەلایەن دوو ڕۆڵەی بنەماڵەی میرایەتی كوردی ڕۆژەكی بەدرخانیەوە، جەلادەت عالی و كامەران دانرا، ئەوان ئەلفباكەیان لە سەرەتادا بۆ چاپكردنی ڕۆژنامەكانی هاوار (١٩٣٢–١٩٤٣) و ڕۆناهی (١٩٣٥) كە لە سوریای ژێر دەستی سەراسوێكاریی فەرەنساوە بەدزیەوە دەیانگەیاندە توركیا بەكارهێناوە، هەر لەو كاتەوە ئەم ئەلفبایە بۆتە پیتی بەكارهێنراو بۆ كوردەكانی توركیا هەر كاتێك جێ دەستیان بوویێ و دەرفەتی بلاوكردنەوەی ناو توركیا یان دەرەوەیان كەوتبێتە دەست.

جۆش و پەرۆشی كوردە دەریەدەرەكانی ئەنەدۆڵ بۆ بینینی بابەتی چاپكراو بە زمانی خۆیان، خۆی لە برێكی گەورەی كتێب و هەواڵنامەو بەرهەمی توێژینەوەی خەستدا كە لە دەزگاكانی چاپەمەنی ناو ئەڵمانیاو فەرەنسا و ئەوستریا و سویدەوە دەردەچێ دەنوێنێ.

ئاسان نیە ئاماری باوەڕپێكرا و لە بارەی باری خوێندەواری كوردەكانی سوریاوە بدەین چونكە هەرێمەكانیان خراونەتە ناو هەرێمی گەورەی تری عەرەبنشینەوە.

بەلام لەبەر تیشكی ئاستی خوێندەواری لە چوار بەشەكەی تری كوردستان و لەبەر ڕۆشنایی نەبوونی كوردی وەكو زمانی خوێندەواری لەوێ، هەرگیز لە گویندا نیە ئەو ئاستە خۆی بدا لە دامێنی پلەی خوێندەواری لەناوچە عەرەب دوەكانی سوریادا.

كۆمەڵگا بچكۆلەكەی كوردەكانی سۆڤیەت لە ئەرمەنستان و گورجستان لە لایەكی ترەوە خاوەنی سیستەمێكی دێرینی خوێندەوارین بە كوردی لە پلە جۆراوجۆرەكانی خوێندندا. زۆر وێ دەچێ خوێندەوارترین كۆمەڵگای هەموو كوردان بن، لە هەمان كاتدا، لە ئازەربایجان و توركمەنستان و قازاخستان و ئۆزبەكستان و قەرغێزستانی سۆڤیەتی، ئەم جۆرە خوێندنە (بە كوردی) نییە، ڕاستییەكەی كوردەكانی ئازەربایجان و توركمەنستان كەوتوونەتە بەر شالاوی سیاسەتی تواندنەوەكە لەلایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتی و ڕێنمایی دەكرێ و لە تۆمار بەندیە ڕەسمیەكاندا سڕراونەتەوە. ئەم كارە لە كۆتایی جەنگی دووەمەوە هەر بەردەوامە، لەوەوە دەتوانین بگەینە دەرەنجامی ئەوەی لەبەر ئەو تەگەرەبەندیانەی كە لەسەر بوونی ئەتنی یان دانراوە، كوردەكان هەوڵێكی ئەوتۆیان وەكو هی هاوزمانەكانیان لە ئەرمەنستان و گورجستان نەداوە.

بۆ سەرچاوە و خوێندنی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** *A Statistical Reflection of the Islamic Republic of Iran* (text in English), Publication No. 4 (Teheran: Ministry of Planning and Budget, Center for Statistics, 1987); *The Population and Household Census, 1986* (Teheran: Iranian Census Bureau, 1987), the "secret edition"; Lord Kinross, *Within the Taurus* (London, 1954)

"کوردستان"ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ساڵی ١٨٩٨ لە ئەستەمووڵی پایتەختی تورکیای عوسمانی لەلایەن میر مەدحەت بەگەوە دەرهێنراوە[2]، میر مەدحەت یەکێکە لە ڕۆڵەکانی بنەماڵەی پڕ ناو و دەنگ و پشتاو پشت میری ڕۆژەکی بەدرخانیی وڵاتی بۆتان. هەندەی پێ نەچوو ڕۆژنامە کە لە ئەستەمووڵ داخرا، ناچار لەوێوە گوێزرایەوە بۆ قاهیرە، دوادواش بنکە و بارگەی گواستەوە ئەورووپا. تا ئێشتاش ڕۆژنامەکە هەر دەردەچێ. ڕۆژنامەیەکی تەمەن کورتیش (تەعاون) ساڵی ١٩٠٨ هەر لە تورکیای عوسمانی دەرچووو، بەڵام چرای تەمەنی زۆر نەسووتاو ئەویش لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتەوە پفی لێکرا. دوا بەدوای ئەمان، ڕۆژنامەیەکی مانگانە (کە ئەویش هەرناوی کوردستان بوو) دەرچوو. ئەمەیان لە پێشدا لە ئورومیە، ڕێك لە ساڵی ١٩١٢ لەلایەن ڕۆڵەیەکی تری بنەماڵەی بەدرخانەوە میر عەبدوڕەزاق بەگ، دەردەکرا. ئەمیش ئەوەندەی پێ نەچوو لەلایەن ڕووسەکانەوە خەفەکرا، چونکە باکووری ئێران ئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو. کە ئەمیش ساڵی ١٩١٤ لە دەرچوون کەوت، "یەکبوون" و ڕۆژی کورد" لە ساڵی (١٩١٢)ەوە کەوتبوونە دەرچووون.

دوا بەدوای ئەم سەرەتایانە، ئیتر ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی شریتەیان بەست. هەندێ لەناوە بە ناوبانگەکان ئەمانەن: بانگی کورد (١٩١٤)، ژین (١٩١٨)، تێگەیشتنی[3] (١٩١٨—١٩١٩) کورد درسال ١٣٤٠ (١٩٢١)، ڕۆژی کوردێکی تر (١٩٢١)، پێشکەوتن (١٩٢٠—١٩٢٢) ڕۆژی کوردستان (١٩٢٢—١٩٢٣)، بانگی کوردستان (١٩٢٢—٢٣)، بانگی حەق (١٩٢٣)،

[2] ئەم هەڵەیە لە لاپەڕەکانی پێشوودا ڕاستکراوەتەوە — وەرگێڕ.

[3] دەبێ مەبەستی ڕۆژنامەی "تێگەیشتنی ڕاستی"بێ کە ژمارە (١)ی لە بەغدا ساڵی ١٩١٨ دەرچووە. بڕوانە د. کەمال مەزهەر "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا" — وەرگێڕ.

ئومێدی ئیستقلال (١٩٢٣–٢٤)، دیاری كوردستان (١٩٢٥–١٩٢٦) و گۆڤاری زاری كرمانجی (١٩٢٦) كە گۆڤارێكی ئەدەبی بوو.

ژمارەی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی پاش ئەمانەی سەرەوە بە زمانی كوردی دەركراون ئەوەندە زۆرن بۆیە ناوبردنی یەكێكیان تۆمارێكی تایبەتی دەوێ. سی. جی. ئێدمۆندز ژمارەگیرییەكی باش و رێكوپێكی چاپەمەنی ساڵەكانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ كردووە. ئێدمۆندز هەروەها باسی توانای چاپەمەنی و بڵاوكردنەوەی كوردیشی بە گشتی كردووە (بڕوانە نووسراوەكانی ساڵی ١٩٢٤، ١٩٣٧، ١٩٤٥)ی. ئێستاكە، ژمارەی ئەو رۆژنامە و پەخشنامە و گۆڤارانە خۆی دەدا لە سەد كە چ لە كوردستان چ لە هەندەران و تاراوگە دەردەكرێن. هەندێك لەمانە بە زمانی كوردی و هەندێكی تریان بە زمانی بێگانە دەردەكرێن، بەڵام هەموو دەربارەی مەسەلەی كورد بابەت بڵاودەكەنەوە، هەرچەندە وڵاتانی كوردنشین دیوار و بارستی بڵند و دژوار بۆ مەرزبەزێنی و چوونە ناوەوەی دەكەن، بەڵام چاپەمەنی كوردی لە هەموو بارودۆخەكاندا، هەرچەندە دژواریش بووبێتن، هەر توانیویانە خۆیان بگەیەننە دەستی خوێنەران.

زاراوەی هەرە باڵادەستی ئەم چاپەمەنیە كوردیانە، بەشێوەیەكی گشتی كرمانجی ژووروو بوە، چونكە كرمانجەكانی باكوور ئێستاو ئەوجاش، زۆرینەی كوردانیان پێكهێناوە، وڵاتەكەشیان نزیكترین بەشی كوردستان بوە، لە ئەورووپای پێشكەوتوو لە بواری سەنعەتدا و ئەمە باشتر دەرفەتی ئاگاداری لە پێشكەوتنە زانستیەكانی ئەو وڵاتانە بۆیان ڕەخساندووە و باشتریش بە بیر و هزری نوێش ئاشنای كردوون. پەیدابوونی كۆماری توركیا و ئەو سیاسەتە زبر و ناڕەوایانەی كە لە بارەی كاروباری زمانی و نەتەوەیی نەتەوەكانی ترەوە گرتیەبەر، هێندەی نەبرد ئەم باڵادەستیە زمانیەی لە كرمانجی باكوور سەند و كردیە دەستی كوردانی باشوورەوە لە عێراق. ئەم باڵادەستیەی كرمانجی باشوور تا ئێستاش هەر بەردەوامە، ئەوەندەی لێدەرچێ كە ئەو هێز و تەوژمەی جارانی، لە ساڵانی (١٩٨٠)وە ئەماوە بە تایبەتی پاش سەرلەنوێ دەركەوتنی چاپەمەنی بە كرمانجی باكوور لە ئەورووپا. زاراوەی دیمیلكی ئێستا رۆژنامەیەكی لە ئەوستریا (نەمسا) بەناوی "تەیرا"وە پێ دەردەچێ، بەڵام هێشتا بە گورانی هیچ دەرناچێ.

گەلێك لە شارە کوردنشینەکان ئێستا خاوەنی ئێزگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی خۆیانن، بەڵام پەخشی دەرەوەی سنوورییان جیایە، لە تورکیا هیچ، لە عێراق بە بەردەوامی و لە ئێران بەین و بەینە. ئەمە ئێزگە ڕادیۆیی نهێنیەکان ناگرێتەوە، کە بۆ هەموو کوردان پەخش دەکرێش و هەر جارە لە شوێنێکەوە ئاراستە دەکرێن و زیاتر بە مەسایلی سیاسییەوە خەریکن و ئەوەندە پەیوەندییان بە گەشاندنەوەی کەلتوور و کۆمەڵگای کوردەوە نیە، بۆ نموونە، زۆر جێگەی گومانە ئەگەر هەموو ئێزگە ڕادیۆییە نهێنیەکان بخەینە سەریەك، بە ئەندازەی ئەو بەرنامە ئەمەریکیانەی باسی ژیانی خێزانداری ئەمەریکا دەکەن و بە زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی بەهاکانی ڕۆژاوا دەمێننە مێشکی گوێگرانەوە (بە کوردیشەوە)، سوودیان بۆ پێشکەوتنی جیهانبینی کوردان هەبێ لە بارەی گۆڕانکاریەکانی ئەم دنیایەوە، ئەم ئێزگانە هەر لە بواری پەخشی ڕادیۆییدا چالاکن و پەخشی تەلەفزیۆنییان هەر نیە.

مۆسیقای کوردی کە لە ئێزگە ڕادیۆییەکانەوە پەخش دەکرێ، لە باکووری سووریا دەبیسترێ، لە کاتێکدا ئێزگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراق لە کوردستان (بەر لە جەنگی کەنداو) پرۆگرامی ڕۆژانەی پڕ و تەواویان پەخش دەکرد، لە ئێران تەنها کاتێکی کەم لە پەخش بۆ بابەتی سرف کوردی تەرخانکراوە.

لە کاتێکدا، هەردوو ئێزگەی نیشتیمانی لە بەغدا و تاران، بەردەوام گۆرانی و مۆسیقای کوردی لێدەدەن لە ئێران، تەنانەت ڕادیۆ مەشهەدیش بەرنامەیەکی یەك ساعەتەی بەردەوامی بە کوردی هەیە بۆ دانیشتوانی کوردنشینی خوراسان.

چ لە ئێران، چ لە عێراق، ڕۆژنامە دەرکردن بە کوردی ئازادە، تا ئەو ڕادەیەی لەو سنوورە دەرنەچێ کە بۆ ڕۆژنامەگەری دەوڵەتی دانراوە، لە کاتێکدا هەندێ ڕۆژنامەی گرنگی ئێرانی بابەتە سەرەکیەکانیان بە فارسی و ئازەری دەردەکەن (ئازەری زمانی ئازەریەکانی ئێرانە کە لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە نەتەوەی دووەمی وڵاتەکەن)، ئەم پلە و پایەیە گرنگە هێشتا بە زمانی کوردی نەبەخشراوە.

پاش دەرکردنی "یاسای زمانەکان" لە تورکیا، ساڵی ١٩٩١، حکوومەتی تورك هەندێ هەنگاوی پۆزەتیفی بەرەو بەکارهێنانی زمانی کوردی ناوە، و لە دیسەمبەر (کانوونی یەکەم)ی (١٩٩١)ەوە، پاش ساڵەهای ساڵی قەدەغەکاری، تورکیا ڕێگای بە دەرکردنی هەندێ بابەتی

كوردی داوە. لەناو ئەوانەدا كە لەم دواییانەدا دەركەوتوون، ڕۆژنامەیەكی كوردی بەناوی "ڕۆژنامە"وە بە (٣٨) لاپەڕە بە كرمانجی باكوور و (٢) لاپەڕە بە دیمیلكی دەردەچێ، هەروەها گۆڤارێكیش بەناوی (دەنگ)ەوە كە گشتی بە كرمانجی باكوور دەردەچێ. كوردەكانی توركیا كە لە هەنگاوی بەدكارانە بەولاوە هیچی تریان لە چوارچێوەی سیاسەتی نەیارانەی توركیادا نەبینیوە بەم چاكسازیانە زۆر كەیفخۆش نین و خەڵكەكە بە پارێزەوە لێیان نزیك دەبنەوە، ڕووناكبیر و خوێندەوارەكانیان پێویستیان بەكات و ماوەیەكی زۆر هەیە تا بە تەواوی لە ئامانجەكانیان بگەن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Amir Hassanpour, "The Language Factor in National Development," unpublished doctoral thesis (Urbana: University of Illinois, 1989), particularly chapter 7; C.J. Edmonds, "A Kurdish Newspaper: Rozh-i-Kurdistan," *Journal of the Central Asian Society* XI-i ((1924); C.J. Edmonds, "A Bibliography of Southern Kurdish, 1920-36," *Journal of The Royal Central Asian Society* XXIV (1937); C.J. Edmonds, "Bibliography of Southern Kurdish, 1937-1944," *Journal of the Royal Central Asian Society* XXXII (1945). Some very valuable surveys of the Kurdish press and journalism have appeared in Kurdish and other Middle Eastern languages (except for Edmonds, I am unaware of anything comprehensive or otherwise in English). Some of these are Abduljabbâr Jabbâri, *History of Kurdish Journalism* (Sulaymânia, Iraq, 1970); Najmadin Malâ, "History of printing press in Sulaymân·a," *Zhin* 30-1232 (Baghdad, 1955); Muhammad Malâ-Karim, "Brief Review of the Open Kurdish Press," *Al-Ta'âkhi* (Baghdad, June 15, 1970); Alâuddin Sajjâdi, *History of Kurdish Literature* (Baghdad, 1971); Jamâl Khazânadâr, ***Kurdish** Journalism Guide* (Baghdad, 1973).

# فەسڵی حەوتەم

# کۆمەڵگا

## کەسایەتی نەتەوەیی

کوردەکان هەموو مەرجە سەرەکیەکانی (نەتەوەبوونی) سەربەخۆیان تێدایە. لە گرنگترینی ئەو مەرجانە، مێژووی دووروودرێژی هاوبەش، دیدی جیهانی هاوبەش، کەسایەتی نیشتمانیی هاوبەش، یەکپارچەیی ئابووری، سەرزەمینی نیشتمانی هاوبەش و ئاواتی هاوبەشی چارەنووسی دوا ڕۆژ. کە سەیری ئەو خەسڵەتە هاوبەشەی کوردەکان دەکەی و لەگەڵ هی گەلانی تردا بەراوردیان دەکەی، دەبینی تەنانەت گەلێ گەلی هاوچەرخ و پێشکەوتووش ئەوەندە هاوبەشیەتی تێکەڵکێشیان نیە کە وەکو (نەتەوە)یەکی سەربەخۆ و جیاواز دەریان خا، تاقە جیاوازی لەوەدایە، ئەم گەلە سەربەخۆیانە خاوەنی دەوڵەتی خۆبەخۆی خۆیانن، ئەمەش لەوانەیە تەنها دەرەنجامی ئارەزووی ئەو هێزە دەسەڵاتدارانە بووبێت کە ئەم گەلانە سەردەمانێك لەبەر هەر هۆیەك بوویێ ژێردەستەیان بوونە، هەر لەبەر ئەم بێ دەوڵەتیە خۆشی و هیچی تر نا، هەر داواو دادخوازییەکی ئەم گەلە بۆ سەربەخۆیی و کەسایەتی جیاواز، کەوتۆتە بەر شالاوی بەدگومانی.

ئەگەرە و کۆسپی دەرەکیی لەبەردەم کەسایەتی نەتەوەیی کورددا، لەو بەدگومانیانەدا بەرجەستە دەبن کە دەخرێنە سەر دێرینەیی و ڕەسەنایەتی ئەم گەلە لە کۆن و نوێدا، گەر باش لێیان وردبینەوە، دەبینین کەوا زۆربەی ئەم کۆسپ و ئەگەرانە، نەك گشتیان، دەسکاری ئەو دەوڵەتانەن کە فەرمانڕەوای وڵاتی کوردانن، لە پاڵ ئەمانەشدا، گەلێ شارەزا هەن کە تەنها بن مەنجەڵێکی کەم و بێ تامی زانیارییان لە بارەی مێژوو و ڕابردووی کوردەوە هەیە، بێ

یەك و دوو و بە پەلەپەل دەکەونە ئاوازدانان و هایکردن بۆ ئەو بۆچوونانە، ئەم ڕوو بەڕووبوونەوانە، بەگشتی، لەم سێ شێوەیەی خوارەوەدا دەردەکەون:

١)گوایە کوردەکانی ئەم سەردەمە، لە خەسڵەتدا لەو گەلە دێرینانە جیان کە لە سەردەمانی هەرەزوودا لە کوردستان ژیاون، چونکە ئەمان، لە ڕووی زمان و ئاینەوە لەوان جیاوازن.

لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا پرسیارێکی زۆر بەجێ هەڵدەزەقێتەوە: باشە بۆ دەبێ تێکڕای ئەو گەلانەی کە لە سەردەمەکانی هەرە هەرە زووەوە لە کوردستاندا ژیاون بە کورد دانێین، لە کاتێکدا وەکو هەموومان دەیزانین کەلتوور و فەرهەنگ و ناسنامەی نیشتمانیی کوردان، هەروەها زمانیان، سەراپا بە هاتنی ئاریەکان و کۆچکردووەکانی تر، کەوتنە بەر گۆڕان، لەم ڕووەوە دەتوانین کوردەکان ڕێك لەگەڵ میسریەکاندا بەراورد بکەین، چونکە میسریەکانی سەردەمانی هەرەزووش بە زمانێك دەدوان کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەم عەرەبیە جیابوو کە ئێستا پێی دەئاخاون و لە داهاتنی ئیسلامەوە بە شانازیەوە خۆیانی پێوە دەشەنگێنن. گەلێ ڕەگەزی تر خزاونەتە ناو ئەم گەلەوە، هەروەها ناسنامەی نەتەوەییشیان بێ هیچ گومانێك بە داهاتنی ئیسلام و داب و نەریت و دەستوورەکانی گۆڕاون، لەم بوارەدا دەکرێ میسریەکان دووبارە بکەینەوە نموونە و سەرتۆپ هەر لە سەدەی دەیەمەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان، ئەوەی دەیزانین، میسریەکان بەر لەوەی ببنە مەسیحی و ئینجا ئیسلام، لەسەر ئایینی فیرعەونیی بوون. تەنانەت تا ئەمڕۆش گەورەترین پەڵەی دانیشتوانی مەسیحی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هەر لە میسر دەژین و نزیکەی (١٠٪)ی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێکدێنن کەچی لەگەڵ هەموو ئەم تێکەڵبوونە ئەتنیکیەی ڕابردوو و جیاوازیە ڕەگەزییەی ئێستاشدا، کەم کەس هەن کە بڵێن میسریەکانی ئەم سەردەمە نەوە و میراتگر و جێگری گەل و شارستانیەتی دێرینی میسر نین، پەیوەندی نێوان ئێرلەندەییە ئینگلیزی زمانەکانی ئەم سەردەمانەش، لەگەڵ باوباپیرانی دێرینی (گال)یاندا، هەر شتێکە لەم بابەتە، نموونە لەم ڕووەوە گەلێکن و کوردانیش لەم بوارەدا وەکو هەر گەلێکی دێرینی تری ڕووی ئەم زەمینەن، کە بە درێژایی زەمان زمانی نوێیان کردۆتە زمان بۆ خۆیان، یان بەشێوەی بنەڕەتیی کەوتوونەتە ژێر

کارتێکردنی فەرهەنگ و نەریتی ترەوە، ئەم گۆڕانە گەورەیە، زۆر بە قووڵی بە ناخی ئەم گەلەدا، وەکو گەلانی تر، داچووە.

دەق بەوێنەی هەر گەلێکی گەورە و گرانی تر، کوردەکانی ئێستا و ئەوجاش، دوا بەرهەمی ئاوێتەبوون و تێکدا توانەوەی گەلێ بابەتی ئەتنیکی تر بوونەو هەن، ئەمانیش بێ هیچ پێچ و پەنایەك، هێشتاش ڕەنگ و بۆی کەلتوورێکیان پێوەیە کە پاشماوەی کەلتوورێکی کەوناراتر یان هی کۆمەڵگای ترە و هێشتا هەر ئاسەواری ماوەو سەردەمانێکی هەرەزوو کەلتووری باوی ناو کۆمەڵگای سەروەخت بووە. لە میسر، مەسیحیە قپتیەکان، بۆ نموونە، دوا پاشماوەی ئەو میسرەن کە سەردەمانێك هەمووی مەسیحی نشین و قپتی زمان بوو و ئێستا داب و نەریتەکانیان هێشتا لەناو فەرهەنگی میسری ئێستای بە ئایین ئیسلام و بەزمان عەرەبدا هەر باوە.

لە هەزارەی شەشەمی پێش میلاد بە دواوە لانی کەم چوار سەردەمی تێکدا ئاوێتەبوونی نەتەوەیی لە کوردستاندا ڕوویداوە کە هەر یەکەیان لەڕووی پێناسەوە تازە هەڵچنراو و نوێ بابەت بووە، دوا سەردەم بە دارمانی کۆمەڵگای وەرزێڕی، پەهلەوانی دووی، سەدەکانی ناوەڕاستی کوردستان کە بە ئایین سەریە تیرەی فریشتەکان بوون، دەستی پێکردووە. تەنینەوەی لەسەرخۆی، کۆچەرە ئاژەڵدارە، کرمانجی دوو و بە ئایین ئیسلامە سوننیەکانی هەرێمی هەکاری لە کوردستانی باکووری ئێستادا وا خەریکە دێتە کۆتایی لە کاتێکدا نزیکەی سێ بەشی هەموو کوردان، ڕەگ و ریشەی کەلتوور و کەسایەتی ئێستایان دەچێتەوە سەر ئەم پرۆسەیە. لەهەمان کاتدا پەهلەوانی دوەکان، کورژبوونەوە و بوون بە نزیکەی چواریەکی کوردان. هەر لەبەر ئەم هۆیە، ئەگەر بیانەوێ بەڵگە بۆ ئەوە بێننەوە کە تاکە میراتگر و خاوەنی فەرهەنگ و کەلتووری کوردستانن، بەڵگەکانیان لە هی قپتیەکان بەهێزتر نابن گەر بڵێن ئێمە میراتگر و خاوەنی فەرهەنگ و کەلتووری میسرین، و بەهەمان شێوە، هەر بەقەدەر میسری بوونی قپتیەکانی ئێستا، ئەوانیش دەتوانن خۆیان بە کورد دابنێن.

بۆ زیاتر قیتکردنەوەی ئەو گۆڕانی ناسنامە و فەرهەنگی نەتەوایەتیە، دەتوانین نموونەی تریش بێنینەوە، دراوسێ سەرەکیەکانی کوردەکانیش واتە فارسەکان و تورکەکان و عەرەبەکان، ناسنامەی فەرهەنگیی ئێستاکەی خۆیان هەر بە پرۆسەی چون ئەوەی کوردەکان

بۆ ماوەتەوە. ئامۆزا ئەتنییەكانی كوردەكان، واتە فارسەكان، كە ئێستا هەر لە سنوورەكانی چین و هندستانەوە تا وڵاتی مێزوپۆتامیا تەنیویانەتەوە، و خۆ بە كەلتوور و فەرهەنگی خۆیی جیاواز و زمان و مێژوو بەرز و بوومی خۆییەوە دەشەنگێنن، دوا بەرهەمی ئاوێتەبوونی چەندین كۆمەڵی ئەتنین كە هەریەكەیان لەوی تریان جیاوازبووە، بەڵام دەسرۆ و خاوەن مێژوو بوون. ئەم كۆمەڵانە بریتین لەهی وەكو باكترییەكان، سوغدیەكان، كوشانەكان، كەرمانیەكان، میدیە رۆژهەڵاتیەكان و گەلێكی دیكە، ئەمانەی دواییان وەنەبێ بریتی بوو بن لە پاشەبەرەیەكی مێژوو و هەر لەبەر ئەم هۆیەش، بە گرووپی فارسی ڕەگەز دادەنرێن كە لەگەڵ سەرەتای ئیسلامدا چوزەرەیان دەركردووە.

"عەرەب"ەكانی میسر و عێراق و سوریای مەزن، كەلتووره میراتە قیپتی و ئارامییەكەی بەر لە ئیسلامەتی خۆیان هێناوەتە ناو ناسنامەی عەرەبی نوێیانەوە، بێ هیچ گێرمە و كێشە و گیروگرفتێك. توركمانەكانی توركیا، لە تێكەڵاوبوون لەگەڵ توركەكاندا هەنگاوێكی زۆریان هەڵناوە و وا خەریكن پێكەوە ناسنامەی هاوبەشی توركایەتی وەردەگرن لەو وڵاتەدا.

٢)گوایە وشەی "كورد" كە لەلایەن سەرچاوە هەرە كۆن و كلاسیك و سەدە ناوەندیەكانەوە بەكارهێنراوە نیشانەی ڕەگەزێكی تایبەتی نەبووە، وەكو ئەرمەنی یان فارسەكان، بەڵكو ئیدیەمێكی گشتی بووە و مانای (شوان)ی گرتیۆتەوە.

ڕاستیەكەی گەلێ شارەزای ئەم چاخەی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە كاتێكدا ڕووبەڕووی هەندێ باسی مێژوویی دەبنەوە لە بارەی بوونی پرانبەكی زۆری كورد لە شوێنی دووردەستی ئەوتۆدا كە ئەمڕۆ زۆربەی دانیشتوانیان كورد نین، یەكەندەردوو و ساویلكانە دەبنە داوی ئەو بیروڕایەوە كە گوایە وشەی "كورد" بەو شێوەیەی لە سەرچاوەكانی سەردەمە كۆن و ناوەندیەكاندا بەكارهێنراوە، بۆ وەسفكردنی شێوەیەكی ژیان بە كاربراوە، نەك بۆ ئاماژەكردن بۆ پێكهاتەیەكی ڕەگەزی. هەروەها، زۆربەی ئەو بابەتانەی ئەمڕۆكە بۆ دەستنیشانكردنی شوێن و جێگەی كورد لە مێژوودا دانراون، وا بە خوێنەرانیان نیشاندەدەن كەوا وڵاتناسانی سەدەكانی كلاسیك و ناوەڕاست لە كارەكانیاندا ناوی "كورد"یان بۆ هەموو ئەو خەڵكانە داناوە كە چیانشین و ڕەوەندو پەزدار بوونە، جا لە هەر تیرەو نەتەوەیەك بووبن.

واتە، لەم سەرچاوە کۆن و بە نرخانەدا، ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك هەرچەندە بە کوردیش باسکرابن، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بە پێکهاتەیەکی ڕەگەزیی کوردەوە نیە.

هەروەها، دانەری ئەم کتێبە خۆشی، هەرچەندە بە پارێزیشەوە بووبێ خلیسکاوەتە ناو ئەم هەڵسەنگاندنە ڕووکەشییە یەکجار چەوتەوە (بڕوانە ئیزەدی ١٩٨٦) بەهەردوو پاوە کەوتنە ناو ئەم هەڵەیەوە، دەکەوێتە مل باش نەگەیشتن لە کۆچکاریە مێژووییەکانی کوردان، لەم بارەیەوە دەبێ بزانین، کە هەزارەها کورد، لە چەند هەزار ساڵی ڕابردوودا لەسەرزەمینی خۆیان هەڵکەنراون و لەسەرزەمینی نوێ نیشتونەتەوە. هەندێکیان ناوی کوردیان هەر پێوە ماوە و هەندێکیان ناوەکەیان بەرەبەرە چۆتەوە و لەناو پێکهاتەی ئەتنی تردا تواونەتەوە (بڕوانە کۆچکاریە مێژووییەکان) لەگەڵ هەموو ئەمەشدا ئەو گومانباریانەی دەخرێنە سەر شوێن و ڕێی ڕاستەقینەی کورد لە مێژوودا، وەکو بەفری بەهار لەبەر هاڵاوی پڕ تینی ئەم ڕاستیانەی خوارەوەدا دەشوێنەوە:

أ)هیچ سەرزەمین و وڵاتێك ناوی بە کوردەوە نەبەستراوە، ئەگەر ئێستاش هەر نەبێ ئاسەوارێکیانی لێ نەمابێتەوە، یان تەنانەت پاش چەندین پرۆسەی دوا بە دواییەکی کۆچکردن و دەرپەڕاندن (کە تا ئێستاش هەر بەردەوامن) باسی مەڵبەندی ئەسڵییان نەهاتبێ.

ب)چیاکانی زاگرۆس ئەو سەرچاوەیەن کە زۆربەی هەرە زۆری کوردانیان لێوە هەڵقوڵاون لە سەردەمانی دێرینەوە. ئێستاکەش کوردان زۆربەی دانیشتوانی ئەم چیایانەن.

ج)گەلێ گرووپی پەز لەوەڕێنی تورك نەژاد کە هەر ئاماژە بۆ چەند وانەیەکی کەمیان دەکەین وەکو قەشقاییەکان، ئەفشارەکان، ئینانلوەکان، قەرەگوێزلوەکان، لانی کەم لە (٥٠٠) ساڵی ئەم دواییانەوە لە چیاکانی زاگرۆس نیشتوونەتەوە و بەشێوە بژێوێکی وەکو هی کوردانەوە ژیاون، کەچی لە هیچ قۆناغێکی مێژوودا بە کورد باس نەکراون.

ء)ئەو گرووپە ئێرانی ڕەگانەی کە بەردەوام بە کورد ناوبراون لە سەرچاوە کۆنەکاندا، بریتین لەو خێڵانەی لە زاگرۆس نیشتەجێن، وەکو شەبانکارەکان، مامەسەنیەکان، گیلۆکان، بۆیەر ئەحمەدەکان و لوڕەکان، ئەمانە، لەڕاستیدا، بەر لەوەی لە هەزار ساڵی ڕابردوودا بتوێنەوە، کورد بوون، ئەوان ئێستاش هەندێ نیشانەی دابەشبەندی و ناوی کوردیی خێڵەکییان

هەرپێوەیە، بەمەش ئیسپاتی دەكەن كە جاران بەشێك بوون لەم گەلە (بڕوانە ئاوێتەبوون و تێكداتوانەوە).

بۆیە، بێ هیچ یەكو دوویەك، ئەو كوردانەی لە سەرچاوە كلاسیك و ناوەندیەكاندا ناویان هاتووە كوت و مت بە نەتەوە كوردی بێ خەوشن و باوباپیرانی كوردانی ئەم سەردەمەن، هەروەها هی ئەوانەی كە لە سەرەتای سەردەمە ناوەندیەكانەوە بەدواوە.

ناسنامەی ئەتنی تریان وەرگرتوە لە باشووری زاگرۆسدا. ٣)گوایە كوردان خاوەنی زمانێكی هاوبەش و ئایینێكی هاوبەش نین كە وەكو گرووپی نەتەوەیی پێكەوە شەتەكیان بدا. ئەم مەسەلەیە، ئەوی ڕاست بێ، پێویستی بە لێوردبوونەوەی پتر هەیە. ئەمڕۆكە، كۆمەڵگای كوردەواری لە ڕووی هەموو ئەو پێویستیانەوە كە بۆ پێكهێنانی ناسنامەی نەتەوەیی پێویستن وەكو ئایین، زمان، شێوەكانی بەرهەمهێنانی ئابووری و و خاكی یەكپارچە، یەكرەنگ و یەكبارنیە، بۆ نموونە، ئاستی لێكگەیشتنی لەنێوان زاراوە جیاجیاكانی كوردی دا، لە لێكگەیشتنی نێوان فەرەنسی و ئیتالی و ئیسپانی و پورتوگالی باشترنیە، لە ڕووی پێكهاتەی جەستەوە، كوردان گرووپێكی هەمە چیزەن. تێكڕای سەرزەمین و گەلەكە لە سێ پشتی ڕابردوەوە یەكیەتی جەستەی بە خۆیەوە نەبینیوە، لە سێ پشت مەبەستمان ئەو ماوە زەمەنیەیە كە بۆ دروستكردنی زۆریەی ئەو نەتەوە دیارانەی كە ئیمڕۆ. لەسەر ئاستی گشت جیهاندا بە نەتەوەی سەربەخۆ دەناسرێن پێویستە.

كوردان لە ڕووی ئایینەوە، بەسەر چەندین ئایین و لق و پوپیاندا دابەش بوون و ئابووری كوردییش هەمیشە هەمە جۆرە بووە. لە لایەكەوە، ڕەوەندی و خڕ وەرزێڕی و لە لایەكی دیكەوە، خزمەتگوزاری شار سیما و سەنعەت و بازرگانی كە هەموو پێكەوە هەر نەبێ لەم هەزارەی دواییەوە شان بەشانی یەك بوونیان هەبوە. لەم كتێبەدا، زانیاری پێویست لەسەر ئەم سەر باسانە خراونەتە بەر دیدەی خوێنەر.

دیارە ئەم جیاوازیانە، ڕێ لەوە دەگرن كە كوردان ملی لێ هەڵكێشن و بڵێن بەڵێ ئێمە چون چوری شیر هیچ پێكهاتەیەكی ترمان تێدا نیە، بەلام لەم فرە بابەتیەدا هەر كوردان بە تەنها نین، بە مەرجێك وەكو نەتەوەیەكی خاوەن جیاوازی ناوخۆیی دابنرێن، نەك وەكو كەمینەیەكی ئەتنیكی سەر بە نەتەوەی تر، كەمینە ئەتنیكییەكان بە سروشتی یەكرەنگی و

تایبەتی زمان و ئایین یان ڕەگەز لە زۆرینەکان جیادەکرێنەوە، نەك بەفرە باوکی ئەم نیشانانە، کوردەکان نەتەوەیەکی فرە زمان، فرە ئایین و فرە ڕەگەزن، بەڵام مێژوویەکی نەتەوەیی و فەرهەنگێکی یەکگرتووی سەربەخۆی تایبەش بە خۆیان هەیە. کورد بەوە لە کەمینەی ئەتنیکی جیا دەکرێنەوە کە فەرهەنگەکەی بەشێك نیە لە فەرهەنگی نەتەوەیی زۆرینەیەك، مێژووەکەشی بەشێك نیە لە مێژووی نەتەوەیەکی گەورەتر.

لە پەلپەلیی ناو خۆیاندا، کوردەکان زۆر لە عەرەبەکان دەچن، چونکە ئەوانیش وەکو ئەمان پێکهاتەیەکی فرە ڕەگەزی، فرە فەرهەنگی، فرە ئایینی و زمانن.

عەرەبیی ستاندەرد، واتە (فوسحا)کە بە ئەدەبێکی عەرەبی ڕەسەنی وەکو هی قورئان پشت ئەستوورە، زمانی نەتەوایەتی هیچ کۆمەڵێکی عەرەبی ئەم سەردەمەی ئێستا نیە، ئاستی لێکگەیشتن ئەوانەی کە بەشێوە جۆراوجۆرەکانی ئێستای زمانی عەرەبی دەدوون هەر لە مۆریتانیا و مەڕاکشەوە بگرە تا دەچێتە لوبنان و عێراق و عەمان، ڕێك وەکو ئاستی لێکگەیشتنی گرووپە جۆراوجۆرەکانی کوردە. هیچ گومانێك لەسەر ناسنامەی عەرەبایەتی ئەم گرووپانە نیە کە خۆیان بە عەرەب دەزانن، هەرچەندە لە شێوەزاریشدا ئەوها لێك جودان، چونکە ئەو حکوومەتانەی کە حوکمڕانی وڵاتانی عەرەبن بەوپەڕی توانەوە ئەو ناسنامە یەکگرتووەیان پایەدار و پارێزراو ڕاگرتووە.

گەلان، تا بتوانن کەلەپوور و ژیانی نەتەوایەتی خۆیان بگەشێننەوە و پتەویان بکەن، پێویستیان بەوەیە دامەتەکانیان بە ئازادی بەکاربێنن، ئەگەر نا، بەڕێکوپێکی بەرەو پێش ناچن، ئەم جۆرە ئازادیە دەشێ لە شێوەی حوکمی ئۆتۆنۆمییدا بێ، وەکو ئەوەی کوردان لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتە فرە نەتەوەکاندا هەیانبووە، یاخود لە شێوەی سەربەخۆیی تەواوی وەکو ئەوەی لە ژیانی نێودەوڵەتی ئێستادا باوە، ستاندەردیزەکردن و سەراسوێی کردنی دەوڵەت لە پێکهێنانی زمانێکی ئەدەبیی هاوبەش، واتە فوسحا (فصحی)، بۆتە مایەی یەکێتی عەرەبەکان لە بواری ناسنامەی نەتەوەییدا، ئێستا عەرەبەکان وەکو نەتەوەیەکی گەورەی دەسەڵاتدار بەرووبوومی ئەو یەکێتییە دەخۆن و لەم ناسنامە هاوبەشە نوێیەدا کە هەر لەم سەدەی دواییدا وەدەستیان کەوت، دەستیان بەسەر گرووپی جیاجیای تریشدا گرتووە.

کەچی، بەپێچەوانەوە ئەم سەدەیەی ئێستا لەگەڵ خۆیدا بۆ کوردستان ئەوەندە پارچە پارچەیی هێناوە، کە هەرگیز لە مێژووی کورددا رووی نەداوە. بە داهاتنی دەوڵەتی نوێ لە رۆژهەلاتی ناوەراست کە بەسنووری نیشتیمانی قایم و باش پاسکرا و پارێزراون، بزووتنەوەی کوردان و ئاڵوگۆڕکردنی فەرهەنگ و بیرورا لەنێوان پێنج پارچەکەی کوردستاندا، یەکجاری بوە بە کارێکی تا بڵێی دژوار، ئەم بارە زیاتر بە دوژمنایەتی و نەیاری پەرەسەندووی نێوان ئەو دەوڵەتانەی کوردان تیایاندا دەژین، زیاتر نالەبار بوە.

لە گەلێ لاوە، کوردستانی ئەم سەردەمە نموونە و نیشاندەری شێوەیەکی زەقیی دواکەوتوویییە لە بواری پێشکەوتوویی نیشتمانییدا. دانیشتوانەکەی لە بارەی ناسنامەی نەتەوەیی گشتییەوە سەریان لێ شێواوە، بە کورتی، ئەوان لە سەرەتای (١٩٢٠)ەکاندا لە جێی خۆیان چەقین، کەچی گەلەکانی دراوسێیان، زیاتر نەشونمایان کرد و لە بواری ئیدیۆلۆجیایەکی نیشتمانی یەکگرتوو و فەرهەنگ و زمان و مێژووی نەتەوەیی (راست بێ یان هەڵبەستراو)، میزاجی میللی و فەرهەنگی سیاسییدا پێشکەوتن و گەشەیان کرد بۆ نموونە، تەنانەت ئاهەنگە نیشتمانییە سەرەکییەکان لە کوردستان، ئەوەندە لە کات و ساش و شێوەی جیاجیادا دەگێڕرێن، تا وای لێ دێ وشەی (نیشتمانی) ئەوەندە بۆ رووداوەکان گونجاو نایەن و بۆ کوردەکان خۆیان دەبنە مایەی هەراسانی (بڕوانە جەژنەکان، ئاهەنگەکان و ساڵنامە). کوردێکی خەڵکی کرماشان لە ئێران بۆ ئەوەی لەگەڵ کوردێکی هەولێری عێراق، یان خەڵکی عەفرینی سوریا یان دیاربەکری تورکیادا گفتوگۆ بکا، دەبێ زمانێکی تر بەکاربێنێ، چاك و چۆنی ئاسایی لێدەرچێ، و ئەمە دەبێ بە مایەی سەرسوورمان کەسێکی بیگانە گەر بە هەڵکەوت لە ناویاندابێ، هەمان شت یەخەگیری عەرەبی وڵاتە جۆراوجۆرەکان دەبوو، گەر فوسحا (فوسحا) بۆیان نەبوایە بە هۆکاری لێکگەیشتنیان.

کار بەوەندەوە نەوەستاوە، بەڵکو خۆی گەیاندوەتە ئاڵای "نیشتمانیش" ئەوەتا دوو ئاڵا هەن کە هیچیان نیشانەیەکی کوردییان پێوە نیە.

ئەمڕۆکە دوو ئاڵا بەسەر وڵاتی کوردستانەوە دەشەکێنەوە، هیچیان لە رووی راستییەوە تایبەتمەندی یان نیشانەیەکی "کورد"یان پێوە نیە و ناچنەوە سەر کورد. دوو وێنەی رەسەن و دێرینەی کوردیش ئاڵای جامیعەی عەرەب (هەڵۆی سەلاحەدین) و کۆماری عێراقیان رازاندۆتەوە.

لەنێوان ساڵانی ١٩٥٩ و ١٩٦٢دا ئاڵای عێراق ڕۆژێکی زێڕینی تێدابوو کە بە حەوت پەڕەی سوور ڕازابووەوە، واتە حەوتە وانە پیرۆزەکە. لە ڕووی کەلتوورەوە ئەم ئاڵا دەوڵەتیەی عێراق گەلێ لەو ئاڵایە کوردانەتربوو، کە ئێستا کوردەکان کردوویانە بە ئاڵای نەتەوەیی.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Martin van Bruinessen, "The Ethnic Identity of the Kurds," Peter Bumke "The Kurdish Alevis: Boundaries and Perceptions," and L. Nestmann, "Die ethnische Differenzierung der Bevölkerung der Osttürkei in ihren sozialen Bezügen," in Peter Andrews, ed., *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Reichert, 1989); Mehrdad Izady, "The Question of an Ethnic Identity," *Kurdish Times* I.1 (Spring 1986).

# کەسایەتی نیشتمانی

ویلیام ئیگلتنی (باوك) باڵیۆزی ئەمەریکا، گەرچی ئەم چەند وشەیەی بە تایبەتی لە بارەی خودی ژەنەراڵ مستەفا بارزانییەوە نووسیوە (بڕوانە کەلتووری سیاسی و سەرکردایەتی). بەلام ئەو دەیتوانی بیانکا بە تێبینییەکی کورت و وردبینانە و کالایەکی پڕ بە بالای هەر تاکێکی کورد لە هەر جێیەك بێ. ئەو — واتە بارزانی — وەرگێر— دەمودەست لە گەوهەری مەسەلەکان دەگەیشت و کاکڵەگیری دەکردن و زیرەکیی دیپلۆماسی و سەربازی خۆی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەخستە کار، لەپاڵ ئەوەدا هەندێ کەلێن لە کەسایەتییدا هەبوون کە مرۆڤ ناتوانێ ڕاگوزارانە بەلایاندا ڕەت بێ و بە ئاسانی بازیان بەسەردا بدا، لەوانە پێداگرتنی سەختی لەسەر بیروڕاکانی، متمانەکردنی زۆری بە کەسایەتی خۆی تا سنووری بوغرایی، زۆر حەزکردنی لە باسکردنی سەربوردی خۆی، هەمیشە لەسەرپێ بوونی بۆ قۆستنەوەی هەلەکان و لە دەست نەدانیان، و بە گرانی هاتنە خوارەوەی لە بۆچوونەکانی (Eagleton١٩٦٣)، دانا ئادەمزشمیتی ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی ئەم چەند وشەیە دەخاتە سەرباسی خەسڵەتەکانی "تێبینییەکانی هەمیشە لەناو تەمومژەوە دەردەکرد و بۆ باسکردنی بابەتەکانی هەمیشە سوودی لە چیرۆك و سەرگوزەشتە وەردەگرت (١٩٧، Adams Schmidt١٩٦٤).

هەرچەندە کورد هەمیشە لە بێگانە و شتی نەناسراو بە گومانن، کەچی بۆ گۆڕینی هەڵوێست و باوەڕکردنی پێیان خێران، ئەوان. چ گەل چ تاکیان، هەر یەکەیان چەندین چیرۆکی

خیانـەتی "ناشـەریفانە"ی لـەبیرە و باسـیان دەكـا، كـە لەلایـەن كەسـان و كۆمەڵانێكـەوە بەرامبەریان كراون كە ئەوان متمانەیان پێیان هەبوە.
لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان هەرگیز لەسەر ئەو ساویلكەییە ئاشكرایەیان، ئامادەی قبـووڵكردنی رەخنەلێگرتن نین.

# پاڵەوان

ئەشـێ كەسـایەتی نموونـەیی كـورد، لـە وێنـەی پاڵەوانێكدا خـۆی بنـوێنێ كـە بریتیـە لـە سوارچاك یان میرخاسێك كە پێویستە ئەو لاف مەرد ئازاییـەی لێـی دەدا، بـە كـردەوەی ئـەوتۆ دەربڕێ كە پڕن لەوپەڕی ئازایەتی دوزەریفی و جـوامێری. داب و دەسـتووری پاڵـەوان، هـەمان جۆری پاڵەوانەكانی سێر واڵتەرسكۆتن. لەوانەیە هەر لەبەر ئـەم هۆیـەش بـێ، كـە رۆژئاواییـانی وەكو لـۆردكێرزن و سـی. جـی. ئیدمۆنـدز، تـا دادوەر ویلیـام ئـۆدۆگلاس و رۆژنامـەنووس دانـا ئادامزشمیـت، تـا ئـەو سـەربازە ئینگلیـز و ئەمەریكاییانـەی كـە پاسـەوانیی كـامپی پەنابـەرە كوردەكـانی توركیـا و عێراقیـان دەكـرد، كوردەكانیـان بـە ئـادەمیزادی ڕووح سـووك و خۆشبرینكەر داناوە.
بەهەرحاڵ، تاكی نموونەیی كورد، دژبـە كـاری بەكۆمـەڵ و پـلان دانـانی بـە كۆمەڵـە و لای هەندێ كەس توانای هیچیانی نیە، ئەو لە كۆتەرەوە، لە ناوخۆدا نەبانە و باوەڕی بـە تاكایەییـە وەكو باشترین جۆری ژیان لە شێوەی "تاكە هەڵۆی بەرز فـڕی سـەر لووتكـەی چیاكان"دا كـە مەسەلێكی باو و بـلاوی نـاو كوردانـە. ئـەوی ڕاسـت بـێ، شێوەی سـەخت و لێكدابڕی خـاكی كوردستان سەبەبكاری هەرە سەرەكیی، دروستبوونی گیانی دووره پەرێزی و هەسـتی بـەهێزی پشت ئەستووری و بەخۆ نازینە لەناو دانیشتوانی كوردستاندا.
هەر كوردێك بیگری شانازی زۆر بەوەوە دەكـات كـە زۆر دەچێتە قـوولایی بابەتەكانـەوە و زۆر باش لێیان ورد دەبێتەوە. هەر ئەم خەسڵەتە خۆی زۆر جار لە ڕۆڵەی نەتـەوە دراوسـێكانی جیای دەكاتەوە، كـوردێكی زۆریش هـەر لـە كۆنـەوە لـەم بـوارەدا ناوبانگیـان دەركـردوە، بـۆ نموونە دەتوانین كاری دوو گەڕیدەی گـەورەی كـورد (ابـن فـضلان) و (دینـەوەری) بكـەین بـە

شایەد. ڕاپۆرتە ورد و پاش کۆزەر و بەربا کراوەکانی یەکەمیان لە بارەی گەشتەکەیەوە بۆ ئیسکەندیناڤیا لە سەدەکانی ناوەندا و ئەو باسە پلە بەپلە و هەنگاو بە هەنگاوەی، دووەمیان لە بارەی پرۆسەی قاڵکردنەوەی کانزاکانەوە لەلایەن گەلە جۆراوجۆرەکانەوە، کردویانە، باشترین بەڵگەن بۆ ئەم بابەتە.

تاکی کورد، کە کەسایەتیەکی ڕووخۆش، ئازادەسروشت و لە ڕیشەوە بێلایەن و ڕاشکاو و قسە لەڕووە، هەرگا لەگەڵ یەکێکدا دۆستایەتی بەست، چی هەبێ و نەبێ دەیخاتە بەر دەست ئەو کەسە، زۆرجار بەگیانێکی ئەوەندە بەخشندانەوە کە لەوانەیە خۆی بدا لە سنووری خۆ خستنە مەترسیەوە بۆ خاتری نەناسێك، سەر و سامان دەکرێن بە قوربانی و تەنانەت لەوانەیە شەڕی خوێناوییش بقەومێ لەنێوان دۆستانی دێریندا، لە پێناوی پێشکەشکردنی خزمەتێك بۆ ئەو نەناسە، دیاریشە هەر لایەیان دەیەوێ ئەو شەرەفە گەورەیە بەرخۆی بکەوێ.

لە کاروباری خۆشەویستی و ئەویندا، کورد زۆرتر ڕۆمانسی و بێباکانە هەڵسوکەوت دەکەن، خۆکوژی یان کوشتنی بەرهەڵستکار، لایەکی ترسناکی دیکەی ئەم زۆرانبازیە خۆشەیە، ئەم جۆرە وێنانە زۆر بە قووڵی و زەبەنی لە ئەدەب و چیرۆکە میللییە کوردیەکاندا باسیان هاتووە. وا دەوترێ کە کوردان یەکگیرییەکی توند و تۆڵ و هەتاهەتایی لەگەڵ ژنەکانیاندا رادەگرن، بەڵام ئەمە هەرگیز نابێ ئەوە بگەیەنێ، کە تاکی کورد هەموو ژیانی خۆی بۆ هاوسەرینەکەی تەرخان دەکا و هەرگیز هاوسەری تر، یان دۆستی تری بەسەرەوە ناگرێ.

بۆ میوان پەزێری، کوردان یەکجار بەناوبانگن، بەڵام ئەم میوان پەزێریە گەرم و گوڕەتینێکی ئەوتۆی نامێنێ، ئەگەر میوانەکە "یاریکەر"ێکی زیرەك و کارامە نەبێ، کابرایەکی وشکی، دڕژی سەختگیر، جێ پاشەڵی گەرم ناکاتەوە، تەنانەت لە ماڵی گەورەترین خانەدانی کوردیشدا. گەر لەگەڵ سادەیی و ڕووح سووکی و دڵپاکی خانەخوێکەیدا نەگونجێ، بە میوانێکی یەسك قورس و ڕەزاگران دادەنرێت. پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە، خێراترین ڕێگا بۆ لەدەستدانی دڵ و دەروونی هەر کوردێك، ئەوەیە شان بکەی بەشانی ئامۆژگاریکاریدا لە بارەی سوودی بەوێڵی و زمان شیرینی، یان ژیانی خەوناوی و ئاسانەوە.

لە لایەکی دیکەوە، لای کورد شەرەف تەنانەت لە ژیانیش بەنرختره، زۆرجار ژیان دەکرێ بە قوربانی شەرەف. ئازایەتی، بەنرخترین سیفەتی هەر مرۆڤێکە، چ ژن چ پیاو، ئەوەی ئازا

نەبێ شەرەفیشی نابێ، لە لێقەوماندا، دەستکردنەوە مەرجی سەرەکییە، ئینجا ئەنجام چی و چۆن دەبێ، ئەوە زۆر گرنگ نیە، بۆیە گەر یەکێك ئازایانە دەست هەڵبێنێتەوە، بیباتەوە یان بیدۆڕێنێ، شتێکی بایەخدار نیە، ساڵی ١٩٩١، پاش شەڕی کەنداوی فارس، بۆ ئەو کەسانەی کە شارەزای سروشت و ڕەفتاری کوردان بوون، جێی سەرسووڕمان نەبوو کە ببینن پەنابەرە کوردەکان لە پێشدا و لە سەروو هەموو شتێکەوە ڕەخنەیان لە سەرکردەکانی خۆیان دەگرت نەك دوژمنە تا کوردەکانیان سەبارەت بەو هەموو نەهامەتییەی کە بەسەریان هاتبوو، سەرکردەکانیان لە نزیکەی سێ ساڵدا، دوو جار ئەمانیان گورگان خواردوو ناچار بە هەڵاتن کردبوو (هەڵاتن بۆ پاڵەوان کاری کردن نیە) بەمەش سەرکردەکانیان کەلێنیان خستبوە شەرەفیی جەنگاوەرانەوە... بەرلەوە، ساڵی ١٩٧٥ کاتێك سەرکردەی گشتی ژەنەڕاڵ بارزانی پاش هەرەسهێنانی شۆڕشەکەیان فەرمانی کشانەوەی پێدان، زۆربەی پێشمەرگەکان مەسەلەکەیان نەدەچوە ئەقڵەوە، ئەوان نەیاندەتوانی ئەو ڕاستیە قووت دەن کە دژ بە داب و نەریتی دێرینەیان بوو، بۆیە هەتا بۆیان کرا پێیان لەسەر مانەوە داگرت لەناو خاکی خۆیاندا و داکۆکیان کرد کە ئەوان دەبێ وەکو "سوارچاك و کەڵەمێرد" ڕەفتار بکەن.

دەست پان نەکردنەوە و هەمیشە خۆ بە دارانیشاندانیش یەکێکە لەو یاسایانەی کە کورد لە ئاستی شەرەفدا دایاندەنێ، هەموو کەس بۆ پەیداکردنی سامان، کە برای هاوپشتە بۆ بدەیی و بێباکی دارایی، مەبەستێکە کە گشت کەس ڕەنجی بۆ دەدا. تەنانەت ئەگەر نامەیەك بنوسرێ و تێیدا باسی کەسێك بکرێ، زۆر شتێکی سروشتییە بگرە مایەی شانازیشە بۆی گەر ئەو کەسە بە "دەوڵەمەند" ناوببرێ. هەرچەندە پیاوەشی و بازووی بەهێز زۆر گرنگن بۆ هەر تاکێکی کورد، بەڵام ڕەشە کوردی لادێ نشین، لەجیاتی دەرپەڕاندنی ماسولکەی سینگ بۆ دەرخستنی "بەتوانایی"، زیاتر ورگ دەردەپەڕێنن (تا دەریخەن کەوا باشیان خواردوە و لە رووی دارایی یەوە هیچیان کەم نیە).

لە کاتی داکۆکی کردن لە بابەتە ئایینیەکانیدا، هەر کوردێك تا ئەوپەڕی بە توندی بۆی دەڕوا، هەرچەندە لەوانەشە بە باشی نەزانی داکۆکی لە چی دەکا. ئەگەر هەر خۆی بێ، ئەوەندە بە تەنگی بەجێهێنانی فرمانە ئایینیەکانیەوە نایەت، ئەگەر لەگەڵ خواست و ئارەزووە کۆمەڵایەتیەکانییدا زۆر نەگونجێن، ڕێزی کەسایەتیە ئایینیەکانی وەکو پیر و شێخ و

مەلاو هی تر، کە بە گوێرەی یاسای کۆمەڵاتیش جێی ڕێزن، هەر بەقەی ئەو ڕێزەیە کە بۆ سەرۆك هۆز و ئەندامانی بنەماڵە میرنشینە ناوخۆییەکان دایدەنێ. لە کاتێکدا لای بێگانان کورد بە توند مەزەب دادەنرێن لە بواری ئاییندا، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە، بەدەگمەن، وەکو دینداریکی زۆر پابەند دەردەکەون.

## چیاکان

لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە، کورد گەلێکی وڵات – بەچکەیە، مێژوو و کەلتووریان لەگەڵ چیاکانیاندا، هەندە تێکولوولن، کە بوونی کورد لە پێدەشتدا وەکو کارێکی پێچەوانە بەسروشت وایە، ئەوان خۆیان قسەیەکیان لەناودا باوە "چیاکان تەختکە، لەیەك ڕۆژدا ئەوەی ئاسەواری کوردە نامێنێ". ئەوان، وەکو ماسی و ئاو، هەرگیز لێك ناتاکێنەوە "پەیوەندی کوردێك و چیاکانی دەوروبەری، وەکو پەیوەندی نێوان وەرزێر و کێڵگەکەی وایە" (بڕوانە سیابەند ١٩٨٨) لای ئەو، چیا وەکو شتە ئاسمانیەکان پیرۆزە: چیا دایك، پشت و پەنا، پارێزەر، ماڵ، کێڵگە، بازاڕ، هاودەم و برادەر، و تاقە دۆستیەتی ئەم پەیوەندیە پتەوەی مرۆڤو چیا لە هەموو هۆکارێکی دیکە زیاتر بەرجەستەکەری دیمەنی کەلتووری و ڕووکار و دەروونی کوردستانە. ئەم پێوەلکانە بەتین و لێك جیانەبوونەوەیەی کوردان لە دەوروبەرەکەیان بوونە بە سەرچاوەی گەلێ بیر و بۆچوونی میللی ئەوتۆ کە دەڵێن: لە هەرجێ چیا هەبێ، ئەوا کوردیش هەیە.

هەر هۆزێکی گەورەی کورد کە لە سەردەمە مێژووییەکاندا دانیشتووی دەشتوویانەکانی هاوسێ و دەوروبەری وڵاتەکەیان بوویێ، زوو بەزوو لەناو گرووپە ئەتنیەکانی دەوروبەریدا تواوەتەوە.

(بڕوانە هۆزەکان، کۆچکردنە مێژوویی یەکان و دەربەدەرکردن و بە زۆر جێگیر کردنەوەکان)، کەچی تاکانەوە لە دوو توێی چیاکاندا، کوردی کردوە بە گەلێکی زیندووی بە پەلوپۆی لە توانەوەوە نەهاتووە بەدرێژایی مێژووی چەند هەزار ساڵەی کورد واتە ماوەیەکی ئەوەندە درێژ کە ئەگەر نەتەوەیەکی تر بوایە بە تەواوەتی لەناو کەلتووری باڵادەستدا دەتوایەوە، کوردان هەر بەجیایی ماونەتەوە، لە بەرامبەردا، نزیکەی هەموو ئەو نەتەوانەی

لەناو چیاكاندا هاوژین بوونە لەگەڵیاندا وەكو سیثیەكان، ئالانەكان، ئارامی یەكان، ئەرمەنیەكان، فارسەكان، عەرەبەكان، مەغۆلەكان، توركمانەكان و توركەكان بە جۆرێك كوردرێنراون كە ئیتر ببڕای ببڕای ڕەسەنیان نەناسرێتەوە.

بەڵام، چیاكان بەهەمان ئەندازەی كە سەربەخۆییان بۆ كوردان هێناوەتە دی، ئەوەندەش بوونە بە مایەی لێكدابڕانیان. تەنانەت ئاڵوگۆڕكردنی كاروباری ناو كۆمەڵایەتی هێشتا شتێكی ئەوتۆ باونیە لە ژیانی ڕۆژانەی كورداندا. پەیوەندی نێوان هۆزی لێك دوور و دوور دابڕا و ئەوە هەر هیچ. شەڕی نێوان كەسان و تیرە و تایەفەی كورد شتێكی باو بوە بە درێژایی چەندین سەدەی بەرێ و زۆر بەشیان لە ئەنجامی لێكدووریی سەرزەمین و باری نەفسی بوە. هەر ئەم چیایانە خۆیان ئۆباڵی دابەشكردنی زمانی كوردییان بەسەر چەند زاراوەدا دەكەوێتە ئەستۆ، هەروەها هی ئایینەكانیان بەجۆرێك كە بوە بە بابەتی لێكۆڵینەوە و شوێژەنكاری، لە پاڵ هی هونەر و داب و نەریتیان كە تا بڵێی جۆرا و جۆرن.

لەبەر ئەم هەمەڕەنگیە، لە ڕابردوو و تا ڕادەیەك ئیمڕۆكەش، كورد نەیتوانیوە ئەوەندە یەكڕیزی پێك بێنێ كە ببێتە بنیاتنەری نموونەیەكی سەرەتایی بزووتنەوەیەكی سیاسی گشت كوردی كە بەرەو سەربەخۆیی بیانبا. لێرەدا جێی خۆیەتی ئەوە بزانین كە تاكی كورد هەمیشە لە هاتووچۆكردنی ناو سەرزەمینەكەی خۆیدا سەربەست بوە و لە "وڵاتێك"ەوە بۆ یەكێكی تر ئازادانە تێپەڕیوە، ئەوی ڕاست بێ تا ئەم دواییانە ئەم هاتووچۆكردنە زیاتر لە گەشتی هۆزە پەز-لەوەڕێنەكاندا خۆی نواندوە كە بەدوای ماڵات و لەوەڕدا چەند سنووری نێودوڵەتیان بەزاندووە.

# جاش

بێ یەكودوو دەتوانین بڵێین كە ژیانی كوردەواری ئەوەندە ساف و زەنگ و نزیكە سروشتە بەجۆرێك لە ڕابردوو ئەمڕۆكەشدا كە كەمتر بواری ئەوەی داوە دیاردەگەلێكی وەكو ناپاكیی، پیلانگێڕی و تەڵەكەبازی پێویست بۆ دروستكردنی كەسایەتی سیاسی سەركەوتوو تێیدا، دەردەكەوێ، تەنانەت لەو چەند ڕێكەوتە كەمەشدا كە پیاوانی وەكو سەلاحەدین و كەریم خانی زەندیان تێدا هەڵكەوتوە و لە باری سیاسیەوە ناوبانگیان داوەتەوە، دڵچاكی و دەروونپاكی لە ڕادەبەدەریان بەزیانی گەلەكەی خۆیان كەوتۆتەوە. ئەوەتا چوونە ناوەندی ئیمپراتۆریەكانیان

بردۆتــە دەرەوەی کوردســتان، لــەناو خــەڵکی نــا کــورد، بــەڵام هەمیــشە کــورد ســووتەمەنی سەرکەوتنەکانیان بوە.

مەرجی بوون بە سیاسـەتمەداری بـاش، پێویـستی کـردوە لـە باوەشـی چیاکان دەرچـن و رووبکەنــە شــارەکانی نێــو پێدەشــتەکان، کــە سیاســەتبازیی تێیانــدا پیــشەیەکی پــەیڕەوو سەرکەوتوە، بەڵام هەرگا ئەوانە، رۆژێك لەرۆژان، بگەڕێنەوە ناو چیاکان ئـیتر وەکـو جـاران پـڕ بەدڵ متمانەیان پێ ناکرێ لەلایەن خەڵکانی ئەوێوە و بـەو چـاوە سـەیر دەکرێن کـە گوایـە لـە باوەشی گەرمی دایکە چیا وەرگەڕاون و رەنگ و بۆی خەڵکی بە پێچ و پـەنای پێدەشـتەکانیان گرتوە، ئەم کەسانە لەگەڵ خۆیاندا پەیامێك بۆ کوردانی چیانشین دێنن، کـەها سـەیرکەن کـە لەخۆ گۆڕان و کاڵی کوردایەتی فڕێ دان و چوونە نێـی ناکوردیـەوە چـەند چـەور و بەسـوودە (بڕوانە ئاوێتەبوون و ئەسیمیلاسیۆن).

ئـەوی ڕاسـت بـێ، ئـەو کوردانــەی لــە چـیاوبانەکان دەژیـن، کـەمتر متمانــە بــە کــوردە شارنشینەکانی ناو پێدەشتەکان دەکـەن و بـە کوردیـان دانـانێن و باوەڕیـان بـەوە نیـە ئـەوان سـەرکردەییان لـێ بوەشـتێەوە، رابـەر و سـەرکردەی ڕاسـتەقینەی کـورد، لای ئـەوان، دەبـێ نهێنیــەکانی نــاو چـیا و دۆڵ و لــوول و تەنگــەکان، هــی چــەم و ڕوویارەکــان، هــی پــەناو ئەشکەوتەکان بست بـە بست شـارەزا بـێ، دەبـێ بـاش داب و نەریتـە خێڵەکیـەکان بزانـێ، و لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە ئازا و کەڵە مێردبێ، بێ گشت ئەمانە سـەرکردایەتی و ڕابـەری لـێ نایەت.

کـوردە نیـشتەجێکانی دەشـت و تەختاییـەکان، لای چیانـشینەکان، زۆر جـار بەتۆکـەری بێگانەو بە پوازێك دادەنرێن کە بەدەنەی کوردان دادەقەڵەشێنن و بۆ ئەوە چەشەکراون کەچـی لای کوردان پیرۆز و بەرێزە، بیتوێننەوەو لەناوی بەرن، بۆیە، لای هەر کوردێکی ئاسایی ئەوانـە بە "چڵکاو خۆر و کرێگرتەی دەشتنشین" دادەنرێن و بۆ سـووکی پێکـردن "نـاوی جـاش"یـان بەسەردا دەبڕن، ئەوان لای خەڵکی وڵاتەکە دەبن بەنموونـەی کەسـێك کـە کـردەوە و ئامـانجی وێرانکردن و لەناوبردنی گەل و نیشتیمانی کوردانە، ئەم دید و هەستە لە دوو پارچـەی ئـەدەبی دێرینی کوردیدا خۆی بەرجەستە کردوە: سەربوردی ئەنکیدۆ لە داستانی سۆمەری گێلگـامش و لە "شیرین و فەرهاد" ڕۆمانس تراجیدیانامەی سەرەتای سەدەکانی ناوەندا.

فەرهاد، کە کەسایەتیەکی ئەفسانەیی یە، کۆکەندە و لە چیاکان پەیکەرتاشی دەکا، دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ژنێکەوە کە ناوی شیرینە و، شازنی ئێران و ژنی شایەکی بە هەیبەش و سامی وەکو خوسرەوی دووەمەوە (بڕوانە کەلتووری میللی و فولکۆرو چیرۆکە میللیەکان). شیرین پەروەردەی ناو کۆتك و سەرای تیسفۆنی پایتەختی ساسانیان لەناو پێدەشتەکانی مێزوپۆتامیا و تازە کۆشك و باخ و گوڵزارێکی قەشەنگی لە قەسری شیرین لە پێدەشتەکانی کوردستاندا بۆ دروست کراوە.

ئاگری عەشقی شیرین، فەرهاد لە چیاکان هەڵدەکەنێ (دەڵێی ئەمە دەردێکە گەنجە کوردەکانی گرتوە، ئەوەتا ئێستەش دەڵێن: خۆشەویستی وا لەو لاوە کوردانە دەکا کە دێنە شار و شارۆچکەکان لەوێ فیرگیر ببن و جارێکی تر مەیلی ناو چیا و بەندەنەکانیان نەمێنێ).

شیرین داوای لێ دەکات بە نیشانەی ڕاستی لە خۆشەویستیەکەیدا، جەستەی چیای بۆدارێنێ، ئەو چیایەی کە هەم کولبەو هەم دڵیەتی، و بۆ ئەم مەبەستە دڵی بێستوونی مەزن و پیرۆز (مەنزڵگەی خودا) بە نووکی پاچ بسمێ، فەرهاد کە هەمرازی چیاکان و وەستکاری پەیکەر تاشیە تێیاندا، شێگیرانە دەکەوێتە کار، بەڵام هێندەی پێ ناچێ، وەئاگادێ کە شیرین "لەسەرپشتەی پێدەشت نشنیان" خیانەتی لێدەکا، بۆیە لەژێر باری گرانی هەست بە گوناهباری بەرامبەر بەو چیایەی کە کەوتە داتاشینی جەستەی پیرۆزی دایکانەی، هەڵدەگرێتە سەر یەکێ لە لووتکە بەرزەکانی و لەوێوە خۆی هەڵدەدێرێ.

دوو هەزار ساڵ بەر لە فەرهاد، کوردێکی چیانشینی تر، دەکەوێتە هەمان هەڵەی ملشکێنەوە، بەوەی دەکەوێتە ناو داوی خەڵکی پێدەشت نشینەوە، چیرۆکی ئەنکیدۆ بەشێکە لە داستانی گلیگامش کە بەرهەمێکی مێزوپۆتامیا مەڵبەند و نزیکەی (٤٠٠٠) ساڵ لەوەبەر نووسراوە، چیرۆکەکە لەدوو توێی ڕووداوەکانیدا ئەوەمان بۆ دەردەخا، لایەدەکان لەو سەردەمانەدا بە چ چاوێك سەیری باوباپیرانی کوردەکانی ئەم سەردەمانەیان کردوە، و دەرفەتێکی باشمان دەداتێ ئەو لەگەڵ ئێستادا بەراورد بکەین. لەو بەراوردەوە بۆمان دەردەکەوێ کە شتەکان تاچ ڕادەیەکی سەرسووڕێنەر لێك دەچن، داستانەکە خۆی لە خۆیدا وەکو کۆنترین کرداری ئەدەبی کە باسی کەسایەتی کابرایەکی چیانشین بکا، زۆر جێی سرنج و تێڕامانە، بۆ نموونە ئەم وردە مشتانەی خوارەوە دێنینەوە کە بەشێکن لە خەرواری داستانەکە و بەتێکڕایی لە وەرگێڕانەکەی ن، ك، ساندەرزەوە وەرگیراون (١٩٧٢):

گیلگامش پادشای نیمچە خوداوەندی ئوروکی دەوڵەتە تاری سەرزەمینی سۆمەریانە، (کە تەنها چەند دە میلیك لە تیسفۆنی مەڵبەندی شیرین و خوسرەوی داستانەکەی فەرهادەوە دوورە). گیلگامش ئەودالی پاڵەوانێك دەبێ کە هاوکووفی خۆی بێ لە هێز و توانادا، خوداوەندەکان "ئادەمیزادێکی سروشت ڕسك"ی بۆ دەدۆزنەوە، ئەنکیدۆ ناوێك کە لە "دارستانە سەروو"ەکانی چیاکانی زاگرۆسەوە دەرچووە، (بڕوانە ژینگە و ژینگە شوناسی).

وەکو وەرگێڕاوەکەی ساندەرز باسی دەکا، "ئەو، خوداوەندی جەنگ، خودی نینورتا، دەستی دابوو بە پشتیدا، لەشی دەتووت تاوێرە بەردە، پرچی وەکو ژن بەشان و ملیدا شۆڕ بووبووەوە، قژە زێڕینەکەی بەدەم باوە وەکو قژی "نیسەبە"ی خوداوەندی دەغڵ و دان دەشەکایەوە... ئەو لە غال و غەرەسی ئادەمیزاد خالی بوو، هیچی لە بارەی پێدەشتەکانەوە نەدەزانی"، ئەوانەی پیشەیان داو نانەوەبوو بۆ دەعب·او زیندەوەر سکالایان لێی دەکرد و دەیانووت "ئەو لەگەڵ دەعبا دڕندەکاندا بەسەر گردەکاندا هەڵدەبەزێتەوە ودێت و دەچێ و وەکو ئەوان گیا خۆرە و کە دەکەوێتە ناو ئەو چاڵە داوانەوە کە ئێمە بۆی دەنێینەوە، داوەکان کەرت کەرت دەکا، ئەو بەوەوە ناوەستێ بەڵکو ئەو دڕندانەش بەڕەڵا دەکا کە دەکەونە دەستمان".

ئەوان ناچار دەکەونە بیری ڕاهێنان وماڵیکردنی هەموو لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە تاکە چار ژنە، کام ژن؟ "ژنێك کە لەپەرستگەی خۆشەویستیدا پەروەردە بووبێ، تا بتوانێ بەزەبری هێزی ژنانەی داگیری کا" هیوا وایە، خۆشەویستی ژنێکی پێدەشت نشین، سادەیی سروشتی لێ بپەڕێنێ، چونکە هەر گا ئەو خۆشەویستی (ژنە پێدەشت نشینەکەی) لە لەشدا ڕسکا، ئەو دەعبایانەی لە هەڵەتەکاندا هاوژینی بوون دەیبێزن، چونکە ئەو خۆی پەروەردەی ئەو هەڵەتانەیە".

پاش ئەوەی بەهەست و نەست هۆکارەی ژیانی ناو پێدەشتەکان دەبێ، هەموو ئاوەڵەگیانی بەگیانیەکانی واتە زیندەوەرە دڕندەکانی چیاکان، دەیبێزن، لاواز و بێ هێز و مناك، لەبەردەم ئاوەڵە نوێیەکەیدا کروشکە دەکا و گرێ لە ئامۆژگاریەکانی دەگرێ: ئەنکیدۆ تۆ مرۆڤێکی ژیری و ئێستا تۆ هەر وەکو خوداوەندێکت لێهاتووە بۆ دەتەوێ هەر کێوی ئاسا لەگەڵ دڕندەکانی هەڵەتەکاندا بمێنیتەوە؟ بەگەڵم کەوە دەتبەمە ئوروکی دیوار سەخت... لەوێ گیلگامش دەبینی، گیلگامش زۆر بەهێز و وەکو گاکێویەك بەسەر گشت پیاوەکاندا دەسڕۆیە "کە ژنەکە لە قسەکانی دەبێتەوە، داوای لێدەکا بیبا بۆلای گیلگامشی تاکە کەڵە مێردی ئورووك، لەوێ ئەنکیدۆ، وەکو پاڵەوانێکی ڕاستەقینە، تواناو لێهاتوویی خۆی دەرخا:

لەم شوێنەدا من مەردی مەیدانم، من هاتووم تا دامودەزگای كۆن بگۆڕم، منم ئەوەی لە پزدانی هەڵەتەكانەوە دەرچوووم، منم ئەو كەسەی كەس بەهێزی بازوو لێم ناباتەوە".

هەندەی پێ ناچێ ئەنكیدۆ لەگەڵ سروشتی دەشتەكاندا ڕام دەبێ، خۆی ڕادێنێ و بەرەبەرە ترس دەزێتە دڵییەوە، بۆ جاری یەكەم دەم لە نان دەدا و مەی دەخواتەوە، هەموو ئەمانە بەدەم دەرزادانی ژنەكەوە دەكا كە پەیتاپەیتا هانی دەدا، "ببێ بە مرۆڤێكی شارستانی".

ئەنكیدۆ كە جاران پارێزەری سروشت بوو، ئێستا ژیانی بە تەواوی وەرچەرخا و گۆڕا، بەوەی كە هەموو تەڵەو داوی ڕاوچییەكانی تێكومەكان داو چاڵەكانیانی پڕ كردەوە، ئینجا دەست دەداتە چەك "تا" شێرەكان بگرێ و بەوە شوانەكان شەو بێ خەم بخەون، گورگ و شێرەكانی گشت گرتی و شوانەكان بێ ترس لێی هەلاژان، چونكە ئەنكیدۆ بوو بە پاسەوانیان (بڕوانە باسی زیا گوگ ئەلپ، محەممەد سەگبان، عیسمەت ئینۆنۆ و عەبدولكەریم قاسم لە بابەتی ئاوێتە بوون و تێكدا توانەوەوەدا).

سەرەڕای ئەمەش دەبێتە هاوڕێیەكی گیانی بەگیانی گیلگامش. كە ئارەزووی وێرانكردنی "داستانە سنوبەرەكانی" ناو چیاكان و گیانی پارێزەریان واتە هومبابای بۆ خاتری بەرزكردنەوەی ناوبانگی خۆی دەكەوێتە كەلەوە، گیلگامش داوا لە ئەنكیدۆ دەكا كە بیبا بۆ ماڵ و ماڵبات و پەناگای جارانی و ئەنكیدۆ گێلانە بە قسەی دەكا.

بە یارمەتی خواوەندەكانی پێدەشتەكان و زانیاری ئەنكیدۆ لە بارەی نهێنییەكانی چیا و دارستانەكانەوە گیلگامش هومبابا واتە "گڕ"ی پارێزەری چیا و دارستانەكانی لە گۆشەكەیەكدا توند دەكا، لە بەرامبەر ئەو خیانەتكارییەی ئەنكیدۆدا، هومبابا دەكەوێتە سەرزەنشتكردنی كەوا لە پیاوێكی ئازادە سروشتی چیاییەوە بوە بە "چڵكاوخۆرێكی خزمەتكار لە پێتاوی ناندا"، لە شەرماندا، ئەنكیدۆ هیچی بۆ نامێنێتەوە ناچار گیلگامش هاندەدا، هومبابا بكوژێ و دارستانەكان خاپوور كا، بە هەردووكیان هومبابا دەكوژن "ئێستا ئیتر هەموو چیا و گردەكان هەڵكەندران، چونكە پاسەوانی دارستانەكان كوژرا".

ئەنكیدۆ دەكەوێتە پێشیان و پێكەوە پەلاماری پیرۆزترین بەشی دارستانەكان دەدەن و لەوێ" دەكەونە گیان دارسنەوبەرەكان، لە كاتێكدا گێلگامش ملی دارەكانی دەپەڕاند و دای دەهێنا، ئەنكیدۆ" لە ڕەگەوە دەری دەهێنا تا گەیشتە كنارەكانی فورات".

گیلگامش وەکو "شکێنەری گڕ (هومبابا)" و وەکو" ئەو گا کێویەی چیاکانی تالانکرد" ناوبانگی دایەوە ئەنکیدۆ نەخۆش دەکەوێ، و لەسەر جێگای مردن و لە سەرەمەرگدا هەرچی لە عنەت هەیە بۆ ئەو ژنە دەنێرێ کە خۆشەویستی ئەو لە سەروو هەموو شتێکەوە خستیە ناو داوەکەوە. لە دەمی دان نان بە گوناهدا، بۆی دەردەکەوێ کە هەر ژنەکە وای لێکردوە کە خیانەت لە هەموو شتە گرنگەکانی خۆی بکا، بەو ژنەشییەوە کە لە چیاکاندا لەگەڵ حەوت کوڕەکەیدا مابوەوە (بۆ گرنگی ژمارە "٧" بڕوانە تیرەی فریشتەکان) ئەو لەناو ڕشتنی بارانی فرمێسکدا دان بە بوونیاندا دەنێ.

بەر لە مردن، بەهەرحاڵ وەکو پاڵەوانێك، ژنی دەشتەکان دەبەخشێ، چونکە هەرچی چۆنێك بێ ئەو ژنە ماوەیەکی کورتی ژیانی لە گەڵیدا بەخۆشی ڕابواردبوو.

گەلێ چیرۆکی تر هەن کە لە زۆر شتدا هاوشێوەی شیرین و فەرهادن، و هەموو پێکەوە مزاجی میللی چ کورد چ غەیرە کورد دەردەبڕن. وا دەردەکەوێ، تێکەڵییەکی زۆر لەنێوان کەلتووری ئەم گەلانەدا هەیە و زەمەنی دوور و درێژی هەزارەها ساڵی هێندەی لە شتە هاوبەشەکان نەگۆڕیوە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Abdul-Kader Amin (collected by), *Kurdish Proverbs* (New York: Kurdish Library, 1989); Major E. Noel, "The Character of the Kurds as Illustrated by Their Proverbs and Popular Sayings," *Bulletin of the School of Oriental Studies* I-iv (London, 1917-20);

Basile Nikitine, "Kurdish Stories from My Collection," *Bulletin of the School of Oriental and African Studies* IV (1926-28); William Eagleton, Jr., *The Kurdish Republic of 1946* (London: Oxford University Press, 1963); , Dana Adams Schmidt, *Journey Among Brave Men* (Boston: Little, Brown, 1964); Captain Bertram Dickinson. "Journeys in Kurdistan," *Geographical Journal* 35 (1910); C.J. Edmonds, *The Kurds, Turks and Arabs* (London: Oxford University Press, 1957); C.J. Edmonds, "Shah Bazher and the Basin of the Qalachuwalan," *Geographical Journal* 123 (1957); W.R. Hay, *Two Years in Kurdistan: Experiences of a Political Officer, 1918-1920* (London, 1921); Margaret Khan, *Children of the Jinn: In Search of the Kurds and their Country.* (New York: Seaview Books, 1980); Captain F.R. Maunsell, "Kurdistan," *Geographical Journal* 3-2 (1894); Major E. B. Soane, "The Southern Kurd," *Journal of the Central Asian Society* 9.1 (1922); Mrs. Lindfield Soane, "A Recent Journey in Kurdistan," *Journal of the Royal Central Asian Society* 22.3 (1935); B. Nikitine and E.B. Soane, "The Tale of Suto and Tato," *Bulletin of the School of Oriental and African Studies, London Institute* III (1923-25); Nizâmi, *Chosroès et Chirin*, French trans. of the Persian original by Henri Massé (Paris: Bibiothèque des Oeuvres Classiques Persanes, No. 2, 1970); Ph. K. Hitti, "The Origin of the Druze People and Religion with Extracts of their Sacred Writings," *Columbia University Oriental Studies* 28 (New York, 1928); *The Epic of Gilgamesh*, N.K. Sandars trans. and ed.(Baltimore: Penguin, 1972); Martin van Bruinessen, "The Kurds Between Iran and Iraq," *Middle East Report* (July-August 1986); C.L. Brown and D. Itzkowitz, eds., *Psychological Dimensions of Near Eastern Studies* (Princeton: Darwin, 1977); A.M. Hamilton, *Road Through Kurdistan* (London: Faber and Faber, 1958); J.C.A. Johnson, "The Kurds of Iraq," *Geographical Magazine* (1940); Mark Sykes, *The Caliph's Last Heritage* (London: Macmillan, 1915); Samande Siaband (pen name used by M. Izady), "Mountains My Home," *Kurdish Times* II.2 (1988); C.J. Rich, *Narrative of a Residence in Koordistan, and on the Site of Ancient Nineveh; with Journal of Voyage Down the Tigris to Baghdad.* London, 1836; Lieut. Col. J. Shiel, "Notes on a Journey from Tabriz, through Kurdistan via Vân, Bitlis, Se'ert and Erbil, to Suleïmaniyeh, in July and August 1836," *Journal of the Royal Geographical Society* 8 (1838); Michael Crichton, *Eaters of the Dead: The Manuscript of Ibn Fadlan Relating His Experiences with the Northmen in AD 922* (New York: Knopf, 1976).

# ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی

چیا سەرکەشەکان و پێکهاتەی سەختی سەرزەمینی کوردستان، بوونەتە سەبەبکاری دروستبوونی کۆمەڵی نیمچە دابڕاوی خەڵك لە دوڵ و دەشتە بەپیتەکاندا. هەر یەکێك لەم کۆمەڵانە، نیشانەوارێکی زمانی و کومەڵایەتیان بۆخۆیان پێکەوە ناوە کە تۆزێك جیاوازی لەگەڵ هی دەوروبەردا پێوە دیاریوە. بەهەمان ئەندازە کە چیاکان کوردەکانیان توند لە مەترسی دەرەکی پاڕاستوە پەیوەندی نێوانیشیانیان بڕیوە و سەرەنجام بوونەتە مایەی دەرکەوتنی ڕوخساری کەلتووری جیاوازیش تۆمارە هەرە کۆنەکانی ژیانی نیشتەجێی شارستانی لە کوردستاندا، هاوکاتن لەگەڵ داهێنانی کشتوکاڵ لە وڵاتەکەدا، کوردستان دەتوانێ خۆ بەوەی کە هەرە کۆنترین کومەڵی کشتوکاڵی لەسەر ڕووی زەمین تێدا دروست بوە بشەنگێنێ، بەڕێوەبردنی ئەو بڵاوبوونەوە خێرایەی کە یەکسەر پاش گواستنەوە بۆ ئابووری کشتوکاڵی هاتە کایەوە (هەندێك بە دەجاری دادەنێن) کە ئابووریەکی یەکجار زەلامتر و بازرگانیەکی فراوانتری لێکەوتەوە، پێویستی بەوە کرد سیستەمی پاڕاستنی سەربازی بۆ پاڕاستنی داهاتە سەربازەکەی دابمەزرێ، بەم جۆرە دەوڵەتی ڕێکوپێك دامەزران و لەمەشەوە ژیانی شارستانی کەوتەوە، هەر لەو کاتەوە شۆڕشی کشتوکاڵی لە کوردستاندا هاتۆتەکایەوە، پەڵەپەڵەی کشتوکاڵگەری نیشتەجێیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، (بڕوانە سەردەمی پێش مێژوو).

سەردەمانێك، کەم ئاسایشی و جێگۆڕکێ کردنی کۆچەرەکان، کشتوکاڵگەرەکانی ناچار کردوە واز لە هەندێ زەوی بەردەستی خۆیان بێنن بۆ کۆچەرەکان، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوەندە زۆر نەبوە کە خۆی بدا لە نیوەی بەرهەمی گشتی کاڵا لە ئابووری کوردەوارییدا، کشتوکاڵگەرەکان بەشێوەی بەرهەمهێنانی هەرەوەزی بەرووبوومەکانیان ڕەنێو دەهێنا. تەنانەت لە پۆپەی وەرچەرخانی کۆچەرایەتی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەشدا بە ژمارە هەر ئەوان لە کۆمەڵگای کوردستانیاندا زۆربەو باڵادەست بوون.

گەلێ نووسەری دەهە سەرەتاییەکانی ئەم سەدەیە وای بۆچوونە کە کوردە نیشتەجێ کشتوکاڵگەرەکان لەوانەیە لە ڕووی ڕاستیەوە لە ڕەگەزێکی جیا لە کۆچەرەکان کەوتبنەوە و

لە بنەکانەوە بەچکەی ئەم سەرزەمینە نەبن بەڵکو نەوەی خەڵکێکی لایدەبن و بەشێوەی جۆراوجۆر بە درێژایی چەندین سەدە خۆیان لە دەستی هێرشی دڕندانەی کۆچەرەکان پاراستبێ، بەڵام ئەم بۆچوونە ئەو ڕاستیەی پشتگوێ خستووە کە کوردستانیش وەکو هەموو سەرزەمینەکانی دراوسێی هەرگیز مەڵبەندی کۆمەڵگایەك نەبوە کە تەنها کشتوکاڵگەر یان کۆچەر بووبێت. بوونی جیاوازیی زەقی بەدەنی لەنێوان چینە کۆمەڵایەتیەکاندا دیاردەیەکە کە دەتوانرێ لە کۆمەڵگای تریشدا بەدی بکرێ، بۆ نموونە لە چەندین دوورگەی دەریای ئارامدا ئەم دیاردەیە زەقە، ئەو جیاوازیە ڕەگەزیەی لەنێوان چینە جۆراوجۆرەکاندا کە بەدی دەکرێ، تاڕادەیەکی زۆر دەرەنجامی شێوەی ژیان و تەندروستی و خۆراکی کۆچەرەکانە. هەرچەندە ناکرێ هەموو بۆ هۆکاری ژینگەیی بگەڕێنرێتەوە (بڕوانە سروشتی جەستەیی) هۆزەکان زۆرتر پەز لەوەڕێن بوونە، و زیاتر وەکو برگەیەکی کۆمەڵایەتی ناو بەرەیەکی فراوانی یەکگرتیوو ڕەفتاریان کردوە نەك ڕێکخراوەیەکی ئابووری و تەنها لەناو چوار بواری شارەکاندا، پەیوەندیە خێڵەکیەکان لاواز دەبوون، بەڵام تەنانەت وەرزێرە نیشتەجێکانی لادێکانیش پەیوەندی زۆر قووڵیان لەگەڵ هۆزەکاندا هەر ڕادەگرت و بەوە لە پاراستن و ڕێنمایی ئەوان بێبەش نابوون. هەرگا کۆچەرە دەستدرێژەکان بە ژمارە زیادیان کرد لە لادێکان، یان شەڕ بەرپابوو لەگەڵ لایەنێکی دەرەکییدا، یان پریشکی وەشاند، یاخۆ قوتەوەبوونی کەسێك یان تایەفەیەك بوو بەمایەی ترس بۆ دانیشتوان، تەنانەت شارنشینەکانیش، دەکەونە پەیجووری پەیوەندیە خێڵەکییە کۆنەکانیان و بە خەڵات و خۆبردنە پێشەوە لە سەرۆك خێڵێکی دەسڕۆ و توانا، ئاسایشی خۆیان دابین دەکەن و مەترسی لە خۆیان دووردەخەنەوە، هەر بۆیە، تا ئەم دواییانەش، هەر یەکێ لە دانیشتوان سەر بە بنەماڵەکەی خۆی، یان هۆزەکەی یان تایفەکەی دەمایەوە، سەر بە هۆز بوونی لێدەرچێ، ئینجا هەر کوردە خۆی دەبەستەوە بە گەلێك یان دەوڵەتیك یان هەر سێبەردارێکی ترەوە.

تەنانەت ئایینیش ڕۆڵێکی کزی لە دارشتنی ئەم سیما کۆمەڵاتیە گرنگەدا بینیوە... ئەوەندەی کە مێژووی نووسرا و دەریدەخا، کوردەکانی سەردەمانی کۆن، بەهەمان شێوەی کوردەکانی ئەم سەردەمە و سەرکردەکانیان، ئاوەڵناوی هۆزەکانیان دەخستە پاڵ ناوی خۆیان، هەر تاکێکی کورد ناسنامە و ئاسایش و ژیانی خۆی لە چوارچێوەی خێڵەکەیدا بەدی

کردوە و نیشانەی گوێڕایەڵی خۆی بەشێوەی ماددی یان مەعنەوی پێشکەش بە سەرۆك هۆز کردوە. سەرکردەی ناوچەش هاوپەیمانی دروست کردوە یان کۆنفیدراسیۆنی نێو هۆزی پێکهێناوە و لەوانیشەوە پشتیوانی بۆ دەسەڵاتداریە خۆوڵاتی یە کوردیەکان هەڵقوڵاوە، ئەم دەسەڵاتداریانەش، بەشێوەی جۆراوجۆر بەگوێرەی پێویست سەر بەوبوون و دڵسۆزی خۆیان و بۆ پادشانشین و ئیمپراتۆریەتە حوکمڕانەکانی سەروەخت دەربڕیوە. لە زۆربەی زۆری سەردەمەکاندا، دەسەڵاتداریە خۆوڵاتیەکان بە کردەوە سەربەخۆبوون. ئیمپراتۆریەت بەهێز بوویێت یان لاواز مەسەلەکە لە دەستودیاری و خەڵاتی جارجارە بۆ پایتەختە دوور دەستەکان کە بەناوە خاوەنی وڵاتەکەبوون، تێنەدەپەڕی.

ئەم سیستەمە تا بڵێی بەدڵی هێزە دەرەکیەکان بوو و بە قازانجیان دەگەڕا، لە سەردەمە کۆنەکانی پێش داهێنانی کەرەستە و تفاقی پەیوەندی و گواستنەوەدا، لەبەر دووری وڵاتەکان لە پایتەختی ئیمپراتۆریەتەوە دەسەڵاتڕانی نەك هەر بەسەر ڕەشەخەڵکەکە، بەڵکو بەسەر سەرداره ناوخۆییەکانیشدا کاری کردەنی نەبوو نەخاسمە ئەگەر شوێنەکە، شوێنی ئاسی و لای وەکو وڵاتی کوردستان بوایە، ئەم کۆتە ئادەتییە کە لەملی دەسەڵاتبەندیەکانی دەوڵەتدا بوو، کە تەنها برا گەورەییەکی بێ دەنگ و ڕەنگ و بەناوەی بەسەر وڵاتەکەدا هەبوو، هەموو مەرجەکانی سەربەخۆیی بۆ کوردستان ڕەخساندبوو، لە پەنای نزمترین ئاستی یارمەتی بە دراویان سەرباز دان و گشت لایەنەکانیش پێی ڕازی بوون.

داهاتنی بەرەبەیانی چاخی پێتەسازی و بڵاوبوونەوەی تەکنۆلۆجیای پێشکەوتە لە چەکسازی و گواستنەوە و پەیوەستکاری بە وڵاتەکەدا، بەوەدا شکایەوە کە دەسەڵاتە ناوخۆیی یە تاڕادەیەك زۆر سەربەخۆکان، تەنانەت سەرکردەکانیش، ناچارین ملی ڕێگایەکی نوێی گرانمایە و ناپێویست بۆ کۆکردنەوەی باج و پیتاك و هێزی کار بۆ دەوڵەتە ئیستیعماری و کۆلۆنیالیەکانی ڕۆژەڵاتی ناوەڕاست بگرنە بەر، لە ناوەڕاستی سەدەی (١٩)دا دوا دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی کورد لەناودرا، و لە کەمتر لە سێ بەشی سەدەیەکدا سەرکردایەتیە خێڵەکییە نیمچە سەربەخۆکانیش نەمان، دوا کوتەکی دەنگبڕ، تا بڵێی گران و هەناسە بڕیش لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا وەشێنرا کاتێ کە دارەڕای ئادەتی دەسەڵاتی (عوسمانی—وەرگێڕ) لادرا و لە جێی ئەو پێنج حکوومەتە قووتکرانەوە کە هەریەکەیان لەتێکی کوردستانی بەمیرات بۆ مایەوە.

دەوڵەتە تازە داهاتەکان دەستیان کرد بە بەرنامەیەکی سیستەماتیزە کراوی کەلـەگایی سیاسی بەسەر سەرزەمینە سەربەخۆ کوردنشینەکاندا بۆ داچەسپاندنی دەسەلاتی ئیداری و ئابووری خۆیان، ئەو هەولانە کە ئەم دەوڵەتە نوێیانە بۆ زەوتکردنی ئازادی و سەربەخۆیی مێژوویی کوردەکان کە بەشتێکی سروشتی وەکو بەفری زستانیان دەزانی بۆ خۆیان شەڕ و هەرای خوێناوی لێکەوتەوە، بەلام ئەم هەولانە هەمیشە بێ ئاکام بوونە ئێستاش کوردستان هەر سیمای سەرزەمینێك و گەلێکی ژێر دەستی بێگانەی پێوە دیارە، نەك تەنها گرووپێکی ئەتنی ناو چوارچێوەی دەوڵـەتیکی یەکگرتوو کە زۆرینەی ئەتنی حوکمرانی تێدا دەکا، ڕاستییەکەی ئەوەیە، ڕادەی ئەو ئازادیەی کە کوردان بەدرێژایی هەزاران ساڵ لە سێبەریدا دەژیان، بریتی بوو لە سەربەخۆییەکی دوفاکتۆ، تەنانەت ئەو کاتەش کە لە شێوەی هەندێ قەوارەی دەرەبەگایەتی ناو ئیمپراتۆریەتی زلزلیشدا دەژیان هەر وابوو.

هەموو کوردان، تەنانەت ئەوانەشیان کە ئاستی بەرزی زانیارییان هەیە، هێشتا هەر توند و تۆلترین پەیوەندییان لەگەڵ سەرکردە خێزانی خێڵەکیەکاندا هەیە. سەرکردە و سەردارەکانی بچووکترین خێڵەکان هێشتا بەرزترین پلەی ڕێزیان لەلای ئەندامان هەیە، تەنانەت ئەمڕۆکەش، هەر سەرکردەیەکی پارتی سیاسی کورد، لە هەموو مەسەلەیەکی سەرەکییدا، ڕاوێژکردن بەو سەردارە خێڵەکیانە بە پێویست دەزانێ چونکە لە سەرەنجامدا، گەریلا جەنگاوەرەکانیان لەناو جەرگەی ئەم خێڵ و تیرانەوە دێن و ڕێز و لاکردنەوە لەگەڵ نوێنەرەکانیاندا مانەوەیان لەناو ڕیزەکاندا دەستەبەر دەکا، تەنانەت مودیرنیزە کراوترین پارتی، واتە پ ك ك لە کوردستانی تورکیا لەم یاسایە بەدەرنیە. بۆ داپۆشینی ناکۆکییە ئیدیۆلۆجیەکان، پ ك ك ئێستا لە پێناوی ڕەوانکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ سەرەك خێڵەکاندا کە بۆ کاروبار یان پێویستن، ناوی "پێشکەوتخواز"ی بۆیان بڕیوەتەوە، لە کاتێکدا ناوی کۆنەپەرست" یان بڕیوە بەسەر ئەوانەدا کە هاوکاریان لەگەڵدا ناکەن (بڕوانە پارتە سیاسیەکان).

لە کاتێکدا کۆچەرایەتی سرف دەمێکە ئاسەواری لە سەرزەمینەکە نەماوە، دەتوانرێ بەڕێکی بەم سەرەك خێڵ و پیاو ماقوولانە بوترێ هەڵبژاردەی سیاسی ناوخۆیی، لە هەمان شێوەی هاو کووفەکانیان لە دەوڵەتە سەربەخۆکاندا کە ئەم ناوە بۆ سیاسیە ناوخۆییەکان بەکاردێ و دەبنە سەرچاوەی باش بۆ کۆکردنەوەی دەنگ و پشتگیری بۆ سیاسەتمەدارە

گەورەکان، ئەوان ڕۆڵی گەورە و کاریگەر دەبینن لەم بوارەدا و لەلایەن خەڵکەکەشەوە زیاتر جێی باوەڕن بۆ پاراستنی ماف و خواستەکانیان.

سەرکردە سیاسیە کوردە مۆدێرنەکان ئەم ڕاستیەیان لە دەست نەداوە و لە ڕاوێژکاری و گوێگرتن لەم هەڵبژاردە ناوخۆییانە یەکو دوو ناکەن، و چ پ ك ك و چ ك د پ–١ ئەم دەسکەلایانە بە باشی بەکاردێنن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Frederick Barth, *Principles of Social Organization in Southern Kurdistan* (Oslo: Vorgensen, 1953); William M. Masters, "Rowanduz: A Kurdish Administrative and Mercantile Center," unpublished doctoral dissertation (Ann Arbor: University of Michigan, 1953); John M. Smith, "Turanian Nomadism and Iranian Politics," *Iranian Studies* XI (1978); Messoud Fany, "La Nation Kurde et son évolution sociale," unpublished doctoral dissertation (Paris: University of Paris, Faculty of Law, 1933); J. F. Bestor, "The Kurds of Iranian Baluchistan: A Regional Elite," unpublished masters thesis (Montreal: McGill University, 1979); Edmund Leach, *Social and Economic Organization of the Rowanduz Kurds* (London: London School of Economics, Monographs in Social Anthropology III, 1940).

# بارودۆخی ژن و ژیانی خێزانی

جی، ئار، درایڤەری کوردناسی ئینگلیز، ساڵی ١٩٢٣، کە دێتە سەر باسی خەسڵەتە کۆمەلایەتیەکانی کوردان، بە توندی بێزاری دەردەبڕێ لە نیشتنەوەی کوردە پەز لەوەڕێنەکانی جارانی کیلیکیا (لە ناوەڕاستی چیای تۆرۆسی سەر دەریای سپی ناوەڕاست)، و بلاوکردنەوەی"خراپترین خەسڵەتیان" کەوا "ژنان بێ ڕووپۆش دەچنە دەرەوە و زۆر سەربەستانە ڕەفتار دەکەن، لە کاتێکدا زۆربەی کاری گرانیان خراوەتە سەر".

ئەو لە بارەی کوردانی ترەوە دەنووسێ "ژنانی کورد، لە ڕووی بەراوردکاریەوە، ئازادن لە هەڵس و کەوتدا و بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان دێن و دەچن، بە ئاشکرا دەزگیران دەگرن و بە دڵخوازی خۆیان شوودەکەن لەناو نزیکەی زۆربەی هۆزەکاندا بێ ڕووپۆش دەگەڕێن، هەرگیز بە تەنگی ئەوەوە نایەن خۆیان لە نێرینە پەنادەن و بەشێوەیەکی بەربلاو نۆکەری نێرینە لە ماڵەوە ڕادەگرن، لەو هاوسەریەدا کە لەمە دەکەوێتەوە ڕۆڵی ژن هەرگیز لەهی پیاو خوارتر

نابێ و لەماڵیشدا ژن بە "کۆڵەکەی ماڵ" دادەنرێ ئەوان لەلای مێردەکانیان بە یەکسان سەیر دەکرێن لەگەڵ پیاواندا و هەمیشە بە چاوی گاڵتەوە سەیری باری بەندە ئاسای ژنانی تورک دەکەن کە بەرهەمی دەستووریکی پشتا و پشت زادە".

درایڤەری هەواداری ڤیکتۆریەکان (١٨٣٧-١٩٠١ وەرگێر)، هەرچەندە لە مەودای بەرفراوانی ئازادی ژنی کورد ڕازی نیە بەڵام ناچار دان بەوەدا دەنێ کە "ڕەوشت بەرزیی ئافرەتی کورد زۆر گرنگە و زۆربەی خێڵەکان سزای مەرگ دەدەن بەسەر ئافرەتێکدا کە پێی هەڵخلیسکێ، قەحبەیی مەگەر بە دەگمەن ئەگینا کەس نازانێ چییە و هەرچەندەی پشکنیومە نەمتوانیوە لە کوردیدا وشەیەك بدۆزۆمەوە کە بۆ قەحبە بەکاربێت" (بێگومان درایڤەر لەمەدا بەهەڵە چوە کەوا ئەم پیشە هەرە دێرینە لەناو کورددا جێ پێی نەبوە، یان زمانەکەیان وشەی وا نەزاوە، ئەم پیشەیە لە کۆنەوە هەبوە و چەندین وشە لە زمانی کوردییدا هەن کە بۆ شێوە جۆراوجۆرەکانی بەکاردێن، هەرچەندە هەندێکیان لە زمانی گەلە دراوسێکان خوازراون).

بۆ ئەوەی جێی ئافرەتی کورد لە کۆمەڵگای کورددا باشتر هەڵسەنگێنی چاك وایە ڕۆڵیای لە هەندێ بواردا کە زۆرترین هی پیاوانن تەماشاکەی وەکو سوپا و سیاسەت و سات و سەودا و ئایین.

لەناو قوتیلەکاندا کەوا تیرەیەکن لە کۆنترین باوباپیرانی کوردان، سەرکردایەتی سوپا تەنها پیشەی ژنان بوو (بڕوانە مێژووی هەرە کۆن، هەروەها آر، گریشمان ١٩٥٤-٤٤). نزیکەی دوو هەزار ساڵ دوای قوتیلەکان پلوتارکی مێژوونووس گریگۆ-ڕۆمان باسی شەڕی دڕندانەی خەڵکانی باکوور و ڕۆژاوای کوردستان و داکۆکی سەرسەختانەیان دژ بە هێزە داگیرکەرە ڕۆمانیەکان دەکا لە سەدەی یەکەمی پێش میلاددا و لەناو ئەو خەڵکانەدا پەنجە بۆ بوونی ژنانی (ئەمەزۆنی) درێژ دەکا لە ڕیزی لەشکرەکاندا، ئەو ژنە چەك بەشانانە، کە بەگوێرەی شەرعی گریك و ڕۆمەکان هەم پێشێلکەری گەورەی ئایین بوون، هەم دوژمنی خوێنخوار، و نیشتیمانەکەیان بە هەموو حیسابێك، هەمان هەرێمی جوغرافیای کوردستان دەگرێتەوە (بڕوانە پلوتارك) ڕووخانی کۆماری ڕۆم: پۆمپێی).

هەر لەو شەڕانە خۆیاندا، پلوتارك باسی هەڤاڵێکی مێینەی میثریداتیسی پادشای پۆنتی دەکا کە بەجلە ڕەنگاوڕەنگە کوردیەکانیەوە ئەو بەهەڵە بە فارسی دەداتە قەڵەم - ئازایەتییەکی کەم وێنە و سرنجکێشی نواندوە لە شکاندن و دڕدان بەو لەشکرەی جەنەراڵ

پۆمپەی، سەركردەی لەشكرەكەی ڕۆم، كە ئابلۆقەی دەوڵەتی پۆنتی دابوو: " لە سەرەتای هێرشەكەدا، میثریداتیس خۆی و (٨٠٠) سوار بەناو ڕیزەكانی ڕۆمەكاندا بۆی دەرچووبوون و خۆیان دەرباز كردبوو، سوارەكانی هەر كەسە بەلایەكدا پەرتەیان لێكردبوو و جگە لە سێ كەس لەگەڵ میثریداتیسدا نەمابووەوە، یەكێك لەوانەی كە لەگەڵیدا مابوونەوە هیپسیكراتێیای دۆستی بوو، كە هەمیشە وەكو پیاو ڕەفتاری دەكرد و ئامادەبوو بێ پەروایانە مل بەهەر كارێكی خەتەرناكەوە بنێ، لەبەر ئەمە، پادشا هەر بەناوی هیپسیكراتیس بانگی دەكرد كە ناوی نێرینەیە".

بەڵگە گەلی ئازایەتی و دلێرایەتی ژنانی كوردستان گەلێ لەوە كۆنتر و دێرینەترن كە لە تۆمارەكاندا نووسراون. لە گۆڕستانە (١٢٠٠٠) ساڵ تەمەنەكانی شانیدەر لە كوردستانی ناوەند (كە پڕن لە پاشماوەی مرۆڤی نیاندەرتال) تاكە كەرەستەی خۆڕازاندنەوە كە لەگەڵ زۆربەی ئیسك و پروسكی مێینەكاندا دۆزرایەوە، چەقۆی جوان نەخشێنراو بوو، لە یەكێك لەو گۆڕانەدا دەسكی چەقۆ كە لە پارچە ئێسكێك و دەمەكەی لە بەردێكی ڕەقی لە قیردراو دروستكرابوو. ( Roaf١٩٩٥:٣٠)

میرنشینی زەند (١٧٥٠–١٧٩٤) كە دوامیرنشینی سەرەكیی كوردە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، ژنانی بەشێوەیەكی چڕ لە هەڵمەتە سوپاییەكانیدا بۆ وەدەستهێنانی تەختی پادشایی خستۆتەكار، تەنانەت دامەزرێنەری میرنشینەكە، محەممەد كەریم خان، پڕ بەمانا پەیڕەوی لەم نەریتە دێرینە كوردیە دەكرد، خۆی و ئەفسەر و سەربازەكانی شان بەشانی بووكەكانیان دەچوونە مەیدانەكانی جەنگەكانەوە، باشترین نموونە بۆ ئەمە بەرەنگاربوونی هێزە داگیركەرە ئەفغانەكانە، ئەفسەرە ئەفغانەكان لە بەرامبەردا كەوتنە توانج گرتنە زەندەكان و بە "خۆشاردنەوە لەژێر داوێنی ژنەكانیان"دا تاوانباریان كردن.

بەشداریكردنی ژنان لە خەباتی چەكدارییدا تا ئێستا لە كوردستان هەر باوە، چونكە نزیكەی هەموو حیزبە سیاسیە كوردەكان (پارتە ئیسلامیە ڕادیكالەكانیان لێدەرچێ) كە خاوەنی هێزی گەریلای پێشمەرگەن، ژنی پێشمەرگەیان لەناو ڕیزەكاندا هەن، لەناو پێشمەرگەكانی پارتی (pkk)دا كە خاوەنی دەسوەشێنترین هێزی پێشمەرگەیە پێشمەرگەیەكی زۆری ژن بەدی دەكرێن (بڕوانە پارتە سیاسیەكان) تۆماری بەشداری بە

کردەوەی ئەم ژنانە لە جەنگدا زۆر هاوڕەنگە لەگەڵ ئەوەدا (پلوتارك) دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر لە بارەی ژنە جەنگاوەرەکانی "ئەمەزۆن"ەوە باسی کردوە، لە هەمان هەرێمی ئەنەدۆڵ: کوردستانی باکوور و ڕۆژهەلات.

لە بواری سیاسەتیشدا، ژنە کورد بەهەمان شێوە لە سەردەمانی دێرینەوە چالاکانە بەشدارییان کردوە، دوا حوکمڕانی خانەوادەیەکی گرنگی دەیلەمی کوردی سەدەکانی ناوەند، واتە بوەیهیەکانی ڕەی (تارانی ئێستا)، سەییدە "ماما" خاتوون، ژنێك بوە، بۆ ماوەی (٣٠) ساڵی ڕەبەق، ئەو بە ئازایەتی و ژیری و دیبلۆماسیەت، پادشاییەکەی لە هێرشی دڕندانەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی بە توانا و سوپا کوچەرە تورکەکەی پاراست، ئەو تا جڵەوی کاروباری دەوڵەتەکەی دایە (مەجدو دەولەی) کوڕی لە ساڵی (١٠٢٩)دا هەر حوکمە ڕمایی کرد، هەرچەند ئەم گۆڕانە بوو بە مایەی لەناوچوونی حوکمی خانەوادەکەش.

لە سەرەتای ئەم چاخانەی دواییشدا ژنان بەشێوەیەکی کاریگەرانە بەشداری سیاسەت و سەرکردایەتییان کردوە، ناوی ژنانی سیاسەتمەداری کورد ئەوەندە زۆرن کە بە ئاسانی لە ژماردن نایەت، لەناو هەرە ناودارەکانیاندا، دەبێ باسی خاتوو (قەرە فاتیمە)ی تاری ماراش بکەین لە کوردستانی ڕۆژاوا لە وڵاتی کۆماجین کە نوێنەری کورد بوو لە ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی نوزدەیەم لە داداگای عوسمانی لە ئەستەمووڵ.Illustrated London (News)ی ٢٢ی نیسان (ئەڤریل)ی ١٨٥٦، لاپەڕەیەکی یەکەمی بە تەواوی بۆ یادەوەری ئەو تەرخان کردوە، لە هەمان دەمەدا، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەرەنگاری ژنێکی تری کورد بوەوە، ئەو ژنە دوا حوکمڕانی هەرێمی نیمچە سەربەخۆی هەکاری بوو لە کوردستانی باکوور، هەر لەوکاتەدا هێزە چەکدارەکانی عوسمانی ناچار بوون، بەرەنگاری ماما پوورە حەلیمەی پژدەر و ماما قەرە نێرگزی[4] هۆزی شوان ببنەوە لە ناوەندی کوردستان، هەروەها ماما پرشەنگی هۆزی گەورەی میلان لە کوردستانی ڕۆژاوا (نیکیتین ١٩٥٦). جگە لەمە ئەو هێزە ڕووسیانەی کە ساڵی ١٩١٦ بەرەو ناوەوەی کوردستانی ناوەند ملیان دەنا بەرەنگاری ژنێکی تری کورد ماما مریەمی، بێوەژنی شێخ محەممەد صادقی نەقشبەندی بوون کە ئازایانە داکۆکی لە تاری ئایینی—

---

[4] نێرگز یان کوێخا نێرگز، لە شوانی سەر خاسەیە و لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٩)دا ژیاوە و لە شەڕی شوان و هەمەوەندا ناوبانگی دەرکردووە. نە(ماما) و نە (قەرە)ش بە ناوییەوە نییە.

مێژوویی نەهرێ دەكرد. دوا سەركردەی چەكداری كورد، كە ساڵی ١٩٨٢، ناچار خۆی دایە دەستی لەشكری ڕەزای شای ئێرانەوە ژنێك بوو، كە لە هەمان كاتدا سەرۆكی خێڵی هەركیش بوو.

عادیلە خانم، یەكێكی ترە لە سەركردە ژنە كوردەكان، ئەو خوێندەوار و دنیادیتە بوو، سەرۆكی گرانترین و بە ژمارە گەورەترین هۆزی كوردستان، واتە هۆزی جاف بوو تا مردنی لە ساڵی ١٩٢٤دا، ئەو ماوەیەك ئی،بی، سۆنی وەكو میرزا لای خۆی ڕاگرت، سۆنی ئەفسانەوار دوای ئەوە لە نووسینەكانیدا سەرچاوەیەكی باشتری دابەستووە لە بارەی پلەو پایەی دێرینی ژنانەوە لە كۆمەڵگای كوردەواریدا سۆن لە یەكێك لە نووسینەكانیدا عادیلە خانم بە "شێرە ژن" ناو دەبا، كۆشكەكەی عادیلە خانم لە هەڵەبجە تا وێرانكردنی شارەكە لە ساڵی ١٩٨٨دا وەكو دوا ئاسەواری بیناسازیی میرایەتی دێرینەی كوردستانی ناوەند هەر بەپێوە بوو (بڕوانە مێژووی ئەم دواییانە).

ڕۆڵی ژن لەناو كوردەوارییدا هەر بەو بوارانەوە ناوەستێ. لە بواری ئایینیشدا ئەوان ڕۆڵێكی سەرەكییان هەیە، تیرەی فریشتەكان، كە ئایینێكی خۆوڵاتی كوردیە، لەناو (٦) بەرجەستەكەرە سەرەكیەكەیدا ژنێكی بەرجەستەكەری گیانی گەردوونیی لە هەر یەكێك لە حەوت دەورانەكەی دونیای ماددیدا تێدایە، (بڕوانە یارسانیەت).

هەندێ لە نووسراوەكانی تیرەكە لەلایەن ژنەوە نووسراون، لەوانە مامانەرگزی شارەزووری (دەورووبەری ١٣١٣) كە خۆی یەكێك بووە لە وردە بەرجەستەكەرەكانی گیانی گەردوونی.

لە ١١٤٥ سۆفیەكانی نیعمەتوڵڵای جەیحونابادی پیاوی پیرۆز و سەركردەی ئایینی سەدەی بیستەمی (یارسانەكان)، نزیكەی (٥٠٠)یان ژن بوون، ئەمە بە گوێرەی قسەی نوور عەلی ئیلاهی، كە هەم كوڕی نیعمەتوڵڵا و هەم پاش خۆی جێگریشی بووە. خۆدی، قارا فاتیمەش (دەبێ قارا فاتیمە بێ – وەرگێڕ) كە لە سەرەوە باسكراوە، بانگی ئەوەی دەدا كە گوایە بەرجەستەكەرێكی مێینەی گیانەكەیە لە سەدەی بیستەمدا.

بەشداریكردنی ژنان لە كۆبوونەوە و بۆنەگێڕیەكانی تیرەكەدا، لەلایەن غەیری كوردەكانەوە بە جۆرێك لە ڕێگە دەرچوون دادەنرا.

ئەو ئازادیەی بۆ ژنان ڕەخساوە بۆ بەشداریکردن لە هەندێ کارو کردەوەدا کە لە کۆمەڵگاو ناوەندە ئایینیەکانی دەوربەردا تەنها بۆ پیاو ڕەوایە، ئەوجاو ئێستاش بە ئاسانی قووت نادرێ. هەر ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی گەلێ تۆمەتی سێکس کاری بەرەڵا بدرێتە پاڵ هەوادارەکانی ئایینەکە (بڕوانە تیرەی فریشتەکان) بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو هاشوهووش و ڕیسواکاریە کە هەڵدەبەسترێن، چ لە کۆمەڵگای یەزیدی، چ لەهی عەلەوییدا، ئاهەنگ و بۆنەگێڕیە ئایینیەکان بێ بەشداری ژنان هەرناکرێن، هەوادارانی یارسانیەت تا ڕادەیەك شانیان بۆ ئەو وشارانە شلکردووە کە لەلایەن کۆمەڵگاکانی دراوسێ و ئایینە توندگیرەکانەوە خراوەتە سەریان، هەندێکیان بەتایبەتی ئەوانی زیاتر لە شیعەکان نزیك بوونەتەوە، ئێستا ناهێڵن ژنان لەو بۆنە و کۆبوونەوە ئایینیانەدا بەشداربن کە لە دووتوێی ماڵ و جێگا ئایینیەکاندا بەجێ دێنرێن.

بزووتنەوەی بابیەتیش کە تا ڕادەیەکی دوور کەوتۆتە بەر تەئسیری تیرەی فریشتەکان، بە دیدێکی لیبرالیانە سەیری ئافرەت دەکا (بڕوانە بابیەت و بەهائیەت).

ساڵی ١٨٤٩، تاهیرە قورەتولعەینی بەرجەستەکەری مێینە لە ئەڵقەی بابیەت لەناو زنجیرەکەدا، بە ئاشکرا و لەناو خەڵکدا ڕووبەندی فڕی دا تا بەوە "یەکسانی ژنان لەگەڵ پیاواندا ئاشکرا بکا وەکو بنەمایەکی بنەڕەتیی ئایینی بابیەش" (Fisher ١٩٧٨)، ئەوەی تاهیرە کردی، زیندوو کەرەوەی ڕووداوێکی تربوو کە ساڵی (٩٢٢ز) ڕوویدابوو، کاتێك لە چوار مێخ کێشانی هەللاجدا خوشکەکەی لە بەغدا و لەناو ئاپۆرای خەڵکدا ڕووبەندی فڕی دا (بڕوانە ڕێباز بەندیەکانی سۆفیگەری).

پلەی کۆمەڵایەتی بەرز و ئازادی نیسبەتەن هەبووی ژنانی کورد، کە جوولەکەکانیشی گرتیۆتەوە، لە سەدەی حەڤدەیەمدا بوو بە مایەی گەیشتنی یەکەم ژنی جوولەکە، واتە رابی ئەسیناث بەرزانی، بە پلەی (رابی)یەتی (بڕوانە جوولەکایەتی). لێرەدا، چاك وایە پەنجە بۆ ڕاستیەکیش درێژ بکەین، شاژنە هێلینای پادشایەتی ئەدیابینی کوردی، پاش ئەوەی خۆی وەرگەڕاوەتە سەر جوولەکایەتی، گوایە مێردەکەی و گەلەکەشی دوایی بەرەبەرە بریۆتە سەر ئەو ئایینە.

لە ڕووی داراییشەوە، ژنانی کورد لە هەموو گرووپە ئەتنییەکانی دراوسێ، زۆرتر، پتر؟ دەسەڵات و کارگوزارییان دراوەتێ، هەرچەندە خێزانی کورد زۆرتر گوێرایەڵ و بەندەواری دەسەڵاتی باوکن، بەڵام کاتێ خاوەن ماڵی نێرینە دەمرێ، یان پەکی دەکەوێ، ژنەکەی دەبێ

بە جێگری لـە هەڵسوڕاندن و سەراسـویی كردنـی گشت ئـەرك و مافەكانیـدا، هەرچـەندە پیـاو خـاوەنی وەچـی نێرینـەش نـەبێ، كـەمجار ئـەوە دەبـێ بـە كۆسـپ لـە بـەردەم ژنەكـەی لـە گرتینەوەی جێ و دەسەڵاتیدا.

ژن و ژنخوازی كارێكی گرێواوی و پڕ بێنە و بەرەنیـە، زۆرتـر بـە ئاسـانی دێتـە دەسـتەوە، بەڵام وەكو درایڤەر لەسـەرەوە باسـی كـردوە، بەڕەزامەنـدی و خواسـتی هـەردولا، ژن و پیـاو، دەبـێ هەرچـەندە لـە هەنـدێ بۆنـەو پێویـستیی سیاسـی یـان ماڵییـدا، جـۆرە گرێبەنـدی و برینەوەیەكی تێدەكەوێ و لەو حاڵەتانەدا خزمایەتیە كە دەبێ بەهی سیاسی یان ماڵی.

ئەوەی جێی داخ و سەیر پێ هاتنە لەم دواییانەدا گەلێ لە پیـاوانی كـورد هەوڵدەدەن ئـەو بەهاو نەریتە بەناوی مودێرنیزەكاریەوە لـەناو هـی گەلەدراوسـێ بـاڵا دەسـتەكاندا بتوێننـەوە و دەورو ئازادی ژنان لـەناو خێـزان و كۆمەڵگاكانیانـدا سـندم بكـەن، لـە شـار و تارۆچـكەكاندا، وا خەریكن پێچە و ڕووپۆش بەسەر ژنە كوردەكانـدا بسەپێنن. ئـەم كوردانـە خۆیـان بـە تـەواوی لەناو كەلتووری دەوڵەتە باڵا دەستەكاندا هەناسە بڕ بوونە، ئەم "مۆدیرنیزە كردنـە" وێ ناچـێ بتوانێ بێیتە شوورەبەند بە دەوری ئـەو ئازادیـە دێرینانـەدا كـە كۆمـەڵگای كـورد بـە ئـافرەتی كوردی داون چونكە، شەپۆلێكی تری مودێرنیزەگـەری وا بـەڕێوە گـژژەی دێ و لەگـەڵ خۆیـدا مژدەی ئازادی زیاتر و یەكسانی فراوانتر بۆ ژنان دێنێ. سەرەڕای هەموو ئەمانە، لە ناوچـە دوور دەستە خەوش نەگرتووەكانی كوردستاندا داب و نەریتە هەزاران سـاڵە كۆنەكـەی كـوردان هـەر ماوە و بەكارن، نەك هەر ئەمە، بەڵكو لەناو هەندێ هۆزی دوور پەڕدا، وەكو كوردە سـۆنیەكانی ئەمدی و ئـەودیوی سنووری توركیـا و ئێـران و نێـوان شـارەكانی خـۆی و وان، ئـەو شـایی و شەوارەیەی بۆ لە دایكبوونی منالێكی مێینە دەكرێ، هەرگیز بۆ هی نێرینە ناكرێ.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Henny H. Hansen, *The Kurdish Woman's Life: Field Research in a Muslim Society, Iraq* (Copenhagen: Ethnografiske Kaekke, no. 7, 1961); Henny H. Hansen, *Daughters of Allah: Among MuslimWomen in Kurdistan* (London, 1960); Mohammed Mokri, "Le Mariage chez les Kurdes," *Revue de la Société d'Ethnographie* (Paris, 1962); T.F. Aristova, "Ocherki kul'tury i byta kurdskikh krest'yan Irana" ("A Sketch of the Culture and Way of Life of the Kurdish Peasants in Iran"), *Trudy Etnografii Miklukho-Maklaya* 39 (Moscow, 1958); Paul Magnarella, "A Note on Aspects of Social Life among the Jewish Kurds of Sanandaj, Iran," *Jewish Journal of Sociology* XI.1 (1969); R. Ghirshman, *Iran: From the Earliest Times to the Islamic Conquest* (Baltimore: Pelican, 1954); Ziba Mir-Hosseini, "Impact of Wage Labour on Household Fission in Rural Iran," *Comparative Journal of Family Studies* 18.3 (1987); Walter Fischel, "The Jews of Kurdistan," *Commentary* VIII.6 (1949); Dina Feitelson, "Aspects of the Social Life of Kurdish Jews," *Jewish Journal of Sociology* I.2 (1910); Ziba Mir-Hosseini, "Changing Aspects of Economic and Family Structures in Kalardasht, A District in Northern Iran," unpublished doctoral dissertation (Cambridge: Department of Social Anthropology, Cambridge University, 1980); A. Salar, "A Kurdish Boyhood," *Kurdish Times* IV.1-2 (1991); Basile Nikitine, *Les Kurdes, etude sociologique et historique* (Paris, 1956); Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990); M. Fischer, "On Changing Concept and Position of Persian Women," in L. Beck and N. Keddie, eds., *Women in the Muslim World* (Cambridge, Massachusetts: Harvard University Press, 1978).

**General Bibliography**

Two excellent works on the social psychology of the Kurds and the cultural-environmental roots of their social behavior and organization are Abdul-Kader Amin (collected by), *Kurdish Proverbs* (New York: Kurdish Library, 1989) and Samande Siaband (pen name used by M. Izady), "Mountains My Home," *Kurdish Times* II.2 (1988); Witold Rajkowski, "A Visit to Southern Kurdistan," *Geographical Journal* 107.3-4 (1946); A valuable earlier work is that of C.J. Edmonds, *Kurds, Turks, and Arabs* (London: Oxford University Press, 1957). B. Nikitine, *Les Kurdes. Etude Sociologique et Historique* (Paris, 1956); Henny Hansen's work, *The Kurdish Woman's Life: Field Research in a Muslim Society, Iraq* (Copenhagen: Ethnografiske Kaekke, no. 7, 1961) sheds light on more than the status of Kurdish women, and should prove valuable reading. A more specific bibliography on the social and political organization of the Iranian Kurds is provided in the work of Wolfgang Behn, *The Kurds in Iran: A Selected and Annotated Bibliography* (London: Mansell, 1977); Hanzelka Jiri and Miroslav Zikmund, *Kurdistan: Land der Aufstände, der Legenden und der Hoffnung* (Prague: Artic Praha, 1962); and the *Kurdish Times*, semi-annual journal, Brooklyn, New York, Kurdish Library, 1985-present.

# فەسڵی هەشتەم

## مەسەلە سیاسی و هاوچەرخەكان

### ناسیۆنالیزمی كورد و دەوڵەتی نەتەوایەتی

كوردەكان ئێستا لەناو پێنج دەوڵەتی سەربەخۆدا وەكو كەمینە دەژین، ئەم ژمارەیە گەلێ لە پێنج تێدەپەڕێ، ئەگەر كۆمارەكانی یەكێتی سۆڤیەتی جاران لە قەفقاسیا و ناوەڕاستی ئاسیا سەربەخۆیی تەواو بە دەست بێنن، ڕاستییەكەی، كورد ئەمڕۆ كەمینەیەكی گەورەن لە هەموو ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانەدا كە تێیاندا دەژین. تەنها لەمەدا كورد بە كەمینە نەتەوەییەكانی تر دەچێ، وەرنە، بە گشت پێوانەیەك، كورد گەلێكی بزێو و گەورەی و بە تاك و بە كۆمەڵ نیشانە و مۆركی گەلێكی سەرەكیی ژێر دەست و داگیركاریی بێگانەی پێوە ئاشكرایە، پێكەوە دەرنەبردنی بەردەوامی كوردان لەگەڵ حكومەتە باڵادەستەكانیان و دامەزراندن و هەڵوەشاندنەوەی چەندین پارتی سیاسی كوردی و ئامادەیی یان بۆ بەرپاكردنی ڕاپەڕین و بەرخودان، شەڕو شۆڕ، بانگدانی سەربەخۆیی، هەروەها دەربەدەركردن تێكڕا كورد لە كەمینە ئەتنییەكانی ناو ئەم دەوڵەتانە و گەلێ كەمینەی تری سەر ڕووی زەمینی جیا دەكەونەوە (بڕوانە مێژووی پێش هاوچاخ و ئەم دواییانە، هەروەها دەربەدەركردن و جێگركردنی بە زۆر و پارتە سیاسیەكان).

گەر بەراوردیان كەین، هەمان كۆمەڵە مەرج كە ئەڵمانەكانیان كرد بە نەتەوە (أمة)، هەرچەندێكو ئەوان بەر لە ١٨٧١ هەرگیز بە یەكگرتوویی لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتی ئەڵماندا نەبینراون، لە كوردیشدا هەن، تاقە شتێك كە كورد وەكو نەتەوەیەك نیەتی دەوڵەتی

سەربەخۆیە، ئەگینا بە هەر پێوانەیەکی باو و ستاندەردی تر، کە لای هەمووان قبوولْ بکرێ، کورد نەتەوەیەکی سەرەکییە.

هەموو ئەو کردەوانەی کە دامەزراوە دەوڵەتیە چاك رێکخراوەکان بۆ دروستکردنی نەتەوەیەك کردیان لەو گەلە جیاجیایانەی کە بە میرات بۆیان مایەوە لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەی لەم دواییانەدا بە دەستکرد بۆ دەوڵەتەکانی تورکیا و سوریا و عێراق و ئێران دروستکران، لە بنەکانەوە تۆزقاڵێك کاریان لە کوردان نەکرد، ئەوی ڕاست بێ لەم ڕووەوە، هەر ئەم دەوڵەتانە خۆیان ئەوەی لە دەستیان هاتبێ بۆ بەربەستدانان لە بەردەم گەشەکردنی کۆمەڵگای کوردیدا تا وەکو پێکهاتەیەکی جیاواز و سەربەخۆ نەکا نەشوونما، دریغیان نەکردووە، بەڵکو چیان بۆ کرابێ بۆ ڕووخاندنی سنوور و نیشانە نەتەوەیی و تایبەتمەندیەکانی کردوویانە. بە هەموو تواناوە هەوڵیان داوە ڕابردووی کورد لە گۆڕنێن، هەر جۆرە سیمایەکی ڕەسەنایەتی لە کەلتووری کورددا هەبێ دایڕنن و بیسڕنەوە، و بەربگرن لە هەر جۆرە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەك کە بەدڵ و بەگیان و دڵسۆزانە لە هەر بابەتێك کە بەلای کوردەوە بایەخدار و گرنگ بێ کرابێ سەرەڕای ئەمانەش، ناسنامەی ناڕاست و بێ بنچینەی وەکو "تورکی چیایی" لە تورکیا و "عەرەبی ئومەوی" لە سوریا و عێراقیان (بۆ کوردە یەزیدییەکان) هەڵبەستووە.

بوونیەتی جیاوازیان لە ئێران و ئازەربایجانی سۆڤیەتی و تورکمەنستان بەبێ یەك و دوو وەکو ئاوخواردنەوە ئینکار کراوە، ئەم هەموو کردەوە سەرکوێرکەرانە، تەنانەت کوردەکان خۆیشیانیان خستۆتە دڵەڕاوکێ و سەرلێشێوانەوە.

زۆربەی هەوڵ و تەقەلای ئەو حکوومەتانەی کە ئێستا هەریەکەیان سەروکاری پارچەیەکی کوردستانی بە دەستەوەیە بۆ ئەوە تەرخانکراون ناسنامەیەکی نەتەوەیی سەرانسەریی و کاریگەر دروست بکەن بە مەبەستی داچەسپاندنی یەکیەتیەکی سیاسی و بنیاتنانی دەوڵەتی نەتەوەیی بەو شێوەیەی کە لە ئەورووپا هەن. لە تورکیا و سوریا و عێراق وشەکانی (تورك) و (عەرەب) کە جاران بە مەبەستی گاڵتەجاڕی بۆ دەلالەتکردن لەسەر کابرایەکی کەڕە گوندی و کۆچەری بیابان نشین بەکاردێنرا، ئێستا بە مەبەستی دروستکردنی ناسنامەیەکی نەتەوایەتی هەمەگیر لە پرۆسەیەکی تێکەڵ لە مێژووسازی و زمانبازی ساختەو شتی بێ پایە و مایەدا

ڕەونەقبەخش دەكرێ، ئەوان ڕاستیە مێژووییەكانی تریان لێخن كردووە یان شێواندوویانە، تا بیكەن بە پێگە بۆ برینەوەیەك كە گوایە، "نەتەوە" بەم شێوەیەی ئەمڕۆی لە سەردەمانێكەوە كە لە بیركردنەوە نایەن وەكو بوونێكی یەكگرتوو و ناسراو هەر هەبووە و یەكێك بووە لە بەشداربووە سەرەتاییەكانی فەرهەنگی جیهانی.

لەم وێنە شێوا و و تێكەڵەدا، شوێنی كورد لە كوێیە؟ چونكە زۆر ڕوون و ئاشكرایە كە كورد نە عەرەبە نە تورك، هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ دروستكردنی ناسنامەیەكی ساختە دراون كە بە عەرەب یان تورك دەریان بخەن، نیوەچڵ، شێوا و دەرچوونە و بوونەتە بڵقی سەر ئاو.

لە ئێران، كوردەكان زۆر بە ئاسانی لە بیروبۆچونە پان ئێرانیستەكانی دەوڵەتدا دەگونجێن چونكە كەلتوورو زمانی كوردی لە ڕاستیدا ئێرانین. بۆ حكوومەتی ئێران، مەسەلەكە نەك هەر ئاسانە كە ناسنامەی كورد لە چوارچێوەی خێزانێكی گەورەتری گشت گەلە ئێرانیەكاندا بخوێنێتەوە، بەڵكو ئەو پشتگیریەی لە كوردەكانی دەرەوەی سنوورەكانی خۆی كردوویە، جوغزێكی گەورەی بۆ مەنتیقی پان ئێرانیزم دروستكردوە (نەك هەر مەنتیقی پان ئێرانیزم بەڵكو هەر مەنتیقیكی كە بە بەگوێرەی كات لە بارێ)، لەم ڕووەوە محەممەد ڕەزا شای پەهلەوی لە باسی كورددا، ئەوانی بە "پاكترینی هەموو ئاریایی نەژادەكان و یەكێك لە ڕەگەزە هەرە ڕەسەنەكانی ئێرانیەكان" لە قەڵەم دەدا، لای ئەو و زۆربەی هەڵبژاردەكان، (ئێرانی) لەگەڵ (فارس)دا بێ زیاد و كەم هاو مانا دەهات.

بەگوێرەی بۆچوونی تاران، كوردیش ڕاست و ڕەوان وەكو فارسەكان، بە زمان و بە فەرهەنگ گەلێكی ئێرانیە، جا لەو سەرشێوانەدا كە ئەمڕۆ تەنانەت ناوەندە زانستییەكانیشی گرتۆتەوە، لە بارەی دوو وتەی ئێرانی و ئێرانی نەژادەوە (كە دوو بیرۆكەی بەقەی ئەڵەمان و جێرمانی نەژاد لێك دوورن)، كوردەكانیش لایان لێڵە ئایا زمانەكەیانی لێدەرچێ چی تر هی ئەوانە و ئێرانی نیە، لە كاتێكدا مەبەست لە ئێرانی وا پەیتاپەیتا خەریكە "فارسی" دەگرێتەوە و هیچ سنوورێك لەنێوان هەردوو بیرۆكەكەدا نامێنێ، هەر لەبەر ئەم هۆیە، كابرایەكی كورد لە توركیا و سوریا عێراق و كۆمەنوێلسی دەوڵەتە سەربەخۆكان (سۆڤیەتی جاران – وەرگێڕ) زۆر ئاسان دەتوانێ خۆی لەو گەلانە بگرێت، بەڵام لە ئێران مەسەلەكەی وا بۆ نالوێ.

جیاوازیەکی گەورەی دیکە کە لەنێوان ئێران و دەوڵەتەکانی تردا لەم ڕووەوە هەیە ئەوەیە کە کوردەکانی ئێران خاوەنی دووروو درێژن وەکو بەشێك لە دەوڵەتی ئێران، لە کاتێکدا هەرچی دەوڵەتەکانی سوریا و عێراق و تەنانەت تورکیاشن، ئەوان دەستکردی دەسەڵاتە کۆلۆنیالیە ئەوروپییەکانن و تەنها دوای جەنگی دووەم لەسەر کەلەکەی لاشاکی دەوڵەتی عوسمانلی دروستیان کردوون و بەر لەو، هیچ وڵاتێك بەو ناوانە لە ناوچەکەدا نەبوە، و تەنها لەبەر ئەوەی بوونی دەوڵەتیکی کوردستانیی سەربەخۆ بۆ بەرژەوەندی کاربەدەستە کۆلۆنیالیە ئینگلیز و فەرەنسیەکان دەستی نەدەدا، کوردان پەسترانە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتە تازە دروستکراوانەوە، هەرچی کوردەکانی ئێرانن، ئەوان هەر نەبێ لە سەدەی شانزەیەمەوە لەناو سنووری دەوڵەتی فارسدا ژیاون، تەنها جیاوازی لە مەسەلەکەدا ئەوەیە، ناوی دەوڵەتە کە لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە لە وڵاتی فارسەوە بوە بە ئێران.

گەلێ کەسایەتی گەورەی نیشتیمانی لە کوردانی نەتواوە لە ئێراندا هەڵکەوتوون، چ لە سەردەمی ئێستامان و چ لە ڕابردوودا. سەرۆکایەتی گەورەترین و بە هەیبەتترین پارتی سیاسی لە ئێران پێش بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی، واتە جەبهەی میللی (کە لەلایەن دوکتۆر محەممەدی مسەددیقی سەرۆك وەزیرەوە دامەزراوە)، لە دوو دەهەی ڕابردوودا بەدەستی کەریمی سنجابییەوە بوە کە کوردێکی کرماشانیە. نەك هەر ئەمە، گەلێ کەڵە نووسەر و هونەرمەند و کەسایەتی کۆمەڵایەتیش، کە لەسەر ئاستی نیشتیمانی خاوەنی پلە و پایەی بەرزبوونە، بە نەتەوە کورد بوونە، ئەمانە بە پەیژەی پایەدا بۆیە سەرکەوتوون چونکە ڕێبازی پان ئێرانیستییان گرتۆتە بەر نەك هی کوردایەتی، ئەگەر وایان نەکردایە، ئەوا دەکەوتنە بەر تیری تۆڵە و ئەفەرۆز کردن لە کۆمەڵگا.

ئەوان تەنها نزیکەی ١٢٪ی گشت دانیشتوانی ئێران پێکدێنن و هیچ دەرفەتێکیشیان بۆ لەمە زیاتر بوون لەبەردەمدا نیە (بڕوانە دیموگرافیا).

لەپاڵ ئەمەشدا وەکو دانیشتوان بەسەر دوو هەرێمی لێکدابڕاودا دابەشکراون: کوردستان و تیلماسکی کوردنشینی خۆراسان کە شەش سەد میل لێکەوە دوورن، جگە لە چەندین پەڵە و پارچەی تر کە بەدەورووبەری چیای ئەلبورزەوە هەن. سەرباری ئەمانە، جیاوازی هەرێمیی کوردانی ئێرانی بەجۆرێك لێکدابڕیوە کە ناتوانن لە تاران یەکدەنگیەك بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانیان پێك بێنن، (بڕوانە دابەشکراوی ناوخۆی).

لە عێراقیش كوردێكی زۆر گەیشتونەتە پلە و پایەی بەرزی سیاسی، و جێگری چەندین سەركۆماری عێراق كورد بوونە، لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئێستای عێراق تەمەنێكی ئەوتۆ درێژی نیە لە مێژوودا (ئەم دەوڵەتە ساڵی ١٩٣٢ پاش كۆتایی هاتنی خاوەنداریەتی[5] بریتانیا دروست بوە) و لەبەر نەبوونی دەستەیەكی هەڵبژاردەی سیاسی بەهێز و جێ پێ قایم، ڕژێمە یەك لە دوایەكەكانی عێراق هەرگیز بەو دارەتەدا نەچوونە كە نوێنەری گرووپە ئەتنیەكانی تر لە دەسەڵات دوور بخەنەوە، سونیە عەرەبەكان كە لە سەردەمی سەریەخۆییەوە جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوە، تەنها ١٨٪ی كۆی دانیشتوان پێكدێنن، و ئەم ڕێژەیە گەلێ لە هی كوردەكان خوارترە (٢٣,٥٪)، كوردێك دەتوانێ بە كوردی بمێنێتەوە و پایەی بەرزی سیاسی و كۆمەڵایەتیش وەرگرێ ئەگەر بەدڵ و گیان لایەنگیری حكوومەت بكا زۆر كوردیش پۆستی یەكجار باڵای سەربازیی وەرگرتووە: نوری سەعید، جەعفەر عەسكەری، بەكر صدقی، بەهائەددین نوری، ئەمین زەكی و هی تر! ! تەنها پۆستەكانی بازنە تەنگەكانی هەرە ناوەوەی دەوڵەت، (بە پۆستە هەرە بەرزە سەربازیەكانەوە)[6] بۆ سونیە عەرەبەكان پاوان كراوە، ئەمەش زیاتر لە هەستی خۆپارێزی و خزم خزمێنەوە پای گرتوە نەك شۆڤینیەتی نەتەوەیی.. هیچ بیر و بۆچوونێكی دەوڵەتی وا لە ئارادا نیە كە لەسەر بنەمای سەر بە گرووپێكی ئەتنی بوون، بەر لە پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی هیچ كەسێك بگرێ، ئەو پان عەرەبیزمەی كە جار ناجار لەلایەن كاربەدەستانی بەغداوە دەكرێ بە دروشم، زیاتر گوفتارە نەك ڕەفتار، هێرشەكەی ئەم دواییەی سەركوێتی برای عەرەب لەلایەن عێراقیە "عەرەبە"كانەوە باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم بۆچوونە (لەگەڵ ئەوەی نزیكەی ١٥٪ی ئەو سەربازانەی لەم هێرشە بەكارهێنران، وەكو ئەیزانین سەربازی گیراوی كورد بوون).

تەنانەت سەرۆك سەدام حوسەین، كە بەدڕندەیی ناوی زڕاوە، نە كوردەكان و هیچ كەسێكی تری لەبەر ئەوە نەداوەتە بەر ڕێژنەی سزادان و تۆڵە چونكە كورد بوونە، بەڵكو زیاتر

---

[5] (دوكتۆر كەمال مەزهەر "قەیموومەت"ی بۆ نینتداب بەكارهێناوە. خاوەنداریتی لە كۆمەڵگای كوردیدا بۆ ئەو سەرپەرشتیە بەكارهاتووە كە كەسێك بۆ یەكێكی دەكا كە خۆی بێ داشداری تواناى بەسەربردنی ژیانی نیە، هەر بۆیەشە من بەكارم هێناوە. با هەردوو وشەكە لە فەرهەنگی كوردیدا هەبن، كامیان ما ئەوا شاباش، كامیانیش مرد، خوای لەگەڵ — وەرگێڕ.

[6] چەندین كوردیش پۆستی یەكجار سەربازیان وەرگرتووە لەوانە نووری سەعید، جەعفەر عەسكەری، بەكر صدقی، بەهادین نووری، ئەمین زەكی و هی تر (دوكتۆر كەمال مەزهەر).

لەسەر ئـەوەی کـە ڕووبـەڕووی ڕژێمەکـەی وەسـتاونەتەوە، ئەنـدامانی خێزانەکـەی خـۆی یـان عەترەشەکەی (تکریتیەکان) گەر گومانی نادڵسۆزی لێ بکرێ، بێ جیـاوازی بـەرەنگاری هـەمان چارەنووسی کابرایـەکی جوتیـاری دانیـشتووی قـووڵایی چـیاکان دەبێتـەوە گـەر بکەوێتـە نـاو کەوانەی گومانەوە.

دوا ڕۆژی کوردەکانی عێراق هیچ ڕوون نیە، هێنانەوەی وڵاتەکە بۆ بـارودۆخی خـۆی وەکـو وڵاتێکی تەواو سەربەخۆ و سنوور سەلامەت و ئەندامێکی بێ کـەلێنی کۆمـەڵگای نێونەتـەوەیی سەردەمێکی زۆری دەوێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی کوردەکان ماوەیەکـە یـان لـە دەرەوەی دەسـەڵاتی ڕاسـتەوخۆی بەغدا، یان بەتەواوی سەربەخۆ (لە مارتی "١٩٩١"ەوە) دەژین، زۆر زەحمەتـە مـرۆڤ بـیر لـەوە بکاتەوە کە کوردە دەست سووتاوو وریا بوەوەکانی عێراق ئامادەبن جارێکی تر بـچنەوە ژێـر دەسەڵاتی بەغداوە، ئەوان ئەمەیان بەو کۆڕەوە دووپات کردەوە کە ساڵی ١٩٩١ پـاش ئـەوەی بەغدا بەتەمابوو دیسانەوە بیانخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، دووپات کردەوە.

پاش نزیکەی ساڵێك لەسەربەرخۆیی لەناوچە "ڕزگارکراوەکان"ی عێراقـدا، پارتـە سیاسیە کوردیەکان دیسانەوە ئەم دەرفەتەیان لە دەسـت دا تـا بـۆ جیهـانی دەرەوەی بـسەلمێنن ئـەوا کوردسـتانێکی ئۆتۆنـۆمی یـان سـەربەخۆ، بیرۆکەیـەکی واقیعییـەو گـەر کوردەکـان بهێڵرێن، دەتـوانن یاسـا و دەوڵـەتیاری و سەراسـوێیی پێویـستیەکانی هاوڵاتیـانی ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـان بکـەن. تۆمـاری کـاری سـاڵێکیان لـە حوکمدا بریتیـە لـە زنجیرەیـەکی داخ ئاوەری سەرنەکەوتوویی لـە ڕاپەڕانـدن و بـەڕێوەبردنی ئـابووری هەرێمەکـە لـە کاتێکدا ئـەوان سەرقاڵی ناکۆکییە سیاسیە ناوخۆییەکانیان بوون، ئێمنایەتی خەڵکەکە هەر بە تەواوی خرابـوە پـشت گـوێ و قاچاخـچیەتی بووبـوو بـە پیـشەی سـەرەکیی. گـەر بێتـو خۆبـەڕێوەبردن بـۆ کوردەکانی عێراق بکرێ بەڕاستی، ئەوا گومان لەوەدا نیە کە ئەو کارە پێویـستی بـە زیـاتر لـەو توانا سیاسی و دیبلۆماسیەیە، کە ئێستا لەوێ هەیە[7].

بیرۆکەی ناسنامەیەکی کوردی، چۆن لە ڕابردوودا لەگەڵ ئیدیۆلۆجیای دەوڵەتدا ناکۆك بـوە لە تورکیا، لـە دوا ڕۆژیـشدا هـەر وادەبـێ، ئەگـەر ناوەکـانی (عێـراق)، (ئێـران)، (سـوریا) هـیچ

---

[7] لەم بۆچوونەدا دوکتۆر میهرداد کەوتۆتە هەڵەوە ڕاستە لـە سـاڵەکانی سـەرەتادا ناوچـەکە گـیرو گرفـت و ململانێیـەکی زۆری بـە خۆوە دیت، بەڵام لەم دواداوییەوە هەرێمەکە بەشایەدی یار و نەیار بوو بە شتێکی نموونەیی بۆ هەموو دەرو دراوسێ – وەرگێڕ.

ڕەنگوبۆیەكی ئەتنی نابەخشن بە دەوڵەتەكانیان، ناوی (توركیا) دەیبەخشێ، بە مانادانەوە (توركیا) واتە (سەرزەمینی توركان)، لەبەر ئەوە گەر كوردەكانی توركیا خۆیان بە "كوردی تورك" بناسێنن، ئەوا ناكۆكییەكی مەنتیقی لە مەسەلەكەدا دێتە پێشەوە، چۆن توركێك دەتوانێ ببێ بە كورد؟ دەبێ ئەوانەی سالآنی ١٩٢٤–١٩٢٥ داكۆكییان لە ئەنەدۆڵیەت دەكرد ئەمەیان لە بیردا بووبێ (بڕوانە Andrews ١٩٨٩) ئەوان ئەوەندەی بە تەنگی بیروبۆچوونە پان توركیزمە فراوانەكەی خۆیانەوە بوون، بە تەنگی كورد و كەمایەتیە ناتوركەكانی ترەوە نەبوون، ئەوان بەو گوفتارەوە بەم بابەتەیاندا هەڵدەدا كە وشەكانی (تورك) و (توركیا) هەموو گەلە تورك ڕەگەزەكان و هەموو ئەو سەرزەمینانەش دەگرێتەوە كە ئەوان لەسەری دەژین واتە سەرزەمینیی ئەفسانەیی توران. ئەوان دەیانگوت "ئێمە ئەنەدۆڵین، ئەنەدۆڵ نیشتیمانمان و گەلەكەمان گەلی ئەنەدۆڵە" (Tachao١٩٦٢–٦٤–٨)، مەبەست و ئامانجی ئەوان هەرچیەك بووبێ، ئەنەدۆڵ، كە ناوی كەسی پێوە نیە لە ڕووی ئەتنییەوە، دەیتوانی لەو ڕادیكالیەت و شۆفینیەتە ئەتنییە بیانبوێرێ كە لەناوی توركیاوە وەكو ناوی دەوڵەت كەوتەوە.

بە نیشانەی ئاگاداری لەو نارێكیەی كە هەردوو ناوی ئەتنیك تەباری (توركیا) و (تورك) دەیروژێنن، دەستووری سالی ١٩٨٢ی توركیا لە برگەی (٦٦)یدا دەریدەخا كە "تورك ئەو كەسەیە كە بە شەتەكی هاونیشتیمانیەت لەگەڵ دەوڵەتی توركدا گرێ دراوە" لێرەدا باسی پەیوەندی ئەتنی نەكراوە و لە بارەی یاساوە وشەی تورك، دەتوانێ ڕۆڵەی هەموو پێكهاتە ئەتنییەكانی تریش، بە كوردیشەوە، بگرێتەوە. تەنها لە ڕووی پراكتیزەكردنەوەیە، كە هێشتا كار بەو جۆرە دەكەوێتەوە، كە تەنها ئەوانەی بە نەتەوە توركن لە توركیا دەژین یان بۆیان هەیە بژین. بۆ ئەم مەبەستە، پارلەمانی توركیا سالی ١٩٣٠ یاسایەكی دەربازكرد كە زمانی كوردی قەدەغەیە بەكار بێ لە كاروباری وەكو بەردەم دادگا، بلآوكردنەوە، پەروەردە و پەخشی ڕادیۆییدا. سەرپێچی كردن لەو یاسایە، سزای زیندانی كردنی بەدواوە بوو، قەدەغەكاریەكە بەشێوەی جیاواز و جۆراوجۆر بەكاردەهێنرا و لە هەندێ شوێن و بۆنەدا تا یاساخكردنی قسەكردن بە كوردیش دەڕۆیشت، ئەم یاسا زۆردارانەیە، كە بە ئاسانی جێبەجێ نەدەكرا، سالی (١٩٥٠) نەختێ خاو كرایەوە، كاتێك كە كزیی لەسەرخۆی باری دیموگرافیی كورد (لە بەرامبەر ناكوردەكاندا) شێوازێكی هەڵخەڵەتێنەری دایە توركەكان كە گوایە

کوردەکان لە توانەوەدابوون (بڕوانە دیمۆگرافیا). کاتێك کە دەوڵەتی تورکیا، لەوە وریا بووەوە کە ئەو وێنەنمایە وا دەرنەچوو، لە ناوەڕاستی (١٩٦٠)کاندا کەوتەوە هەمان شێوەی توندکاری و لە (١٩٧٠)کان و بە تایبەتی لە (١٩٨٠)کاندا گەلێ سەختگیرانەتر کەوتەوە کار.

لە کانوونی یەکەم (دیسەمبەر)ی (١٩٩٠)ەوە تا مارت (مارس)ی ١٩٩١، یاسایەکی تر لەلایەن سەرکۆمارەوە پاش دەربازبوونی لە پەرلەمان ئیمزاکرا کە دیسانەوە ڕێگای ئاشکرای بە زمانی کوردی دایەوە، دوای ئەوە کەمێك بڵاوکراوەی کوردی بە ڕۆژنامەشەوە لەوێ دەرکەوتن (بڕوانە زمان، ئەدەب و چاپەمەنی). ئەمانە ئەو هەنگاوە هەرە پۆزەتیف و بوێرانانە بوون کە لە ساڵی (١٩٥٠)وە بۆ ئاشتبوونەوە و پێکهاتنەوەی دوو پێکهاتە سەرەکیەکەی ناو کۆماری تورکیانران ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە کاروباری پەیوەندیدار بەم بابەتەوە دەتوانێ بە هەنگاوی خێراتر پێش بکەوێ لە بەرژەوەندی کوردەکانی ئەو وڵاتەدا و هەموو پرۆسەکەش بە ئاشتی و تەبایی بێشە دەستەوە.

ئێستا لەناو تورکیادا مەسەلەیەك بە باشی تەقیوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە (١/٥)ی ئەندامانی پەرلەمانی ئەو وڵاتە کوردن، کەسایەتی گرنگی بواری سیاسەش، سوپا، و هەر بوارێکی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتی تورکیا لە کوردان پێکدێن، لەمانە هەندێکیان تا لە چارەنووسی خۆیان دڵنیابن تواونەتەوە (بڕوانە ئاوێتە بوون و تێکداتوانەوەوە).

بەڵام هەموو بەڵگەکان ئەوە نیشان دەدەن کە زۆریەیان نەتواونەتەوە، ئەوان دڵنیا کراونەتەوە کەوا گەر هیچی تر لە بارەی پەیوەندی ئەتنیکیی خۆیانەوە نەودکێنن، ئەوا هیچ ئاستەنگێکیان نایەتە ڕێ، بەو ناسینە ڕەسمییەی ئەم دواییەی زمانی کوردی، ئەنقەرە خۆی وشەی کوردی خستەوە جێی شایستەی خۆی، ئەمە دەتوانێ زۆر باش ئەوە دەرخا کە ئەنقەرە لێکدانەوەی خۆی بۆ ئەو برگەیە لە دەستووری وڵاتەکەدا کە دەڵێ: "وشەی تورك هەموو هاووڵاتیەکی دانیشتووی تورکیا دەگرێتەوە"، بەرفراوانتر کردۆتەوە.

ئەم هەنگاوە کە بەرەو سیستەمێکی زیاتر یەکسان لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە نراوە، لەوانەیە نەتوانرێ خۆی لێ ببوێررێ، بۆ گەلێك کە بەرەو گەیویی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەنگاو دەنێ، لە هەمان کاتدا مرۆڤ دەبێ بیر لەوەش بکاتەوە کە ئەگەر لە دوا ڕۆژدا تورکیا لە کۆمەڵەی ئەورووپادا وەربگیرێ، زۆریەی ئەو کوردانەی کە ئەمڕۆ لە ژیاندان لەگەڵ ئەو وڵاتەدا

دەچنە ناو ئەو ڕێکخراوەیەوە چارەنووسی خۆیان زیاتر دەخەنە چنگی بروکسل و ئەنقەرەوە، ئەگەر دەست بەڕووی ئەنقەرەوە لەلایەن ڕێکخراوەکەوە بنرێ، لەوانەیە ڕێگاکە هەندێ دوورتر و سەختربێتەوە، بەڵام ئەو هەنگاوی دیموکراتیزەکردنەی کە لە (١٩٩١)ەوە هەڵنراوە، مژدەی دوا ڕۆژێکی پرشنگدارتریان بۆ کوردەکانی تورکیا پێوەیە.

ڕەفتاری دەوڵەتی سوریا لەگەڵ ناسنامەی ئەتنی کوردی ئەو وڵاتەدا، لەنێوان دووتای تەزاروودا هەمیشە بەرزو نشێوی کردوە، لە پشتگیری و دەست بەپشتدا دانەوە لەو کاتەدا فەرەنسیەکان خاوەنداریەتی ئەو وڵاتەیان دەکرد، بۆ بە توندی و دڕندەیی یەکسان لە ئازاردان و دەربەدەرکردندا لەلایەن حکوومەتی سەربەخۆی پێش هاتنە سەرکاری سەرۆك ئەسەدەوە لە ساڵی ١٩٦٨دا. ئەسەد تا ڕادەیەك لە ڕووی ڕەفتارکردنەوە لەگەڵ نەتەوەکانی تردا نەختێ پشوو درێژتر بوو.

ئەم گۆڕانەی ئەم دواییە دوو هۆی سەرەکیی هەبوە، یەکەم وێ دەچێ لەوە گەیشتبێ کەسێ پارچەکەی کوردستانی سەر سنوورەکانی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی سوریا لەگەڵ تورکیا و عێراقدا هەڕەشەیەکی ئەوتۆ بۆ دەوڵەتەکەی پێك ناهێنن، لە کاتێکدا دەکرێ کوردەکان بکرێن بە دڕك بۆ بن پێی تورکیا و عێراق، ماوەیەکی زۆر بۆ دەربڕینی ناسنامەی کوردی و دراوە، هەڵبەت هەمیشە لەژێر چاوەدێری توندی دەوڵەتدا. دووەم حکوومەتەکەی ئەسەد کە نوێنەری کەمینەیەکە لە سوریادا، واتە عەلەویەکان، بۆ پارسەنگ پێویستییەکی زۆری بەدڵدانەوەی گرووپە ئەتنییەکان هەیە، تا بتوانێ داری دەوڵەت ڕاست ڕاگرێ، بەهەرحاڵ، باروذۆخی کوردەکانی سوریا، لە هەڵکشان و داکشاندا دەبێت، بەگوێرەی بزووتنەوەی کوردەکانی سەر سنوورەکانی سوریا و هەڵوێستیان بەرامبەر بە سوریا.

لە یەکیەتی سۆڤیەتی جاران، کوردەکان تەنها لە پەڵەپەڵەی دوور لە یەکدا دەژیان، و زۆریەیان بە سنوورەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەندیەوە بوون. کوردەکانی ناو کۆمارەکانی ئەرمەنستان و گورجستان، کە تەنها چەند دە هەزار کەسێك دەبوون و نابوون، هەر لە کۆنەوە ئاستێکی بەرچاوی سەربەستی فەرهەنگیان هەبوە، کەچی لە کۆمارەکانی ئازوربایجان و تورکمەنستان دووچاری ئاوارەکردن و ئینکارکردنی ناسنامەی نەتەوەیی بوونە، ئەم باروذۆخە،

لەوە ناچێ لە دوا ڕۆژیشدا بەرەو باشتر بگۆڕێ هەرچەندە ئەم تازە دەوڵەتانە سەربەخۆییان دەست کەوتەوە.

کوردەکان لە بەرنگاربوونی پارچە پارچەیی و لێکڕەوانەوەی زیاتر بە ئاقاری جیاوازی کۆمەڵایەتی و کەلتووریدا لەنێوان لەتەکاندا، و لە بەرامبەر ئینکارکردنی ڕاشکاوانەی مافە نیشتیمانی و نەتەوەیی یەکانیدا، بوونەتە گەلێکی یەکجار سیاسیە — تاوی و دڕ، و هەمیشە لە ململانێ دان لەگەڵ حکوومەتە ناوخۆیی یەکاندا و دژ بەیەکن، لەناو خۆیاندا، بوونی پڕ مەترسی و نادڵنیایان بەسەر هەرێمە سنووریەکانی ئەم دەوڵەتانەوە، چەند جار بۆتە مایەی ماڵوێرانی و لێقەومان و کەوتنە ژێر پێوە، ئەوان کە هەزاران ساڵە وەکو هێزێکی سەرەکی ڕۆژەڵاتی ناوەڕاست هەن، و سەرەڕای لەتلەتی و پارچەپارچە بوونیان، هێشتا هەر وەکو هێزێکی زیندووی لە توانەوەوە و سڕینەوە نەهاتوو هەر لە مەیداندان.

لەگەڵ هەرەسهێنانی یەکیەتی سۆڤیەت و دامەزراندنی چەند دەوڵەتی سەربەخۆ لە ناوچەکەدا، ئێستا وا کوردەکان بۆیان دەردەکەوێ کە سنووورە نێودەوڵەتیەکان وەکو جاران نەگۆڕ نین، بە تایبەتی لەنێوان ئەو وڵاتانەدا کە بە دەوریانەوەن، باوردۆخی شل و شاویی لە وڵاتانی ئۆراسیا هەر لە سلۆڤینیاوە بیگرە تا دەگەیتە کۆریا و یەمەن ئەوە دەردەخا کەوا گەلێ شتی واهەیە، کە جاران لە کردن نەدەهاتن، ئێستا لە گویندان بێنەکایەوە، ئەو گۆڕانانە جاران بەهیچ جۆرێك ڕێی هاتنەدییان نەبوو، ئێستا لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە بوونە بە بابەتی ڕووتینی و سروشتی. لەم چوارچێوەیەدا، گرووپە نەتەوەییەکان و مافە بنەڕەتیە مرۆڤ و نیشتمانیەکان، بە سەربەخۆییشەوە هی ئەوەن بخرێنە بەردەست و بێنەدی.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Ismail Besikci, "State Ideology and the Kurds," *Middle East Report* (July-August 1988); Peter A. Andrews, *Ethnic Groups in the Republic of Turkey* (Wiesbaden: Ludwig Reichert, 1989); Sureya Bedir Khan, *The Case of Kurdistan Against Turkey* (Philadelphia: Kurdish Independence League, 1928); F. Tachau, "The Search for National Identity among the Turks," *Die Welt des Islams* 8 (Leiden, 1962); Martin van Bruinessen, "Kurdischer Nationalismus und Sunni–Schi'i Konflikt," in *Geschichte und Politik religiöser Bewegungen im Iran, Jahrbuch zur Geschichte und Gesellshchaft des Mittleren Orients* (Berlin/Frankfurt, 1981); Ferhad Ibrahim, *Die Kurdische Nationalbewegung im Irak: eine Fallstudie zur Problematik ethnisher in der Dritten Welt* (Berlin: Klaus Schwarz Verlag, 1983); Christiane More, *Les Kurdes Aujourd'hui: Mouvement National et Partis Politiques* (Paris: Editions l'Harmattan, 1984); Theodore Nash, "The Effect of International Oil Interests upon the Fate of Autonomous Kurdish Territory: A Perspective on the Conference at Sèvres, August 10, 1920," *International Problems* 15, 1-2 (1976); McDermott and Short, *The Kurds* (London: Minority Rights Group, 1975); U.S. Helsinki Watch Committee, *Destroying Ethnic Identity: The Kurds of Turkey* (New York: USHWC, 1988).

# جیۆپۆڵەتیکا

جیۆپۆڵەتیکای کوردستان بۆتە کۆسپێکی کاریگەر و گەورە لەبەر پێکهێنان و چەسپاندنی قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردی لەم سەدەیەی ئێستادا. بەم باروبۆخەی ئێستایەوە کە پێنج سنووری نێودەوڵەتی بەجەستەیدا ڕەت دەبن، کوردستان لەم (٧٤) ساڵە ڕووداواویانەی ئەم دواییەوە بوە بە بەرجەستێکی سروشتیی لەبەردەم هێڵەکانی پێشەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە قەفقاسیا، بەلام بەلێکهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت، کەس نازانێ سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست چیان بەسەر دێ، لە کاتێکدا کوردستان هەر بەناوچەی لێك جیاکەرەوەیی دەمێنێتەوە.

لەناو گشت گرووپە ئەتنیکیەکانی دیکەدا کورد وای بۆ هەڵکەوتووە کە تاقە گرووپی ئەتنی بێ لە جیهاندا کە چ گەل چ وڵاتی بەشداریی بێ ئاگابن لە چوار پێکهاتەی جیۆپۆڵەتیکی گرنگ و بەیەك نەیاری جیهانییدا: جیهانی عەرەب (لە عێراق و سوریا)، ناتۆ (لە تورکیا) پەیمانی وارسۆوبلۆکی سۆڤیەتی (لە قەفقاسیای سۆڤیەتییدا) و بلۆکی باکووری ئاسیا ناوەندی ئاسیا (لە ئێران و تورکمەنستانی سۆڤیەتییدا). کورد و چارەنووسی لە سەدەی (٢٠) داوای بۆرێککەوتووە لە چوارچێوەی سیاسەتی هێز بازی نێوان ئەم بلۆکە جیهانیانە و بزووتنەوەی بەرژەوەندیەکانیاندا بخوێنرێتەوە.

ئەگەر هێزە دەوڵەتیەکان بێتو یارمەتی کوردەکان بدەن بۆ وشار خستنە سەر ئێران، ئەوە فشاری نا ڕاستەوخۆ، بەلام ترسناکی بۆ باڵی ڕۆژهەلاتی تورکیا لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا لێدەکەوێتەوە و لەوێشەوە تەشەنە دەکا بۆ ئاسایشی وڵاتەکانی ناتۆ، پشتگیریی کردنی کوردەکانی عێراق، بەشێوەی ناڕاستەخۆ یارمەتیدانی ئێران و سوریای بە دواوەیە لە دوژمنایەتی کۆن و بەردەوامیان بەرامبەر بە بەغداد و ئەمەش دەبێتە مایەی نیگەرانی بۆ تورکیا. بلۆکی عەرەبی، بەهەرحاڵ، پێی ناخۆشە کەمایەتیە نا عەرەبەکانی سوریا یان عێراق لەلایەن هێزە دەرەکیەکانەوە بلاوێنرێن. بۆ ڕۆژئاوا، پشتکردنی تەواو لە کوردەکان ئەوەی دەگەیاند، کە بە زۆر بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت بیانڕەتێنێ، یاخۆ بیانخاتە باوەشی

تیرۆریزمەوە، کاتێ کە هیچ ئەلتەرناتیڤێکی تریان بۆ برەودان بە مەسەلەکەیان بەدەستەوە نەمێنێ. هەرەسهێنانی یەکیەتی سۆڤیەت، ئەم کارتە باکووریەی لە دەستی سەرکردە کوردەکان دەرکرد، بەڵام بارودۆخی دەڵەمە ئاسای ئێستا، لەوانەیە بچێتەوە سەر دۆخی جاران، یان شێوەی نوێ و نائاسایی بگرێتە بەر.

کوردستان وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی ئاو، لە رۆژهەڵاتی ناوەراستی وشك و بێ ئاودا بایەخێکی یەکجار زۆری بۆ ئەو وڵاتانە هەیە کە ئێستا هەر یەکە بەشێکی ئەم وڵاتەیان بە دەستەوەیە، لە کاتێکدا، نزیکەی هەموو سامانە ژێر زەمینییە نەوتیەکانی تورکیا و سوریا لە کوردستانن، لە عێراقیشدا کێڵگە نەوتیەکانی پیرە کەرکووك نزیکەی سێ یەکی هەموو سامانی نەوتی ئەو وڵاتەیان تێدایە (بروانە سامانە سروشتیەکان: نەوت).

ئەوەی راست بێ، ئەم خەمە ئابووریە گەورانە بوون کە بریتانیایان پاڵنا تا ئەو پرۆسەیە ببزرکێنێ کە پەیمانی سێڤەر پاش جەنگی جیهانی یەکەم بە ئاراستەی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ داینابوو، هەر لەبەر گرنگی ستراتیژی و ئابووری هەرێمە نەوتجارەکانی کوردستانی ناوەندبوو، بەریتانیا تێکرا خستنیە ناو عێراقی ژێر خاوەنداریی خۆیەوە و لە بەرامبەردا شانی بۆ تورکیا نسلێ کرد دەست بەسەر بەشەکانی دیکەی کوردستاندا بگرێ (بروانە مێژووی هاوچەرخ).

تەگەرەیەکی تری پێش حەسانەوە و بە مراز گەیشتنی کوردان ئەوەیە دۆستێکی ساخ و راستیان لەپاڵیان نزیکی خۆیانەوە نیە، گرنگی دۆستی ئەوهامان کاتێك باش بۆ دەردەکەوێ کە کورد لەگەڵ فەلەستینیەکاندا بەراورد بکەین کە عەرەبێکی زۆری تریان بە دەورەوەیە و تێکرا پشتگیرییان لێدەکەن و مەسەلەکەیان بووە بە ئامانجی سەرەکیی بزووتنەوەی عەرەب. کوردەکان هیچ پەیوەندییەکی ئەتنیکییان بەدراوسێ سەربەخۆکانی دەوروبەریانەوە نیە... ئەوان قوربانی مەوقیعی ستراتێژی خۆیان و خواست و قازانجە جیۆپۆڵەتیکیەکانی دەوڵەتانی دیکەن، ئەوان لە چارەیان نووسراوە، چ لەناوەوە، چ لە ئاستی جیهانی، هەمیشە بێ دۆست و یارین.

لە هەمان کاتدا کوردەکان دووچاری جۆرە دابەشبوونێکی تریش بوونە بەوەی لەناو چەند بلۆکی جیۆپۆڵەتیکی جیاوازدا گیرساونەتەوە کە هەر یەکەیان کەلتووریکی تایبەتی دەوڵەت و

دیدێکی دەوڵەتیارانەی ئەتنی تەبار، یان کەسایەتی تەباریان هەیە و کوردەکان بە جۆرێك کەوتوونەتە داوی ئەمانەوە کە دەرفەتی دەربازبوونی تەواویان بە ئاستەم بۆ هەیە، ئەوەتا ئەمڕۆکە کوردەکانی ڕۆژهەڵات و باشوور شوورەی ئیدیۆلۆژیای ئیسلامیی دێرین هەوای ئێرانیان بۆ کێشراوە و هەرچی کوردەکانی عێراق و سوریان ناچارن بەدوای کەلەپووری کۆنی خۆیاندا بگەڕێن و بەوە بوونی خۆیان بپەڕێننەوە لەژێر باری گرانی ئەنگێزەی عەرەبچیەتی ڕادیکاڵی ئەم دوو دەوڵەتە دژ بە ڕۆژاوەیەدا، لە ئەنەدۆڵ، فەرهەنگ و کەلتووری کوردی بەرەنگاری تورکیایەك بووە کە خاوەنی دیدێکی باشوور ڕۆژهەڵاتی ئەوروپایی و حکوومەتێکی مودێرنخوازی ڕۆژاوا خوای یەکجار سەختگیرە.

هێزە کەلتووری و ئابووری و سیاسییەکان هەریەکە لە پارچەکانی گەلی کورد بەلایەکدا بکێش دەکەن، گەر ئەم بارە ماڵوێرانکەرە نەوەستێنرێ، بۆی هەیە لە مەودای دووردا، ناسنامەی نەتەوەیی و یەکیەتی فەرهەنگیی کوردەکان هەڵتەکێنێ و ئەم پیرە گەلە دێرینە، بکا بە چەند گەلی نوێی جیاجیا.

بەرەچاوگرتنی ئەو سوودانەی دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستیان دەکەوێ یان ئەو ئەرکانەی دەکەونە سەرشانیان، ئایا چی لێ دەکەوێتەوە ئەگەر کوردستان بگا بە سەربەخۆیی نیمچە یان تەواو؟ ئایا دەرەنجامە جیۆپۆلەتیکی و ئابووری و کومەلایەتیەکان بۆ ئەو دەوڵەتانە کە دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان لەو خاکانە پێك بێ کە ئێستا بەشێکن لە خاکی ئەوان، چی دەبن؟ ئایا لەو حاڵەدا کێ براوە دەبێ و کێ دۆڕاو؟

با لە تورکیاوە دەست پێ بکەین، کە ئیمڕۆ زۆربەی کوردەکانی تێدا دەژین، ئایا ئەگەر دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد لەسەر ئەو خاکانە دابمەزرێ کە ئەمڕۆ زۆربەی دانیشتوانیان کوردن، کۆماری تورکیا لە ڕووی ئابووری و کومەلایەتی و نێودەوڵەتیەوە لە ئێستای باشتر دەبێ یان خراپتر؟ کوردستان لە ڕووی ئابووریەوە دواکەوتوترین بەشی تورکیایە و کومەڵگاکەشی لە هەمووی پارێزگارتر و سستتر و لە ڕووی پەروەردەشەوە کزترە و گەلێکیش کەمتر لە تورکیای ئەوروپایی یەکگرتوو ترە، مەسەلەکە وردکردنەوەی زۆری نەگەرەکە گەر بڵێین لە دەستدانی ئەو هەرێمە و خەڵکەکەی بۆ تورکیا، تەنیا لە کۆڵ بوونەوەی بارێکی گرانە. نەك هەر ئەمە، ڕاستیەکەی ئەوەیە، تورکیای نیوە دوورگەیی بە لەدەستدانی کوردستان لە

ڕووی کۆمەڵایەتی و دیموگرافیا و ئابووری و مێژووییەوە، دەبێ بە یەکێک لە وڵاتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا گەر زیاتر نەبێ، بێ هیچ گومانێک ئەم وڵاتە گەر کوردستانی تا بلێی هەژار و ئاسیایی سرووشتی لێ بقرتێنرێ، بێ تەگەرەیەکی ئەوتۆ لە کۆمەڵەی وڵاتانی ئەورووپادا وەردەگیرێ و ئەوکاتە تورکیا بە باشی دەتوانی بنووسێ بە وڵاتانی ئەورووپاوە، هەر ئەوکاتە سەرچاوە ئاویە ستراتیژیەکانی کوردیش بۆ تورکیا ئەو بایەخەیان نامێنێ، چونکە لەو تورکیا نوێ قەوارەیەدا هیچ سەرچاوەیەکی ئاوی لە چیا و هەڵەتەکانی کوردستانەوە نایەن. بۆ نموونە، سیستەمی دیجلە و فورات لە باشووری کوردستانەوە دەڕژێتە سوریا و عێراقەوە و ئاراس و کورا دەچنە ڕۆژهەڵاتی ئەرمەنستان و گورجستانەوە. لەلایەکی ترەوە، زنجیرە چیا بڵندەکانی تۆڕۆس و ئەو سیستەمە چیاییەی لێی دەکەوێتەوە، لەڕووی جیۆلۆجی و هەیدرۆلۆجییەوە کوردستان بە ڕێکی لە نیوە نیوورگەی ئەنەدۆڵ دادەبڕێ ڕاستە تورکیا ئەوسا دەرفەتی فرۆشتنی ئاوی کوردستانی بە وڵاتە عەرەبە تینوکان لەدەست دەچێ، بەڵام ئەو دەسکەوتە هەرگیز ناگات بەو بارەگرانەی کە بووژاندنەوە و هەڵساندنەوەی کوردستانی وێرانە گەرەکیەتی. وێنەیەکی هەڵوەشانی دەوڵەتێکی نابەکار و لەڕووی ئابووریەوە سەرنەکەوتوو، لەم دواییەدا لە بن باڵی تورکیا، لە یەکێتی سوڤیەتدا ڕوویدا، ئەگەر چاو لە گرفتە ئابووریەکانی ئێستاکەی بپۆشین کە کەوتوەوەی چەندین دەهەی کارگێریی خراپن، ڕووسیا ئێستا لە بواری مافە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەکاندا گەلێ لە جاران پێشکەوتوو ترە و لە ڕووی ئابووریشەوە لەو کاتە چاکتر دەبێ کە ناچار بوو هەموو داهاتی وڵاتەکە بۆ پاراستنی سیستەمی ئیمپراتۆری تەبار بڕژێنێتە قوڕگی کۆمەڵە هەژارەکانی ئاسیا و قەفقاسەوە، تورکیاش گەر کوردستانی لێ بقرتێنرێ داهاتێکی تاکە کەسی باشتر، ڕێژەی بەرزتری خوێندەواری، ڕاژەی نزمتری زیادبوونی دانیشتوان، سیستەمێکی هاوچەرختری ڕێگاوبان و هاتووچۆ و کەمتر هۆی پێشێلکردنی ماف مرۆڤی دێتە پێش، سەرباری ئەمانەش هەمووی، ئیتر تورکیا ئەوەندە دراوسێی سەریەشێنەری لە ئاسیادا نامێنێ بە پەناوە. سەرزەمینە سنووریەکانی دەوڵەتێکی تازەی وەکو ئەوە تەنها بە دەم کوردستان و گورجستانی سەر بەخۆوە دەبن لە ئاسیادا. بە کورتی، لەم سیناریۆ جیۆپۆڵەتیکیەدا کە کوردستانێکی سەربەخۆی لێ دەکەوێتەوە، تورکیا گەورەترین براوە دەبێ.

هەرچی ئێرانە، مەسەلەکە جیاوازیەکی گەورەی تێدایە بۆی، لە دەستدانی زۆربەی سەرزەمینە کوردنشینەکانی لەوانەیە دەرگایەك بکاتەوە بۆ لەتلەت بوونی زیاتری وڵاتەکە بۆ چەندین بەشی تر بەگوێرەی پێکهاتەی ئەتنیکی (هەرچەندە بەشە دوور دەست و دابڕاوەکەی خۆراسان لەبەر دووری لەو دەوڵەتە کوردیەدا نابێ)، ئیتر ئەو ئێرانەی کە لە دێرزەمانەوە دەوڵەت بوە، بەیەك قەوارەیی نامێنێتەوە.

خۆی، دەوڵەتەکە لە کۆتەرەوە بەفرە نەتەوەیی هاتووە، گەر بێتو تاران ڕەزامەندی بۆ جیابوونەوەی کوردەکان، واتە نەتەوەی سەرەکیی سێیەمی وڵاتەکە بدا، دەبێ شان بۆ هەمان ڕێگا بۆ نەتەوە جۆراوجۆرەکانی تریش شلکا هەمان ڕێباز بگرنە بەر، چونکە هیچ پاساوێکی یاسایی بە دەستەوە نامێنێ بۆ ڕاگرتنیان، ئازەریەکانی باکور، لەناو سەرزەمینی یەکێتی سۆڤیەتی جاراندا دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەیە و، لەوانەیە ئازەریەکانی ئێران ئیتر مانەوەی خۆیان لە دەوڵەتیکدا کەوا لە باڵی یەکتر دەردەچێ بە کارێکی بێ مانا بدەنە قەڵەم و لەوانەشە هەر ئێستاکە ئارەزووی یەکگرتینیان لەگەڵ براکانی باکووریان لە مێشکدا گەڵاڵە کردبێ، پێویست بەوە ناکا لە بارەی دەرەنجامە ئابووریەکانی کارێکی ئەوهاوە بۆ ئێران زۆر بڵێین چونکە هەر دەرەنجامە سیاسیەکانی بەسن بۆی، گەورەترین دۆڕاو لە دروستبوونی دەوڵەتیکی سەربەخۆی کورد، ئێران دەبێ.

بۆ سوریا، لە دەستدانی پەڵەپەڵە سەرزەمینە کوردنشینەکانی ئەوەندە کار ناکاتە سەر دارەڕای دەوڵەت، ئەوەی لێدەرچێ کە جۆرە ئاڵۆزکردنێکی هەستی "نەتەوایەتی"یە بۆی، لە دەستدانی سەرزەمینە کوردەکان لەلایەن سوریاوە دەتوانرێ بکرێ بە باتی سەرزەمینیە عەرەب نشینەکانی دەشتی حەڕان (باشووری ڕۆژهەڵاتی ئورفە) و باشووری ماردین کە دەکرێ بخرێنە سەری، ئەم سەرزەمینانە ئێستا بەشێکن لە تورکیا، بەڵام پەیوەندی جوگرافیایی وای پێویست دەکا لە هەر لێك جیابوونەوەیەکی تورکیا و کورددا، بخرێتە سەر کوردستان، ئەو کاتە سوریا تەواوەتی عەرەب زمانیەتی خۆی، بێ لە دەستدانی سەرزەمینێکی زۆر وەدەست دێنێ، لە ڕووی ئابووریشەوە هەموو ئەو سەرزەمینانەی لە سوریا دەکرێنەوە، ناگەنە ئەژنۆی دەشتی بە پیت و بەرەکەتی لۆکەجاڕی حەڕان تەنها خۆی.

مەسەلەکە بۆ عێراق جۆرێکی تری کاردانەوە بە دواوەیە، بە لەدەستدانی سەرزەمینە کوردنشینەکانی کە لە ڕاستیدا بریتین لە ئەمبارێکی قەڵاپەچنی سامانی سروشتی و کشتوکاڵی، عێراق زیانێکی یەکجار گەورەی ئابووریی دەکا، یەکێك لە زیانە هەرە زلەکانی لە دەستدانی کێڵگە نەوتیەکانی کەرکووك و باڵاوتەکانیەتی، بەڵام لێرە شتێکی یەکجار گرنگ هەیە، لە باشووری عەرەب نشینی عێراق ئەوەندە سامانی نەوت زەبەندە، کە دەتوانێ لە دەستدانی نەوتی کەرکووك زوو لەبیر بباتەوە، ئەوەی کە مەترسیەکی گەورە دروست دەکا لەدەستدانی ئاوی ڕووباری دیجلە و زێ یەکانیەتی کە ئەگەر بێتو لە دەستبچن، ئەوا عێراق هەتا هەتایە دەبێ بۆ ئاو دەست بۆ کوردستانی سەربەخۆ پەلکاتەوە، هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە خاکی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن و هەموو ئەو زێیانەش کە تێیان دەچن لە کوردستاندا تێکەڵی دەبن بۆیە ئەوەندەی لە دەستچوونی سەرچاوە ئاویەکان بۆ حکوومەتی بەغدا خەمی گەورەیە بیرە نەوتیەکان وانین.

ناوچە کوردنشینەکانی قەفقاسیا، لە ناوەڕاستی سەدەی (١٩) و هەڵزشانی لێشاو ئاسایی ئەرمەنیەکانەوە بۆ ناو خاننشینی ئەریڤان (کە دوایی بوو بە ئەرمەنستانی ڕووسی)، بەشێك نەبوونە لە خاکی کوردستان، لەبەر ئەوە هیچ لە گویندا نیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببن بە بەشێك لە کوردستانێکی سەربەخۆ، مەگەر دانیشتوانەکەی بە ویستی خۆیان بگوازنەوە بۆ ناو ئەم دەوڵەتە کە هێشتا هەر لە ڕووی تیۆریەوە باسی لێ دەکەین.

کوردستان بەش بەحاڵی خۆی وەکو دەوڵەتیك، گومانی تێدا نیە کە دەتوانێ ببێتە مەڵبەندی خۆشگوزەرانی و پێشکەوتن. جارێ سامانێکی ئاویی و کشتوکاڵیی تا بڵێی لەبن نەهاتووی هەیە، سامانە نەوتیەکانی بە باشترین تەکنیك سیستەمیزە کراون، هەر لە پاڵاگەوە بگرە تا دەگەیتە تۆڕی بۆریبەندی و دەزگای بۆ دەرەوە ناردن وەکو ئەوەی لە بەندەری ئەسکەندەرۆنە ئێستا لە کاردان. ئەو دەوڵەتە دەبێتە یەکێك لە گەورەترین و دەوڵەمەندترینی دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەم بۆچوونانە بنەمای توکمە و بە توندیان هەیە، ئەو دەبێ بە هاوسێی نزیکەیی حەوت وڵاتی سەربەخۆو، هیچ گومانێکیش لەوەدا نیە کە دەبێ بە یاریکەرێکی سەرەکی لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Reading and Bibliography**: Chris Kutschera, "Le Mouvement National Kurde," *Military Review* 6-6 (1981); Theodore Nash, "The Effect of International Oil Interests upon the Fate of Autonomous Kurdish Territory: A Perspective on the Conference at Sèvres, August 10, 1920," *International Problems* 15, 1-2 (1976).

# كەلتووری سیاسی و ڕابەرایەتی

لە (١٥٠) ساڵی ڕابردوودا، تەرەفداریی زۆربەی گەلانی جیهان، كە بەردەوام بێ گۆڕان بۆ هەڵبژاردە سیاسییە ناوخۆكان كۆرخ كرابوون، بەرەبەرە ئاراستەی هەندێ گرووپ كراوە كە لە تەپۆڵكەی كاری سیاسییدا لە لووتكەی هەرە سەرەوودا بوونە، واتە بۆ سەركردەكانی دەوڵەتە نەتەوەییەكان ئەو سەرسپردەیی یانەی جاران تەنها بۆ سەركردە ئایینی و هەرێمی و عەشیرەتیەكان تەرخان كرابوون، وێ دەچێ یان لەگەڵ ڕۆژگاردا كزبووبن، یان لەلایەن هەندێ كەسایەتی سیاسی نیشتمانیەوە بە مەبەستی برەودان بە فەرهەنگێكی سیاسی، یان ڕابەرایەتیەك كە خاوەنی پێگەیەكی جەماوەریی گەورەترین، لە ڕەگ و ڕیشە دەركرابن.

بەڵام ئەم مەسەلەیە بۆ كورد، وەكو نەتەوەیەك بە جۆرێكی تر بەڕێوەچووە، كورد لە ئەنجامی یەككگیربوون و گەلەكۆمەكێی چەندین ڕووداوی مێژوویی جۆراوجۆر، دووچاری بارودۆخێكی جیاواز بوە. لەناو كورداندا، ڕابەرایەتی بەردەوام پێگەیەكی پشتگیریی تەسك و بەرنامەیەكی زیاتر ناوخۆیی هەبوە، ئەویش وەكو گرووپە ئەتنییە سەرەكیەكانی دەورووبەری، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە كەوتۆتە دوای دروستكردنی كەلتووریكی سیاسی كوردانە كە ئامانجی پێكەوەنانی سیاسەتێكی گشت كوردانەبێ. گەر لە كردارە ئەدەبیەكانی هەندێ كەسی دەستپژاردەی وەكو حاجی قادری كۆیی باش وردبینەوە، ئەم هەست و هەناسانە بە زەقی دەرك دەكەین، ئەم كردارانە كاتێك دەركەوتوون كە هێشتا هەندێ بنەماڵەی فەرمانڕەوای كورد وەكو دەوڵەت، بەو مانایەی كە ئیمرۆ هەیەتی، ڕەفتاریان دەكرد، ئەم دەسەلاتداریانە، پێگەی بەهێز و نەلەرزیان لەناو هاوولاتیاندا هەبوو، بێ جیاوازی ئایین و پەیوەندی عەشیرەتی و پلە و پایەی گوزەران. دەتوانین بێ پەنگانەوە بلێین كەوا ئەو دەسەلاتداریە كوردیانە، هەر یەكە نیمچە دەوڵەتیك بوون، بە مانای مودێرنی ئەم بابەتە و گەر

بهاتایه و له (١٥٠) ساڵی ڕابردوودا بمایانەتەوە و لەناو نەبرایان، ئەوا ئەوانیش دەبوون بە دەوڵەتێکی نەتەوەیی تەواو عەیار، بەڵام ئەفسوس، چەرخ، بە پێچەوانەی ئەم ئاواتەوە گەڕا.

پێشکەوتنەکانی بواری تەکنولوژیا، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، کارئاسانی بۆ هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارس کرد کە بکەونە بە دواداچوون و بەکارهێنانی حوکمی ناوەندیی توندوتۆڵ و سنترالزەکراوی ڕاستەوخۆ. ئەمە بوو بە مایەی لە کارخستنی بەرەبەرەی دەسەڵاتە کوردیەکان لە چوارچێوەی ئەم دوو ئیمپراتۆریەدا، ئەوەبو دوا بنەماڵەی میرنشینی کورد، واتە ئەردەڵانیەکان، ساڵی ١٨٦٧ لەناوبرا.

ئەم بۆشایی دەسەڵاتە، ڕێگای بۆ چینی دووەمی دەستبژاردەکانی ناو خەڵك و مەرەدمانی خاوەن پلە و پایەی ناو کۆمەڵگا، واتە مەلا و قازی و شێخ خۆشکرد کە پڕی بکەنەوە، تەرەفداریی خەڵکی سادە بۆ ئەم هەڵبژاردانە ئەوەندە گەرم نەبوو و ئەمانە لە تەرفداری کەمایەتیەکی کەمی ناو کۆمەڵگای فرە ئایین و کەلتووری کوردستان بەولاوە هیچی تریان نەدەهێناو، بەڵام هەر ئەم ڕابەرە ئایینیانە خۆیان لە دەرفەتێکی تردا کەوتنە بەرهەڵستکردنی ئەو فشارەی دەوڵەتانی عوسمانی و ئێران دەیانخستە سەر کوردان و ئەوەبوو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە ڕابەرایەتی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری کوردان دژ بە دەوڵەتی مەرکەزی کەوتە دەستی ڕابەرە ئایینی و عەشیرەتیەکانەوە.

لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، گۆڕانکاریەکانی سەدەی نۆزدەیەم دیاردەیەکی زەقتر و بگرە کاریگەرتر و یەکالاکەرەوەتریان لەگەڵ خۆیاندا بە دیاری هێنا: لەم کاتەدا کۆتایی بەسێ سەدەی تەنینەوەی کۆچەرایەتی هێنراو لەجیاتی ئەو ژیانی کشتوکاڵی نیشتەجێی بووە باو، هەر ئەمە خۆی بوو بە هۆکاری لەناوچوونی دەسەڵاتی سەرکردە خێڵەکییە کۆچەرەکان و هەرەسهێنانی توانا سەربازیەکانیان کە هەمیشە لە ئاستی ژیان و دەسەڵاتی ناوخۆدا دەبوو بە هێز و توانای سیاسییش، لەم دەورەدا، لە کاتێکدا سەرکردە ئایینیەکان لەناوچە کشتوکاڵیەکاندا جۆرە سام و هەیبەتێکیان هەبوو، لەناو خەڵکە کۆچەرو نیمچە کۆچەرە چیانشینەکاندا ئەوەندە ئاو بە دوای بێڵیاندا نەدەڕۆیشت، بەڵام نیشتەجێبوونی بەردەوامی کۆچەر و ڕەوەندەکان، بڵاوبوونەوە و تەنینەوەی زیاتری دەست و دەسەڵاتی ئەم ڕابەرە ئایینییانەی لەسەر حیسابی ڕکەبەرە خێڵەکیەکان بە دواوەبوو، کە سەرەتای سەدەی بیستەم

## چەردەباسێك لە بارەی کوردانەوە

لە ئاسۆوە کەوتە سەرەتاتکێ، دەسەلاتی ئەمانە تەگەرەیەکی ئەوتۆی لە بەردەمدا نەما لەناو مەیدانگای سیاسی کورددا، هەرچەندە لە ڕووی ئیدیۆلۆجیا و ڕەفتاری کۆمەلایەتیەوە جێ پێی ئەم رابەرانە وەك جاران بە قایمی نەمابوەوە، ئەو حکوومەتە مەرکەزیانەی کە لە کوردستاندا جڵەوی کاریان بە دەستەوە بوو، کاتێك لە کاریگەریی نفووزی ئەم رابەرانە ئاگادار بوونەوە، بەتوندی کەوتنە بەرهەڵستکردنیان، بەهەمان ئەو شێوازە نەیارانەیەی کە پێشتر لەگەڵ میرنشینە کوردیەکاندا کردبوویان و بگرە بەشێوەی گەلێ توندتریش.

ئەم پاشەکشەیە هەر بەوجۆرە بەردەوام بوو، تا زەمینە بۆ سەرکردە خێڵەکیە ناوخۆییەکان خۆش بوو، وەکو سەرچاوەی بەرزترین دەسەلاتی خۆبەخۆیی بمێنێتەوە چینێکی لاوەکی لە دەستبژاردە و سەرۆك خێڵەکانیش بۆیان لوا پێگەیەکی تەسکتر لە هی پیاوە ئایینیەکان بۆخۆیان لەناو خەلکەکەدا دروستکەن و ئەو دەسەلاتداریە سیاسیەی لەمەوە کەوتۆتە چنگیان تا ئەمڕۆش هەر کاراو کاریگەرە.

گەلێ سەرکردەی خێڵەکیی زەبەر دەست، کاتێك هەستیان کرد کەوا پێگەی هێزو دەسەلاتیان بەنیشتەجێبوونی کۆچەرەکان و زیادبوونی ژمارەی جوتیاران و وەرزێڕان، دەکەوێتە مۆلەکەوە، ئینجا دەرکیان بە گرنگی دەسەلاتی ئایینیەکان کرد بۆیە ژمارەیەکی زۆریان بە کردەوە چوونە ریزی پیاوانی ئایینیەوە یان خۆیان کوتایە ناو تەریقەتە سۆفیەکانەوەو بەوجۆرە لە ڕێبازی ئایینەوە خۆیان کردە بەشداری پیاوە ئایینیەکان لەو پێگە بەرینانەدا کە لەناو کۆمەلگەدا هەیانبوو، سەرکردەکانی بەرزانیەکان بەتایبەتی شێخ ئەحمەد نموونەیەکی باشی ئەم دیاردەیەن.

لە پەنای ئەم گۆڕانکاریە سیاسیەنەشدا، نابێ کاریگەری شێوەی توپۆغرافی خاکی کوردستان لە داڕشتنی سرووشتی تاکە کەسی لەناو هاوولاتیاندا لە بیر بکەین، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی دەسەلاتیکی کەم لەلایەن کەسانەوە بدرێ بە دەستەیەکی بە کۆمەڵی کارگێڕی، واتە دەسەلاتیك کە دەستی کەم پێویست بێ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە کۆمەلایەتیە بنەڕەتیەکان و هیچی تر، بەم جۆرە ڕێکخراوەی عەشیرەتی، زۆر جاران دەبێ بەرزترین ئاستی تەرەفداری کە تاکێکی کورد ئارەزووی گوێرایەڵی کردنی لێی هەیە.

ئەمە چی لێکەوتۆتەوە؟ لەمە ئەوە کەوتۆتەوە ئەوەی کوردان ئێستا هەیانە، تا ڕادەیەکی دوور بریتیە لە سەرکردایەتی و کەلتوورێکی خێڵەکی، پچڕپچڕی یەکجار خۆجیی لە کاتێکدا

پلاتفـۆرمێکی سیاسـی گـشت – کوردانـەی مەدەنیـەت پێگـە کـە یـارای تەرەفداریـەتی و شوێنکەوتنی زۆربەی زۆری کوردانی هەبێ تازە وا خەریکە چەکەرە دەردێنێ.

## دەستبژاردەی سیاسی ئەم سەردەمە

ئەو کاتەی دوا سـەرکردەی سرف ئـاییني کـورد، شێخ مـەحموود، سـاڵی ١٩٣٢ مەیدان بەدەرکرا، سـەرکردە خێڵەکیـەکان، لەبـەر نـەبوونی هـیچ کەسێکی ئـەوتۆی هاونیشتیمان کـە بەرامبەریان لێ بگرێ، باڵادەستیی سیاسی خۆیـان بـە کـردەوە ئیسپات کردبوو، هەنـدێکیان حیزبـی سیاسـییان پێکـەوەنا، ئـەوانی تـر هێـزی چـەکداریاندا بـە سـەرکردە سیاسـیەکان لـە بەرامبەر بەشداریکردن لە بڕیاری سیاسیاندا، بەمە سەرۆك عەشیرەتەکان بوون بە بەرزترین ناو کۆی دەسەڵاتی سیاسی خۆیی و دەسـبژاردە و پارتیـە کوردیـە ڕۆژئـاوا ئـەنگێزە مۆدێرنـەکان ناچـار بـوون سازشـیان لەگەڵـدا بکـەن، ئەگـەر ڕاسـتەوخۆ نەبوونایـە بـە پاسـکەری بەرژەوەندیەکانیان.

سـەرکردەکانی خێڵـەکان بـە هـیچ جۆرێـك ناشـێ بـە مرۆڤـی کۆنـە پەرسـت و مـەردمی نەخوێنـدەوار و دواکـەوتوو دابنـرێن، زۆر لـە ئەنـدامانی خێزانـەکانیان دەرچـووی دانـشگاکانی ڕۆژاوان و لەگـەڵ کۆتـایی هـاتنی تەمـەنی نـەوە کۆنەکانـدا، نەوەیـەکی نـوێی خوێنـدەوار و شـارەزای تازەیـان لـەجێ پێدەگا کـە لـە شـارەزایی و دنیاداریدا هیچیان لـە سیاسـەتوانێکی ناوخۆیی دەوڵەتیکی سەربەخۆی ناو دەوڵەتان کەمتر نیە.

هەرچـەندێکو تـا ئێستا هـیچ سـەرکردەیەکی ئـەم سـەردەمەی پارتـە سیاسـیەکان خـۆی لەبەردەم سندووقی دەنگداندا تاقی نەکردۆتەوە، بەڵام پارتە سیاسیە کوردیـەکان شـەرعییەتی خۆیان لەوە وەرگرتووە کە ئەوان دەست لـەناو دەست لەگـەڵ نوێنـەرانی خێڵـە ڕەسـەنەکاندا کاردەکـەن و لەڕێگـەی ئەوانـەوە لـە بـیروڕای کۆمـەڵانی خەڵکەکـە ئاگـادار دەبن، بـەم جـۆرە سەرکردەی خێڵ و عەشیرەتەکان کە پەیوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵ خەڵکەکـەدا هەیـە، دەبـن بە سەرچاوەی بەخشینی شەرعیەتی ناوخۆیی پێیان، تا هەیئەتێکی دیمـوکرات و نوێنەرایـەتی جێگەیان دەگرێتەوە، وا دەردەکەوێ کە بەشێکی زۆری خەڵکی کوردسـتان ئـەم ڕیش سپییە

خێڵەكیانە لە هەرگفتوگۆیەكی سیاسیدا دەربارەی كوردستان، بە نوێنەری ناوخۆیی خۆیان دادەنێن. پرۆسەی شەرعیەتدان بە بڕیارو سیاسیەكان، بە تەواوی دیموكراتیانەیە چونكە تێیدا سەركردە سیاسییە كوردەكانی ئاستی خوارەوە و پارتە سیاسیەكانیش پێویستە لەگەڵ نوێنەرانی خەڵكەكەدا بیرورا بگۆڕنەوە و راوێژكاری بكەن، ئەم نوێنەرانەش بە تەواوی لە هەست و نەستی كۆمەڵانی بەرینی گەلەكە ئاگادارن، بەم جۆرە ڕای گشتی بۆ سەركردە سیاسیەكانی سەردەم پێكدێ، چونكە هەموو دەیزانین ئەم سەركردانە ناتوانن هەڵبژاردنی گشتی بكەن، یان بەشێوەی سەردەمانە لە بزووتنەوەكانی ڕای گشتی خەڵكی كوردستان ئاگادارین، بۆیە ناچارن زانیاری و پشتگیری لە سەركردە خێڵەكیە، باوەكانەوە وەرگرن تا بتوانن درێژە بە چالاكی خۆیان بدەن و لەجیاتی و بە نوێنەرایەتی هاوولاتیانەوە قسەو گفتوگۆ بكەن.

ئەمە هەر بە سیاسیە ئاساییەكانەوە نەوەستاوە، تەنانەت پارتە سیاسیەكانی چەپیش، لە پەنای تۆمەتباركردنی ئەو سەركردە خێڵەكی و ئاینییانە بە كۆنە پەرست و دەرەبەگ كەچی بەدزی و بە ئاشكرا لەگەڵیاندا هەڵس و كەوت و سات و سەودایان كردوە.

هەرچەندە لیستەی پارتە سیاسیە مودێرنەكان درێژە (بڕوانە پارتە سیاسیەكان).

بەلام تەرەفدرایەتی زۆربەی خەڵكی كورد هێشتا هەر بۆ ئەم كۆنە قەلا سیاسیە دێرینانەیە، و ئەمەش بووە بە مایەی هێز بۆ شەخسیەتی سەركردایەتی و سیاسەتكاری كورد، هەرچەندێكو ئەم واقیعە بە پەلە وا لە گۆڕاندا، دەتوانرێ بوترێ، كە زۆربەی كەسایەتیە سیاسیە گرنگەكان لە كوردستان ئاوەڵناوێكی خێڵەكێتی خستۆتە سەر ناوەكەی خۆی (سەرباری هەندێ ئاوەڵناوی ئاینیش وەكو لەسەرەوە باسمان كردوە)، باشتر وایە لەم ڕووەوە ئاماژە بۆ ناوی هەندێ كەسی هەرە ناسراو بكەین كە ناوی هۆزەكانیشیان خستۆتە سەر ناوی ئەسڵی خۆیان: جەلال تاڵەبانی، موستەفا بارزانی، مەسعوود بارزانی، عەبدوڕەحمانی قاسملو، ڕەسووڵ مامەند[8].

فەرماندەكانی هێزە هاوپەیمانەكان لەو "ناوچە ئازاد"ەی كە پاش جەنگی كەنداوی فارس لە كوردستان پێكهێنرا، بە سەرسووڕمانەوە پاشان نابەدلانە بەسەر ئەو ڕاستیەدا كەوتن كە

---

[8] وەكو بیزانم قاسملوو ناوی ئاواییەكە لە دەروووبەری مهاباد و مامەند (یان مەمەند) ناوی باوكەو خوالێخۆشبوو ڕەسووڵ مەمەند لە عەشرەتی شیلانەی ولاتی پشدەرە – وەرگێڕ.

ناچاربوون بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان لەگەڵ یەکەیەکی سەرۆك هۆز و کوێخاکاندا گفتوگۆ و مامەڵە بکەن، ئەوان زۆر بە سەرسوورمانەوە، بەوەدا دەکەوتن کە ئەم سەرکردە ڕەگ قووڵانە بەقەی هەر سیاسەتمەدارێکی تری پڕ کاری ئەم دنیایە، ئاگادارو ئاوەدانن.

سیما نەگەتیڤەکانی سیاسەتگەریی دێرینەی هۆز و عەشیرەتچیەتی لەوەدان کە ئەم جۆرە سیاسەتگەرییە زیاتر بەلای پارێزگەری، خزم خزمێنە، عەشیرەتگەری و ناوچەگەرییدا دەشکێ، تەنانەت سەرکردە گەلێکی مۆدێرنی سیاسی کوردی وەکو جەلال تاڵەبانی (puk) و عەبدولڕەحمانی قاسملو (kdp)، هەرچەندێکو بنەڕەتی خوێندنیان ئەورووپیانەو ماوەیەکی دوور و درێژیش لەوێ ژیاون، نەیانتوانیوە لەبەندی ڕەگو ریشاڵە خێڵەکییە کۆنەکانیان ڕزگاربن لە چوارچێوەی حزبەکانیاندا. ئەو رکەبەریێ درێژخایەنەی کە لەنێوان بەشەکانی باشووری کوردستانی عێراق کە مەڵبەندی تەئسیری (puk)، و بەشەکانی باکوور کە مەڵبەندی (kdp)یە، سەرنەکەوتنی هەریەکە لەم دوو حیزبە "مۆدیرنە" دەردەخا لە ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکەکەدا بێ دەرچوون لە ئەڵقەی پەیوەندیی خێڵەکی، هەندێ خاوەن نەزەر و توێژەرەوە ئەمە دەخەنە ئەستۆی جیاوازی شێوەزار، واتە دەیالێکت، لە هەردوو ناوچەکەدا و هەندێکی دیکە ئۆباڵەکە دەخەنە ئەستۆی ڕێبازی سۆفیگەری. بەهەرحاڵ، چاکە ئەوە دەرخەین کە جیاوازی نێوان هەردوو لقەکەی کرمانجی زۆر لاواز و ناکاریگەرە بە تایبەتی لە عێراقدا و ناکرێ ئۆباڵی ئەو ناکۆکیەی بخرێتە ئەستۆ، جگە لەمە، ئەم جۆرە ناکۆکیە لە ئێرانیش لەنێوان (kdp) و کۆمەڵەدا هەیە، هەروەها لەنێوان (puk) و کۆمەڵەی عێراقیش، کە هەموو بەزاراوەی کرمانجی باشوور دەدوێن و هەمووش سەر بە ڕێبازی سوننی قادریین. زۆرتر وێدەچێ، پەنجەی هۆزیەندی و ناوچەگەریەتی لە مەسەلەکەدا هەبێ و پارتە سیاسیەکان پایان توند ئالابێتە ئەم داوەوە.

چونکە ئەم سەرکردە سیاسیە مۆدێرنانە وەکو سەرکردەی تازە بابەتی هۆزەکان هەڵسوکەوت دەکەن (وتە ڕەفدارەکانیشیان هەر وایان تێ دەگەن)، رووخساریان، بە تایبەتی لە کوردستانی عێراق، هی باوکێکی خەمخۆر بووە، نەك هی سەرکردەی سیاسی کە بوونیان لەسەرمەکۆی سەرکردایەتی بەندبێ بە هەڵبژاردنی خەڵکەکەوە لەسەر بنەمای لێهاتوویی یان دڵسۆزییان بۆ مەسەلەکە. مادام ئەوان ئەوەی لە توانایاندایە دەیکەن، تەرەفداری خەڵکەکە

مسۆگەرە بۆیان. مەبەست ئەوەیە، مادام ئەوانە سیفەتی وەكو ئازایەتی، دڵسۆزی، سەربەرزی و مەردایەتییان پێوەیە، ئیتر مانەوەیان لە رابەرایەتیدایە مەترسی بۆنیە. لێرەدا نەزیری و زانایی نە دیبلوماسیەتزانی، شەرتی بنەڕەتین بۆ سەركردایەتی (بڕوانە كەسایەتی نیشتیمانی).

بەم جۆرە، ئەو هەڵانەی دەیكەن كەم جار دەبنە مایەی لەقبوونی جێگەیان وەكو سەركردە، لەوانەیە بە سەركردەی باش دانەنرێن، بەڵام ئەوان بەهەرحاڵ لە مەقامی سەركردەییدا هەر دەمێننەوە و پشتیوانیان لێدەكرێ و بگرە رێزیشیان هەر لێدەگیرێ.

لە دوا پێنج ساڵی تەمەنییدا، ژەنەراڵ مستەفا بارزانی، بۆ نموونە، كەوتە ئەم گێروگرفتانەی خوارەوە، ئەو ساڵی ١٩٧٥، پێشنیازی كرد كوردستان ببێ بە ویلایەتی (٥١)ەمی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا (ڤان برونیسن ١٩٨٦)، ئەم پێشنیارە گەر لەلایەن هەر سەركردەیەكی سیاسی تری جیهانی سێیەمەوە بخرایەتە ڕوو، لەوانەیە لێڵی بخستایەتە سەر نەك هەر كارامەیی سیاسی، بەڵكو تەنانەت سەلامەتی بیركردنەوەی خاوەنەكەشی، هەروەها قبوولكردنی یارمەتی دارایی لە وڵاتە یەكگرتووەكان لە سەردەمێكدا كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ناوبانگێكی باشی ئەوتۆی لەناوچەكەدا نەبوو (پاش جەنگی ڤێتنام و شەڕی ساڵی (١٩٧٣ی نێوان عەرەب و ئیسرائیل) بەشێوەیەكی بەربڵاو بۆ پروپاگەندە دژ بەو بەكار هێنرا، جگە لەوە پاش هەڵنەسەنگاندنە كارەساتا و یەكەی لە متمانەكردن بە شای ئێران هاوكات لەگەڵ گۆڕینی تاكتیكی شەڕ لە چالاكی پارتیزانییەوە بۆ جەنگی بەرەیی، دژ بە مەكینەی بەهێز و توانای سوپایی ئەو كاتەی عێراق، بوون بە مایەی خچانێكی سەربازی تەواو لەمەیداندا و لە پاشدا هەرەسهێنانە كارەساتبارەكەی ساڵی ١٩٧٥.

گەر لە هەر وڵاتێكی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕووی بدایە، هەر یەكێ لەم هەڵانە بەس بوون بكەرەكەیان لە ڕووی سیاسیەوە لەكەدار بكەن، كەچی زۆربەی زۆری كوردان هێشتا هەر تەرەفداری توندیان بە ژەنەراڵ بارزانی كرد و ئێستاش هەر جێی ڕێزە و پایە و پێگەی ئەفسانەواری لەناو كورداندا هەر بەرز و بەهێزن، ئەم دیاردەیە كە لەوانەیە بۆ هەندێ كەس جێی سەرسووڕمان بێ، دەرەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو وێنەیەیە كە وەكو سەركردە لە مێشكی خەڵكەكەدا چەسپیوە – باوكی ئەو خێزانە خێڵەكیە گەورەیە كە هەموو كوردان دەگرێتەوە – كەسێكی خۆیی كە بۆی هەیە هەڵەی گەورە بكا و لە خەملاندنەكانیدا سەركەوتوو نەبێ كەچی

هەر چاویشی لێ بپۆشرێ، وەکو هەر سەرکردەیەکی خێڵەکی یان نموونەیەکی دەق و تەواوی پاڵەوان (بڕوانە ناسنامەی نەتەوەیی).

بەردەوامیی گیانی خێڵەکیەتی لە کاروباری سیاسی سەردەمانەی کورددا، وەکو دیاردەیەکی نابوارده، دەرکەوتنی سەرکردەی پیشەیی لێکەوتۆتەوە کە هەرگیز بە بەردەم سندووقی هەڵبژاردن تەنانەت لەناو حیزبەکانی خۆشیاندا تێنەپەڕیون، بۆیە مەسەلە ڕێکەوت نەبوو، کاتێك ژەنەراڵ بارزانی کۆچی دوایی کرد، کورەکانی بێ پێویستکردن بە هەڵبژاردن یەکسەر چوونە سەر مەکۆی سەرکردایەتی.

لە تورکیا، فیدراسیۆنە هۆزیەندیە گەورەکان لەژێر فشاری دەوڵەتی تورك لە سێ پشتی ڕابردوودا تا ڕادەیەکی زۆر ئاسەوارپڕ کراون، هۆزو عەشیرەتە بچووکەکان ئەوەندە بەری نەکەوتوون، بەڵام ئەوانیش بەهۆی ئەوەوە کە دەم سپی و ماقووڵەکانیان، یان بە زۆر یان بە خواستی خۆیان ڕەهەندەی ڕۆژاوای تورکیاو شارە سەرەکیەکانی ئەوێ کراون، ئەوەندە بەهەند نەماون، ئەمە لە سێیەك تا نیوەی کۆی دانیشتوانی کوردی تورکیا دەگرێتەوە (بڕوانە کۆچکردن و ڕەهەندەیی) یەکێك لەو شتانەی لەمەوە کەوتۆتەوە، پێکهێنانی پارتی سیاسی کوردیە لە تورکیا بەمانای سەردەمانەی (واتە بێ سەرسپردەیی بۆ خێڵ و عەشرەت).

ئەگەر بەشێوەیەکی نیسبی بیگرینەوە، سەرکردایەتی سیاسی کوردی لە تورکیا هەرە سەردەمانەترین و نوێژەنترین سەرکردایەتیە پڕ بەپێستی وشەکە، لە (pkk) و سەرکردایەتیەکەیدا، بۆ نموونە، دەرکردنی هەزارەها بابەتی ئیدیۆلۆژی و فێرکاری و پەروەردەیی سرنج دەکێشن، دیسپیلینی نموونەیی و مەشق و ڕاهێنانی هەموو ئەندامان و گەریلاکان و لە کاتی پێویستدا، بەکارهێنانی تیرۆر، بۆ دوژمنان کورد بن یان نا کورد. ئەم چالاکییەی دواییـن، واتە تیرۆر، کە تاکتیکێکی باوە لە ئیدیۆلۆژیای سیاسی ڕادیکالی جیهانی سەردەمدا، لای کەلتووری سیاسی خێڵەکی پشت بەپشت هاتووی دێرین زۆر دڵخوازنیە.

# ناوچەگەری

بۆ ئەوەی گەلی كورد بتوانێ بگا بە ئامانجەكانی و مرازەكانی بێنێتە دی، كەندێك یان چەند كەند لە كەلتووری سیاسی كورددا دەبێ پڕ بكرێنەوە، ئەو كەندە گەورانە بریتین لەو جیاوازیە قووڵ و بەرینانە كە لە دیدی هەر پێنج هەرێمە هاوسنوورەكانی كوردستاندا هەن (بڕوانە دابەشكاریە ناوخۆییەكان) شێوازە جیا جیاكانی سەركردایەتی سیاسی كە لە كوردستان هەن، بەلای ئەوەدا دەشكێن كە لە هەرێمە جیاجیاكاندا ببنە باو، ڕاستیەكەی تاوتوێكردنی پارتە سیاسیە كوردیەكان لەڕووی چۆنایەتی و شێوەی سەركردایەتی و شێوازی ڕەفتاریان، خێراترین ڕێگایە بۆ دەست خستنە سەر هێزو كارایی جیاوازیە هەریمیەكان لەناو گەلی کورددا.

لە باكووری كوردستانی عێراق، (kdp) كە لەلایەن بەرزانیەوە رابەری دەكرێ، نوێنەری میزاجێكی گشتی ئەوتۆیە كە ئاوێنەی داب و نەریتی كوردی باكوورە، ئەم داب و نەریتە پشتا و پشت هاتووە و ڕەگی قووڵە لەناو ڕیش سپیە عەشرەتی و كۆمەلایەتی و برا گەورەكانی ناو كۆمەڵگادا، بەرزانیەكان، مرۆڤی ئایینین و موریدەكانیان بریتین لە خەڵكی تەقلیدی و پەیڕەوی ڕێبازی رووحی، بەوەی لە هەموو بڕیارە گرنگەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ ڕیش سپی و بە تەمەنەكانی عەشیرەت، شێوەیەك لە داب و نەریتی دیموكراتیەتی عەشرەتی بەكاردێنن، ئەوان هەموو موریدەكانیان بە چاوی ئەندامی یەك خێزانی گەورە سەیر دەكەن.

لە كوردستانی ناوەند لە عێراق (puk) كە لەلایەن تاڵەبانیەوە رابەری دەكرێ، نوێنەری جەماوەرێكی زیاتر شارستانی و سەردەمانەو دەرەوە ڕوانی ولاتەكەیە كە پەیوەندیەكی توندی بە كوردستانی باشوورەوە هەیە لە ئێران، حیزبەكە كەمتر ئایینوار و سەركردەكانی مەگەر بەدەگمەن ئەگینا لە كارو چالاكیەكاندا ناگەڕێنەوە بۆ دەم سپییە ناوخۆیی و پیاوە ئایینیەكان.

ئەوانی لە گۆشەی سەردەمانەیی و دنیاناسی بەرزترەوە دەڕواننە (kdp) و تەرەفدارانی و زۆرجار بە چاوی تەوسەوە سەیری بەرامبەرە باكووریە خێڵەكی و ئایینی و وەرزێڕ

سرووشتیەکانیان دەکەن کە هەمیشە مایەی بار لارین بۆیان و هەرگیز دریغی ناکەن لە دۆڕانی دەرفەتدا.

گەلیّ هاوولاّتی ئاسایی کوردی دانیشتووی ئەم ناوچەیە لەگەلّ ئەم بۆچوونەی (puk)دا یەك دەگرنەوە. ئەم هاوولاّتیانە نیشتەجێی هەرە کۆنترین مەلّبەندی شارستانی کوردستانن و دەتوانن شانازی بە مێژوویەکی چەند هەزار سالّەوە بکەن، بەلاّم لە هەمان کاتدا، هەرگیز لە دان نان و دەستخۆشیکردن لە ڕاستگۆیی و ڕەشیدی و دلێری و چاوتێری و دەستوچاو پاکی هاوولاّتیە "زبر"ەکانی باکووریاندا دوا ناکەون.

لە بەرامبەردا دید و بۆچوونی باکووریەکان دەربارەی (puk) کە تالّەبانی سەرکردایەتی دەکا جیاوازە ئەوان (puk) بە ڕێکخراوێکی بیّ کەلّك دادەنێن، کە هۆش و زانیاری زیاتر لە چاویدایە نەك لە مێشکی و لەلایەن کەسانێکەوە ڕابەری دەکریّ کە ڕێبازی دلّخوازیان زیاتر خیانەتە نەك ڕەشیدی و دلێری و مەگەر بە دەگمەن ئەگینا ژیانی خۆیان ناکەنە قوربانی شەرەفیان. لەگەلّ ئەمەشدا، بە چاوی بایەخەوە تەماشای شارەزایی و چاوکراوەیی و جیهان شوناسی ئەم باشووریانە دەکەن و بە ئیرەییەوە دەڕواننە "زیرەکی و زانیاری" یان. ئەم تێڕوانینەی (puk) کەم یان زۆر، هەمان تێڕوانینی کوردەکانی باکووری عێراقە بۆ هاوولاّتیەکانی باشووری خۆیان.

(kdp) ئێران کە پێگەی لە کوردستانی ڕۆژهەلاّتە، کەمتر خێلّەوارە و لە کاتێکدا پشت و پەنای زیاتر پیاوماقوڵ و سەرکردە ناوخۆییەکانن، زۆرتر لە هەلّبژاردەی کۆمەلّەوە نزیکە. سەرکردەکانی حیزبەکە وەکو دەربڕینێکی هەستی ئەندام و هەوادارانی، نەزەرێکی ئەوتۆیان بەرامبەر بە کوردە دراوسێکانی ناوەندی کوردستانیان، بەتایبەتی ئەوانی باکوور هەیە کە گوایە کەللەڕەق و خاوەن نەریتی وشکن، و جۆرێکن لە مەردمی خێلّەکی سروشتی ناشارستانی و نیمچە خوێندەوار و تێکەلاّوی دوور و درێژیان لەگەلّ کەلتووری نامۆی عەرەب و تورکدا، ڕەفتاری کۆمەلاّیەتیانی کردوە بە مایەی شەرمەزاری و کەلتووریانی بە تەواوەتی شێواندوە. ئەمان بۆ "ئیسپاتکردنی" ئەم نەزەرەیان، ئەوە دێننەوە یاد کەوا زۆربەی کوردەکانی تورکیا و عێراق ئەوەندە لە مانا یان پشتەلّەکی کەلتوور و مێژووی کورد سەر دەرناکەن. کوردەکانی ئێران خۆیان بە بالاّدەست دەزانن لە هەموو بابەتەکانی کەلتوور و ڕووناکبیری کوردیدا و لەو

باوەڕەدان كە ناسكی و ژیرییان لە "هەڵەت نشینە سروشت وشكەكان" جیایان دەكاتەوە. لە هەمان كاتدا ئەم كوردە ڕۆژهەڵاتیانە، چاوی تەما لە كوردە عێراقیە "كەڕە كرمانج و زبر و، بەڵام لە هەمان كاتدا جێ باوەڕ و سفت و ساغ و زانا و زیرەك و بەتوانا" كانیان هەر ناترۆكێنن.

كوردەكانی باشوور لەوەش زیاتر خۆیان لە كوردانی تر دوور دەگرن، زۆربەیان، ئەگەر گشتیان نەبێ بەرو ماوەی كوردستان بەتەسك و بێ كەڵك دەزانن بۆ "وەفیرۆدانی توانا سیاسی و فەرهەنگیەكانیان " و بۆ ئەم مەبەستە ڕوو لە تاران و بەغدا دەكەن، ئەگەر ڤیەننا و پاریس و نیویۆركیان بۆ نەلوێ، بۆ دانیشتن، تەنانەت ئەمڕۆكەش، پارتێكێ سیاسی كوردی سرف نیە لە باشوور كە باسی بكەی چونكە دەستەی هەڵبژارەی كورد لە دەرەوەی كوردستان، لە پایتەختی ئەو وڵاتانەی لە چوارچێوەیاندا دەژین، توانا و ئارەزوە سیاسیەكانیان بەكاردێنن، بۆ نموونە، كەریمی سنجابی، كە كوردێكی نەتەوەی كرماشانیە، ماوەیەكی دوور و درێژ سەرۆكی پارتێكی گرنگی وەكو "جەبهەی میللی ئێران"بوە كە لەلایەن دوكتۆر موحەممەدی موسەددیقەوە دامەزراوە، كەلتووری سیاسی كوردەكانی باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕوخسار و دیدی ئێرانی پێوەیە و هەر بەو جۆرەش ناسراوە لە چوارچێوەی كەلتووری سیاسی دەوڵەتدا، نەك بە ڕوخساری كوردانەی.

هۆی جیاوازیەكانی نێوان كەلتووری سیاسی كوردە ئێرانیەكان و ئەوانی عێراق ئاشكران، هەرچەندە گشت كەس بە تەواوی پەی پێ نابەن. ئەوەندە بایەخ دراوە بە دابەشكردنی ئەم دوادواییەی پاش جەنگی جیهانی یەكەمی وڵاتی كوردستان، كە زۆربەی زانا و ڕوناكبیرەكان دابەشكردنێكی گەلێ كۆنتری ئەم وڵاتەیان بە تەواوی پشتگوێ خستوە كە كوردەكانی ئێرانی تێكڕا لە كوردەكانی تر دابڕیوە. كوردەكانی ئێران نەك لە كۆتایی جەنگی جیهانی دووەمەوە لەو كەش و هەوای دابەشكارییدا ژیاون، بەڵكو هەر نەبێ لە ساڵی (١٥١٤) و جەنگی چالدێرانەوە تێیدا دەتلێنەوە، ئەوی ڕاست بێ، ئەم كوردانە لەژێر دەسەڵاتی چەندین بنەماڵەی حوكمڕانی ئێراندا ژیاون (كە هەندێكیان بەبنەچە كورد بوونە). لەم پرۆسەیەدا، كوردە ئێرانیەكان لە كەلتووری سیاسی نیشتمانی ئێران و ڕەوشت و میزاجی كۆمەلایەتی ئێران زیاتر پاراوبوونە و زۆریش بەشداریان تێدا كردوە وەكو لە كەلتووری فراوانتری سیاسی كورد.

پەیوەندی نێوان کوردەکانی ئێران و هاونەتەوەکانیان هەر لە کوردستانی ناوەندەوە، واتە کوردستانی عێراقەوە بوە و هەرواش دەمێننەوە. کوردستانی عێراق لە دێر زەمانەوە مەیدانی ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕابوە لەنێوان هەموو بەشەکانی کوردستاندا.

کوردەکانی کوردستانی ڕۆژاوا، لەوەش زیاتر لە کوردەکانی تر دابڕاون و بۆیەشە کەلتووریکی سیاسی تایبەش بە خۆشیان پەروەراندوە و خسشوویانەتە کار. تاقە هۆی ئەم دابڕانەیان زەبرو زەنگی لەڕادەبەدەری کار بەدەستانی تورکیایە کە بۆتە کۆسپ لەبەردەم هەر جۆرە پەیوەندیەك لەنێوان کوردەکانی تورکیا ئەوانی تری کوردستاندا، لە پەنای ئەم هۆکارەدا هۆکاری گرنگی تریش هەن وەکو مێژوو و جوگرافیا، بەم جۆرە کوردەکانی ڕۆژاوا لە لای کوردەکانی تر نامۆ بوونە، و ئەمانیش بەلای ئەوانەوە هەروایان لێهاتووە، تەنها ئێستا و لەم سەردەمە نوێیەدا، داهاتنی ڕایەڵی پەیوەستی جیهانی کارێکی وایکردوە کوردەکانی ڕۆژاوا و کوردەکانی تر لەیەك ئاگادارین، و باس و خواسی یەکتر پێ بەپێ بزانن.

جیاوازیەکە نە لە زەمانەدایە، نە لە ئایین، چونکە ئەوانیش لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستاندا هاوبەشن لە هەردوو ئەم بابەتەدا، جیاوازیەکە لە دیدو بۆچووندایە. شکانەوە بەرەو دەریای سپی ناوەڕاست و ئەوروپایەکە وا ئەم بەشە گەورە و چڕەی کوردستان ئەوها داوەتە دەستی جیاوازیەوە.

لەم دواییەدا، عەبدوڵا ئۆجەلانی سەرکردەی سیاسی کوردەکانی ڕۆژاوا ڕێز و خۆشەویستیەکی زۆری لە دڵی کوردانی دەرەوەی تورکیادا وەرگرت، زۆربەی زۆری ئەم ڕێز و خۆشەویستیە هی ئەوەنیە ئەوان زۆر بە باشی ئەو دەناسن یان لەگەڵ کەلتووری سیاسییدا ئاشنان، بەڵکو لەبەر ئەوەیە دید و بۆچوون و شێوازەکانی جیاوازن لەگەڵ ئەوانەدا کە ئەوان لێی ڕاهاتوون و شارەزایانن و تا ئێستا لە نەزۆکی بەولاوە چی تریان لێ نەکەوتۆتەوە، ئۆجەلان کارێکی ئەوتۆی لە بواری ناو هەرێمیدا نەکردوە کە ببێتە مایەی لیسدانی کوردەکانی دەرەوەی هەرێمەکەی خۆی لە ئەنەدۆڵ لە دەوری، بەڵام چونکە ئەنەدۆڵ نیشتگەی زیاتر لە نیوەی هەموو کوردانی جیهانی ئەمڕۆیە، ئەو توانیویەتی بە ئاسانی پلاتفۆرمێکی سیاسی بە هێزتر لەوەی بەرزانی هەیەتی پێکەوە بنێ. کەلتووری مێدیتەرانەی(دەریای ناوەڕاست) ئۆجەلان و ڕەفتاری سیاسی نیمچە ئەوروپیانەی ئەو وا زوو بەزوو خۆی و حیزبەکەی دەکەن

بە دوو شتی ئەفسانەوار لە چاوی نیوەكەی تری گەلی كورددا كە لە دەرەوەی ئەنەدۆڵی توركیا دەژین، بەهەمان شێوەی كە جاران بەرزانی، سەرباری هەموو كەموكوڕی و كورت هێنانە سیاسیەكانی، گەییوە بەرزترین پلەی پەرستن لەناو هەموو كورداندا.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Very valuable primary resources are the detailed tape interviews with many Kurdish leaders and political figures on deposit in the Oral History Archives at the Kurdish Library in Brooklyn, New York. Wadie Jwaideh, "The Kurdish Nationalist Movement: Its Origins and Development," unpublished doctoral dissertation (Syracuse, 1960); Chris Kutschera, *Le mouvement national kurde* (Paris: Falmmarion, 1979); R. Olson, *Emergence of Kurdish Nationalism* (Austin: University of Texas Press, 1989); Martin van Bruinessen, *Agha Shaikh and State: On the Social and Political Organization of Kurdistan* (Rijswijk: Europrint, 1978); Martin van Bruinessen, "The Kurds between Iran and Iraq," *Middle East Report* ( July-August 1986); Fredrik Barth. *Principles of Social Organization in Southern Kurdistan* (Oslo: Brodrene Vorgensen, 1953); Martin van Bruinessen, "The Kurds in Turkey," *MERIP Reports* 16.141 (1986).

## حیزبە سیاسیەكان

بزووتنەوە و پارتە سیاسیەكانی كوردستانی ئەم سەردەمە ئەوەندە زۆرن كە لە شوێنێكی وەكو ئەم لاپەڕانەدا نایەنە ژماردن، بۆیە هەر باسی ئەوانەیان دەكەین كە زۆر بە بایەخ و لە تەمەندا كۆنن و لە دێرزەمانەوە لەسەر خاكی كوردستان كار و چالاكیان نواندوە.

وەكو گشت شوێنەكانی دیكەی ئەم دنیایە، كە تێیدا ژمارەیەكی زۆری پارتی سیاسی بۆ خۆئالاندن لە پشتگیری ئەوەندە خەڵكەی كە هەن، بۆ هەموو ئیدیۆلۆجیا و ئامانجێك های دەكەن كە زۆر جار لێك جیاوازنین، لە كوردستانیش ڕكەبەرێی نێوپارتیان و مشتومڕی هەمیشەیی نێوانیان شتێكی باوە لە مێژووی كاری سیاسی كوردییدا. تاقە جیاوازی كە هەبێ، لە كوردستان ئەوەیە، جار بەجار ئەم ڕكەبەرانە دەكەونە پێكدا هەڵپرژانی سیاسی و گەریلاكانیان دەستە و یەخەی یەكتر دەبنەوە، بەهەرحاڵ ئەم وێنە ئەسەفبارانە، كورت خایەن بوونە و تەنانەت چەندین جارێكی كەم ڕوویانداوە.

ژمارەبەندیەكی ئەوتۆ ڕێك لە بارەی ژمارەی ئەندامانی پارتە سیاسیە كوردەكانەوە بەدەستەوە نیە جارجارە، ئەم پارتانە كارتی ئەندامەتیان دەركردوە، بەڵام هەموویان

ناچاربوونە هێزی گەریلا پێکەوە بنێن، بۆیە بۆ ئەوەی بزانی هەر پارتە و سیاسەتەکانی لەناو خەڵکدا تا چ ڕادەیەك پێگەدارە دەبێ ژمارەی گەریلاکانی لە ژن و لە پیاوی چەکدار بزانی.

وشەی لە زاری خەڵکدا شیرینی "پێشمەرگە" لە کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی بەربڵاو بۆ گەریلا و جەنگاوەرەکان بەکاردێ، بەڵام ناوەکە هەر بەوێوە نەوستاوە بەڵکو بەناو گرووپە کوردەکانی تری دەرەوەی عێراقیشدا بڵاوبۆتەوە، مانای وشەیی پێشمەرگە "خۆبەختکەر" دەگەیەنێ، وشەکە وشەیەکی پڕ خۆشەویستی و بگرە ڕۆمانسیەتیشە، لەلایەن دایکانەوە بۆ دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی بەرامبەر بە بەچکەکانیان دەردەبڕێ، واتە دایکێك کە بە ڕۆڵەکەی وت دەبمە پێشمەرگت، واتە گیانی خۆم بۆ ژیان و خۆشی و تەندروستیت بەخش دەکەم، وشەکە چ خۆی چ ئەو چەمکەی دەیگەیەنی ڕەگوڕیشەی قووڵیان لەناو مێژووی کورددا داکوتاوە، ئەم ناونان و خۆشەویستیەی ئێستا دوو وێنەی پێشینەیان لە مێژووی کورددا هەیە. لە سەردەمانی هەرە دێرین، لە هێرشەکانی میدیەکان بۆ ناو خاکی باشوورستان و لە سەردەمی کلاسیکیشدا، کاتێك کوردەکان بۆ داکۆکی کردن لە خاك و گیانی خۆیان دژ بە ئەردەشیری یەکەم پادشای ساسانیی، دەجەنگین، (بڕوانە مێژووی کلاسیك و هەرە کۆن).

بە مەبەستی تێگەیشتنی ئاسان لە باسەکە، هەموو پارتە سیاسیەکانی کە ناویان هاتووە مەیدانی کارکردنیان لە چوارچێوەی دەوڵەتەکانی ئێران، عێراق، تورکیا و سوریادایە و لە هەر شوێنێك پێویست بێ باسی پەیوەندی و کەین و بەینەکانیان دەکەین، پشتەڵەکی مێژوویی پێویست لە بارەی ئەم ڕووداوە سیاسیانەوە لە فەسڵەکانی مێژووی سەردەمانە و مێژووی ئەم دواییەدا خراوەتە ڕوو.

## ئێران

حیزبی دیموکراتی کورد (ح د ك)، ئەم حیزبە ساڵی ١٩٤٥ لە مەهاباد لەلایەن سەرکۆمار قازی محەممەدەوە لەسەرینیی دامەزراندنی کۆماری کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان (دیسامبری ١٩٤٥–دیسامبری ١٩٤٦)، دامەزرا، وەکو کۆنترین حیزبی سیاسی کورد کە تا ئێستا هەر بە پێوەبێ، (ح د ك) شایستەی بایەخدانێکی تایبەتیە. لە کەمتر لە نیو سەدەدا، ئەم حیزبە بە کۆمەڵە ڕووداوێکدا تێپەڕیوە، کە مشتی ناوخەروارن بۆ هەموو ئەوانەی کە لە

پاشدا حیزبە کوردیەکان پێیدا تێپەڕیون، یەك شتی لێدەرچیٚ کە ئەم حیزبە چرای تەمەنی هێشتا نە کوژاوەتەوە و هێمان هەر تیشك دەدا.

ساڵی ١٩٤٥ کە تێیدا دامەزرا، مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی کوردی عێراقی چوە ناو (ح د ك)ەوە، مەلا مستەفا هەندیٚ هێزی عەشیرەتەکەی خۆی بۆ پشتگیری و لەسەر کردنەوەی ناوچەی مەهاباد هێنابوو، پاش ڕووخانی کۆمارەکە لە دیسامبری ١٩٤٦داو لە سێدارەدانی قازی محەممەد لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە، (ح د ك) ناچار بوو بکەوێتە کاری نهێنی و تا ڕادەیەك چالاکیەکانی کز بوون.

لە ڕاپەڕینەکانی ١٩٥١–١٩٥٣دا (ح د ك) و پارتە سیاسیە ئێرانیەکانی دیکە تا ڕادەیەك بووژانەوە، و ئەم ڕاستبوونەوەیە بە لابردنی تا لەلایەن سەرۆك وەزیران محەممەدی موسەدیقەوە گەیشتە پۆپەی گەشانەوە، بەڵام ڕاستبوونەوەکە ئەوەندەی نەبرد، کە تا بە کودەتایەك هێنرایەوە و (ح د ك) و هەموو حیزبەکانی ئۆپۆزیسیۆن ناچار چوونەوە کاری ژێر زەمینی.

جگە لەمە حیزبەکە ناچار بوو ناوی خۆی بگۆڕیٚ بۆ ح د ك – ١("١" ئاماژەیە بۆ ئێرانیەتی)، پاش ئەوەی مستەفا بارزانی دوای گەڕانەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە ساڵی ١٩٥٧[9]، (پ د ك)ی بۆ ناوی ئەو لقەی (ح د ك) هەڵبژارد کە ساڵی ١٩٤٦ پشتیوانی لە دامەزراندنی کردبوو لە عێراق، و لەژێر سەرکردەیی خۆیدا خەریك بوو پێگەی قایم و بەرینی پەیدا دەکرد، ئەم مەسەلەیە بابەتێکە کە بە دوور و درێژی لێی دەدوێن لە لاپەڕەکانی داهاتوودا.

لەبەر دژواری کارکردن لەناو خاکی ئێراندا، (پ د ك – ١) زۆرتر بایەخی داوەتە ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق، و سەرباری گلەییەکانیان لە بارزانی، تا کۆتایی شەستەکان ئەویان بەرابەر دادەنا، بەڵام پەیوەندی پەرەسێنیٚ نێوان شاو بارزانی، لەبەر ئەوەی بەرزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەغدا پێویستی بە پشتگیری هەبوو، دوپماکار (پ د ك–١)ی لە هاوتا عێراقیەکەی دوورخستەوە و لە (١٩٧٣) ڕوویکردەوە گیروگرفتەکانی کوردەکانی ئێران.

---

[9] جەنابی مەلا مستەفای بارزانی ساڵی ١٩٥٨ گەڕایەوە عێراق – وەرگێڕ.

هەرچەندێکو هەردوو حیزبەکە لەناودا لێك دەچن، (پ د ك)ی ئێران کە حیزبێکە لە بنەڕەتەوە شارستانی تەبار و هەڵبژاردە پێکهاتە و کەمتر بەلای خێڵەکیەتیدا لار، لە زۆر کەم خەسڵەتدا لەگەڵ (پ د ك)ی عێراقدا هاوبەشە کە حیزبێکی دێرینەوار و خاوەنی پەیوەندی بە توندی عەشرەتیە. (پ د ك-١) حیزبێکی چەپی میانەڕۆیە، و لە ژیانی سیاسی خۆیدا، سالّی یەکەمی تەمەنی نەبێ (١٩٤٥-١٩٤٦) هەرگیز لە داواکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ هەرێمی کوردنشین " لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراتدا" دەرنەچوە.

ناکۆکی توند لە پەیوەندیەکانی نێوان (پ د ك)ی ئێران و بەرامبەرەکەی (پ د ك)ی عێراقدا هەر بەردەوامە، (پ د ك)ی ئێران زۆرجار (پ د ك) عێراقی بەوە تاوانبار کردوە کە هێزەکانی سەروبەر لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا بۆ تێکدانی حیزبەکەیان و بزووتنەوەکەیان هاوکاری کردوە، هەروەها بێ وچان هەوڵی بۆ دەست بە سەرداگرتن و کۆنترۆڵکردنی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران داوە.

سالّی ١٩٨٠، داقلێشانێك لەناو کادرە پلە یەکەکانی (پ د ك-١)دا ڕوویدا، لەسەر مەسەلەی هەڵوێست لە حکوومەتی شۆڕشگێری ئێران: پشتی بگرن یان دژی بوەستنەوە؟ گرووپێکی بچووکیان، چوونە پاڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران (تودە) و پشتگیریان لە حکوومەتەکە کرد. زۆربەی حیزبەکە بە ڕابەرایەتی عەبدوڕەحمانی قاسملو کە ئابووریناسێکی دەرچووی زانستگاکانی وڵاتی چیکە، زۆری پێ نەچوو لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا کەوتنە پێکداهەڵپڕان، شەڕوپێکدا هەڵپرژانەکانی زۆر بۆ بەرژەوەندی (پ د ك-١)) وەرنەگەڕان و لە کۆتایی (١٩٨٣)دا ناچارمان لەگەڵ حکوومەتی عێراق و حیزبەکەی جەلال تاڵەبانی (puk)ی عێراقدا ببنە هاوپەیمان، قاسملو و تاڵەبانی دۆستی کۆنی یەکدی بوون و پێکەوە لە پراگ خوێندبوویان، لەگەڵ ئەمەشدا سەرکردایەتی (پ د ك-١) لە (puk) بەگومان بوو، ئەوان لەوە دەترسان کە ئەم هاوپەیمانیەیان ببێتە مۆری خیانەت بۆیان، چونکە بەغدا ئەودەم چ لەگەڵ ئێران و چ لەگەڵ زۆربەی حیزبە کوردیەکانی عێراقدا لە شەڕی دەستە و یەخەی گەرمدابوو، لەبەر ئەمە هەرگیز پشتیوانی تەواوی نە لەلایەن (puk)ەوە لێکرا و نە لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە، ئەوەبوو دویماکار سالّی ١٩٨٤ بە تەواوی لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە هەڵێنرا.

د. قاسملو تا كوژرانی لە ڤیەننا لە یۆلیۆ (تەمموزی) ١٩٨٨ و لە باروودۆخێكی تەمومژاویدا و لە كاتێكدا خەریكی وتووێژی ئاشتی بوو لەگەڵ نوێنەرانی تاراندا، هەر سەركردایەتی (پ د ك-١)ی كرد، سەركردایەتی حیزبەكە ئێستا چۆتە دەستی دوكتۆر سەعیدی شەرفكەندیەوە[10].

ژمارەی ئەو چەكدارانەی كە هێزەكانی (پ د ك-١)یان پێكهێناوە لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی جیاواز بوونە، لە گەرمەی شەڕەكانی ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨١ی لەگەڵ ئێراندا، باسیان لە (١٢٠٠٠) چەكدار دەكرد، بەڵام ئەم ژمارەیە ئەمڕۆكە تەنها هاتۆتە سەر چەند سەد كەسێك.

چ (پ د ك-١)، چ هەر پارتێكی سیاسی كورد بۆ خۆی، نەك هەر بۆی نیە لای ئەوە لێبدا كە پارتی سیاسی گشت كوردانە بەڵكو هیچ پارتێكی سیاسی هەرگیز لە كۆمەڵێكی بچووكی كوردەكانی ئێران بەولاوە نەیتوانیوە لەژێر ئاڵای خۆیدا كۆیكاتەوە، هۆی ئەمەش لە بنەكانەوە لەو جیاوازیە هەرێمی و كۆمەڵایەتی فەرهەنگیە قووڵەدایە كە كوردەكانی هەرە باكووری كوردستانی ئێران لەوانی هەرە باشوور لێك جیا دەكاتەوە، جیاوازی ئەم دوو بەشە لەگەڵ پارچە دابڕاوە گەورەكەی خۆراسانی دووردەست ئەوە هەر هیچ. پارتەكانی (پ د ك-١)،پ د ك ی ن ك، یان كۆمەڵە و هەموو پارتەكانی تر، بۆ كوردێكی ئێرانی خەڵكی باشووری كوردستان، لە جۆرە پێكهاتەیەكی نەنگەویست و نەی لێكراو بەولاوە هیچی ترنین، چونكە ئەو لە بنەكانەوە هیچ بە بایەخداری دانەناون بۆخۆی، لەم ڕووەوە، نەپلان و پڕۆژەكانی ئەم پارتیانە، نە پابەندی ئایینییان، نەزاراوە زمانیەكانیان، نە هەست و میزاجی ناوچەییان، نە توندڕوییان، نە پەیوەندیە عەترەشیەكانیان بۆ ئەو بكێشكەر و ئارەزوو گیرنەبوونە، هەرچی كوردەكانی خۆراسانن لە بیستنی ناوی ئەم حیزبانە بەولاوە هەریان لە بڕیان ناكەنەوە، بەهەرحاڵ، (پ د ك-١) هەرچەندە لای پێگەی بەرین و خەڵكی زۆرلێدات، برشتی داسی لە ناوچەیە تێناپەڕێ كە دەكەوێتە ورمێ و مەهاباد و مەریوانەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤٠).

(پ د ك-١) ئەوجا و ئێستاش بەرو ماوەیەكی زۆری لەبەردایە كە بتوانێ تێیدا بتەنێتەوە و تەرزهەڵدا، بە مەرجێك بتوانێ كاژی ناوچەگەری ئەستوور و ئاسۆتەسكیی فەرهەنگی لە خۆی داماڵێ، چونكە مێژوویەكی دوور و درێژ و دەوڵەمەندی لە ڕووبەڕووبوونەوە و پەنجە

---

[10] دوكتۆر صادقی شەرفكەندی پسپۆڕی كیمیا و برای شاعیری بەناوبانگ هەژاری موكریانی بە هەمان پیلان و بە دەستی هەمان بكوژان بە دەردی دوكتۆر قاسملو چوو. سەد داخ پەندی لەتێداچوونی ئەو وەرنەگرت.

نەرمکردنی لەگەڵ بەرەنگاریە گەورەکا هەیە، چ لە ناوەوە، چ لە دەرەوەی وڵاتەکە و دەتوانێ لە ئەڵقەی تەسکی دیاردەیەکی ناوخۆیی دەرباز بێ، گەر بتوانێ گۆڕانێك لە خۆیدا بێنێتەدی.

لە دیسامبر (کانونی یەکەم)ی ١٩٩١دا هەندێ ڕۆژنامەی ئێرانی باسیان لەوە کرد کە گوایە جۆرە گفتوگۆیەك لەنێوان (پ د ك–١) و دەوڵەتدا هەیە بۆ ئاغای شەرەفکەندی دووجار بیرکردنەوە پێویستە بەرلەوەی بەرەو ئەوها "گفتوگۆ"یەك هەنگاو بنێ، چونکە کارەساتی گیان لە دەستدانی دوا سەرکردەی حیزبەکە لە کەین و بەینێکی هاوشێوەدا تێیداچوو هێشتا تۆزی نەگرتوە.

كۆمەڵە: لە سەپتەمبەر (ئەیلول)ی ١٩٤٢دا، ڕێك سێ ساڵ بەر لە پێكهێنانی كۆماری كوردیی مەهاباد، پارتێكی نەتەوەیی سیاسی بەناوی "كۆمەڵە"وە لەلایەن هەندێ ڕوناكبیری چینی ناوەندی شارنشینی كورد دامەزرا، ئەوەبوو دوبیماكار (ح د ك) لەسەر كوانگی ئەو ساڵی ١٩٤٥ دروستبوو، بەڵام هەر لەسەر بزۆتكی نیوەسووتی كۆمەڵەوە، حیزبێكی نوێی تۆخ ماركسی لینینی هەر بەناوی كۆمەڵە"وە ڕاستەوە بوو.

هەموو شتەكانی كۆمەڵەوە لانێین، هەر ناوی حیزبەكە خۆی لە خۆیدا تەم و مژواییە، قاسملوی سەركردەی كۆچكردووی (پ د ك-١)) ساڵی ١٩٨٠ نووسیویە دەڵێ ناوی تەواوی كۆمەڵە: "كۆمەڵەی ژیانی كوردستان"ە (Challiand1986-118) لە كاتێكدا ڤان برونسن لەو باوەڕەدایە كە ناوەكە بۆ "ڕێكخراوی زەحمەتكێشانی شۆڕشگێری كوردستانی ئێران"ە، كۆمەڵە بە كوردی هەمان مانای "یەكێتی Society" ئینگلیزی دەگرێتەوە و بە گشتی مانای "یەكێتی"یەو لە هەمان كاتیشدا یانە یان یەكیەتیەكی سیاسی یان كۆمەڵایەتی.

پاش شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران، هەم كۆمەڵە، هەم (پ د ك-١) دژ بە دەسەڵاتداری ئێران لە كوردستاندا وەستانەوە، بەڵام هەرگیز كۆمەڵە ئەو پشتیوانی و پێگەیەی ناو خەڵكی نەبوە كە (پ د ك-١) هەیەتی، هەندێ جاریش وەكو ئەوەی ساڵی ١٩٨٥، هەردوو حیزبەكە كەوتوونەتە دەستەویەخەی خوێناویەوە دژ بە یەكتر، تەنانەت لەو كاتانەشدا كە هەردوو لەبەر هێرشی هێزە سوپاییەكانی دەوڵەتی ئێراندا بوون.

ساڵی ١٩٩١، دەنگوباسی وا بڵاوبوەوە كە كۆمەڵە بۆتە دووبەشەوە: زۆرینەیەك بە ڕابەرایەتی مەنسووری حیكمەت و كەمینەیەك بە ڕابەرایەتی عەبدوڵای موهتەدا (یان موهتەدی)، تا ئێستا نەزانراوە ئایا ئەم دوو بەرەكیە تا سەر دەڕوا یان هەردولا ڕێك دەكەونەوە، وەكو هەموو بزووتنەوە ماركسی لینینییەكانی تر، هەرەسهێنانی كۆمۆنیزم تەمەڵی ئیدیۆلۆژی كۆمەڵەشی خستۆتە داتەپین، وا ڕەچاو دەكرێ حیزبەكە بەم زوانە لەو ئیدیۆلۆژیە بێ بازاڕە دەربەڕێ و ئیدیۆلۆژیەكی زیاتر خۆیی هەڵبگرێ. مەودای چالاكی كۆمەڵە لە ناوچەیەكی تەسكدا بەندە كە دەكەوێتە هەرێمی مەریوان-سەنەندەجەوە، واتە باشووری مەریوان و مەودای كاركردنی (پ د ك-١).

وەکو (پ د ک)ی ئێران، کۆمەڵەش هاوشێوەیەکی عێراقی بۆخۆی دۆزیوەتەوە ئەویش کۆمەڵەی عێراقییە. کە بەچکەیەکی هەفتاکانی ئەم سەدەیەیە.

سازمانی نەتەوەیی: لە کۆتایی (١٩٧٩)دا شێخ عیزەدینی حوسەینی کە ڕابەرێکی ئایینی سوننی مەهابادیە، ڕابەرایەتی بەرهەڵستکاریەکی میللی دژ بە سیاسەتەکانی تاران کرد، سەرەڕای ئەو هەموو فشارەی لەلایەن هێزە دەوڵەتیەکانەوە لەسەری بوو، ئەو ساڵی ١٩٨٣ گرووپێکی بەناوی "سازمانی نەتەوەیی"یەوە پێکهێنا و توانی خەڵکێکی زۆر بە دەوری خۆیەوە کۆبکاتەوە.

دوایی، بوو بە گرووپێکی چەپگەرا و چوە پاڵ کۆمەڵە – ئامانجی سازمانەکە دابینکردنی جۆرە ئۆتۆنۆمییەکە بۆ کوردەکانی ئێران سەرکردایەتی بزووتنەوە کە لە ساڵی ١٩٨٤ و قایم بوونی جێ پێی کۆماری ئیسلامی لە کوردستاندا لە تاراوگەو لە ئەوروپا دەژی.

# عێراق

پارتی دیموکراتی کورد (پ د ک): پارتی دیموکراتی کوردستان، هەر لە سەردەمی دامەزرانیەوە ساڵی ١٩٤٦، و بە تایبەتی لە (١٩٦٠)ەکانەوە چالاکترین پارتی سیاسی کورد بوە، مەلا مستەفای بارزانی هێشتا لە مەهاباد و لەژێر سایەی کۆماری کورددا بوو کە پشتگیری پێکهێنانی "لق"ێکی (پ د ک)ی ئێرانی لە عێراق کردبوو و کاری بۆ کردبووو کە ئەم ڕاسپاردەیە لە بەشی باشووری کوردستانی عێراق لەلایەن ئیبراهیم ئەحمەدی، کە پارێزەر و ڕووناکبیرێکی خەڵکی سولەیمانی و خەزووری ئایندەی جەلال تاڵەبانی (سەیری ئەم بابەتەی خوارەوە بکە) بەجێهێنرا. ئیبراهیم ئەحمەد تا ساڵی ١٩٥٨ و کەم یان زۆر بەناوە تا کودەتا ناوخۆییکەی ساڵی ١٩٦٤ی بەرزانی کە بەلادانی ئیبراهیم کەوتەوە، حیزبەکەی بەڕێکی ڕابەری کرد.

ساڵی ١٩٥٨[11]، (پ د ک) ماوەی کارکردنی یاسایی پێدرا، پاش ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی و دامەزراندنی حکوومەتی کۆماری بە سەرکردایەتی قاسم، بارزانی بۆ گەڕانەوە بۆ وڵات

---

[11] پ د ک ساڵی ١٩٦٠ ماوەی کارکردنی یاسایی پێدرا. بەرلەوە هەمزە عەبدوڵڵا زۆرتر لەناو حیزبدا لەپێش بوو. هەمزە خۆی و یارانی ساڵی ١٩٥٩ لەلایەن دەستەکەی ترەوە کە بەرزانی ڕابەریەتی دەکردوو و ئیبراهیم ئەحمەدیشی تێدابوو لە حیزب دەرکرا.

بانگهێشت كرابوو، سێ ساڵ بەرلەوە لە كاتێكدا بارزانی هێشتا هەر لە تاراوگە بوو، كرا بوو بەسەرۆكی شەرەفی (پ د ك) . لە كاتێكدابەكردەوە هەرئیبراهیم ئەحمەد كار راپەڕێنی حیزبەكە بوو.

پاش گەڕانەوەی بۆ عیراق، بارزانی بە شێوەكی بەربلاو دەستی كرد بە دەست تێوەردانی كاروباری ناوخۆی حیزبەكە، هەرچەندێكو ئەوە لە بواری سەرۆكایەتیە شەرەفیەكەی ئەو بەدەربوو. ئەو بۆ ئەم مەبەستە، سەرباری ئەوەی دەیویست سەركردایەتی ڕاستەقینەی حیزبەكەی بەدەست بێت، دوو هۆی دەهێنایەوە ١) پ د ك لەلایەن كۆمەڵێك هەڵبژاردەی كوردی شار یەوە دەستی بەسەردا گیرابوو (بڕوانە كەسایەتی نەتەوەیی و سەركردایەتی و كەلتووری سیاسی) و ٢) حیزبەكە زۆر بەلای چەپدا دایدەڕنی. ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ كۆمیتەی ناوەندی (پ د ك)دا لە ساڵی ١٩٦٤ كەوتە باری كردەوە و ئاشكرابوون، كاتێك كە هەرلایە بڕیاری دەركردنی ئەوی دیكەی لە حیزب دەركرد. بەرزانی، كە پشتگیریی باڵی سەربازی بەلاوە بوو، لە ململانێكەدا براوە دەرچوو و بوو بە سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان كە سەرلەنوێ وەكو حیزبێكی نەرمەڕاسترەو ساز درایەوە. هێزەكانی بارزانی گەریلا چەكدارەكانی سەر بە سازمانە كۆنەكانی ئیبراهیم ئەحمەدیان بەو دیوی سنووردا پەستایە ئێرانەوە و بەو جۆرە لە كوردستانی عێراقدا بەردی بەردانیان نەما. ئەو هێزە ڕەتێنراوەی ئیبراهیم ئەحمەد دوا دوایی بوون بەناوكی دروستبوونی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بە ڕابەرایەتی جەلال تاڵەبانی.

تەنینەوەی پەیتاپەیتا و زیادبوونی شەپۆل وەشێنی دەسەڵاتی (پ د ك) لەناو خەڵكدا، وەستانەوەی لە ڕووی بەغدادا بۆ بەرزانی زیاتر ئاسان نیشاندا. هەندێ جار ئەم وەستانەوەیە هۆیەكی ئەوتۆ گرنگی نەبوو. ئەو ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ بەغدادا ڕێككەوتننامەیەكی بۆ ئۆتۆنۆمی دان بە كورد ئیمزا كردبوو (بڕوانە مێژووی ئەم دوایییە). ساڵی ١٩٧٤ كە شەڕە سەرلەنوێ لەگەڵ هێزە چەكدارەكانی عێراقدا سەری هەڵدایەوە، (پ د ك) بە ئاسانی دەیتوانی (٣٠٠٠٠) چەكداری پارتیزان بخاتە كارزارەوە، بەڵام نەزەبەندی هێزی پارتیزان و نە یارمەتی دەوڵەتی

---

لەوەودوا هەمزە گۆشەگیریی هەڵبژاردوو لە ژیانی سیاسی خۆیدا تا مردنی لە نەوەتەكاندا لە بواری بزووتنەوەی كورددا هیچ جموجۆڵێكی ئەوتۆی نەبووە – وەرگێڕ.

بێگانــە دەیتــوانی سیاســەتی ســەرنەکەوتوو ڕەقــەکاری کادرەکــانی حیــزب و ســەرکردایەتی بشارنەوە ئەوەبوو ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشەکە هەرەسی هێناو کارەساتی ئاوارەبوونی بـە کۆمـەڵی سەرکردە پلە یەکەکانی حیزب و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی سیویل و پێشمەرگەی بـەرەو ئێـران لێکەوتەوە حکوومەتی ئێران لـە نزیـك تـاران شـوێنێکی بـۆ ئاوارەکـانی حیـزب تـەرخان کـرد، ئێستاکەش هەندێ لەوانە هەر ماونەتـەوە لـەوێ، مووچـەی مانگانـە بـۆ سـەرکردە حیزبیـەکان بڕایەوە و پەنابەرەکانیش پاسپۆرتی ئێرانییان پێدرا کە بتوانن بۆ هەر شوێنێك بیانـەوێ بـڕۆن، بە مە تاران چاکەیەکی زۆری بۆ (پ د ك) کرد و پاداشتی ئەو کارانەشـی دایـەوە کـە بـە دزی و بە ئاشکرا بە قازانجی ئەو ئەنجامی دەدا، هەر لە کاری وێرانکارانەی پشت هێزەکانی عێراقـەوە لە جەنگی ئێران و عێراقەوە بیگرە تا دەگاتە یارمەتیدانی هێزەکـانی ئێـران لـە دامرکاندنـەوەی سەرهەڵدانەکانی کوردەکانی ئێراندا.

پاش مردنی مەلا مستەفا بـە شـێرپەنجە و لـەکاتی تیمـارکردنی لـە وڵاتـە یـەکگرتیوەکانی ئەمەریکا، ساڵی ١٩٧٨، سەرکردایەتی حیزبەکە چووە دەستی ئیدریسی کوڕە گەورەیەوە، کە ئەمیش ساڵی ١٩٨٧ مرد، مەسعوودی کوڕە گەورەی دیکەی بوو بە سەرۆکی حیزبەکە.

ئێستاکە حیزبەکـە دەتـوانێ (١٥٠٠٠) شـەڕکەری گـەریلا بخاتـە مەیدانـەوە، پێگـەی هێـزی زیاتر دەکەوێتە کەرتی باکووری کوردستانی عێراق، کـە دەورووبـەری سـەرزەمینی عەشـیرەتی بارزانە (کە یەکێکە لە هۆزە هەرە کۆنـەکانی کوردسـتان: بڕوانـە هۆزەکـان) بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیەنێ کە حیزبەکە لە شوێنی تری کوردستان خەڵك و خوای نیە، چونکە لە ناوچەکانی تری کوردستانی عێراقیش لایەنگری هەیە و مەیدانی چالاکیشی بە دەستەوەیە، حیزبەکە هێـشتا لـە دەرەوەش بە خاتری ناو بانگی ئەفسانەواری مـستەفا بـارزانی، ڕێـزی لێـدەگیرێ و پـشتیوانی زۆرن.

(پ د ك) ئێـستگەیەکی ڕادیـۆیی بـەناوی "دەنگـی کوردسـتانی عێـراق"ەوە دەگێـڕێ، کـە وەکو دەردەکـەوێ ئێستا لەناوچـە کوردنـشینەکانی عێراقـەوە بەرنامـە پـەخش دەکـا، سـاڵی ١٩٨٠ (پ د ك) پـەیمانێکی هاوپـەیمانی دژ بە بەغدای لەگەڵ پـارتی کۆمۆنیـستی عێـراق (Icp) و پارتی سوشیالیستی یەکگرتیوو و دوای ئەوەش پاش کۆتـایی هـاتنی جـەنگی کەنداو، لەگـەڵ

یەكێتی نیشتیمانی كوردستانی نەیارییدا بەست، تا نووسینی ئەم لاپەڕانە، ئەم پەیمانە هەر كارایە[12].

یەكێتی نیشتیمانی كوردستان (ی ن ك puk): (پ د ك)ی عێراق ئێستا لەلایەن یەكێتی نیشتیمانی كوردستان (puk)ەوە بەرامبەرگیری لێدەكرێ، (puk) زیاتر لە كەرتی باشووری كوردستانی عێراق خاوەنی پێگە و پایەیە.

هێزە چەكدارەكان و ئەو بەشەی (پ د ك) كە ئیبراهیم ئەحمەد ڕابەری دەكردن و ساڵی ١٩٦٤ لەلایەن بەرزانییەوە لە كوردستان دەركرا بوون، ساڵی ١٩٦٥ لەژێر ڕابەرایەتی جەلالەدین تاڵەبانی زاوای ئیبراهیم ئەحمەددا گەڕانەوە. جەلال ڕۆڵەی بنەماڵەی بە دەسەڵاتی تاڵەبانییە، كە لە ڕابردوودا چەندین كەسایەتی ئایینی و ئەدەبی ناسراو و ڕابەری سیاسی بە دیمەنی لێكەوتوتەوە، ئەو لە سەرەتاوە لەگەڵ بارزانییدا ئاشتەوەبوو و هێزەكانی لەگەڵ هێزەكانی ئەودا تێكەڵ كردەوە، بەهەرحاڵ، زۆری پێ نەچوو، بۆی دەركەوت كەخۆی و تاخمەكەشی خەریكن لەبن سێبەری پەرەسێنی بەرزانییدا ون دەبن و لە دەریای لەبیرچووندا نقوم دەبن، لە كاتێكدا شەپۆلی یارمەتی سەربازی و ماڵی تاران پەیتاپەیتا بۆ بەرزانی دەدەمێنران، ئەوەبوو تاڵەبانی دویماكار لەگەڵ بارزانییدا تێكیداو بە "خێڵەكی و دەرەبەگ یان كۆنەپەرست" تاوانباری كرد (Bruinessin 1986-22،Van ) لە بەرامبەر ئەمەدا بارزانی هێرشی بردە سەر هێزەكانی.

تا بەر لە هێرشە بەرفراوانەكەی بارزانی بگرێ، تاڵەبانی شتێكی كرد كە بە بیری كەسدا نەدەهات:

ئەو ساڵی ١٩٦٦ هێزەكانی خستە تەك بەغدا و كەوتە جەنگ لەگەڵ پێشمەرگە كوردە خۆییەكاندا كە ئەوسا بە سەركردایەتی بارزانی دژ بە بەغدا دەجەنگین، بەمە تاڵەبانی كەوتە بەر بارانی توندی ڕەخنە و تاوانبار كردن، هاتنەوەی بە لەناكاوی ئیبراهیم ئەحمەد لە تارانەوە بۆ بەغدا نەیتوانی وێنەی شێواوی تاڵەبانی هەموارتر بكاتەوە، لە دوو ساڵی پێش (١٩٧٠)دا تاڵەبانی وەكو كەسایەتیەكی پلە دووەم لە سیاسەتی كوردییدا مایەوە و مەگەر بە دەگمەن

---

[12] ئەم مەسەلەیە لەسەرییەوە تابنی پێویستی بە لێكدانەوە و هەڵسەنگاندنێكی هێمن و بابەتیانە هەیە — وەرگێڕ.

ئـەگینا ئەوەنـدە دەرنەدەکـەوت لـە بەرامبـەر کەسـایەتی و ناوبـانگی کێوئاسـای بەرزانییـدا، هەرچەندیکو چالاکی چاوقایمانە و دەسپێشخەری بێباکانەشی دەنواند.

رێککـەوتنی ئاشـتی و ئۆتۆنـۆمی کـە بەغدا و بـارزانی سـاڵی ١٩٧٠ ئیمزایـان کـرد (بڕوانـە مێژووی ئەم دواییە) دیسانەوە گرووپەکەی تاڵەبانی پەکخستەوە، لەبەر ئـەوەی بەغدا لەگـەڵ بەرزانییدا گەیشتبووە رێککەوتن، ئیتر تاڵەبانی ئەوەندە لەوێ جێی نەما، بۆیە ناچـار چـووەوە نـاو ڕیزەکـانی بەرزانیـەوە و تـا سـاڵی ١٩٧٥ و دوانووچـدانی بـەرزانی و هەرەسـهێنانی ئـەو راپەڕینەوە کـە (پ د ك) رابەرایـەتی دەکـرد لـەوێ مایـەوە. ئـەم جـارە، نـەك تاڵـەبانی بـەڵکو نزیکەی گشت ئەوانەی لەگەڵ بەرزانییدا هاوپەیمان بوون لێی تاکانـەوە، و زۆربـەیان ڕێکخـراوی سیاسی تایبەت بـە خۆیـان دامەزرانـد، تاڵـەبانیش هـەمان ڕێبـازی گرتەبـەر، راستیەکەی ئـەو خواخـوای هـەلێکی وای بـوو ئـەوەبوو لـە هـاوینی سـاڵی ١٩٧٦ تاڵـەبانی کـە ئەوسـا نوێنـەری بارزانی بوو لە دیمەشق، لەوێ یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتانی دامەزرانـد، کـە بـریتی بـوو لـە هاوپەیمانیەکی نێوان کۆمەڵەی عێراق و حیـزب (یـان بزووتنـەوەی) سۆشیالیـستی عێـراق (کـە پاشان بوو بە حیزبی سۆشیالیستی کوردستان) و گرووپەکەی تاڵەبانی خۆی لە ناو پارتییدا .

بۆ ئەوەی بتوانێ باڵادەستی بەسەر باڵی درێژ و بەرینی پارتییدا وەدەسـت بـێنێ، یـەکێتی پێویستی بە تەنینەوەی خێرا هەبوو بە وڵاتەکەدا، بۆیە سـەکۆی نـاوخۆی حیزبەکـەیان وا پـان کردەوە کە بتوانێ جێی هەر گرووپێکی نوێی کوردی تێدا ببێتـەوە، بـێ پەنگانـەوە لـە جـۆری بیرکردنەوە و ئاواش و ئامانجی سیاسی. ئەم هەمـە جـۆرەیی ئیدیۆلۆژیـە تـا ئەمڕۆکـەش هـەر بەردوامە، ئەوەتا لە چوارچێوەیدا، پلاتفـۆرمی پارێزگـار، نـاوەنجی و مارکسی گـشت لـە پـاڵ یەکدا کاردەکەن.

لە بەهاری ساڵی ١٩٧٨دا شـەڕێکی خوێنـاوی لـەنێوان (پ د ك) و (ی ن ك) لـە ناوچـەکانی سەر بە بارزانییدا ڕوویدا، ئەم شەڕە هەراو هەژانێکی گەورەی لەناو (ی ن ك)دا نایەوە، نزیکـەی (٨٠٠)کەسـێ لـە سـەرکردە سـەربازی و پێـشمەرگەکانی کـوژران یـان خۆیاندایـە دەسـتی حکوومەتەکانی تورکیا و عێراقەوە و ئەوانیش گشتیانیان لەناوبرد.

پاشـان حیزبـی سۆشیالیـستی کوردسـتان لـە (ی ن ك) جیـابووەوە و تاڵـەبانی ناچـاربوو بەدوای هاوپەیمانی تردا بگەڕێ، ئەوەبوو ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ کۆمەڵەی ئێراندا هاوپەیمانیـەکی

گرێدا، هەروەها ئارەزووی ئەوەشی دەكرد، كە (پ د ك–١)ی ئێرانیش كە خاوەنی گرانایییەكی تایبەتی بوو و ئەوسا هەم لەگەڵ هێزەكانی ئێران و هەم لە بەرامبەر هێزەكانی بەرزانیشدا لە مشتومڕدا بوو بۆ خۆی بكا بە هەوپەیمان. ساڵی ١٩٨١ نیمچە ڕێككەوتنێكی وەهای وەدەستهێنا، بەڵام زوو دەركەوت كە ئەو لەگەڵ هاوپەیمانێكی دوڕاودا كناری گرتووە.

ساڵی ١٩٨٣، كە (پ د ك) شانی بۆ هێزەكانی ئێران شلكرد بێنە خاكی كوردستانی عێراقەوە تاڵەبانی بە نیشانەی دژایەتی لەگەڵ ئەم كردەوەیەدا دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ بەغدادا كردەوە، لە كاتێكدا هێزەكانی لەگەڵ هەردوو حیزبی سۆشیالیستی كوردستان و پارتی كۆمۆنیستی عێراقدا دەستەو یەخەی شەڕ بوون، بەمە تۆمەتە كۆنەكانی خیانەت دیسانەوە بەسەر تاڵەبانییدا هەڵڕژێنرانەوە.

ساڵی ١٩٨٥، تاڵەبانی كەوتە گفتوگۆیەكی گەرمەوە لەگەڵ بەغدادا بە مەبەستی گەیشتن بەرێككەوتنێكی یەكجار بەرفراوان و پڕ بەڵێن بەو جۆرەی دەستی بۆ بەسنگدا دەدا، بەڵام فشاری گران و بەهێزی توركیا ڕێككەوتنەكەی لە بێشكەدا خەفەكرد و هەرگیز ئیمزای نەدی، سەرەنجام یەكێتی دیسانەوە لەگەڵ بەغدادا تێكچووەوە شەڕو پێكدادان لە نێوان هەردوولادا سەری هەڵدایەوە، لەم كاتەدا كۆمەڵەش لە یەكێتی تاكایەوەو حیزبەكە جارێكی تر تووشی لێكدابڕان بووەوە و ئەمە بوو بەهۆی لە دەستدانی بەرەبەرەی ئەندامان و لایەنگیریی ناو خەڵكی حیزبەكەش.

تاڵەبانی چەندین جار لەگەڵ حكوومەتی ناوەندی عێراقدا چۆتە وتوویژ و هاتووچۆوە بە ئامانجی چارەسەركردنی مەسەلەی كوردستانەوە، بەڵام لە هەموویدا بێ ئاكام و بە دەستی بەتاڵ هاتۆتە دەرەوە، دواترینی ئەم وتوویژانە، یەكسەر پاش كۆتایی هاتنی جەنگی كەنداو بە جووتە لەگەڵ (پ د ك)دا، ئەنجامدراوە و دوا كۆبوونەوەكان پێش لە كۆتایی ساڵی ١٩٩١ بێ هیچ ئەنجامێك دەرگایان داخرا.

(ی ن ك) ئێستا خۆی بە خاوەنی (٤٠٠٠) پێشمەرگە دادەنێ و پێگەیەكی لایەنگیریی قورسی لەناو دانیشتوانی كوردی كەرتی باشووری كوردستانی عێراقدا هەیە، بەڵام ئەو هیوای پێگەو گرانایییەكی گەلێ لەمە گەورەتری لە دڵدا دەپەروەراند.

حیزبی سۆشیالیستی کوردستان: بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان، کە بـە لێکدانـەوە و بڕیارە هەڵـەکانی تاڵـەبانی زۆر ئـاڵۆزبوو بـوو، دوای ئـەوەی لـە شـەڕە خوێناویـەکانی سـاڵی (١٩٧٨)ی نێوان هێزەکانی تاڵەبانی و بارزانییـدا، هێزەکـانی تووشـی دەسوەشـانێکی گـەورەو زیانێکی گران هاتن لە (ی ن ك) جیا بووەوە، حیزبەکە بە ڕابەرایەتی رەسوول مەمەنـد، لەگـەڵ مەحموود عوسمانـدا کـە هاوپـەیمانێکی کـۆن بـەڵام بـە خۆداچـووەوەی بـارزانی بـوو، حیزبـی سۆشیالیستی یەکگرتیووی کوردستانیان لە زستانی (١٩٧٩)دا پێکهێنا، ئەم هاوپەیمانیە تـەنها تا سـاڵی ١٩٨١ خـۆی ڕاگـرت. لـەوە و دوا هەریەکـە لـەدوو سـەرکردە بەلایەکدا بایاندایـەوە و لەمەدا رەسوول مامەند زۆربەی ئەندامان و ڕێکخراو و ناوی حیزبەکـەی لەگـەڵ خۆیـدا بـرد. لـە ترۆپکی چالاکییدا، حیزبەکە نزیکەی (١٧٠٠) پێشمەرگەی هەبوو.

زۆرجار تاوانی فڕاندنی ئەو ڕۆژاواییانەی لە عێراقدا کاریان دەکردو دوایـی گۆڕینـەوەیان بـە پارە، خراونەتە ئەستۆی حیزبی سۆشیالیستی کوردستان. جگە لەمـە حیزبەکـە چـەندین جـار هاوپەیمانیی لەگەڵ گەلێك حیزبی عێراقی و کوردستانی تردا بەسـتوەو، بـە تایبـەتی(پ د ك) و نەیاری و دژایەتی لەگەڵ ئەوانی بە تایبەتی(ی ن ك) و کۆمەڵەی عێراقدا کردوە، ئەوەبوو سـاڵی ١٩٨٣، شـەڕ لـەنێوان حیزبـی سۆشیالیـست و (ی ن ك)دا تەقییـەوە و چ سـەرکردایەتی و چ چەکدارانی حیزبی سۆشیالیست جەزرەبەی گەورەیان لێ وەشێنرا، شیعاری حیـزب لـە "مـاف چارەنووسەوە بۆ کوردان"ەوە بۆ "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان" گۆڕاوە.

کۆمەڵە: لە سەرەتای حەفتاکانـدا لـە سـەردەمێکی یـەکجار دژوار لـە کوردسـتانی عێراقـدا پارتی کۆمەڵەی عێراقی بووبوو بە کۆمایەکی شەڕفرۆشتن و گێرەشێوێنی لـە وڵاتەکـە و مایـەی دووبەرەکیەتی ناوخۆ و دەسدرێژی کردنە سەر حیزبە سیاسیە کوردەکان، بـە کـورتی ئـەویش لەم بوارەدا وەکـو کۆمەڵـەی ئێرانـی لێهـاتبوو، کۆمەڵـەی عێراقـی دەسـەڵات و هەیبـەتێکی بـە بەرەنگاریکردنی حکوومەتی عێـراق لـە پرۆسـەی بـە زۆر گواسـتنەوەی کـوردە عێراقیـەکان لـە ناوچە سنووریەکان پاش هەرەسهێنانی هێزەکانی بەرزانی پەیدا کردبوو، هەر ئەم هەیبەتەشـی تەوژمێکی تری دا بە هاوپەیمانیەکەی (ی ن ك) پاش ئەوەی کۆمەڵە چووە ناویەوە.

پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان (DPPK). ئەم حیزبـە سـاڵی ١٩٨١ دامـەزرا. لـە هـەموو مـاوەی تەمەنییـدا، هـەر بـە هاوپـەیمانی (ی ن ك) مایـەوە. دامەزرێنـەر و سـەرۆکی حیزبەکـە

محەممەد مەحموود عەبدورەحمانە، كە زۆرترین بە نازناوی (سامی) ناسراوە، وەكو زۆربەی سەركردە كوردەكانی عێراق، سامیش هاوپەیمانێكی كۆنی دڵسۆزی مستەفا بارزانی بوو تا ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ (پ د ك)ی دووبارە ڕێكخراوە و كوڕانی بارزانی ئیدریس و مەسعوودا مایەوە، لە ١٩٧٩دا، پاش ئەوەی بێزاری لە دەسەڵاتخوازی بێ سنووری ئیدریس دەربڕی لە (پ د ك) تاكایەوە و پارتی گەلی دیموكراتی كوردستانی دامەزراند.

حیزبی كۆمۆنیستی عێراق: هەرچەندە لە بنەڕەتەوە حیزبی كۆمونیستی عێراق حیزبێكی كوردیی سرف نیە، بەڵام چونكە حیزبەكە زۆرتر بە پشتیوانی كورد پشت ئەستوورە و پڕە لە ئەندامی كورد لە سازمانە ڕابەریەكانییدا، دەبێ ئەویش لە ڕیزی حیزبە كوردیەكان بژمێرین، هەموو ئەو شەڕكەرەی حیزبەكە هەیەتی بریتیە لە نزیكەی ئەو هەزار چەكدارە كوردەی كە لەژێر ئاڵایدا كۆبوونەتەوە.

ئەنجامگیریەك: ڕەفتاری درندانەی مەكینەی جەنگیی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ خەڵكی مەدەنی كورددا لە ساڵی ١٩٨٨ و دوو ساڵی دوا بەدوایدا، بەرەبەرە پارتە سیاسیە كوردیەكانی عێراقی ناچار كرد بگەنە ئەنجامگیریەك كەوا لە هاوپەیمانی و یەكگرتن بەولاوە ئەڵتەرناتیڤی تریان نیە، تەنانەت ئەگەر مەبەست شەڕی دوژمنیش نەبێ و تەنها بە مەبەستی خۆ پاراستن و مانەوەش بێ، هەموو ئەو حیزبە كوردیە عێراقیانەی كە چەند ساڵ بوو چنگیان لە ڕیشی یەكدی گیر كردبوو، هەروەها ئەتوانم بڵێم نزیكەی گشت حیزبە سیاسیە عێراقیەكانیش، پاش لە گرمەو لووره كەوتنی جەنگی نۆكەندی فارس بۆره پەیمانێكیان بە ئامانجی لە كۆڵكردنەوەی مۆتەكەی سەرسنگی هەموویان، واتە ڕژێمی سەدام حوسێن بەستبوو. جگە لەمە هەرەشەیەكی چاوەڕوان نەكراو، بە گوێ قوتەوەكردنی پارتی كرێكارانی كوردستان (pkk) كە لەناو كوردەكانی توركیاوە سەری هەڵدابوو هاتبووە كایەوە، بە پەیداكردنی جێ پێی قایم لەناو خەڵكدا، چ حیزبەكە خۆی چ عەبدوڵا ئۆجەلانی ڕابەری، وەكو دەردەكەوێ خەریكە هەمان هەیبەت و خۆشەویستی وەرگرێ، كە مستەفا بارزانی هەیبوو، كە ئەم كتێبە لە تەواو كردندابوو ئەم هاوپەیمانیە، كەم یان زۆر، هەر بەردەوام بوو.

# تورکیا

خۆیبوون: خۆیبون کە سالّی ١٩١٨ لەلایەن هەندیّ کوردی ئەریستوکرات و رووناکبیرەوە لە پاریس دامەزرێنرا[13]، یەکەم حیزبی سیاسی کوردە بە مانای سەردەمانەی حیزبی سیاسی، خۆیبوون پاشان بنکەی گواستەوە بۆ سوریا کە ئەوکات لەژێر خاوەنداریەتی فەرەنسادا بوو، حیزبەکە سالّی ١٩٢٧ پێکهێنانی حکومەتێکی تاراوگەی جاڕدا و کە سالّ وەرسوڕایەوە (١٩٢٨) کەوتە کنوکۆی بەرپاکردنی شۆڕشێك لە ناوەوەی تورکیادا، پاش ئەوەی گشت بارەگاکانی گواستەوە ئەویّ، بەلاّم سالّی ١٩٣٠ راپەرینەکە لە قەلاّی قایمی کە چیای ئەرارات بوو سارد کرایەوە و ئیحسان نووری پاشای سەرکردەی ناچار گواستیەوە بۆ تاراوگە لە تاران، پاش ئەم تێکشکانە، کوردەکان ناچار بوون (٣٧) سالّی تر هەلّوێستە بکەن، بەر لەوەی دیسانەوە پارتێکی سیاسی تر پێك بێننەوە.

پارتی دیموکراتی کورد (پ د ك – ت): سالّی ١٩٦٧، بە سەرکردایەتی پارێزەرێکی ئورفەیی، فایق بۆچاك دامەزرێنرا، حیزبەکە لەسەر هەمان مودێلی (پ د ك)ی عێراق پێکهێنرا و پەیوەندی پتەویشی لەگەلّییدا هەیە، ئەوەندەی پیّ نەچوو (پ د ك – ت) لەلایەن ئەنقەرەوە خرایە ژێر فشاریکی یەکجار گرانەوە و دەولّەت بۆ ئەم مەبەستە لەشکرێکی زۆری فرێدایە هەرێمە کوردنشینەکانی ئەنەدۆلّەوە، سالّی ١٩٦٨ بۆجاك کوژرا، سەعید ئێلچی هەفالّ و جێگریشی سالّی ١٩٧٠ کەلە کوردستانی عێراق بە پەنابەریی نیشتبووەوە، بەهەمان دەردی ئەو چوو... ، سالّی ١٩٦٩ حیزبەکە دووچاری داقلّیشان بوو، و بالّێکی بە رابەری (دکتۆر دیڤان) لیّ تاکایەوە و لەمە حیزبێکی زیاتر رادیکالی چەپگەرا پێکهات کە بانگەشەی سەربەخۆیی کوردستانی لە تورکیا و هەموو دەولّەتە دراوسێکان هەلّدا.

پارتی کرێکارانی کوردستان (pkk): سالّی ١٩٧٤، بالّێکی کوردی لە پارتی لاوانی شۆڕشگێری تورك جیابووەوە، ئەم بالّە سالّی ١٩٧٨ وەکو حیزبێکی سیاسی سەربەخۆ خۆی

---

[13] خۆیبوون سالّی ١٩٢٧ دامەزرا.

جارێدا، دوای ئەوە حیزبەكە مەڵبەندی چالاكی خۆی لە ئەنقەرەوە گواستەوە بۆ كوردستان، ساڵی ١٩٧٩ ناوی پارتی كرێكارانی كوردستان (پ ك ك)ی بۆ خۆی بانگدا.

حیزبەكە كە لەسەر بنەمای ماركسی لینینی دامەزرابوو، ئامانجەكانی خۆی تەنها لە ڕزگاری كوردستاندا نەسنووراند، بەڵكو ڕزگاری لە دەستی "دەرەبەگایەتی و كۆلۆنیالیزم و جیاوازی چینایەتیش" بۆ خۆی كردە نیشان، بەم جۆرە شەرعیەتی سەردەك خێڵە كوردەكان و دەسەلاتیانی خستە بەر هەڕەشە. نەك هەر ئەمە بەڵكو هەر بە داردەستی دەوڵەتی توركیشی دانە قەڵەم، بۆیە هەردوولا، كەوتنە بەر شالاوی (pkk) بەلام لە هەشتاكانەوە هەڵوێستی حیزبەكە بەرامبەر دەسەلاتداریە دێرینەكانی ناوخۆی كوردان بەرەبەرە داویە لە نەرمی.

پاش هەرەسهێنانی كۆمۆنیزمی جیهانی، وێ دەچێ (پ د ك) بە هەڵویستی وشكە ماركسیچیەتی خۆیدا چوونبێتەوە و زیاتر ڕووی كردبێتە بەها كوردەواریە خۆییەكان و بۆچوونی بورجوازیانەی نیشتیمانی.

(پ ك ك) تاكە حیزبی سیاسی كوردە كە لە كۆمیتەی سەركردایەتیدا سەرۆك خێڵی ئەندام نەبێ، حیزبەكە هەوڵێكی زۆریداوە و گەیشتووتە بە دابینكردنی پشتیوانی چینی خوارەوەی كورد، كە یەكجار بەربلاوە، ئەم حیزبە زیاتر لەو حیزبانەی دەستەی هەڵبژاردەی كورد سەركردەییان دەكەن، لەگەڵ ئەم چینەدا ئاشنایە، بەلام چونكە گەریلاكانی بۆیان دەركەوتووە كە داواكاری یارمەتی لە خەڵكی سیویلی كورد دەبێتە مایەی چ چەرمەسەرییەك بۆ خەڵكەكە، بۆیە ڕوویان كردۆتە قولایی چیاو دارستانەكان و لەوێ ژیانێكی ئەوتۆ كولەمەرگی دەبەنە سەر، كە هیچ گرووپێكی گەریلای كورد هێشتا تووشی نەبوونە.

وەكو هەر پارتێكی سیاسی تر، (پ ك ك)ش بۆ ئەوەی مانی خۆی مسۆگەر بكا، ناچاربووە شان بۆ هەندێ بابەتی كۆمەلایەتی ولاتەكە شل بكا.

ئێستا حیزبەكە سەركردە خێڵەكیە" پێشكەوتنخوازەكان"ی لە "كۆنە پەرستەكان" جیا داناوە و ئەمەی كردوە بە پێوانەی پشتگیری كردن و داشداری كردنی گەریلاكان( Van Bruinessen 1988 -44).

بەم کردەوەیە (پ ک ک) توانیویەتی هەلومەرجی ئەموارتر بۆ ژیان و مانەوەی خۆی بڕەخسێنێ.

لەم ساڵانەی دواییدا، (پ ک ک) هەڵوێستی ڕادیکالانەو نەیکەری لە ئایین گۆڕیوە و ئایینی وکو هێزێکی گرنگی کۆمەڵایەتی ناسیووە و هەوڵی داوە بۆ سوودی کاروباری خۆی بەکاری بێنێ، بەم جۆرە لە جیهانبینی (پ ک ک)دا، کەسایەتیە ئایینیەکانیش وەکو سەرۆك خێڵەکان بەسەر "پێشکەوتنخواز" و " کۆنەپەرست"دا دابەش کراون.

هەر لە سەرەتای دامەزرانیەوە، (پ ک ک) لەلایەن عەبدولا ئۆجەلانەوە (ئوەج ئالان)ەوە سەرکردەیی کراوە، ئەو لەناو خەڵکدا لەبەر خۆشەویستی بە "ئاپۆ" بەناوبانگە. لە کوردیدا باوە خەڵك بە کورتکراوەی ناوەکەی بانگ بکرێ، بەم جۆرە (ئاپۆ) کورتکراوەی "ئەپتولا" کە ناوی ڕاستەقینەی ئۆجەلان خۆیەتی، بەڵام "ئاپۆ" بە ڕێکەوت لە کوردیشدا بە مانای "مام" دێت.

بەم جۆرە لە هەردوو بابەتدا ناوەکە پڕە لە مانای خۆشەویستی، ئەوی ڕاست بێ ئەندامانی (پ ک ک) لە تورکیا باشتر بەناوی "ئاپۆجو" ئاپۆچو، کە بە تورکی دەکا "خزمانی ئاپۆ" یان "هەوادارانی ئاپۆ"، ناسراون.

چالاکییەکانی (پ ک ک) پاش کودەتاکەی ساڵی ۱۹۸۰ لە تورکیا بە دەنگدانی حکوومەتی عورفی لە هەرێمە کوردنشینەکاندا، کە تا ئێستاش لە هەندێ ناوچەدا هەر لە کاردایە، تەگەرەیان بەرکەوت و تا ڕادەیەك وەستان، حیزبەکە ناچار بەشێکی زۆری چالاکیەکانی بۆ ناو کوردەکانی تاراوگە لە ڕۆژاوا و باکووری ئەورووپا گواستەوە، لەوێ کەش و هەوایەکی لە باری لەناو لاوەکاندا بۆ رەخسا کە گشت تینووی کارکردن بوون، جگە لەمە، (پ ک ک) لە سوریا و لە دۆڵی (بەقاع)ی لوبنان کە بە دەست سوریەکانەوە بوو، بارەگای بۆخۆی دامەزراند، لەوێ لەسەر دەستی گرووپە گەریلا فەلەستینیەکان مەشق و ڕاهێنانێکی باشیان وەرگرت و هاوینی ۱۹۸۳ کە گەڕانەوە وڵاتەکەی خۆیان بە کارایی لە چالاکیەکانیاندا بە کاریان هێنا، ئیتر هەرچی دامودەزگای سوپای تورکیا و هاووڵاتی کوردی گومان لێکراو بە هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتدا هەبوون کەوتنە بەر پەلامار و پرسینەوە و سزادان.

لە ساڵی (١٩٨٠) شەوە (پ ك ك) لەلایەن (پ د ك)ەوە پاڵپشتی لێكراوە و لە كوردستانی عێراقدا دەرفەتی پێگە دانانی پێدراوە تا لەوێوە هێرش بەرێ بۆ ئامانجەكانی لە ناوەوەی توركیا، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی توركیا ساڵی ١٩٨٣ لەشكر بكێشێتە ناو كوردستانی عێراقەوە و گەلێ جێگا داگیر بكا و بكەوێتە هەوڵی پەلاماردانی چ (پ د ك) بە بەمەستی سزادان، چ (پ ك ك) بە ئامانجی زەربەی قورس تێسرەواندن و لەناوبردن، بەڵام نەیتوانی هیچ كاتێك لەم دوو ئامانجە یەكێكیان بپێكێ.

لە ساڵی (١٩٨٤)ەوە تا (١٩٩١) چالاكیەكانی (پ ك ك) لەناوەوەی توركیا، بەرەبەرە لەبەر بوونی چڕی لەشكری توركیا و بەكارهێنانی یەكجار بە توندی حوكمی عورفی لەناوچە هەرە نا ئارامەكانی كوردستان بەرگیركران. لەم ماوەیەدا، پێكدا پرژانی جارجارە، ڕفاندنی كەسان، و هەڵڵای پڕ لە بگرە و بەردەی پروپاگەندە و جەنگی ڕاگەیاندن، نیشانەی هەرە دیاری بارودۆخەكە هاواری دەكرد كە بێ گۆڕانێكی بنەڕەتیی و قووڵ بەری بنبەستەكە ناكرێتەوە.

پاش دامركانەوەی جەنگی تۆكەند و كشانەوەی دەوڵەتی عێراق بە ناوچە سنووریەكانیشەوە، هەلێكی باش بۆ (پ ك ك) ڕەخسا كە گوڕبداتەوە بە چالاكیەكانی و ئەو ناوچانە بۆ ئەو مەبەستە بەكاربێنێ. ئەم كارە بێ گەڕانەوە بو (پ د ك)ی عێراق و وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەو كرا، هەرچەندە گشت كەس دەیزانی ئەو سنوورانە لە كۆنترۆڵی ئەودابوون، هەردوو حیزبی (پ د ك) و (ی ن ك)ی عێراقی هەمیشە بە تەنگەوە بوونە، لە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بەغدادا، ئەنقەرە ئاگادارو ڕەزامەند بێ و هەرگیز نەیانویستووە بۆ خاتری (پ ك ك) (یان هەر گرووپێكی تری كوردی ئەنەدۆڵ، سەبارەت بەهەمان هۆ) ئەم ڕێككەوتنە تازە وەدەستهاتووەیان لەگەڵ ئەنقەرەدا بشێوێنن، لە بەرامبەردا (پ ك ك) بە توندی (پ د ك) و بە تایبەتی(ی ن ك)ی ڕەخنە باران كردوە لەسەر"هاوكاری كۆنە پەرستانەو خیانەتكارانەیان" لەگەڵ ئەنقەرەدا، شێلنگەی تایبەتی ڕەخنە ئاراستەی (ی ن ك) كرابوو و بە (قەحبەیی سیاسی) تاوانبار كرابوو لەوەدا كە "هەمیشە خۆی بەو كڕیارە فرۆشتووە كە باشترین نرخی دابێ، چونكە ئیتر كاروانی یارمەتی و بار و بووی تاران ئیتر ڕووەو (ی ن ك) شۆڕبەدەبوەوە" بەڵام لەو ڕەخنەوەشانیەی (پ ك ك)دا، ئەوە باس نەكرا بوو، كە هەمان كاروانی خورجین پڕ خەریك بوو دەگەیشتە بارەگاكانی خۆیان.

بەهەمان شێوەی ساڵی ١٩٨٣ کردیان، هێزەکانی تورکیا ساڵی ١٩٩١، سنوورەکانی عێراقیان بە هیوای کوشتن و تارومارکردنی گەریلاکانی (پ ك ك) بەزاندەوە، هەر ئەم جارە روە و سنوورەکانی ئێرانیش ملیان ناو چەند جار بەزاندیانەوە بەهەمان شێوەی ساڵی ١٩٨٣ کردبوویان، لەمەدا زۆر بێ پەروانە رەفتاریان کرد، چونکە بە بەشێکیان دادەنا لە جێهێنانی بەرژەوەندی هەردوولا لە بەربەرەکانێکردنی یاخیگەریدا، بەلام هەردوولایان شەکریان خواردبوو! ، چونکە ئەم کردەوەیەیان ئێرانی هەر وەکو سوریا، راستەوخۆ کردە پاڵپشت بۆ ئەو هێزە کوردیانەی کە لەناو تورکیادا کارزاریان دەگێرا، و ئەم هێزەش لە (پ ك ك) بەولاوە کەسی تر نەبوو. لەگەڵ تێکچوونی پەیتاپەیتای پەیوەندیەکانی نێوان ئەنقەرە و تاران لەسەر کۆمەڵێك بابەتی لێکدانی بەرژەوەندیەکان، بە وەزعی ناسکی سیاسی قەفقاس و ئاسیای ناوەندەوە، دراوسێ دۆستەکانی جاران ناچاردەمان، هەریەکەیان نەیارەکانی ئەوی تر پڕ چەك كا.

لە کاتێکداکە ئەنقەرە یارمەتی گرووپی موجاهیدینی ئێرانی دەدا و لە ئازەربایجانی ئێران ئاگری ئاژاوە خۆش دەکا، (پ ك ك) یارمەتی پەیتاپەیتای زیاتر لە هی ئەمڕۆ لە تاران وەردەگرێ.

پشتگیری کردنی بەهێزی ئێران لە (پ ك ك) لەوانەیە ببێتە مایەی دامەزرانی هاوپەیمانیەکی ئاشکرای نێوان (پ د ك)ی عێراق و (پ ك ك) و هەر ئەمەش ئەو سیناریۆیەیە کە تورکیا زەندەقی لێچووە.

ئەم هاوپەیمانیە بۆ هەردوولا سوودبەخش دەبێ، چونکە لەلایەکەوە دەبێتە مایەی قایمکردنی پێگەی (پ د ك) بەرامبەر بە (ی ن ك) لە عێراق، و لە هەمانکاتدا پێشمەرگە پڕ چەك و لە شەڕدا سواوەکانی (پ د ك) دەچنە هاواری براکانی (پ ك ك)ەیان و لە بنکەکانی ناو عێراقی خۆیانەوە یارمەتیان دەدەن.

(پ ك ك) خاوەنی نزیکەی (١٠– ١٥) هەزار پێشمەرگەیە و لە هەموو گرووپە گەریلاکانی تری کورد، رێژەی پێشمەرگەی ژنی تێدا زیاترە (بڕوانە بارودۆخی ژنان و ژیانی خێزانەتی).

لە تاراوگە، بلاو کراوەکانی (پ ك ك) کەمتر باسی شێوازی رەفتاری سەربازیی رێکخراوەکە لەناو ولاتدا دەکەن، دەزگاکانی بلاوکردنەوەی (پ ك ك)، چاپەمەنیەکانی زۆر بە زمانی کوردی

بڵاودەكەنەوە لە پاڵ چەندین هەواڵنامەدا، هەموو ئەمانە بەشێوەیەكی بەربڵاو و رێكوپێك دەگەنە دەستی خوێنەران، بە جۆرێك بۆتە مایەی سەرسوورمان بۆ ئەو كەسانەی لە كەمی چاپەمەنی كوردی و دووره پەرێزی فەرهەنگیی حیزبە كوردیەكان شارەزان. ئەوی پێویستی وتنە لێرەدا، پەكەكە بەم چالاكیە فەرهەنگیەی تۆڵەی هەفتا ساڵی رەبەقی سەركوتكردنی چاپەمەنی و خوێندەواری كوردانی توركیای كردۆتەوە.

پارتی سۆشیالیستی كوردی توركیا (KSPT): ساڵی ١٩٧٤، واتە هەمان ساڵ كە (BKK)ی تێدا دامەزرا ئەندامە كوردەكانی حیزبی كرێكارانی توركیا حیزبێكی نوێی كوردی سرف ماركسییان دامەزراند و ناویان نا پارتی سۆشیالیستی كوردی توركیا (KSPT)، زۆربەی ئەندامانی حیزبەكە، لە دامەزراندنیەوە لە زیندان قایم كراون و كەمال بورقای سكرتێری ئێستا لە تاراوگە لە دەرەوەی توركیا دەژی. لە زۆربەی ماوەی بوونیدا، چالاكیەكانی حیزبەكە لەناو كوردەكانی ئاوارەی وڵاتانی ئەوروپادا گێڕراون.

ئەم بابەتە لە دەرەوەی بازنەی مەبەستی ئەم كتێبەدایە.

كۆمكار: تاكە حیزبی تر كە لە قەوارەدا لە (پ ك ك) نزیك بێ، كۆمكارە، حیزبەكە لەلایەن كوردە ئەنەدۆڵیەكانی تاراوگەوە لە ئەڵمانیا و سوید دروست كراوە.

بەڕاستی، لە بواری فەرهەنگییدا، حیزبەكە بە بڵاوكردنەوەی چاپەمەنیەكی زۆر و زەبەندی لە ڕووی چۆنایەتیەوە بەرز و دەوڵەمەند، كارێكی گەورەی كردووە، ئەم چاپەمەنیە بۆ كورد و بە دەستی ڕەنگینی كورد ئامادە كراوە و لەسەر ئەمە جێی ستایش و بایەخە. بەڵام لە ڕووی مەیدانی چالاكیەوە، كۆمكار حیزبی كوردە ئاوارەكانی ئەوروپایە هەر بۆیەشە، ئەویش دەكەوێتە دەرەوەی ئامانجی ئەم كتێبەوە.

حیزبی ئیسلامی كوردستان (PIK): ئەمە حیزبێكی سوننی مەزەب و خاوەنی بەرنامەیەكی سیاسی ئایینییە. لەم دواییانەی دواییدا سەرانی حیزبەكەزیاتر خۆیان بەلایەنی نەتەوەییەوە خەریك كردووە لە هی ئایینگەرانی ڕەسمی حیزبەكە، كە بە "جودی" ناسراوە – جودی ئاماژەیەكە بۆ چیای جوودی لە كوردستان كە لە تەلموودا ناوی هاتووە و گوایە جێی نیشتنەوەی كەشتیەكەی نووحە – بە ڕوونی بیروبۆچوونی حیزبەكە دەردەخا. مەیدانی سەرەكیی كاركردنی حیزبەكە لەو هەرێمە سنوورییانەی كوردستانی توركیایە كە مەڵبەندی

کۆبوونەوەی چەندین ئاییینی جۆرا و جۆرە وەکو مەلاتیە و ئەلازیگ کە مەکۆی سوننی و عەلەوین و سێرت و باتمان کە شوێنی یەزیدی و مەسیحی و مسولمانی سوننین.

پارتیزان: ئەم حیزبە کوت و مت حیزبی کۆمۆنیستی عێراقە و هەمان پەیوەندی بە توندی ئەوی لەگەڵ کوردەکاندا هەیە، حیزبەکە بریتییە لە رێکخراوێکی رادیکالی چەپی سەرانسەری تورکیایی، نزیکەی هەموو کۆی ئەندامەکانی عەلەوی ریشەن و بەمە کوردێکی عەلەوی زۆریشی بە دەور خۆیەوە کۆکردۆتەوە، عەلەویە کوردەکان، چ لە سەرکردایەتی چ لە ریزەکانی حیزبەکەدا سەنگێکی گەورەیان هەیە، ئەم عەلەویانە لە تورکیا لە دوو رووەوە بە پشتگوێ خراو دادەنرێن: لە رووی ئایینەوە (بەرامبەر بە برا کوردە سونیەکانیان) و لە رووی ئەتنیکیەوە (وەکو کورد بەرامبەر بە زۆرینەی تورکی تورکیا) باش دیارە کەوا عەلەویەکان ئارەزووی یەکسانی دەکەن چ بەرامبەر بە برا کوردەکانی خۆیان و چ بەرامبەر هاوولاتیە تورکەکانیان بەگشتی. باوەشی رێکخراوە چەپەکان، پەناگەیەکی باشە لە بەرامبەر ئەو دڵەراوکێیەدا کە بۆ ئەم کوردە ناموسڵمانانە دروستکراوە لەلایەن رێکخراوە سیاسیە راستڕەو بگرە ناوەنجییەکانیشەوە کە زیاتر لەلایەن کەسانی سوننییەوە سەرکردایەتی دەکرێن، چ کورد بن یان تورک.

## سوریا

پارتی دیموکراتی کوردی (پ د ک – س): پەڵەپەڵەیی و بەدەمیەکەوە نەبوونی هەرێمە کوردنشینەکانی سوریا، کۆسپێکە لە بەردەم هەر هەوڵێکدا بۆ دەرخستنی یەککگرتوویی ئاوات و داخوازیەکانی کوردەکانی سوریا وەکو نەتەوەیەکی جیاواز، تەنانەت لە چوارچێوەی دەوڵەتی سوریاشدا. سوریا هەمیشە وەکو پێگەی وەکارکەوتن بووە بۆ ئەو حیزبە سیاسیە کوردانەی کە لە تورکیا و عێراقەوە هاتوون نەك بۆ هی کوردانی ناوەوەی خۆی. وێنەی راستەقینەی سوود وەرگرتنی ئەو حیزبانە لە خاکی سوریا، لەو باسانە دەردەکەوێ کە لەسەرەوە لە مەڕ ئەم حیزبانەوە کردوومانن، بۆ نموونە بروانە باسی خۆیبوون، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان کە باشترین وێنەن.

ساڵی ١٩٥٧، بە هەرحاڵ، "لق"ێکی حیزبی دیموکراتی کورد لە سوریا دامەزرا، واتە (١٠) ساڵ بەر لە دایکبوونی کۆڕپەیەك بەهەمان ناو لە تورکیا، داخوازی حیزبەکە لە دەورووبەری

حوكمێكی ئۆتۆنۆمی بۆ كوردەكان لە چوارچێوەی سوریادا دەگەڕا، ساڵی ١٩٥٩ و لە سەردەمی حوكمی ليوا (عبدالحميد سراج) لە سوريا لە چوارچێوەی یەكگرتنە كورتەكەی سوريا و ميسر، حيزبەكە بە ناياسايی دانرا و سەركردە و ئەندامەكانی لە زيندان توند كران.

جگە لەم حيزبە، هيچ حيزبێكی تری كورد ناسنامە، كە شايانی باسبێ، لە سوريا دانەنراوە[14].

بۆ سەرچاوە و زانياری بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography;** Very valuable primary sources are the detailed tape interviews with many Kurdish leaders and political figures on deposit in the Oral History Archives at the Kurdish Library in Brooklyn, New York. An excellent reference book on the Kurdish political and semi-political organizations in Kurdistan and diaspora is Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico international, 1991), section 3; Gerard Challiand, ed., *People Without a Country* (London: Zed, 1980); *Echo of Iran* (Teheran: Echo of Iran Press, various issues, especially the annual almanacs); Great Britain, Office of the Civil Commissioner, *Personalities in Kurdistan* (Baghdad, 1919), and also *Personalities* for *Mosul, Arbil, Kirkuk*, and *Sulaimaniyyah* (Baghdad, 1922-23); Ferdinand Hennerbichler, "Iran's Kurdish Rebellion and its Leaders," *Swiss Review of World Affairs* 29 (March 1980); UK, Foreign and Commonwealth Office, "The Kurdish Problem," Background Brief, (London, July 1986); Chris Kutschera, *Le mouvement national kurde* (Paris: Flammarion, 1979); Chris Kutschera, "Le Mouvement National Kurde," *Military Review* 6-6 (1981); Christiane More, *Le Kurdes d'aujourdhui: Mouvement national et partis politiques* (Paris: Editions l'Harmattan, 1984); Martin van Bruinessen, "The Kurds between Iran and Iraq," *Middle East Report* (July-August 1986); Martin van Bruinessen, "Between Guerrilla War and Political Murder: The Workers' Party of Kurdistan [PKK]," *Middle East Report* (July-August 1988); Martin van Bruinessen, "The Kurds in Turkey," *MERIP Reports* 16.141 (1986); Marvin Zonis, *The Political Elite of Iran* (Princeton: Princeton University Press, 1971); Ismet Vanly, *The Kurdish Problem in Syria* (Chicago: Committee for the Defence of the Kurdish People's Rights, 1968).

**General Bibliography**

Of the two works of special value one is regrettably as yet unpublished, the doctoral dissertation of Wadie Jwaideh, "The Kurdish Nationalist Movement: Its Origins and Development" (Syracuse, 1960). The other is Martin van Bruinessen, *Agha Shaikh and State: On the Social and Political Organization of Kurdistan* (Rijswijk: Europrint, 1978). Of a more specific nature are William Eagleton, *The Kurdish Republic of 1946* (New York, 1963), which is a valuable case-study of the Kurdish political process as it took place during the course of World War II at Mahâbâd; Edith Lytle, *A Bibliography of the Kurds, Kurdistan and the Kurdish Question.* (Monticello, Illinois, Council of Planning Librarians, No. 1301, 1977); *Kurdish Times*, semi-annual journal of the Kurdish Library, Brooklyn, New York, 1985-present; *Studia Kurdica*, semi-annual publication of the Centre de Recherches de l'Institut Kurde, Paris, 1984-present (text appears in English, French, and the primary Middle Eastern languages).

---

[14] زۆربەی ئەو بیرو بۆچوونانەی دوكتۆر میهرداد كە لە بارەی كەلتووری سیاسی و ڕابەریەتی و حیزبە سیاسییەكانی كوردستانەوە هاتوون بیرو ڕای خۆیین، بە تێگەیشتنی ئێمە - هەرو وەكو لە شوێنی تریشدا ئاماژەمان بۆ كردووە ئەم بابەتە پێویستی بە وردبوونەوەی قووڵتر و لێكدانەوەی بابەتیانەو لەسەرخۆ و حیسابكاری زۆر هێمنانە هەیە بە تایبەتی ئەگەر گۆڕانكاری و ڕووداوەكانی ئەم دواوییانە بكەینە تەرازووی كێشان. بۆیە هەر تۆمەتبار كردن و گوناه خستنە پاڵێك دەبێ دیسانەوە بە پێودانگی واقیع و بارو دۆخ و هۆكاری بابەتەكی تەتەڵەو كێژە بكرێ و سەر لەنوێ بنرخێنرێتەوە. من لێرەدا مەبەستم پەرلندنەوە یان تۆمەتباركردنی كەس نییە بەڵام زۆر ڕووداوی مێژوویی لە كاتی ڕوودانیدا دەكەونە ناو تەم و مژوو گێژاوی لێكدانەوەی ناو گوژنگی لێقەومانەوە كەچی دوای تێپەڕبوونی زەمان و لاچوونی تەپ و تۆزی ڕۆژگار ڕۆژ دەبێ بە سپی و سپی دەبێ بە ڕەش — وەرگێڕ.

# فەسڵی نۆیەم

## ئابووری/ سەرچاوە سروشتییەکان

### نەوت

کوردستان خاوەنی گەورەترین گەنجینەی ژێر زەمیینیی نەوتە نەك هەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵکو لە هەموو جیهاندا. ئەو نەوتەی لە کوردستاندا هەیە و دەستی خراوەتە سەر لە تەواوی نەوتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەلێ فرەترە. بەمە کوردستان بووە بە خاوەنی شەشەمین پلە لە جیهاندا بە گەنجینەیەکی دەورووبەری (٤٥) بلیۆن بەرمیلیەوە، ئەم گەنجینەیە لەژێر تلیماسکە زەویەکی تەسکدایە کە بە داوێنی نێوان چیا بڵندەکان وزورگەکاندا لەوپەڕی کوردستانی باشوورەوە تا ئەوپەڕی کوردستانی ڕۆژاوا نزیك دەریای سپی ناوەڕاست دەکشێ(بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤١).

لە باشوور، نەوتەڵانی نەفشتا. نەفتخانە — بەم دیوەو دیوی سنووری عێراق — ئێراندا هەیە. لە نزیکی قەسر شیرین (کرماشان) پاڵاوتگەیەك بۆ پاڵاوتنی نەوتی ئەوێ دروستکراوە (پاش شۆڕشی ئیسلامی ناوی نرا نەفت شەهر) ئەم نەوتەڵانە دەوری پەنجا ساڵێکە نەوتی لێ دەردێنرێ و ئیستا خەریکە وشك دەبێ پەرەسەندنی توانای پاڵاوتن لە پاڵاوگەکانی کرماشان و خانەقین وایکردوە لە نەوتەڵانی ترەوە نەوتی بۆ پاڵاوتن بۆ بهێنرێ، ئێستا ڕایەڵەیەکی بۆڕیە نەوت پاڵاوگەی کرماشان بە بۆڕی نەوتی هەمەدان و ڕایەڵەی سەرەکیی نەوتی گشتی ئێرانەوە دەبەستێ بێجگە لەوە پاڵاوگەی خانەقینیش نەوتی خاوی بە بۆڕی لە کەرکووکەوە بۆ دەچێ. لە کاتێکدا نەوتی نەوتەڵانی نەفتشا — نەفتخانە — خەریکی — وشکبوونە، گەورەکازی سرووشتی دەوڵەمەندی تەنگەی بیجاڕ کە لە خوارەوەی نەفشتاوە بەرەو بازاڕی سۆمار دەچێ، هێشتا کەڵکی لێدەرهێنانیان هەر هەیە.

هێشتا بەرەو خوارتر، نەوتەڵانی پڕ نەوتی پەهلە – دهلوڕان (كە تەنها بەشێكی لێدەكەوێتە هەرێمی كوردنشین) بۆڕی بەرەو بەندەری ئەهوازی سەر كەنداوی فارس لێوە كێشراوە.

وەكو تایبەتمەندیەك، نەوتەڵانە هەرە پڕ نەوتەكانی كورد كەوتوونەتە كوردستانی ناوەڕاستەوە.

لە کەرکووک، ئەو نەوتەی لەژێر خاکەکەیدان بە ئاوایەکی سرووشتی لە ڕووی زەویەوە بڵق دەدا لەدێر زەمانەوە، وەکو سەرچاوەی قیرو ڕۆنەچرا خزمەتی شارستانیەکانی کردوە، ئاگر سرووشتییەکانی ئەویێ کە هەورە بروسکە بە گڕی هێناون، لای گەلیێ ئاییینی خۆنەتەوە، بە تایبەتی زەردەشتی، بە پیرۆز دانراون. نەوتەلانی کەرکووك بوو کە بوو بە مایەی لکاندنی کوردستانی ناوەڕاست بەو دەوڵەتەوە کە لەژێر خاوەندارێتی بریتانیادا دامەزرا (ناش ١٩٦٧). وانەبوایە، ویلایەتی مووسڵ کە ئەوسا بە کوردستانی ناوەڕاست دەناسرا، بەر تورکیای کەمالیست دەکەوت (بڕوانە بابەتی ڕەتاندن و نیشتەجێ کردنی زۆر دارەکی).

سەرباری هەموو ئەمانە، نەوتی کوردستان هێشتا بە تەواوی دەستنیشان نەکراوە بەردەوام نەوتەلانی نویێ دەدۆزرێنەوە و وەکاردەخرێن، دیارترین نموونە لەم ڕووەوە نەوتەلانی چیا سورخ و جەمبوورن.

لەلایەکی دیکەوە نەوتەلانیکی تر ئێستا لە مووسڵەوە تا ناو خاکی سوریا وا لە بەرهەمهێناندا. ئەمە هەمان وڵاتە کە کلۆدیۆس تۆلێمی (Ptolmy) جوگرافیاناسی دێرین ناوی (NIPHATES MONS) چیاکانی نەوتی لێناوە.

نەوتەلانە ڕەنێو هێنراوەکانی دیوی عێراق لە موشۆراب[15]، عێنزالە، بۆتمە و ساسان ئێستا زۆریەیان خراونەتە سەر بۆڕی و بەستراون بە ڕایەڵە سەرەکییەکانی نەوتی عێراقەوە، حکوومەتی عێراق ئەمە ساڵەهای ساڵە تۆڕی مەزن مەزنی نەوتی بەناو خۆی وڵات و بە وڵاتە دراوسێکاندا کێشاوە وەکو ئەوەی کە تا سەر دەریای سوور لە یەنبوع بە سعودیەدا تێپەڕدەبیێ، یان ئەوەی بەندەری بەکر و خۆری عومەییە لە عێراق خۆی، یان تەرتورسی سەر دەریای سپی ناوەڕاست لە سوریا و دوێرت یمۆل یومورتە لیك لە تورکیا، ئەمەیان لە دەهەی ڕابردوودا سەلماندی کە لە گشت هێڵەکانی تر جێگای متمانە و پشت پیێبەستنە، چونکە پاش وێرانبوونی دامودەزگا نەوتیەکانی سەر کەنداوی فارس لە ساڵی ١٩٨٠، (٦٠–٩٠٪)ی سەرجەمی نێردەی نەوتی عێراق لەم بۆڕیانەوە نێردرایە دەرەوە.

---

[15] دەبیێ موشراق بێت – وەرگێر.

پاش كردنەوەی هێلی یەنبوع لە ساڵی (١٩٨٦)دا ئەم ڕێژەیە تا ساڵی ١٩٩١ لە (٦٠٪)دا مایەوە، هەرچەندە هەموو نەوتی عێراق وەستێنرا، ئەوەبوو لە كۆتایی هەشتاكاندا هێڵەكانی توركیا كران بە جووت لوولە و تا دەریای ناوەڕاست نەوتیان برد.

نەوتەڵاتی كەركوك، بە دۆزینەوەی نەوتەڵانە مەزنەكانی باشووری عێراق ئیتر ئەو گرنگییە ژیانییەی جارانی بۆ ئابووری عێراق نەما، پێشتر نزیكەی سەرتاپای نەوتی عێراق لە كوردستانەوە دادەڕژا، ئێستا ئەو ڕێژەیە لە سێیەكی نەوتی هەموو وڵاتەكەدا وەستاوە. نەوتەڵانەكانی كوردستان ئێستاكە (٣٦) بلیۆن بەرمیلیان لە (٩٠) بلیۆن بەرمیلی دۆزراوەی گشت عێراق وەكو زەخیرە تێداماوە. خوا و ڕاستان لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی شلبوونی هەڵویست و چنگی بە توندی حكوومەتەكانی عێراق لەسەر بەشداربوونی كوردو ئەو حكوومەتە هەرێمییە ئۆتۆنۆمانەی ناو بەناو لە كوردستانی ناوەڕاستدا پەیدا دەبن لە سوود وەرگرتن لەو سامانە نەوتیانە.

هەر ئەمە خۆی نیشانەی داهاتنی ئەو سەردەمەشە كە تێیدا كورد كەمتر كارتی كاریگەری بۆ ساتوسەودای ئابووری و سیاسی لەگەڵ بەغدادا لە دەستدابێ. هەمان پێكهاتەی جیۆلۆجی نەوتەڵانە كوردیەكانی باكووری مووسڵ، سنووری سووریا دەبڕن و بە هەرێمی جەزیرەدا تێدەپەڕن، ئەوەتا وا ئێستاكە نەوتەڵانەكانی ئەلیان، ڕۆمەلان، سوادیە و قەرەچووخ لەگەڵ نەوتەڵانەكانی جوبەیبە و جبیسە لەناوچەی سەجەر بەرەو خوار نەوتیان لێ دەردەهێنرێ بەرهەمی ئەم نەوتەڵانانە تاكە، سەرچاوەی شایانی باسی سووریایە و بە تۆڕە لوولەیەكی جەمسەر كراوەوە تا ناوەڕاستی وڵاتەكە براوە.

هەرچی توركیایە، كەمێكی زۆركەمی نەوتی تێدایە، بەڵام ئەوەش هەر لە سەرزەمینی كورداندایە.

چەورترینیان لەناوچەی باتمانی ڕۆژهەڵاتی توركیایە، لەوێ، لە چیاكانی دەوری باتمان چەند كێڵگەیەكیان لێ خراوەتە گەڕ و بە هۆی هێڵە لوولەیەكەوە نەوتەكە دەبرێنە پاڵاوگەی باتمان. نەوتەڵانەكانی باكووری دیاربەكریش هەر بەرەو ئەو پاڵاوگەیە دادەدۆشرێن.

دوورتر، لە رۆژاوا لە ئادیەمان دوو نەوتەلانی سەرەکی لە گەردان بە بۆری بە نەوتەلان و دەزگاکانی سەرەوە بەرەو باشووری رۆژئاوا، دەبرێنە بەندەری دورت یۆل لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست.

هەرچەندە ئەو نەوتە لەناوچە کوردنشینەکانی تورکیا دەدۆشرێ تا ئێستا پێداویستییەکانی بازاڕی ناوخۆ دابین ناکات، بەلام لێکۆلینەوە و کەندەکاری جیۆلۆجی بۆ دوارۆژ هیوا بەخشن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: *The International Petroleum Encyclopedia, 1979*; Christopher Ryan, *A Guide to the Known Minerals of Turkey* (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960); I. Altin et al., *Ölçekli Türkiye Jeoloji Haritasi* ("Explanatory Text of the Geological Maps of Turkey"), sheets published loose at 1:500,000 scale for each Turkish province, accompanied by explanatory texts (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960-70); *Middle East Area: Oil Fields and Facilities* (Washington: U.S. Central Intelligence Agency, 1980), a sheet map at 1:4,500,000; Theodore Nash, "The Effect of International Oil Interests upon the Fate of Autonomous Kurdish Territory: A Perspective on the Conference at Sèvres, August 10, 1920," *International Problems* 15, 1-2 (1976).

# کانزاکانی دیکە

هەر لە کۆنەوە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس لای پێشینان بە سەرچاوەی گەلێك خاوی کانزا بەناوبانگن، لەوانە مس، کرۆم، ئاسن. دەوری هەشت هەزار سالێك لەمەوبەر لە (چای ئۆێنوی) نزیکی دیاربەکر لە کوردستانی رۆژاوا کۆنترین شێوەی تەکنۆلۆجیای فلزسازیی دەسکردی مرۆڤ، کە مرۆڤی لە چاخی بەردینەوە بۆ چاخە شۆڕشوارە کانزاییەکان گواستەوە (چەنی مس، برونز ئینجا ئاسن) پەردەی لەسەرهەلمالرا (بڕوانە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی پێش مێژوو و سەردەمەکانی کۆن) کاری سەردەمانەی دەرکردنی بەرهەمی کانەکان لە کانگە کۆنەکان هێشتا هەر بەردەوامە. سالی ١٩٧٠، (٢٪)ی مسی هەموو جیهان و (٨٪)ی کرۆم بەو شێوەیە دەرکراوە، لەسەردەمانی زوودا، بڕێکی زۆری زیوو و کەمێك زێڕیش لەلایەن دانیشتوانی دەورووبەری زاگرۆسەوە هەلدەهێنجرا، بەلام ئێستا ئەم دوو بابەتە هەردووکیان وەکو بەرهەمێکی لاوەکی پالاوتنی مسی خاو لە کوردستانی رۆژاوا وەچنگ دێن.

ناوچەی ئادیەمان مەلاتیّ لە کوردستانی ڕۆژاوا پڕە لە ئاسنی خاو و دەوری بیست ساڵێکە، بە ڕێژەیەکی زۆر چاك لە چاو وڵاتانی تری ڕۆژەلاتی ناوەڕستدا، بەرهەم دێنریّ.

گەورەترین خەزێنەی گۆگردی بەردنی گشت جیهان کە کەوتۆتە باشووری ڕۆژاوای هەولێرەوە لەم دواییەدا لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە لە شەرگات هێنرایە بەرهەم، پێشتر برێکی بەرچاوی گۆگرد لە کوردستانی ناوەڕاست لە کەرکووك و خانەقین و کرماشان وەکو بەرهەمێکی لاوەکی دەرکراوە.

گۆگرد سەرچاوەیەکی سەرەکیی پەیني کیمیاوی و مێروکوژە بەڵام، لە هەمان کاتدا وەکو پێکهێنەرێکی باڕووت و گازی ژەهراوی بۆ مەبەستی کاروباری سوپاش بە کاردیّ. بابەتی وردبوونەوەیە، کەوا ئەو ماددە خاوەی کە سوپای عێراق لە شێوەی چەکی کیمیاوییدا دابیاراندە سەر کۆمەڵانی خەڵکی کورد لەوانەیە بەشێکی لە خودی ئەم زەوییەوە دەرهێنرابیّ (بڕوانە مێژووی کۆن).

بەهۆی جیاوازیی پێکهاتەکانی زەوییەوە گەلێك جۆرە بەردی ئاگرین و سواو و تازە پێکهاتوو کە بۆ دروستکردنی خانوو بەرە بە کاردێن، لەوانە بەردی نەخشین و تراڤێرتاین، بەردی مەرمەڕ و دێورایت (هەسانە بەرد) و هەروەها بەردی بۆرەك و گرانیت بۆ دروستکردنی چیمەنتۆ، بە زۆری لە وڵاتەکە هەن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: C. Ryan, *A Guide to the Known Minerals of Turkey* (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960); I. Altin et al., *Ölçekli Türkiye Ceoloji Haritasi* ("Explanatory Text of the Geological Maps of Turkey"), sheets published loose at 1:500,000 scale for each Turkish province, accompanied by explanatory texts (Ankara: Mineral Research and Exploration Institute of Turkey, 1960-70); O. Kühn, et al, "Oberkreide aus Kurdistan," *Neues Jahrbuch für Mineralogie, Geologie und Paläontologie Beilagebände* 83 (1940).

## ئاو

لە کاتێکدا دەوروبەر بە دەستی بێ ئاوییەوە دەناڵێنیّ، کوردستان وڵاتێکی ئاودارو باراناویە. کەشی بارانی بەخوڕ کوردستانی کردۆتە یەکێك لە شوێنە پڕ بارانە کەمەکانی ڕۆژەلاتی ناوین، ڕووبارەکانی دیجلە، فورات، خابوور، ئە رشار، جەیحان، ئاراس، کوڕا، سفیدروود، کەرخە و لقە سەرەکییەکانیان لە کێوەکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن. شتێکی ئاساییە کە هەندێ ڕووباری تر، کە کەم یان زۆر، لە خاکی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن، یان پێیدا تێپەڕ دەبن، بایەخێکی مێژووییان بۆ کورد هەبێ، لەوانەش ڕووبارەکانی موراد

(ئەرەسان) و بۆتان لە کوردستانی باکوور و ڕۆژاوا (تورکیا)، هەردوو زێی گەورە و بچووک و فیشخابوور و سیروان لە کوردستانی ناوەڕاست (عێراق)، چەغەتوو (زەرین روود). تەتەئو (سیمینەروود)، زەهاو و گاماسیاب لە کوردستانی باشوور (ئێران) بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤٢.

خشتبەندی ژمارە ٧

ئەو بەنداوانەی ئێستا لەژێر کاردان، یان ئەم دواییانە تەواو کراون لە کوردستانی ڕۆژاوا و باکوور لە ئەنەدۆڵ.

| ناوی بەنداو | ڕووبار | ویلایەت | قەبارە (بلیۆن پی٣) | کارەبا میگاوات | ڕووبەری ئاودان ئێکر |
|---|---|---|---|---|---|
| دوملووجە | بوگور | ماردین | ١٢ | —— | ٦٠٠٠ |
| گۆڕێکسوو | گۆڕێکسوو | دیاربەکر | ٥٦ | —— | ٩٠٠٠ |
| مەمزەلەت | جەیحان | قارەمان مەرلش | ٢٥٦ | ١٢٠ | ١١٦٠٠٠ |
| ئەتاتورك | فورات | ئورفە | ٢٥٣٥ | ٢٤٠٠ | ٢١٧٥٠٠٠ |
| حاجی خدر | حاجی خدر | ئورفە | ٤٢ | —— | ٨٥٠٠ |
| کراڵ کزی | دیجلە | دیاربەکر | ٤٤٩ | ٩٠ | نەزانراوە |
| کۆزگون | سەرچەمە | ئەرزڕۆم | ٨٢ | ٢٠ | ١٣٠٠٠٠ |
| پولات | پولات | مەلاتیێ | ٦٢ | —— | ٧٠٠٠ |
| ئۆزلووجە | پەریسوویی | ئەلازیگ | ٢٢٨ | ١٦٠ | —— |
| پانتۆس | کێلقی | ئاگری | ٨٢ | —— | ١٢٥٠٠ |

ژمارەکان نزیك خراونەتەوە.

سەرچاوە: ئامارنامەی ساڵانەی تورکیا/١٩٨٩

سامانی ناوچە سەهۆڵبەند و بەفر پۆشەکان لەگەڵ خڵتە جیۆلۆجییە سوود بەخشەکانی زەویەکەدا دەبنە هۆی پەیداکردنی تایبەتمەندییەکی هەمەگیر لە زۆریەی شوێنەکانی کوردستاندا (بێجگە لەناوچەکانی باکوور کە زۆرتر بورکانین).

سەراب غەمیار لە کوردستانی باشوور، کە بریتیە لە کانی و کانیاو و سەرچاوەی بە خوڕ و بێ شومار، بۆ نموونە، لە ناخی زەویەوە هەڵدەقوڵێن و لە چرکەیەکدا دەورووبەری (٦٥٠) گاڵۆن دەردەدەن. کە دەبن بە چەمێکی گەورە، زیاتر لە (٤٠٠) میل بەرەو کەنداوی فارس شۆڕ دەبێتەوە و هەر خۆشی سەرچاوەی ئاوی چەمی سەیمەرە دروست دەکا. ئەو هەموو شار و گوندە کوردنشینانەی کە ناویان بە سەراب یان کانی دەست پێ دەکا، بەڵگەی زیندوون بۆ ئەوەی کە وڵاتەکە پڕە لە کانیاو سەرچەشمە، لە کاتێکدا ڕووبارەکانی کوردستان دەمارە خوێنی ئابووری نەوییاتیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن، کانیاوەکان تاکە سەرچاوەی ئاودێری

دەسکرد و ئاوی خواردنەوەی دانیشتوان و ئاژەلیشن، کرماشان، کە هەرە شارە گەورەی کوردە ئاوی خواردنەوەی مشت بەمشت لە کانیاوەکانی دەورو پشتەوە بۆ دێ.

رێکخستنەوەی رێچکە و رێرەوی ئاوی رووبارەکان زیاتر لە قازانجی بەکاربەرە نا کوردەکانی زەویە پاینیشینەکاندایە، نەك کوردە چیا و بڵندایی نشینەکان. ئێستا گەلێك پرۆژەی هایدرۆلیك لە ئارادان بۆ گۆرینی رێرەوی رووبارەکانی کوردستان و هەندێکی دیکەش بەرێوەن. گرنگترین ئەمانە لە ناوچەی پەنگخواردنەوەی باراناوی دیجلە و فوراتدان.

لە کوردستانی ناوەراست بەنداوی گەورە لە دەربەندیخان (لەسەر سیروان) و دوکان (لەسەر زێی بچووك) بە جووتە وزەی کارەبا بۆ ناوچەی بەغدای پایتەخت دابین دەکەن. لە کوردستانی باکوور و رۆژاوا لە تورکیا پرۆژە چەند بلیۆن دۆلارییەکەی باشووری رۆژهەلاتی ئەناتۆلیا (GAP) هەردوو رۆخی دیجلە و فورات و لقەکانیان دەگرێتەوە و هەوڵ دەدا ئاو بۆ ئاودانی دەشتە نەوی و بێ ئاوەکان و کارەبای هەرزان بۆ خواردنەوە و پیشەسازی دەستەبەر بکات. ئاو خەریکە دەبێ بە کالایەکی پارە هێن، چونکە نیاز وایە لە رێی ئەو تۆرە لوولەیەوە کە ناوی "تۆرە لوولەی ئاشتی" لێنراوە، ئاو بە بۆریەکی (١٧٠٠) میلیدا لە تورکیاوە بگەیەنرێتە ولاتە بێ ئاوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست و بە کوێت و عەرەبستانی سعودی بفرۆشری (گریگوری ١٩٩١) سەرچاوەی ئاوی ئەم هێڵە لوولەیە سیستەمی رووباری جەیحانە لە ناوەراستی رۆژهەلاتی چیای تۆرۆس، بەلام وا دەردەکەوێ کە دویماکار هەر بازنەی ئاوی فورات دەبێتە سەرچاوەی وەگەرخستنی پرۆژەکە چونکە ئەم رووبارانە یارای ئەوەیان نیە ئاوی بەردەوامی بۆ دابین بکەن.

زۆریەی بەنداوەکانی پرۆژەی (گاپ) بە بەنداوە زلەکەی ئەتاتورکیشەوە لەسەر فورات، تەواو بوونە، (گاپ) سیانزە پرۆژەی سەرەکی ئاودێری و بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا دەگرێتەوە (٧ پرۆژە لەسەر بازنەی فورات و ٦ لەسەر دیجلە) پرۆژەکان بە کۆمەڵ زیاتر لە (٤) بلیۆن ئێکەر (٦,٤ بلیۆن دۆنم) زەوی ئاو دەدەن و(٢٤) میگاوات/ سەعات کارەبا لە ساڵێکدا بەرهەم دێنن. ئەو راستییەی کە دەوڵەت لە چل ساڵی پێش پەیدابوونی گاپدا تەنها (١,٤) بلیۆن ئێکەر زەوی لە رێی ئاودێریی دەسکردەوە ئاو داوەو تەنها (٣٤) میگاوات/ سەعات کارەبای تا ساڵی ١٩٨٥ بەرهەم هێناوە، تیشکی زۆر دەخاتە سەر گرنگیی پرۆژەکە.

پڕ بوونی ستێڵی بەنداوی ئەتاتورك لە ساڵی (١٩٩٠)دا كە لە ئاوی ساڵێكی فورات و بگرە لە هی نیلیش زیاتر دەگرێ، گرنگی ئاوەكانی كوردستان بۆ دەشتەكانی خواروو دەردەخا (خشتەی ژمارە ٧).

توركیا بۆ نزیكەی دوو مانگ ئاوی فوراتی لە سوریا و عێراق بڕی كە گرنگییەكی ئابووری نەتەوەیی ژیانیی بۆ سوریا و عێراق هەیە.

جموجوڵی بە دەسوبردی هێزە چەكدارەكانی سوریا (ئابی ١٩٨٩) و هەڕەشە و خۆ لێك گیفكردنەوەی ئەنقەرە و دیمەشق و بەغدا زۆر بەڕوونی ئەوەی نیشاندا كە ئاو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چ گرنگییەكی ستراتیژیی هەیە بە تایبەتی لە كوردستاندا كە یەكێكە لە سەرچاوە هەرە گرنگەكانی ئاو.

لەبەر دەوڵەمەندیی لە رادەبەدەری ئاركیۆلۆژی خاكی كوردستان، لەوانەیە دروستكردنی هەر بەنداوێك لە كوردستاندا بەشێكی مێژووی كوردنقوم بكات، گرانترین زیان لەم بوارەدا نقومبوونی سەرتاپای تاری مێژوویی سامان بوو (سامۆ سامای دێرین). لەژێر بەنداوی ئەتاتوركدا. لە هەندێ جێ نەبێ وەكو شوێنی بەنداوی كیپان كە كەوتۆتە ناوچەی یەكاو بوونی هەردوو ڕووباری مورات و فورات لە باكووری كوردستانی ڕۆژاوا، هیچ كەندەكاریەكی ئەوتۆی پێش نقوم بوون ئەنجام نەدراوە. بە ساكاری دەتوانرێ ئەندازەی ئەو زیانە بخەملێنرێ كە بەر پاشماوە دێرینەكان كەوتوون بۆ نموونە لە شوێنی وەكو بەنداوی دەربەندیخانی تەك هەڵەبجە كە لە هەر میلێكی دووجادا چەندین گرد و تەپۆلكەی دێرینی تێدایە. بەم جۆرە سامانی بەربڵاوی ئاركیۆلۆژی بە ژێر ئاوكەوتن و تا هەتایە فەوتان و ئاسەواری ئەو گوندە چیایی یانەی كە یانزە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا شارستانێتیان تێدا دامەزرا، لە دەست چوون و ڕووخساریان نقوم بوو.

هەندێ دەریاچەی سرووشتی گەورە و بچووك، كە هەریەكە بۆ خۆی مەڵبەندێكی بە نرخی گەشتوگوزارە بۆ كوردستان، ڕوپێوی وڵاتەكەیان لێرە و لەوێ نەخشاندوە. لەوانە، دەریاچەی زرێبار لە نزیك مەریوان (كوردستانی ڕۆژهەڵات) كە بە چیای لێرەوار پۆش و كەناری دڵگیردەورە دراوە، یان دەریاچەی وان (كوردستانی باكوور) كە لە ڕووی قەوارەوە چوارەمین دەریاچەی جوان و گەورەی گشت جیهانە و دەوروبەری پڕ لە پەیكەر و ئاسەواری

ئارکیۆلۆژی بیناسازیە و بۆسەنعەتی توریستی مەڵبەندێکی تا بڵێی بەنرخە. هەر لەم بوارەدا و پانزە میل بەلای ڕۆژاوای کەنارەکانی دەریاچەی وانەوە، دەریاچەی نەمرود لە شێوەی دەمە داسێکدا بە دامێنی چیای نەمرۆدەوە ئالاوە (ئەم دەریا چەیە لە نەخشە تورکیەکاندا ناونراوە Nimrut Dagh و جیایە لە شوێنەواری Nimrut Dagh ی سەروو ئادیەمان لە کوردستانی ڕۆژاوا).

دەریاچەی نەمرود چاڵاییەکی بورکانییە بە تیرەی هەشت میل و چەندین ڕکەی تاقوولی نیومیل بڵند دەورەیان داوە، ئەم دەریاچەیە لە شوێنە سرووشتی بەهەرە دڵڕفێنەکانی کوردستانە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** *Doomed by the Dam: A Survey of the Monuments Threatened by the Creation of the Keban Dam Flood Area*, Faculty of Architecture, Publ. No. 9 (Ankara: Middle East Technical University, 1967); Robert Whallon, *An Archaeological Survey of the Keban Reservoir Area of East-Central Turkey*, Memoirs of the Museum of Anthropology, No. 11 (Ann Arbor: University of Michigan Press, 1979); Daniel Stoll and Joyce Starr, eds., *The Politics of Scarcity: Water in the Middle East* (Boulder: Westview, 1988); Joyce Starr and Daniel Stoll, *U.S. Foreign Policy on Water Resources in the Middle East* (Washington: The Center for Strategic and International Studies, 1987); John Kolars and H. Mitchell, *The Euphrates River* (Carbondale: University of Illinois Press, 1990); Thomas Naff and Ruth Matson, eds., *Water in the Middle East: Conflict or Cooperation?* (Boulder: Westview, 1984); Thomas Naff, "Water: An Emerging Issue in the Middle East?" The Annals of the American Academy of Political Scientists (November 1985); "Middle East: Water Issues in the 1990's," testimonies submitted to the U.S. House [of Congress] Subcommittee on Europe and the Middle East, Washington, June 26, 1990; Joseph R. Gregory. "Liquid Asset," *World Monitor* 28 (November 1991); Joyce Starr, "Water Wars," *Foreign Policy* 82 (Spring 1991). Angus Hindley, "Battle Lines Drawn for Euphrates," *Middle East Economic Development* (October 13, 1989).

# کشتوکاڵ

سامانی پڕ بەرەکەتی چەڕاگاکانی کوردستان زۆر لەمێژە دروستبوونی ئابووریەکی ئاژەڵداریی ڕەخساندوە. لە هەمان کاتدا لە زۆر شوێندا ئەو لەوەڕگایانە بەهەمان ئەندازە بە کەڵکی کشتوکاڵی چرپش دێن. لەوەڕگاکان، بەقەی دارستانەکان تووشی وێرانکاری نەهاتوون، بۆیە وەکو خۆیان بە جوانی ماونەتەوە و بەردەوام وەك سەرچاوەیەکی باشی لەوەڕی ئاژەڵ سوودیان لێ وەرگیراوە (بڕوانە شینایی و زیندەوەر). لەوەڕگا دەوڵەمەندەکان هەمیشە پیشانی دەدەن کە لە هەموو چاخەکانی مێژوودا ئاژەڵداری کۆچەر ئەم ژینگەیە گونجاوە ئابوورییە بەکارهێناوە، بەبێ ڕەچاوگرتنی چەندێتی زاڵبوونی کەرتی کشتوکاڵ.

ئەگەرچی بەشێكی زۆری لەوەڕگاكان بە كەڵكی كشتوكاڵ دێن، بەڵام سوود لە گشتیان وەرنەگیراوە، بە تایبەتی ئەوانەی دەكەونە بڵندایی یان لێژایی سەخت یان بانە دوور دەستەكانەوە. لە زۆر شوێندا هەندێ فاكتەری جۆراوجۆر بوونەتە هۆی تەگەرەدان لە گۆڕانی لەوەڕگا بۆ زەوی كشتوكاڵی، لەوانە فاكتەرەكانی سەختیی شوێن (هەر لەسەرینی ئەوەشەوە، كورت بوونی وەرزی گەشەكردن)، نەبوونی سەرچاوەی ئاسانی ئاو، تایبەتیە نالەباری هی تر، و خاك. تەنانەت پلیكانەبەندی زەویە لێژەكان كە لە هەشت هەزار ساڵ پێش میلادەوە بەكاردێن، ئێستا لەبەر گرتینی توێژی ئەستووری خاك و خۆڵ كەم بۆتەوە.

ئەو لەوەڕگایانە ئەگەر لەلایەن پەزدارە كۆنەكانەوە یان بەهۆی وەرزێڕە تازە نیشتەجێبوەكانەوە بەكار نەهاتبانایە، ئێستا ئەشتە بایان لێ بەرهەم نەدەهات. ئێستاش هەندێ كورد هەن كە بە پەزلەوەڕاندن دەژین و بەوە سوود لە سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی سرووشتی وەردەگرن (بڕوانە ئابووری كۆچەری).

مەودای ئەو پەزلەوەڕێنییە وەرزییە لە ڕاستیدا، زۆر بە كورتی دەمێننەوە، ناچار مێگەلی مەڕ و ماڵات لە بنەگەی ماڵ دوور دەكەنەوە و ئەو سوودەی جارانیان لێ نایەتە دەست. كۆچەری جاران ئەم هەموو كەند و كۆسپەی لە بەردا نەبوو.

لەلایەكی ترەوە دۆڵ و تەختاییە بەرین و بە پیتەكانی دوتۆیی چیاكان مەودایەكی بەربڵاو بۆ كشتوكاڵ دەڕەخسێنن. سەرەڕای سرووشتی كوێستانیی، كوردستان لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆرتر زەوی شیاوی چاندنی هەیە (٢٨٪ی هەموو ڕووبەرەكە). شیو و دۆڵە بەرینەكانی دەوری ڕووبارەكان چەندین كێڵگەی بە پیت و بەرەكەتیان پێكهێناوە كە تەنها ناوچە شاخاویەكانی ناوەڕاست ناگرێتەوە. ئەمە ڕەنگە زۆر بەچاكی ئەو ڕاستییە ڕوون كاتەوە كە كشتوكاڵ لە پێشی پێشدا لە كوردستاندا داهاتووە و هەر كوردستان خۆشی وڵاتی هەموو جۆرە دانەوێڵەی سەرەكی ژیانی ماڵات بووە، بەناو هێنانی ڕەشەوڵاخ و چاندنی برنج لەم بۆچوونە بە دەرن (بڕوانە فەسڵی ٣ – گەشەی تەكنۆلۆژی...) لەوساوە تا ئێستا ئابووری وڵاتەكە، كەم و زۆر، بە بەردەوامی بنەمایەكی كشتوكاڵی هەبووە.

لە دێرزەمانەوە چەند جۆر دانەوێڵە و شینایی لە كوردستان ڕەنێو هاتوون، هەرچەندە گەنم و جۆ لە هەموویان كۆنترن و چاندنی برنج لەم دواییانە بایەخی وەرگرتووە و خەریكە لای چینی ناوەڕاستی كورد جێی نان دەگرێتەوە و دەبێ بە خۆراكی سەرەكیی.

بەرهەمی بەسوودی وەکو تووتن، چەوندەری شەکر و لۆکە ڕۆڵێکی زیندوو لە ئابووری وڵاتەکەدا دەگێڕن. توتنی کوردستان جۆرێکی باشە، هەروەها توتنی سبیل و تەماکۆش کە لە وڵاتانی دەورووبەریشدا کڕیاریان هەیە و بەبرەون.

زەوی بە پیتی دەشتەکان کە زۆرتر بەر بەڕۆژن، لە پاڵ درێژی وەرزی نمادا، و لەپاڵ دارمانی بەردەوامی خاکی چیاکان بە ئاوی باران بەرەو هەڵەت و پێدەشتەکان، کارێکی وایان کردوە کە لۆکە ببێ بە بابەتێکی پڕ سوودو ویسترا و لای وەرزێڕەکان.

لە کوردستانی ڕۆژئاوادا (لە تورکیا) بەشێکی زۆری ئەو زەویانەی بەهۆی پڕۆژەی (گاپ)ەوە دەبووژێنەوە (بڕوانە سەرچاوەی سروشتی ئاو) بە تایبەتی لە ناوەڕاستی بازنەی فوراتدا (ناوچەی بەنداوی ئەتاتورک) بۆ چاندنی لۆکە تەرخانکراون، لەگەڵ پەرەسەندنی ئاستی بەرهەمی لۆکە لە کوردستانی سوریا و عێراقدا وا چاوەڕوان دەکرێ ئەم بەرهەمە لە ساڵانی داهاتوودا دەورێکی گەورەتر لە ئابووری کورددا بگێرێ.

لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە چەوەندەری شەکر بە بەرێڵاوی هێنراوەتە ناو کوردستانەوە و ئەمە وای کردوە کەم و زۆر کارگەی پاڵاوتنی شەکریش لێرە و لەوێ، چ بچووك چ گەورە، بکرێتەوە.

ئەم پاڵاوگانە، شەکریان دەگاتە بازاڕە ناوچەیی و دەوڵەتیەکانیشەوە (بڕوانە پیشەسازی).

زەیتوون سەرچاوەیەکی تری دەرامەدە بۆ وڵاتەکە و بە زۆری لە کوردستانی ڕۆژئاوا بەلای دەریای ناوەڕاستەوە لە برەودایە لەبەر ئەوەی چەوریی پێویست بۆ خواردەمەنی بەشێوەیەکی دێرین هەر لە سپیایەتییەوە هاتووە، زەیتوون هێشتا هەر بۆ مەبەستی لاوەکی بەکاردێ نەك بۆ خۆراك.

بەرهەمی سەرەکیی تر هەن کە تاڕادەیەك تازە هاتوونەتە کوردستانەوە و بەرەبەرە خەریکن دەکەونە ناوان. لەوانە گەنمەشامی، لۆبیای سۆیا، گوڵەبەڕۆژە، کە ئێستاکە لای دانیشتوان بوونەتە بابەتی بەرهەم و بەکارهێنان، لەمانە ڕۆنی ڕوەك دەردەکرێ و دەخرێتە بازاڕەوە لەپاڵ ئەمەشدا وا خەریکن بۆ خۆراکی پەلەوەر بە بەرێڵاوی بەکاردێن و بازاڕیشیان بە پەلە دەتەنێتەوە.

پەتاتە کە ڕۆڵەی خاکی بێ هێز و بەستەڵەکە، بە فراوانی لەناو خەڵکدا بۆتە بابەتی خواردەمەنی جۆراوجۆر، لە لێوارەکانی زاگرۆس— تۆرۆسیش داری میوەی جۆراوجۆر و بابەتە

جیاجیاكانی خێزانی بادەم و گوێزیش بەشێوەیەكی سروشتی دەڕوێن (بڕوانە گژوگیا و گیانەوەر).

پستەجاتی وەكو فستق، بادەم، فندق و بەڕوو، لە زۆر شوێندا بەشێوەی درەختی خۆڕسك هەن. بەڵام لەو شوێنانەدا كە دەستنێژ كراون، بەرهەمی باشتر دەدەن، چونكە درەختەكان لە ژینگەی لە باری خۆیاندا چاكتر نەشونما دەكەن.

ڕەنگە وردە میوەی خۆرسك بە تایبەتی تووە سپیكە و توە ڕەشە، لە گشت گوندەكاندا هەبن، بەڵام بەرهەمیان هێشتا نەچۆتە بازاڕەوە. توو لە هەندێ جێ، تا ڕادەیەك تووتركیش، بە وشككراوەیی بە درێژەی ساڵ بۆ خواردن بەكاردێ.

بە گشتی پانشاییەكی زۆری زەوی بۆ میوە تەرخانكراوە لە وڵاتەكەدا، ڕەزە خۆڕسكە كێویەكانیش سەرچاوەیەكی تری میوەن بۆ دانیشتوان. میوە، بە تایبەتی بە وشككراوی، سەرچاوەیەكی سەرەكیی خواردنی كوردانە.

ئەو بەڵگانەی لە پاشماوە و ئاسەواری ٢٨٠٠ ساڵەی گوندی حەسەنلو لە كوردستانی ڕۆژاوا دەسكەوتوون، بە باشی دەری دەخەن، كە میوەجات بەگشتی و میوەی ناوكدار (nuts) بە تایبەتی، چەند لە خۆراكی دێرینی كورددا گرنگ بوونە، لەو شوێنەوارە كۆنەدا، بەڵگەی تەواو لەسەر بوونی بەهیَ (جۆری سیدۆنا، ئۆبلۆنگا)، چەند جۆری هەرمیَ (پایرۆس كۆمۆنیس)، سێو (پایرۆس مالۆس) و زەردەلو و بادەم (چەشنی پرۆنەسی)، هەن (هاریس ١٩٨٩).

میوەی وشك كاڵایەكی زۆر بە قازانجە و تا ڕادەیەك لە لۆكە و تووتنیش پڕداهاتترە بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٨١دا كوردستانی ئێران بایی نزیكەی ٢٢١ ملیۆن دۆلار زێدەبایی لە بەرهەمی وشك و تەڕ بوە. دانەوێڵە لە پلەی دووەمدا هاتووە (ئاماری ساڵی ١٩٨٦ی ئێران). بازاڕی نێونەتەوەیی پەرەسەندووی میوەی تەڕو وشك لە بازاڕی ناوخۆیی ئەم كاڵایە بە برەوتر بوە و كردوویەتی بە پیشەسازیەكی ڕاستەقینەی سەربەخۆ، بەرهەمەكانی ئەم پیشەسازیە كە ئێستا بە شێوەی میكانیزە پوختە و دەستەبەندی دەكرێن، بەپێی پێوادنگی نێونەتەوەیی مژدەدەری دەورێكی بە گورتری میوەی وشكن لە ئابووری ناوخۆییدا.

دۆمەڵان كە بەشێوەیەكی فراوان وەكو ڕووەكێكی خۆڕسك لە دارستانەكانی بەروودا دەڕوێ، لە ڕۆژاوا تەنها خۆراكی دەسڕۆیوەكان و چینی هەڵبژاردەیە، كەچی لە كوردستان بەهۆی

زۆربەوە بوە بە خۆراکی هەژار و نەدارەکانیش. ئەگەر بێتو بکرێ بە بابەتی بۆ دەرەوە ناردن ئەوا بێ یەکو دوو دەتوانێ شان بدا لە شانی قارچکی شیتاکەی یابانی لە بازارەکانی ئەورووپا و ئەمریکادا و لەناو بازاڕدا تەنگی پێ هەڵچنێ.

پیشەسازیەکی ڕێکوپێکی بۆ دەرەوە ناردنی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان لە هەموو کەرتە ئابووریەکانی دیکە زیاتر هاوسەنگی نێوان داڕژانی پارە و پایەدارکردنی ئابووریەکی خۆراگر ئاسان دەکا. کاڵا کشتوکاڵیە پارەکەرەکان دەتوانن ببنە مایەی گەڕانەوەی ئابووری ئێستای کوردستان، کە لە ئاستی دابینکردنی بژێوی ڕۆژانەدا چەقیوە، بۆ ئەو ئابووریە بە تواناو هەنگاونەرەی کە لە سەردەی (١٦)دا لە ئارادا بوو، هەروەها، ئەو بەرهەمەی لە کشتوکاڵ دێنە دەست، دەست بەدەست تا دەگاتە خێزان بەخێزان دەڕوا و بەمە زۆرترین ژمارەی دانیشتوان سوودمەند دەبن لێی. ئەمە نەك هەر قازانج بە بەرهەمهێنە گەورەکان دەگەیەنێ، بەڵکو یارمەتی زۆربەی وەرزێرەکانیش دەدا.

ئاژەڵ: داهاتی ئاژەڵ بەشێکە لە داهاتی کشتوکاڵ، گرنگترین ئاژەڵی باو مەڕە. بزن لە پلەیەکی نزمتردایەو وەکو کاڵایەکی بازاڕ گەرم بەخێو ناکرێ هەرچەندە وەرزێرەکان بۆ موەکەی پێویستیان پێیەتی، نەخاسمە جۆری ئەنگۆرا (بزنە مەرەز—وەرگێڕ) کە سەرچاوەی ڕێسی جلوبەرگ و پێویستی دیکەی ناوماڵ و شتومەکی ترە. سەردەمانێك ژمارەی خۆی لە بلیۆنەها سەر دەدا، بەڵام ئێستا لەبەر کزی بازاڕی یان لەبەر کەمبوونی لەوەڕگاو لێرەوارەکان ژمارەی هەر لە کزی دەدا.

هەرچی مەڕە، ژمارەی نەك هەر لە زیادبوون و پەرەسەندن دایە، بەڵکو تا دێ وەکو کاڵایەکی نێردە زیاتر بایەخ پەیدا دەکا. ئێستا دەرفەتی باش هاتۆتە پێش گەیاندنی گۆشت بەشێوەی بلۆك، یان بە بەستوویی بە بازاڕی ناوەوە و دەرەوە، چ نزیك چ دوور، بەرهەمهێنە کوردەکان لەمە قازانجێکی باش دەچننەوە، بازاڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە ئەوداڵی گۆشتی تازە و ناسکە، دەرگای بۆ بەرخ و کاوڕی کوردی ئاوەڵەیە هەرچەندە لەم ساتەی ئێستاماندا بۆ بەرهەمی وڵاتانی دووری وەکو ئەرژەنتین و نیوزیلاند و ئوسترالیا کراوەتەوە چونکە، ئەو ژمارەیەی لە بازارەکانی ناوچەکەدا هەیە گشت پێوستی کڕیاران دابین ناکا.

خوری کە بۆ کارویاری تەون و جۆلایی و هەلاجی ناوخۆ بە کاردێ ئێستا وا خەریکە دەچێتە مەیدانی چنینی میکانیکییەوە کە بەرەبەرە وا دەکەوێتە سەرپێ، دیارە سەرچاوەی خوری مەڕە و هەرواش دەمێننەوە.

گا و مانگا کە چ بۆ بەرهەمهێنانی گۆشت و سپیاتەتی بەخێو دەکرێن، هەروەها هێزی بار و جوت کردنیش بۆ وەرزێران دابین دەکەن، هەرچەندە لەم دواییانەدا تراکتەر جێی هەردوکیانی گرتۆتەوە.... هێشتا خەڵکێکی زۆر هەر رموودەی شیری مانگان زیاتر لەهی مەڕ. هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ژمارەی گاڕان لە زیاد کردندابێ، نەك کەم کردن بە هەرحاڵ ئەم نایابییەی لە ڕاپۆرتەکانی سەدە ناوەڕاستەکاندا کراوە بە سەرواری باس بۆ شیرەمەنیی کورد، تەنها سپیایەتی بەرهەمی مەڕ دەگرێتەوە.

پەنیر، ماست، لۆر، دۆ، ڕۆنی زەنگ (ئەو ڕۆنەی کە تەنها بۆ چێشت لێنان بەکاردێ) بۆن و بەرامەیەکی خۆشی گوڵاوییان لێدێ کە نیشانەی تایبەتیی شیرەمەنی کوردیە ئەمە زیاتر باسی کۆنە نەك ئێستا. زۆرترینی ئاژەڵی کوردستان خۆراکی لە بەرهەمی لاوەکی کێڵگەکانەوە دێ (وەکو کا و پووش و قەسەڵ و گزرە...). ئیتر لەوەڕگای پڕ گیا و گوڵی کیوی کە بۆن و بەرامەی سروشتی بە بەرهەمی شیرەمەنی دەبەخشن، ناویان نەماوە.

هەرچەندە دارستان و لێرەوار و شوێنە چڕەکانی کوردستان پڕن لە بەرازی کێوی، بەڵام لە بازاڕی گۆشتدا گۆشتەکەی هیچ جێی نیە چونکە بەپێی دابونەریتی ئیسلام نەی لێکراوە و هەرچی کوردە نامسوڵمانەکانیشن. زۆر خۆیان لەوە دەپارێزن کە لەکەیەك لە پەیوەندی ناسکیان لەگەڵ مسوڵمانەکاندا دروست بکەن، لە ناوچە دوور دەستەکاندا ڕاوچی سەر بە هەموو ئایینەکان ڕاوە بەراز دەکەن بەڵام هەرچۆنێك بێت گۆشتی بەراز ناخرێتە بازاڕەوە، ئەگەرچی توانایەکی لە بار بۆ ناردنی بە پوختەکراوی بۆ ئەورووپای نزیك لە ئارادایە، بەڵام پێ ناچێ ئەم بازرگانییە دوا ڕۆژێکی هەبێ لە کوردستاندا.

لە کاتێکدا دەرفەتی زیاتر کردنی توانای پاوان و لەوەڕگاکان لەوەی هەیە، بەولاوە ناڕاو، کێڵگە و ڕەز و باخەکان دواڕۆژێکی باشیان لەبەردایە بۆ دابین کردنی نەك هەر خۆراکی، ناوخۆیی، بەڵکو بۆ ناردنە دەرەوەی بەرهەمەکانیشیان.

بۆ سەرچاوە و خوێندەوەی زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** Mary Virginia Harris, "Glimpses of an Iron Age Landscape: Plants at Hasanlu," *Expedition* 31.2-3 (1989); E. R. Guest, C. C. Townsend, and A. al-Rawi, eds., *Flora of Iraq*, 6 vols. (Baghdad: Ministry of Agriculture, 1966-85); B. Gilliat-Smith and W.B. Terril, "On the Flora of the Near East," *Bulletin of Miscellaneous Information of the Royal Botanic (Kew) Gardens* 7-10 (1930).

# ئابووری کۆچەری

لە کاتێکدا ئێستا کەمتر لە (٣٪)ی هەموو دانیشتوان ژیانی کۆچەریەتی دەبەنە سەر، ئیتر ماوەی ئەوە نەماوە بکەوینە باسی ئابووری کۆچەریی کورد، هەرچەندە ئەمە تاچەندانێك لەمەوبەر وانەبوو.

گوزەران و ئابووریی ئاژەڵداریی، دەبێ پاش پەیدابوونی کۆمەڵی کشتوکاڵیی نیشتەجێ لە چیاکانی زاگرۆس هاتبێتە ئاراوە، چونکە ئەم جۆرە کۆمەڵە پێویستی بە ماڵیکردنی گیانەوەر و چاندن هەیە (Gerth Waite 1979) لە قۆناغەکانی تری مێژوودا کۆچەرەکان هەمیشە لەپاڵ وەرزێڕ و جێگیر و تارنشینەکاندا ژیاون.

ڕەوەندەکان لەسەر سروشتی کۆچەران، هەر خەریکی جەردەیی و ڕێگریی و چەتەیی بوونە، بە تایبەتی لە کاتی تەنگانەو دەسکورتییدا، هەر کردەوەکانی ئەمانە کە ناوی کوردی لەگەڵ ڕێگر و چەتەدا خستۆتە یەك تای تەرازووەوە و زڕاندوویەتی.

کوردە نیشتەجێکان لە خەڵکانی تر گەلێ زیاتر لە باری نەبوونی ئاسایشەوە گیرۆدەی دەستی کۆچەرە غەوارە و نەسرەو بەرەو خوار و بەرەو ژوورکەژەکان بوون. لە کاتێکدا ڕێگای بازرگانیی نێودەوڵەتی لە سەدە ناوەڕاستینەکاندا بە کوردستاندا تێپەڕ دەبوو، میرنشینە کوردە خۆییەکان تا ئەندازەیەکی باش دەسەڵاتیان بەسەر چرکە و پرکەی کۆچەرەکاندا دەڕۆیشت. لەبەر ئەوەش کە قازانجیان لەو بازرگانییە دەکرد بۆ باج و دەرامەد، هەرگیز لێی خافڵ نەدەبوون. پاش ئەوەی ڕێگا بازرگانیە نێودەوڵەتیەکان گۆڕانیان بەسەردا هات و بەرەو دەریاکانی باشوور داکشان (بڕوانە بازرگانی)، پووکانەوەی گشتیی ئابووریی نەتەوەیی کورد زیاتر کۆچەرەکانی بۆ ڕاو و ڕووت هاندا. کۆچەرەکان زۆر دڕندانە سەرچاوەکانی دەوڵەتە ڕێکوپێکەکانیان لە ڕەگەوە هەڵتەکاند بۆ ئەوەی نەتوانن بەرهەڵستییان بکەن. لە دوادوای

سەدەی (١٨)دا تەنانەت لەلای كوردە نیشتەجێكانیش ئەشتەبا نەمابوو تالان بكرێ لە هەندێ نامە بەر و دەسگێڕی لێكەوتووی ئەرمەنی بەولاوە كە هێشتا هەر بە ناچاری ڕێگا بازرگانییە دوورەكانی كوردستانیان تەی دەكرد.

نەبوونی هێزی ئاسایشی ڕێكخراوی دەوڵەت بوە هۆی ئەوەی كە وەرزێڕی نیشتەجێ ببێتە نێچیرێكی بێدەستەلات و بكەوێتە بەردەستی كۆچەرە هەمیشە نەیار و چەكدار و بزێوو زەلەندەكان (Smith-1978) كە هەموو كاروباری كشتوكاڵیی خەڵكە جێگیرەكەیان تێكدەدا لە ئەنجامدا ژمارەیەكی زۆری وەرزێڕەكان بوون بە دیل و كۆیلەی بندەستی سەر خێڵە كۆچەرەكان، بەشێكی زۆری تارنشینەكانیش دووچاری هەمان چارەنووسی ڕەش بوونەوە، زۆر خەڵكی نیشتەجێ، ئەگەر نەڵێین زۆریەیان، نا گوزیر دەبوو ببنە هاوكاری خێڵێكی كۆچەر بۆ خۆ پاراستن و دابینكردنی پەیوەندییەكی بازرگانی بێ ترس لەگەڵ خێڵێكی ئاژەڵداری دەوڵەمەند و بە هێزی تردا.

بۆ كۆچەرەكان خۆیان، جەردەیی تەنها بە جۆرە سەرگەرمییەك دادەنرا، هەرچەندە ئەمە ناوزڕانێكی زۆریشی بەدواوە بوو ئەوەی ڕاست بێ، لەگەڵ دەسپێكی سەدەی هەژدەیەمدا پا بەپای كزبوونی لەسەر خۆی نرخی بەرهەمی كوردە نیشتەجێكان، بووژانەوەی گشتیی ئابووری بە خێرایی كەوتە پشت بەستن بە بەرهەمی ئاژەڵی و چنراوی دەسكردی كۆچەرەكان.

وا مەزەنە دەكرێ كە لە تۆخیانی سەردەمی كۆچەری لە سەدەی (١٨)دا، دەوری یەك ملیۆن كورد، كە دەیكرد (٣٠٪)ی گشت دانیشتوان كۆچەر بووبن (بڕوانە دیموگرافیا). ڕاستییەكەی ئەم ژمارەیە لە ژوور ئاساییەوە و ئەو فشارە سیاسی و سەربازیە دەردەخا كە كۆچەرەكان دەیانخستە سەر وەرزێڕە نیشتەجێ و كوردە شارنشینەكان. ئەم ڕێژانە ئەوە دەردەخەن كە ئەوسا ولاتەكە تا ڕادەیەك چۆڵ بوە و خەڵكەكە كەمتر ئاوایی نشین بوونە و لە كۆمەڵی كشتوكاڵی بچووك بچووك و لێكدابڕا و بەولاوە، هچی تر نەبوونە، كێڵگەی خەڵك، كە لە سەرەتای وەرزدا دەكێڵرا و تۆو دەكرا ساڵی یەكدووجار دەكەوتە بن پای كۆچەرەكانەوە و ئاژەڵی تێدەكرا. ئەمە لەگەڵ ڕاپۆرتی چاودیتەگەلێكی وەكو ئەولیا چەلەبیدا زۆر گونجاو دێت، كە باسی بێ خاوەنیی لە ڕادەبەدەری زەوی و زار و چۆڵبوونی ڕەز و باخەكان و ناچار بوونی خەڵك بە خۆ پەستانە ناو قەلایچە و خانووبەرەی ناوشوێنی سەخت و قایم و شوورەدار

دەکا، لەم بوارەدا کوردستانی باکوور زۆرترین کولۆلی و لێقەومانی تووش بوە و ئەنجامەکانیشی تا ئێستا نەسڕاونەتەوە (بڕوانە دابەشکاریە ناوخۆییەکان).

لەم ماڵوێرانیەدا کوردستان بە تەنیا نەبوو گەلێ کۆمەڵی دڕلوسیێ بە فەوتانی بازرگانیی زەمینی و شەڕی یەك لە دوای یەکدا زیانی گەورەیان لێدەکەوت بە تایبەتی پاش پەیدابوونی تۆپ لە ناوچەکەدا کە شەڕەکانی ئەوەندەی تر مەینەتبار دەکرد. بەردەوامی هێرشی چاو نەترسانەی کۆچەرە دڵڕەقەکان بۆ سەرنشینگە و ئاوایی و شارۆچکە و ڕێگرتن و تالانکردنی کاروانەکان بە ئەندازەیەك خەڵکەکەی بێزار کردبوو کە هەرگیز ئەو کۆچەرە بەدڕەفتارانە لە دوژمن بەولاوە بە هیچی تر دانەنێن، ئەوان ئامادە بوون ئەوە قەبووڵ بکەن کە نەریتی هاوبەشی زۆرتر و توندتر لەگەڵ ئەرمەن و تورك و عەرەب و تورکمانی نیشتەجێی وەکو خۆیاندا گرێی دەدەن لەوەی لەگەڵ کوردە کۆچەرە هاوڕەگەزەکانی خۆیاندا هەیانبوو چونکە ئەو کۆچەرانە کارێکی وایان کردبوو کوردە نیشتەجێکان هیچ هیوایەکیان بە ژیانی ئاسوودە نەبێ، تا ئەوان هەبن.

بە دەسپێکی سەدەی نۆزدەیەم ئەتوانرێ بوترێ کە هەر وەرزێکی نیشتەجێ و شارنشینێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەبارەت بە کردەوەی کۆچەرەکان ئاوەڵناوە ئەتنییە کۆنەکەی خۆی لە بیر چوبوەوە و لە بڕی ئەو ناوی شار یان ناوچەیەکی خۆماڵیی لە خۆنابوو، ئیتر بەلای ئەوانەوە ئاوەڵناوە ئەتنییە کۆنەکانی وەکو کورد، عەرەب، تورك، تورکمان... تەنها مانای کۆچەریەتیی دەدا، واتە ڕەفتاری وەکو: بێ نەزاکەتی، گەڕۆکێکی نیمچە کێوی کە بەلای سەر ڕووی زەمینە و ئامرازی یاسا شکێنی و خراپکاری، تا سەرەتای سەدەی بیستەم ئەم ناوە ئەتنییە کۆنانە ڕێز و حورمەتیان پەیدا نەکردەوە.

کۆچەرەکان دواترین گرووپی ئەتنی سەرەکیی بوون لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە نیشتەجێبن، بەمە کوردەکان دوا گرووپی ئەتنیش بوون کە دیسانەوە هەمان ناوی ئەتنی کۆنی خۆیان بۆ گشت نەتەوەکەیان بەکار بێنن، تەنانەت ئێستاش کوردە شارنشینە هەرە بە تەمەنەکان کە یادگاری ڕەوەندە دوابڕاوەکانیان بیر دەکەوێتەوە، خۆیان لە بەکارهێنانی وشەی کورد دەپارێزن، بەهەمان شێوەی تورکە هاوچەرخەکان، سەرەڕای ئەو هەموو پیرۆزییە ساختەیەی بۆ وشەی تورك سازدراوە، هێشتا هەر وشەی تورك لە گفتوگۆی تایبەتدا بۆ مرۆڤێکی دەشتەکی دڕڕفتاری ساویلکە یان نەزانێکی نەزاندووی کەللە بۆش بە کاردێنن.

دەورانـی زەمـان کـە هاتـە دەورووبـەری سـەدەی (١٩)، زیـاد بـوونی سروشـتی ڕێـژەی دانیشتوانی گوندنشین لووشی داله ٢٥٪، له كاتێكدا كۆچەرەكان ڕێژەیەكی ئەوتۆیان نەهێنا لە زیادبووندا. ئەوان نەیانتوانی لە بەرامبەر ئەو بارە تازەیەدا بالادەستیەکەی جارانیـان بپـارێزن، دویماكار ڕێژەكە بـوە (٤) نیـشتەجێ لـە بەرامبـەر هـەر (١) كـوردی كۆچـەردا نـەك هـەر ئەمـە درزەكە تا دەهات بە پەلە دەمی دەكردەوە.

زنجیرە بەرنامەكانی نیشتەجێكردنی تۆبزی كە لە بیستەكانی سەدەی بیستەمدا لـە توركیـا و ئێـران جێبـەجێ كـران، بـۆ كۆچـەرەكان و شـێوە دێرینـەكانی بەرهـەمهێنانی ئابووریـیـان سەرەتای مـەرگ بـوو، زۆربـەی هـەرە زۆری كـوردە كۆچـەرە ئاژەڵدارەكان بـە زۆری زۆرداری نیشتەجێ كران و تەنها چەند بۆرە خێڵێك توانیان هەر لەسەر ژیانی ڕەوەندی بمێننەوە.

لە ئێران پاش لادانی ڕەزا شا لەسەر تەخت ساڵی ١٩٤١ و داگیركردنی خاكی ئێران لەلایـەن هاوپەیمانانەوە، هەندێ خێڵی بـە زۆر نیـشتەجێكراوی كـورد و نـا كـورد گەڕانـەوە سـەر ژیـانی ئابووری جارانیـان، بـەڵام ئەمـە ئەوەنـدەی نـەبرد چونكە ژیـانی پـەز لەوەڕانـدن و كۆچـەریی بەسەرچوو بوو و هێز نـەبوو چـەرخی زەمـان بگەڕێنێتـەوە دواوە، ئـیتر كۆچـەری و ئاژەڵداری كاری كاری بوویوو و لە چەند ئاسەوارێكی سەردارەتی پێشووی بەولاوە چی لێ نەمابووەوە.

هەندێ كەسی مەڕدار هێشتا مێگەلی گەورە گەورەی مەڕ و بزن بە دوای لەوەڕدا دەگێـڕن و لەسـەر نـەریتی جـاران گـەرمیان و كوێـستان دەكـەن، بـەڵام نـەك بـە كۆمـەڵ، چونكە زۆر لـە هاوپیشە كۆنەكانیان دامـاڵراون و بوونـە بـە وەرزێـڕ یـان گوندنـشین و تەنانـەت شارنـشینیش. زەوی بەیار، یان ڕەقێنی جاران ئێستا بە زەبری گاوەسن هـەناوی هەڵدەدرێتـەوە و كـشتوكاڵی تێدا دەكرێ و دەبێ بە سەرچاوەی خێر و بەرەكەش بۆ كۆمەڵی كوردەواری.

لەگەڵ گۆڕانی ئابوورییدا هەموو ئاوەڵناوە خێڵەكییە كوردیە مەزنەكان كە پێـشتر تـەنها بـۆ خێڵە ئاژەڵدارە كۆچەرە سەرەكیەكان و كەسانی جێنشینی سـەربەوان بـەكار دەهـاتن، ئێـستا تەنها بوون بە ئاوەڵناوی كۆمەلایەتی، ڕێك وەك بەكارهێنانی ناوی تـیرە لـە ئێرلەنـدەی ئێـستا، ئەمەش جۆرێكە لە ڕەواندنـەوەی هەسـتی دابـڕان لـە خـاك و هەنـدێ جـاریش هێمـای بـیروڕای سیاسییە (بڕوانە خێڵەكان و حیزبە سیاسیەكان).

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: John Masson Smith, "Turanian Nomadism and Iranian Politics," *Iranian Studies* XI (1978); G.R. Garthwaite, "Pastoral Nomadism and Tribal Power," *Iranian Studies* XI (1978); Fredrik Barth, *Principles of Social Organization in Southern Kurdistan* (Oslo: Brodrene Vorgensen, 1953); William Masters, "Rowanduz: A Kurdish Administrative and Mercantile Center," unpublished doctoral dissertation (Ann Arbor: University of Michigan Microfilms International, 1953); E.R. Leach. *Social and Economic Organization of the Rawanduz Kurds* (London: London School of Economics and Political Science. 1940); Douglas Johnson, *The Nature of Nomadism* (Chicago: University of Chicago Press, 1969).

# پیشەسازیەکان

مارکۆ پۆلۆ لە بارەی کوردەکانی نێوان مووش و ماردین و مووسڵەوە دەنووسێ و دەڵێ کەوا "ئەوان لۆکەیەکی زۆریان بەرهەم هێناوە و لەو لۆکەیە جۆرە قوماشێك دروست دەکەن کە پێی دەوترێ بۆکاسینی Boccasini لەگەڵ چەند جۆرە قوماشی تر.

خەڵکی وڵاتەکە هەم دەسرەنگینن، هەم بازرگان" گەشتەکان I-vi) ئێستا ئەو کاڵا سەنعەتیەی کە بۆ ناردنە دەرەوە گونجاو بێ تەنها کاڵای دەسکردە، کە وەك دیاری و پارچەی تایبەت بەکاردێن.

بەرهەمی فراوانی چنین بە مەبەستی ناردنە دەرەوە لە هیچ کوێیەکی کوردستاندا نیە راستییەکەی، هەرچەندە سامانێکی زۆری خوری و لۆکە لە ناوچەکەدا هەیە، کەچی بەرهەمی تەون و جۆلایی هیچ گرنگییەکی بازرگانییان نیە، وەکو سەنعەتیش، بە تەواوەتی کز بوە. سەرەڕای رابردووی پرشنگدار و پڕ سوودی، ئێستا تەنها خۆی لە رایەخی ناوماڵ وەکو لباد و مافوور و بەڕەی بەن و کلیم دا پەنگاندۆتەوە کە تاڕادەیەك جووڵەیان تێدا ماوە، ئەمانە دەرفەتی باشی بۆ دەرەوە ناردنیان لە بەردایە، بە تایبەتی جۆرە لادێکردە ڕەسەنەکانیان، نەخش و نیگارە "خۆماڵی" و "دیمەنە" سروشتی"یەکانیان لە بازاڕی ڕۆژاوادا ڕەواجێکی کەم وێنەیان لای ئەو کڕیارانە هەیە، کە خولیای مافور و بەڕەی نایابی ئێرانی و هاوجۆرین. ئاییندەی نێردەی مافووری دەسکردی کوردی، تا بڵێی پڕشنگدارە. هەرچەندە ناگاتە مافووری ئێرانی کە تەنها لە ساڵی (١٩٩٠)دا بایی (٧,٢) بلیۆن دۆلار فرۆشی هەبووە. هەرچۆنێك بێ بەرزترین ڕادەی فرۆشی جۆری کوردیی مافوور خۆی دەدا لەچەند سەد ملیۆن دۆلارێك، بەڵام ئەمە لە باری بایەخی بازرگانی نێردەییەوە بۆ بابەتێکی سەرەکی ئەوها، مایەی پشت بەستن نیە.

شمەکی تر، کە لە بابەتی ڕەشماڵ و سەرزین و کەرەستەی دیکەی خۆولاتی سواری بن، ئەمڕۆ باویان نەماوە. بەکارهێنانیان زۆر دواکەوتووە و ناردنە دەرەوەشیان داکەوتوو تر (بڕوانە مافوور و قوماش). پاڵاوتنی پیترۆل بێ یەك و دوو گرنگترین سەنعەتی مۆدێرنە لە کوردستاندا، دەرهێنانی کانزاکان، لە پلەی دووەمدا دێ، نزیکەی نیوەی ئەو (٢,١) ملیۆن بەرمیلە نەوتەی لە

ڕۆژێکدا عێراق لە ساڵی (١٩٩٠)دا دەیناردە دەرەوە لە نەوتەڵانە سەرەکیەکانی کورد دەردەکرا، ئەمە لەگەڵ بەرهەمی نەوتەڵانی بچووکتری کوردستان لێی ڕادەبینرێ ساڵی دەوری (٧– ١٠) ملیۆن دۆلار بێنێ، بەرهەمی نەوتی پاڵاوتە و پیترۆکیمیاویات دەتوانێ ئەم ژمارەیە زۆر زیاتر بەرزکاتەوە. داهاتی نێردەکانزاییەکانی تر، بە تایبەتی لە کوردستانی ڕۆژاواوە (لە تورکیا) لە هەمان ماوەدا تۆزێك لەیەك بلیۆن دۆلار کەمتر بووە.

گەشەکردنی ئەم دوو سەنعەتە، بەهەرحاڵ، هەر دەچێتە گیرفانی ئابووری گشتی عێراق و تورکیاوە. تەنها لە ئێراندا، دەتوانرێ بوترێ، کە پیشەسازی نەوتی کورد قازانجێکی خەڵکی ناوچەکەی لێکەوتۆتەوە ئەویش لەبەر ئەوەی لەوێ (لە کوردستان) سەرچاوەی نەوت ئەوەندە نیە. کارکردن و بە گەڕبوونی پاڵاوتەی مۆدێرنی نەوت لە کەرکووك و خانەقین (لە عێراق) و باتمان (لە تورکیا) جگە لە دابینکردنی دەرفەتی کار بۆ کارکەری نەشارەزا، سوودێکی ئەوتۆیان بۆ کوردستان خۆی نیە...تەنانەت لەم ڕەوشەوە، کارکەرەکان لە ڕووی ئەتنییەوە تێکەڵ و فرە ڕەگەزن، چونکە بڵندی ئاستی مووچە و بەردەوامی دانیی کرێکار لە شوێنە هەرە دوورەکانیشەوە بکێش دەکا.

دەرهێنانی بەرهەمی کانزای گرنگی تری وەك مس، ئاسن و کرۆم لە تورکیا هەمان شێوە و شێوازی سەنعەتی نەوتی هەیە لەو وڵاتەدا، واتە بەرهەمەکە بۆ ئەوە تەرخانکراوە کە بۆ دەرەوەی کوردستان بنێررێ، و ئەوەندە سوودی بۆ ئابووری ناوخۆیی لێنەکەوێتەوە. هەر چۆنێك بێ، ئەم سەنعەتە دەرفەتی کار بۆ کارکەرە نەشارەزاکانی وڵاتەکە پەیدادەکا.

لەلایەکی ترەوە پیشەسازی سووکەڵە تری وەکو کەرەستەی خانووبەرە، شەکر، کوتاڵ زیاتر پەیوەندییان بە ئابووری ناوچەی کوردنشینەوە هەیە، بۆ نموونە، کارخانەی چنینی بێستوون لە کوردستانی ڕۆژهەڵات (لە ئێران) بەشێکی زۆری کوتاڵی بازاڕی ناوچەکە دابین دەکا، کارگەکانی شەکریش بەرهەمی چەوەندەری شەکر بەکاردێنن کە بەردەوام ڕوو لە زیاد بوونە. کارگەکانی چیمەنتۆی کوردستانی ناوەڕاستیش زیاتر لە پیشەسازی نەوت پەیوەندیان بە ئابووری کوردستانی ناوەڕاستەوە هەیە و لە ئایندەی نزیکیشدا هەروادەبن.

جگە لەم سووکە سەنعەتانە، کوردستان بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی خۆی لە کاڵای مۆدێرن و شمەکی دەسکردی ناوخۆیی ڕێگەیەکی دوور و سەختی لە پێشە.

تورکیای لێدەرچێ، کەرتی سەنعەتی وڵاتانی ڕۆژەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەتی هی عێراق و ئێران زۆر لە دابینکردنی پێداویستییە ناوخۆییەکانی دوورە و پێویستی بە گەشەکردنێکی زیاتر هەیە تا کۆتایی بە پرۆسەی هاوردنی شمەکی دروستکراوی سەردەمانە لە دەوڵەتە پیشەسازیەکانەوە بێنن. لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە کوردستان لە هەموو ئەو وڵاتانە کەمتر گەشەکردوو لە رووی پیشەسازیەوە کەمتر هەنگاوی ناوە پێویستی بەوە هەیە کە بەشێوەیەکی لاوەکی کاڵایەکی درووستکراوی زۆرتر لە ئابووری ئەو وڵاتانەی پێیانەوە لکاوە، بێنێتە ناوەوە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بروانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Glenn M. Fleming, "The Ecology and Economy of Kurdish Villages," *Kurdish Times* IV 1-2 (1991); F. Barth, *Principles of Social Organization in Southern Kurdistan* (Oslo: Vorgensen, 1953); Ziba Mir-Hosseini, "Some Aspects of Changing Economy in Rural Iran: The Case of Kalardasht, A District in the Caspian Provinces," *International Journal of Middle Eastern Studies* 19 (1987); H.L. Rabino, "A Journey in Mazandaran (from Resht to Sari)," *Geographical Journal* 42 (1913); J.B. Noel, "A Reconnaissance in the Caspian Provinces of Persia," *Geographical Journal* 57 (1921); Marcel Bazin and Christian Bromberger et al., *Gilân et Âzerbâyjân Oriental: Cartes et Documents Ethnographic* (Paris: Éditions Recherche sur les civilisations, 1982); Ziba Mir-Hosseini, "Impact of Wage Labour on Household Fission in Rural Iran," *Comparative Journal of Family Studies* 18.3 (1987); X. de Planhol, "Le boeuf porteur dans le Proche-Orient et l'Afrique du Nord," *Journal of the Economic and Social History of the Orient* XII.3 (1969); Z. Mir-Hosseini, "Changing Aspects of Economic and Family Structures in Kalardasht, A District in Northern Iran," unpublished doctoral dissertation (Cambridge: Dept. of Social Anthropology, University of Cambridge, 1980); E. R. Leach. *Social and Economic Organization of the Rowanduz Kurds*. (London: London School of Economics and Political Science, 1940); Marco Polo, *Travels*, John Masefield, ed. (London: Dent, 1975); E.J. Keall, "Political, Economic, and Social Factors on the Parthian Landscape of Mesopotamia and Western Iran: Evidence from Two Case Studies," in L.D. Levine and T.C. Young, eds., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia* (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, vol. 7, 1977).

# بازرگانی

سەروبنکردنی ئاسەوارە دێرینەکان بە باشی ئەوە دەردەخا کە کۆمەڵگای کوردستان لە دە هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە کۆمەڵگایەکی بازرگانی بووە. دەسکردی پارچە و پلۆچەیان ساغی شمەکی لە شوێنانی یەکجار دوورەوە هێنراو، ئەو ڕۆڵە دەردەخەن کە بازرگانی لە ئابووری کوردستاندا بوویەتی، ڕۆڵێك کە لە بایەخدا گرنگ، بەلام لە گەشەکردنی تەکنۆلۆژیدا ئەوەندە کاریگەر نەبووە (Beale۱۹۷۳ ).

تێپەڕبوونی فاسکۆدی گاما بەسەری هیوای چەکدا لە باشووری ئەفریقیا لە ساڵی (۱٤۹۷)دا سەرەتای گۆڕانێك بوو لە ڕێوبانی زەمینیەوە بۆ ڕێگای دەریایی لە کاروباری

بازرگانییـدا، پێـشتر ڕێگـای زەمینیـی لـەبن نـەهاتووی بازرگـانی بـاوی هـەبوو، وەكـو ڕێگـای ئاورێشم. كە بە كوردستاندا دەبورد و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای پێكەوە دەلكاند.

لەكاركـەوتنی هاتووچـۆی بازرگـانی بـە كوردسـتاندا و دوابـەدوای ئـەوە وەسـتانی ئـەو ئاڵوگۆڕەی لە ئاستی نوێكاریە تەكنۆلۆجی و ئابووریەكان لـەنێوان كـەلتوورە جیاجیاكانـدا لێـی دەكەوتەوە، بوو بە سەبەبكاری دابڕانی كوردستان لە وریابوونەوە و نوێسازی نێو نەتەوەیی.

هەروەها لـە گشت بـاس و خواسـێكی تـەكنۆلۆژیای نـوێش، ئاسـت و توانـای پیـشەسازی ناوخۆیی بەشێوەیەكی ترسناك دابـەزی، چـونكە وڵاتەكـە لـە هەندێ بـازاڕی تـەنگی نـاوخۆیی بەولاوە هیچی بۆ نەمایەوە، ژێرخانی ماددی و بەڕێوەبەریش كە خزمەتی هاتووچۆی بازرگـانیی كوردسـتانی دەكـرد و سوودیـشی لێـدەبینی، پوكایـەوە، لـە بابـەتی مێـژووی هاوچـەرخی زۆر نوێدا، بەسەرهاتی مێژوویی ئەم ڕووداوانەی باسكراون.

تـا ئـەم سـەردەمانەی ئـەم دواییـە كوردسـتان نـەیتوانیوە لـە دەردی چـەندین سـەدەی تاكانەوەی دوای ئەو ڕووداوە ڕاست بێتەوە. گەڕانەوەی ڕێگاوبـانی بازرگـانیی نێونەتـەوەیی لـە شەستەكانی(سەدەی بیستەمیندا) بە كوردستاندا، هەرچـەندە ئەوەنـدە بـە تـەوژم نـەبوو بـوو بەمایـەی بووژانـەوەی ئـەم ڕێگاوبانانـەو ئـەو دابڕانەشـی قـەرەبوو كـردەوە كـە لـە سـەدەی (١٦)ەوە بەرۆكگیری كوردستان بوو بوو.

بازرگانیی زەمینی چالاك و پڕ جموجوڵی وڵاتە نەوتدارەكانی ئێران و عێـراق (بـە ڕادەیـەكی كەمتریش بازرگانیی وڵاتەكانی ئـەولاتری ڕۆژهەڵات و باشـووریش) لەگـەڵ بازاڕەكـانی ئـەورووپادا كوردسـتانی بووژانـدەوە و كـارێكی وایكـرد كوردسـتان وەكـو پردێـك لێـی سـوودمەند بـێ. دامەزراندنی ژێرخانی گواستنەوە لە كوردسـتاندا بـازی بەسـەر هـەموو چاكسازیەكی مـاددی و پیشەسازیدا داوە لە وڵاتەكەدا.

ئێستا گەورەترین گەلە كاروانی هاتووچۆ بـەناو كوردسـتانی بـاكوور و ڕۆژاوادا (لـە توركیـا) تێدەپـەڕێ. ئـەم هاتووچۆیە بازاڕەكـانی ئێـران (زاڵگـەكانی بازرگـان – ئـاگری، قونـور– وان، سـەرۆ– یوكسەكۆڤا) و عێـراق (زاڵگـەی مووسـل – خـابوور– جزیـرە) بەوانـەی ئـەورووپاوە دەبەسـتێتەوە لـە سـاڵی (١٩٩٠)دا سـەرجەمی بـڕی كـاڵای بـە كوردسـتاندا تێپـەڕیوو (بـە نەوتیشەوە) بایی نزیكەی (٢٣) بلیۆن دۆلار بووە، بـە كرانـەوەی سنووری ئێـران – عێـراق تـا

دەمارە سەرەکیەکانی هەمەدان – کرماشان – بەغدا و گەلی عەلی بەگ – قەلادزە – مووسڵ بوونە پاڵپشتێك بۆ بە گوڕهاتنەوەی هاتووچۆی بازرگانی قورس، تا دەمارە بازرگانیە کوردیەکان ڕۆڵێکی ژیانبەخشیان لە ئابووری ئەم دوو وڵاتەدا بینیوە چونکە بەندەرەکانی هەردوو وڵاتەکە بەهۆی شەڕی (٨) ساڵەی (١٩٨٠– ١٩٨٨) نێوانیانەوە داخراون، یان وێران بوون.

خراپی ڕێگاوبانی سەر سنوورەکان، کە هەندێ جار بە درێژایی دەیەها میل ڕێگا بە تەواوی دەبەسترا، کارێکی وایکرد تورکیا ئاوڕێك لە ڕێگاوبانی کوردستان بداتەوە، چونکە قازانجێکی زۆری لە کرێی ترانزێت دەچووە باخەڵەوە، بەلام ئەو کارەی کرا لە رووی جۆرەکییەوە ئەوەندە باش نەبوو، کە سوود بە ئێران و عێراق بگەیەنێ، چونکە کەلکی تێپەڕبوونی سووك و ئاسانی بۆری و شەمەندەفەری نەبوو. ئەمە جگە لە دواکەوتن و زیان بەرکەوتنی ماددی و شمەك. سەرەنجام هەردوو دەوڵەت ناچارمان یارمەتی تورکیا بدەن تا ڕێگاوبانی کوردستانەکەی چاك بکا. لەم بارەیەوە گەورەترین پرد لە ڕۆژهەلاتی ناویندا کە ڕێی تێپەڕبوونی شەمەندەفەری ئێران – تورکیایە، لە دۆڵی قوتووری کوردستانی باکوور خڕ بە پارەی ئێران دروست کرا، بەلام پێویستە تورکیا لەم ڕووەوە چالاکی زیاتر بنوێنێ. ڕاستە لە ئەنجامی جەنگی ساڵی (١٩٩١)ی کەنداوەوە چاککردنی ڕێگاوبانەکان دواکەوتوون، بەلام ناشکرێ دەستیان لێ هەڵبگیرێ.

بێجگە لە ڕێگاوبان، چەندەها تۆڕی بۆڕی نەوت لەسەر خاکی کوردستان بۆ گواستنەوەی پیترۆل و بەرهەمەکانی لەسەرچاوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە بۆ بازاڕەکانی ڕۆژاوا ڕایەڵکراون و هەندێکیش بۆ دوارۆژ نەخشەیان بۆ کێشراوە.

گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ بایەخ و گرنگیی گەڕانەوەی بازرگانیی نێودەوڵەتیدا بۆ کوردستان، بازرگانی گەنجینە فلزییەکان و سەرچاوە سرووشتیەکانی دیکە، دەکەونە پلەی دووەمەوە. ئەوی ڕاست بێ، سەرەڕای سامانی کانزایی وڵاتەکە، کەرتی کشتوکاڵ لە بەهێزکردنی ئابووریی ناوخۆیی کورددا دوارۆژێکی پرشنگدارتری لەبەردایە (بڕوانە کشتوکاڵ).

بەنرخترین پاشەبەرهەمی پارەخستنەکار لە بازرگانی ترانزێتدا، ئەو گوڕ و تاوەیە کە بە دروستکردنەوەی ژێرخانی یاریدەدەری ناوخۆیی دەدا. لە بەرامبەردا دەتوانرێ بەرووبوومی

سامانی كانزاكان بە چاككردنێكی هاكەزایی ژێرخانی ناوخۆیی بنێررینە دەرەوە حكوومەتی عێراق بەرنامەیەكی بەربلاوو مۆدێرنی بۆ پەرەپێدانی ناوچە شارییەكان داناوە. باشووری ولاتەكە كە زۆرەبەی دانیشتوانی عەرەبی شیعەن لەم بوارەدا زۆر پشتگوێ خراون.

لە هەموو سەرزەمینی كوردستان، كوردستانی عێراق لە رووی ژێرخانی هاوچەرخ و دامودەزگای گواستنەوەوە چاكتر گەشەی كردوە، لە بەرامبەردا، كوردستانی ئێران لە هێڵەكانی تەلەفۆن و پەیوەستدا، پێشكەوتووترە.

لە كوردستانی عێراقدا دوو دیاردەی دژ بەیەك بە زەقی بەدی دەكرێن: یەكێكیان، پەرەپێدانی پلانێكی بەربلاوو ئەویتریان وێرانكاریەكی سەرانسەری. زۆر جێی سەرسوورمانە، كە لەگەڵ سەرلەنوێ دروستكردنەوەی هەر بەشێكی كوردستاندا، دەوڵەت بەشێكی تر وێراندەكا، زۆرجار بەوانەشەوە كە هەر تازە دروستی كردوونەتەوە، ژمارەیەكی زۆری گوند و شارۆچكەدراونە بە بیلدۆزەرو لەگەڵ خاكدا یەكسان كراون، دانیشتوەكانیشی بەزۆر كوتراونەتە شارو شارۆچكەی گەورەترەوە و لە كۆمەڵگەی كۆنترۆڵكراودا ئابلۆوقە دەدرێن. بەكارهێنانی گازی كیمیاوی لە ئابی ۱۹۸۸ دژ بە دانیشتوانی سێكوچكەی دهۆك، زاخۆ، ئامێدی، لە باكووری مووسڵ تەنها یەك لێكدانەوە هەڵدەگرێ، ئەویش ئەوەیە كە دەوڵەت. ئامانجێكی گرنگی سەرەڕای هەموو شتێك لەژێر سەردایە: بە ئارامی ڕاگرتنی پەیوەندییە ئابوورییە زەمینییەكانی لەگەڵ ئەوروپادا كە تازە سەرلەنوێ دروستی كردوونەوە، هەموو ڕێگاوبانەكانی شەمەندەفەر و تۆڕی بۆڕیە نەوتی عێراق بۆ توركیا و هەندەران بەم شوێنەدا تێپەر دەبن، گەلێ كۆلنەدەری كورد، دەبوو لەوكاتەدا كە ئەو ئامانجە دەهێنرایەدی، ببێ بە قوربانیی بۆ سەلامەتی ڕێگاوبانە بازرگانیەكان كە بەناو زەویەكانییدا تێدەپەرین.

لە رووی گەشەكردنی ژێرخانەوە كوردستانی توركیا كەمترین بەشی بەركەوتووە و لەبەر ئەوەی گەورەترین پارچەی كوردستان پێكدینێ و زیاتر لە نیوەی گەلی كوردی تێدا دەژی، ئاستی گشتی ئەم چاكسازیە مودێرنانە لە كوردستان لە ڕێژە نیشتیمانیەكانی هەریەكە لە ئێران و عێراق و سوریا و توركیا نزمترە، هەرچەندە چاكسازی یەكجار گەورەگەورە لە كوردستانی عێراق و ئێراندا كراون.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: H. Weiss and T. Cuyler Young, Jr., "The Merchants of Susa: Godin V and Plateau-Lowland Relations in the late Fourth Millennium B.C.," *Iran* XIII (1975); L.D. Levine, "East-West Trade in the Late Iron Age: A View from the Zagros," in *Le plateau iranien et l'asie centrale des origines à la conquête islamique*, No. 567 (Paris: Colloques internationaux du centre national de la recherche scientifique, 1976); T.W. Beale, "Early Trade in Highland Iran: A View from a Source Area," *World Archaeology* 5:2 (1973); G.A. Wright, *Obsidian Analysis and Prehistoric Near Eastern Trade: 7500 to 3500 BC* (Ann Arbor: University of Michigan Press, 1969).

# دەرفەتی کارکردن

سەرەڕای ڕێژەی زۆر نزمی شارنشینان و خوێندەوار لە کوردستاندا، کەچی کورد ڕێژەیەکی بڵندی کارکەریان هەیە لەو وڵاتانەی تێیاندا دەژین (بڕوانە شارستانیی بوون، سەنتەرە شارییەکان و پەروەردە).

لە کاتێکدا ڕێژەی دەوڵەتیی کارکردن لە ئێراندا (٢٢,٣٪)ی ژوور شەش ساڵان پێکدێنێ، ڕێژەی کارکردن لە پارێزگا کوردنشینەکانی ئازەربایجانی ڕۆژاوا، کوردستان، کرماشان و ئیلام بەدوای یەکدا ئەوهایە:( ٢٢,٩٩٪، ٢١,١٣٪، ١٩,١٧٪ و ١٧,٥٩٪)، هەرچی هەمەدانە کە نیمچە کوردە (٢٣,٣٤٪)ی تێدایە.

گەر بێتو ژمارەی ئەو خەڵکە زۆرە بگرین کە لە جەنگی عێراق— ئێران لە ئیلام و کرماشان ئاوارە بوون، ئەوا ڕێژەکە، بۆگشت کوردستانی ئێران خۆی دەدا لە ٣٠٪، ئەم ڕێژەیەش نەك لە ٢٤ پارێزگاکەی ئێران بەرزترە، بەڵکو لە دوو پارێزگای فارس نشینی کرمان و فارسیش سەردەکا.

ئامارگیری کارکردن لە ئێراندا هەر وەکو لە وڵاتانی تریشدا کە کوردیان تێدا دەژی، ئەگەر چەند فاکتەرێکی تریشی لە پاڵدا ڕەچاو نەکرێ ڕاست دەرناچێ. لە ماوەی (٣٠)ساڵی ڕابردوودا هەڵقوڵانی خێرای ژمارەی دانیشتوانی لادێ شان بەشانی سەرمایە گوزاری و پوختەکردنی کز لە کەرتی کشتوکاڵدا، پاڵ بە خەڵکێکی زۆرەوە دەنێن بەرەو مەڵبەندە شارییەکان و بەرەو هەندەران کۆچ بکەن، بەشێکی زۆری لاوی کار توانا بۆ دەرەوەی کوردستان سەرهەڵدەگرن و

تەنها لە ڕێی ئابوورییەوە بۆ ماوەیەك پەیوەندییە ئابوورییەكانیان لەگەڵ خاكی نیشتیماندا دەهێڵنەوە، ئەنجامی ئەمەش لە دوو بەدەرنیە:

١- فشارێكی كەمتر دەكەوێتە سەر بازاڕی كاری سنووورداری ناوخۆ، كە خۆی لەخۆیدا هەر بەشی ئەوانە دەكا كە سەرەڕای كرێی كەم و ئابووری سست، مانەوەیان لە وڵاتدا هەڵبژاردوە.

٢- زۆری ئەوانەی كە بۆ كاركردن ڕوویان كردۆتە دەرەوەی كوردستان بە بێكاری وڵاتێكی تر دادەنرێن، دیارە ئەمە ژمارەی كارداریی لە هەرێمە كورد نیشنەكانی ئێران و عێراق و توركیا و سوریا بەرزتر دەكاتەوە، بەم پێیە نابێ ڕێژەی كارداریی ناوخۆیی بەشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی بكرێ بە بەڵگەی دەوڵەمەندی و ئابووری گەش. هەرچۆنێك بێ، ئەمانە دەكرێ بە نیشانەی زیندییەتی زیاتری باری كۆمەڵایەتی ئابووری خاكی كوردنشین دابنرێن لە بەرامبەر ئەو شوێنانەدا كە كۆمەڵی ئەتنیكی تریان تێدا دەژی لەو وڵاتانەدا كە كوردیان تێدایە.

پارە ناردن بۆماڵەوە لەلایەن كوردە كاركەرەكانی دەرەوەی كوردستانەوە ڕەنگە هۆكاری ئەو ژمارە سەرسووڕێنەرانە بێ كە لە بارەی خەرجكاری و لاف لێدانی دانیشتوانی پارێزگا كوردنشینەكانی ئێران و عێراقەوە دەدرێن و گوایە ئەو خێزانانە بەرزترین ڕێژەی داهاتی نەتەوەیی خێزانیان هەیە، وابزانم خێزانە كوردەكانی توركیایش لە هەمان ڕەوشدان، هەرچەندێكو نەمتوانی لە بارەی ئەمانەوە ئامارێكی ئەوتۆ وەدەست بێنم.

وا مەزەندە دەكرێ كەسێیەكی دانیشتوانی كورد لە دەرەوەی خاكی كوردستان بژین (بڕوانە كۆچكاری و ئاوارە بوون). ئەمە، تا ڕادەیەك ئەوە نیشاندەدا كە هاوسەنگییەكی بەردەوام لەنێوان ژمارەی توانای بازاڕەكانی ناوخۆی كار و ئەو كەسانەدا هەیە كە پێویستیان بە كاركردنە، گەلێك سەنعەتی مۆدێرن كە دەتوانن كرێكارێكی زۆر بگرنە خۆ، نەهاتوونەتە كوردستانەوە، پیشەسازی نەوت و كانزاكانیش، تەنانەت سەنعەتی مافووری دەستیش، كرێكاری كەمتر بەكرێ دەگرن. ئەوەی دەمێننەوە كشتوكاڵە كە لە ڕووی كارەوە وەكو كەرتێكی ئابووری هەرە گرنگ لە مەیداندا دەمێننەوە و فراوانترین گەشەی بازاڕی كار دەكرێ لە ڕێی بوژاندنەوەی ئەم كەرتەوە بهێنرێتە دی. پلانی باش داڕێژراوی پرۆژەی گاپ (بڕوانە سەرچاوەی سروشتی: ئاو). دەتوانێ تا ڕادەیەكی بەرچاو كۆچكردنی لاوی كورد بۆ ئەم لاو ئەو لا بە دوای كاردا كەم كاتەوە و ئابووری ناوخۆ پایەدار بكا و گەشەشی بداتێ. كاتێك پرۆژە

کشتوکاڵی سەنعەتیەکانی چون گاپ و چاندنی لۆکە و تووتن و چەوەندەری شەکر لە کوردستاندا بەگشتی و لە کوردستانی تورکیادا بە تایبەتی باش بکەونە گەڕ، ئەوسا دەردەکەوێ چ دەرفەتێکی زۆر بۆ کاری کشتوکاڵی دێتە پێشەوە.

لەگەڵ زیادبوونی سەرمایە گوزاری لەناو ئابووری کورددا، خەڵکێکی زۆری خۆوڵاتی کاریان لە دامودەزگا خزمەتگوزاریەکاندا دەست دەکەوێ، بە تایبەت لە کەرتی گواستنەوەدا.

ئەمڕۆ چینی ناوەڕاستی کورد، بە بەسترانی بە تۆڕی خزمەتگوزاریەوە بوە بە چالاکترین کەرتی کۆمەڵگای کوردەواری.

دیارە سەرچاوەی ئەم بووژانەوەیە، ئەو سوودە بەرچاوەیە کە هەردوو کەرتی کشتوکاڵ و گواستنەوە، بە بازاڕی ناوخۆی خەوتووی کوردستانی تورکیای دەگەیەنن، سەرەنجامی ئەمە، وێ دەچێ ببێتە پاڵنەر بۆ کوردەکانی دانیشتووی ڕۆژهەلات کە بە لێشاو بەرەو شارەکانی ڕۆژاوای تورکیا قەلفڕ نەکەن، لە وڵاتەکەی خۆیان، واتە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا بمێننەوە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** *The Population and Household Census, 1986* (Teheran: Iranian Census Bureau, 1987), the secret edition; Yacqub Sarkis, *Tobacco in Iraq: Its Existence and Cultivation a Little Before Three Hundred Years Ago* (Baghdad: 1941); Marcel Bazin and Christian Bromberger et al., *Gilân et Âzerbâyjân Oriental: Cartes et Documents Ethnographic* (Paris: Éditions Recherche sur les Civilisations, 1982).

**General Bibliography**

Jürgen Roth, *Geographie der Unterdrückten: die Kurden* (Hamburg: Rowohlz, 1978); M.A. Cook, ed., *Studies in the Economic History of the Middle East* (1970); *Kurdish Times*, semi-annual journal of the Kurdish Library, Brooklyn, New York, 1985-present; *Studia Kurdica*, semi-annual publication of the Centre de Recherches de l'Institut Kurde, Paris, (1984-present) with text in English, French, and the primary Middle Eastern languages.

# فەسڵی دەیەم

## کەلتوور و هونەر

### کەلتووری میللی

دەڵێی بەخش یاریدەی داون، بەوەی کوردان توانیویانە هەندێ بەشی بابەتی ناوداری ئەدەبیاتی کۆن، وەکو کورتەی ئینسایکلۆپیدیایەك وان بۆ ناساندنی کەسایەتی و کەلتووری نەتەوایەتی کورد، بە تایبەتی ئەگەر جێگای ڕووداوەکان و کەسایەتیەکان دەستنیشان بکرێن و بزانرێن.

هەرچەند بەڵگەکان لەسەر کۆنیەتی لە ڕادەبەدەری کەلتووری میللی کورد دێرینەتر بن، ئەوەندە بایەخیان زیاتر و سرنجکێشترن. لە گەرمەی کاری کەندەکارییدا بۆ دەرخستنی پاشماوەی سەردەمە بەردینە کۆنەکان لە ئەشکەوتەکانی شانیدەر لە کوردستانی ناوەندا (سۆلیکی)ی ئاسەوارناس لە سەرەتای ئەو ڕاپۆرتە کتێبەدا کە "شانیدەر یەکەم گەلی گوڵخواز ١٩٧١" نووسیویە هەر دادیەتی لە دەستی کرێکارە کوردەکانی کە "عاشق ئاسا ئەوداڵی گوڵە کێوین" ئەو بە تووڕەیی یەوە دەڕوانێتە کرێکارەکان سەبارەت بەوەی بەردەوام خەریکن دەستە گوڵ بە پاچ، و باڵتە و بێڵ و تانکەری ئاو و دیواری ئەشکەوتەکان، و بە تایبەتی جل و بەرگە ڕەنگا و ڕەنگەکانیانەوە هەڵدەواسن (بڕوانە جل و بەرگ و خشڵ). ئەو خوێنەرانی کتێبەکەی بەوە دەورووژێنێ کە گوایە ئەنجامی تاقیکردنەوە زانستیەکانی کابرایەکی (٥٦٠٠٠) ساڵەی نیاندەرتاڵ کە لەلایەن کرێکارە کوردە گوڵ بەسەرەکانیەوە لە ئەشکەوتەکەدا دەرهێنراوە وایان دەرخستوو کە کابرا لەسەر ڕایەخە گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ درێژ کراوە ئینجا داپۆشراوە، داب و نەریتی کۆن بە ئاسانی لەناو ناچن.

ئەمـە لەوانەیــە لەگــەڵ رەگ و ڕیــشەی تێگەیــشتنی کــورددا لــە بــارەی سروشــتەوە پەیوەندییەکی یەکجار پتەوی هەبێ... بە تایبەتی سروشتی چیاکان، کـە کـورد وەکـو دۆسـتی گیـانی بـەگیانی خـۆی، یـان تەنانـەت بەشـێکێش لـە خـوێن و گۆشـتی خـۆی دادەنـێ. تاشـە بــەردەکان، کــە پۆســکەکان، ڕەوەزەکــان، تاڤگــەکان، زینــدەوەرەکان دار و درەختــەکان، ڕووحەکان، ئەو کەسایەتیانەی لە دەروونیاندا دەژین، هەموو بەش بەشن لە سروشـتی گشتی، کـە لـە چوارچـێوەیدا، مرۆڤـی کـورد لـە وێنەیـەکی ڕاسـتەقینەی خـۆی دەگـەڕێ زۆر لەمانـە، تەنانـەت لـە ڕووی ئایینیـشەوە بـە پـیرۆز دادەنـرێن و ڕێزیـان لـێ دەگـیرێ، بـۆ نموونـە هـەر پیرەدارێکی گەورەی سەر کانی یان گۆلە ئاوێك بە پارچە پـەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ ڕازێنراوەتـەوە، کە بۆ خۆ پاراستن و نزاگیرابوون هەڵدەگیرێن و ئەم دەسـت و ئەودەسـت دەکـەن. چ ئـەو دارە خـۆی چ کـانی و گۆلـەکان تەنانـەت ئـەو زیندەوەرانـەش کـە بـە دەوریانـدا دەژیـن هـەموو لـە چوارچـێوەی گـشتی سروشـتدا بایـەخ و پلەوپایـەی خۆیـان هەیـە، ئـەو چوارچـێوەیەی کـە ڕەنگدانەوەی مـاددی گیـانی هـەڵم ئاسـای گەردوونـە، ئـەم قەوارانـە، هـەموارە گیـانی خـوارتر دەگرنـە خـۆ. لـەناو ئـەو گیانانـەدا، هەنـدێ هـەن کـە لـە قۆنـاغی گۆڕانـدان بـەرەو قۆنـاغی "ئادەمیزاد"، یان بەشێوەیەکی تر، ڕووحی ئەو کەسانەی کە پلـە نـزم کـراون تـا سـزای کـارە خراپەکانی ڕابردوویان وەرگرن (بڕوانە ئایین، یارسانیەت) بەم پێیە، دەبێ ڕێزیان لـێ بگـیرێ و نابێ بهێڵرێ بە خۆڕایی پیس بن، ڕووحی هەرە گرنگ لەناو ڕووحەکاندا "خـدر"ە واتـە "پیـاوە سەوز پۆشەکەی دەورووبەری کانی و گۆلاوەکـان" (بڕوانـە فۆلکلـۆر و چـیرۆکە فۆلکلۆریـەکان) ڕەنگە جوان جوانەکانی سروشت، هی تاشە بەرد و ڕەوەزەکان، هـی گـوڵ و گـژوگیا، شـێوەی زیندووی جۆراوجۆری شینایی و زیندەوەر و هەڵسوکەوتیان، هەموو ئەمانە پێکەوە لێکدراون و میزاجێکی تایبەتیان لێ دروستکراوە، کە پێی دەوترێ "کوردەواری".

هـەر کـوردێکی کـورد ئاسـا، بـە چـاوی ڕێـزەوە دەڕوانێتـە ئـەم شـتە. هـەروەها لەلایـەن بیانیەکانیشەوە، وەکو نیشانەیەکی پیرۆزی نەتەوەیی، بایەخی بەرزی پێدەدرێ.

ڕەنگە ئاڵ و والا و تێکـچڕژاوەکانی سروشـت کـە هەڕەمـەکی و بـێ شـیرازە بەسـەر یەکـدا کـەوتوون، بـێ ئـەوەی دەسـتی هـەوڵی ڕێکخـستن و شـێوە بەنـدییان بـدات، مـۆرك و نیـشانی زەوقیی کوردەوارییِن. هەر ئەمە وایکردوە، گەر کوردێك لەناو سەدەها کۆمـەڵی خـەڵکی تـر بـە

جل و بەرگی نەتەوەیی كوردانەوە بوەستێ، ئەو وەكو گای قەش دیاریێ و بۆ ناسینەوەی پێویست بە وردبوونەوە ناكا، ئەمە لە دێرزەمانەوە هەر وابوە و هەر واش دەبێو پلوتارك لە جیاكردنەوەی جلوبەرگی (میثریداتە پۆنتیەكاندا) ئەم ڕەنگاوڕەنگییەی جلوبەرگی كوردەكانی بە باشی لێك كردۆتەوە و باس كردوە (Lives:Pompey).

تەنانەت ئەو شتومەكە تازە بابەتانەش كە دەگەنە كوردستان، زوو بەزوو خۆماڵی دەكرێن و ئاڵ و والای كوردییان بە سەردا ڕەنگڕێژ دەكرێ و بەشێوەی كوردییەوە دەچنە ناوانەوە... نەك هەر ئەمە گۆڕەكان، تا وەرزی پشكوتنی گوڵاڵە و شینایی بە پارچە قوماتێكی ڕەنگاوڕەنگ دادەپۆشرێن تا بۆگیانی مردووەكەی ناویان سەبووری بەخش بێ، بۆ بیانیەك كە لە ناشتنی مناڵە كوردێكدا ئامادەبێ، مایەی غەمباریەكی سرنجكێشە كەوا لاشەكە بە جۆرێك دەپێچرێتەوە كە بۆ ڕۆژاوایی یەك تەنها لە "دیارییەكی پێچراوە" دەچێ چونكە تەنانەت كفنەكەش لە پارچەیەكی گولگولی ساز كراوە و بە شریتی ڕەنگاوڕەنگ بەستراوە.

ڕەنگە كوردییەكان بەزەقی لە كارە هونەریە تازە بابەتەكانی هونەرمەندە كوردەكاندا بە زۆری دەردەكەون بە جۆرێك كەسێكی ئاشنا هەرگیز لە جیاكردنەوەیان لە كاری هاوێنەی گشت دنیا بە هەڵە ناچێ. دەڵێی هونەرمەندی كورد هەرگیز بیر لە "تایبەتی و هاوئاهەنگی" ڕەنگەكان ناكاتەوە، ئەو تەنانەت ناتوانێ بەر لە ئارەزووی سەركێشی هەست و دەروونی خۆشی بگرێ، كە بەتوندی بەلای ڕەنگی شەڕ و ئاوداردا جڵەوكێشی دەكەن. مەنسوور ئەحمەد، كە وێنەكێشێكی مۆدێرنخوازی كوردە لە پێشانگایەكی كارەكانیدا كە لەم دوایی یەدا لە كۆتینگن مۆدێرنخوازی ئەلەمانیا كردی بە خەڵكەكەی وت "بۆ من، وێنەكێشان ڕێگایەكە بۆ گۆڕین و مامەڵەكردن لەگەڵ ڕەوشێكی تایبەتدا، لەگەڵ ئاوێتەبوون لەگەڵ ڕەنگەكاندا، ماڵە دوورەكەم دەبینمەوە، خودی خۆم دەبینمەوە" (بڕوانە پەیكەرتاشی و وێنەكێشان).

تا ئەو ڕادەیەی نووسەری ئەم كتێبە ئاگادارە، كەلتووری كۆنی كورد كە لە داب و ڕەسمەكانی تیرەی فریشتەكاندا پارێزراوە، تاقە كەلتوورە كە ڕەنگی تایبەت دەدا بە هەر یەكێ لە حەوت ڕۆژەكانی هەفتە: سوور بۆ یەكشەمە، ڕەش بۆ دووشەمە، سپی بۆ سێشەمە، شین بۆ چوارشەمە، پەمەیی یان مۆر بۆ پێنج شەمە، سەوز بۆ هەینی و زەرد بۆ شەممە، ئەوی ڕاستە، حەوت بەرجەستەكەرە پیرۆزەكەی گیانی گەردوونییش لەم ئایینەدا، ڕەنگی

تایبەتی خۆیان هەیە. بەڵام خواوەندی هەرە گەورە تێکەڵەی دوو ڕەنگی سپی و شینی پێدراوە (ئەمانە لەگەڵ ئەو حەوت ڕەنگە هاوکرۆکەدا بەراوردێکە کە بۆ ڕەنگکردنی دیوار، لە شارە هەرە کۆنە کوردیەکاندا بەکارهێنراوە)، (بڕوانە بابەتی بیناسازی و نەخشە کێشانی شار).

بیرۆکەکانی فۆلکلۆری کوردی، بە دەورووبەری ئەو ڕووداوانەدا دەخولێنەوە کە کرۆکەکەیان سروشتە، یان پەیوەندییان بە سروشتەوە هەیە، یان لەسەر خودی سروشت دەدوێن، تەنانەت داستاننامە و چیرۆکی جەنگەکانیش بالادەستی بێ یەکودووی سروشت و پەیوەندیی مرۆڤ و سروشت بەزەقی دەردەخەن، لەم بواری پەیوەندی مرۆڤ و سروشتە لە فۆلکۆردا دەتوانین پەنجە بۆ دوو نموونەی گرنگ ڕاکێشین: چیرۆکی فەرهادی کێوکەنی لە خۆبردوو، ئەنکیدۆی پاڵەوانی گلگامش (بڕوانە کەسایەتی نەتەوەیی). تەنانەت لە داستانی مەم و زیندا، کە گەلێ لەوانە نوێترە، ئەم پەیوەندییە بە زیریی دیارە.

ئەوەتا لە خوێنی بەکرەوە، دڕکێك دەڕوێ کە ڕیشەی ئێرەیی تا قووڵایی زەوی لەنێوان گۆڕی هەردوو دڵدارەکەدا دادەکوتێ، بەم جۆرە وەکو دەرەنجامێکی سروشتی چاوەڕوانکراو و تەنانەت دوای مەرگیش لێك جیایان دەکاتەوە (بڕوانە ئەدەب). بە دەگمەن نەبێ، لە کوردستاندا ئایین بۆ بابەتی ئەدەبیات و ئاهەنگگێڕانی گاڵتەجاری بەکار نەهێنراوە. بەڵام ئەمە لە سەرزەمینە شیعەنشینەکاندا وانیە. بۆ نموونە، لەو سەرزەمینانەدا گوڵمەزی (عومەر سوزان)، واتە سووتاندنی عومەر دەگێڕێ، عومەر کە خەلیفەی سێیەمی ئیسلامە، لەلایەن سوننەییەکانەوە زۆر ڕێزی لێ دەگیرێ، بەڵام لەلایەن شیعەکانەوە بە چاوی داگیرکەر دادەنرێ (داگیرکەری جێگەی عەلی لە جێگەداریی پێغەمبەرداوەرگێڕ). لەو گوڵمەزەدا وێنە و پەیکەری عومەر بە کوڵەکەیەکەوە دەبەسترێن و ئاگریان تێ بەردەدرێ. لەو شوێنانەی کوردستاندا کە شیعەنشینن. ئەم گوڵمەزە بە تایبەتی لەو شوێنانە دەکرێن کە هەندێ سوننیشیان لێ جێ نشینن. لە هەمان کاتدا بەیت و بالۆرەی کاڵتە ئامێزیش لە ئاهەنگەکاندا دەوترێن و بوونی منداڵ و مەزنیش لە بەرنامەکەدا، زیاتر گەرمتر و خۆشتری دەکا زۆرجار تیپی نواندنی خۆجێیش لە کارەکەدا بە چالاکی بەشداری دەکەن، بۆ ئەوەی تا دەکرێ سوننیەکان زیاتر بێزار بکەن، هەرچەندە لەوانەیە، ئەم کارانە ببنە مایەی پێکدادانی خوێنین و

شەڕ و شۆڕی ناوخۆیی گەورە و كەوتنی قوربانی لە گشت لایەك، كەچی ساڵ بەساڵ ئەم بەزمە هەر دەوام دەكا و ڕاگرتنی نیە، سەیر ئەوەیە ئەم بەزمە لە ئێران پاش سەركەوتنی شۆڕشی ئیسلامی قەدەغە كرا. دیارە ئەمە لە هەوڵی دەوڵەت بۆ دڵڕاگرتنی سوننیەكان و خۆ بەبێگانە نەزانینیان لە ڕژێمەكە بەولاوە شتی تر نیە.

هەندێ ڕێبازی سۆفیگەری وەكو ڕەفاعیەكان (بڕوانە ڕێبازە سۆفیەكان) یان سۆفی شێوە، جۆرە داب و ڕەسمیكی سیحرامێز ئەنجام دەدەن. ئەوان لەگەڵ لێدانی تەپڵ و خوێندنی دوعا و هاوار بردن بۆ هەندێ ناو و كردنی سەمایەكی تایبەتییدا كە گشت پێكەوە حاڵەتێكی لە خۆچوونی ئەوتۆ پەیدا دەكەن كە لەشی ئەو كەسە بێ هەست كردن بە ئازار، دەتوانرێ بریندار بكرێ یان ئەشكەنجە بدرێ، و بێ ئەوەش هیچ ئاكامێكی هەبێ دوای تەواوبوونی پرۆسەكە و هاتنەوە سەرخۆی كەسەكە. لەو لەسەر خۆچوونانەدا، شیر و زەرگ لە لێو و زمان و گوپ و ئەم لاو ئەولای لەش دەدرێن و هەروەها بەسەر ژیلەمۆی گەشدا دەڕۆن و ئاگریش قووت دەدرێ.

هەر لەو كۆڕانەدا، چاككردنەوەی نەخۆشیش، دەبێ بە یەكێك لە بابەتەكان، بەڵام شتەكە بە ئەندازەی ئەوانەی لە كەنشتەكانی ئەمریكادا دەكرێن بە هێز و كاریگەرنیە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: R. Solecki, *Shanidar: The First Flower People* (New York: Alfred Knopf, 1971); Patty Jo Watson, *Archaeological Ethnography in Western Iran* (Tucson: University of Arizona Press, 1979); Margaret Kahn, *The Children of the Jinn* (New York: Seaview, 1980); Dana Adams Schmidt, *Journey Among the Brave Men* (Boston: Little, Brown, 1964); A.M. Hamilton, *Road Through Kurdistan* (London: Faber and Faber, 1937); W.R. Hay, *Two Years in Kurdistan* (London: Sidgwick and Jackson, 1921), William O. Douglas, *Strange Lands and Friendly People* (New York, 1951); Roderic Hill, *The Baghdad Air Mail* (London: Edward Arnold, 1929); E.B. Soane, *To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise* (London: Johny Murray, 1912); Sally Binford, "A Structural Comparison of Disposal of the Dead in the Mousterian and Upper Paleolithic," *Southwestern Journal of Anthropology* XXIV-2 (1968); Marcel Bazin and Christian Bromberger, et al., *Gilân et Âzerbâyjân Oriental: Cartes et Documents Ethnographic* (Paris: Éditions Recherche sur les civilisations, 1982); J.C.A. Johnson, "The Kurds of Iraq," *Geographical Magazine* 11 (1940); Mark Sykes, *The Caliph's Last Heritage* (New York: Arno Press, 1973, reprint of the 1915 London edition); Henry Rawlinson, *Journey from Zohab to Khuzistan* (London, 1836); Major Frederick Millingen, *Wild Life Among the Koords* (London, 1870).

# فۆلکلۆر و چیرۆکە فۆلکلۆریەکان

دەکرێ زۆربەی زۆری چیرۆکە فۆلکلۆریە کوردیەکان پێکرا بخرێنە خانەی "چیرۆکی بەر ئاگردانی کوردی"یەوە. هەموو ئەم چیرۆکانە لەو زستانە درێژ و سارد و، گەر مرۆڤ زۆر وریا نەبێ، مەترسیبارەکانی کوردستاندا، دەوترێن، ئەم چیرۆکانە پڕن لە پەند و ئەندەرز لە بارەی چۆنیەتی خۆلادان لە خەتەری دنیا و خۆڕاگرتن لە بەرامبەریاندا، ئەویش بە وردبوونە لە ڕەفتاری کەسەکانی ناو چیرۆکەکاندا، چیرۆکەکان تا بڵێی ساکارن، بەڵام سەرنجکێش و خۆشن، سەرەنجامەکانیان بە شارەزایی و زیرەکانە لە کۆتایی چیرۆکەکاندا شاراونەتەوە و دۆزینەوە و هەڵێنانیان بۆ بیستەران هێڵراوەتەوە.

چیرۆکی منداڵان لە ڕووداوە سروشتیەکان دوور ناکەونەوە. ورچ، کە هێشتا بە زۆری لە جەنگەڵستانەکانی کوردستاندا هەن، ڕۆڵی زۆربەی ئەو زیندەوارانە دەبینێ کە لە ئەدەبیاتی منداڵانی هەموو جیهاندا دەردەکەون، لە چیرۆکی گەورەکاندا ورچ، ڕێوی، سمۆرە تەنانەت دار و دەرخشیش هەموو وەکو ئادەمیزاد خاوەن بیر و هۆشن، هەمووشیان ژیانی ئاسایی بەسەردەبەن و خاوەن ڕەسەم و ئادەتی مرۆڤ ئاسان، لەم چیرۆکانەدا هەر پیاوێك، یان ژنێکی بە دیمەن و جوان، لەوانەیە لەلایەن ورچێکەوە بە مەبەستی کردن بە هاوسەر، بڕفێنرێ. ورچەکە بە وردی ئاگاداری ئەو کەسە دەکا، خواردنی بۆ دابین دەکا، و هەموو پێداویستییەکانی بە چاکی و زیرەکی جێبەجێ دەکا، یەك شتی لێدەرچێ ئەویش ئەوەیە هەرگیز بەرەڵای ناکا. هەموو ئەم چیرۆکانە بە کوشتنی ورچەکە کۆتایی دێت، سەرەڕای هەموو ئەو زیرەکی و دڵچاکی و خۆشەویستی و "مرۆڤایەتی"یەی لەگەڵ فڕێنراوەکەدا دەینوێنێ هەمیشە سەرەنجامیش بە ئازادکردنی ئەو کەسە کۆتایی دێ. ئەم زیندەوەرانە لە چیرۆکەکاندا وا نیشان دەدرێن، کە توانای فێربوونی زمانی ئادەمیزادیان بە باشی هەیە، بەوە دەتوانن لە زیرەکترین مرۆڤ بەرنەوە و لە بەکارهێنانی داب و نەریتی مرۆڤدا زیرەکانە سەردەرکەون.

بۆ نموونە لە یەكێك لە چیرۆكەكاندا، ورچێك، خۆی لەژێر كۆمەڵێك خوریدا دەشارێتەوە تا خۆی لە میوانێكی نەناسی ناوەخش ڕزگاركا. خوریەكە هەر ئەو خوریەیە كە هەر ساتێك لەوەبەر لە مەڕەكانی خۆی هەڵیقاچیوە. ورچەكە بە ژنەكەی دەڵێ كە بە كابرای نەناس ڕاگەیەنێ كە جێگەی داكردنیان نیە بۆی چونكە مێردەكەی لە ماڵ نیە. دوایی دەردەكەوێ كە كابرای نەناس خدری زیندەیە كە هەمیشە بە بەرگێكی جیاوازەوە لە گەڕاندایە، خدری لە گشت شت ئاگادار دەڵێ ڕاستە خاوەن ماڵ لە ماڵ نیە، چونكە ئەوەی لەژێر خوریەكەدا خۆی شاردۆتەوە ئادەمیزاد نیە...

خوریەكە یەكسەر بە لەشی كابرای میوان نەپەزێرەوە دەنووسێ ئینجا لە زمان دەكەوێ و دەبێتەوە ورچەكەی جاران. ئەو ئەندەرزەی لەم چیرۆكە وەردەگیرێ ئەوەیە، ورچەكە هەر وەكو زیندەوەرێكی بەڕێز دەمێننەوە، كە لەبەر ئەوەی جارێك لەجاران بوە بە مرۆڤ، زمانی مرۆڤ هەر دەزانێ، بەلام ناتوانێ پێی بدوێ.

دەتوانرێ چیرۆكە ئایین سروشتەكانیش بخرێنە سەر چیرۆكە میللییەكان، كورد لەم بوارەدا زۆر دەوڵەمەندن، زۆربەی ئەم چیرۆكانە، پەیوەندییەكیان بە خدرەوە هەیە، خدر كە ناوەكەی واتە "سەوزایی" یان "ڕێبوار" و خۆی كەسایەتیەكە لە هەموو شوێن و لە هەموو كاتێكدا هەیە، زۆرتر ڕموودەی دەشش و دەر و سەوزاییە. وەكو یەكێك لەبەر جەستەكەرە سەرەكیەكانی ڕووحی گەردوونی، خدر لە گشت شت ئاگادارە و خاوەنی هێزێكی بێ سنوور و بێ هاوشای لە ئاسا بە دەرە بە تایبەتی بەسەر هێزە سروشتیەكان و مەملەكەتی سەوزایی و زیندەوەردا هەروەها بە هانای هەر كەسێكەوە دێ كە لە كردەوەیەكی پاك و مرۆڤانەدا گیری خواردبێ، (بروانە ئاهەنگ و سەیران و ساڵنامە). یەكێك مرازی سەردانی خدربێ لێی، دەبێ (٤٠) ڕۆژ لەوەبەر خۆی ئامادەكا، وەكو یەكێك بۆ پێشوازی كردن لە میوانێكی گەورە ئامادە كاری بكا. دەبێ هەموو ماڵەكە، بە باغچە و بەرەیوان و دالان و بەردەرگای ماڵیشەوە پاك بكرێتەوە و هەموو ڕۆژێك خواردن و كەرەستەی تام و بۆن خۆشكەر ئامادە بكرێ، ئەگەر ئایینەكە بە ڕێكوپێكی و بەگوێرەی دڵی بەجێ بگەیەنرێ، ئەوا خدر لە كۆتایی (٤٠) ڕۆژەكەدا لە ناكاودا بە خۆگۆڕیوی پەیدا دەبێ، ئینجا مەسەلەكە لەسەر ئەو كەسە دەوستێ، كە خدر بناسێتەوە و داوای مرازی لێ بكا، بەلام هەموان دەزانن كە خدر زۆر وریایە (نیشانەی هاتنی

ئەوەیە کە خاوەن مرازی بەسزمان خەوێکی گران سواری ملی دەبێ). هەروەها لە خۆ گۆڕیندا زۆر وەستایە و مەگەر بە دەگمەن ئەگینا ناناسرێتەوە، تا کاتێ مرازدار وریا دەبێتەوە و دەیناسێ، ئەو دەبێ بە چۆڕێ ئاو قووت دەدرێ.

شاه خوشێن، کەسایەتیەکی دیکەیە کە کۆمەڵێکی زۆر چیرۆکی فۆلکلۆری بۆ ڕێکخراوە ئەمیش یەکێکە لەبەر جەستەکەرە سەرەکیەکانی ڕووح، ئەو چیرۆکەی لەسەر زمانان لە بارەی لە دایکبوونیەوە دەگەڕێ زۆرتر لەبەر ئەوە گرنگە، چونکە بە جۆرێکی دروست تیشك دەخاتە سەر هەندێ چیرۆکی کەم بایەختری هاوشێوە لە بارەی دروستبوونی ئادەمیزادەوە لە میثرادا (خواوەندی خۆر).

هەندێ دەقی کۆن لەم بارەیەوە تا ئێستا ماون و باسی ئەم بابەتە دەکەن لە ئایینی گنۆستیدا، کە یەکێك بوە لەو ئایینە کۆنانەی لە سەرزەمینەکەدا پەیڕەوکەری هەبوە. سیمبولە ئایینیە بە هێزەکانی ئەم چیرۆکە شایستەی سرنج و ورد کردنەوەیە.

لە چیرۆکەکەدا، مامە جەلالە لە کاتی کڕنووش بردنی بەرەبەیاندا بۆ ڕۆژ لەگەڵ دەرکەوتنی لە ئاسۆوە، گوناهێکی لێ دەقەومێ، واتە باوێشکێك دەدا، لە ئاکامدا تاڵە تیشکێکی خۆر دەچێتە ناو هەناویەوە، لەو تاڵە تیشکە شاخوشین دروست دەبێ، کە نیشانەی بارداری لێ دەرکەوێ باوکی فەرمان دەدا بە شەش براکەی (بەوە، بە خۆیەوە حەوتەوانە پیرۆزەکە پێکدێ) کە بۆ سڕینەوەی ئەو شورەییەی هێناویەتە سەر خێزانەکە، بیکوژن، بەڵام، هەر کە براکان شیرەکانی دەستیان دادێننەوە، دەستیان دەبێ بە بەرد، لە ناکاودا، لەناو هەناویەوە دەنگێك بڵند دەبێتەوە... دەنگەکە دەڵێ "من "بابا"یەکی تازە و بەرجەستەکەرێکی ڕووحم".

بارداریەکە (٢١)ڕۆژ دەکێشێ (واتە سەرەنجامی لێکدانی هەردوو ژمارەی ٣ و ٧) بڕوانە تیرەی فریشتەکان).

کە دایکی دێتە سەر ژان و منداڵ بوون، خوشی لە شێوەی نواڵە تیشکێکدا لە دەمی دایکیەوە دەردێ... نواڵە تیشکەکە لەو تەشتە زێڕینەدا جێگر دەبێ کە بۆ گرتنەوەی منداڵەکە دادەنرێ، دوایی دەبێ بە منداڵێکی زمان تەواو پڕاو، ئەوەندەی پێ ناچێ هەواڵێك بڵاو دەبێتەوە کەوا لەشکرێکی گران بۆ وێرانکردنی وڵاتەکە بەڕێوەیە... خەڵکەکە دەکەونە خۆ بۆ ڕاکردن، بەڵام تا سەد کەس کە لە تەشتەکە دەنوون بۆ هەڵگرتنی و بردنی، بۆیان لە زەوی

بڵند ناكرێ. بیر لەوە دەكەنەوە منداڵەكە لەژێر تەشتەكەدا بشارنەوە، بەڵام هەرچەند دەكەن ناتوانن بیبزوێنن، دوایی بۆیان دەردەكەوێ كە ئەمە وێ دەچێ بە گرانایی زەمین، یان هەر خودی زەمین بێ، لێرەدا مامە جەلال دێتە زمان و پێیان دەڵێ، تەنها ڕێگا بۆ هەڵگرتنی ئەوەیە گایەك بێنن و منداڵەكەی بە تەشتە زێڕینەكەوە بخەنە سەر.. كە گاكە دێنن ئیشەكە بە ئاسانی ئەنجام دەدرێ و كاروانەكە دەكەوێتە ڕێ. خۆشین لە (٣٢) ساڵییدا دەبێ بە بەرجەستەكەری ڕووح و لە (٦١) ساڵییدا لەژێر شەپۆلی ڕووباری گاماسیابدا ون دەبێ و تا ئەبەد لەوێ جێگیر دەبێ.

بۆ ئەو كەسەی لە داب و ڕەسمی میترایی (میهر پەرستی) كۆن ئاگادار بێ، گشت پێكهاتەكانی سیمبولزم لەم چیرۆكەدا بەدی دەكا، لەوانە: زكپڕ بوون بە تاڵەتیشكی خۆر، گا، تەشتی زێڕین...

ئەم جۆرە چیرۆكانە بەشێكن لە پارچە هەرە بە نرخەكانی ئەو جۆرە ئەدەبەی كە دەكرێ ببن بە چراو تاریكترین قۆناغی مێژوو كەلتووری كورد ڕوون بكەنەوە. ئەو چیرۆكە میللییەش كە لە بارەی لە دایكبوونی خۆشینەوە لە دایكێكی پیا و نەدیتوو دەگێڕێتەوە دەشێ زكپڕبوونی پاكیزە و بێ خەوشی بەرجەستەكەرە پیرۆزەكانی تری تیرەی فریشتەكان، كە هەندێكیان بێ بوونی دایك یان باوك باردار دەبوون، لەبەر ڕووداوەكانی ئەم جۆرە چیرۆكانە ڕوونتر ببینەوە. لە هەمان كاتدا، پیاو دەتوانێ داوی پەیوەندی لەنێوان ئەفسانەی شاخۆشین و هەندێ ئایینی تریشدا بەدی بكا. مژدەپێدانی لە تەمەنی (٣٢) ساڵییدا یەكساڵ لەو تەمەنەی مەسیح كەمترە كە مەزەندە دەكرێ تێیدا بۆ چوارمێخ كێشران برابێ، هەروەها نقوم بوون و ونبوونی لە قوڵایی ئاو لە تەمەنی (٦١) ساڵییدا یەكساڵ لەو تەمەنە كەمترە كە حەزرەتی محەممەدی تێدا مرد.

لە لایەكی ترەوە، گەلێ چیرۆكی میللی لە وڵاتەكەدا باون كە پەیوەندییان بە مێژووی پەیدابوونی گەلی كورد خۆیەوە هەیە.

تا ئێستا هەندێ لەو چیرۆكانە بەهی نووسەرەكانی سەدە ناوەندیەكان دادەنرێن، لە هەموویان هەرە باوتر، بێ سەرسووڕمان، ئەوەیە كە كورد دەباتەوە سەر پادتا ئەژی دەهاك (بڕوانە تیرەی فریشتەكان) چیرۆكەكە بەو شێوەیەی لە شانامەدا هاتووە، دەڵێ كوردەكان

نەوەی ئەو لاوانەن کە بەدزییەوە لەلایەن دوو پیاوی ئەژی دەهاکەوە ئازاد دەکران، کە ئازاد دەکران بزن و مەڕیشیان دەدرایە تا پێی بژین، هەر لەوەشەوە ژیانی کورد بە ژیانی پەزدارییەوە زۆر پەیوەستە، هەرچی کوردە جوولەکەکانە، پێ لەسەر ئەوە دادەگرن لە ڕووداوێکی ترەوە کەوتوونەتەوە، کە تێیدا سولەیمان پێغەمبەر دەوری هەبوە. چیرۆکەکە دەڵێ سولەیمان کە هەموو زیندەوەری دنیا، بە مرۆڤ و جنۆکەشەوە سەرسپردەی فەرمانی بوون، جنۆکەکانی ڕاسپارد کە جوانترین (١٠٠) ژنی سەر ڕووی زەمین کۆبکەنەوە و بیانخەنە حەرەمسەرایەوە، وا ڕێکەوت کە لەو ڕۆژەدا ئەوان، فەرمانەکەیان بەجێهێشت، سولەیمان مرد، بۆیە جنۆکەکان ژنەکانیان بۆ خۆیان برد و لە سەختترین جێگەی چیا بڵندەکان خۆیان قایم کرد. ئەوەی لەم ژن و ژنخوازیە سەیرە کەوتەوە، کوردان بوون کە بە ڕەفتاری لە خەڵك بەدەریان لە باپیرە جنۆکەکانیان و جوانیان لە داپیرە ئادەمیزادەکانیان دەچن. هەر لەمەوە، گەلێك لە نەتەوەکانی دراوسێ، بە تەوسەوە کورد بە نەوەی جنۆکە دادەنێن.

هەروەها، گەلێ مێژووناسی ئیسلامی باس. لە هەندێ بیروڕای باوی ناوی خەڵکان دەکەن کە کورد دەبەنەوە سەر عارەبان، ئەوەی جێ سرنج و سەیر پێ هاتنە ئەوەیە، کە ئەوان باسی دووکەس دەکەن "کورد" و "مەرد" ئەوەی دەیزانین مەردان بریتین لە کۆمەڵە خەڵکێکی بە بنەچە زۆر کۆنی ڕۆژاوای کوردستان (تاری ماردین لەناوی ئەوانەوە هاتووە). لەوانەیە بەستانی هەردوو ناوەکە پێکەوە، پشتەڵەکێکی یەکگرتن و تێکدا توانەوەوەی هەردوو ڕەگەزەکەی لە سەردەمانی هەرەزوودا پێوەبێ، هەندێ چیرۆکی تر دەڵێ کورد لەم سەرچاوانە هیچیان نین، بەڵکو نەوەی هۆزە سەرلێشێواو و نبووەکانی ئیسرائیلن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Abdul-Kader Amin (collected by), *Kurdish Proverbs* (New York: Kurdish Library, 1989); M. Mokri, *L'Arménie dans le Folklore kurde* (Paris: Librairie Klienksieck, 1964); D.N. MacKenzie, *Kurdish Dialect Studies*, vol. II, *Texts and Folk Stories* (London: Oxford University Press, 1962); Major E. Noel, "The Character of the Kurds as Illustrated by Their Proverbs and Popular Sayings," *Bulletin of the School of Oriental Studies* I-iv (London, 1917-20); Basile Nikitine, "Kurdish Stories from My Collection," *Bulletin of the School of Oriental and African Studies* IV (1926-28).

# میهرەجانەكان، ئاهەنگەكان و ساڵنامە

ساڵی كوردی هەتاویە، واتا (٣٦٥)ڕۆژیە، چەند سەعاتەكەی كە دەمێننەوە، دەكرێ بە ساڵی (پڕ) و هەر چوارساڵ جارێك بە ٣٦٦ ڕۆژی دێتەوە. ساڵی كوردی لە یەكەم ڕۆژی بەهار (٢٠ یان ٢١ی مارت بە گوێرەی ساڵنامەی گریگوری)دادەست پێدەكا، و بەشێوەیەكی ڕاست و ورد لەلایەن حیسابگر و ئەستێرە ناسی دێرینی فارسی عومەری خەیامەوە دانراوە. لە ڕۆژاوادا عومەری خەیام زیاتر بە چوارینە شیعریەكانیەوە ناسراوە وەكو ئەستێرەناس و حیسابگری. ناوی مانگەكان و ساڵی سەرەتاكەی لێدەرچێ، ساڵینامەی كوردی لەگەڵ هی گەلانی فارس و ئێرانی نەژادەكانی تردا جیاوازییەكی نیە.

لەم ساڵنامەیەدا، شەش مانگی یەكەم كە بەهار و هاوین دەگرنەوە، هەر یەكە (٣١) ڕۆژن و ئەوانی پایز و زستان هەر یەكە(٣٠)ڕۆژن، ئەوەی لەمە بەدەرە تەنها دوا مانگی زستانە كە لە ساڵە كەبیسەكاندا (٣٠) و لە ساڵەكانی تردا (٢٩) ڕۆژە.

مانگەكان لەگەڵ (١٢) نیشانە بورجیەكاندا یەكن واتە مانگی یەكەم هاوكاتە لەگەڵ بورجی (كاوڕ)، دووەم لەگەڵ (گا) و سێیەم لەگەڵ (دوانە)، هتد، ناوی مانگە كوردیەكان بەم جۆرەن: خاكەلێوە، بانەمەڕ، جۆزەردان، پووشپەڕ، گەلاوێژ، خەرمانان، ڕەزبەر، خەزەلوەر، سەرماوەز، بەفرانبار، ڕێبەندان، ڕەشەمە. ساڵنامەكە بەو ساڵە دەست پێدەكا كە تێیدا دوا پادشایەتی كوردی سەردەمی كۆن ڕووخاوە، واتە بنەماڵەی پادشایەتی، كەیانیان (یان بنەماڵەی كاوسەكان)، كە دەكا ساڵی (٣٨٠)ی پاش میلاد (بڕوانە مێژووی كۆن). حەوت ساڵ دەخرێتە سەر ئەم ساڵە، كە لەوانەیە پەیوەندی لەگەڵ پیرۆزڕاگرتنی ژمارەی حەوتەوە هەبێ لەناو كورداندا لە ڕووی ئایینییەوە بە گوێرەی ئەو بۆچوونە زیندووبوونەوەی گیانی سەركردە كۆچكردوەكان حەوت ساڵی دەوێ (بڕوانە تیرەی فریشتەكان).

ئێمە ئێستاکە (ساڵی ١٩٩٢ی پاش میلاد) لە ساڵی (١٦٠٥)ی کوردییداین[16]، ئەم ساڵنامەیە بە کوردی یان مایی (میدی) ناسراوە، ساڵنامەیەکی تر کە لەناو کورداندا باوە، ساڵنامەی کۆچییە، کە لەناو هەموو مسوڵمانانندا دەچێ، و پەیوەندی لەگەڵ کۆچکردنی موحەممەد پێغەمبەر لە (١٦ تەمووزی ٦٢٢ی پاش میلادن) لە مەککەوە بۆ مەدینە هەیە و ئێستا (١٩٩٢) لە ساڵی ١٣٧١ی کۆچیداین.

دەبێ ئەوە بزانین ئەم ساڵنامەیە نەتەوەیی یە بە بەتوندی لەلایەن نەتەوە پەروەرە کوردەکانەوە پشتگیری لێدەکرێ، هەرچی کاروبارە ئایینیەکانە لەسەر ساڵنامەی مانگی دەڕۆن کە لەلایەن گشت مسوڵمانانەوە پەیڕەوی لێدەکرێ، ئەوی ڕاست بێ، کوردان کەمتر دەرفەتی ئەوەیان هەیە ساڵنامەکەی خۆیان بەکاربێنن چونکە ئەمە بەندە بە ساڵنامە و سیاسەتی ئەو دەوڵەتانەوە کوردانی تێدا دەژین، لەمە ئێران تا ڕادەیەك بەدەرە.

لە عێراق و سوریا، ساڵنامەی گریگۆریی ڕۆژاوا بۆ هەموو کاروبارە دەوڵەتییەکان بەکاردەهێنرێ. ناوی مانگەکانی لێدەرچێ کە لەسەر ناو نامەی ئارامیی کۆن دانراوە لە تورکیا و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتی بەرێ، ساڵنامەی گرێگۆریی بێ هیچ گۆڕانێك لە کاردایە.

لە ئێران، دەوڵەت ساڵنامەی زەردەشتی، کە ناوی مانگەکانی لێدەرچێ، لە هەموو شتێکدا لەگەڵ شێوەی دانانی ساڵنامەی کوردییدا دەگونجێ، بەکاردێنێ. ساڵی ١٩٩٢ میلادی لە ساڵنامەی دەوڵەتی ئێراندا دەکا (١٣٧١)ی کۆچی، لە هی کوردییشدا هەروا دەکا.

بەم جیاوازیانەی ساڵنامەکان لە کاروباری ڕەسمییدا، دیارە بابایەکی کورد بە ئاسانی لە حیساب کردن و گرنگیی میهرەجان و بۆنە نەتەوەییەکانیدا تووشی سەریەشە و سەرلێشێوان دەبێ.

جەژنی هەرە گرنگی گشت کوردان جەژنی دێرینی ساڵی نوێ یان نەورۆزە (لە کوردستانی باکوور نەوروز، لە کوردستانی ڕۆژاوا نیرۆز، لە باشوور نۆروون) کە لە (٢١)ی مارتدا دادێ، ئەم جەژنە، لەوانەیە هەفتەیەکیان زیاتر، بە ئاهەنگگێڕانی بەردەوام بەرێوە بچێ.

خواردنی جیاجیا و بە تام بەر لە داهاتنی جەژن ئامادە دەکرێ و بۆ ڕۆژی جەژن دادەنرێ. گوڵی تایبەتی نەورۆزی (کە بریتین لە نێرگز و گوڵاڵە و بنەوشە) بۆ ئەو ڕۆژە دەسك دەسك

---

[16] ساڵی ١٩٩٢ی پاش میلاد ئەکاتە ساڵی (٢٦٩٢)ی کوردی (وەرگێڕ).

دەچنرێ، هەروەها لقە داری سپی چنار و هەرمێی تازە گولکردوو بۆ بۆنەکە دەبڕرێ و بۆ ڕازاندنەوە چەپك دەدرێن، خەلکی هەموو بە جلوبەرگی نەتەوەیی ئالا و والا خۆ دەرازێننەوە، هەندێ کەس کاسە و گۆزەی کۆنیش بە نیشانەی چوونی کۆن و هاتنی تازە و بەختی چاك ورد و خاش دەکەن، دراوسێ و خەلك و خوا سەردانی یەکدی دەکەن بۆ گەردن ئازایی و ئاشتبوونەوە ئەگەر تالیەك لە ئارادا بوو بێ، گەورە دیاری و جەژنانە بە بچووکان دەدەن، سەر لە سەرگەورە و پیاو ماقولان دەدرێ و هەندێ جار دیاری و سەوغاتیشیان بۆ دەبرێ.

لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەلات و ناوەند، چەند ڕۆژ بەر لە داهاتنی نەورۆز ئاهەنگی شەوانەی خۆش دەگێڕرێ. لە بازاڕ و شەقامەکان و لەسەربانان ئاگر دەکرێتەوە تا ڕابووردنی زستانی تاریك و سارد جاڕ بدرێ و مژدەی داهاتنی بەهاری خۆش و ڕۆشن بلاوبێتەوە، شاپلێتە و فیشەکە شێتە دڕ بە تاریکی شەوان دەدەن و گیانەوەری خراپە خواز دەردەپەڕێنن، تەنانەت مردوەکانیش بەم ئاهەنگگێڕانە وشیار دەبنەوە و خەلك لەو باوەڕەدان دێنەوە سەردانی کەسوکاریان و بەشداری ئەم خۆشیەیان دەکەن.

لە کوردستانی ڕۆژاوا و باکوور، ئەم جەژنە بە ناوی "تولدان"ەوە دەگێڕرێ (لەوانەیە ئەم وشەیە لە توول هەلدانەوە هاتبێ، کە بە مانای (وەراندنی گوناه) دێت)، بەگوێرەی داب و نەریتی دانیشتوان، دوو چرا تا سبەی بەیانی، بە درێژەی شەوان دەبێ بە ڕۆشنی بمێننەوە، لەم بەشانەی کوردستاندا، خەلك وا باوەڕدەکەن کە خدر ئەلیاس یان خدر پێغەمبەر (کە پێغەمبەر ئیلیاشی پێ دەوترێ) هەموو ئەو مالانە دەگەڕی کە بەشەو چرایان داگیرساندوە و دیاری و خۆشی و بەرەکەت بۆ دانیشتوانی مالەکان لەگەل خۆیدا دێنێ. باسی چڕوپڕ تر لە بارەی ئەم جەژنگێڕانانەوە لە باسی "ئایینداا" بە درێژی هاتووە.

لە دامەزراندنی کۆماری تورکیا و لادانی سالنامەی یۆلیوسی و کارکردن بە سالنامەی گریگۆرییەوە ئاهەنگی تولدان لەناو کورداندا لە (٩)ی مارتەوە بۆ (١٤)ی فەبرایر (شوبات) پێشخراوە. لە شوێنە دووردەستەکاندا زووتریش دەکرێ، بەلام کۆمەلگا کوردە دابڕاوەکانی دەوروبەری چیاکانی ئەلبورز (کە نزیکەی ٤٠٠ سال لەمەوبەر لە ئەنەدۆلەوە هاتوونەتە ئەوێ) جەژنی تولدان لە (٣١)ی ئۆگست (ئاب)دا دەگێڕن.

لە هەندێ جەژنی تردا کە هەر بەشێکن لە تولدان، چرا دادەگیرسێنرێ و خەڵك چرا بەدەست بە شەقامەکاندا دەگەڕێنن و ئاهەنگی سەرکەوتنی سەرکردەیەکی نەناسرا و بەسەر دوژمنانی خۆی و گەل و وڵاتدا چی دەکەن، هەندێ ڕووناکبیری ئەم سەردەمەی کورد جۆرە بیرو ڕایەك دەدەن بەبادا کە بە باشی ناچێتە ئەقڵەوە، ئەوان دەڵێن لەوانەیە تولدان جەژنی سەرکەوتنی فەرەیدوونی پاڵەوانی داستانیی ئاریایی یان بێ بەسەر دەهاکی ئەهریمەندا، بەو شێوەیەی لە ئاوێستای کتێبی پیرۆزی زەردەشتیاندا هاتووە. زۆر سەیرە ! ئەم سەرچاوانە ئەو ڕاستیەیان لە بیرچۆتەوە کە هەر لە چیرۆکە داستانیە خۆماڵیەکانی خۆیاندا، دەهاك پاڵەوانێکی کوردە، لە کاتێکدا فەرەیدوون دوژمن و پیا و خراپە، هێشتا لەمەش هەڵەتر، بیرو ڕایەکە ئیحسان نووری پاشای مێژووناس و سەرکردەی سەربازیی کورد تێی کەوتوە، لەم بۆچوونەیدا، کە هیچ پاڵپشت و لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەوە دەرناخا، نووری پاتا دەڵێ ئەم بۆنەیە بۆ ئاهەنگگێڕان و خۆشی دەربرینە لەسەر سەرکەوتنی سیاراکسیسی مەزنی پادشای ماد بەسەر مادیسی سیثیدا کە هەم وڵاتەکەی داگیر کردبوو و هەم تەختی پادشایەتی (لە دەورووبەری ٦٢٥ی پێش میلاددا).

نەورۆز لەناو گەورە هۆزی وەکو شکاك، بەگزادە و جەلالییدا ئەوەندە باو و پیرۆز نیە، ئەوان لەجیاتی نەورۆز بایەخی زۆر و پلەی بەرزی پیرۆزی دەدەن بە جەژنە ئایینیە ئیسلامیەکانی چون ڕەمەزان (فطر) کە لە کۆتایی مانگی ڕۆژووگرتنی ڕەمەزاندا دادێ و جەژنی ئیبراهیم (أضحى یان قوربان) کە لە کۆتایی سەفەرکردنی حاجیانی مسوڵمان بۆ مەکە دادێ. گەلێ جەژنی تر هەن کە کوردان ئاهەنگ و شاییان تێدا دەگێڕن، وەکو هینەکانی سوننیەکان، شیعەکان، هەروەها یەزیدی و یارستانی و عەلەوییەکان، جەژن و بۆنەگیری وەکو هی خدر ئەلیاس (یان خدر پێغەمبەر) کە یەکێکە لە جەژنی تولدان کە ئەویش وەکو نەورۆز بۆنەیەکی ئیسلامی نیە، لەلایەن کوردە مسوڵمانەکانەوە بە ڕێز ڕادەگیرێ و دەکرێ بە جەژن لەمەدا، شکاك و بەگزادەکان و جەلالیەکانیش بەشداری دەکەن، هەرچەندە ئەوان بایەخێکی ئەوتۆ بە نەورۆز نادەن، وەکو باسمان کرد.

جگە لە جەژنی سەرانسەرگیری نەورۆز، و تا ڕادەیەکی کەمتر تولدانیش، جەژنەکانی پێش ئیسلام لەناو تیرەی فریشتەکاندا لە جەژنە ئیسلامیەکان پیرۆزتر ڕادەگیرێن. بۆ نموونە، لە

چوار جەژنە ئایینیەكانی یەزیدیەكاندا دوانیان پەیوەندییان بە نەورۆزەوە هەیە و بەشێكن لەو، هەرچەندە نەختێك لە كاتی گێڕانیاندا جیاوازی لە ئارادایە.

نەورۆز وەكو جەژنێكی گەورەی ئارياییان ڕێزی لێ دەگیرێ، (یەزیدییەكان لەجیاتی ٢١/مارت لە ناوەڕاستی نیساندا دەیگێڕن)، یەزیدیەكان، جەژنی تیرەگانیش، لە (٣٠) شەمووزدا دەگێڕن لەجیاتی (٥)ی تەمووز، مەسینا (Massina) بەڵگەبەندییەكی باشی بۆ داب و ڕەسمی گێڕانی جەژنی تیرەكانی لەناو كوردەكانی ئەدیابین لە سەدەی سێیەمی پاش میلاددا چێ كردوە (Massina 1938).

لە دوو جەژنەكانی تری یەزیدیاندا، جەژنی "جەمی مەزن" كە دەكەوێتە نێوان (٦–١٣)ی ئۆكتۆبەر (تشرینی یەكەم)ەوە لە هەردوان گرنگترە. چوارەم ئاهەنگگێڕان كە بۆ لە دایكبوونی یەزید دەگێڕرێ، دەكەوێتە دەورووبەری لە دایكبوون یان پەیدابوونی میثراسەوە لە (٢٥)ی دێسەمبەر (كانوونی یەكەم)دا پێوەندی نێوان ئەم دوو جەژنە و تیرەی دێرینی میثرایی لە بابەتی (یەزیدیەتی)دا باس كراوە.

بۆ خۆ پاراستن لە نەیاران و لەو دەمانەدا كە ناچار نەبووبن بە دزییەوە بیانگێڕن، كوردە نامسوڵمانەكان زۆر جار بۆ پاراستنی خەڵكەكە لە زیان و تا ڕەنگێكی ئیسلامی بدەن بە جەژنگێڕانە ئایینیەكانی خۆیان ناچار بەرگێكی نیوە مسوڵمانانەیان داوە بە سەریاندا، هاوشێوە كردنی (ئایینی جەم) لەلایەن دیمیلیە عەلەویەكانەوە لەگەڵ جەژنی قوربانی حەزرەتی ئیبراهیمدا و هەروەها دانانی عەلی (ئیمامی یەكەمی شیعەكان) بە ڕابەری ئایینی خۆیان لەلایەن یارسانی و عەلەویەكانەوە و كردنی بە سەرچاوەی زۆربەی جەژنەكانیان بەشێكە لەم تەگبیرە خۆ پارێزانەیە.

لە ئێران، كە گەلێ پێكهاتەی ئێرانی نەژادی تری وەكو كوردان خۆیانی تێدا دەژین، زۆربەی جەژنەكانی كوردان لەگەڵ جەژنە دەوڵەتی و نیشتمانیەكان هاوشێوەن، بەم جۆرە گێڕانیان لەناو كورداندا، ناچێتە قاڵبێكی سیاسی جیاوازەوە و نابێتە مایەی لێككەوتن. لەم ڕووەوە، هەر چی عێراقە، نەورۆز كراوە بە جەژنێكی ڕەسمی وڵات.

لە سوریا، كە (حافز ئەسەد)ی عەرەبی عەلەوی سەركۆماریەتی، جەژنی نەورۆزی كوردی شتێكی نەناس نیە، هەرچەندە نەكراوە بە جەژنێكی ڕەسمی. عەرەبە عەلەویەكانیش بەهەمان

شێوەی کوردەکان لە نەورۆزدا ئاهەنگ دەگێڕن، هەرچەندە دەوترێ لە ڕابردوودا کوردەکان لەسەر گێڕانی ئاهەنگی نەورۆز تووشی گیروگرفت بوونە.

لە یەکیەتی سۆڤیەت، هەموو جەژن و ئاهەنگە ناو خۆیی یە ناکۆمونیستیەکان، لەبەر خاتری جەژنە مێژووییە کۆمونیستیەکانی دەوڵەت قەدەغەکرا بوون، جگە لە کوردەکان نەورۆز لای هەموو گەلە مسوڵمانەکانی ئەوێ، هەر لە نەتەوەکانی دەورووبەری ڤۆلگا و پەشکیری و ئازەری و تورکمانەکانەوە بگرە تا دەگەیتە ئۆزبەك و تاجیك و کازاخەکانی ئاسیای ناوەند، پیرۆز و باوە. هەموو ئەم نەتەوانە بە قوولی کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کەلتووری ئێرانیەوە. بە هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت، ئیتر هیچ ئاستەنگ و کوسپێك لە بەردەم ئاهەنگگێڕان و جەژنە گرتنی ئاشکرا بەبۆنەی جەژنەکانەوە نەبۆ کورد نەبۆ کەسی تر باوەڕ ناکرێ بمێنێ.

لەم بوارەشدا، لە تورکیا دیسانەوە هەر کوردانن کە بۆنەکانیان لێ دەکرێ بە زەهرە مارگەلێ. جەژنی کوردی وەکو نەورۆز و تولدان، دەبن بە بەردەباز بۆ بەرپاکردنی هەڵا و بگرەی گەوردەی سیاسی دژ بە دەوڵەت، ئاهەنگگێڕانی چون نەورۆز و هی تر بە بە توندی لەلایەن دەوڵەتەوە نەك هەر قەدەغەکراون، بەڵکو ئەو خوێن گەرمانەی سەرپێچیان لە فەرمانەکانی دەوڵەت کردوە تەقەشیان لێکراوە، بە هەرحاڵ، لەم دواییانەدا حکوومەتی تورکیا ناچار دانی بە ڕێبازی عەلەوی و هەندێ لە جەژنەکانیاندا ناوە وەکو جەژنی حاجی بەکتاشی دانەری ڕێبازی بەکتاشی عەلەوی (بڕوانە مێژووی تازە). نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئەنقەرە هەندێ جار سەراسۆیی کردنی ئەم جەژنانەش دەگرێتە ئەستۆ و باوکایەتیشی بۆ دەکا، جەژنە کوردیەکانی تریش قەدەغە ناکرێن، بەڵام تا بکرێ ئاستەنگیان دەخرێتە بەر.

جێی لاکردنەوەیە کە لە نەورۆزی ساڵی ۱۹۹۱دا ڕادیۆی گشتیی ئەمەریکا پرسیاری لە دانیشتوانی دیاریەکر کرد کە خەریکی ئاهەنگگێڕان بوون. هیچ کەس تەنانەت لە پیرەکانیش لە بارەی مانای نەورۆزەوە، نەیتوانی وەڵامی دروستی بداتەوە، ئەوەی لێدەرچێ کە گشت دەیانزانی جەژنی ساڵی تازەیە بە گوێرەی حیسابی کوردی، کەچی وەکو دەردەکەوت کەس نەیدەزانی ئەم هەموو فۆلکۆر و داب و نەریتە میللیەی لە نەورۆز دایە چین، تەنانەت دانیشتوانی دیاریەکریش، کە بە پایتەختی کوردستانی تورکیا دادەنرێ. بێ گومان هەرچی

ئۆبالّ هەبێ لەم بارەیەوە دەكەوێتە ئەستۆی حكوومەتی توركیا كە سالّەهای سالّە ئەم گەلەی لە ناسینی كەلتووری میللی خۆی بێبەش كردوە، لەم بارەیەوە هەرچەندە سیاسەتی دەولّەتی سۆڤیەت لە بواری رێگەدان بە گەشانەوەی فولكلۆری میللی گەلانی خۆیدا توند بوو، بەلام نەیتوانی رەگوریشەی لە بن دەركا و ئەوانەی ئاهەنگگێران بە بۆنەی نەورۆزەوە بەشێك بوو لە كەلتووریان، پاش حەفتا سالّ حوكمی سۆڤیەت، لە سالّی ١٩٩١دا كەوتنەوە ئاهەنگگێران، ئەم حەفتا سالّی قەدەغەكردنە لە هی توركیا درێژترە لەسەر كوردەكانی باكوور و رۆژاوا، لەناو ئەو نەتەوانەدا كە جاران هاوولاتی سۆڤیەت بوون، كەم كەسی هەبوو نەزانێ مانا و بۆنەی نەورۆز چییە، نهێنی ئەم جیاوازیە لەوانەیە لەوەدابێ، كەوا نەورۆز هەرگیز لای دانیشتوانی باكوور و رۆژاوای كوردستان (واتە ئەو ناوچانەی كە دەكەونە باكوری كەرتی كەلتووریی باكوور– باشوورەوە– بروانە دابەشكاریە ناوخۆیی یەكان) شتێكی باو نەبوە وەكو ئەوەی لە بەشەكانی تری كوردستاندا هەیە.

گەلێ دابونەریتی تر كە لای كوردەكانی ئێران و عێراق زۆر باون، لای كوردەكانی قوولایی و دوور دەستی رۆژاوا و باكووری كوردستانی توركیا هەر ئاسەواریشیان نیە لەبەر ئەوەش كە ئەم بەشانەی گەلی كورد پێكەوە گەورەترین بەشی گشت كوردان پێكدێنن، مرۆڤ بە پێویستی دەزانێ پرسیارێك لە خۆی بكا، ئایا كام داب و نەریت لەناو كورداندا خۆ جێین و كامیان نەتەوەیین. بێ ئەوەی گوێ بدەینە بەربلاوی یان بەرتەسكی ئەو داب و نەریتانە، ئایا ناكرێ بلّێین تولدان كە لەناو كوردەكانی باكوور و رۆژاوادا، واتە لەناو زۆربەی گەلی كورددا باوە، لە نەورۆز زیاتر شایستەی دانانە بە جەژنی نەتەوەیی گەلی كورد؟ راستە نەورۆز زۆرتر دەنگی داوەتەوە، بەلام ئایا ئەوە هی ئەوە نیە كە هەوادارانی واتە كوردەكانی ئێران و عێراق لە ئاكامی راپەرینی میللی زۆرتردا، لەمان دەسترۆ تر و دەم سپیتر بوونە؟

كاریگەریی رابردووی نەورۆز لەسەر كوردانی باكوور و رۆژاوا بوو بێ یان نا، ئێستا ئەوان وا دیارە كردوویانە بە جەژنی خۆیان، چونكە بۆتە یەكخەرێكی سیاسی بۆ دەربڕینی ئاواتەكانیان.

بەم جۆرە، سالْ بەسالْ خەلْکێکی زۆرتر (هەندێ جاریش بە توندوتیژیەوە) بەشداری ئاهەنگگێڕان دەکەن نەك بەم بۆنەیەوە، بەلْکو بە گەلێ بۆنەی تریشەوە کە لە مێژەوە لە تورکیا قەدەغە کرابوون.

هەندێ ئاهەنگگێڕان کە سروشتێکی خێزانییان هەیە، لە ئاهەنگە نەتەوەییەکان بەربلاْوتر و گرنگتریشن، لێرەدا، شایی و پرسەکان زۆر بۆنەی گرنگن، شایی لەوانەیە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بکێشن ئەگەر خاوەنەکەیان دارا بێ، بەلاْم لای گوندنشینە دەسکورتەکان هەر ڕۆژێك دەبا، خێزانی بووك و زاوا، دیاری دەدەن بە یەك، پاش حەفتەیەك، بووك و زاوا پێکەوە سەردانی خزمە نزیکەکانی هەردوو لادەکەن، لەم سەردانەدا وەرگرتنی خەلاْت و دیاری و تەنانەت دراویش شتێکی باوە.

کە یەکێك دەمرێ دوای سێ ڕۆژ، هەفتەیەك، (٤٠) ڕۆژ، دوایی ساڵێك بەسەر مردنییدا بیرەوەری بۆ دەکرێن، پرسەی ژنان، لەناو هەندێ خێزاندا کە خۆ بە خاوەن جێ و ڕێ دەزانن دەبێ بەکارەساتێکی لە خۆدان، و سنگ کوتان و دەمو چاو ڕنینەوە، بە جۆرێك گەلْی ڕوومەت و ناو چەوان لە خوێندا سوور دەبێ، گەلێك سەریش لە قوڕ دەنێن و دیمەنێك پێکدێنن کە دلْی تەماشاکەر دەتوێنێتەوە، جاك دی مورگانی گەڕیدە و ئاسەوارناسی فەڕەنسی، باسی دیمەنی پرسەیەك دەکا، کە تێیدا سەری مردوەکە دەدرێتە بەر گەلاْکوتك یان تێلاْ "تا ئەو شەیتانانەی لێدەرکەون کە تێیدا گیراون"، ئەم کۆنە نەریتە کە جاران لەناو گەلانی تری دراوسێشدا باو بوو، ئێستا لە بەین چوە.

خەتەنەکردنی منداڵانی نێرینە بە ئاهەنگ گێڕانەوە ئەنجام دەدرێ، وەکو نەریتێك، لە کۆتایی هاوین و لە کاتی "کالْەك گەیین"دا، و ئەو دەمەی منداڵەکە دەبێتە (٥) ساڵە، دەکرێ. لە تاك و شەرای هەندێ ناوچە و بەشێوەیەکی زۆر سنووردار و لەناو پەیڕەوانی" تیرەی فریشتەکاندا" کچانیش سوننەت (میتکەبڕ) دەکرێن، بەلاْم هیچ جۆرە ئاهەنگێك بۆ ئەمە ناگێڕێ و ئەگەر بکرێ لەژێر دارێکی پیرۆزدا و زیاتر لە نزیك نزرگەیەکی حەزرەتی خدرەوە (بڕوانە تیرەی فریشتەکان) بەجێ دەگەیەنرێ، ئەم جۆرە خەتەنەکردنەی مێینە، زۆر بە نهێنی و بە ژمارەیەکی یەکجار کەم دەکرێ، و لەلایەن زۆربەی کوردانەوە بەکارێکی دزێو و ناشیرین دادەنرێ چونکە دەکرێ ببێتە مایەی "نەنگی"یەکی زۆر بۆ بکەری، بە گوێرەی زانیاریەکانی نەتەوە یەککگرتوەکان سوننەتکردنی ئافرەت لە (٢٦) ولاْتی ئەفریقا و تاك و تەرا لە ولاْتانی ڕۆژهەلاْتی ناوەڕاستیشدا دەکرێ و ئەمە بە گشتی (١٠٠) بلیۆن مێینەی لە هەموو جیهاندا بەر

دەكەوێ، لە بارەی جێگا و كاتی سەرهەڵدان و سەرچاوەی ئەم كارەوە هیچ بەڵگە و زانیاریـەك بە دەستەوە نیە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Mohammed Mokri, *Les rites magiques dans les fêtes du "Dernier Mercredi de l'Année" en Iran* (Teheran: Teheran University Press, 1963); Mohammed Mokri, "Le Mariage chez les Kurdes," *Revue de la Société d'Ethnographie* (Paris, 1962); Jacques de Morgan, *Relation sommaire d'un voyage en perse et dans le kurdistan* (Paris, 1895); P. G. Messina, "La celebrazione de Tiragan in Adiabene," *Proceedings of the International Congress of the Orientalists* (Rome, 1938).

# شایی و هەڵپەڕكێ

شایی دێرینەی كوردی بەشێكە لە شایی دەست لەناو دەستی بە كۆمەڵ كـە لـەناو گـەلانی دانیشتووی باڵقان تا لوبنان و قەفقاسیا و ئێراندا باوە، بەم جۆرە شاییە دەوترێ گۆڤەنـد یـان گۆوەند (یان گۆبەند— وەرگێڕ) و بۆ ڕۆژاواییەك كە زیاتر لەگەڵ (دەبكە)ی لوبنانییدا ئاشـنایە، دەكرێ بە دەبكە بشوبهێنرێ، شێوەی هەرە باوتری ئەوەیە كە بە ئەڵقەیەكی كـراوە دەكـرێ و شـاییكەرێك یـان دوان بـە تـەنهایی لـە ناوەڕاسـتی ئەڵقەكـەدا جـۆرە سـەمایەك دەكـەن... شاییكەرەكان لە شێوەی ئەڵقەی ڕەشبەڵەكدا، واتە ژنێك پیاوێكی لە دەستدا دەبێ، شاییەكە دەگێـڕن، زۆر جـار دەسمـاڵی ڕەنگـاو ڕەنگیـان لـە دەسـتدا دەبـێ و بـە دەم شـاییەوە ڕایدەوەشێنن.

سەرچۆپی كێش، دەسماڵ یان دەسەسر بە دەستەوە شاییەكە بەو ئەڵقەیەدا دەگێڕن كـە پێكهێنـراوە و بـە لەرانـدنی ڕێكوپێـك و لەنگانـدی لـەش، كـە زۆر جـار بـە تـاب و گەرمییـەكی ئەوتۆوە دەكرێ كە شاییكەرەكان دەخاتە جۆش و خرۆشێكی بێ سنوور.

شاییە بە كۆمەڵەكان دەكرێنە دوو جۆری جیاوازەوە، جۆری یەكەم، كـە لـە سـەرخۆ شـل شل و بە نەرم دەكرێ، شاییكەرەكان شان بەشان بە هەنگاوی ڕێكوپێكو و ترپەی لـە سـەرخۆ بەڵام زۆر ورد، كۆتر ئاسا بۆی دەڕۆن، هەندێ جـار ڕووكـار دەگـۆڕن و ڕوو دەكەنـە دواوە یـان پێشەوە، بەڵام هیچ كات، ئەو ئەڵقە ناسكە ناگۆڕن كە دروستیانكردوە، لـە شـاییەكەدا چـەند كەڕەت ڕوو دەگۆڕن، لـە هەنـدێ شـێوەی نەرمـە شـاییدا، هـەر كەسـە دەست لـە پـشت ئـەو

کەسەوە لە دەستییدایە بۆ دەستی کەسی سێیەم درێژ دەکاو دەست تێکەڵ دەکەن و شاییەکە دەڕوا، ئەگەر ڕەشبەڵەك بێ، واتە پیاوێك، ژنێك، پیاوێك ژنێك... شتەکە وا دەکەوێتەوە هەر پیاوە لە پشتی ژنەکەی دەستیەوە دەستی ئەو پیاوەی تر دەگرێ کە لە دەستی ژنەکەدایە.

بەم جۆرە هەموو پیاوەکانی ناو شاییەکە دەستی یەکتردەگرن هەروەها ژنەکان، ئەمە، وەکو دەبینین، زۆر لە چنین دەچێ، ڕاستیەکەی هەر شاییەکە خۆی وەکو کردارێکی چنین دێتە بەرچاو.

هەرچی شاییە خێراو بەتاو و تەوژمەکان، شاییکەرەکان دەستی یەکدی شل شل دەگرن تا لەگەڵ ڕەوتی شاییەکەدا گەرم دەبن و نەشئە دەیانگرێ ئینجا لە ئەڵقەکە دەردەچن و بە هەڵقونینەوەی خێرا و سووك و سرك بەم دیوو ئەو دیوی ئەڵقەکەدا هەڵدەبەزنەوە و جارێك ڕوو دەکەنە ناوەندی ئەڵقەکە و جارێکی تر ڕوو دەکەنە سەرچۆپی کێش.

جاری واش هەیە، جووتێ شاییکەر دەکەونە ناوەڕاستی ئەڵقەی شاییەکە و ڕوو دەکەنە یەکدی و بە دەم دەسەسڕ بادانەوە، سەمایەکی تایبەتی دەکەن، جارێك بە ئەژنۆدادێن، ئینجا بە تەوژم ڕاستدەبنەوە و دوا بەدوای یەك، یای ئاسا، ئەم سەمایە دەکەن، ئەم جۆرە سەمایە زۆرتر لای گەلە قەفقاسیەکان باوە، زۆر جار ئەوانی ناوەڕاستی ئەڵقەکە، دەکەونە ئاڵوگۆرکردنی هەنگاوەکانیان و لاسایی چیرۆکێکی خۆشەویستی دەکەنەوە، لە یەکێك لە چیرۆکەکاندا، کەنیشکەکە پشت لە کوڕەکە دەکاو خۆی دەتۆرێنێ.. خۆشەویستییەکەی ڕەتدەکاتەوە کوڕەکە واز ناهێنێ، زێڕ و زیو و خشڵی پێشکەش دەکا، دوایی شمشێرێکی پێشکەش دەکا، ئەم هەر ڕەتیدەکاتەوە، دوا جار، دەسکە گوڵێکی، بۆ درێژ دەکا ئینجا خۆشەویستییەکەی قبووڵ دەکا.. (بڕوانە کەلتووری میللی).

لە کوردستان شێوەی جیاواز جیاوازی شایی هەن، بە گوێرەی بەش و ناوچەکان لێك جیان، بەڵام شایی باکووری ڕۆژاوای کوردستان، واتە هی دیمیلیەکانی دەرسیم لە هەموویان جیاوازە.

لەناو شاییە خێراکاندا، هەیی نار، یاڵە، نیری، دەرسیم، شێخانی، چۆپی و هەڵپەڕکە لە هەموویان بە تەوژمترن. لە چۆپیدا، ئەوانەی لە ناوەڕاستی ئەڵقەکەدا سەمادەکەن جار جارە

دارێکیش دەگرن بە دەستەوە بۆ دروستکردنی هەندێ دەربڕینی گاڵتەجاڕانەی شەڕی دوو کوڕ لەسەر خۆشەویستی کچێك، یان دەربڕینی شەڕێکی ئاسایی لەو شەڕانەی لەناو کۆمەڵگادا باون.

شاییەکان زۆر لەگەڵ لێدانی تەپڵ و زوڕنادا دەکرێن، جارجارە تەموورەشی دەخرێتە سەر، یان لەجیاتی زوڕناکە بەکاردێ (بڕوانە موسیقا).

لە کوردستانی باشوور، زۆر جار شایی لەلایەن گۆرانی بێژی میللییەوە شان بەشانی تەپڵ و زوڕنا دەگێڕێ گۆرانیەکان لە بارەی بابەتە گشتییەکانی ژیانی خەڵکەوە دەچڕرێن.

شاییەکان وا بەرەبەرە دەبنە بابەتێکی سیاسی و کۆمەلایەتی لەناو کوردەکاندا، لە تورکیا کە بۆ چەندین پشتی یەك لە دوای یەك کەلتووری میللیان بە توندی تەپەسەر یان هەر لە بنی قەدەغەکراوە، یان لە سوریا کە لە ماوەیەکی دوورەوە بەربەستی بۆ دانراوە، کردنی شایی کوردی، واتای شکاندنی یاسا سەختگیرەکان و دەربڕینی ناسنامەی نەتەوەیی دەگەیەنێ، بۆیە مرۆڤ دەبینێ، پێشمەرگەکان بە جلی پێشمەرگەییەوە، هەروەها سیاسەتمەدار و ئەکادیمی و پیشەوەری کورد بە جلوبەرگی ئەوروپاییانەوە، هەموو پێکەوە دەست لەناو دەست، لە بۆنە و جەژنەکاندا، لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان، شایی دەگێڕن و هەمان پەیام بۆ دنیا دەنێرن، ژەنەرال مستەفا بارزانی سەرکردەی ئەفسانەواری کورد، هەمیشە ئەوەی لەسەر زار بوو کە "ئەوەی شایی نەزانێ کوردنیە".

لە بەرامبەر ئەمەدا، سەمای کەس کەسی بە خێرایی خەریکە دەبێ بە باو و ئەم گوندە جیهانیە زیاتر گەورە دەبێ و کوردستانیش دەگرێتەوە، نەوەی نوێ لە شارە گەورەکاندا بڕیاری خۆی داوە و ئاهەنگ و جەژنە دێرینەکانی لێدەرچێ، یان لەکاتی زیندووکردنەوەی بۆنەیەکی میللییدا نەبێ، لە سەما و دانسی مۆدێرنی ئەوروپا هیچ جۆرە شاییەکی تر ناکەن.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** T.F. Aristova, "Poyezdka k Kurdam Zakavka'ya," *Sovetskaya Etnografiya* VI (Moscow, 1958).

# شانۆ و فیلمسازی

لە کوردستاندا ڕابردوویەکی باوی شانۆی لادێ هەیە، بە تایبەتی لە کوردستانی باشوور و هەندێ کەرتی کوردستانی ڕۆژاوادا، سامانی لە ڕادە بەدەرەی یاری شانۆ شێوەی ناوخۆیی و چیرۆك و داستان و داب و نەریتی پشتاوپشت دابەزیو کە تا ئێستاش هەر ماون، بوونەتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ ژمارەیەکی زۆری شانۆگەری نووس و ڕوومان نووس و فیلمساز و ئەکتەری ئەم سەردەمە کە تا ئەندازەیەکی بڵند سەرکەوتوون و ئاوازە و ناوبانگی باشیان داوەتەوە (ناوچەرگەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور دەکەونە خاکی ئێرانەوە).

ئەگەر بە ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی ئەم هونەرە لە مێژووی کورددا بچینە خوارەوە، دەبێ هەر نەبێ تا سەردەمی هیللەنیستی (سەدەی ٤ – ٢ ی پێش میلاد) شۆڕ بینەوە، لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی بەرچاوی شارە – دەوڵەتی گریکی لە چیاکانی زاگرۆس بنیات نران، زۆربەی ئەم شارانە لە هەرێمی کوردستان بوون ئەم گریکانە و هاو شاریەکانیان کە لەڕووی کەلتوورەوە گریکێنرا بوون، هێندەی پێ نەچوو، کەوتنە بووژاندنەوەی دوو بابەتی باوی ڕابواردن بۆ خۆیان: شانۆ و وەرزشگا (جیمنا زیۆم).

ئەم دوو سەرگەرمییە چۆن هاتۆنەتە ناو کوردانەوە، زۆر گرنگ نیە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە پاش ماوەیەك شێوەیەکی شانۆی گوندی هاتەکایەوە (لە سەرەتاوە لە کوردستانی باشوور و ڕۆژاوادا)، لە پاڵ مەیدانی پاڵەوانبازی و زۆرانبازی لە ئاوایی و شارەکاندا (لە هەموو کوردستاندا).

هەرچەندێکو ئەم نومایشە شانۆییانە لەڕووی بیرۆکەوە سادە و ساکارن و بۆ پێشکەشکردن ئاسان، بەڵام لەناو خەڵکدا پلە و پایەیەکی بە هەندیان هەیە، لە یەکێك لەو نومایشانەدا کە لە کوردستانی باشوور باون، کابرایەکی ئاشەوان ڕیشی خۆی لە ئارد دەگرێ و دەبێ بە ڕیش سپی ئاوایی و کوڕێکی گەنجیش لەچکی کچێکی ئاواییەکە لەسەر خۆی دەئاڵێنێ و دەوری ئافرەتێك دەبینێ.

تاشە بەردێك دەكرێ بە كالایەكی بەنرخ، سەرینێك كە بە پەتێك ڕستكراوە لەجیاتی بزن، و ژنێكی قەڵەو كە بە چوار چنگوڵە دەڕوا و دەبۆڕێنێ، لەجیاتی مانگا... ژنێكی كەم دار و بار سواری پشتی مانگاكە دەبێ و دەوری خاوەن مانگا دەبینێ، هەر كەس لای خۆیەوە كەرەستەیەك دێنێ كە بۆ جێبەجێكردنی نومایشەكە بەكاریێ، كە یەكێك لە ئەكتەرەكان ماندوو دەبێ، یەكێكی تر دێتە جێی و بەم جۆرە تیپەكە خۆشی و سەرگەرمییەكی باش بۆ خەڵكی ئاواییەكە دروستدەكەن و بەوە گەنجەفەیەی سازی دەكەن یارمەتییان دەدەن هەندێ لە خەمەكانی ڕۆژگاریان بدەن بە بادا.

بابەتێكی كولەكە كالێیان پرسان پرسانە، كە نومایشێكی دووكەسییە، لە یەكێكیاندا، یەكێ لە دوو ئەكتەرەكە خۆی لە پشت ئەوەی ترەوە دەشارێتەوە و دەستی لەژێر دەستی ئەوەوە دەردەكا، لە كاتێكدا ئەكتەری پێشەوە هەردوو دەستی دەخاتە پشتی خۆی، ئینجا ئەكتەری، پێشەوە دەكەوێتە گێڕانەوەی چیرۆكێك، هەرچی دووەمە دەستەكانی دەكەوێتە جۆرە ئیشارەتێك كە بۆ زیاتر دەرخستنی ڕووداوەكانی چیرۆكەكە سوود بەخشن و هەموو دیمەنەكە پێكەوە دەبێتە مایەی شادی بینەران.

لە نومایشێكی تری دوو ئەكتەرەدا، كە نومایشیكی بێدەنگە، هەر دوو ئەكتەرەكە دەكەونە لێدانی یەكتر لێدانێكی یەكجار چاك، دوایی هەموو گوبەندەكە بە ئەندەرزێكی ئەخلاقی كۆتایی دێت.

هەروەها، هەندێ نومایشی تر هەن، كە گفتوگۆكانیان بەشێوەی شیعری ئەنجام دەدرێن بۆیە ئەكتەرەكان دەبێ پێشەكی لەبەریان كەن.

لە هەندێ نومایشی تردا، ئەكتەرەكان لەگەڵ خۆیاندا بووكە دارینە بەكاردێنن، بەم جۆرە، تێلایەك دێنن یان لە قۆڵی بەرگەوە، یان لە دەلینگەوە دەری دەكەن و لە پشتەوە دەیجووڵێننەوە، ئەم جۆرە نومایشانە، هەروەها ئەوانەی كە گفتوگۆكانیان بە شیعر ئەنجام دەدرێن كەمتر ساز دەدرێن چونكە خۆئامادەكردنێكی باشیان لەلایەن ئەكتەرەكانەوە گەرەكە و زیرەكییەكی زۆریشی لەلایەن بینەرانەوە.

ئەم نومایشانە لە پەنای لایەنە سەر گەرمكەرەكەیانەوە، لایەنێكی ئابووریشیان تێدایە بۆ ئەو گوند نشینانەی كە وەرزێرپیشە نین وەكو پاسەوان و سەرتاش و حەمامچی ئەگەر هەبن.

پـایزان لـە کۆتـایی وەرزی درەودا، نومایـشێك دەگێـڕن لـە بـەرایی ئاواییـدا، ئەکتـەرەکان لـە دەرگـای دەرەوەی ماڵێکـەوە دەردەکـەون، ئـەوان ژن و پیـاوێکن و لـەنێوان خۆیانـدا لەسـەر خەرجی ماڵ لێیـان دەبـێ بـە دەمـەقاڵ، کەسـانێکی تـر ڕۆڵـی منداڵـەکانیان و ناوبژیکـەری تـر دەبینن... هەر برە پارەیەك لە خەڵکەکەوە دەست کەوێ، لەبری بـار و بـووری زسـتانە دەدرێ بە ئەکتەرەکان.

نومایشنامەی کۆسەکاڵی زۆرتر لە کوردستانی بـاکوور و ڕۆژاوای کوردسـتان بـاوترە وەکـو کوردستانی باشوور، لەوێ لە هەموو جۆرەکانی دیکـە بڵاوتـرە. ئـەوی ڕاسـت بـێ لـە سـەدەی شانزەیەمەوە لە ئەناتۆلیا تورك زمانەکان ئەم جۆرە نومایـشانەیان بـە زۆری دەکـرد، بـە نـاوی قەرە گوێز (چاو ڕەش)ەوە، لە بارەی ئەسڵی ئەم هونەرەوە سەرچاوەیەك بـە دەسـتەوە نیـە، هیچ بەوەش ناچێ میسری بێ، چونکە میـسریەکان خۆشیان جـۆرێکی تـری ئـەم هونـەرەیان هەیـە و هــەر نـاوە تورکیەکەشـی لێـدەنێن، لــە هەنـدێ نووسـینی ئەفلاتوونـدا بەشـێوەی ناڕاستەوخۆ، باسکراوە، بەڵام ئەمە هیچ پەیوەندی بە ڕەگو ڕیشەی ئەو هونەرەوە نیە.

ئەم نومایشنامە خۆوڵاتییە کوردیانە بـە تـەواوەتی لـە نومایـشنامە ئایینیـەکانی شیعەکان جیان کە لە ئێران و عێراق و لـەناو کۆمـەڵگای بـچووکی کـوردی شـیعەدا ئـەنجام دەدرێـن، بـە هەرحاڵ، لەناو کۆمەڵگای تری کورددا، نومایشنامەی ئایینی نیە.

وێ دەچـێ نومایـشگەریی لادێ، هـاو کـووفێکی سرووشـتی جـۆرە سـەر گەرمییـەکی تـری کوردان بێ، واتە حیکایەتخوانی گەڕۆك و داستانبێژی، (بڕوانە موورێك).

زۆر سرووشتیە کە ئەم خەرمانە گەورەیەی سامانی هونـەری دێرینـەی شانۆسـازی کـوردی بووبێتە مایەی دروستبوونی خەرمانێکی گـەورەتری ئـەدەبیاتی نـوێ و کۆڵینـەوە لـەو سـامانە هونەرییە دێرینەیە، بـەڵام ئـەم سـامانە لـە ئـەدەبیاتی ڕۆژاوادا هێـشتا سـەری لێنـەدراوە و بـە بیروڕای من ماوەیەکی گەرەکە تا لێکۆڵینەوە لە بارەیـەوە بـە زمانـە بێگانـەکانیش بکرێ. بـە هەرحاڵ، کارێکی زۆر لەسەر نومایشسازیی دێرینی کـوردەوە بـە کـوردی و بـە زمـانی گـەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کراوە، هەندێ لەو کارانە کە لـەم دوا دواییـەدا کەوتۆتـە ناوانـەوە ئەوانـەی عەلی ئەشرەف دەروێشیانن کـە خـۆی ڕۆمـاننووس و شـانۆگەری نـووس و چـیرۆکی منـداڵان نووسە، ئەو سامانێکی باشی لە چیرۆکی نومایشنامەی شانۆیی لادێی کۆکردۆتـەوە، لـە جزمـی

دووەمی کارەکەیدا کە ناوی ناوە "ئەفسانەو بابەتی شانۆگەری و گەمەی کوردان" - ١٩٩٨-، دەروێشیان باسی پلانی نومایشکردنی گەلێ لە شانۆگەریەکان دەکا و لە بارەی ئامادەکردن و دەرهێنان و خستنە سەر شانۆیانەوە دەدوێ.

لەم ڕابردووە خۆماڵییەوە پیاو دەتوانێ باسی ئەو بیرۆکە خۆییە کوردیانە بکا کە بوون بە بنەما بۆ بەرهەمهێنانی دوان لە باشترین و بەناوبانگترین فیلمی سینەمایی لە تورکیا و ئێران. "شوەکەی غەزال خانم" کە لەسەر چیرۆکێکی عەلی محەممەدی ئەفغانی (کە چیرۆکنووسێکی کرماشانییە) دانراوە، باسی ژیانی ژنێکی کورد دەکا کە مێردەکەی ژنێکی تری بەسەرهێناوە، کارەکە سالّی ١٩٦١ هەموو ناوەندە ئەدەبییەکانی ئێرانی هەژاند و گەورەترین تیراژی فرۆشتنی بڕی لە وڵاتەکەدا لایەنی شانۆیی چیرۆکەکە بە ئاسانی کردی بەکاری شانۆیی و تەلەفزیۆنی و سەرەنجام بوو بە کەرەستەی فیلمێکی سینەمایی سەرکەوتووش، دووەم، فیلمی سینەمایی "یۆلّ"ە کە بە کوردی واتە "ڕێگا" و لەلایەن فیلمسازی کوردی ئەناتۆلیا، "یلماز گونەی"یەوە دەرهێنراوە و سازدراوە، ئەم فیلمە باسی دەرەنجامە خراپەکانی ئابوورییەکی شلەژاو و کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو لەسەر پەیوەندی خەڵکانی ئاسایی ناو کۆمەڵگا دەکا، بە ناوەندەکانی ژنانو ڕەوشە کۆمەڵایەتیەکانیشەوە لە کوردستاندا، لە کاتێکدا وڵاتەکە هەنگاو بۆ ناو جیهانی نوێ دەنێ.. ئەم بەرهەمەی گونەی چەندین خەڵاتی نێودەوڵەتی وەرگرت و لەلایەن سەنعاتکارانی فیلمسازی جیهانەوە بە شاکارێك دانرا، لە کاتێکدا گونەی خۆی لە زیندانەکانی تورکیادا ماوەی زیندانیی دەبردە سەر.

سەرەڕای توانای بەرزی هەردووکیان، ئەفغانی و گونەی بیرۆکەی زۆر ناسکی کوردی بەکاردێنن لە کارەکانیاندا و لەم ڕووەوە دەتوانرێ ناوی "کوردەواری"یان بدرێتێ. ئەوان مەگەر بە دەگمەن ئەگینا هەرگیز کەسایەتیەکان یان ڕووداوەکانیان لە چوارچێوە و سرووشتە کوردیەکانیان جیا ناکەنەوە و لە ڕەنگوبۆ و بەرامەی کوردانەیان دوور ناخەنەوە. ئەم خەسیەتە لە هەموو کارەکانی تری کورداندا لە شوێنەکانی تری کوردستاندا ئەوها باو نیە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:-

**Further Readings and Bibliography**: Valuable biographies of some Kurdish playwrights and film directors living overseas are found in Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico international, 1991), section 2; see also Ali-Ashraf Dervishiân, *Kurdish Fables, Theatrical Plays, and Games* (Teheran: Nashr-i Ruz Publisher, 1988), text in Kurdish and Persian.

# نەخش و نیگار ودیزاین

قۆناغی حەلەف (٦٠٠٠–٥٠٠٠ پێش میلاد) کۆنترین گەی مێژووە کە هەندێ بەلگەی ئارکیۆلۆجی لێوە بچکێ لەسەر هونەری کوردی و بوونی قوتابخانەیەکی تایبەتی هونەر لە کوردستاندا.. بە چاو خشاندن بەو بەلگانەدا، مرۆڤ یەکاویەك بە سەر یەکیەتیەکی هونەریی زەق و ئاشکرادا دەکەوێ، ئەویش لەو وێنە و نەخش (نیگارا)نەدا کە لەسەر دەفر و گلێنەی دەسکردی ئەو گەلانە هەلکەنراون کە لەو سەرزەمینەدا نیشتەجێ بوون. سەرزەمینێك کە هەر لە زنجیرە چیای ئەمانۆسی سەر دەریای سپی ناوەڕاستەوە دەگرێتەخۆ تا دەگەیتە کەلاوە و کەیلەکانی عەلی کوش لە باشووری کوردستان. سنوورەکانی لای باشووری کەلتووری حەلەف لەگەلّ کۆتایی سنوورەکانی کوردستان لە پێدەشتەکاندا تەواو دەبێ، بەلاّم سنوورەکانی باکووری ئەم کەلتوورە، لەبەر کەمی کەندەکاری و تۆژینەوەی ئارکیۆلۆجی، بە باشی نەزانراوە لە کوێ دەوەستنەوە. ئەم کەمی کەندەکاری و تۆژینەوەیەش، لەبەر ئەوەیە ئەو سنوورانە باکوور و باکووری ڕۆژاوای کوردستانی تورکیا دەگرنەوە و خاوەنی هەلکەوتەیەکی ستراتیژی یەکجار گرنگن لە سیاسەتی تورکیادا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٢). ئاستی یەکیەتی هونەریی ڕاستەقینە لەناو ئەو خەلکەدا کە کەلتووری حەلەف دەیانگرێتەوە، بەلگەی زیندوون لەسەر ئەو ڕاستیەی کەوا ئەو خەلکە یەکیەتی ئەتنی کۆی کردوونەتەوە.( Roaf 1991، 51)

کەلتووری حەلەف، زۆرتر بە دەولّەمەندی لە گلێنە و ئامانی بە نەخشونیگاری ڕەنگاوڕەنگ ڕازاوە ناوبانگی دەرکردووە، کە لەناو کوورەی جووت – تەنووردا سوورکراونەتەوە، هەروەها لە زۆربەیاندا وێنەی گولّی کێوی دەردەکەوێ، ئەوەی زیاتر مایەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە تا ئەمڕۆ ئەم نموونانەی کەلتووری حەلەف لەناو کورداندا هەر باون و لەسەر بابەتی چنراوی کوردەواری بە زەقی خۆیان دەردەخەن (Mullart 1975).

هەر لەبەر نەخشونیگارە ناسراوەکانی و پەیداکردنی ئاشنایی باش لەگەلّ ئەو وەستاکارییەی تێدا بە خەرج دراوە گلێنەی سەردەمی حەلەف بە ئاسانی دەناسرێنەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیە خۆی، لە گەلێ شوێن و شوێنەواری دەرەوەی سنووری خۆیدا بە سانایی

جیاكراونەتەوە و دەكرێنەوە و ئەمەش ئەو ئاڵوگۆڕە بازرگانیە چالاكە دەردەخا كە لەنێوان كوردستان و دەرەوەیدا لەو سەردەمانەدا هەبووە، ئەم ئاڵوگۆڕە بنەڕەتی هەرە بە هێزی ئابووری كوردستان بوو تا سەرەتای سەدەی (١٦)ی پاش میلادیش (بڕوانە بازرگانی).

دوابەدوای كەلتووری حەلەف، قۆناغی حوری لە مێژووی كەلتووری كورددا دەست پێدەكا، ئەم قۆناغە لە دەووربەری (٣٠٠٠)ی پێش میلادەوە دەستی پێكردەوە و تا هاتنی كۆچكردووە هیند و ئەوروپییەكان بۆ كوردستان و ئاریائیزە بوونی كۆمەلگا و كەلتووری كوردەواری لە دەووروبەری ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش میلاددا (بڕوانە كۆچكردنە مێژووییەكان) نەكوژاوەتەوە، قۆناغی كەلتووری حورییەكان، مۆركی زۆر ئاشكرای ئاڵوگۆڕكردنیان لەگەڵ گەلانی دراوسێدا پێوەیە هەروەها بەڵگەی كڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕكردنێكی چالاكی كالآ و شمەك و ئەندێشە لەنێوان گەلانی كوردستان و مێزۆپۆتامیا و ئێران و ئەولاتریش (Mellink1966)، دەسكردەكانی دەورەی كۆتایی سەردەمی حۆری كە لە شوێنە ئاركیۆلۆجیەكانی زێویە و حەسەنلو دۆزراونەتەوە مۆركی قۆناغی ڕاگواستنەوەی ئەم سەردەمە بەرەو سەردەمی كەلتووری ئاریایی یان پێوەیە كە تا ئێستا لە كوردستاندا بەردەوامە.

ئەو دەستكردانەی كە لە ئاوایی زێویەی كوردستانی ڕۆژهەلات (كۆنە شاری ئیزیدایی سەردەمی مانیەكان) دۆزراونەتەوە، هەندێ لە نەخشونیگاری یەكجار سرنجكێشی دانیشتوانی كوردی زۆر كۆنیان پێوەیە، ئەو شتە بەنرخانەی ئەوێ كە تا ئێستا لای گەلەری شتە ئەنتیكەكانی جیهان بە "گەنجینەی زێویە" بەناوبانگن، هێشتاكەش بەنرخی خەیاڵی دەستا و دەست دەكەن. ئەم شتانە، نەك تەنها ئەڵقەی پێكەوە گرێدەری زەمانیی نێوان هونەری نەخشونیگاركێشی نوێی كورد و حەلەف دەردەخەن، بەڵكو ئاوێنەی ساف و بێگەردن بۆ نیشاندانی هونەری نەخشكاریی ئایینی و ئەفسانەواری كوردیش (بڕوانە ١٩٥٠ Godard ).

لە پەنای گەنجینەی زێویەدا، گەنجینەیەكی پڕ بەهای دیكەی شارێكی سەردەمی مانیان هەیە لە حەسەنلوو (لە ڕۆژهەلاتی شنۆ و باكووری زێویە) ئەم شارەش هەر هی دەووروبەری ئەو سەردەمەیە (سەدەی نۆیەمی پێش میلاد).

ئەو بابەتانەش کە تێیدا دۆزراونەتەوە، بەڵگەی یەکجار بەهێزن لەسەر شێواز و سرووشتی هونەری و کەلتووری ئەو سەرزەمینە (Dyson And Voigt1989).

لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ هەر تەنها پشت بە گلێنەی کۆن ببەستین بۆ ساخکردنەوەی ئەم پەیوەندی و بەردەوامیە، ئەو خاڵبەندی و نەخشونیگار کێشیەی کە لە سەردەمی ئێستاماندا لەسەر لەش دەکرێ لەوانەیە بە تەواوەتی بۆ مەبەستیکی جیاواز بکرێ، بەڵام لە هەمان کاتدا، بەڵگەی زیندوون بۆ ئەوەی نەخشکاری لەناو کورددا بابەتێکی دێرینەیە. پیاو دەتوانێ بە ئاسانی پەنجە بخاتە سەر ئەو ڕاستیەی کەوایە کەم دەربڕینی خۆ ڕازاندنەوە لەلایەن مرۆڤەوە بە خۆنەخشاندن و خۆ ڕەنگکردن دەستی پێکردووە، ئەم کارە دوایی بابەتی ئەفسانەدار و لە سرووشتیە دەریشی چووتە سەر. هەر لەبەر ئەم هۆیە خۆیەتی کەوا لەش ڕەنگاندن ئێستا باوێکی وای نەماوە و جێگەی بۆ خاڵکێشانی لەش چۆلکردووە کە چوونەوەیان نیە و لای هەموو گەلانی جیهانیش کارێکی گشتکردەیە.

ژن و پیاوی کورد هەمیشە خاڵکوتانیان (کوترایی) لا باو بووە و تا ئێستاش، هەرچەندە بە ئەندازەیەکی کەمتر، هەر لایان باوە، هەندێ پەیکەری پاشماوەی کەلتووری حەلەف تا ئێستاکەش نیشانەی خاڵی کوتراوی سەر ڕوو و سنگیان هەر پێوەیە.

ئەمە دەکرێ وەکو نیشانە بەرزیەکی لەش دابنرێ (Von Opponhein 1931 Field 1958).

زۆربەی خاڵ کوتانەکان، ئەگەر گشتیان نەبێ، ئێستا بە ئامانجی کاریگەریی ئەفسانەوارایان لەسەر پەڕاندنی نەخۆشی دەکرێن، هەندێ کەس باوەڕیان وایە خاڵکوتان نەخۆشی سووک دەکا بۆیە خەڵکێکی کەمتر بە مەبەستی خۆ ڕازاندنەوە و جوانکاری خۆیان دەکوتن (Field 1958،24).

سەرەنجام هەر نەخشێکی کوتراو لە شتێکی پیرۆز پێکدێ و ئەگەر بشێوێنرێ، پیرۆزییەکەی نامێنێ، ئەم خاڵ و نیشانانە بایەخی کەلتووری و کەلەپووری خۆیان هەیە و پاشماوەی "زیندوو"ی نەخشی کۆنن و بەو شێوەیە تا ئەمڕۆکە پارێزراون.

گەلێ شێوەی خاڵکێشان و نەخشونیگاری کوتراو ئەو بۆچوونە دەردەخەن و باسی پەیوەندی نێوان خۆیان و نەخشونیگاری تر دەکەن کە بۆ مەبەستی دیکەی ئایینی یان دنیایی بەکارهێنراون، ئەو نەخشی شانەو ڕۆژ و حەوت ئەستێرەیە کە ژنان دەیکوتن، بۆ نموونە، وان

بە دیوارەكانی ئارامگای شێخ ئادییەوە لە لالشی شوێنەواری پیرۆزی یەزیدیان (بڕوانە یەزیدیایەتی).

وێنەی كیسەڵیش، كە سیمبوڵی تەمەن درێژیەو ئاماژەیەكە بۆ خدری زیندە (بڕوانە یارسانیەت). بەزۆری و لە شێوەی جۆراوجۆردا لە سەنعەتی "میناخانی"دا دەردەكەوێ كە هونەرێكی دێرینەی كوردییە. هەروەها، ئەو سیمبوڵبەندیەی وێنەی سەگ و ئەژدەها و خەرمانەی ڕۆژ پێكەوە كە لەلایەن ژنانی یەزیدیەوە بەكاردێ، هەمان سیمبوڵبەندیە كە لە پەیكەرە ئایینییەكانی میترایییە كۆنەكاندا بەكار دێنرا (میتراسی خواوەندەڕۆژ گای ئاسمان دەكوژێ و لە خوێنی گاكەوە مارێك و سەگێك دروست دەبن كە هەردووك سیمبوڵی هێزەكانی چاكە و خراپەن).

نەخشونیگاربەندیە كوردیەكان دوو جۆری لێك جیاواز پێكدێنن:

١- جۆرێك كە هیچ شێوە پەیوەندییەكی بە شكڵی سرووشت تەبارەوە نیە (واتە شكڵی ئەندازیاریەكان).

٢- جۆرێكی دیكە كەشتی سرووشت تەبار بۆ دەربڕینەكانی خۆیان بەكاردێنن و دوایی بەم شێوە و بەو شێوە لێكیان دەدەن تا سەرەنجام لە وێنەیەكی تەبادا دەریان دەخەن، دەست ڕەنگینانی ژن و پیاوی لادێ ئەم دوو شێوەیە جیاجیا، یان پێكەوە بۆ مەبەستەكانی خۆیان وەستایانە بەكاردێنن، هەرچی سەنعەتكارانی شارنشینن زیاتر بەلای جیاكارییدا دەچن لەم دوو شێوەیەدا، بۆیە گەر سەیری مافوور یان بەڕەیەكی دەسكردی شارنشینان بكەین، دەبینین نەخشی زیندەوەرو گوڵی لە شێوەی ڕاستیاندا بەكارهێناوە، كەچی هەمان شت گەر بەرهەمی دەستی گوندنشینێك بێ دەبینین پڕە لە تێكەڵەی نەخشی ئەفسانەوار و سرووشتی زۆرجار بە شێوەیەكی ئاڵۆز.

ئەمڕۆ، دەسكردی كوردی لە هەردوو شێوەدا، دەتوانرێ بە ئاسانی لە دەسكردی گەلانی تر جیا بكرێتەوە، بە تایبەتی لە بواری بەڕەدا، لە كاتێكدا كۆنیی ئەم پارچانە دەكرێ لە ڕەنگ و ڕیشە خۆ جێیەكانیانەوە بزانرێ، بەڵام ئەگەر هەمان بابەت لە دەرەوەی كوردستاندا بێنرێن، ئەوا هەر دەچنەوە سەر دروستكەرە دێرینەكانیان و ئەوە دەستمان دەگرێ و چیرۆكە تاڵ و سوێرەكانی كۆچكردنە مێژووییەكانمان بە گوێدا دەدا. نەك هەر ئەمە، ئاراستەی ڕێگاویانەكانی سەردەمانی دێرینیشمان بۆ دەردەخا، وەكو ئەوەی لە كەلتووری حەلەفدا هاتووە.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: Robert Dyson and Mary Voigt, eds., "East of Assyria: The Highland Settlement of Hasanlu," *Expedition* 31:2-3 (1989); I.J. Winter, "Perspective on the 'Local Style' of Hasanlu: A Study in Perspective," in L.D. Levine and T.C. Young, eds., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia*, vol. 7 (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, 1977); James Mellaart, *The Neolithic of the Near East* (New York: Scribner, 1975); André Godard, *Le Trésor de Ziwiyè, (Kurdistan)* (Haarlem: Publications du service archéologique de l'Iran, 1950); Edith Porada, "Of Deer, Bells and Pomegranates," *Iranica Antiqua* vii (1967); Edith Porada, "The Hasanlu Bowl," *Expedition* 1.3 (1959); M.J. Mellink, "The Hasanlu Bowl in Anatolian Perspective," *Irancia Antiqua* VI (1966); M.J. Mellink, "Hurriter Kunst," *Realexikon der Assyriologie* 514 (1972-75); Pierre Amiet, "Un vase rituel iranien," *Syria* XLII (1965); R.H. Dyson, "Problems of Protohistoric Iran as seen from Hasanlu," *Journal of Near Eastern Studies* 24 (1965); P. Amandry, "A propos du trésor de Ziwiyé," *Iranica Antiqua* VI (1966); Edith Porada, "A Fragment of a Gold Applique from Ziwiye and some Remarks on the Artistic Traditions of Armenia and Iran during the Early First Millennium BC," *Journal of Near Eastern Studies* 19 (1960); C.K. Wilkinson, "Treasures from the Mannean Land," *Bulletin of the Metropolitan Museum of Art* (New York, April 1963); R.D. Barnett, "Median Art," *Iranica Antiqua* II.1 (1962); A.D.H. Bivar, "A Hoard of Ingot-Currency of the Median Period from Nush-i Jan, near Malayir," *Iran* IX (1971); P.R.S. Moorey, "A Note on Pre-Achaemenid Standard-Tops from Western Iran," *Iran* XV (1977); Henry Field, *Body-Marking in Southwestern Asia* (Cambridge, Massachusetts: Peabody Museum, 1958); Max von Oppenheim, *Der Tell Halaf* (Leipzig, 1931); Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990); O.W. Muscarella, "Comments on the Urkish Lion Pegs," in G. Buccellati and M. Kelly-Buccellati, eds., *Mozan I: The Soundings of the First Two Seasons*, vol. 20 (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, Undena, 1988).

# ڕایەخ و تەون و جۆلاکاری

دەرکەوتنی ڕایەخ لە تۆماریەندیەکانی ڕۆژەلاتی ناوەندی کۆندا، هاوکاتە لەگەڵ گەیشتنی ئاریایی و هۆزە هیند و ئەورووپی زمانەکانی دیکەدا، وەکو میتانی و میدیایی و حیتیەکان. وادیارە ئەم کۆچەرانە کە لە هەردە ساردەکانی یۆراسیای باکوورەوە هاتبوون هونەری تەونیان (بە تایبەتی جۆری کۆلکن) هێناوەتە کوردستان و ئەو جێ دوورانەی تر‌ەوە کە لێی نیشتنەوە (بڕوانە کۆچکاریە مێژووییەکان).

کۆنترین بەلگەی ڕاست لەسەر بەرەی کولکن، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەیەمی پێش میلاد و لە ئەڵەچە حویوق کە کۆنە شوێنەوارێکی حیتیە لە ئەناتۆلیای ناوەند دۆزراونەتەوە، هەروەها لە نەخشێکی سەر دیواری سەردەمی ئەمن حۆتەپی چوارەم (ئەخناتوون) و شا ژنەکەی کە ئاری نەژادێکی میتانی بووە و ناوی نەفەرتیتی بووە (دەروبەری ١٣٦٩ — ٥٣ پێش میلاد). بە هەرحاڵ، بەکاریی بەلگەکان لەسەر بەرەی کولکن لە "میلەرەش"ەکەی

شەلمان نەسەری پادشای ئاشووریەوە (دەورووبەری ٨٥٨ – ٨٢٤ پێش میلاد) دەست پێ دەکا. بەو میلەوە وێنەی هەندێ دیاری و خەڵاتی بەڕەی کولکن نیشاندراوە کە (دوانیان لەبەر گرانبیداریان دراوەتە ژێر و بە شانی دوو زەلام هەڵگیراون) و ڕیشووەکانیان (زۆربەی بەڕە کولکنەکان ڕیشوودارن) بەمسەر و ئەوسەریانەوە شۆڕ بوونەتەوە. ئەو دوو زەلامەی کە دارەکانیان بەسەر شانەوەیە، بە بەرگەکانی بەریان ناسراون کە لە دانیشتوانی باکووری ڕۆژاوای ئاشوورستان واتە کوردستانی ڕۆژاوان، بە وشەیەکی تر ئەو شوێنەی کە بەر لەوە پادشانشینی میتانیەکان بووە (بڕوانە مێژووی هەرە کۆن).

بیرۆکەی نەخشکاری و بنەوانی هونەریی ئەو بەڕانەی کە هێنرابوونە بازاڕەکانی ئاشوورستانەوە دەتوانرێ لەو کار و نەخشسازیانەی بەرد نەخشێنە خۆڵاتیەکانەوە بناسرێنەوە کە بۆ نەخشاندنی ئۆدە و کۆتك و سەراکان هەڵیان بژاردوون. زۆربەی ئەو "فەرشە بەردینانە" کە هێشتا ماون نەخشونیگاری ئەوتۆیان لەسەر کراوە و کە زۆر لە نەخشونیگارە سەردەمییە کوردیەکان دەچن وەکو چوارگۆشەی گوڵزار، گەواهێرات، دوینە کیسەڵ و قرژاڵ، لەرووی دیزایینی گشتیەوە میناخانی، چوار سووچ، پیرگوڵ و ڕەقە ئاوێتە، زۆرتر باون .(Akasheh١٩٩٢)

لە هەموو دیزاینە سەردەمییەکانی بەڕەی کوردییدا، لەم تۆماربەندیە کۆنینەیەی ئاشووریاندا، تەنیا جۆری "ماسی ئاوێتە" دەرناکەوێ. لە خوارەوە، باسێکی دوور و درێژی ئەم ستێل و وێنانە دەکرێ.

هەرچی بەرهەمی جۆڵاییە لە کوردستان، واتە سیپاڵ چنی، ئەوا جیاواز لە بەڕەی کولکن مێژوویەکی تۆمار بەندکراوی هەیە. کۆنترین بەڵگە لە بارەی چنینەوە بە مانای سەردەمانەی، واتە کوتاڵی هێڵ هێڵ، لە نەخشی سەر هەندێ خشتی سەردەمی (چەرخی بەردینی نوێ) (Aceramic Neoulithic) (8500 – 7000)ی پێش میلاد کە لە شارە شوێنەواری چەرمووی نزیکی سولەیمانی ئێستا لە کوردستانی ناوەند دۆزراوەتەوە (Roaf 1990:28) ئەمانە، ئەوی ڕاست بێ، مێژینەترین بەڵگەی سیپاڵ چنینن بە مانای سەردەمانەی کە لە هەر شوێنێکی تری سەر ڕووی زەمین کەوتبنە دەست، دیمەنی تازە شێوەی ئەو بابەتانە بە هەرحاڵ، وامان پێدەڵێن کە بەر لەمان شێوەی تریش هەبوونە وەلێ هێشتا نەدۆزراونەتەوە..

لە بەرامبەر ئەمەدا، بەم دواییە بەڵگەیەك كە، لەسەر سەنعەتی چنین لە ئەشكەوتی نەحال حیمار لە ئیسرائیل دۆزرایەوە (كە هاوچاخە لەگەڵ چەرموودا)، بریتییە لە جۆرە لوولدانێكی پۆكان بە دەوری تانەكاندا واتە هەمان ئەو تەكنیكەی كە بە گرێچن ناسراوە.

سەنعەتی چنین لە كوردستاندا تا سەدە مێژووییەكان بەردەوام بووە و لە سەدەی دەیەمی پێش میلادەوە بەرهەمەكانی وەكو دیاریی شاهانەی نایاب پێشكەش بە كۆشكی پادشاهانەی ئاشووری كراوە، پیشەی تەنك چنی تا كۆتایی سەدە ناوەندەكان (سەدەی پانزەیەم) هەر بەردەوام بووە.

ماركۆ پۆلۆ لە نووسینەكانیدا لە بارەی ئەو ناوچەیەوە كە دەكەوێتە نێوان مووش و ماردین و مووسڵەوە (كوردستانی رۆژاوا)، دەڵێ: "ئەمە ئەو مەڵبەندەیە كە "لۆكەی زۆر بەچری تێدا دەكرێ، و لە بەرهەمەكەی جۆرە قوماشێكی نایاب دروست دەكرێ كە پێی دەوترێ "بوكاسینی" لە پاڵ گەلێ جۆری تردا" (Travels I.Vi).

لەو پەڕی كوردستان، لە رۆژاوا، ماركۆپۆلۆ دیسانەوە باسی بازاڕەكانی قەیسەری (سیزاریا) و سیواس (سیباستیا) دەكا و دەڵێ "باشترین و جوانترین مافووری جیهان دێنرێتە ئەم بازاڕانەوە، هەروەها پارچەی ئاوریشمینی مەخمەڵ و رەنگینی تریش لەم بازاڕانەدا دەستا و دەست دەكەن".

حەوت سەدە لەوەدوا، واتە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، نەیبووری ئاسەوارناس، لە باسی هەمان ناوچەی كوردستاندا، باسی پیشەسازی لۆكە و كەتان دەكا و ئاماژە بۆ "جۆرە ئاوریشمێك دەكا كە كەژ یان كێژی پێ دەڵێن و لەسەر داران دەڕزكێ" (voyage 11-268) لە بارەی ئەو پارچە چنراوانەوە كە دێنرێتە بازاڕەكانی مووسڵەوە، ماركۆپۆلۆ دەڵێ:

"مووسڵ و مووسڵێن جۆرە قوماشێكی لووكەیە و ناوەكەی لەو شوێنەوە وەرگرتووە كە تێیدا دروستكراوە".

ئەو بە وشەی مووسڵێن، مەبەستی" هەموو ئەو بەرگە زێڕین و ئاوریشمینانەیە، كە ئێمە پێی دەڵێین موسڵێن.."

بەگوێرەی دابێك كە تا ئێستاش هەر بەردەوامە لەنێوان بازرگانە رۆژاواییەكاندا، بە تایبەتی ئەوانەی سەوداكاری مافوورات و بەرەجات دەكەن، ماركۆپۆلۆش هەر بەرهەمێك دەكا

بەهی ئەو شارەی لێی خراوەتە بازاڕەوە، نەك ئەوەی لێی دروستكراوە، بەم پێیە، كاتێك باسی ئەو بابەتە بازرگانیانە دەكا كە لە دوكانەكانی مووسڵی سەردەمەكانی ناوەند دەكا دەڵێ: "هەموو دەسكردی مووسڵن" كە وای وت، دەبێ قسەكانی خۆی و ئەوانەی نەیبووریش، بەسبن بۆ ئەوەی بزانین مەڵبەندی دروستكردنی ئەم ماڵە دەستچنانە نەك تەنها ناوچە كوردنشینەكانی دەورووبەری شاری فرەڕەگەزی مووسڵن، بەڵكو هی كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا تەنانەت ناوەندیشن. لەسەردەمە دوا دواییەكانی سەدەكانی ناوەنددا، مووسڵ یەكێك بوو لە مەڵبەندە بازرگانیەكانی ڕۆژهەلات، و ئەتوانرێ بوترێ گەورەترین سەنتەری ئاڵوگۆڕكردنی كاڵاكانی كوردستانیش و لەمەدا تەورێزیش تۆزی پێی نەدەشكاند، هەر بەهەمان گوێرەی سەردەمی ماركۆپۆلۆ، ئێستاش مافوور و بەڕەی كوردی هێشتا لە بازاڕەكانی مووسڵ و سیواس و قەیسەری، هەر وەكو شارە گەورەكانی تر، بەسەرشانەوە گێڕدەدرێن و لە مغازە و دوكانەكاندا، هەڵدراونەتەوە.

هەرچەندە ئێستا ئاورێشم ئەوەندە باوی نەماوە و كەمتر دەست دەكەوێ، بەڵام لۆكە هێشتا بەرهەمی هەرە پارەكەری ئەم هەرێمەی كوردستانە (بڕوانە كشتوكاڵ) و لەمەدا شان دەدا لە شانی خوری وەكو كەرەستەی خاوی سەنعەتی چنین.

دوای سەردانەكەی ماركۆپۆلۆ، ئەوەندەی پێنەچوو ئابووری كورد دای لە كرژی و ئەم پرۆسەیە تا كۆتایی سەدەی ڕابردوو (سەدەی نۆزدەیەم – وەرگێڕ) هەر بەردەوام بوو هۆی هەرەسەرەكیی ئەم كرژیەش ئەوەبوو ڕێوبانی بازرگانی جیهانی بە كوردستاندا لەكار وەستا (بڕوانە بازرگانی).

ئەو داهات و ئەو تاو و تەوژمە دینامیكیەی بازرگانی دابووی بە ئابووری و تەكنۆلۆجیای ناوخۆ، بوو بەمایەی پەیدابوونی ئابووریەكی خۆخۆیی و ئەمەش دەرەنجامێكی نەگەتیڤی لەسەر تەكنۆلۆجیای ناوخۆی لێكەوتەوە.

ئیتر لە كوردستانەكەی سەردەمی ماركۆپۆلۆدا نە كوتاڵە جیهان ئاراكان مانو نە ئەو تەكنیكانەش كە بۆ دروستكردنیان وەكار دەهێنران، پێنج سەدە دوای سەردانەكەی ئەم گەڕیدە ڤینیسیاییە، كۆتاڵی كوردی دابەزیبوە نزمترین پلەی لەڕووی وەستاكارییەوە لەچاو

هـەموو بەرهەمـە ناوخۆییەکانـدا (بـە ئەدەبـەوە بـە ڕەشـۆکیو دڕ نـاو دەبـران) یـان هەنـدێ گەڕیدەی تازە هاتوو بە "کێوی" و "پەڵاس"وە سپیان دەکردن (٣٨– ١٩٨٨ Eagleton ).

وەبەرهێنانی جلوبەرگی دەستکرد لە کوردستان بە تەواوی لەناوچووە، هەندێ بابـەتی لـە چەك و دەسماڵ و وردە بابەتی ئەوتۆی لێدەرچێ، کە لەو ئاوریشمە کەمەی ئێستا لـە وڵاتەکـە وەبەردێنرێ دروستکراون ئەگینا بست بەبستی ئـەو کوتاڵـەی کـە کـوردان بـۆ سـیپاڵ بـەکاری دێنن یان لـە دەرەوە هێنـراوە یـان لـە نـاوخۆ بەمەکینـە دروسـتکراوە. ڕایـەخی دەسـکرد، بـە هەموو جۆرەکانییەوە، هەروەها کاری گرێچنی، ئێستا سەنعەتێکی یەکجار بەربڵاو و پارەکـەرن لە کوردستاندا.

کاری گرێچنی، لە باری بابەتدا، لەو جۆرەیە کە پارچەکە بە تەواوی بە نەخـشونیگاری فـرە ڕەنگ و شێوە دادەپۆشـرێ و ئەمـە بـە تـەواوی تـەکنیکێکی تـازە بابـەت و یەکتایـە، زنجـیرە بەنـدی بـە گـشتی شـێوەی هـەرەباوە لـە سـەنعەتی گرێـچنیی کوردییـدا و لـە شـێوەیەکی دێرێنەواری ئێسکە ماسییدا دەڕوا.

بـۆ پارچـەی گـەورە، زۆرتـر خـوری بـەکار دێنـرێ، ئەمـە وایکـردوە کـە بابەتەکـە دڕتـرو دیزاینەکەشی زلتر بنوێنێ، لـە کاتێکـدا گـەر داوی ئاورێـشم یـان لۆکـە بـەکاربهێنرێ، بابەتەکـە لووستر و دیزایینەکەشی وردتربنوێنێ.. ئاوریشم و لۆکە زۆرتر بـۆ وردە بابـەتی وەکـو تەپلـە و خورجینی دەست بەکاردێ ڕەنگی هەرە باو، سووری شۆخ یان جەرگییە، بۆیەکەش، لە ڕەگـی دەوەنـی کێـوی و هەنـدێ پێـشوولەی خـۆڵاتی دەردێنـرێ ڕەنگـەکانی تـر بـە گـشتی ئـاودارو بریسکەدارن. نەخـشەکان جۆراوجـۆرن و یـەك بابـەت نـین، لـە هەنـدێ شـوێن ئەرابیـسکن (لـە کوردستانی باکوور)، گوڵ و ئاژەڵ (کوردستانی ناوەند و ڕۆژاوا) یان گولزیندەوەر– ئـادەمیزاد (کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور) لـە کاتێکـدا ئـەو دیزاینانـەی لـە بـەرەی کوردییـدان لـە کـاری گرێچنیـــشدا بـــەکارهێنراون، کەچـــی ئـــەوەی مایـــەی سەرســـوڕمانە ئەوەیـــە، وێنـــە و نەخشونیگارەکانی ناو مافووریان بە هیچ جۆرێك تێدا بەدی ناکرێ. ئەوی ڕاسـت بـێ، نـزیکترین شـت لـەو وێنـەی ئـادەمیزاد و زیندەوەرانـەی کـە لـە گرێـچنکاریەکانی کوردسـتانی ڕۆژهەڵات و باشووردا دەردەکەون، کوت ومت، هی چەرخی بەردینی کۆنن کە لەسەر تاشـە بـەرد و دیـواری

ئەشکەوتەکان هەڵکەندراون.. واتە، ئەوەندە لێك نزیکن کەوا هەستی لێك جیانەکردنەوە لای هەر کەسێك کە هەردووکیانی دیتبێ، درووست ناکا.

کاری گرێچنی، لەرووی ڕووبەرەوە جیاوازە و لەسەرە تەپڵەکی بچووکەوە دەگرێتەوە تا بابەتی وەکو فەرشەی بووکێنی کە خۆیان دەدەن لە ١٤×٦پێ، ئەم کارە زیاتر لە کوردستانی ناوەند و ڕۆژاوا باون، بابەتەکانی بریتین لە پشتێنەوە تا کڵاوی سەر، و لە سەرزەینەوە تا ڕایەخی نەخشین جۆراوجۆرن.

ئەو برەوە باشەی لەمەودوا بازاڕی ئەم بابەتە پەیدای کرد بە تایبەتی لە بواری ناردنە دەرەوەدا بۆ بازاڕەکانی ڕۆژاوا وای لە گەلێ پیشەوەری کورد کرد بگەڕێتەوە سەر شێوازە کۆنەکان و دایانگرنە سەر شێوە و بابەتی نوێ، هەرچەندە ئەم بەرهەمە نوێیانە هیچ پەیوەندیەکان بە گەنجینەی دێرینەواری هونەری کوردیەوە نیە، بۆ نموونە، لە هەموو ئەم کارانە بازاڕ گەرمتر ئەو جانتا دەستیانەن کە بە گرێچنی دروست دەکرێن. ئەم بەرهەمانە فرۆشێکی باشیان هەیە بە تایبەتی بۆ گەڕیدە بێگانەکان کە لە بابەتی دەسکردی خۆولاتی دەگەڕێن، ئێستا ئەمانە چاکەت و دامەنیشیان چۆتە پاڵ و پیشەوەرەکان، پشتەکێکی ڕەشی لۆکەیی و پێشکەش بە پارچەیەکی لە لۆکە دروستکراو دەگرن کە هەندێ وێنەی مەکینەکردی دەخەنە سەر. بەم جۆرە، ئەو پارچەیەی کە دەردەچێ نە ناوی هەیە نە ناوك، ئەو وێنانەش کە لەسەری دەردەکەون لە زادەی خەیاڵی دروستکەرەکەیان بەولاوە هیچی تر نین و بەو جۆرە کارەکەیان لە چەواشەکردنی چەژی کابرای کڕیاری بێگانە بەولاوە هیچی تری لێ ناکەوێتەوە.

بەڕەی دەسکردی ساکار یان کلیم، زۆر ئاسانتر دروست دەکرێن، کڕیاریانی زۆرترن و لە مافوور کەم تەمەنترن و لە شێوەی چنیندا، ئەوەندە لەگەڵ تەختە تەونی تردا جیاوازی نیە لە ڕووی بنەڕەتی چنینەوە، تەنیا جیاوازی لە ئەستووری ڕستەکاندایە، چونکە هەم تان و هەم پۆکانیان ئەستوورترن، بنەڕەتی دروستکردنی بەڕە لەسەر ئەوە بەندە کە گرێچنیی تێدا نییە، گرێچنی نیشانەی هەرە دیاری مافوورە، مافووری کوردی بەڕەنگاو ڕەنگی و دیزاینی زەق دەناسرێنەوە، بەڕەی کوردی لە هەردوولاوە، هێشتا لەوەش ئەولاتر چووە.

جۆرێك بەڕەی كوردی لە دوولا پێكدێ، هەردوولا كە لەگەڵ یەكدا هەڵدووراون، ئەم بەڕانە بە دەزگایەكی تەونی زۆر بچووكی، دەستی دروست دەكرێن كە پانایی لە "١" پێ تا "١,٥"پێیە، كە هەندێ ژنەكۆچەر بە پشتی ولاخەوە لەم هۆبەوە بۆ ئەو هۆبە دەیانبەن و لە كاتی دەستبەتاڵییدا دایان دەبەستن و بەكاریان دێنن و بەو دەرامەدەی دەستیان دەكەوێ بەشێك لە مەسرەفیی خێزانەكانیان دابین دەكەن، ئینجا لا درێژ و تەسكەكان لێك دەدەن و لاكێشێكی ستاندەریان لێ دروست دەكەن. بەڕەكەرەكان هەمیشە گرفتێكیان لە بەردەمدایە لە پیشەكەیاندا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە كە ڕایەڵەكان، لەبەر بوونی وردە گرێی زۆر تێیاندا، یەكسان كش ناخۆن و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پارچەكان لەهەر چوارلاوە ڕێك دەرنەچن. ئەو بەڕەكەی پارچەكان بە ناچاری بەرامبەر یەكتری جووت دەكرێن و لەم سەرو ئەوسەرەوە لێك دەدرێن و هەڵدەدوورێن ئینجا دەپێچرێنەوە. ئەم بەڕانە جاران نرخێكی وایان نەدەهێنا و زیاتر لەلایەن دروستكەرە كۆچەرەكان خۆیان یان كڕیاری دەسكورتەوە دەكڕران، بەڵام ئێستا مەسەلەكە وا نەماوە، چونكە لە بازاڕی میكانیزە خنكاوی ڕۆژاوای ئەم سەردەمەدا، هەرچەندەی ئەو جۆرە كاڵایانە "سرووشتی"ترو "كێوی" ترو مۆركی "ئەتنیكی" یان زەقتر پێوە دیاربێ و لە كردا زبرتر و ناوەستایانە ترین، ئەوەندە زیاتر، كڕیاری ڕمووده و شەیدایان بە سەردا دەكەوێ.

هەرچی مافووری كوردیە، دوو جۆری لێك جیان، تەنانەت بۆ كەسێكی مافوور نەناسیش دوو جۆرەكە خۆیان هاوار دەكەن: یەكێكیان بەشێوەیەكی وەستایانەی ڕێكو بە نەخشێكی ئەموار و دلگیر و بە خەتی كووڕ كووڕو شاریا بەتیانە دروستكراوە، ئەوی تر، بەنا وەستایانە، بە نەخشی نەزانكردانە، گۆشە گۆشە و دەشتەكیانە دروستكراوە.

كەچی سەرەڕای ئەم دوو بەشییە، دیزاینی گشتی و نەخشكاری هەردوو جۆرەكە كە لە بنەڕەتدا هەر یەكن واتە دوو قوتابخانەی جیاوازی دیزاین، یان پشتەڵەكی كەلتووری لە ئارادا نیە، بەڵكو، سەرچاوەی هەردوو بابەتەكە یەك قوتابخانەی دیزایینە، بەڵام پشتەڵەكە كۆمەڵایەتی — ئابووریەكەیان لێك جیایە.

بەم جۆرە، دەتوانرێ ڕایەخ و چنراوی تری كوردی بكرێ بە پێوەری ڕەوشی ئابووری دارەڕای چینایەتی كۆمەڵگای كورد. لەم بارەیەوە ئەناهید عەكاشە (١٩٨٦) تێروانینێكی

سرنجکێشمان دەداتێ، ئەو دەڵێ چنراوی "ئاسایی" لە کوردستاندا نیە: چنراوەکان یان زۆر قایم، زۆر بەرگر، و لە کردا درو زبرن، نەخشەکانیان سادە و سرووشتین، یان زۆر ناسك، و لە کردا تەنك و لە نەخشکارییدا زۆر شێوازگیرن، ئەو ئەمە بەرەنگدانەوەی رەوشی بازاڕ و سەرەنجام بە ئاوێنەی دارەڕای چینایەتی کۆمەڵگای کوردستان دادەنێ. کۆمەڵگای کوردستان، کۆمەڵگایەکی دوو چینەبووە کە پێکهاتوون لە: ١) ئابوورییەکی بژێن کە وەرزێڕ و کۆچەرەکانی لە خۆی گرتووە و ئەو کاری چنینەی دەکرێ لە پلەی یەکەمدا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەوان تەرخانکراوە ٢) چینێکی ئەریستوکرات کە پێکهاتبوو لە خان و خانزادە و میر و میرزادە و کە لە باشترین بابەت دەگەڕان و دەیانپۆشی. نەبوونی چینێکی ناوەندی شارنشین، یان تەنانەت وەرزێڕی دەوڵەمەندیش، لە چوار پێنج سەدەی رابردووی مێژووی کورددا، نەیهێشتووە لەنێوان ئەو دوو دەستەیەدا یەکێکی تر دەرکەوێ، ئەم تێورییەی عەکاشە لەسەر بنەمایەکی قایم داڕێژراوە و لەم کتێبەشدا لە چەند جێ بە شایەد گیراوە، (بڕوانە ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی و سەرەتای مێژووی هاوچەرخ).

هەندێ نموونەی مافووری ناسکی سەدەکانی (١٨) و (١٩)ی بیجاڕو سەنەندەج (سنە) کە تا ئێستا ماون، دەرخەری پیشەسازییەکی شارکردن کە دەیتوانی تەنها چێژی دەستەیەکی زۆر هەڵبژاردە ڕازی بکا، ئەم نەریتە، بەهەمان شێوەی ئەو چینەی کە ڕاگرو پشتو پەنای بوو، لە بەین چوو و ئاسەواری ون بوو، لەم دوا دواییانەدا هەندێ تەقەللای بازرگانی سرووشت بۆ گەڕاندنەوەی ئەوەی لەدەست چووە و پاراستنی ئەو کەمەی کە ماوە، لە کارگە تازە بابەتەکانی سەنەندەجدا دران، بەڵام هەوڵەکە لە ڕەنجێکی بێهودە بەولاوە بڕی نەکرد.

مافووری کوردی، بە ئاسانی دەناسرێنەوە (یان دەناسرانەوە) چونکە چ وێنە و نەخشونیگار و ستێڵی گشتیان و چ دروستکردەی هونەرمەندە کوردەکان باش دەستنیشان کروان، وێنە سەرەکییەکان بریتین لە هەرشەنگ (قرژاڵ — قرژانگ — وەرگێڕ) رەقە (کیسەڵی و شکایی)، کیسەڵی ئاوی، ماسی ئاوێتە (ماسی و نەیلوفەر کە بە هیراتیش ناسراوە)، گوڵ، چوارسووچ (گۆشە یان چوارڕێیان)، شاخیی (کەڵە کێوی) گوڵاڵە (گوڵە باخ) و لاولاو و کاژینە (کە لە ڕۆژاوا بە وێنەی نان و بادەی شەراب بەناوبانگە).

جۆری گوڵ و ماسی ئاوێتە و لاولاو و کاژینە لەلایەن نەتەوەکانی تری دراوسێشەوە بە زۆری بەکاردێن، هەرچەندە گۆڕانیان تێدا کراوە. بۆ نموونە، لە مافووری کوردییدا وێنەی نیلوفەڕ لە لاولاو و کاژینەدا، لە شێوەی پیتی (V)ڤیدا کراوە، لە کاتێکدا لە مافووری قەفقاسدا، هەمار وێنە لە شێوەی پیتی (u)یو باوە، نەخشی ماسی و نیلوفەڕ ئێستا لە ئازەربایجان زۆر باوە، پەقلاوەی (ئەڵماسی) قولابدا لەلایەن هۆزە دراوسێکانەوە بەکارهێنراون.

دیزایینی گشتی لە مافووری کوردییدا دەبێ بکرێ بە دوو بەشەوە: دیزایینی کنارەکان و دیزایینی تەختەکان، لە دیزایینی تەختەکاندا گرنگترین نەخش جۆری (پۆیلەماسی)ی مەدالیەییە (پۆیلەیەك لە ناوەڕاستی تەختیی مافوورەکەیە چوار چارەکە پۆیلەی بە دەورەوەیە، هەر یەکەیان لە گۆشەیەکی مافوورەکە).

پڕگوڵ، میناخانی (گوڵە ئەستێرە) و چوار سووچ، ئەمانە لە هەر جۆرێکی تر ساغ و باوەڕی ترن لە بواری دیزایینی مافووری کوردییدا، ڕەسەنایەتی و لە مێژینەیی ئەم سێ ستێڵە کوردییەیەوە دەردەکەون کەوا لە هەمان نەخشونیگاری تەختی هۆدە و دیوانە ئاشوورییەکاندا دەرکەوتوون کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردوون.

هەرچی جۆری مەدالیە و هەورییە، هەردووك ستێڵی بێگانەن لەلایەن مافوور چنی کوردەوە وەرگیراون، نەخشی خۆماڵی کوردی زۆر جاران لەگەڵ نەخشی بێگانانـدا لێك دەدرێن، وەکو ئەوی ماسی ئاوێتە کە لەگەڵ میدالیەدا لێکدەدرێ، یان شاخی لەگەڵ ستێڵی هەوریدا.

پارچەی زۆر بەنرخی دەسکردی مافوور چنەکانی بیجار و سنە (سەنەندەج) زۆرجار ستێڵی مەدالیە بەکاردێنن کە تێیدا نەخشی کیسەڵ و ماسی و نیلۆ فەریش بەکار هێنراون پڕ گوڵ بریتیە لە تێکەڵۆپێکەڵێکی پڕ و قەرەباڵغی وردە گوڵ یان وێنەی خڕی تر کە هەموو تەختی فەرشەکە دەگرێتەوە.

هەرچی چوارسووچە، هەموو تەختەکە بە نەخشی چوارگۆشە پڕ دەکا، کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دابەشکراون و لە شێوەی هێڵی تێکپەڕدا، دامەزراون (هەر بۆیەشە چوارڕیانیشی پێ دەڵێن).

لەناو چوار گۆشەکاندا دەکرێ وێنەی جۆراوجۆر دابنرێ، بەڵام میناخانی، جۆرێکی ناوەندە لەنێوان پڕ گوڵی قەرەباڵغ و چوارسووچدا کە نەخشەکانی ڕێکوپێك و لەنێوان هەر نەخشێك و

ئەوی دییدا بۆشاییەك هەیە. نەخشەكانی درشتن و لێك دوور (وەكو چوارچرا) بەڵام كەوانەیی و بێ سەرجەم (وەكو پڕ گوڵ) ئەو وێنانەش كە لە میناخانیدا بەكارهاتوون گشت ڕەنگەكان دەگرنەوە، ئەوانەی كە زۆر باون بریتین لە كیسەڵ و رەقە و پۆیلەی قولاَبدار.

ڕاستە لەناو هەموو نەخشە كوردیەكانی مافووردا، میناخانی لە گشتیان زیاتر بە نموونە دادەنرێ. ئەوەش ڕاستە كە نەخشونیگارێكی زۆری تێدایە، بەڵام لە ڕووی سرووشتی كوردیەوە نە بەئەندازەی دوو جۆرەكەی تر، ڕەسەنایەتی كوردیی تێدا چەسپیووە، و نە مۆركی ئەو ڕەسەنایەتیەشی پێوەدیارە.

بۆ نەخشی كنارەكان، دەتوانرێ هەر یەكێ لە نەخشەكانی تەختەكان بەكار بهێنرێ، بەڵام لە هەموویان زیاتر كیسەڵ، كوپە، و گوڵە نیلوفەڕ باون.

گەلێ دیزایینی مافووری كوردی، لەلایەن كوردی كۆچكردوو یان دەربەدەر كراوە وە بۆ سەرزەمینی دوور دوور گوێزراونەتەوە، هەر وەكو كارتی سەردان، ئەم وێنە و نەخشانە، دوای توانەوەی ئەو كوردانە لەناو كۆمەڵگا نوێكانیاندا، یان گەڕانەوەیان بۆ شوێنی خۆیان بەجێهێڵراون. بۆ نموونە، لە وەرامین كە دەكەوێتە ڕۆژاوای باشووری تارانەوە، مافوور چنەكان، وێنەی هارشەنگ، میناخانی و كیسەڵ بەكاردێنن، هەرچەندە دروستكەرەكان بە نەتەوە فارسن و لە وڵاتەكەدا لەو پەڵەپەڵە بچووكە كوردە ڕەهەندەیەی سەدەی شانزەیەم بەو لاوە كە بە كێوەكانی پشت وەرامینەوەن ئەشتەبای كوردی لێ نیە و ئەوانەش فریان بە مافوور چنینەوە نەماوە (بڕوانە هۆزەكان).

وێنەی ژمارە (3):-نەخش و نیگاری سەر مافوور و بەڕەی کوردی
گوڵە نیلوفەر و قۆزاخەی سنەوبەر (خێڵەکی)
گوڵە نیلوفەر و قۆزاخەی سنەوبەر (شاری)
هەرشەنگ (خێڵەکی)
ڕەقەو دووپشک (شاری)
أ- نەخش و نیگاری کنارەکان
ڕەقەی وشکایی (تێکەڵەی نەخشی گوڵە نیلوفەر و قۆزاخەی سنەوبەر)
ماسی و نیلوفەر
ڕەقەی ئاوی
گوڵ
هەرشەنگ
ڕەقە
ڕەقەی وشکایی (ئەنگەر)
پۆیلەی قولابدار
پۆیلەی زۆزان
ب- نەخش و نیگاری تەختەکان

وەكو دەردەكەوێ، ئەم نەخشە كوردیانە لەلایەن خەڵكی شارەكەوە خراونەتە ناوان، كە دەشێ هەندێكیان، كۆنە كوردی ئێستا فارس بن و لە دێرزەمانەوە تواوبووبێتنەوە. مافووری وەرامین و جۆری دیكەی هاوشێوەی، لەوانەیە بۆ كەسێك كە ئاگاداری ڕابردووی ئەتنیكی كوردیی ئەو دەوروبەرە نەبێ مایەی سەرسووڕمان بن و زۆر گران بتوانرێ ڕەسەنیان دەستنیشان بكرێ.

نەخشی كیسەڵ، كە نەخشێكی دڵگیر و تەواو كورد ڕەسەنەو لە كناركاریی جوانترین مافووری سنە و بیجاردا بەكاردێ، ئێستا لەلایەن فەرشچنەكانی نەتەوەكانی تری دەوروبەریشەوە بەكاردێنرێ و بەشێوەیەكی بەرپلاو لە فەرشی فارسی و جۆری تردا دەردەكەوێ. هەمان شت لەگەڵ نەخشەكانی ماسی و گوڵە نیلوفەردا كراوە و لە مافووری تەورێز و ئەراك و ساڕووكدا، بوونە بە باو.

بۆ سەنعەتی مافوور، خوری سفتی بەرملی مەڕ، واتە بەرەگن، چاكترین كەرەستەی خاوە، لە مافووری كوردییدا، زۆربەی هەرە زۆری بەنی ڕایەڵەكان، دوو داوەن و لە خوری (گوررزە s شێوە و ڕیشاڵ z شێوە) چێ دەكرێن، وەرنە بەنی سێ داوە هەرچەندە بەكاریش دێنرێ، بەلام مافوورەكە لە "كوردی"یەتی دەردەكا، زۆرجاریش دیزایین و نەخشەكانیش دەبنە مایەی ئەم لە "كوردی" كەوتنە (Eagleton1988،59) لە پارچەی زیاتر سفت و نایابدا، لەجیاتی خوری، لۆكە بەكاردێ، بەلام بەهەمان شێوەی ڕێسین و ژمارەی دلو.

گرێكاریی لە مافووری تووكداری كوردستاندا هەردوو شێوەی باو واتە یەك شێوە (توركی) و جۆراوجۆر (فارسی) بەكاردێن، شێوەی گرێدان لە ڕۆژاوا بە دوو ناوی دێرینەوار بەلام هەڵەوە ناسرلوە، واتە غیوردس (یەك شێوە) و سەننە (جۆراوجۆر) غیوردس شاریكی بچووك بوو لە ڕۆژەلاتی ئەناتۆلیا و خەڵكەكەی زۆرتر مافورچن بوون، دیارە سەننەش، هەر شاری سەنەندەجی پایتەختی كوردستانی ڕۆژاوایە، تەنها مافووری هەرە تەنك و ناسكی كوردی شێوەی گرێچنی لێكنەچووی فارسی بەكاردێنێ كە بۆ داوی یەكجار باریك و دیزاینی گران دەشێ، مافووری گرێچنی فارسی تەنها لەسەر ئەم ڕێبازە دەڕوا لە سەنعەتەكەدا و ئەگەر بێتو بیخەینە سەر ناوی شارێك، واتە ناوی شارێكی لێ نێین، ئەوا هەر یەكێك لە شارە بەناوبانگەكانی ئێران لە مەیدانی مافوورسازیدا، وەكو ئیسفەهان، كاشان، یان كرمان، لە سەنەندەج زۆرتر شایانی ئەوەن ناویان لە مافوورەكە بنرێ، ئەم تەكنیكی گرێكارییە بێ گومان بۆ دروستكردنی ئەو جۆرە مافوورە سفتەی كە خێڵە كۆچەرەكان دروستی دەكەن و تێیدا قایمی و بەرگری زیاتر ڕەچاو دەكرێ بەكاردێ.

ئـەو مـافووره سـنەیی و بیجاریانـەی کـە لـەژێر سـایەی خانـەوادەی میرنـشینی کـوردی ئەردەڵاندا دروست کراون زۆرتر ئەم تەکنیکە یان تێدا بـەکاردێنرا پـەی دروسـتکردنی پارچـەی بە نرخ بۆ ڕازاندنـەوەی کۆشـك و دیوەخـانی دەوڵەمەنـدەکان (Cecil-Edwards-1953) بـەڵام بـە گشتی، مافووری کـوردی تـەکنیکی گرێکـاری تـورك شـێواز بـەکاردێنێ (چـونکە زۆربـەی زۆری مافوور چنە خێڵەکییەکانی تورك ئەم تەکنیکە بەکاردێنن).

ئەمە لە گرێکاری جۆراوجۆری ئێرانی قایمترە، بەڵام لـە سروشـتدا، ناگاتـە ناسـکی و نـەرم ونیانیی ئەو، هەرچی جۆری خێڵەکی مـافووری کوردیـە، بـازاڕی گـەرمی زیـاتر داوە بـە جـۆری لێکچووی گرێکاری لەوانەیە لەبەر تووکی درێژی زۆربەی ئـەم مافوورانـە و دڕی ڕووکاریـان بـێ، کـە شارنـشینەکان بـە تەوسـەوە بـە مـافووری دەسـتکردی خێڵـە کوردەکـان دەڵـێن "ورچـە مافوور" لە بازاڕەکانی ڕۆژەڵاتی ناوەڕاستدا مافووری کوردی بابەتی پیاوی هـەژار و نـەدارا بـوو لەبـەر ئەمـە لـە بازاڕەکـانی نـاوخۆدا بـەبرەوێکی ئـەوتۆ بـوون، کـە جـۆری تـر بەتۆزیـشیان نەدەگەیشتن "ورچە مافوور"کە خەرجێکی ئەوەندەیان بۆ دروستکردن نەدەویست پارەیـەکی زۆریان دەڕشتە ئابووری پێش مۆدێرنزمەوە و بۆیە بەرهەمهێنانیشیان تـا ئـەمڕۆش هـەر زۆرە، ئـەم بابەتـە هەژارانـە کوردیـە ئـەمڕۆ لـەناو خـەڵکانی ڕۆژاوادا، کـە زادەی پـاش شۆڕشـی پێشەسازین، برەوی بـاش هەیـە، سـاکاری، و سـاخی و فـرە جـۆری ڕەنگـەکان و وێنـەکان (و کۆمـەڵێك هەڵـەی درشـتیش لـە بـەجێهێنانی دیراینەکانـدا) لەناکاوێکـدا بـوون بـە بابـەتی سرنجکێشیان و ئارەزوو وورووژاندن لای ئەم کڕیارانە کە لە فرە جۆریی مافووری مەکینەساز بـە تەواوەتی بۆژە و بێزار بوونە، بەڵێ "ورچە مافوور" ئێستا بازاڕی هەندە گەرمـە و هێـزی کڕیـار و مافووردۆست ئەوەندە عەودالّیەتی کە لـە دەسـتی کڕیـارە دێرینـەکانیان، واتـە هـەژاران، بـە تەواوەتی دەرچوون.

بۆ سەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography**: The most valuable general work on rugs, including Kurdish rugs, remains that of A. Cecil-Edwards, *The Persian Carpet* (London: Duckworth, 1953). Works of William Eagleton, *An Introduction to Kurdish Rugs and Other Weavings* (New York: Interlink, 1988), Anahid Akasheh, "Woven Skies, Woven Lands: Kurdish Textiles as an Expression of Social Structure," *Kurdish Times*, I.1 (1986) fill the remaining gap. Also, Ora Schwartz, "Jewish Weaving in Kurdistan,"*Journal of Jewish Art* 3-4 (1977); Marco Polo, *Travels*, ed. John Masefield (London: Dent, 1975); R. Pfister, "Le rôle de l'Iran dans les textiles d'Antioné," *Ars islamica* XIII-XIV (1948); Anahid Akasheh, *The Archaeology of the Kurdish Rugs* (New York: Kurdish Library, 1992); R.S. Ellis, "Mesopotamian Carpets in Modern and Ancient Times: Ancient Near Eastern Weaving," *American Journal of Archaeology* 80 (1976); Yanni Petsopoulos, *Kilims: The Art of Tapestry Weaving in Anatolia, the Caucasus and Persia* (London: Thames and Hudson, 1979); Anthony Landreau, "Kurdish Kilim Weaving in the Van-Hakkari District of Eastern Turkey," *Textile Museum Journal* 3:4 (1973); Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990).

# جلوبەرگ و خشڵ

ڕەنگاوڕەنگیی جەنجاڵ لە جلوبەرگی کورداندا، کە نەریتێکی دێرینەواری پیرۆزە و کوردەکانی تا ڕادەیك کردوە بە بابەتی گاڵتە و تەوسبازی لای خەڵکانی نا کورد، باسی کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی ژینگە لەسەر میزاج و چەژی میللی کوردان دەکا، دەتوانین بڵێین هەمان هۆکار، ڕەنگە جوانەکانی سەر گۆزە و گلێنەی سەردەمی کەلتووری حەلەفیش لە کوردستانی پێش (٨٠٠٠) ساڵ دەگرێتەوە (بڕوانە دیزایین و نەخشونیگار).

ڕەنگ و وێنە و نەخشونیگاری ئاڵۆزی سەر جلوبەرگ، لە لادێ و دەشت و دەری ڕەنگاوڕەنگ و جوانی کورددا ئەوەندە سروشتین، کە مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ، لەو وەرزانەدا کە بەفر لەسەر ڕووی زەوی دەچێتەوە، بە جۆرێکی لە خۆیەکخستنی زەمین لەگەڵ سروشتدا دابنێ، ڤیتا ساکڤیل وێستی گەڕیدە و نووسەر کە ساڵی ١٩٢٦ بە کوردستاندا تێپەڕیوە دەنووسێ دەڵێ: "مرۆڤ هەرچەندە بەتانی ئەم ڕەنگاوڕەنگییەی ناو چیا و چۆڵەکاندا بچێ، هێشتا کەس ناتوانێ بڵێ ئەمە لاف لێدانە. هەرگیز جوانی ئەو هام لە شوێنی تر بەر چاو نەکەوتوە، کە سەیری تاشەبەردەکان دەکەی سەرت سووڕدەمێنێ، دەڵێی دەستێکی ڕەنگین بۆیەی کردوون، لە هەندێ جێ لەوە دەچێ دەسکردبن، لە ناکاوێکدا، تاشەبەردی شینی مەیلە و سەوز دەردەکەون، سەد سوێند بخۆ دەستێك هاتووە بە بۆیەی مسی گوگرد گرتوویان ژەنگ هەڵهێناو بۆیەی کردوون. ئینجا دەمارێکی سەوزی کاڵی مەلەکایت، دواتر ملەیەکی تەواوی سووری ئاڵ، ئینجا تاشە بەردی لەسەر یەك کەڵەکە کردووی ئاڵی مەیلەو سیاو" (Sackville-West ١٩٢٦,٧٢). ئەوی ڕاست بێ، جلوبەرگی ئەستووری سەرتاپا چەرمووی زستانەکە لە زۆر جێگە لە بەرگی پیاواندا باوە، لەوانەیە پاڵ پشتێك بێ بۆ ئەم بۆچوونی خۆ پاراستنەکە لەسەرەوە باسمان کرد.

لە پاڵ ئەم ڕەنگاوڕەنگییە بێ سنوورەدا، هیچ شتێکی تر نیە کە بڵێین ئەمە نموونەیە بۆ جیاکردنەوەی جلوبەرگی کوردی. شێوەی پۆشاکی کوردی لە هەرێمەوە بۆ هەرێم جیاوازی هەیە، هەروەها لە شێوەی بڕین و کوتاڵیشدا، بە هەرحاڵ، دەتوانین دوو ناوچەی لێك جیا،

بخەینە ڕوو: ١) کوردستانی ڕۆژاوا و ٢)کوردستانی باشوور و ناوەند و ڕۆژهەڵات. لە کوردستانی باکوور، دەتوانی تێکەڵەی هەردوو جۆرەکە بەدی بکەی (بڕوانە دابەشکاریە ناوخۆییەکان).

هەرچی پۆشاکی دانیشتوانی کوردستانی ڕۆژاوایە، تەنگ و تەسکن. پیاوان شەرواڵی دەلنگ لوولە سۆپایی لە پێ دەکەن، لەگەڵ پەستەکی، سفت و کورتەکی تەسکدا، ڕەنگی ڕەشی بە قەیتانی زەرد نەخشێنرا و زیاتر باوە. لە دیمەندا، بێ یەکوو لە جلوبەرگی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا و باڵکانەکان دەچن، پیاوان فێسی سوور یان کڵاوی سوور لەسەر دەنێن و سووکە مێزەرێکی لێ دەئاڵێنن بە جۆرێك تۆپەڵاکی فێسەکە لەسەرەوە دیارە، لەوانەیە ناوی قزڵباش، کە نراوەتە کوردە عەلەوییەکانی ئەم سەردەمە و ئەو هێزە سوپاییانەی کە بنەماڵەی سەفەوی وڵاتی فارسیان لە سەدەی (١٦)دا لێکەوتەوە، لەمەوە هاتبێ. سەرۆکەکانی هۆزی بارزانی تا ئیمرۆکەش بە مێزەری سوور لەناو خەڵکدا ناسراون (بڕوانە وێنەی ژمارە ٤).

ژنان لە کوردستانی ڕۆژاوا، مێزەر لەسەر نانێن، بەڵکو لەچەکی چاك شەتەك دراو کە زیاتر ڕەنگیان شۆخە لەسەر دەبەستن. پۆشاکی ژن بریتیە لە چەند پارچە جل کە بەسەر یەکدا لەبەر دەکرێن و هەر پارچە بە تۆزێکی لەژێر ئەوی سەریەوە دەردەکەوێ. هەر پارچەیە لە ڕەنگێکە، بەڵام لە ڕەنگاوڕەنگی گشت پارچەکاندا، لە هی شوێنەکانی تری کوردستان جیانین.

پاشی سێ پشت قەدەغەکاری لەسەر جلوبەرگی نەتەوەیی کوردی لە تورکیا، تەنها لە باکووری خۆراسان پیاو دەتوانێ بە دوای دیزایینی ڕەسەنی کوردەکانی ئەنەدۆڵدا بگەڕێ، نەك لە ئەنەدۆڵ خۆی، ئەو کۆمەڵگا کوردەی کە ئێستا لە خۆراسان دەژی و لە بنەڕەتدا نەمامی باکوور و ڕۆژاوای کوردستانە و لە ڕەتاندنە زۆرەملێکانی سەدەکانی (١٦) و (١٧)دا ڕەهەندەی ئێرە کراون هێشتا لەم ئەفەرۆزگایە دەستووری ڕەسەنی دێرینەی خۆیان لە جلوبەرگدا هەر وەکو خۆی پاراستوە: هەمان جلوبەرگە تەسکەکانی ڕۆژاوا، بەڵام بە ئالۆزی ڕازاوە بە وێنە و نەخشونیگاری شوێنەکانی تری کوردستان.

لە کوردستانی باشوور و ناوەند و ڕۆژاوا جلوبەرگ زیاتر مەیلە و دەلب و شلن لە بەردا دەلینگی شەلوارە فشوفۆڵەکانی بەر پیاوان، لە قولەپێدا بە بەنێك (پزوویەك) تەسککراونەتەوە. هەمان شەلوار لە کوردستانی باکوور ئەو تەسکی دەلینەگەی نیە و هەر بە کراوەیی دەمێننەوە. هەر بە گۆڕانی داو دەلینگی شەلوار، پیاو کە لەزێی، گەورە پەڕیەوە دەزانێ کەوا چۆتە ناو کەلتووری کوردانی باکوورەوە.

وێنەی ژمارە (4): جل و بەرگی کوردستانی ڕۆژاوا و هەندێ ناوچەی پارچەی دابڕاوی خۆراسان و کوردستانی باکوور

پیاوان کراسی بێ ملیوان (یەخە) لەبەر دەکەن کە لە پێشەوە یەخە دادڕە و قۆڵەکانیان بە کلکێکی درێژ (فەقیانە یان لەوەندی– وەرگێڕ) کۆتایی دێت کە بەدەوری مەچەکدا لوول دەدرێ و ئینجا گرێ دەدرێ. سوخمە و یان کورتەکێکی لە قوماشی ئەستوور دروستکرا و (لەگەڵ ساقۆیەکی درێژ لە ڕۆژانی سەرددا) لەسەر کراسەکەوە لەبەر دەکرێ، فەقیانەکەش پاش ئەم هەموو بابەتە، بە سەریاندا بە توندی لە مەچەک دەئاڵێنرێ و شەتەك دەدرێ، ئینجا بەسەر بەنەخوێنی شەڵوارەکەدا پشتێنێکی زۆر درێژ بەناو تەلانگدا دەئاڵێنرێ تا بەشی خوارەوەی کراس و سوخمە و کورتەك و پارچەکانی تر (ساقۆ یان سەرکەوای لێدەرچی) دادەپۆشێ. بۆ داپۆشینی تەپڵی سەر کڵاوێکی کوپەیی بچووك لەسەر دەنرێ و بە دەوریدا مێزەرێك کە لە پارچە قوماشێکی درێژ پێکدێ، لە پێشدا سێ سووچ، دوایی چەند جار بەهەمان ئەندازەی داپۆشینی سەر بە دەوریدا پێچ دەدرێ کە لە پانیدا نزیکەی پێنج گرێ (ئینج–وەرگێڕ) دەگرێتەوە. لفەکەی مێزەرەکە بە پشت گوێی ڕاستدا شۆڕ دەکرێتەوە (بڕوانە وێنەی ژمارە ٥).

بێگومان ئەم تاخمە بە گوێرەی هەرێم و ناوچە دەگۆڕێ و لە هەندێ شوێن شتی تری دەچێتە سەر، بۆ نموونە، مێزەری سەر لە باکووری کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەلێ زلتر بوە لە قەوارەدا و دەوری دەیاردە قوماشی تێچوە و ئەوەندە زلکراوە کە سەر بە ئاسانی یارای هەڵگرتنی نەبوە، هەروەها پشتێنی ناوتەلانگیش، تا هاتووە ئەستوور تر بوە. پیاو کە سەیری وێنەی مێزەری خان و بەگەکانی ئەم سەدەیە دەکا، لە خۆیەوە پێکەنین دەیگرێ. لە کوردستانی باشوور، پیاوان جلی زۆر ڕەنگاوڕەنگ، بە تایبەتی بریقەدار لەبەر دەکەن، لەم میانەدا هێنی خێڵی سەنجابی سرنجکێشن لەبەر سادەیی و بریسکانەوەیان لەبەر تیشکی ڕۆژدا.

جلوبەرگی ژنان، زۆر لە هی پیاوان جیا نەبوو، ئەوەی لێدەرچێ کە سوخمەی پیاوان تەسکترو سووکتر بوون و بە سەر کورتەکێکی نێوان سوخمەکە و کراسێکی هاودامان‌دا دەکرانە بەر، هەموو شتەکانی تر وەکو هی پیاوان وابوون بە مێزەر و کڵاوی سەرەوە، لە کوردستانی ناوەند و بە تایبەتی لە کوردستانی ڕۆژاوا، ئەو مێزەرەی بەدەوری کڵاوی سەردا دەپێچرا، وەکو لەچکێکی درێژی شل بە دەوری کڵاوەکەدا دەئاڵێنرا و ئەو پارچەیەش کە بەکاردێنرا، لە توولێکی زۆر تەنك و ناسکی ئاوریشمی هەڵدەبژێررا.

وێنەی ژمارە (5): جل و بەرگی كوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵات و ناوەند.

جاران، چ پیاو چ ژن لە کوردستان خشڵ و زێڕ و زێوێکی زۆریان بۆ خۆ ڕازاندنەوە لە خۆ دەدا، ئەم دەستوورە هێشتا لای ژنان هەر باوە، ژنە خێڵەکییەکانی هەرکییان، هەندێ خشڵ لە خۆیان دەدەن کە پیاو تووشی سەرسووڕمان دەکەن. ئەم خشڵە پێکدێ لە چەندین پاوەند بەردی بەنرخ و بابەتی زێڕین و زیوینی گرانبەها. ئەگەر ژنەکە لە بنەماڵەیەکی دارا بێ. گەر لە بنەماڵەیەکی دەسڕۆیو نەبێ، ئەوا زێڕ و زیوەکە کەمتر دەبن، ئەم خشڵە، لە شێوەی زنجیر و تەزبێح و پارچەدا لە شولاری ژنەکە هەر لە تەپڵی سەرەوە تا بنی پێ دەڕازێنێتەوە، وا دیارە ئەمە لە کوردستان دەستوورێکی دێرینە، لە کوردستانە (١٢) هەزار ساڵ کۆنەکانی شانیدەر (کە ئاسەواری هەرە کۆنی مرۆڤی نیاندرتاڵیان تێدایە و بەمە ناوبانگیان دەرکردوە)، وکە تا ئەم دواییە مەڵبەندی هاوینە هەواری هۆزی هەرکی بوون، لاشەی بە بەردبووی منداڵێك دۆزرایەوە کە تەنها بە دەوری کەللەی سەریدا (١٥٠٠) وردە بەردی ڕەنگاوڕەنگ ڕیز کرابوو، .(Roaf-1990-30)

ئەمڕۆکە، زێڕ و زیوو خشڵجات بە سامانێکی خێزان دادەنرێ، زۆرتر بۆ ڕۆژی تەنگانە و پێویست بەکاردێن. تەنانەت تا ئێستاش، فرۆشتنیان بە ئاسانی و شێوازی پارە کێشانەوە لە بانك دەکرێ و بۆ کڕینی شتی پێویستی وەکو پارچە زەوی یان خەرجی خوێندنی منداڵان بەکاردێن. واتە، خشڵ و زێڕ و زیوی ژنان (یان پیاوان)، بە هی تاکە کەس دانانرێ، بەڵکو بە هی گشت خێزان و بۆ ڕۆژی خۆی بەکاردێ.

دیارە، لە ڕووی جلوبەرگەوە جیاوازی بە گوێرەی هەرێم و ناوچە هەن، بەڵام هیچیان لە چوارچێوەی هەندێ سەرباری خێڵەکی و ناوخۆیی دەرناچن و لە بازنەی ئەو باسەی سەرەوەدا دەمێننەوە، لەژێر کاریگەریی هەردوو بابەتەکەدا ئەم جۆرە جیاوازیانە و هەندێ وردە جیاوازی تری ناوچەیی، بەهەمان شێوەی داب و دەستوور و زاراوە خۆجێییەکان، زۆر خۆڕاگرنین و زوو لە بەین دەچن، هەر ئێستاکە و لە ماوەی ئەم سەدەیەی ئێستاماندا، گەلێ لەو داب و دەستوورانە ئاسەوار نەبێ هیچی تریان لێ نەماوە.

هەندێ گەڕیدەی وەکو سایکس، تەنها بۆ ئاگاداری نەوەکانی دوارۆژ، لە نووسینەکانیاندا باسی گەلێ دابو دەستووری کوردانیان کردوە کە ئێستا نەماون، بۆ مەسەل، لە باسی جلی دانیشتوانی چیای سنجاردا، بەتانی کڵاوێکی لبادی بۆری قووچ دا دەڕوا کە بەم دیوو ئەودیویدا

قەیتانی بە گوێوە بەستنی پیوە بوە، ئینجا دەچێتە سەرباسی كراسێكی سپی لۆكە، كە نەملیوانی هەبوە و نە یەخە لە پێشەوە، كەوڵێكی لە پێستی ئاسك یان چەرمی بۆر دروستكراو، كاڵە و پێتاوی چەرمین، و پشتینی قایش بە پشتەوە. هۆزی هەرە مەزنی جبرانان، چ پیاو چ ژن تەپڵی سەریان دەتاشی.

سایكس، ساڵی ١٩٠٨ لە بارەی هۆزی هەرە مەزنی جبرانانەوە دەڵێ "پیاوان جلی زۆر سەیر لەبەر دەكەن، هەندێ جار لەسەر دەستووری میوە فرۆشەكانی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵات دوگمەی سەدەف، یەخە و سەر دەستی مەخمەڵی ڕەش، شەڵواری فش و فراوان، توول و ئەوانەش كە دەسڕۆن، ملپێچ لە مل دەئاڵێنن، كڵاوێكی لبادی یەك پێ درێژ دەكەنە سەر كە لە قەلپاخ دەچێ و بە دەوریەوە مێزەرێكی سووكی هەریر دەئاڵێنن.

هیچ گومان لەوەدانیە كە كڵاوە قووچە لبادینەكەی یەزیدیەكانی چیای سنجار، هەمان شێوەی كڵاوی سەردەمی سیثوئالانیەكانە، شێوەیەكی هەرە دێرینی ئەو كڵاوە لەو پەیكەرە زلەی میثراسی خواوەند دەردەكەوێ كە لە كەیلەكانی نیمروت داغ لە كوردستانی ڕۆژاوا هەڵدرایەوە، پەیكەرەكە لەلایەن میثراداتیس كالینیكوسی پادشای كوردی كۆماجینەوە (٦٩-٣٤ پاش میلاد) دروستكراوە، لەناو هەموو ئەو خودلوەندانەی كە لە نیمروت داغ پەیكەریان بۆ كراوە، تەنها میثراس ئەم جۆرە كڵاوە تایبەتی یەی بەسەرەوەیە. لەبەر ئەو پەیوەندیە تایبەتییەی كە لەنێوان خواوەند میثراس و یەزیدیاندا بینراوە، (بڕوانە ئایین) ئەم بەڵگە سەربارەی جلوبەرگ لەوانەیە شایانی لێكۆڵینەوەی فرەتربێ، مانەوەی ئەو كڵاوە سیثوئالانیە لەنێوان یەزیدیەكاندا بۆی هەیە ڕێچكەی شێوەی دامەزراندنی دێرینی ئەم هۆزە ئاریاییانە لە كوردستاندا دەربخا، (بڕوانە كۆچكردنە مێژووییەكان).

بابەتی خۆڕازاندنەوە و خشڵبەندی و جلوبەرگ لەناو كورداندا، بەڵگەی پشتەڵەكێكی سفتن لەسەر دیزایین و شێوەی بەكارهێنانیان، ئەو نموونەی خشڵ و زێڕ و زیوەی كە لە كەندەكاری ئاركیۆلۆجیدا دەست كەوتوون، وەكو ئەوانەی زێویە، وێنەی ئەوانەی كە ئێستاش هەر بە پەیكەر و وێنەكانی سەر تاشە بەردەكانەوە ماون (بۆ نموونە ئەوانەی تاقی بوستان لەسەر پولی زەهاو، و هینەكانی نیمروت داغ)، بەڵگەی زیندوون لەسەر ئەوەی كە ئەوانەی ئیمڕۆكەش باون هەر بەشێكن لەوانە و بە پاشماوەی ئەوانە دادەنرێن (Peck١٩٦٩)، ئەكەرمان (١٩٣٨)

لەو باوەڕەدایە کە ئێستاکەش ئاسەواری بەرچاوی دەوری ساسانیان بەسەر خشڵ و بابەتی خۆ ڕازاندنەوەی کوردیەوە هەر ماوە. عەلافەیرۆزو هەندێ کەسی تر (١٩٧٧) کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی جلوبەرگی دەرباری ساسانیانی لەسەر هی کوردان، بە تایبەتی لە پشت بەستن و سەر پێچاندا کە زۆرتر لە پەیکەرکاری و وێنەی سەر تاشەبەرد و کێوەکانی کوردستان وەری گرتوون، بەڵگەبەندی کردوە. ئەوەی کە ساخ نەکراوەتەوە تەنها ئەوەیە ئەم کاریگەریە لەکام لایانەوە چۆتە سەر ئەوی تر. ئەوان لەوەدا سەرنەکەوتوون کە باش چاو ژیرکەنەوە، هونەرمەندە خۆوڵاتیەکان (وەکو فەرهادی کێوکەنی ئەفسانەیی– بڕوانە ئەدەبیات) کە ئەم بەرد تاشیە مێژووییانە یان ئەنجامداوە سروشتیان لە شێوە و جۆری جلوبەرگ و خشڵ و زێڕ و زیوی خۆوڵاتی وەرگرتوە، هیچ بیرکردنەوەیەکی وردیش ئەم بۆچوونە سروشتیە ناتوانێ ڕەش بکاتەوە لێرەدا، باسەکانی ئەکەرمان و پێك و عەلافەیروزکەقە لە نزیکایەتی نێوان جلوبەرگ و خشڵی ئەم سەردەمەی کوردان لەگەڵ ئەوانی سەردەمانی کۆندا دەکەن زۆر ئەقلگر و بەجێ دێنە بەرچاو... هیچ پێویست ناکات بەدوای کاریگەریی بابەتی بێگانەدا بگەڕێین، چونکە بەڵگەکانی سەردەمی ساسانیان کە هێشتا بەسەر تاشەبەرد و کێوەکانی کوردستانەوە ماون، بۆ خۆیان پڕ بە دەم هاوار دەکەن.

بۆ سەرچاوە و خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:–

**Further Readings and Bibliography**: E.H. Peck, "The Representation of Costumes in the Reliefs of Taq-i Bustan," *Artibus Asiae* 31 (1969); Iran Ala-Firouz, *A Survey of Persian Handcraft*, ed. Jay Glick and Sumi Hiramoto-Gluck (Teheran and Tokyo, 1977); Vita Sackville-West, *Passenger to Teheran* (London: Hogarth, 1926); R. Berliner and P. Borchart, *Silberschmiedearbeiten aus Kurdistan* (Berlin, 1922); A.S.M. Chirvani, *Islamic Metalwork from the Iranian world, 8th–18th century* (London: Victoria and Albert Museum, 1982); H.E. Wulff, *Traditional Crafts of Persia* (Cambridge: M.I.T. Press, 1966); Ora Schwartz-Be'eri, "Kurdish Jewish Silvercraft," *Kurdish Times* IV.1-2 (1991); Edith Porada, *Ancient Iran* (New York, 1965); Géza Fehérvari, *Islamic Metalwork of the Eighth to the Fifteenth Century* (London/Boston 1976); Phyllis Ackerman, "Jewelry in the Islamic Period," in Arthur U. Pope, *A Survey of Persian Art* (London/New York, 1938); Mark Sykes, "The Kurdish Tribes of the Ottoman Empire," *The Journal of the Royal Anthropological Institute of Great Britain and Ireland* XXXVIII (London, 1908); Michael Roaf, *Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East* (New York: Equinox-Oxford, 1990).

# كاری پەیكەرسازی و وێنەكێشی

لە كاتێكدا هەندێ هونەرمەندی ئەم سەردەمەی كورد پەیكەرسازییان كردووە بە دەروازەیەك بۆ دەربڕینی هەست و خەونەكانیان، بەڵام ئەوان زیاتر لە مەیدانی وێنەكێشاندا سەریان دەركردوە، و وێنەكێشان سرنجی زیاتر شایستەیە، هەرچەند لەمەدا نەختێ پاشكەوتووین.

بۆ هەر كەسێك كە لەگەڵ "جەژنی كوردی"دا ناسیاریێ، زۆر ئاسانە لەوە بگا كە بۆچی ڕەنگ ئەوەندە لە وێنەكێشیی كورددا گرنگە (بڕوانە جلوبەرگ و خشڵ و زێڕ و زیو). ژمارەیەك لە وێنەكێشانی لاوی كورد، ئێستا سامانێكی بەرچاوی كاری وێنەكێشی بەرهەمدێنن بە تایبەتی لە تاراوگەی ئەوروپا، و تەنها لەم دوادواییەدا توانیویانە ناسینی گەلەكەیان و هونەردۆستان وەدەست بێنن، جگە لە هەڵسەنگاندن و ڕێزی نێودەوڵەتی.

ستێڵەكانی وێنەكێشان لە دوو بابەتی گشتیدا خۆیان دەنوێنن: تەجریدیەتێكی هاوچاخ كە بەرەو شێوەی تەكعیبیەت نزیك دەبێتەوە، ئینجا شێوەیەكی دێرینەواری ڕۆژهەڵاتی كە زیندووكردنەوەی مینیاتۆریەتی تێدا ئاشكرایە. ئەگەر لە ڕووی جۆرەكییەوە سەیری بەرهەمەكان بكەین، وا دەردەكەوێ كە بابەتی یەكەم زۆرتر سرنجكێشە و پەیڕەوكەری هەیە، چونكە بابەتی دووەم كەمتر مۆركی كوردانەی پێوە دیارە.

بیرۆكەی ئەم كارانەش بە ئاشكرایی خۆی لە دوو نموونەی گشتیدا دەنوێنێ: بیرۆكەیەكی نیشتمانیی "لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە پابەند" و جۆرێكی تر كە لە هونەرمەندێكەوە بۆ هونەرمەندێكی تر جیاوازە، هەر لە دیمەنی باخ و گوڵزارەوە بگرە تا دەگەیتە ژیانی بێدەنگ كە من ناوی "ستێڵی ئازاد"ی لێ دەنێم. ستێڵی "لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە پابەند" كوردستان وەكو سەرچاوەی بیرۆكە دادەنێ بۆ خۆی، بەوە هەوڵدەدا خزمەت بە گەل و نیشتمان بگەیەنێ لە گوتەی دەرخستنی گیروگرفتەكانیان و دەربڕینی دەسكەوت و وڵات و ژیانی ڕۆژانەیانەوە. تەنانەت چیاكان هەروا بە ڕووتی، بێ ئەوەی سیمایەكی نیشتمانییان بەسەردا

بکێشرێ، دەرنـاخرێن، دیمەنـەکانی بـە زەقـی پێـشمەرگەکان دەردەخـەن، ژیـانی لادێ دەردەبڕن، گیروگرفتەکانی ڕۆژانەی خەڵك و شتی ئەوها دەخەنە ڕوو.

سنووربەندی بۆ بابەتەکان و هەمیشە هەوڵدان بۆ ناردنی پەیامێکی سیاسی، نەك هونەریی، لە ڕێگای کاری هونەرییەوە، بە خراپی بەسـەر هونـەردا لـە ڕووی چۆنایەتییەوە، شکاوەتەوە، هەرچـەندە ئـەو کـارە هونەرییانـە بـۆ مەبەسـتی پیشاندان لـە کۆنفرانسەکانی مـافیی مـرۆڤ و کۆبوونـەوە نەتەوەییەکانـدا زۆر بـە سـوود و لـەبارن، بـەڵام لـە ڕووی هونەرییـەوە یـارای پێشبڕکەکردنیان لەگەڵ کارەکانی "وێنەکێشە ئازادەکان"دا نیە، کە جگە لە سـنووری خـەیاڵی خۆیان هیچ شتێکی تر ناتوانێ بەر لە دەستیان بگرێ و لێکدانەوەی سیاسی هیچ جێگایەکی لـە پڕۆژەکانیاندا نیە. هەر پارچە چادرێك کە بەکاری بێنن بۆ ئامـانجێکی هونـەری بـەکار دێ نـەك شتی تر. وەکو دەردەکەوێ ئەم هونەرمەندانە ئەوەندە بە تەنگی چێژی بینـەر و ڕەخنـەگرانی ڕۆژاواوە نین، ئەوان ئەوەندەیان بەسە کە کوردەکان خۆشیان دەوێن، مەسەلەکە هەر واشە.

لەناو کارەکانی ئـەو وێنەکێـشانەدا کـە لـە ڕووی کۆمەڵایەتیـەوە پابەنـدن، هێنـەکانی گـارا ڕەسـوول (لـە دایکبـووی ١٩٥٥ی کـەرکووك و ئێـستا دانیـشتووی ئـەڵمانیا)، جێـی ئـەوەن کـە هەڵوێستەیان لە لادا بکرێ.

زیندوویی، ڕەنگاوڕەنگیی و هەنـدێ جـار شـێتگیری ئـەو سـتێڵە ئـازادەی کـە ڕەمـزی (لـە دایکبووی ١٩٣٢ و ئێستا دانیشتووی فەرەنسا) بەکاری هێناوە لە کارەکانیـدا، وات لێدەکـەن وا بیرکەیتەوە کە هاکاناکا لە چوارچێوەکەی دەوریان دەرپەڕن و دەکەونە هەڵەکەسەما پشتی لـە کاغزی دیوار دروستکراوی کارێکی ڕەمزی، کە یەکێکە لە کارە "بێدەنگ"ەکان وێنەی سـەبەتە مێوەیەك نیشان دەدا کە ئەوەندە بە چڕیی و جوانی و زیندوویی گوڵپـۆش کـراوە کـە پیـاو زۆر بە پارێزەوە دەتوانێ نـاوی "بێـدەنگ"ی لـێ بنـێ. تەنانـەت سـێبەری سێبەرئاسـاش لەلایـەن ڕەمزییەوە بەگوێرەی "جەژنی کوردانە"ی خودی خۆی ڕاهێنراوە وێنـەی کورسـییەکی سـووری جوان سـێبەری لاجـوەردی و شـین و زەردی خـستۆتە سـەر تەختاییـەکی ڕەش بەرامبـەر بـە دیوارێکی پرتەقاڵی.

لەناو وێنەکێشە ئازادەکانی تردا، کارەکانی مەنسوور ئەحمەد (لە دایکبـووی سـاڵی ١٩٥٥ی کەرکووك و ئێستا دانیشتووی ئەڵمانیا)، جێی سرنجی تایبەتیین.

تەنانەت وێنەکێشە زیاتر لەسەرخۆ و ئارام و لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە پابەندەکانیش، لەم شێتی ڕەنگسازیە بەدەرنین. ڕووخساری پیرەمێردێکی لادێی لە پۆرترێتێکی زوودی سەردارردا[17] (لە دایکبووی ١٩٥٣ی عێراق و ئێستا دانیشتووی ولاتە یەکگرتیوەکانی ئەمەریکا) کە بە بۆیەی شۆخ و ڕەنگ شەقارکراوە، مەبەستیکی تایبەتی لە دواوەیە.

بەلای منەوە، ئەم هونەرمەندە لەم شێوە دەربڕینەدا لە دەرخستنی ڕەگوریشەی ئەتنی خۆی بەولاوە چ ئامانجێکی تری نەبوە.

هەرچەندە کاری وێنەکێشەکانی ئەم سەردەمەی کورد، خەریکە بەرەبەرە سەرەتای سرنجی سرك و بە پارێزی ناوەندەکانی هونەر لە ئەورووپا بۆلای خۆی دەکێشێ، و سەرەڕای چەندین سەردانی هونەرمەندانی کورد بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کەچی هیچ کارێکی هونەری کورد هێشتا لەوێ نەچۆتە بەر دیدەی بینەران. لەم بوارەدا، ڕۆڵی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی ئەمەریکای لاتین زۆر لە کورد دەست لە پێشترن و ئەوان بازاڕەکانی ئەمەریکایان بە کاری هونەریی خۆیان پڕ کردوە. ئەمە لە کاتێکدا، کاری هونەرمەندە کوردەکان، بە قەی دووری نێوان ولاتەکانیان لە کاری هونەرمەندە ئەمریکی لاتینیەکان جیان.

ئەوی ڕاست بێ، گەلێ هونەرمەندی کورد هەولیانداوە مۆرکی ئەتنیکی نەخەنە سەر کارەکانیان و بە پشت ئەستووریەوە هەولیانداوە کە کارەکانیان لەسەر بنەڕەتی نرخی هونەرییان هەڵسەنگێنرێن. گەر لە کارەکانی ڕەمزی و وردبینەوە، کەم مۆرکی نەتەوەییان تێیدا بەدی دەکرێ. مەبەستم ئەو کارانەیەتی کە لەسەر ئاستی جیهان پیشان دراون، هەرچەندە ئەم مۆرکە چ لەسەر ئەو چ لەسەر هونەرمەندەکانی تری کورد، بوە بە نیشان و بەسەریاندا داچەسپیوە.

---

[17] مەبەستی سەردار زوهدییە. سەردار کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ عەبدوڵڵای زوهدی تێکۆشەری دێرینی ڕێبازی کوردایەتییە و برازای مامۆستا خوالێخۆشبوو رونووق زوهدییە کە ئەویش نیشتیمانپەروەرێکی دێرینە. هەروەها برای تێکۆشەری دێرین و پێشکەوتنخوازی شاری سلێمانی بەڕێز ئەنجوومی زوهدییە. خانمی زوهدی پوریان یەکێك بوو لە تێکۆشەرانی چەپ. دوکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێ (ئەنجووم یەکێك بوو لە کچە شۆخەکانی سلێمانی پێم وایە لە بزووتنەوەی ئافرەتاندا کاری دەکرد. دوای شۆڕشی (١٤) گەلاوێژ دوو گەڕیدەی چیکی هاتنە کوردستان و دوایی کتێبێکی وێنەداری نازداریان دەربارەی کورد بڵاو کردەوە. لەو کتێبەدا کە کراوەتە ڕووسیش – لاپەڕەیەکی گەورە بۆ وێنەیەکی ئەنجووم تەرخان کراوە لەژێریەوە: ئەنجووم واتا ئەستێرەکان ناوی خۆی وا بە خۆیەوە).
ماڵی ئەنجووم خان لە شەستەکاندا مەکۆی تێکۆشەرانی ڕێبازی کوردایەتی بوو. من خۆم دەیەها جار هاتووچۆی ئەو خانەوادە بەڕێزەم کردووە ئێستاش ئەو پێوەندییە گەرمەم لەگەڵیاندا هەر ماوە – وەرگێڕ.

کارەکـانی هەسـەن شـونج (لـە دایکبـووی ١٩٧٠/دەرسـیم و ئێـستا دانیـشتووی سـوید)، دەکەونە بازنەی کارێکی فرە رووخساری ڕۆژهەڵاتییەوە. ئەو وێنەکێشیکی پلە یەکە لە ستێڵی ئازاددا، پەیکەرتاشێکی کارامە و دەست ڕەنگینـە، و خشڵـسازێکی یـەکجار زەبەر دەستیشە. ئەم بەهرەیەی دوایی، لەوەدایە کە لە هێڵی دێرینـەی خشڵـسازی وڵاتەکـەی، دەرسیم، دەرناچێ.

هەرچـەندە هونەرمەنـدێکی زۆری کـورد ئێـستا سـەرقاڵی وێنەکێـشین و لـەم بـوارەدا بەرهەمێکی زۆریان خستۆتە ناوان کەچی کارێکی ئەوتۆ نەکراوە لە بواری ئاسەوار ناسـییدا کـە پەردە لە رووی بابەتی وەکو فریـسکوو وێنەکێـشیی سـەر دیـوار هـەڵماڵێ، تـا لـەوێوە بتـوانین لەگەڵ ڕەنگ و ڕیشەو قۆناغی گۆڕانی هونەری وێنەکێشی کوردییدا بەدرێژایی مێژوو ئاشـنابین، کەچی کە دێینە سەر پەیکەرتاشی، مەسەلەکە بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەمەوەیە.

کوردستان لە کاری کۆکەنی کۆنە کـار و وێنەکێـشیی سـەر تاشـە بـەرد و پەیکەرتاشـی بـە پاوە وەستاوی خەڵك و خوادا زۆر دەوڵەمەندە. ڕەگ و ڕیشەی ئـەم پیشەیە دەگەڕێنـەوە بـۆ سەردەمانی پێش مێژووش، لێرەدا جێی خۆیەتی کە بڵێین کۆنترین پاڵەوانی میللی کوردسـتان، فەرهادی کێوکەن، پەیکەرتاشێك بوە کە بە وێنـەکانی خـۆی لەسـەر تاشـەبەردەکانی چیاکان پێشکەوتەیی هونەرەکەی بە کارەکانی تا ئێستا بـە زینـدوویی هێشتۆتەوە (بڕوانـە کەسـایەتی نەتەوەیی و فۆلکلۆر و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان).

مێژووی پەیکەرتاشیی، بە تایبەتی کۆکـەنی سـەر تاشـەبەرد لـە کوردسـتاندا گـەلێ کۆنـە، پەیکەرە زەلامەکانی دێرەکانی چیای نەمروود داغ لە کوردسـتانی ڕۆژئاوا (بـاکووری ئادەیـەمان) بەڵگەی نەگـەڕەوەن لەسـەر مێژینـەیی گرنگـی پەیکەرسـازی لـە هونـەری کوردسـتانی کۆنـدا. هەندێ لە کۆنترین شوێنەوارە بیناسازییەکانی کوردستان بەقەد چیاکانەوە بوونە بە ئەشـکەوتی دەستکرد، باشترین نموونەی ئەم جۆرە ئەشـکەوتانە، ئەشـکەوتەکانی دەڤ دوختـەر، دووکـانی داود، تاقی گیرا و تاقی بۆستانن کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، لە مانەوە ئـەوە دەردەکـەوێ، کـە پەیکەرسازی و کێوکەنی لە چیاکاندا باوترین شـێوەی کۆکـەنکاری بـوویێ. تەنانـەت پەیکـەرە فیلئاسـاکانی نـەمرود داغ لـە دامێنی چیاکان دامـەزراون و هـەر ئەمـە خـۆی ئـەو پەیوەندیـە

گیروتونده دەردەخا كە لەنێوان كورد و چیادا هەیە، بەو جۆرەی كە لە "كەسایەتی نەتەوایەتی"دا دەرخراوە.

سەرەڕای ئەم سامانە گەورەیەی كورد لە بواری ئەسەواردا هەیەتی، هونەرمەندە كوردەكانی ئەم سەردەمە كارێكی ئەوتۆیان لەم بوارەدا نەكردووە، بۆ نموونە، هەرچەندێكو سەردار زوهدی لە پەنای وێنەكێشیدا كاری پەیكەرتاشیشی هەیە، بەڵام كاری دووەمی لەگەڵ یەكەمییدا هەر بەراوردیش ناكرێ. هەرچی كارەكانی حەسەن تونچن لە بواری پەیكەرتاشیدا، هەرچەندێكو تا بڵێی دلگیرو پڕ هونەرن، بەڵام لە تەوازووی نرخی هونەرییدا، هەر تۆزی كارە خشڵسازیەكانیشی ناشكێنن.

بۆسەرچاوەو زانیاری زیاتر بروانە:—

**Further Readings and Bibliography**: W. Kleiss, "Zur Topographie des 'Partherhanges' in Bisutun," *Archäologische Mitteilungen aus Iran, Neue Folge* 3 (1970); H. Luschey, "Zur Datierung der sasanidischen Kapitelle aus Bisutun und des Monuments von Taq-i Bostan," *Archäologische Mitteilungen aus Iran, Neue Folge* 1 (1968); S. Fukai and K. Horiuchi, "Taq-i Bustan I-II," *The Tokyo University Iran-Iraq Archaeological Expedition Reports* 10-11 (Tokyo, 1969, 1972); W. Hinz, "Das sassanidische Felsrelief von Salmas," *Iranica Antiqua* V (1965); W. Hinz, "Das sassanidische Felsrelief von Tag-e Qandil," *Archäologische Mitteilungen aus Iran, Neue Folge* 6 (1973); E.H. Peck, "The Representation of Costumes in the Reliefs of Taq-i Bustan," *Artibus Asiae* 31 (1969); L. Vanden Berghe, "De ikonografische Betekenis van het sassanidisch Roksrelief van Sarab-i Qandil (Iran)," *Mededelingen van het Kon. Akad. van Wetenshappen van Belgie* XXXV.1 (1973); B. Hrouda et al., "Die Felsreliefs (Sarpoli Zohab) I-IV," *Iran. Denkmäler* (Iran, Felsreliefs C, 1976), Lief. 7; H. von Gall, "Neue Beobachtungen zu den sog. medischen Felsgräbern," *Proceedings of Second Annual Symposium of Archaeological Research in Iran* (1974); W. Hinz, "Das sassanidische Felsrelief von Salmas," *Iranica Antiqua* V (1965); Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico international, 1991), section 2.

# خانووسازی و نەخشەكێشانی شار

تا كشتوكاڵ دانەهێنرا، دروستكردنی خانوویەرە بۆ حەوانەوەی بەردەوام نەبوو بەباو. چونكە كۆمەڵگا ڕاوپیشەكان پێویستیان بەم جۆرە نیشتگانە نەبوو لەبەر ئەوەی جۆری ژیانەكەیان وای پێویست دەكرد ئەوان بە دوای نێچیرو بەرووبوومی شینایی خۆڕسكدا بگەڕێن، بۆ حەوانەوە ئەشكەوت ڕێكترین ئاسایشگە بوو. كە كشتوكاڵ داهێنراو ئاژەڵ و مالات ماڵیكران، ئینجا دروستكردنی خانوویەرە لە نزیك كێڵگەكان بۆ حەوانەوەی بەردەوام نەبوو بە

شتێکی پێویست، هەر لەبەر ئەمە، ئەگەر بتەوێ بەڵگەی هەرە کۆن لەسەر کەلوپەلی دەسکردی ناومالٌ پەیداکەی، دەبێ لەو دەوروبەرە منەبکەی کە کشتوکاڵی لێ داهێنراوە. کۆنترین تۆماربەندی خانووسازی، ئەوانەن کە هی سەرەتای چەرخی بەردینی نوێن (٩٣٠٠-٨٥٠٠ پێش میلاد) کە لە قرمزدەرە و کەریم شار لە کوردستانی ناوەند دۆزراونەتەوە و لەگەڵ هەرە کۆنترین شێواز و نیشانەی Jericho هاوچەرخن، ئەو بەڵگانە بریتین لە کۆختەی قورین کە تەمەڵیان تا ناوقەد لە زەویدان لەو سەردەمەدا کە قالبی خشت بڕین لە کوردستاندا باوبوون، لە Jericho هەر باسیشی لە ئارادا نەبوو.

لە قۆناغی حەلەفدا (٦٠٠٠-٥٤٠٠ پێش میلاد)، دروستکردنی خانوو جارێکی تر چووەوە سەر شێوەی کۆن، واتە شێوەی چڕ (پێی دەوترا ثۆلۆی) و بەمە ئیتر خانووی چوارسووچی فرە ژووری ٢٠٠٠ ساڵەی ڕابردوو باوی نەما. ئەم خانوانە، بریتین بوون لە ژووری یەکجار بچووکی ١٥-٢٥ پێی، و وا دادەنرێ کە بۆ تاکە خێزانێك دروستکرابن، لەناویاندا ژووری سێ سووچیش دروست دەکرا کە وێ دەچێ بۆ پشتیر و هۆڵی ماڵات بەکارهاتبن، ئەو کەرەستەیەی بۆ دروستکردن بەکار دەهات جۆراوجۆر بوون و زیاتر پەیوەندییان بە کەموزۆریی بارانەوە هەبوو خشتی قوڕ، بەرد و دار کەرەستەی هەرە سەرەکیی کاربوون.

لە کاتێکدا وێ دەچێ، خانووە قوڕەکان، بە گومەزی قوڕ سەریان گیرابێ، بەڵگەی زۆری دیکەش هەن کە دەریدەخەن کە داریش بۆ دارە ڕاکردن بەکارهاتووە، کەلاوەکانی یارم تەپە بەڵگەی بە هێزی ئەم برینەوەیەن. شێوەی خانووسازی ئەم سەردەمەی دێهاتی کورد، ئەوەندە لەم بابەتەوە دوورنین، چونکە خشتی قوڕ و بانی گومەز لە وشکە وڵاتەکان و دیواری بەرد و بانی دارەڕا کرا و لە بڵندایی و شوێنە پڕ بارانترەکاندا بەکارهێنراون. شێوەی تر کە بریتی بێ لە لێکدانی هەردوو شێوە، ئێستا لەو وڵاتانە هەن کە دەکەونە هەردوو بابەتە کەشەوە و لە قۆناغی حەلەفیشدا نموونەیان دۆزراوەتەوە.

میدیاییەکان و هیندۆئەورووپی زمانەکان کە پاشان هاتن، بێ هیچ گومانێك، لە کوردە کۆنەکان گەلێ بابەتی هونەر و کەلتووریان خواستەوە. لەم بوارەدا، بابەتی شارسازی و خانووسازی بە ئاسانی دەتوانرێ دەستنیشان بکرێن و بەڵگەبەندییش بکرێن.. بەڵگەیەکی زۆری وێنەسازی سەر تاشەبەرد و دیواری سەردەمی ئاشوورییەکان هەن، کە دەریدەخەن چۆن

سوپای ئاشوورییەكان شارە كوردنشینەكانیان ئابلۆوقە داوە. هەر لەو وێنە و نەخشانەوە دیمەنی شارە ئابلۆوقە دراوەكان دیزایینی شارەكانیش دەردەخەن، كە لەسەر بڵندایی دروست كراون و بە دیواری یەك سەرجەم (حەوت دیوار)كە تا سەر بڵندایییەكان دەكشێن دابەش كراون و كۆشكیان پەرستشگەی شاریش لە بڵندترین جێگە دروست كراوە. هیرۆ دوتز باسی هەمان شێوەی خانووسازی كردوە لەو باسانەیدا كە چۆتە سەر كۆشك و باخاتەكانی میدییەكان لە هەمەدان (ئەكباتانی دێرین) ئەو دەڵێ: هەر یەك لەو دیوارە یەك سەرجەمانە بە ڕەنگێكی جیا بۆیە كراوە (زێڕین، زیوین، شین، سپی، ئەرخەوانی، سوور، ڕەش، لە سەرەوە تا خوار). خانووی دانیشتوانی شار، باغ و گوڵزارەكان، لەوانەشە هاچەی مەڕ و ماڵاتیش، دەكەوتنە نێوان دیوارەكانەوە.

ئەم جۆرە دیزایینە، كە بە ئێرانی كۆن (زۆریش وێ دەچێ میدیایی بێ) "پەیری دیزا"ی پێ دەوترا، واتە "لە چوارلاوە شوورەدار"، وشەی هاوچەرخی (paradise)ی لێكەوتۆتەوە لە زمانە ئەوروپاییەكاندا كە لە گریكییەوە تێیان خزاوە، هەروەها فیردەوسیش (بەهەشت) كە لە قورئاندا هاتووە و (جالین)[18] یش لە فارسی نوێدا كە بە واتەی گوڵزار دێ و پەرێز (باخی سەوزە)ی كرمانجی و پەردێزی گۆرانی (گوڵزار) هەموو لەم وشەیەوە كەوتوونەتەوە. دوا كەیلی بە پاوە ماوی دوو دیواری دیوی دەرەوە (واتە دیواری ڕەش و دیواری سوور)ی ئەم پایتەختە میدیاییە، واتە "پەرەدایس"ی ڕاستەقینە، لە هەمەدان تا ساڵی ١٩٦٧ هەر مابوو.

بەكارهێنانی ڕەنگەكان بە بەرباڵوی لە هونەری كوردییدا، لە گەلێ شوێنی تری ئەم فەسڵە و فەسڵەكانی تری ئەم كتێبەدا باس كراوە و بەكارهێنانی بەربڵاو و بێباكانەی ڕەنگ لە شارسازیی كوردییشدا هەر ڕەنگدانەوەی ئەم دیاردەیەیە.

دواترین شێوەی هەیكەل (زەقوورە) لە وڵاتی مێزوپۆتامیا، بە تایبەتی ئەوانەی ئیلام و ئاشوورستان و بابلییەكان، كتومت وێنەیەكی بچووككراوەی دیزایینی یەكێك لە شارەكانی ناوچیاكانی كوردستانن.

ئەم دەشتایی نشینانە شێوە "چیای" دەسكردی هاوشێوەی هی كوردەكانیان بۆ خولوەندەكانیان دروست دەكرد و لەسەری سەرەوە كۆمەڵە بینایەكیان بڵند دەكردەوە كە

[18] جالیز لە فارسی نوێدا بەوتەی (بێستان)ی كاڵەك و ترۆزی و تەرەی تر دێبرونە فەرهەنگی عمید- وەرگێڕ.

هەموو لەسەر یەك ناوەند کۆدەبوونـەوە و لەسـەروو هـەموو ئـەو بینایانـەدا، پەرستـشگەکەیان دادەمەزراند. دیوارەکان فرە ڕەنگ دەکران، لەم ناوەدا، زەقـووره ئاشـووریەکەی دورشـاروکین (گونـدی کوردنـشینی ئێـستای خۆرسـاباد لـە بـاکووری ڕۆژاوای مووسـڵ) هـەموو ڕەنگـە کوردیەکانی لەسەرەوە باسمان کردوون بەرجەستە کردوە.

گەر بەریدەیتە جێگەی پایتەختی پادشایەتی کۆماجین، لە نەمروود داغ (چیای نـەمروودی باکووری ئادیەمان لە کوردستانی ڕۆژاوا) کـەوا بـە تۆپـەڵاکی چیاکەوە، بـە تـەواوەتی سیمای کوردانـەی بیناسازیش لەسـەر سـەر و پۆپـەی چیا و گـردە بڵنـدەکان بـۆ بەرجەسـتە دەبـێ، لەوانەیـە گـەر کـاری کەنـدەکاری و کۆڵینـەوە لـە پاشمـاوە و کەیلەکانییـدا بکـرێ، دیـوارە هاوسەرجەمەکانیش لەناکاوێکدا مل قوت بکەنەوە لەژێر زرمـەی بێـڵ و باڵتـەدا، تـا بـەو جـۆرە سیمای تەواوی دیزایینەکە خۆی دەربخا.

دیمـەنی شـار و شارۆچـکە کوردیـە هاوچـەرخەکان بەقـەی شـوێنەکانیان، سیمای کـوردی بوونیان دەرناخەن، هەر چۆن لە نەخشو نیگـاری سـەر تاشـەبەرد و بنـاری کێوەکانـدا شـار و شارۆچکە کۆنەکان بە بڵندایییەکانـەوە نیشتوونەتەوە. بـازارە کوردیـەکانی سـەردەمی نـوێش هەر بە سەر تۆپەڵاکی باسکە بـەرزەکان و بنـاری چیاکان و تەنانـەت سـەر هەڵدێرەکانیـشەوە قووتەوە بوونە، ئەمە بە تەواوەتی دژ بە ڕێبازی شارسازی دەشتەکانی دەورووبەرە.

لە کوردستانی باکوور، نزیکی شاری بایەزیـد (یەزدانـە فریـشتە)، کـە شـارێکی سـەدەکانی ناوەنـدە و ئێـستا بـە "دۆغوبایەزیـد" بەناوبانگـە، کۆشـك و سـەرایەکی بـە دیمـەن لەگـەڵ مزگەوتێکدا کـە کـاتی خـۆی سـاڵی ١٧٨٤ ئیـسحاق پاشـای مـیری کـورد لەسـەر بڵندایییـەکی ڕووبەڕووی چیای ئەرارات دروستی کردوە، هێشتا هەر بە پاوەیە، کۆشك و سەراکە بریتییـە لـە تەلارێکی زەلامی چەند نهۆمی وەستایانە دروستکراوی قایم و بە گومەز سەردراو، لەگەڵ چـەند منارە و دەرگـای نەخـشبەند کـراو و چـەندین حەوشـەوبان و تەویلـەی ولاخ، ستێڵی هونـەریی بیناسازی بەکارهێنرا و لـە کۆشـك و سـەراکەدا، بریتیـە لـە لێکدانی چـەند شـێوازی قەفقاسـی فارسی. سووری و ئەنەدۆڵی و پێکهێنانیان لە بارەگایەکی کێوئاسای قەشەنگ و دیمەن ڕێکدا. ئەویش، وەکو کۆشك و سەرای حوکمڕانە کوردەکـانی بـەر لـە هـاتنی ئـاری نـەژادەکان، یـاخۆ ئـەوانی میدیـەکان، لەسـەر دونـدی باسـکێکی بڵنـدی بـەردین دروسـت کـراوە. هەرچـەندە

شوێندەستی هونەری بێگانە بە سیمایەوە هاوار دەكا، نەخشەكاری و دیزایینی گشتی كۆشك و سەراكە كتومت دەستە خوشكی كۆشك و سەرایەكی كلاسیكی بە بڵندایییەوە قووتەوەبووی كوردستانی باشووره واتە قەڵای یەزدگرد (شاری فریشتان)، دیارە ئاسەوارێكی ئەوتۆ زەلامی قەڵای یەزدگرد بە پاوە نەماوە، بەڵام ئەوی بەسەر بارستی بناغەكان و شێوەی بیناسازی و دیمەنی گشتی ئەم كێوەكۆشكە (كە پاشماوەیەكی ساسانیی بەناوبانگە)، دەڵێی وێنەیەكی پڕا و پڕی كۆشك و سەرا عوسمانلی ڕووخسارەكەی ئیسحاق پاشایە لە كوردستانی باكوور كە (٢٠٠٠) ساڵ دوای ئەو ئاوا كراوە.

كۆشك و سەراكەی ئیسحاق پاشا تا دەهەكانی سەرەتای ئەم سەدەیە بە باشی ڕاگیرابوو. لەگەڵ هەرەسهێنانی ڕاپەڕینەكەی خۆیبووندا، كەوتە بەر شاڵاوی تاڵان و نیوە وێرانكردنەوە لەلایەن سوپای كۆماریی توركیاوە، ئیتر لەوساوە كەوتۆتە بەر زەبری ڕۆژگار و چەپۆكی باوبۆران.

لە سلێمانی، پاش شۆڕشی ساڵی ١٩٨٥ی عێراق، كە كۆشكە هەرە مەزنەكەی حامید بەگی دوا میری بابان[19] وێران كرا، كۆشكەكەی عادیلە خانم لە هەڵەبجە، وەكو دوا نیشانەی بیناسازی دێرینەی میرەكان لە كوردستانی ناوەند مایەوە (بڕوانە مێژووی هاوچەرخی نوێ). كەچی ئەمیش لە چەپۆكی وێرانكردن ڕزگاری نەبوو، ئەوەبوو لە شەڕ و شۆڕەكانی بەهاری ١٩٨٨دا سەروبن خاپوور كرا.

خانوویەرەكانی میرە ئەردەڵانیەكان، بە تایبەتی كۆشكە سەرەكیەكەی سنەیان، نیوە مانێك بە پێوە ماوە، هەرچەندە دیمەنی زۆر شێواوە. ئەم كۆشكانە پاش لابردنی ئەردەڵانیەكان لە ساڵی ١٨٦٧دا، بۆ كاروباری دەوڵەت بەكارهێنران، زۆریەی بەشەكانی

---

[19] بمداخەوە وا دیارە دوكتۆر د. میهرداد لەم بارەیەوە بە هەڵەدا چووە. دوكتۆر كەمال مەزهەر نووسیوە دەڵێ. شتی وا نەبووە، دوو ماڵی ئاوەدانی بابانەكان ئەو ساڵە لە سلێمانی هەبوون یەكەمیان ماڵی عەزمی بەگی بابان بوو كە لە كۆنەوە دروست كرابوو خانوویەكی گەورە و ئاوەدان بوو ئەوتریان ماڵی نووری بەگی بابان بوو كە كاتی خۆی ئەفسەرو پێم وایە ئامێر حامییەی سلێمانیش بوو. ماڵەكەی نووری بەگ نوێ بوو لەسەر شێوازی ڕۆژئاوا دروست كرابوو خێزانی نووری بەگ ڕووناك خانی ناوبوو ئەویش بابان بوو ئافرەتێكی شۆخ و عەسری بوو. هەموو ئەوەكانیان قژ زەردو چاو سەوز و سپی پێستن كەچی لەگەڵ ئەوەشدا باپیرە گەورەیان دەیفەرموو بابانەكان ئەوەی خالیدی كوڕی وەلیدن هەرچەندە خالید پێی نەناوەتە ناو خاكی كوردستانەوە و ئیبنولئەثیر دەڵێ سەراپای ئەوەی خالید بە تاعوون مردوون....

ناوەوەیان بۆ مەبەستی بیرۆکراتی کارمەندان شێوێنران، یەکێك لە کۆشکە هەرە نایابەکانیان، زۆر بە وەستایانە تازە کراوەتەوە و ئێستا کراوە بە مۆزەخانەی سەنەندەج.

لە ڕووی دەورو دیوارەوە، ئەم پاشماوانەی دەورانی میرایەتی هەموو بریتین لە ساختمانی چەند نهۆمی و بۆ زۆربەی جەستەیان بەرد وەکو کەرەستەی هەرە سەرەکیی بەکارهێنراوە

تەنانەت لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵاتیشدا، کە وەکو دەستوورێکی باوی بیناسازی فارس، خشت زۆر بەکاردێ، کەچی لەم بینایانەدا بەردی تاشراو و ڕێك بڕا و لە شێوەی خشتدا، زۆربەی بڕبڕەکان پێکدێنێ. لە کوردستانی باکوور و ڕۆژاوا کە خشتی گەورەگەورە بە زۆری بەکاردێنرێن، ئەوەندە پێویستی بەرد بڕین و سەربەشەی لەو جۆرە لە ئارادانیە. خانووی بچووکی یەك دەستە لە گوندەکان لە بەرد دروست دەکرێن، گابەردی زلزل و ڕەش، کە لە شوورەی شاری دیاربەکر (ئامەد) بەکارهێنراون، لە چەند جێگاو بۆنە لەلایەن نووسەرە گریکەکانەوە باسی لێکراوە. ئەوانیش ئێستا هەر ماون و چاوەڕێی دەست و چاوی توێژینەوە دەکەن، تا پەردە لەسەر جۆرێکی تری شارسازی و شێوەی بیناسازی کورد، کە هێشتا بوخچەی نەکراوەیە، هەڵماڵن.

بۆسەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Further Readings and Bibliography:** E.J. Keall, "Qal'eh-i Yazdigird. A Sasanian Palace Stronghold in Persian Kurdistan," *Iran* V (1967); E.J. Keall, "Qal'eh-i Yazdigird: The Question of its Date," *Iran* XV (1977); R.H. Dyson, "Architecture of the Iron I Period at Hasanlu in Western Iran and its Implications for Theories of Migration on the Iranian Plateau," in *Le plateau iranien et l'asi centrale des origines à la conquête islamique* (Paris: Colloques internationaux du centre national de la recherche scientifique, No. 567, 1976); T. Cuyler Young, "Thoughts on the Architecture of Hasanlu IV," *Iranica Antiqua* VI (1966); C.L. Goff, "Excavations at Baba Jan, the Architecture of the East Mound," *Iran* XV (1977); Glenn M. Fleming, "The Ecology and Economy of Kurdish Villages," *Kurdish Times* IV.1-2 (1991).

## مۆسیقا

زۆر شتێکی سروشتیە بۆ کەسێك کە بگەڕێ و بتوێژێتەوە، شوێن پێ هەڵگری و وردبێتەوە، سەرەنجام دەست بنێتە سەر ڕەگو ڕیشەی مۆسیقای کوردی... ئەوە زۆر ڕوونە و ئاشکرایە، کەوا تا دەم سەدەکانی ناوەند، دەتوانرێ بەست بە بەست ئاسەوارەکانی ئەم مۆسیقایە دەستنیشان بکرێ، چونکە لەم کاتەوە بە دواوە گەلێ مۆسیقا ناسی شارەزای گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بارەی سیستەمی مۆزیکی وڵات و گەلەکانیانەوە نووسینیان

بەجێ هێشتووە. دوان لەم مۆسیقا ناسانە، ناوبانگیان داوەتەوە لەم بوارەدا: "صفی الدین اورموی"دانەری كتێبی "كتاب الادوار" و "الرسالة الشرقیة" و "محمد الخطیب الأربیلي" دانەری كتێبی "جواهر النظام في معرفة الأغاني". لەم دوانە ئورمەوی (كە ساڵی ١٢٩٤ مردووە) بەدانەری قوتابخانەی "سیستەماتیك" دادەنرێ لە بواری مۆسیقادا (wright ١٩٧٨)، ئەم قوتابخانەیە تیشك دەخاتە سەر شیكردنەوەی قۆناغە جیاجیاكانی سەرهەڵدان و نەشونمان كردنی مۆسیقا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا جگە لە چەند بابەتی تر. بە یەكدەنگی گشت شارەزایان كتێبەكەی ئورمەوی یەكێكە لە هەرە شارەزایانە ترین بابەت لە بارەی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، لە كاتێكدا ئەربیلی ڕووناكی دەخاتە سەر باروددۆخ و شێوە و شێوازی مۆسیقای كوردی، ئورمەوی هیچی بە تایبەت بۆ ئەم بابەتە نەنووسیوە، ئەو زیاتر خۆی بۆ باسكردنی قوتابخانەی مۆسیقای دەستەی باڵای ناو كۆمەڵگای بەغدا خەریككردوە لە دوادواییەكانی حوكمی عەباسیەكاندا لەوێ.. ئەو تەنها دوای داگیركردنی بەغدا و دەزگیركردنی خۆی لەلایەن كاریەدەستە مەغۆلەكانەوە، "الرسالة الشرقیة"ی بە ڕاسپاردەی "نصیرالدین الطوسي"[1] سەروەزیری ڕۆشنبیر و زانای مەغۆلان نووسیوە. لەم كارەیدا، ئورمەوی كەلتووری مۆزیكی گەلە ئێرانیەكان (بە كوردەكانیشەوە) و عەرەبەكانیش دەخاتە بەر باس و تاوتوێكردن.

لەسەر چاوەیەكی تردا، باسی زۆرتر لە بارەی مۆسیقای كوردەوە كراوە، لە "رسائل اخوان الصفا"دا كە یەكێكە لەو كتێبانەی ئەندێشەی تیرەی ئیسماعیلیە دەردەبڕن، بە باشی و جیا لەیەكتر، كەلەپووری مۆسیقای كوردی دەرخراوە، بە زمانی پلە و ئاهەنگ و هەوا و ئامێرەكان. جگە لەوە باسی مۆسیقای گەلانی تری وەكو فارس و عەرەب و هی تریش كراوە و لێكیش جیا كراونەتەوە.

گەلێ مۆسیقازانی تریش لەسەردەمانی ناوەندا ناوبانگیان دەركردوە. لەوانە زەریاب كە گوایە ئەو ئاهەنگی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی هێناوە بۆ وڵاتی ئیسپانیا و لەوێ مۆسیقازانەكانی بە شێوەكانی خۆی ڕاهێناوە، هەردوو موسڵییان ئیبراهیم و ئیسحاق، دوو كۆنە جووی ئومسوڵمان، موسیقاژەن و مۆسیقاناسیش بوون، ئەوان زۆر لە هونەرەكەیاندا شارەزابوون و

چەند کاری پلەیەکیان لەم بوارە و لە بواری ستێڵەکانی مۆسیقای مێسوپۆتامیا و سەرزەمینی ئێراندا داناوە.

مۆسیقای ئەم سەردەمەی ئێستای کورد، هاوکانیاوی کەلەپووری مۆسیقای سەدەکانی ناوەندەکە ئەم هونەرمەندانەی گۆش کردوە و گەورەی کردوون تا گەیشتوونەتە ئەم ئاستانە لە زانستی مۆسیقادا. هەرچەندە تا ئێستا کەم لە بارەی کورد و هونەری مۆسیقای کوردەوە نووسراوە، هەروەها ئەوەش کە کوردەکان لە سەردەمانی زووەوە لەو بارەیەوە نووسیویانە هەر کەم و لاوازە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مۆسیقای کوردی توانیویەتی پێش بکەوێ و دەوڵەمەندییەك بۆخۆی بپارێزێ، ئەم ڕەوشە جارووبار، تەنانەت بیستەری کوردیش دەورووژێنێ، کابرایەکی کوردی ئەمسەری سەرزەمینی کوردستان کە گوێی لە بەرهەمی یەکێکی ئەو سەری کوردستان، یان قوڵاییە دوور دەستەکانی ناو چیاکان دەبێ، تووشی جۆرێك سەرشێوان دەبێ.

هەروەها، لە کاتێکدا هیچ تۆمارێکمان بە دەستەوەنیە لە بارەی گرنگیی گۆرانییەوە لە ڕەوشی مۆسیقای سەدەکانی ناوەندی کوردستاندا، تەنها ئەو ڕاستییەی کە مووسڵیەکان (ئیبراهیم و ئیسحاق-وەرگێڕ) و زریابیش، هەم دەنگبێژبوون و هەم مۆسیقاژەن، لەوانەیە پەردە لەسەر پێوەندی نێوان هەردوو بابەتەکە هەڵماڵێ. سا هەر چۆنێك بێ، لە مۆسیقای تازە بابەتی کوردییدا وتن لە پاڵ ژەنیندا، بە ئەندازەی لەراندنەوەی ژێی تەموورە و لێدانی تەپڵ یان فووکردن بە نەیدا پێویست و بنەڕەتییە. بەم پێیە، گۆرانی وتن بێ مۆسیقا، هیچ نرخێکی نیە.

شیعری گۆرانییش، دەبێ ئامانجێکی هەبێ، چیرۆکێ بگێڕێتەوە، شتێکی تازە بابەت بڵێ، بەهەمان شێوەی کە ئاواز و هەواکان پێشەکی و ئەوجگیری و کۆتایی یان هەیە. هەر وەکو زۆر ئاواز لە تەورێکی تایبەتیدا، بە مۆسیقا دەڕازێنرێنەوە، وشەکانیش دەبێ ئامانجێکیان هەبێ و دارەڕایەکی چیرۆکبێژیش. بە کورتی، گۆرانییە میللییە کوردیەکان، بریتین لە چیرۆکی لە تەك مۆسیقادا وتراو، ئەوەی ڕاست بێ، تەنانەت ئەو کاتەی کە زمانیش نابزوێ، ئەو مۆسیقایەی کە لەسەر ئاوازی گۆرانیەکان لێدەدەرێ، دەبێ بە جۆرە گۆرانیەکی "بێدەنگ" بۆ هەر گوێگرێکی کورد، لە کاتێکدا مۆسیقا کە خۆی بە تەنها هەموو چیرۆکەکەی بە گوێدا دەدا و دەیبزوێنێ.

لە بەرامبەر ئەمەدا، دەتوانرێ گۆرانی بێ بەشداریكردنی مۆسیقا بوترێ، لەم حاڵەدا، گۆرانیبێژ هەندێ وشەی بێ مانا، بەڵام مۆسیقادار، دووپات دەكاتەوە، وەكو لۆ، لۆ، لۆ یان لێ، لێ، لێ، و بەوە مەزەیەكی مۆسیقا دەخاتە پاڵ گۆرانیەكەی، لە كوردستانی باشوور و رۆژهەلات ئەم مەزەیە بەو جۆرە دانانرێ. تەنها لە شێوەیەكی كوردستانی باشووردا، "تورە خوانی" واتە گۆرانی خەم—كە وەكو لە ناوەكەیەوە دیارە بۆ بۆنە خەماوی و ناخۆشەكان دەوترێن، وەكو برگە ناوترێن و دەبن بە نوزەی نەرمییەك لە دوای یەك و بە هەوا و ئاوازێكی خەماوی تایبەت و بە وتەی گەرمی ئەفسووس پژێن دەبێژرێن، لێرەدا هەرا و ئاواز جێگای مۆسیقا دەگرنەوە.

بەیتی كوردی چوار بیرۆكەی لێك جیا بەكاردێنێ: ئازایەتی و رەشیدی، دڵداری، ئایینی، و سیاسی كە لەم دواوایییەدا چوە پاڵی ئەو سیانەكەی تر، لە بابەتی ئازایەتی و رەشیدییدا بەیتی كوردی بەشێوەیەكی دێرینەوار باسی ئازایەتی و نەبەردی پاڵەوانەكانی سەردەمانی كۆن و ناو داستانەكانی كردوە و بە پاڵەوان داینـاون (بروانـە كەسایەتی نەتەوایەتی). پاش دابەشكردنی كوردستان لەم سەدەیەدا ئەم شێوە گۆرانیە بابەتی سیاسی و نیشتیمانیشی چۆتە سەر و بۆ وروژاندنی هەستی نیشتیمانی و نەتەوەیی گوێگران بەكارهێنراوە، شیعری شاعیرە كلاسیكیە كوردەكان كە لە رووی بابەتەوە نیشتیمانیانە بوون و مەگەر بەدەگمەن ئەگینا لە رابردوودا نەكراون بە گۆرانی، ئەوا ئێستا زیندوو دەكرێنەوە و دەكرێن بە گۆرانی و دەخرێنە ناو زنجیرەی ئەو گۆرانیانەوە كە بۆ پێداهەڵدانی نیشتیمان دەوترێن. لە یەكێتی سۆڤیەتی جاراندا، كوردەكان ئەو جۆرە بیرورا نیشتیمانیەیان بۆ پروپاگەندەی سیاسی بەكاردەهێنا.

لەمانەدا، "گۆرانیەكانی كۆمسۆمۆڵ" و "گۆرانی ئایار" جێگەی تایبەتییان هەیە " Aristova 1958". ئەم بابەتە بازاڕیە تازە داهاتانە، نەگەیشتوونەتە گۆرانی بێژە میللییە رەسەنەكان و ئەوان كەلەپووری پشت بەپشتی، زار بەزار هاتووی گەلەكەیان پاراستوە لەم قۆژبن و لەو قوژبنی سەرزەمینی كوردستاندا.

لە سەردەمی پارثیەكاندا (٢٤٧ی پێش میلاد—٢٢٧ی پاش میلاد)، ژمارەیەكی زۆر شایەر و حیكایەتخوان لەناو كۆمەڵدا هەبوون و پێیان دەوترا (گۆسان)، لەناو ئەمانەدا داب و

دەستووری (میترەکان) یاخۆ ئەفسانەی دروستبوونی دنیا لە ئایینی میترابیدا، رۆڵێکی گرنگی دەبینی، بەڵام نەریتی بوونی گۆرانی بێژی گەرۆك و شایەر و حیکاتخوان باوە لەناو کەلتووری هەموو گەلانی هیندۆئەورووپی و ئەو گەلانەشدا کە کەوتوونەتە بەر کاریگەریی قووڵی ئەو گەلانە، وەکو کەلتووری گەلە تورك زمانەکان ئەگەر بمانەوێ سەرەتای دەستپێکردنی ئەم هونەرە لە کوردستاندا دەستنیشان کەین، ئەوا دەبێ زۆر بە وریاییەوە بڵێین سەرەتای هاتنی ئارياييەكان بۆ كوردستان باشترین سەرەداوە بۆ ئەم مەبەستە.

گۆرانیبێژە گەرۆکە کوردەکان، یان چەرگەر، بە ئازایی و دلێری ئەو دلدارانەیاندا هەڵدەدا کە لە مەیدانی نەبەرد بۆ خۆشەویستەکانیان، وەکو مەیدانی نەبەردی دژ بە دوژمنانی وڵاتەکەیان خۆیان بەخت دەکرد. ئەوان داستانەکان، یان (چەریگا)کانیان دەوت و لەگەڵیدا تەمبوور یان (کەمانچە)شیان لێدەدا. ژمارەی ئەو چەریگەیانەی چەرگەرێك دەتوانێ بیانبێژی مایەی شانازیە بۆی، هەتا زۆرترین باشتر وەستایی و باڵادەستی ئەو دەردەخەن هەر بۆیەشە چەرگەرەکان، هەر داستانە، بە چەند شێوە دەڵێن، بۆ ئەمە داستانی مەم و زین باشترین بەڵگە و نموونەیە (بروانە ئەدەب). چیرۆکە هەرە باوەکانی تر بریتین لە بابەتی وەکو شیرین و فەرهاد و داستانی قەڵای دمدم.

ئەگەر پێویست کات، گۆرانیبێژەکە بەبێ یارمەتی مۆسیقا دەیڵێ بەڵام هەر لەناکاوێکدا هەڵوێستەیەکی بۆ دەکا و بە دەنگ چەند بەیتێك دەخوێنێتەوە، لەم بوارەدا، چیرۆکەکانی بەر ئاگردانی زستان، باشترین نموونەن (بروانە کەلتووری میللی و فۆلکلۆر و چیرۆکە میللییەکان).

زۆربەی (نەك هەموو) گۆرانیبێژە کوردەکان، گۆرانی بە دەم لێدانی ئامێرێکەوە دەڵێن، ئەمە شێوازی دێرینەواری وتنە، بەڵام خەریکە بەرەبەرە لە کزی دەدا و جێ بۆ شێوازی ئۆرکسترا چۆڵ دەکا، بە جۆرێك کە نزیك، یان بە تەواوی، لە شێوازی رۆژاوا دەدا. لە هەڵبژاردنی زمانی گۆرانی وتندا، گۆرانیبێژە نوێخوازەکان، بە دوو جۆری جیاوازدا دابەش دەبن: ئەوانەی کە لەبەر هۆکارە و هەستی نەتەوایەتی هەر بە کوردی ستران دەڵێن، و لە بەرامبەردا، ئەوانەی کە بە زمانی تر دەیڵێن، لە پەناشیدا، دەست لە گۆرانی کوردی هەڵناگرن، ئەم دوو بابەتییە، لە بواری وێنەکێشانیشدا هەیە، وەکو نموونەی دەستەی یەکەمی گۆرانی بێژەکان، تەمۆ عیزەدین، عارف و حەسەنی جەزراوی، ئارامی تیگران، شوان، ئینجا شوان

بەروەر لە هەموان ناسراوترن. زۆربەی، نەك هەموو، ئەم گۆرانیبێژ و گۆرانی هەڵبەستانە، لە ڕووی كۆمەڵایەتیشەوە چالاكن و لە گۆرانیەكانیاندا خەون و ئارەزووە نەتەوەییەكانی كوردان دەردەبڕن.

لەناو دەستەی دووەمدا، پەری زەنگنە، فەقێ تەیران، شەهرامی نازیری، حوسەینی ئەڵبورزی و برایانی كامكار، لە هەموان بەناوترن. لەناویاندا، بۆ نموونە، پەری زەنگنە گۆرانیبێژێكی هەڵكەوتووی ئۆپرایە و هەندێ سترانی میللی كوردیشی بۆ ئامێری تازە بابەت ڕاهێناوە، ئەو بەردەوام گوێگرەكانی زیاتر بەوە دەورووژێنێ كە كارەكانی بە گۆرانیەكی كوردی تەواو دەكا جا لەسەر هەوایەكی كوردی بێ یان بە غەزەلێكی فارسی، هونەرە لە ڕادەبەدەرەكەی فەقێ تەیرا و بەكارهێنانی زۆربەی ئاوازە باو و سەرزاریەكانی گۆرانی كوردی، بە لایلایەكانیشەوە، كە شێوەیەكی شانۆكارانەشی دەخاتە پاڵ، هەست و هۆشی هەموو گوێگر و بینەرەكانی زەوت دەكا، چ توركبن، چ كورد چ ڕۆژاوایی.

ناوەڕۆك و سروشتی هەر سترانێك بەو ناوە دەزانرێ كە مۆسیقاژەنبێژەرەكەی پێش وتنی پێشكەشی دەكەن، بۆ نموونە سترانی (گۆرانی) (كە لە كوردە گورانەكانەوە داهاتووە)، زۆرتر لە شێوەی چوار تاكدا دەوترێ و بۆ مەبەستی درێژی خۆشەویستی و ئەویننداری بەكاردێ و لە ڕووی ئاوازەوە زۆر لە گۆرانی ڕۆژاواییەوە دوور نیە، كەڵوڕی (كە لە هۆزی كۆچەری مێژینەی كەڵوڕی كوردییەوە هاتووە)، بە شێوە و هەوایەك دەوترێ كە بیرۆكەكانی، هی كۆچەرایەتی و ڕاوچیەتی و خەڵكی پڕ كار و ڕەنجدەرە و لە دەورووبەری بابەتەكانی ژیانی ئەوان دوور ناكەوێتەوە، هەرچی بەیتە، یەك تاكەن و بەشێوەی دوو تێكەڵكێشی قافیەدار و بۆ دەربڕینی هەستی دڵداری و خۆشەویستی دەوترێ، شێوەی بەیت زۆرجار لە كاری باشترین شاعیرە كلاسیكیەكانەوە وەردەگیرێ. دیلۆك كلافەی دێڕی یەكجار كورتە بۆ گۆرانی شایی دەوترێن، لە كاتێكدا حەیران شێوەیەكە لە گۆرانی بۆ لاواندنەوەی مەرگی خۆشەویستێك یان لەدەستچوونی دڵدارێك دەچڕێ.

قەتار جۆرە گۆرانیەكی تایبەتیە و هەوایەكی چەسپاوی هەیە و هەموو چینەكانی نەگۆڕن (Schneider۱۹۹۱)، بەریتی لە شێوەی كۆرسدا دەوترێ و هەواكەی دەشێ بۆ هەڵپەڕكێ و بۆ سرودی نیشتیمانی و پروپاگەندەی سیاسییش بە كاربێ، سۆنی و دەروێشەكان بۆ سۆز و نزا

گەرمەکانیان لایە بەکاردێنن، هەرچی لاوکە، ئەوە بۆ باسی ئازایەتی و چیرۆکی نەبەردی و مەردایەتی تەرخانکراوە.

ئەو ئامێرانەی لە زووەوە بەکارهاتوون و هەر بەکاردێن، بە گوێرەی شار و دێهات دەگۆڕێن. ئێستاش تا ڕادەیەك هەر باون و ماون، ئەو ئامێرانەی لە دەرەوەی شارەکان و لە ناوەندە میللییەکاندا بەکاردێن، بریتی بوون لە زوڕنا و دووزەلە (یان جوزەلە) و تەمووره و پیك و دەهۆڵ و دومبەڵەك، لە هەندێ شوێنی تایبەتی شمشاڵیش بەکاردێ.

ساز، ناوێکە بۆ کۆمەڵێك ئامێری ژێداری لێك جیا، بەڵام باو، کە لەم سەری ڕووی زەمینەوە بۆ ئەوسەری بەکاردێن، بۆیە تا شوێنی بەکارهێنانی نەزانرێ ناتوانرێ ڕێ و شوێن و مەبەستی بەکارهێنانی بوترێ. بۆ دەرخستنی ئاڵۆزیی ئەم بابەتە، ساز، لە مەڵبەندە شاریەکانی کوردستان، بە ئامێرێك دەوترێ کە لە (سیتار)ی ئێرانی دەچێ و پێی دەڵێن (تار). تار ناوێکی گشتییە بۆ کۆمەڵێك ئامێری مۆسیقا. ئەگەر هەموو ئەم ناوانە وەلا بنێین، سیرەی زوڕنا، لەگەڵ دەهۆڵ یان دومبەڵەك، خۆشترین دەنگە کە لە کوردستانەوە پیاو چاوەڕوان بێ ببیستێ.

دەنگبێژە گەڕۆکەکان، تەنها شەمووره یان کەمانچە (ئامێرێك کە لە ڤیۆلین دەچێ و وەکو سیلۆ دەژەنرێ) بەکاردێنن، گەلێ ئامێری تریش، چ ناوخۆیی چ هی دەرەوە، لە کاری مۆسیقای کوردیدا بەکاردێن.

مۆسیقای کوردی، هەر وەکو مۆسیقای هیندی لەسەر ریتمی هەشتانە دەڕوا، لە ڕووی دەسکاری بەزمەوە لە مۆسیقای گەلانی فارسی و زۆربەی گەلانی ئاسیای ناوەند و ئەفغانەکان دەچێ، ئەو وشەیەی بۆ بەزم بەکاردێ پێی دەوترێ دەسگا (دەستگای فارسی) یان مەقامە (مەقامی عەرەبی). بەزمی هەرە باو و دێرینەی کوردی بەیاشی کوردە، واتە پەیژەی کوردی، ئەم پەیژەیە بە ئەندازەیەکی فراوان و بەهەمان ناو لەلایەن گەلە دراوسێکانی کوردیشەوە بەکاردێ، هەندێك دەڵێن ئەمە تاقە ئاوازە کە مۆسیقای کورد بەکاری دێنێ (یان دەبێ بەکاری بێنێ). ئەگەر مرۆڤ ئەوە بسەلمێنێ کەوا مۆسیقای دێرینەواری کورد تەنها یەك ئاوازی بەکارهێناوە، دەبێ ئەوەش بسەلمێنێ کەوا ئەم مۆسیقایە زۆر ڕەسەن و ڕیشەدارە، ئەگینا لەگەڵ ئەو سادەییە گەوهەر پاکەیدا، تا ئەمڕۆ نەیدەتوانێ بێ خەوش خۆی ڕاگرێ، بەڵام ئەم مۆسیقایە یەك نەوا نییە، تەنانەت هەر لایلایەیەك کە دایکێکی کورد بۆ منداڵەکەی دەیکا، بۆ نموونە، جۆرێکە لە بەزمی

هومایون و هەر ئەمە خۆی ڕەتكەرەوەیەكە بۆ ئەو كەسەی دەڵێ مۆسیقای كوردی یەكنەوایە، نەوای بەیاتی كورد، بەهەرحاڵ، بابەتێكە وەكو (فلامینگۆ)ی ئیسپانیەكان، یان (دوریان)ی گریكە كۆنەكان. كەسیش ناتوانێ بڵێ كامیان كاری كردۆتە سەر ئەوی تر، ئەگەر مەسەلەی كارتێكردن لە ئارادابێ، لە چوارچێوەی نەوا، یان نەواكاندا، ژمارەیەكی زۆری مێلۆدی كوردی لەلایەن مۆسیقاژەنە كوردەكانەوە، ئەنجام دراون و بە گوێرەی چەش و ئارەزووی گوێگرەكانیان لە مەیدانی بەزمەكەدا وەستاكاری شارەزایانەیان نواندووە، لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز لە چوارچێوەی یاسابەندی بەزم و مێلۆدیەكان دەرنەچوون، ئەمە باوەجودی ئەوەی كە هەندێ كەس دەڵێن مۆسیقاژەنی كورد سەرپێیەتی و دەستنێوەردان بە كارێكی ڕەوا دادەنێن. خەڵكی سادە، لەوانەیە نەزانن ئامێری مۆسیقا بەكاربێنن و بەزمی پێ دەركەن، بەڵام زۆر باش دەزانن و دەنگ بڵند دەكەن گەر یەكێكی نەشارەزا لەبەر چاویان چوارچێوە و سنوورەكان ببەزێنێ و ئاوازەكە بەهەڵە دەركا و بكەوێتە گاگۆزھاڕین.

ئەوەی مایەی سەرسووڕمانە ئەوەیە، مێژووی مۆسیقای كوردی سەدە ناوەندەكان، باشتر لە هەر كاتێكی پێش ئەو سەدانە، بگرە دواشیان، بەڵگەبەندی سفت كراوە، بۆ نموونە، "رسالات اخوان الصفا" كە كتێبی ئایینیی ئیسماعیلیەكانە، لە چوارچێوەی باسی مۆسیقای گەلانی ناوچەكەدا، واتە عەرەب و فارس و تورك، بەتانی مۆسیقای كوردیشدا دەڕوا (Wright١٩٧٨) ئەو زانیاریەی ئەم كتێبەدەیدا، یەكجار بەنرخە لە بواری كاری شۆڕێنەوەی مێژووی نەشونمای مۆسیقای كورد و ئەو گەنجینە پڕەی كە لەسەری دامەزراوە و لێیەوە پەرەی سەندوە.

ئەمڕۆكە، مۆسیقای كوردی، چ لە ستایڵ چ لە مووددا، گیرۆدەی جیاوازیەكی فراوانە، ئەمە هەرگیز جێی سەرسووڕمان نیە گەر بەرپلاوی و لێكدابڕانی وڵاتەكەی و گرانیی باری ڕێگاویان و پەیوەندی و سەختیی سەرزەمینی كوردان ڕەچاو بكەین. مۆسیقای كوردستانی باكوور و ڕۆژاوا خاوەنی تام و چەژێكی ئەنەدۆڵیە و بە ئاسانی هەوایەكی مۆسیقای تورك و یۆنان و بالقان دەدا بە گوێرەی گوێگردا، هەرچی مۆسیقای باكووری ڕۆژهەڵاتە، وشەكانی لێدەرچێ، پیاو بەگرانی دەتوانێ دوور لە مۆسیقای دێرینەواری ئەرمەنی و گەلە قەفقاسیەكان باسی لێ بكا.

مۆسیقای ئەو بەشانەی کوردستان کە هاوسێی پێدەشتە عەرەب نشینەکانن، بە تایبەتی سوریا و عێراق، بە ئاشکرا لە سروشتی مۆسیقای دێرینەواری عەرەب شێی سەندوە، لە کوردستانی باشوور ڕۆژهەڵات، گەردی ستێلی بانەزەمینی ئێران، ئەوەندە بە هێزە، کە مۆسیقای کوردی ئەم ناوچەیەی بە تەواوەتی لە هی پارچەکانی تر جیاواز کردوە، کەس لەمە سەری سووڕنەمێنێ، چونکە ناوچەکە ئەوە چەند سەدەی ڕەبەقە، واتە هەر نەبێ لە سەدەی (١٦)ەوە بەشێکە لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی فارس و ئێران، ئەم ستێڵە لە هەموو ستێڵەکانی تری مۆسیقای کوردی خەماوی تر و کزە دارترە باسکردنی هەستی تاکێکی کورد لە کاتی گوێ شلکردن بۆ مۆسیقای نەتەوەیی خۆی کارێکی ئاسان نیە ئەو دەبێ ئەوە قووتدا کە "هەموو ئەوەی گوێی لێیە مۆسیقای کوردی" یە، هەرچەندە جیاوازی نێوان شێوەکانی هاوار دەکەن و ڕەنگی چەندین شوێن و بابەتی تریان پێوە دیارە و بە چەندین قۆناغی جۆراوجۆردا گوزەریان کردوە، بەم جۆرە ئەو بە گومانەوە لە بارەی پێناسەی مۆسیقاکەیەوە دێتە دەر، بەڵام ئەمە هەرگیز جێی ئاڵۆزبوون و لچ هەڵقورتان نیە، هەر میللەتێکی تر کە گیرۆدەی ئەو بارودۆخە گرانەبێ کە کورد تێی کەوتوە، وڵاتێکی بە سەر سەرزەمینێکی فراواندا پانەوە بوو، دەر و دراوسێیەکی زۆر و جۆراوجۆر، کەلتووری جیاواز، ستێلی مۆسیقای جیاواز، ئیتر مۆسیقاکەی چۆن لە کارتێکردن و مۆرك سەپاندنی ئەم هەموەدا دەرباز دەبێ؟؟ گەر بهاتایە و کوردستان ئەوها لەتلەت نەبوایە و خاوەنی دەوڵەتی خۆی و میدیای ئەلەکترونیی خۆی و قوتابخانە و وانەگای مۆسیقای خۆی بوایە لەم (٧٥) ساڵەدا کە ڕابورد، دەیتوانی ئەم جیاوازیە ڕیشەکێش و مۆسیقاکەی یەك ڕەنگ بکا و دەستی ئۆخەی بخاتە سەر دڵ.

ئێستا کە لە وڵاتانی تاراوگە و غەریبایەتی، کوردانی پارچە جیاجیاکانی کوردستان سەریان ناوەتە سەری یەکەوە و لە کاتێکدا شەپۆلی ڕادیۆ و پەخشی تەلەفزیۆن سنوورە قەدەغەکانی نێوان دەوڵەتەکان دەبڕن، وا مۆسیقای کوردیش، هەرچەند گەلێ درەنگ، خەریکە هەنگاو بەرەو یەکڕەنگی و ستاندەردیزەیی دەنێ و هەر پێشی دەگا...

## بۆسەرچاوە و زانیاری زیاتر بڕوانە:—

**Bibliography and Audio Records:** The music collection at the Kurdish Library in Brooklyn, New York, is of special value. Also, Ralph Solecki, *Kurdish Folk Songs and Dances* (New York: Ethnic Folkways Library, Album No. FE 4469, 1955); Christian Poche and Jochen Wenzel, *Musical Sources: Kurdish Music* (Berlin: UNESCO Collection, Modal Music and Improvisation VI-4, n.d., a Phillips music record); T.F. Aristova, "Poyezdka k Kurdam Zakavka'ya" ("A Visit to the Kurds of Transcaucasia") *Sovetskaya Etnografiya* VI (Moscow, 1958); Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico international, 1991), section 2; O. Wright, *The Modal System of Arab and Persian Music: AD 1250-1300* (Oxford: Oxford University Press, 1978).

**General Bibliography**

A very valuable reference book on the Kurdish artists in diaspora is Robin Schneider, ed., *Kurden im Exil: Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft* (Berlin: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung, dem Haus der Kulturen der Welt und medico international, 1991), section 2; L.D. Levine and T.C. Young, Jr., eds., *Mountains and Lowlands: Essays in the Archaeology of Greater Mesopotamia* (Malibu, California: Bibliotheca Mesopotamica, vol. 7, 1977); P.R.S. Moorey, ed., *Excavation in Iran, the British Contribution* (Oxford: Oxford University Press, 1972); R.D. Barnett, "Median Art," *Iranica Antiqua* II.1 (1962); *The Cambridge Ancient History*, 3rd ed. (New York: Cambridge University Press, 1964); R. Ghirshman, *Iran. Protoiranier, Meder, Achämeniden* (Munich: Universum der Kunst, 1964); T.F. Aristova, "Ocherki kul'tury i byta kurdskikh krest'yan Irana" ("A Sketch of the Culture and Way of Life of the Kurdish Peasants in Iran"), *Trudy Etnografii Miklukho-Maklaya* 39 (Moscow, 1958); *Kurdish Times*, semi-annual journal of the Kurdish Library, Brooklyn, New York, 1985-present.

Land and nature of Kurdistan in general:

1. **British Naval Intelligence Division's** ***Geographical Handbook*** series on Iran, Iraq, Turkey (2 vols.), and Syria (1940-43).

2. *Tiibinger Atlas des Voerderen Orients* (TAVO) (Wiesbaden, Ludwig Reichert Verlag, ongoing)

3. Also see Ali Tanoglu, Sirri Erine and Erol Tiimertekin, *Tiirkiye Atlasi* (Istanbul: Milli Egitim Basimevi, 1961); Sirri Erine, *Dogu Anadolu Cografvasi* ("Geography of Eastern Anatolia") (Istanbul: Istanbul University Press, 1953)

***Map of Eastern Turkey in Asia, Syria, and Western Persia (Ethnographical)*** (London: Royal Geographic Society, 1906, updated in 1914), with fufl-color sheet map at 1:2,000,000 scale;

Captain Bertram Dickinson. "Journeys in Kurdistan," *Geographical journal* 35 (1910), with map of Kurdistan at 1:2,000,000 scale;

Captain F.R. Maunsefl "Kurdistan," ***Geographical Journal*** **3-2** (1894), with map at 1:3,000,000 scale; Captain F.R. Maunsell "Central Kurdistan," *Geographical Journal* 18-2 (1894), with map at 1: 1,000,000 scale;

Lieut. Col. J. Shiel, "Notes on a journey from Tabriz, through Kurdistan via VAn, Bitlis, Se'ert and Erbfl, to Suldmaniyeh, in July and August 1836," ***Journal of the Royal Geographical Societv*** 8 (1838), with map at 1:4,060,000 scale; T.F. Aristova and G.P. Vasfl'yeva, "Kurds of the Turkmen SSR," *Central Asian Review* 13-4 (1965).

# سوپاسێكی تایبەتی...

لە كاتێكدا ئەم كتێبە وا تەواو دەبێ و دەچێتە بەر دەستی خوێنەران بە پێویستی دەزانم سوپاسێكی تایبەتی ئاراستەی برای بەڕێز كاك ئیبراهیم چەلكی بكەم، كە كتێبەكەی بەدیاری لە ئەمەریكاوە بۆ هێنابووم و هەر ئەوەش خولیای وەرگێڕانی خستە دڵمەوە، هیوادارم مرازی بە كوردستانی یەكگرتوو و سەربەخۆ حاسڵ و دڵی بە گەلی كوردی سەرفرازو بەختیار پاراوبێ.

# چەند وشەیەك لە بارەی دانەری ئەم کتێبە...

میهردادی ئیزەدی وانەبێژە لە بەشی زمان و شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك لە زانکۆی هارڤارد. پلەی زانکۆی لە مێژوو و زانستی سیاسی و جوگرافیادا وەرگرتووە، پاشان چەند پلەی ماستەری لە کاروباری نێودەوڵەتی و جوگرافیا و لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەدەست هێناوە. پلەی دوکتوراکەی لەسەر لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە زانکۆی کۆلۆمبیاو وەرگرتووە. ئەو لە چەندین بۆنەدا لە بارەی کوردەوە دەرسبێژی کردووە و لەبەردەم دوو لیژنەی کۆنگرێسی ئەمەریکادا لە بارەی هەمان بابەتەوە شایەدیی داوە. بابەتێکی زۆری لە گۆڤاری "کوردیش تایمز" و "میدڵ ئیست جورناڵ"دا بڵاوکردۆتەوە. جگە لەمانە ئەو لە "ئینسایکلۆپیدیای مێژووی ئاسیا"دا بەشداری کردووە و چەند نەخشەی لەسەر وڵات و نیشتەجێی کوردان بڵاوکردۆتەوە.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ٢٠٠٧

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
| --- | --- | --- |
| ٣٧٥-سروشت لە شیعری گۆراندا | د.فازیل مەجید مەحمود | |
| ٣٧٦-دەسەڵاتی چوارەم و زمانی تەلەفزیۆن | محەمەد فەریق حەسەن | |
| ٣٧٧-ئەو لە نیگاهێکدا | شری شیڤاگورو<br>یۆگی هاوبیر | |
| ٣٧٨-ئێوارەی شار | فەروخ نێعمەتپور | |
| ٣٧٩-مێژووی شارستانێتی | ویل دیورانت | ئازاد بەرزنجی<br>نەبەز کەمال نوری<br>دانا ئەحمەد مستەفا |
| ٣٨٠-ئاناتۆمیی توندوتیژی | مەسعود سەفیری | بەیان عەزیزی |
| ٣٨١-تیۆدۆر ئادۆرنۆ | سەلاح حەسەن پاڵەوان | |
| ٣٨٢-بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان | عەبدوڵڵا سەراج | |
| ٣٨٣-چەپکێك شیعرەکانی ژاك پریڤێر | ژاك پریڤێر | فەرهاد پیرباڵ |
| ٣٨٤-شانۆیی ئیسپانیی | ئالفۆنسۆ ساستری | عەلی کەریم |
| ٣٨٥-شاری ئاشتی و خاڵخاڵۆکەو شای مشکان | سیمین چایچی | |
| ٣٨٦-فیکری سیاسی خۆرئاوا | د.موسا ئیبراهیم | شوان ئەحمەد |
| ٣٨٧-تینسی ولیامز | شاکر الحاج | کامەران سوبحان<br>عەبدوڵڵا زەنگەنە |

٣٨٨-شانۆنامەی کەڵەگاکان — ئەنوەر قادر رەشید

٣٨٩-پلورالیزمی ئایینی — د.هادی محەمەد

٣٩٠-چۆن دەبیت بەسەرکردە؟ — فیلد مارشاڵ مۆنتگمری — ئەحمەد سەلام

٣٩١-دەروازەی چۆنێتی بەکارهێنانی spssلە توێژینەوەی زانستیدا — ئا: هادی ئەمین محەمەد

٣٩٢- دەنکە برنج لەئاسمانەوە نابارێ — کۆنراد هێرمان — قوباد رەسوڵ گوروون

٣٩٣-بریدا — پاولۆ کۆیلۆ — یاسین عومەر

٣٩٤-میسری فیرعەونەکان — بریندا سمیث — یادگار حەمە غەریب